# هەولێر لە روانگەی گەڕیدە بیانییەکانەوە

هۆشیار محەممەدئەمین کۆیی

**پێشەکی**

ئەدەبی گەشت ئەدەبێکی زۆر کۆنە و مرۆڤ بەخوێندنەوەی چێژی زۆری لێ وەردەگرێ، چونکە وەک چیرۆکێکی ڕاستەقینە سەرنجی خوێنەر ڕادەکێشێ و لە خوێندنەوەی بێزار نابێ، بەتایبەتی ئەو گەڕیدانەی کە بەوردی قەڵەمە بەبرشتەکانیان خستۆتە کار و بەشێوەیەکی زۆر جوان دەربارەی شار و دێهات و بەرهەمی کشتوکاڵ و پیشەسازی و بازرگانی و دووکان و بازاڕ و داهاتی وڵات لە باج و سەرانەی مەڕومالاَت و باسی ئاژەڵی کێوی و دەشت و شاخ و رووبار و پلەی گەرما و جلوبەرگی دانیشتوان دەنووسن، کە وەک فیلمێکی سینەما دێتە بەرچاو.

گەڕیدە بیانییەکان بەتایبەتی ئەوروپییەکان زانیارییەکی باشیان بۆمان جێ هێشتووە، ئێستا وەک سەرچاوە و دیکۆنۆمێنت قوتابیی خوێندنی باڵا و نووسەر و مێژوونووس و جوگرافیناس و کۆمەڵناسی کورد سوودی لێ وەردەگرن.

هەندێ لەو گەڕیدانە بەهەولێردا رۆیشتوون، بەڵام شتێکی ئەوتۆیان لەسەر ئەم شارە تۆمار نەکردووە، هەندێکی تریشیان بەرێگایەکی تردا بەرەو مووسڵ رۆیشتوون، وەک رێگای پردێ ( ئاڵتوون کۆپری ) - دەشتی قەراج - مەخموور - مووسڵ یان لە بەغداوە ڕاستەوخۆ بۆ مووسڵ.

هەندێ گەڕیدە کە باسی بنەماڵەیەک یا کەسایەتییەک بە چاک یا خراپ دەکا ئەوە بیروڕای خودی خۆیەتی، هەندێ گەڕیدەش بۆ مەبەستی سیاسی یا ئابووری هاتوونە کوردستان زیاتر بەرژەوەندیی وڵاتەکەی خۆیان ڕەچاو کردووە زۆرجاریش هەندێ لەو گەڕیدانە پشتیان بەقسەی خەڵکی سادە و ساکار بەستووە و بەمە تووشی هەڵە بوون لە تۆمارکردنی ڕووداوەکان، دەبێ ئەوەش بزانین کە گۆڕین و پوختەکردنی هەر بابەتێک بۆ سەر زمانی کوردی، وەک ئەمانەتێک دەبێ وەکو خۆی و بێ دەستکاری بڵاو بکرێتەوە.

| ناوی گەڕیدە بیانییەکان | ساڵی هاتنیان بۆ هەولێر |
|---|---|
| ١- هەولێر لە دیدی گەشتیاران لە کتێبی کاروانەی فەلەکی هادی چاوشلی | ٦٣٤ی کۆچی |
| ٢- هەولێر لە دیدی راوولفی پزیشکی هۆڵەندی | ١٥٧٤ی زایینی |
| ٣- گەشتەکەی (نیبور) بۆ عێراق لە سەدەی هەژدەهەم | ١٧٦٦ی زایینی |
| ٤- گەشتەکەی (ئولیڤییە) بۆ عێراق | ١٧٩٤ی زایینی |
| ٥- دیدەنی بەریتانییەک لە عێراق (جاکسون) | ١٧٩٧ی زایینی |
| ٦- گەشتەکەی جەیمز بێکنگهام بۆ عێراق | ١٨١٦ی زایینی |
| ٧- گەشتەکەی (المنشئ البغدادي) بۆ کوردستان | ١٨٢٠ی زایینی |
| ٨- گەشتەکەی (میستەر ریچ) بۆ کوردستان | ١٨٢٠ی زایینی |
| ٩- دوو ساڵ لە کوردستان (کاپتن های) | ١٩١٨ تا ١٩٢٠ی زایینی |
| ١٠- سی جی ئەدمۆندز | ١٩٢٢ تا ١٩٥٠ی زایینی |
| ١١- رێگایەک لە کوردستان (هاملتۆن) | ١٩٢٨ی زایینی |
| ١٢- هاملتۆن، ئەندازیاری پردی (گەلی عەلی بەگ) | |

# محەمەد پاشای ڕەواندز
# (لە گەشتەکەی فرێزەر و یاداشتەکەی دکتۆر رۆسدا)

کەریم شارەزا

(جێمس بیلی فرێزەر)ی گەشتیار و گەڕیدەی ئینگلیز لە کتێبەکەی (گەشتی فرێزەر)دا، کە جەعفەر ئەلخەیات لە ئینگلیزییەوە کردوویەتی بە عەرەبی و لە ساڵی ١٩٦٤دا بە یارمەتیی کۆڕی زانیاریی عێراق لە بەغدا چاپ کراوە، لەبارەی محەمەد پاشای ڕەواندزی و حوکمەکەیەوە نووسیویەتی و دەڵێ:

(کە میر مستەفا بەگی باوکی محەمەد پاشا پیر بوو و توانای حوکمرانی نەما، کاروباری حوکمی میرنشینی سۆرانی بە محەمەد پاشای کوڕی سپارد. ئەویش لە ماوەیەکی کەمدا توانی دەست بەسەر بەشێکی زۆر لە میزۆپۆتامیا و ئەو لایەنانەی کەوتوونەتە ڕۆژهەڵاتی ڕووباری دیجلە لە نێوانی هەولێر و کەرکووکدا بگرێ و سوپایەکی ٥٠ هەزار شەڕکەری پێکەوە بنێ و ئەمن و ئاسایش لە وڵاتەکەی خۆیدا بەرقەرار بکات).

ئینجا فرێزەر بۆ دەرخستنی وێنەیەکی تەواوی کەسایەتیی محەمەد پاشا و حوکمەکەی پشت بەیاداشتێکی پزیشکیی تایبەتی موقیمیەی بەریتانیا لە بەغدا، دکتۆر رۆس دەبەستێ، کە بەختەوەر بووە گەشتێک بۆ ئەو بەشەی کوردستان بکات، کە محەمەد پاشای میری گەورەی سۆران حوکمی دەکات. گەشتەکەشی لەسەر داوای محەمەد پاشا بووە، تاکو بێتە ڕەواندز بۆ چارەکردنی چاوی نابینای مستەفا بەگی باوکی. بۆ ئەو مەبەستەش پاشا پەیوەندیی بە (کۆلۆنێل تایلۆر)ی بەرپرسی موقیمیەی بەریتانیاوە کرد و تکای لێ کرد پزیشکێکی پسپۆڕی بۆ بنێرێ تاکو چاوی باوکی چاک بکاتەوە.

کۆلۆنێل تایلۆریش ئەم داوایەی بە دەرفەتێکی باش زانی بۆ دروستکردنی پەیوەندیی سیاسی لەگەڵ ئەم پاشا ناودارەی کورد و ئەویش ڕووی لە دکتۆر رۆس نا تاکو ئەو کارە بەجێ بگەیەنێ.

رۆس لەگەڵ دەستەیەک لە پیاوانی محەمەد پاشا بەسەرۆکایەتیی میر بایەزید بەگی مامی، کە بۆ ئەم کارە ناردرابوونە بەغدا لە ناوەڕاستی مانگی مایسی ١٨٣٣دا بەغدایان بەجێ هێشت و بەرەو میرنشینی سۆران بەڕێ کەوتن.

لەو تێبینییانەی دکتۆر رۆس تۆماری کردوون، ئەو جیاوازییە زۆرە بوو لە ڕووی ئاوەدانی گوند و دێهاتی سەرەڕێی کاروانەکەیان و باری کشتوکاڵییەوە لە نێوان ناوچەکانی ژێردەستی حوکمی والی بەغدا و ئەو ناوچانەی ژێر حوکمی میر محەمەد پاشا بوون. لەو بارەیەوە رۆس دەڵێ: ئەو ناوچانەی ژێر دەستی والی عوسمانی بوون، هەموویان وێران و چۆڵ بوون، چونکە خەڵکەکە لە چەنگ ئەو باجە زۆرەی لەسەریان دانرابوو رایان دەکرد و ئەوەی دەماوەش ژیانێکی یەکجار سەخت دەژیان و هەر کاربەدەستێک تێپەڕبووبایە داوای بەخشیشیان لێ دەکرد، بەڵام کە کاروانەکەی بایەزید بەگ و دکتۆر رۆس گەیشتە پردێ، کە لە ژێر دەستی محەمەد پاشا بوو، خەڵکەکە هاتنە پێشوازییان و داوای هیچ بەخشیشێکیان لێ نەکردن و یەکەکە دەستی بایەزید بەگیان ماچ کرد و گوڵبارانیان کرد. ئینجا دکتۆر رۆس وەسفی دەشت و دەری نێوان پردێ و هەولێر دەکات، کە لەو دەمەدا هەموو دەغڵ و دان و گوڵ بوون و دەپرسێ بەروبوومی ئەم زەوییانە بۆ کێیە؟ پێی دەڵێن هەموو بۆ محەمەد پاشا و ئازووقەی سوپایەکەیەتی. بەڕاستی دیمەنێکی جوان و دڵگیر و ناوچەیەکی ئاوەدان بوو.

ئینجا فرێزەر دەڵێ: دکتۆر رۆس کە گەیشتە هەولێر، پێشوازییەکی گەرمی لێ کرا. بۆ ڕۆژی ١٩ی مایس هەولێری جێ هێشت و لەگەڵ چەند پاسەوانێکی چەکدار بەرەو ڕەواندز

کەوتە ڕێ و زۆر ڕێگای سەختی شاخاویی بڕی تاکو گەیشتە قەڵای میر مستەفا بەگی باوکی محەمەد پاشا، کە پێی دەگوترا (دمدم) و بەسەر دۆڵی ڕەواندز دەیڕوانی و کەوتبووە سەر لووتکەی شاخێکی بەرز.

ئینجا ڕۆس وەسفی ئەوسای شاری ڕەواندزی پایتەختی سۆران دەکات و دەڵێ: "شاری ڕەواندز نزیکەی دوو هەزار ماڵە" و لەبارەی چارەکردنی چاوی مستەفا بەگیش دەڵێ: "سەیری چاوەکانیم کرد، بینیم لەبەر پیری هەردوو چاوی نابینا بووبوون و ئومێدی چاکبوونەوەیان لێ نەدەکرا، بەڵام بۆ دڵنیایی هەندێ دەرمان و دڵۆپی چاوم پێ دا و پێم گوت: ئەم دەرمانە بەکار بێنە چاوت چاک دەبێتەوە!".

ئینجا دکتۆر ڕۆس دەیەوێ محەمەد پاشا ببینێ، پێی دەڵێن: ئێستا بەخۆی و سوپاکەیەوە چۆتە بادینان و شاری ئاکرێ و دەستی بەسەر ئەو ناوچەیەدا گرتووە، بۆیە پێت ناکرێ پاشا ببینی و ئەویش دوای مانەوەی لە قەڵاکەی میر مستەفا دەگەڕێتەوە هەولێر و چاوەڕوانی فەرمانی محەمەد پاشا دەکات بۆ دانانی وادەیەک بۆ بینینی لە دەشتی ئاکرێ. دکتۆر ڕۆس بەوردی سەرنج دەداتە هەڵسوکەوت و ژیانی خەڵکی هەولێر دەڵێ:"خەڵکی ئەم شارە و دەوروبەری ئازا و شەڕکەرن و تەنانەت مێردمنداڵی دە پازدە ساڵییان حەز بە بەکارهێنانی چەک دەکەن و خەنجەریان لەبەرپشتە و هەموو لەگەڵ حکوومەتەکەی محەمەد پاشان و گاڵتە بەحکوومەتی والی بەغدای سەر بەدەوڵەتی عوسمانی دەکەن.

دوای چەند ڕۆژێک مانەوەی ڕۆس لە هەولێر، محەمەد پاشا بەدوایدا دەنێرێ و ئەویش لە ٣ی تەمووزی ١٨٣٣دا بەرەو ئاکرێ دەکەوێتە ڕێ و بەکەڵەک لە زێی بادینان دەپەڕێتەوە تاکو دەگاتە دەشتی ئاکرێ و نێو ئۆردووگای محەمەد پاشا و بەناو چەند ڕیز پاسەوانی تایبەتیدا دەگاتە بارەگای محەمەد پاشا و بەمجۆرە وەسفی پاشا دەکات:

"محەمەد پاشا پیاوێکی لێوەشاوەی ڕێک بوو، تەمەنی لە دەوروبەری ٤٥ ساڵدا بوو، ڕەنگ و ڕوویێکی سپیی هەبوو، ئاسەواری خوریکە (ئاوڵە)ی بە دەموچاوییەوە دیار بوو، لە ئەنجامی ئەو نەخۆشییەی چاوێکی بە قووڵدا چووبوو و وەک کوێر دیار بوو، واتە یەک چاو بوو، ڕیشێکی ڕەنگ قاوەیی ئاچوغی ١٢ ئینج درێژی هەبوو، جلوبەرگێکی ڕێکوپێکی نایابی لەبەر دابوو و دەنگێکی نزمی هەبوو".

ئینجا دکتۆر ڕۆس دەڵێ: "پاشا لەگەڵمدا کەوتە گفتوگۆ و لێی پرسیم خوێندن لە ئینگلتەرە چۆنە؟ پەیوەندیتان لەگەڵ ئێران و ڕووسیا چۆنە؟ باسی نەخۆشیی کۆلێرا و تاعوونی لێ پرسیم و گوتی: چ دەرمانێک بۆ چارەسەرکردنی برین و نەخۆشی باشە؟ ئینجا لەبارەی چەکی پێشکەوتووی ئەوسای وەک تفەنگ و دەمانچە دوا. خۆیشی تفەنگ و دەمانچە و شمشێرێک و دووربینێکی پێشاندام".

دکتۆر ڕۆس دەڵێ: "ژمارەی سەربازانی لەشکری پاشا زۆر جار دەگەیشتە ٥٠ هەزار شەڕکەر، بەڵام لە کاتی دروێنە و هەڵگرتنی خەلە و خەرمان نیوەیانی ئیزن دەدا تاکو بچن سەپانی بکەن و دوایی بێنەوە ژێر چەک و بۆ کاتی نوێژ تۆپ دەتەقێنرا لە پاش نوێژی عیشاش جووقی موزیکی پاشا کەمێک ئاوازی خۆشی پێشکەش دەکرد، ئینجا سەربازەکان دەنووستن و خۆیشی درەنگانێک دەنووست".

دکتۆر ڕۆس لەبارەی چەکی سەربازە شەڕکەرەکانەوە دەڵێ: "چەکی سەربازی پیادە تفەنگ و خەنجەر و چەکی سەربازی سوارەش ڕم و خەنجەر بوو".

تۆپە گەورەکانی دەستکردی وەستا ڕەجەبیش لە کاتی گرتنی قەڵای شارەکان بەکار دەهاتن. دوای تەواوبوونی ئەرکەکەی دکتۆر ڕۆس لە ڕۆژی ٨ی تەمووزی ١٨٣٣دا بەرێگای مووسڵ گەڕاوەتەوە بەغدا و وەختێک لە مووسڵ نزیک بۆتەوە هەستی کردووە خەڵکەکە ڕووت و ڕەجاڵن و داوای بەخشیش لە ڕێبواران دەکەن، لەوەوە تێدەگا، کە لە وڵاتی میرنشینی سۆران دەرچووە و کەوتووەتە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی حکوومەتی والی بەغدا، کە ئەوساکە ولایەتی مووسڵ خرابووەوە سەر ولایەتی بەغدا.

لەمەوە بۆمان دەرکەوت، کە ژیانی کورد لە ژێر دەستەڵاتی حوکمی محەمەد پاشا گەلێک خۆشتر بووە لە ژیان و گوزەرانیی ئەو خەڵکانەی کەوتبوونە ژێر دەسەڵاتی حوکمی والی عوسمانی، کورد چاکتر حوکمی وڵاتی خۆی دەکرد و شارستانیتر بوو لە چاو ئەو میللەتەی، کە لە ژێر چەپۆکی ڕاستەوخۆی دەوڵەتە دواکەوتووەکەی عوسمانیدا بوو.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری (مێرگ) ژمارە (١٨)ی ساڵی ٢٠٠٦ وەرگیراوە.

# گەشتەکەی (نیبور) بۆ هەولێر لە سەدەی هەژدەمدا

هۆشیار محەمەدئەمین کۆیی

(نیبور) لە ساڵی ١٧٦١ی زایینی لەسەر ڕاسپاردەی پادشای "دانیمارک" (فردریکی پێنجەم) لەگەڵ لێژنەیەکی زانستیی هەمەجۆر ئەم گەشتەی ئەنجام داوە و ناوی خۆی ناوە (عەبدوڵڵا)، بۆ ئەوەی لە گەڕانەوەی تووشی گرفت نەبێ. لەو گەشتە زانستییەدا ئەندامانی لێژنەکە گیانیان لە دەست داوە و تەنیا (نیبور) ماوەتەوە. لە بەشێکی کتێبەکەیدا باسی ناوچەی هەولێر دەکا و نووسیوەتی:

### کۆیسنجق
### - ئادار ١٧٦٦ی زایینی

بنکەی پادشایەکی کوردە، کە سەر بەپادشای بەغدایە، دوازدە کاتژمێر لە ئاڵتوون کۆپری دوورە، پێش چەند ساڵێک هەولێر و ئاڵتوون کۆپری سەر بەکۆیسنجق بوون، بەڵام ئێستا فەرمانڕەوای بەغدا، دەسەڵاتداری هەولێری




ڕاسپاردووە بۆ ئەوەی کاتی پێویست ئاغایەک بۆ ئاڵتوون کۆپری دابنێ.

### قوشتەپە

بەناوی گردێکی بچووک کراوە. لەو گوندە بۆ یەکەم جار ژنێکی موسڵمانم دیت، کە بەڕێکوپێکی نوێژ دەکا، چونکە زاناکانی ئەورووپی بیروڕای جیایان

هەبوو دەربارەی بەجێگەیاندنی ئەرکەکانی ئیسلام لەلایەن ژنان و دواتر بۆیان ڕوون بۆوە، چونکە بەهەشت هیچ جیاوازییەکی بۆ ژن و پیاو نییە.

گوندی (قوشتەپە) بە (خانی عادیلە) ناو دەبرێ، خاکی ئەو ناوچەیە زۆر بەپیتە، پێش چەند ساڵێک بیابانێکی وشک و چۆڵ بوو، تەنیا هەندێ جار کوردەکان لە هەندێ کاتی ساڵدا بەو ناوەدا دەگەڕێن.

(ئەحمەد پاشا) فەرمانڕەوای بەغدا، فەرمانی دا بە لێدانی بیرێکی ئاو و دروستکردنی خانوویێک بۆ پشوودان لەو شوێنەدا، بەتایبەتی بۆ تەتەرەکان و فەرمانبەرانی پۆستە، کە کارەکەیان ساناتر دەبێت، کچەکەشی (عادیلە خاتوون) خانێکی بۆ حەسانەوەی ڕێبوارەکان دروست کرد. دواتر ( ئەحمەد پاشا ) فەرمانێکی دەرکرد بە

ڕێپێدانی هەر کەسێک، کە دەیەوێ لە دەوروپشتی گوندەکە نیشتەجێ بێ و کاری کشتوکاڵ بکات، پاش ماوەیەکی کورت بووە گوندێکی گەورە.

ئەمەش شتێکی سانا بوو بۆ ئەم پاشا تورکە بۆ ئەوەی ئەو کۆچەرانەی سەر بەون نیشتەجێیان بکا و سوود لە بەرهەمەکانیان لە کشتوکاڵ وەربگرێ، بۆ ئەوەی ولات پێش بکەوێ. بەلام مانەوەی ئەو پاشایە لە فەرمانڕەوایی زۆر کورت بوو، بۆیە زیاتر خەریکی بەرژەوەندیی تایبەتی خۆی و کۆکردنەوەی سامان بوو، کە ئەمەش دەبێتە هۆی بایەخنەدانی ئەو جۆرە پادشایانە بە چاکسازی لە ولات و خۆشگوزەرانیی خەڵک، جگە لەوەی جووتیار و هەژاریش پەراوێز دەکرێ، بۆ ئەوەی جەربەزەکان لە عەرەب و کورد لەو ناوە بسووڕێنەوە و بەرهەمەکانیان بەتالان ببەن و ڕووتیان بکەنەوە. بۆیە ولایەتەکانی عوسمانی لە خراپ بەرەو خراپتر دەچێ.

**هەولێر**

لە ڕۆژی چواردەی مانگ سێ میل و نیومان بڕی تا گەیشتینە (هەولێر)، ئەو شارە (ئەربیلا)یە، کە شەڕەکەی ئەسکەندەر و دارای لێ ئەنجام درا.

ئەو شارە (میرنشین)ی لێ بووە، کە بۆ ماوەی سالانێکی زۆر فەرمانڕەواییان پشتاوپشت بۆ مایتەوە و بەتوانا و بەهێز بوون. ئەم میرنشینانە سەردەمێک میرنشینییان فراوانتر کرد و گەیشتە ولاتی فارس تا (تەبریز).

شارەکە جاران زۆر فراوان بوو، قەلایەک لەسەر گردێکی بڵند دروست کرابوو، بەلام ئێستا قەلاکە بێ شوورەیە، خانووەکانی ڕۆخیشی زۆر لە پاڵ یەکن، لەبەرئەوە چوونە ناو قەلا تەنیا بە دەرگایەک دەبێ، لە خوارەوەی قەلاکەش چەند خانوویێکی خەڵکی هەژار هەیە.

لە هەولێر شوێنەوار تەنیا پاشماوەی ئەو مزگەوتە دیارە، کە لە قەلاکەوە دوورە و لە ناو زەوییەکی کشتوکاڵییە و لە پاشماوەکانی سوڵتان مزەفەر و منارەکەی، کە لە تەنیشت مزگەوتەکەیە بە خشتی سوور و قسڵ دروست کراوە، دوو شوێنی چوونە ژوور و سەرکەوتنی هەیە، کە بەسانایی دەتوانی بەسەر بکەوی، بێ ئەوەی کەسەکەی دیکە ببینی.

هەولێر لەسەر هێڵی پانی ٣٦ و ١١ خولەکە و سەر بەفەرمانڕەوایی بەغدایە و سەربازگەیەکی پارێزگاری بەهێزی لێیە لە (یەنیچەری)[1] قوستەنتینییەیە.

زەوییەکانی هەولێر وەک بەغدا و بەسرە بە ئاوی ڕووبار و جۆگە ئاو نادرێن.

گەنم دە هەندەی خۆی بەرهەم دەهێنێ و لە پازدە هەندەی خۆی لە سالی زۆر بەپیت تێپەڕ نابێت. ئەو گەنمەی بەباران ئاو درابێ لەو گەنمەی، کە بەڕووبار ئاو درابێ بەتامترە و بەرهەمیشی زیاترە و ئاردەکەشی باشترە. بەرهەمی بەغدا بیست ئەوەندەیە، لێرە بۆ ئاودان پشت بەباران دەبەسترێ. لە کاتی چاندنی گەنمەکە زۆر بەچڕی دەچێنرێ، لەبەرئەوە بەلاوازی و بەیەک کات پێ ڕاناگا، زۆربەیان وشک دەبێ و چۆلەکە دەیانخوا.

زۆربەی ئەو کاروانچییانەی لە کەرکووکەوە یاوەرمان بوون، هەولێر دوا شوێنیان بوو، گوێبیستی ئەوە بووین کە کاروانێکی دیکە بەڕێ دەکەوێ، لەبەرئەوە لە ١٦ی ئەم مانگەدا لە کاتێکی زوو لەگەڵ ئەوان بەڕێ کەوتین، پاش ڕۆیشتنی نۆ کاتژمێر و بڕینی پێنج میل و نیوی ئەڵمانی[2] گەیشتینە زێی گەورە، کە لە چیاکانی (هەکاری) ولاتی کوردستان هەڵدەقوڵێ.

**پەراوێزەکان:**

١- بە مانای سوپای نوێ

٢- میلی ئەڵمانی لە میلی ئینگلیزی درێژترە، کە نیبور لە نووسینەکەیدا بەکاری هێناوە.

وەرگێرانی لە ئەڵمانییەوە:
د.مەحموود ئەمین حوسێن بەغدا / ١٩٦٥

# هاملتۆن، ئەندازیاری پردی (گەلی عەلی بەگ)

نەژاد عەبدوللا عەزیز

لە میانەی خوێندنم، لە زانکۆ، کۆلێژی کشتوکاڵی، لە شاری (پەنجاب) لە پاکستان، هۆڵێکی تایبەت هەبوو لەو کۆلێژە، بۆ بەستن و گێڕانی کۆڕ و کۆبوونەوەکانی گشتی. ئەو هۆڵە ناوی ژمارە (٤) بوو. من زۆر بەکەمی دەچوومە ئەو هۆڵە، لەبەر نەبوونیی پەیوەندی لە نێوان پسپۆڕی خۆم، وەکو کشتوکاڵی و ئەو کۆڕانەی لەوێ دەبەستران، کە تایبەت بوون بە (کۆماری پاکستان)، پاکستانییەکان خۆیان خاوەنی ئەو مەسەلەیە بوون بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ.

ڕۆژێک لە ڕۆژەکانی ساڵی (١٩٦٠)، یەکێک لە برادەرانم ئاگاداری کردمەوە، کە ئەندازیارێکی بەریتانی ناسراو بە ناوی (ئەی. ئەم. هاملتۆن)، لە هۆڵی ژمارە (٤) لەبارەی پرد و ڕێگاوبانەکانی جیهاندا کۆڕێک پێشکەش دەکا کە خۆی دایەزراندوون و دروستی کردوون. منیش دیسان، لەبەرئەوەی بابەتی کۆڕەکە دوور بوو لە بایەخدانی خۆم، ئەوەندە گرنگیم بەو هەواڵە نەدا، بەڵام لەبەرئەوەی حەزم کرد سەیری ئەو وێنانە بکەم کە لەسەر


هاملتۆن

دیواری دەرەوەی هۆڵەکە هەڵواسرا بوو و تایبەت بوون بەبابەتی کۆڕەکە، کە وێنەی پردەکان بوو لە جیهاندا، لە نێوانیاندا وێنەیەک کەوتە بەرچاوم و لە ژێری ئەو دێرە نووسرا بوو: (پردی گەلی عەلی بەگ لە کوردستانی عێراق)، لەبەر سۆزی گەرمم بۆ کوردستان، بڕیارم دا لەو کۆڕە ئامادە بم و گوێی لێ بگرم.....

لە کاتی دیاریکراودا، لە هۆڵەکە ئامادە بووم، سەیرم کرد پیاوێکی ڕێکوپێک و گران لە پشت دووانگەکە دانیشتووە. تەمەنی لە (٨٠) ساڵ زیاتر بوو و چاویلکەیەکی پزیشکیی لە چاو بوو و هەندێ وێنە و پەڕە کاغەزی لە دەست بوو، دەستی بەپێشکەشکردنی کۆڕەکەی خۆی کرد، باسی لە گرنگترین وێنەی

پردەکان کرد، بەتایبەتی ئەوانەی خۆی لە ناوچەکانی ئاسیا و ئەفریقیا دروستی کردبوون بەشێوازێکی نوێ، لە دوایی باسی لە پردی (گەلی عەلی بەگ)ی ڕێگای حاجی ئۆمەران کرد، دوای تەواوبوونی کۆڕەکە، دەرفەتی دا بۆ پرسیارەکان....

منیش داوای هەندێ ڕوونکردنەوەم لێ کرد لەبارەی (پردی گەلی عەلی بەگ)، پرسیاری لێ کردم : تۆ ڕەگەزت چییە ؟

وەڵامم دایەوە و گوتم من کوردی عێراقم، لە جێگای خۆی هەڵسا و بۆ لای من هات و باوەشی پێدا کردم و بەئامادەبووانی گوت: (ئەو گەنجە یەکێکە لە گەلێکی چەوساوە، کە یەکێکە لە گەلە ڕەسەنەکانی جیهان، کوردەکان نموونەی ئەخلاق و وەفاداری و زۆر ڕێز لە میوانانی خۆیان دەگرن...)، لە دواییش داوای لێ کردم لە ناو هۆڵەکە بمێنمەوە هەتا ئەو کاتەی لە کۆڕەکەی تەواو دەبێ، لەبەرئەوەی حەزی دەکرد لەبارەی هەندێ شت و کەسایەتی لە کوردستان پرسیارم لێ بکا لەبارەی هەندێ کەس کە پەیوەندیی برادەری لەگەڵیان هەبوو، وەکو (عەتاوڵلاغا) و(داود ئاغا) و (قادری میران بەگ) و (ڕەشید میران بەگ) و (خزر ئاغای سوورچی) و (ئیسماعیل بەگی ڕواندزی) و (نووری باویل ئاغا) و(حوسێن حوزنی موکریانی) و (ڕەمزی مەعرووف) و (مەتران حەریر) و شوفێرێکی ئەرمەنی ئێستا ناوەکەم لە بیر نەماوە و هی تریش... لە دواییشدا دەربارەی ئایا دوکانی فیلان یان چایخانەی فیلان لە کوردستان هەتا ئێستا ماوە.....

کاتێک پرسیاری لێ کردم، فرمێسک لە چاوی دەهاتە خوارەوە و گوتی: (هیچ گەلێکم نەدیوە وەک گەلەکەتان باش و بەوەفا، قەد ئەو ڕۆژە جوانانە لە بیر ناکەم، کە لە کوردستان بەسەرم بردووە، لە دوای باسی چۆنیەتیی دروستکردن و کردنەوەی ڕێگای هەولێر- ڕواندز و ئەو زەحمەتی و تەگەرانەی تووشی بوو لە کاتی جێبەجێکردنیان)، هەروەها گوتی: وەک ڕێزلێنان لەگەڵ کوردستان، کتێبێکم نووسی (بە ناونیشانی- طريق في كوردستان)، بەڵێنی پێ دام نوسخەیەک لەو کتێبەم بۆ بنێرێ، دوای گەڕانەوەی بۆ بەریتانیا، بەڵێنی خۆی جێبەجێ کرد و نوسخەیەکی لە ڕێگەی پۆستە بۆ ناردم و بەواژووی خۆی واژووی کردبوو، لە دواییشدا پێشکەشی کتێبخانەی (المجمع العلمي الكوردي) لە بەغدام کرد، وەکو بەشدارییەکی خۆم بۆ دەوڵەمەندکردنی. بەڵام ئەوەی زۆر گرنگە، کە مستەر هاملتۆن پێی گوتم، ڕاسپاردەی کردووە، دوای مردنی لە کوردستان بیشارنەوە، لەبەرئەوەی دەترسا نەوەک وادەکە جێبەجێ نەکەن، بۆیە حەز دەکا هەندێ خۆڵی کوردستانی بۆ بنێرن، بۆ ئەوەی لەگەڵی بیشارنەوە لە کاتی مردنی لە وڵاتی خۆیدا.

دوای گەڕانەوەم بۆ کوردستان، ئەوەی ویستی و داوای لێ کردم، بۆیم جێبەجێ کرد، هەندێک لە خۆڵی کوردستانم، بە تایبەتی خۆڵی (گەلی عەلی بەگ)م بۆ ڕەوانە کرد... لە دواییشدا زانیم، کە ئەو ئەندازیارە بەریتانییە بەناوبانگە لە (لەندەن) کۆچی دوایی کرد و هەر لەوێش شاردراوە.

ئەو پیاوە چاکە برادەرێکی دڵسۆزی گەلی کوردە و دیعایەکی گەورە بووە بۆ کوردستان.

**و: نەجات خۆشناو**

# هەولێر لە گەشتەکەی (ئولیڤییە)وە ١٧٩٤-١٧٩٦

هۆشیار محەمەدئەمین کۆیی

گەڕیدەیەکی فەرەنسییە لە زۆر ناوچەی دەوڵەتی عوسمانیدا گەڕاوە و لە ساڵی ١٧٩٤دا سەردانی هەولێری کردووە و نووسیویەتی:

پاش ڕۆیشتنی چوار کاتژمێر و چل و پێنج خولەک گەیشتینە (عینکاوە)، کە دانیشتوانەکەی لە کورد و سریان و کاتۆلیک پێکهاتووە، ئەوانە پەرس و ئامۆژگاری لە ئاغایەکی کورد وەردەگرن. زەوی لە زێی گەورە تا ئەو گوندە تەخت و زۆر بەپیتە، زۆربەشی چێندراوە، ئەمە جوانترین دەشتە، کە لەو ناوچەیەدا چاومان پێ کەوتبێ.

(ئولیڤییە) باسی شەڕەکەی ئەسکەندەر و داریوش دەکا، کە لە دەشتی هەولێر ڕووی داوە.

**قەڵای هەولێر**

لە ٢٧ی نیسانی ساڵی ١٧٩٤دا عینکاوەمان جێ هێشت، پاش نیو کاتژمێر بە بەشی خوارەوەی هەولێر تێپەڕ بووین. هەولێر لەسەر گردێکی دەستکردی بڵند دروست کراوە و سەرەوەی تەختە و لەمەوپێش هەروەک ئێستا قەڵا بووە. شوورەیەکی کۆنی بەدەوریدایە، ئەو گردە زۆر بڵندترە لە گردەکەی (حەلەب) و ئەوانەی دیکە، کە لەو وڵاتەدا دیومانن. کە سەیری دەکەی بڕوا ناکەی کە ئادەمیزاد دروستی کردووە، گردەکە زۆر لێژ و بە گیاوگۆڵ داپۆشراوە، لە خوارەوەی گردەکە چاڵێک هەیە، کە هەندێکی پڕ کرابۆوە، بەشەکەی دیکەی شارەکە لەو دەشتەی کە لە خوارەوەی گردەکەدایە، ژمارەی دانیشتوانی ئێستای هەولێر دوو هەزار کەسە، هەموویان نزیکەی کورد و کلدانن، وا دیارە پێشتر ئەو شارە زۆر گەورەتر بووە لە ئێستا و پانتاییەکی لەو دەشتە داگیر کردووە، هەندێ کەلاوەی کۆنی لێیە.

لە دەرەوەی شار بەرزاییەکی چوارگۆشە هەیە، وا پێ دەچێ منارەیەکی سەردەمی خەلیفەکان بووبێ، (نیبور) دەڵێ: سوڵتان (مزەفەر) دروستی کردووە، ئەو منارەیە لە خشت و گەچ دروست کراوە و، بە دوو پلیکانی نزیک یەکتر بەسەر دەکەوی.

هەولێر سەر بە فەرمانڕەوایی بەغدایە و ئاڵا و هێزێکی فەرماندەی سەربازی بەرگریی (ینکشریە)ی هەیە، کە سەر بە (قوستەنتنییە)ن.

# هەولێر لە نامەی الحوادث الجامعة والتجارب النافعة

ئامادەکردن و وەرگێڕانی: هادی رەشید چاوشلی

کە (ابن الفوطي) دەربارەی هەولێر لەلاپەڕە ٩٨ نووسیویەتییەوە، گوتوویەتی: لە ١٧ی شەوالی ٦٣٤ کۆچی هەواڵ گەیشتە اربل کە مەغۆلەکان دەرەوەی شاریان گرتووە و دەیانەوێ شارەکەش بگرن. سەرتاپای دانیشتوانی شار سەنگەرەکانیان پتەو کرد و خەندەقەکانیان پاک کردەوە. میری شارەکە و زانای دین فتوایان دا کە ساڵی ناوبراو و پاراستنی شار دەبێ بکرێ و ئەو کەسانەی دەیانەوێ بچنە حەج، دەبێ سەفەرەکەیان دوا بخەن بۆ ساڵی داهاتوو. مەغۆلەکان هێرشیان هێنایە ناو شار بە لەشکرێکی زۆرەوە و مەنجەنیقیان دامەزراند بەرامبەر شوورە سەختەکەی اربل. توانییان بەشێکی برووخێنن و لەشکریان داخلی شارەکە بوو و دانیشتوانی دەشتەکە هەموویان روویان کردە قەڵای هەولێر و قەڵاکەیان بەند کرد بەرامبەر بەدوژمن. لەسەر قەڵا لەشکری کورد بەرامبەر لەشکری دوژمن وەستا شەڕیان بەتوندی کرد هەرچەند مەغۆلەکان خوارەوەی شاریان ویران کرد و سووتاندیان لە قەڵاوە بەمەنجەنیق بەرامبەر بەو پەلامارەی مەغۆل وەستان و زۆربی لەشکری دوژمن خەریک بوو قەڵا بگرن بەڵام بۆیان نەکرا. هەروەها چەند مانگێک بەمجۆرە نەیانهێشت دوژمن قەڵا بگرێ.. هەتا سەربازی (خلیفە) لە بەغداوە بەرێ کەوت بۆ یارمەتیی خەڵکی هەولێر، بەڵام لە پێش گەیشتنی لەشکری (خلیفە) دوژمن گەڕاوە دواوە.

*** هەولێر لە نامەیەک لە بابەت (مێژووری ئاشوورییەکان)دا:**

کە لە بەیرووت چاپ کراوە لە لاپەڕە ١٠٣-١٠٤ دەربارەی شاری هەولێر باس دەکا. لەو نووسینە بەشێکی دەنووسین: (دکتۆر سکانا) دەڵێ: شاری ئەربل رۆڵێکی گەورەی لە زەمانی کۆتا بووە لە سەروو و خوارووی دیجلە.. زۆر کەس لە کۆندا زەردەشتی بوون لە سەدەی یەکەمی کۆچی بوونەتە مەسیحی، ئەمانەش زۆریان بازرگان و صنعەتکاری تر بوون وەک ئاسنگەر و جووڵا و دارتاش... هەروەها ئەربل بووە مەرکەزی ئایینی مەسیحی.

لەم نووسینەدا وا دیارە کە وڵاتی هەولێر و شارەکەی لەسەر ئایینی زەردەشتی بووینە و لەسەدەی یەکەمی میلادی هەندێ لە زەردەشتییەکان ئاینیان بوویتە مەسیحی و ئەوانی تر هەر بە زەردەشتی ماونەتەوە و لە نووسینی نووسەرەکانی تردا دەردەکەوێ، کە ئایینی ئیسلام لە وەختی (خلیفة عمر بن الخطاب) بڵاو بووەوە، ئەوە لە وڵاتی کوردستان زەردەشتییەکان هەموو ئیسلامیان قبووڵ کردووە لەم وڵاتەدا و مەسیحییە کوردەکان زۆری بوونە ئیسلام و هەندێکیان لەسەر ئایینی مەسیحی ماون تا ئەمڕۆ.

*** هەولێر لە نووسراوی (ارض الخلافة الاسلامية):**

جوگرافییەک کە لە کەمبردج نووسراوە لە لاپەڕە ٩٢ لە بابەت هەولێردوە هاتووە (ئەم شارە کۆنە بە ئەربیلا ناو براوە دەکەوێتە بەینی زێی گەورە و زێی بچووک، لە کۆندا رێگای کاروانی بازرگانی بووە و قەڵایەکی سەخت و مەزن هەیە کە لەسەر گردێکی زۆر گەورە دروست کراوە و لە چواردەوری شوورە و خەندەق هەیە. لە ناو قەڵا بازاڕێکی بووە لە زەمانی خۆیدا کۆنترین مزگەوت لەم شارە بە مزگەوتی (دەست پەنجە) ناو براوە کە لەسەر بەردێک وێنەی دەستی هەڵکەنراوە مزگەوتی (پێنج ئەنگوستە).

لە چەرخی حەوتەمی پاش عیسا ئەم شارە زۆر پێشکەوتووە وردە وردە گەورە بووە، ئەم شارە بەکشتوکاڵ بەناوبانگ بوو و خەلە و دەغڵودانی

زۆری تێدا کۆ کراوەتەوە.

*** هەولێر لە روانگەی رۆژهەڵاتناسی هۆڵەندی مالیبارد**

دەربارەی شاری هەولێر لە نووسراوی خۆی باسی دەکا و دەڵێ: ئەو شارە کۆنانەی کە لەسەر زەمین بووینە هەموو وێران بوون تەنیا شاری هەولێر یەکێکە لەو شارانە کە لەگەڵ چەرخەی فەلەک سووڕاوە و ئەم شارە مەزنە بەرامبەر هەموو کارەسات و فەلاکەت بەرانگیر بووە و راوەستاوە. بەلای کەمەوە دەتوانین بڵێین (٥) چەرخی زەمانەی دیوە و لە (تەورات) بە ئەربائیلا ناوی هاتووە. ئەم شارە پیرۆزە کە بەدیمەنی شوورەکان و قەڵا شاناز و سەربەرزە وەک شێرێکی پۆڵا لەسەر بناغەی عەرد دروست بووە کە بەرزایی لە ٣٠ مەتر پترە و چواردەوری دەشت و هەردێکی بەرین و گەورەیە.

لە شوێنێکی سەخت و زۆر قەڵا لەسەر گردەکان کە زۆر لە مێژوونووسان دەڵێن ئەو گرد و تەپۆلکانەی دەورپشتی لە وەختی خۆیدا سەنگەری شەڕ بووە بۆ پاریزگاریی هەموو پەلامارێکی بێگانە.

ئێمە نازانین و نەماندیوە هیچ شارێک یا شاخێک بەرامبەر بە دەورانەی فەلەک ٥ چەرخ مابێ وەک شاری هەولێر بەو سەربەرزییەوە لە جێی خۆی بلند و ئەم چەند زەمانەوە و بڵێی تازە دروست کراوە. ئێستا دەبینی کە دیوارەکان چەند گەز پانە و دەرگاکانی زۆر تاریکە دەڵێی ئەم شارە هیچ نەگۆڕاوە و هیچی بەسەر نەهاتووە. لەگەڵ ئەمەشدا شاری هەولێر تازە کە بەخوار قەڵاوە دروست بووە لەسەر نەخشە، تازە ئەویش یەکێکی بێگانە سەر لە رێگا و شوێنی دەرناکا.

ئەم شارە مێژووییە لە پێش ئاشوورییەکان مەڵبەندی ئایینی و دیانەت بووە هەرچەندە شارە ئاشوورییەکان ئێستا خاکیشیان نەماوە وەک نەینەوا و نەمروود کەچی هەولێر کە زۆر لەوان کۆنترە لە شوێنی خۆیدایە (وا دیارە شوورا سەختەکانی ئەم شارە چاوی هەموو پەلاماردەرێکی شکاندووە و رێی نەداوە نزیک کەونەوە، ئەوانەی کە لە نەخشە و شتی کۆن باسی دەکەن یا لە خاک دەکۆڵنەوە بۆ زانینی مێژووی کۆن زۆر شتی نایابیان بەدەست هێناوە لە دەوراوپشتی ئەم شارە، هەندێ لەم شتانە دەتوانین بڵێین کۆنە مێژووی دەگەرێتەوە بۆ پەیدابوونی ئادەمی لەسەر رووی زەوی.

چەند بیرێکی قووڵی تێدایە لە کۆنەوە ماوەتەوە و وشک نەبووە و ئاوی لێ نەبڕاوە، سەلاحەدین ئەو قارەمانەی کە شەڕی لەگەڵ سەلیبییەکان کردووە لەم شارە گەورە بووە و چەندین قارەمانی تر لەم شارەدا لە مێژوودا هەر کاتێ توانیویانە پەلاماری هەر شوێنێکی سەخت بدەن و بیەتە دەست، بتوانن شار و وڵاتی خۆشیان لە هەموو هێرشێکی بێگانە بپارێزن. مەغۆل بەهەموو هێز و جەربەزەییانەوە نەیانتوانی ئەم شارە یەخسیر بکەن هەرچەند زۆر لە شار و وڵاتانی تریان داگیر کرد و زۆریان وێران کردووە ئەم شارە هەتا ئێستا لەسەر پایەختی کوڵکەی گردەکەی دانیشتووە و دانیشتوانی هەر کاتێ بێ ترس لە هەزارەها پشتەوە هەتا ئەمڕۆ..).

لە نووسینی ئەو رۆژهەڵاتناسە ئەورووپییە دەردەکەوێ کە شاری هەولێر وڵاتی ناودارانی مێژووە و زۆر قارەمانی پێ گەیاندووە، مێژووی هێندە کۆنە زۆر کەس نازانن و چەند کەسێ لەو قارەمانانەی کە شایانی شانازی بوون لە هەر دەمێکدا ناو دەبەین وەک (خەلیفە سەلاحەدین ئەیوبی) و شای کورد مزەفەرەدین و میری کوردستان محەمەد پاشای رواندزی و زۆر کەسی تر.

*** هەولێر لە نووسراوی مامۆستایان محەمەد هادی دەفتەر و عەبدوڵلا حسەن**

لە نووسراویان (عێراقی سەر و دایر بە هەولێر دەڵێن) ئەم لیوایە لە مێژووی کۆندا زۆر باس کراوە و لە خاکی ئەم ناوچە شەڕی فارسەکان و مادییەکان (کوردەکان) چەند جار رووی داوە و هەروەها لە نزیک ئەم شارە شەڕی دارا و ئەسکەندەر بەهەموو هێز بەرپا بووە و زۆر شەڕ و ئاشووبی تر لە نێوان هۆلاکۆ و تەیموورلەنگ و ئیسلامەکاندا رووی داوە. وڵاتی هەولێر بەناوی شارە گەورەکەی هەولێر (ئەربیل) ناو دەبرێ و دەڵێن ناوی کۆنی (ئەربائیل) بووە لەم شارەدا قەڵایەکی زۆر کۆن هەیە و کەس نازانێ ئەم شارە چ وەختێ دروست کراوە و بنیاتی کێیە زۆر لە مێژوونووسان دەڵێن: ئەم شارە لە نەینەوا و بابل کۆنترە.

* هەولێر لەگەڵ کاروانەی فەلەک، هادی رەشید چاوشلی، چاپخانەی الجاحظ، بەغدا، ساڵی ١٩٨٧، یادەوەریی رۆژانە، نووسینی خوالێخۆشبووە بە خستنە سەر رێنووسی نوێ، بەیادی رۆژانی چاوشلی بڵاومان کردەوە.

# هەولێر لە ساڵی ١٥٧٤دا

راوولف پزیشکێکی هۆڵەندییە. ساڵی (١٥٧٣)ی زایینی گەشتەکەی دەستی پێ کرد بە مەبەستی کۆکردنەوەی گیا و درەخت بۆ بەکارهێنانی لە بواری پزیشکی... ئەو گەشتە ساڵی (١٥٨١)ی زایینی بەزمانی ئەڵمانی لە (لیدن) و ساڵی (١٦٩٣)ی زایینی، بەزمانی ئینگلیزی لە لەندەن چاپ کراوە و لە ساڵی (٢٠٠٨)ی زایینی (د. سەلیم ئەحمەد خالید) لە ئینگلیزییەوە وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی و لە لبنان چاپ کراوە.

راوولف لە ٢٦ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٥٧٤ی زایینی دەگاتە کەرکوک، لە ٣٠ هەمان مانگدا دەگاتە پردێ و دواتر نووسیویەتی: لە کۆتایی کانوونی یەکەم بەناو زەوییەکی چێندراودا رۆیشتین و بۆ شەوەکەی گەیشتینە شاری هەولێر، هەولێر شارێکی گەورەیە، بەڵام خانووەکانی نزمن و بە شووردی لاواز دەورە دراوە، لەبەرئەوە بێ زیان داگیر دەکرێ و هێزی زۆریشی ناوێ.

تا رۆژی شەممە کە رێکەوتی یەکەم رۆژی ساڵی نوێ بوو لە حەسانەوە و پشوودان‌دا بووین.

هاوکات ئەو هەواڵەم زانی کە پێش چەند رۆژێکی کەم فەرماندەی لیوای تورکی لە شارەکە هەشت تاوانباری گەورەی لەسێدارە دا و ئەوانەی جەردەیی و تاڵانکردن و تاوانی کوشتنیان لە رێگای گشتی ئەنجام دەدا، ژمارەیەکی زۆری تر لەو چەتانە لە ناوچەکەن لەسەر سنووری ئەرمینیا، ئەوانە خەڵکی ناوچەی شاخاوین لەبەرئەوە گەشت بۆ ئەو شوێنانە کارێکی ترسناکە.

بەهۆی پەیوەندیی خراپی نێوان تاوانباران و چەتەکان، بارودۆخەکە نائارام بوو. فەرماندەی لیوای تورکی بۆیە ئەو فەرمانەی دەرکرد، نەوەک ئەو تاوانبارانە زیانی پێ بگەیەنن، چونکە هەواڵگریی باشی هەبوو، لە نیازیان گەیشتبوو و پاش ماوەیەکی کەم فەرمانەکەی بۆ سوڵتانی تورکی لە ئەستەنبوڵ نارد.

ئەو فەرماندەیە هیچ پارە و سامانێکی لا نەمابوو تا خۆی لەو کۆمەڵە چەتانە بپارێزێ، لەبەرئەوە لە بازرگانێکی دەوڵەمەندی ئەرمەنی قەرز کرد کە تازە گەیشتبووە هەولێر بۆ کڕینی ٣٠٠ هۆقە مازی کە لە هەولێر زۆرە، بەڵام چەتەکان لەو بازرگانە پەست بوون و ژیانی کەوتە مەترسی و هەڕەشەیان لێ کرد، ئەویش ناچار بوو کە مانەوەکەی درێژتر بکاتەوە تا کاروانێکی گەورە رێک دەکەوێ ئەویش بەئارامی گەشتەکەیان لەگەڵ بکا.

لە ٥ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٥٧٥ی زایینی هەولێرمان جێ هێشت و بازرگانە ئەرمەنییەکەش خۆی گەیاندە کۆمەڵەی کاروانی گەشتەکەی ئێمە کە بار و کەلوپەلێکی زۆرمان لەگەڵدا بوو، تەنیا ئەو باری پەنجا کەر و وڵاخی مازی لەگەڵدا بوو کە بۆ (ئامەد)ی دەبرد، کە شاری خۆی بوو و دواتر بۆ حەلەبی بنێرێ، چونکە بازرگانەکانی ئەوێ داوایان دەکرد بۆ ئەوەی بۆ وڵاتی ئەورووپای خۆمانی بنێرن.

دواتر رۆژ و نیوێکمان بە رۆیشتن بردە سەر بەبێ ئەوەی هیچ خواردن و خواردنەوەیەک بخۆین، لە نیوەی شەو بۆ حەسانەوە وەستاین.

ئەو کاتەی مابۆوە لەو شەوە بۆ خواردن و خواردنەوە بۆ خۆمان و وڵاخەکانمان تەرخان کرد، بەدەرکەوتنی رووناکی دەستمان کرد بە رۆیشتن بەسەر زەوییەکی چێندراوی بەپیت، دواتر گەیشتینە زێیەکی تر کە بتلیمۆس بە (کابروس)ی ناو بردییە (مەبەستی زێی گەورەیە -و-)، هەرچەندە فراوان نەبوو، بەڵام زۆر قووڵ بوو، دەبووایە بۆ پەڕینەوە شتێک ئامادە بکەین، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کە زۆر وریا بم و پارێزگاری لەو درەختانە بکەم کە کۆم کردبۆوە و لە پێش خۆم لەسەر ئەو ئەسپەی کە سواری ببووم دامنابوون.

تێبینی: وەک دەردەکەوێ لیونهارت راوولف لەم گەشتەیدا لە چاوی دەسەڵاتدارە تورکەکان سەیری خەڵکەکەی کردووە، هەر بۆیە بەشێوەیەکی گشتی خەڵکەکە بە (چەتە و تاوانبار) ناو دەبات، لەوەش کە دەنووسێ: (چەتەکان لەو بازرگانە پەست بوون و ژیانی کەوتە مەترسی و هەڕەشەیان لێ کرد، ئەویش ناچار بووە کە مانەوەکەی درێژ بکاتەوە...) لەم کورتە پەرەگرافە بۆنی ئەوەی لێ دێت کە بەرژەوەندی و سیاسەت تێکەڵی ئەو بازرگانییە بووە و (چەتە!)کانیش لایەنێکی سیاسەت و بەرژەوەندی و بازرگانییەکە بوونە، هەروەها لە سێدارەدانی (هەشت تاوانبار) ناکرێ تەنیا وەک چەتە و تاوانبار قبووڵیان بکەین، کە من زۆرتر بۆ ئەوە دەچم ئەم لەسێدارەدراوانە سەرکردەی گەورەی جۆرێک بەرگری بن، هەتا ئەگەر بەرگریی عەشایەریش بێت. (ئـ. هـ).

و: هۆشیار محەممەدئەمین کۆیی

# هەولێر لە گەشتەکەی (المنشئ البغدادي)

هۆشیار محەمەدئەمین کۆیی

ناوی محەمەد کوڕی سەید ئەحمەدی حوسەینییە و محەمەد ئاغای فرسیشیان پێ دەگوت، کەسێکی ئێرانییە بە (المنشئ البغدادي) ناسراوە، لە سەردەمی فەرمانڕەوایی (داود پاشا) لە بەغدا فەرمانبەر بووە لە قونسولگەری بەریتانیا لە بەغدا، لەو سەردەمەی کە میستەر (ریچ) قونسولگەری بەریتانیا دەبێ لە بەغدا، ساڵی ١٨٢٠ گەشتێک بۆ کوردستان دەکا و کۆمەڵێک فەرمانبەری قونسولگەری لەگەڵ خۆی دەبا، لەوانە (المنشئ البغدادي) بووە، کە بیرەوەریی خۆی تۆمار کردووە و دەربارەی ناوچەی هەولێر نووسیویەتی:

**کۆیسنجق**

شارێکی خۆشە و چوار هەزار ماڵە. قەڵایەکی قایمی لێیە، هۆز و تیرەکانی بە ژمار نایەت، هۆزەکانی کۆیە تا شاری (خۆی) لە ئێران درێژ دەبێتەوە، لەولاشەوە بۆ شاری (هەولێر). کشتوکاڵیان تووتن - گەنم - ترێ- و میوەی ترێشی زۆرە، سێ فرسەخ[1] لە چیاکانی سلێمانی بەناوی (پیرەمەگروون) دوورە و ئەو چیایە چاڵە بەفری لێیە بۆ شاری سلێمانی دەچێ.

**ڕێگای سلێمانی و کۆیسنجاق**

لە سلێمانی بۆ بازیان (٧) فەرسەخە لە دووریی هەر میلێک یا دوو میل گوندێک هەیە و ڕێگاکە ئاوەدانە، بەچیای تاسلوجە و بازیان و تاینال تێپەڕ دەبێ، لە بازیان بۆ (خەرابە)[2] (١٨) فەرسەخە، خەرابە گوندێکی بچووکی ٥٠ ماڵییە لە خەرابە بۆ کۆیە (٤) فرسەخە ڕێگاکەشی دەشتایی و خۆشە.

**ئەربیل**

لە ئاڵتوون کۆپری بۆ ئەربیل (٨) فرسەخە، لەو ڕێگایەدا کوردەکانی ((دزدی)) هەیە (مەبەستی عەشیرەتی دزەییە - لە شوێنێکی تر بە دیزنە ناویان دەبا) کە ژمارەیان هەزار ماڵێک دەبێ، ئەوانە بە زیانن و لە ناویان سوارە و پیادە هەیە و کاریان (دزی) کردنە. (ئەمە بۆ چوونی خۆیەتی، و، ه)

ئەربیل ویلایەتێکی کۆنە، ناوی کەمە، سەردەمێک جۆگە ئاوی بۆ دەهات، بەڵام ئێستا تێکچووە، لەسەر گردێکی بڵند دروست کراوە، ژمارەی ماڵەکانی ١٠٠٠ ماڵ دەبێ، لە دەرەوەی قەڵاکەش چوار هەزار ماڵ هەیە، زمانی ئاخاوتنی خەڵکەکە کوردی و تورکییە، ئەربیل باغ و بیستانی نییە، کشتوکاڵی ترێ زۆرە، میوەجاتی لە چیاکانی ئامێدی بۆ دێت (ڕاستییەکەی شەقڵاوەیە)، مزگەوتێکی کەلاوەی کۆنی لێیە، منارەکەی لە دەرەوەی شار دیارە و زۆر بەرزە، دوو پلیکانی هەیە، یەکێک بۆ سەرکەوتن و ئەوی تر بۆ دابەزین.

ئەربیل لە گوندی عینکاوە (٣) فەرسەخ دوورە و ئەو گوندە ٣٠٠ ماڵی دیانی لێیە، فەرمانڕەوایی گوندەکەش لە خۆیانە.

دەشتی هەولێر بە درێژی (١٢) فرسەخە و پانی (٦) فرسەخە و خاکەکەی دەشتێکی ساکارە و لە ئەربیل میوانخانە نییە، خەڵکەکەش مەزهەبیان شافعییە.

١- فرسەخ (٣) میلە نزیکەی (٥) کیلۆمەتر و بە پیادە یەک کاتژمێر دەبێ.

٢- مەبەستی گوندی خراپەیە نزیک زێی کۆیە.

لە فارسییەوە بۆ عەرەبی: پارێزەر عەباس ئەلعەزاوی بەغدا - ١٩٤٨



# هەولێر لە گەشتەکەی (جەیمز بێکنگهام) ساڵی ١٨١٦

هۆشیار محەمەدئەمین کۆیی

گـەریدەیەکی ئینگلیـزی، ماوەیەک لە کۆمپانیای هیندی ئینگلیزی ڕۆژهەڵات فەرمانبەر بووە. لە ساڵی ١٨١٦ سەردانی عـێـراقی کـردووە و لە ڕێگای سووریا هاتۆتە ژەنگار- مووسڵ - هەولێر - کەرکووک - بەغدا. گەشتەکەی یەکەم جار ساڵی ١٨٢٧ بە زمانی ئینگلیزی چاپ کراوە. دەربارەی ناوچەی هەولێر نووسیویەتی:

لە ڕێگا دوو تەتەری تورکمانم لەگەڵدا بوو، کە نامەیەکیان لە باڵیۆزخانەی بەریتانیا دەگەیاندە (میستەر ریچ) لە قونسوڵگەری بەریتانیا لە بەغدا، لەبەرئەوە بەهەر شوێنێکدا دەچووین لەبەر ترس و ستەمی ئەو دوو تەتەرە

تورکە خەڵکەکە بەناچاری خزمەتی باشیان دەکردین، هەرکە گەیشتینە گوندی (عینکاوە)، کە پێشتر لەلایەن ئەو تەتەرانەوە ئاگادار کرابوونەوە کە ئامادە بن بۆ پێشوازیمان، هەرکە گەیشتین هەموو شتێک ئامادە کرابوو لە ڕاخستنی مافوور و دانانی کورسی و قەنەفە و قاوە، سفرەیەکی جوانیش دانرا بوو، ئێمەش لەسەر ڕایەخێکی نەرم و نوێ لە هەیوانێکدا بۆ ماوەی سێ کاتژمێر ڕاکشاین، پاش ئەوەی کە ئەسپە تازەکانیان زین کرد، نانی بەیانیمان خوارد، کە بریتی بوو لە مریشکی سوورەوەکراو و قەیماغ و هەنگوین و شیرینەمەنی، دوو پیاویش لە تەنیشت هەریەکێکمان وەستابوو، هەریەکەی شووشەیەک عارەق و پەرداخێکی پێ بوو بۆ ئەوەی هەرکاتێ کە داوامان کرد، بۆمان تێ بکەن، هەر لەبەر ئەو ترسەی ئەو گوندنشینانە کە هەموویان دیانی سریانن، بەرامبەر ئەو تەتەرە تورکانە هەیانبوو، ٤٠ کەس بۆ خزمەتکردن بۆمان وەستابوون، هەندێکیان قاپی پڕ یا بەتاڵ و هەندێکیان ئاوی دەستشووشتن یا پەشتەماڵیان بەدەستەوە گرتبوو، خەڵکی تریش هەبوو وەستابوون و ئامادە بوون بۆ پێڵاودانان بۆ ئەو زۆردارە ستەمکارانە.

پێش ئەوەی بەرێ بکەوین، خۆمان مەست کرد بەخواردنەوەی مەی: دواتر تەتەرەکان بە داواکاری ناڕەوا خەڵکەکەیان بێزار کرد، بەڵام خەڵکەکە لەبەر بێدەسەڵاتییان زیاتر خزمەتیان دەکردن، لەو کاتە گەنجێک کە زۆر بێزار بوو، ناڕەزای خۆی دەربڕی و تفێکی لە یەک لە تەتەرەکان کرد و بەڕاکردن ڕۆیشت و نەگیرا، بەمە ستەمی تورکەکان بەرامبەر خەڵکەکە زیاتر بوو.

پێش ڕۆژ هەڵات عینکاوەمان بەجێ هێشت و کاتی ڕۆژ هەڵات گەیشتینە (هەولێر) یا ئەربیل، کە هەردوو ناو بەکار دەهێنرێت، گەورەترین شار بوو پاش مووسڵ بینیمان، پێیان ڕاگەیاندین، کە ژمارەی دانیشتوان ١٠٠٠٠ کەسە، بەڵام ئێمە نیوەی ئەو ژمارەمان پێ ڕاست بوو، زۆربەی دانیشتوانی موسڵمانن، دوو مزگەوتی گەورەی بە منارەمان دیت، بازاڕ و شەقامەکان بەو کاتە زووە لە خەڵک جمەی دەهات، بازاڕەکان سەریان بەدار و گەڵا داپۆشرابوو، خانوو بە خشتی قوڕ دروست کرابوو، جلوبەرگی دانیشتوان پۆشتە و پەرداخ بوو، دیمەنی سەرەکیی شار قەڵاکە بوو، کە پێ دەچێ کاتی خۆی لەسەر گردێک دروست کرابێ، زۆربەی گەڕەک و ماڵەکان لە دەوروپشتی قەڵاکە دابوون.

بێکنگهام نووسیویەتی: کاتێ کە (داریوش) لە شەڕی (کوکامیلا)ی نزیک هەولێر بەرامبەر (ئەسکەندەر) شکا و داریوش کشاوە و ئەسکەندەر بەرەو هەولێر ڕۆیشت و داگیری کرد.

منارەیەکی درێژی جوانمان لە باشووری شارەکە دیت، کە کەلاوەی رووخاو دەوریان دابوو، هەندێ نەخش و کاشیی سەوز و زەخرەفەی گەورەی لەسەر مابوو، پێ دەچێ کاتی خۆی مزگەوتێکی گەورە بووە. پاش ماندووبوونێکی زۆری ڕۆیشتن بەدەشتێکی گەرمی بێ ئاو، دوای شەش کاتژمێر گەیشتینە (ئاڵتوون کۆپری) بەمانای پردی زێڕین، لە ماڵی ئاغا میوان بووین، کە تەتەرەکان لەو ماڵەدا هەموو جار پشوو دەدەن، لە ژوورێکی کراوە دانیشتین بەرامبەر زێی گچکە و لە ڕۆژهەڵاتیشەوە چیاکانی کوردستان، کە بەفر لووتکەکانی داپۆشی بوو دیاربوو، خواردنێکی باشمان خوارد.

**گۆڕینی بۆ عەرەبی:**
**سەلیم تەها تکریتی بەغدا - ١٩٦٨**

# هەولێر لە گەشتەکەی گەڕیدەی ئینگلیزی جاکسۆن

هۆشیار محەمەدئەمین کۆیی

مشاهدات بريطاني عن العراق

جاکسۆن لە کۆمپانیای هیندی ئینگلیزی ڕۆژهەلات فەرمانبەر بووە. باسی ئەو بەشەی گەشتەکەی دەکەین، کە پەیوەندیی بە ناوچەی هەولێرەوە هەیە.

کاتژمێر ۷:۳۰ گەیشتینە (ئالتوون کۆپری)، شارێکی گەورە و ئاوەدانە، لەسەر دوورگەیەک دروست کراوە کە دوو لقی زێی ئالتوون ئەو دوورگەیەی دروست کردووە و لە باشووری شارەکەش یەک دەگرنەوە.

ئێستا سەربازگەیەکی گەورەی تورکی لێیە، قەلا و سەنگەری شارەکە بەهێزە و بەئەستەم دەگیرێ، بەلام تۆپی لێ نییە، لە پردێکی بەردی یەک نهۆم پەڕینەوە لەبەر نارێکیی پردەکە ئەسپەکەم چەند جار ساتمەی کرد.

کە ئالتوون کۆپریمان بەجێ هێشت بەدێهاتێکی زۆر جوان تێپەڕین، بە زەویی پان و بەرین، کە ناوچەیەکی کشتوکالی بوو، بە گەنم و سەوزەوات چاندرا بوو، گەنم پێ گەیشتبوو لە دروێنەی نزیک بوو، پاش بڕینی شەش میل بە چەند کێلگەیەکی کشتوکالی، گەیشتینە هەولێر (جاکسۆن بە ئەربیل ناوی دەبا) بە دووریی لە ئالتوون کۆپری ۳۲ میلە. لە سەردەمی پێشوو گرنگیی زۆری هەبوو، لەبەر ئەو قەلایە قایم و کۆنەی، کە لە ڕۆژئاوای شارەکە لەسەر گردێک دروست کراوە

دەلێن ئەو دێهاتانەی دەورووپشتی هەولێری کۆن گۆڕەپانی شەڕ بووە لە بەینی (ئەسکەندەر) و (داریوش).

ئەسپەکەمان لە هەولێر نەگۆڕی و لە ڕۆیشتن بەردەوام بووین، پاش بڕینی چوار میلی تر، کاتژمێر ۱۱ بەرێگایەکی خۆش گەیشتینە شاری (عینکاوە). لە کاتژمێر ۱:۳۰ بەیانیی ڕۆژی سێشەممە لە ڕێکەوتی ۲۵ی تەمووز عینکاوەمان بەجێ هێشت، بە ڕۆیشتنێکی زۆر خێرا کاتژمێر پێنج گەیشتینە شارێکی بچووک، پێی دەلێن (کەلەک)، کە کەوتووەتە سەر زێی زاب، پەڕینەوە لەم زێیە کاتێکی زۆری دەویست. هەرکە زانییان بێگانەین زوو بەرێیان کردین.

ئەم زێیە زۆر گەورەیە و ئاوەکەی روونە و لە چیاکانی باکوور، کە بەفر لووتکەکانی داپۆشی بوو بەرەو خوار دەهات، خاکی نزیک زێ زۆر بەپیتە و خەلکەکە خەریکی دروێنەی گەنم بوون.

گۆڕینی بۆ عەرەبی: سەلیم تەها تکریتی شوێنی چاپ بەغدا -۱۹۶۲



# هەولێر لە گەشتەکەی (کلۆدیۆس جەیمز ریچ)دا ساڵی ١٨٢٠ز

هۆشیار محەمەدئەمین کۆیی

(ریچ) لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم لە بەغدا نوێنەری بەریتانیا بووە، لە ٢٨/٣/ ١٧٨٧ لەدایک بووە و لە بەیانیی ڕۆژی ٥/ ١٠/ ١٨٢١ لە شاری (شیراز) لە ئێران بە نەخۆشیی کولێرا گیانی لەدەست داوە، لەو کاتەی ئەو پەتایە لەو شارە بڵاو بیۆوە، خەڵکێکی زۆر بە فەرمانڕەوایی شار و خێزانییەوە شاریان بەجێ هێشتبوو، بەڵام ئەو لەبەر شکۆیی و سەربەرزی و دەروونپاکی خودی خۆی، هەرچەندە پێیان ڕاگەیاند، کە شار بەجێ بهێڵێ، بەڵام ئەو وازی لەو هەژارانە نەهێنا و بەردەوام فریاکەوتنی سەرەتایی بۆ دەکردن تا خۆی تووشی ئەم پەتایە هات و گیانی لەدەست دا.




کتێبەکەی (ریچ) بە پێشەنگی ئەو کتێبانە دەژمێردرێ، کە لەبارەی کوردستان نووسراوە. لە ڕووی هونەری نووسینەوە، زۆر بەوردی و بەتەواوی لە دانانی ڕێکەوتی : ڕۆژ و مانگ و ساڵ و کاتیش: کاتژمێر و خولەکی تۆمار کردووە، پلەی گەرمای شارەکانی لە سێ کاتی جیاواز بە پلەی (فەهرەنهایت) تۆمار کردووە و ئێمە پلەی (سەدیمان) لە تەکییەوە نووسیوە. باسی دووری شارەکانی بەفەرسەخ و بەکاتژمێر دیاری کردووە. (فەرسەخ نزیکەی پێنج کیلۆمەترە)، بەتێروتەسەلی کەسایەتیی شارەکان و پاشاکانی بابان لە سەرەتاوە تا دوا پاشای ئەو ڕۆژگارەی، کە بۆ خۆی لە سلێمانی بووە، باس دەکا. لە کەلەپوور و باری کۆمەڵایەتی و دار و درەخت و دەشت و چیا و دۆڵ و ڕووبار و سەرچاوەکانی ئاویش دەدوێ و، واتە لە هەموو ڕوویێکەوە زانیارییەکی دەوڵەمەندی لە خۆ گرتووە و سەرچاوەیەکی گرنگیشە بۆ مێژوونووس و جوگرافیناس و کۆمەڵناسانی کورد.

ریچ خۆی و ژنەکەی خاتوو (ریچ) و ژمارەیەک لە فەرمانبەرانی نشینگەکەی لە بەغدا لە پسپۆڕان و کارگوزاران، کە ژمارەیان شەست کەس دەبوون، حەوت مانگ لە کوردستان ماوەتەوە و سەردانی چەند شارێکی کوردستانی ئێرانی کردووە و زۆربەی کاتەکەی لە سلێمانی

لە سەردەمی بابانەکان ڕابواردووە و سەردانی هەولێریشی کردووە و دەڵێ: هەتا ماوم چاکە و پیاوەتی کوردان لە بیر ناکەم.

**گەیشتنی ریچ بۆ ناوچەی هەولێر**

٢٥ی تشرینی یەکەم ساڵی ١٨٢٠ دەگاتە (ئاڵتوون کۆپری - پردێ)، دەڵێ:

ئەو ڕۆژە زۆر گەرم بوو و شەش کاتژمێر و نیو ماینەوە.

لە ٢٦ی تشرینی یەکەم، بەرەو خۆر ئاوا ڕۆیشتین: بە ناوچەیەک کە دەکەوێتە نێوان ڕووبارەکە و زوورگە پارچەکراوەکان، یان ئەو زەوییە بەرزەی کە لە سەرووی شارەوە دەست پێ دەکا و، درێژ دەبێتەوە، لە زەوییە لماوییەکە دوور دەکەوێتەوە کە بەجێمان هێشت و دووبارە لە زوورگەکانی (کوبیر)ەوە دەست پێ دەکەنەوە. لە شەش و بیست خولەک بۆ ڕێگای (شەمامک) لامان دا و بەلای چەپ دوور کەوتینەوە، دواتر گەیشتینە کۆتایی ناوچەکە.

لێرەوە زوورگە لماوییە دابڕاوەکانمان بڕی، لە دوای ئەمە وردە وردە زەوییەکە بەرزتر دەبۆوە، زەوییەکەی لای چەپیشمان، وردە وردە بەرەو زوورگە لماوییەکانی (کی بیر) بەرزتر و کەندر کەندرتر دەبۆوە، لای ڕاستیشمان ئەو زەوییە زوورگاوەییە کەندرە بوو، کە ماوەیەک بوو جێمان هێشتبوو، لێرەوە پێیان دەوت (هەڵەجە و بیستانە)، کە ئەو ناوچەیە سەر بە (کۆیسنجاق) بوو. لە پشت ئەویشەوە شاخی بەرزتر دیار بوون.

بەگوندی (مەخزوومە)دا تێپەڕ بووین، کە لەلای چەپمانەوە بوو، ڕووبارێکی بچووکیش دەڕژایە (ئاڵتوون صو). وا دیار بوو بەسەر ڕێگایەک دەڕۆیشتین بۆ نیشانە چەند گردۆڵکەکی بچووکی دەستکردی لە یەکتر دووری لێ بوو کە دوورییان لە یەکتر کاتژمێرێک یا کاتژمێرێک و نیو ڕۆیشتن دەبوو، هەندێکمان بینی، هەرچەندە زەوییەکە کەمێک بەردەڵان بوو، بەڵام دەشتێکی باش بوو، تا (کی بیر) و (هەڵەجە و بیستانە) درێژ دەبۆوە، لە ڕاست و چەپی ڕێگا گوندێکی زۆرمان دەبینی، کە شینایی لێ چێنرا بوو، گوندنشینەکانیش خەریکی کێڵانی زەوی بوون.

لە کاتژمێر ١٠ گەیشتینە هەوارگەی (فارس ئاغا)ی سەرۆکی هۆزی (دزەیی) کە سەردەمێک سەر بەکۆیسنجاق بوو، بەڵام بەفەرمانی پاشای بەغدا لە (کۆیسنجاق) و (ئەربیل)ی جیا کردەوە و خستییە ژێر دەسەڵاتی



ڕاستەوخۆی خۆیەوە. لەبەرئەوەیە گوێ بە کەس نادەن. (فارس ئاغا) ئازووقەچییەکەمانی دەرکردبوو، پێی گوتبوو:

من نە سەر بەوەزیری بەغدا و نە بەپاشای کوردستان و نە بەپاشای ئێرانم، بەڵکو خۆی گەورەی خۆیەتی و، لە وڵاتی خۆی دەژی و میوانیش ڕاناگرێ، بۆیە چاکتر وایە بچین بۆ (ئەربیل). ئیتر ئومێدمان نەما، بەڕاستیش ئەوە چاکتر بوو بۆ ئێمە کە بڕۆین، چونکە ڕۆیشتنی ڕۆژێک قازانج دەکەین، بۆیە پاش ڕاوەستانێکی کە چەند خولەکێک دەبوو دەستمان کرد بەڕۆیشتن، لە یازدە و نیو لە نزیک جۆگەیەکی بچووک دابەزین، بۆ ئەوەی فنجانێک قاوە بخۆینەوە، بەڵام بار و شتومەکەکانمان لێمان دوور کەوتنەوە، لە دوازدەدا سوار بووینەوە و بەرەو باکوور دەستمان کرد بەڕۆیشتن، لە کاتژمێر یەک و نیوی دوای نیوەڕۆ بە (دە پلە بەلای باکووری خۆرهەڵاتدا) (ئەربیل) دەرکەوت، پاش ماوەیەکی کورت باشترمان بینی و، وێنەیەکم کێشا، دیمەنی گوێسوانەی گردەکە، کە لەوانەیە کاتی خۆی گۆڕستانی (ئەرساسیدیین) بووبێ، ئەو قەڵایەی بەسەریدا دەڕوانی، لە دواوەی کێوەکانی (کورد و شیعەکانە)، دیمەنێکی جوان بوو، لە نزیک شار جێگری فەرمانڕەوای شار لەگەڵ چل پەنجا سوارەی تورک پێشوازیی لێ کردین، کە دەهۆڵ لێدەرەکان و پلەدارەکان لە ریزی پێشەوەدا بوون، ئەم پێشوازییەم بەشتێکی نادروست زانی، چونکە پێش ئەوەی دابەزین، تۆز و خۆڵ خەریک بوو بمانخنکێنێ، لە سێ و نیو گەیشتینە جێگاکەی خۆمان، ئیمرۆ هەشت کاتژمێر و چل خولەک بەڕێوەبوین.

چادرەکەمان لەلای (کارێز)، یان جۆگەیەک ئاو هەڵدا، کە بۆ (حاجی قاسم بەگ) دەگەڕێتەوە، کەمێک لە باشووری خۆرئاوای شارەکە بوو، لە پێش ئێمەش لە نزیک ئێمە کۆمەڵێکی بچکۆلەی هۆزی ((حەرب))ی (عەرەبی) ڕەشماڵیان هەڵدابوو.

پاش ماوەیەکی زۆر کە ناسیمن، بۆم دەرکەوت کە عەرەب خەڵکێکی پیس و چەپەڵ و ڕووزەرد و ڕەزاقورسن، دانیشتوانی هەولێریش کورد و تورکن.

ئیمرۆ لە ڕێگا تووشی کاروانێک بووین بەرەو بەغدا دەچوو، پیاز و تۆوی پیازی بار کردبوو، لە ئەربیلیش خانەخوێی دێرینم (حوسێن ئاغا) لە چاوەڕێمدا بوو، کە پاشای مووسل ناردبووی بۆ یاوەریم، بڕیارم دا دوو یا سێ ڕۆژ لە هەولێر بمێنمەوە، بۆ ئەوەی کۆمەڵەکەمان پشوو بدەن و هێستری تریشی بکڕین و ماڵئاواییش لە (عومەر ئاغا) بکەین.

| پلەی فەهرەنهایت | پلەی سەدی |
| --- | --- |
| پلەی گەرما ٥٨ پلەی (ف) لە پێنجی بەیانی | (١٤/٥ " س") |
| پلەی گەرما ٩٤ پلەی (ف) لە دوو و نیوی دوای نیوەڕۆ | (٥٣٤/" س ") |
| پلەی گەرما ٥٩ پلەی (ف) لە دەی شەو | ( ١٥ " س ") |

### ٢٧ی تشرینی یەکەم (١٨٢٠ ز)

بەیانییەکی زوو لە خەو هەستام و بەگورجی دەستم بەکارەکانم کرد، لە پێشدا چوومە لای منارە کۆنەکە، کە دیارترین دیاردە بوو لە ناو شاردا، مزگەوتەکەی رووخا بوو و کەلاوە بوو، بناغەکەی هەڵکەنرا بوو، خشت و پاشماوەکەی دەرهێنرا بوو، بەرزیی منارەکە سەد و بیست و یەک پێیە، تیرەی کەمەرەکەی بیست و یەک پێیە، لەسەر بنکەیەکی هەشت گۆشەیی هەڵچنراوە، کە درێژی هەر گۆشەیەک نۆ پێ و یازدە گرێیە، بەرزاییەکەشی سی یا چل پێ دەبێ، لە ناو منارەکە دوو پلیکانەی پێچاوپێچ هەیە کە تا دەگاتە سەرەوە بەیەک ناگەن، لە سەرەوەش بەڵەکۆنەکە لەگەڵ لووتکەی منارەکە تێکدراوە، تەنیا قەدەکەی سەر بەڵەکۆنەکە ماوە، منارەکە لەسەر شێوەی منارەی (تاووق) دروست کراوە، وا پێ دەچی هی سەردەمی خولەفاکان بێت، یا شیاوترە بڵێین هی سەردەمی فەرمانڕەواکانی هەولێرە، کەلاوە دەوری دابوون، وەک پاشماوەی کەلاوەی بەغدا بوون، پاشماوەی شوورە و سویەرەکەی دیار بوون، بەتایبەتی لە نزیک چادرگەکەمان کە هەڵمانداوبوو، پێ دەچێ کاتی خۆی شارەکە زۆر فراوان بووبێت، لەوانەیە

ئەوەندەی بەغدای ئێستا بووبێ، هەولێر کەوتۆتە سەر ئەو گردە دەستکردە، کە لە بەشی باشووریدایە، گەرماوێکی تێدایە، لەگەڵ چەند خانێک و چەند بازاڕێک، بەشێکی شارەکە لەسەر قەڵاکەیە، لەلای خۆرهەڵاتی شارەوەش، یان کەمێک بەلای باکووریدا، (شوێنێکی نزم هەیە پێی دەڵێن دۆڵی (چی کونم) دەڵێن (تەیموری لەنگ) کاتێ ئابلووقەی هەولێری داوە چادری لەو شوێنە هەڵداوە، شێخێکی ئایینیی هەولێریش ترس و تۆقاندن لە ناو سوپاکەی بلاو دەکاتەوە و، بەمە سوپاکە پەرت و بلاوەی لێ دەکا، تەیموری لەنگیش لەو کاتەدا بە فارسی هاوار دەکا و دەڵێ: (چی کنم) واتە چی بکەم، بۆیە دۆڵەکە ئەو ناوەی وەک زاراوە وەرگرتووە.

| | پلەی فەهرەنهایت | پلەی سەدی |
|---|---|---|
| پلەی گەرما لە پێنجی نیوەڕۆ (بەیانی) | (٥٢ پلەی (ف) | (١١ ی (س) |
| لە دوو و نیوی نیوەڕۆ | (٩٠ پلەی (ف) | (٣٢ ی (س) |
| لە دەی دوای نیوەڕۆ (شەو) | (٦٤ پلەی (ف) | (١٧/٥ ی (س) |

### ٢٨ی تشرینی یەکەم

ئیمڕۆ چەند جارێک دەستم بەتێڕوانینەکانم کردەوە، خەڵکێکی زۆر لە (ئەربیلییەکان) بەشێوەی نیوە بازنە لەلامەوە وەستابوون، قەنەنەکانیان بە دەست و دەمیانەوە بوو، لە ناو خۆیاندا باسی ئەوەیان دەکرد، کە دەبێ چی بکەم، بەڵام کەسێک لەوانە بێزاریان نەکردم، نەمتوانی زەردەخەنەکانم بشارمەوە کاتێ، کە خۆم بە (دی لامیر) دەهاتە بەرچاو (ئەگەر بەراوردەکەم ڕاست بێت)، کە لە نزیک (پاریس) بەسەری هاتبوو، هەرچەندە شوێنەکانمان جیاوازیی هەیە، کە من لێرە بەتەنیا و بێ پاسەوان و نۆکەر لە ناو کۆمەڵێک خەڵکی نامۆ و ناشارستان دام. من وام دادەنا، کە بەرزایی گردە دەستکردەکە، کە قەڵای (ئەربیل) بەسەریدا دەیڕوانی سەد و پەنجا پێ بێ، کەمەرەکەشی چوار سەد یارده بێ، بێگومان کاتی خۆی لەمە بەرزتر بووە، لەوانەشە (قاراقللا) لووتکەکەی تێکدا بێ، چونکە وا ڕووی دا، کە جارێک (حاجی عەبدوڵڵا بەگ) لەسەر گردە دەستکردەکە خانوویێک دروست دەکات، کرێکارەکان گۆڕێکیان دۆزییەوە، کە تەرمێکی تێدا بوو، ڕۆژگار ڕووخساری تێک نەدابوو، بەڵام کە بای پێ کەوت تێکچووە و هەڵوەرییە، خۆ ئەگەر بۆچوونەکەم ڕاست بێت، کە کاتی خۆی ئەم گردە گۆڕستانی (ئەرساسیدییەکان) بێ، ئایا ئەو تەرمە هی یەکێک لە پاشاکانی (برپییهکان) نییە؟ حاجی قاسم بەگ پێی ڕاگەیاندم، کە ناوەوەی گردە دەستکردەکە دابەش بووە بۆ چەند ڕێڕەوێک یا درزێک، کە بەخشتی قەبارە گەورە دروست کراوە، نووسینیان لەسەر نییە، حاجی جەختی لەسەر ئەمە کردەوە، کاتێ کە خۆی ژێرزەمینیماڵەکەی پشکنیوە، بەرزایی گردەکەشی بە چل گەزی گەورە دادەنێ.

ئەفسانەیەکی ناوخۆش هەیە، تایبەتە بە (ئەربیل)، کە گوایە (داریوس) ئەربیلی دروست کردووە، کە ئەمە لە بنەرەتەوە ڕاست نییە، چونکە هیچ چیرۆکێک یا مێژوویێکی خۆرهەڵاتییانە نییە، کە باسی پەیوەندیی (دارا) و (ئەربیل) بکا. خۆرهەڵاتییەکانیش لەبارەی شەری (ئەربیل) و (کوکەمیلا) هیچ نازانن.

لە دەشتی (ئەربیل)دا کەروێشک و ئاسک زۆرن، لەگەڵ پۆلە (قەتێ)، کە بێ شومارە، لەم دەشتە هەڵۆی (بالابان) ڕاو دەکرێ، بەتایبەتی بۆ کوردستان دەنێردرێ.

پلەی گەرما لە شەشی بەیانی (٧٠) پلەی (ف) (٢١ پلەی سەدی)
لە دوو و نیوی پاش نیوەڕۆ (٨٤) پلەی (ف) (٢٩ پلەی سەدی)
لە دەی شەودا (٧٤) پلەی (ف) (٢٣ پلەی سەدی)

با بۆ لای باشووری خۆرهەڵات بوو، کەشوهەواش هەوراوی بوو.

ڕیچ درێژە بە گەشتەکەی دەدا بۆ (کەلەک) و دواتر بۆ (مووسڵ).

**گۆڕینی بۆ عەرەبی:**
**بەهائەدین نووری بەغدا -١٩٥١**



# دوو ساڵ لە کوردستان ١٩١٨-١٩٢٠

**دانەر: دەبلیو- ئار- هی***

**پێشەکی**

ئەم کتێبە لە ساڵی ١٩٢١ لە لەندەن بەزمانی ئینگلیزی چاپکراوە، لەلایەن دەبلیـو- ئار- هی، کە ئەفسەرێکی ژێری بەریتانی بوو و دوو ساڵ لە ناوچەکانی هەولێر وەک حاکمی سیاسی پاش سەرکەوتنی هاوپەیمانان لە شەڕی یەکەمی جیهانی و داگیرکردنی عێراق و بەزینی دەوڵەتی عوسمانی و پاشەکشێی لەو وڵاتە، ئەو کاری کردووە کە ئەو سەردەمە بارودۆخی ناوچەکە لە بواری ئابووری و ئیداری و سیاسی زۆر خراپ بوو، ئەو بەزیرەکی خۆی توانی ئیدارەی شار و شارۆچکەکان دابمەزرێنێتەوە و باری ئابووریش باشتر بکا و، هەولێریش کە پێشتر قەزا بوو و سەر بەلیوای مووسڵ بوو بەهەوڵدانی ئەو بێتە لیوایەکی سەربەخۆ. بەدەوڵەمەندترین کتێبی بیرەوەری و یاداشت



دەبلیو- ئار- هی

دەژمێردرێ، کە لەلایەن کەسێکی بیانی لەسەر هەولێر نووسرابێ، زۆر بەوردی باسی سروشت و جوگرافیا و کشتوکاڵ و بازرگانی و هۆزە کوردییەکان و کەسایەتییەکانی ناوچەکە و پێناسە و ڕووخساری هەریەک لەوانە بەشێوەیەک دەنووسێ، هەروەک وێنەیەکی ئەو کەسەی گرتبێ، بەقووڵی لە ناخی کەسەکان دەگا و لە کوردێکی ئەو ناوچەیە زیاتر ئاشنای هەموو بوارەکانی ژیانە و شارەزای هەموو گوند و دەشت و دۆڵەکانە. کورتکردنەوەی بابەتەکانی ئەو کتێبە کە بەعەرەبی بەدوو بەرگ چاپکراوە شتێکی ئەستەم بوو، چونکە زۆربەی زۆری باسی ناوچەی هەولێر دەکا و هەمووی لەم بارەیەوە گرنگە، ئەو بۆ بەرژەوەندیی وڵاتەکەی خۆی زیاتر تێ دەکۆشا و ئەو سیاسەتەی پەیڕەو دەکرد، کە لەلایەن (وەزارەتی موستەعمەرات) و (حاکمی گشتیی شاهانەی بەریتانی) لە عێراق دارێژرابوو. لەبەرئەوە شتێکی ئاساییە ستایشی هۆزێک یان کەسایەتییەک بکا و یەکێکی تر سووک و ڕیسوا بکا، ئەوە بیروڕای خۆیەتی و بەگوێرەی بەرژەوەندی و تێڕوانینی خۆی نووسیویەتی و مەرج نییە بەو شێوەیە بێ و، ڕێزی زۆرمان

بۆ ئەو بنەماڵانە هەیە، کە ئەو بەو شێوازە باسی کردوون. لەبەرئەوەی گۆڕینی هەر بابەتێک دەبێ سەرراستی لە خۆ بگرێ و نابێ نووسینی نووسەرەکە بشێوێنرێ. زۆر لە ناوی کەسایەتی و گوند و شوێن بەهەڵە نووسرابوو راستمان کردیتەوە و هەندێ جار پیتی (و) واتە وەرگێڕمان نووسیوە.

(های لە پێشەکییەکەیدا دەڵێ: کە شەڕی یەکەمی جیهانی هەڵگیرسا، قۆناغی یەکەمی زانکۆی ئۆکسفۆردم تەواو کردبوو، لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٤ بەرێگای دەریا لەگەڵ (یەکەی دور سیتس ٤/١) بەرەو هیند بەرێ کەوتم. لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩١٥ گەیشتمە وڵاتی نێوان دوو زێ (عێراق-و-) لە نیسانی ساڵی ١٩١٦ بەسووکی بریندار بووم و بۆ هیند گەڕامەوە، پاش ساڵێک دیسان هاتمەوە عێراق، لە تشرینی یەکەم تاقیکردنەوەیەکی زمانی عەرەبیم ئەنجام دا و لە کانوونی یەکەم لە ئیدارەی مەدەنی دامەزرام. سەرەتا بە (یاریدەدەری حاکمی سیاسی) لە (مەندەلی) بووم. من هەندێک زمانی (فارسی) لە هیند فێر بووم و لە ناوچەی فورات هەندێک لە زمانی (عەرەبی)، لە (مەندەلی) لەو دوو زمانە زۆر پێشکەوتم، هەوڵم دا (تورکی) فێر بم و توانیم قسەی پێ بکەم و خەڵک لێم تێ بگەن. دواتر کە لە (ئاڵتوون کۆپری) بووم و لە کۆیە و هەولێر تورکییەکەم باشتر بوو و توانیم بەشێوەیەکی مامناوەندی بەکوردییەکی رەوان قسە بکەم.

های خۆشحاڵ بووە کە ئەو ساڵانەی دوایی لە وڵاتی نێوان هەردوو زێ و شوێنە دوورەکان خزمەتی کردووە.

کاپتن های دەڵێ: ناوی کوردەکانم نەبیستبوو، ئەگەر گوێبیستیشی بووبێن، ئەوا بەخەڵکێکی گوندنشینی رێگر باس کراون. کاتێ کە سوپا لە بەسراوە بۆ ناوەوەی عێراق بەرێ کەوت، بۆ هەر بنکەیەکی گرنگ (فەرمانڕەوایەکی سیاسی) بۆ دانرا، بۆ ئەوەی هۆیەک بن لە نێوان پەیوەندیی خەڵکەکە و (دەسەڵاتی سەربازی)، بەڕاوەستانی شەڕ (یەکەمی جیهانی -و-) بایەخی زیاتر بەچەسپاندنی یاسا و سەقامگیریی ئاسایش و پەیڕەوی یاسا و رژێم لە نێوان هۆزەکان لەم وڵاتە ئامانجی بوو، (سر ئارنولد ویلسۆن)، کە بەرپرسی فەرمانڕەوایی ئەو وڵاتەی پێ سپێردرا بوو لە مانگی مارتی ١٩١٨ تا ئەیلوولی ١٩٢٠، لێپرسراوی بەرزی کاپتن های بووە. عێراق لە پاش وەستانی شەڕ بە مەبەستی بەڕێوەبردنی دابەش بە ١٣ یەکەی کارگێڕیی سەرەکی کرا، لە هەر یەکەیەک فەرمانڕەوایەکی سیاسی دانرا، کە راستەوخۆ بەرپرسیار بوو بەرامبەر دەسەڵاتدارانی مەدەنی لە بەغدا، یەکە ئیدارییەکان کە دواتر بوون بە لیوا، لە هەر قەزایەکیش (یاریدەدەرێکی فەرمانڕەوای سیاسی) دانرا. ئەفسەرە بەریتانییەکان سەرپەرشتیی سەربازە تازەکان (لیڤی) و (ژاندرمە)ی ناو شارەکانیان دەکرد، فەرمانبەری تریش لە فەرمانگەکان بەپێی پێویست دانران، خەڵکەکە بەهاتنی ئینگلیزەکان خۆشحاڵ بوون، لە کاری فەرمانبەرە هیندییەکانیش رازی بوون.

گوزەرانی (یاریدەدەرەکانی فەرمانڕەوا سیاسییەکان) لە شوێنە دوورەکان لەبەر نەبوونی پێداویستییەکانی حەسانەوە زۆر دژوار بوو، ژیانیشیان هەردەم لە مەترسی دابوو. سەرەتا خەڵکەکە وایان مەزەندە دەکرد، کە بەهاتنی ئینگلیزەکان سەردەمی زێرینی لە بوارەکانی کشتوکاڵ و بازرگانی دەست پێ دەکا.

کابتن های نووسیویەتی: لە ١٩١٨/١/١٥ پاش ئەوەی یاریدەدەری فەرمانڕەوای سیاسی (لونگریک) لە (ئاڵتوون کۆپری) شوێنی منی گرتەوە. بەرەو (کۆیسنجاق) رۆیشتم بۆ ئەوەی یاسا بچەسپێنم و ئاسایش بەرقەرار بکەم، دواتر سەردانێکی (رانیە) و (قەڵادزە)م کرد و تا ٢١ی شوباتی ساڵی ١٩١٩ بارەگام هەر لە کۆیە بوو تا ئەو کاتەی لەبەر چەند هۆیەکی خێزانی مۆڵەتم وەرگرت و بۆ وڵاتەکەم گەڕامەوە.

لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩١٩ گەڕامەوە و لە هەولێر دامەزرام، کە ئەو سەردەمە قەزایەک بوو سەر بەلیوای (مووسڵ) بوو، لەو داستانە ئەزموونی خۆم لە ٣١ی تشرینی یەکەم لە ساڵی ١٩١٨ کە لە لیوای هەولێر و ئەو ناوچانەی کارم لێ کردووە دەنووسم.

## جوگرافیا و رووەک و ئاژەڵی ناوچەکە

زێی گەورە بە دووریی ٨ میل لە باکووری هەولێر بە (شەمامک)دا دەڕوا، ئاوێکی زۆری ئەو زێیە دەڕژێتە (دیجلە)، ئاوەکەی قووڵە و بەتەوژمە، سوودی بۆ خەڵکەکە کەمە و بۆ بەکارهێنانی (کەلەک) دەست نادات، حکوومەتی تورکی کاتی خۆی بیری لە هەڵکەندنی جۆگایەک کردبۆوە لە شەمامکەوە بۆ باشووری هەولێر، بەڵام لەبەر بەرزی بڕی بودجەکە ئەنجام نەدرا. لە کەناری ئاوەکە و لە نزیک گوندی (سفەیە) پاشماوەی جۆگای کۆن هەیە.

زێی (بچووک) لە باشووری دەریاچەی (ئورمیە) هەڵدەقووڵێ و ئاوەکەشی بۆ ڕۆیشتنی (کەلەک) باشە و لە باشووری (ئاڵتوون کۆپری) لە هەردوو کەناری زێیەکە پاشماوەی هەڵکەندنی جۆگای گەورە هەیە، کە یەکێکیان بەرەو دەشتی (قەراج) دەچی و ئەگەر تەواو بکرابایە سوودێکی زۆری بۆ ئەم دەشتە بێ ئاوە دەبوو.

لە دووریی ٣٠ میل لەو شوێنەی کە زێی گچکە تێکەڵ بە (دیجلە) دەبێ ریزە چیای وشکی (قەرەچووغ) بەرەو ڕۆژهەڵاتی باکوور درێژ دەبێتەوە و لە خوارووی (گوێر) نزیک زێی گەورە بچووکتر دەبێتەوە. ئەو ناوچەیەی کە ئاوی نییە و دەکەوێتە ناو ئەو گردانە و زێی گچکە و دیجلە پێی دەڵێن بیابانی (قەرەچووغ) یان (قەراج)، ئەگەر لەو دەشتە بباریێ، ئەوا زۆر بەپیتە و لەم بارەیەوە ناوبانگی دەرکردووە، بەرهەمی دانەوێڵەشی یەک بەرامبەر بە (١٠٠) دەبڕێ. زۆر جار باران کەم یان هەر ناباری، بیری ئاویش زۆر کەمە و ئاوەکەشی سوێرە، لە هاوین ئاووهەوای زۆر گەرمە و تەنیا هەندێ دڕک و داڵ نەبێ، دەنا دەشتێکی رووتە.

لە سەرەتای مانگی نیسان لە دەشتی هەولێردا کاتێ کوردەکان مەڕومالاتیان دەلەوەڕێنن و رەشماڵ هەڵدەدەن، سوود لەو گۆمە ئاوانە وەردەگرن، کە لە بارینی باران کۆ دەبێتەوە و لەو کاتەش بە ڕاوی کەروێشک یان مامز خەریک دەبن.

زۆری و کەمی دانیشتوانی گوندەکانی (قەرەچووغ) بەبارینی باران بەندە، کاتێ کە باران نەباری ئەوا چۆڵ دەبێ.

چیای (قەرەچووغ) (٢٨٠٠) پێ لە رووی دەریاوە بەرزە، گەلی (حوسەینی غازی) دەیکاتە دوو بەش، بەشە گەورەکەی دەکەوێتە باشووری، هەندێ شوێنی سەختن، ئەو زنجیرە چیایە بۆ مرۆڤ هیچ سوودێکی نییە، لەبەر بێ ئاوی جگە لەوەی، کە دار و درەختی لێ نییە، دەڵێن پێش سەدەیەک دار و بار لە سەرەوەی هەبووە، بەڵام کە کورد لە نزیکەوە نیشتەجێ بوون هەموویان بۆ سووتاندن بڕیتەوە. گیا لە بەهار شین دەبێ و لە مانگی نیسان وشک دەبێ و لە وەرزەکانی تر بۆ لەوەڕ سوودی لێ وەردەگرن. باکووری دەشتی (قەرەچووغ) کە نزیک زێی گەورەیە بە دەشتی (شەمامک) و لە باشووریشی بەدەشتی (کەندێناوە) ناسراون.

دەشتی (شەمامک) نیوە بازنەیە، کەوتۆتە لای سەرووی چەپی کەناری زێی گەورە و بە پیتترین زەوی ناوچەی هەولێرە، کە ڕێژەی دانیشتوانی زۆرە و بۆ کشتوکاڵ ئاوی زۆرە و بیرەکانیشی ئاوی شیرینە، بەرهەمەکانیش دوای دوو هەفتە لە هی قەرەچووغ پێ دەگا.

(کەندێناوە) دەشتێکە پانییەکەی ١٥ میل و درێژییەکەی ٣٠ میلە و کەوتۆتە نێوان (قەرەچووغ) و



(زوورگەزراو)، (کەندێناوە) دەشتێکە وەک (شەمامک) بەپیتە، بەڵام بارانی کەمترە و هەندێ شوێنی بەردەڵانە بۆ کشتوکاڵ دەست نادا، هەندێ جار کلۆ زیان بە بەرهەمەکان دەگەیەنێ، جگە لەوەی، کە لە هەندێ شوێن ئاوەکەی سوێرە، بەرهەمی کشتوکاڵیشی زامن نییە.

((زوورگەزراو) زنجیرە گردێکی نووک تیژە، دەشتی (کەندێناوە) لە دەشتی (هەولێر) جیا دەکاتەوە.

(دەشتی هەولێر)، کە درێژیی ٥٠ میل و پانی ٢٥ میل دەبێ، لە زێی گەورەوە تا زێی بچووک درێژ دەبێتەوە و دەشتێکی بەپیتە ساڵانە یەک بەرامبەر بە ١٠ دانەوێڵە بەرهەم دێنێ، هەموو دەشتەکەش بە کشتوکاڵ چێنراوە و ڕێژەی دانیشتوانی بەرزە، هۆزی (دزەیی) بەهێز سێ سەدە پێش ئێستا لەو دەشتە نیشتەجێن. ئاو لەو دەشتە شیرینە و کارێز زۆرە و قووڵیی ئاویش لە زەوییەوە ٣٠ تا ٤٠ پێ دەبێ.

سنووری (دەشتی هەولێر)، لە باکوور، ڕووباری بەستۆرە، لە ڕۆژهەڵات، چیای (دێدەوان)، کە یەکەی هەولێر و کۆیە لێک جیا دەکاتەوە، هەرچەندە چیای (قەرەچووغ) بەرچاوتر دیارە، بەڵام بەرزاییەکەی هەروەک (دێدەوان) دەبێ.

ناوچەی (کۆیە) دوو بەشە، یەکەی (کۆیە) و یەکەی (شەقڵاوە)، چیای (هەیبەت سوڵتان) کە ٢٨٠٠ پێ بەرزە، زنجیرەیەکە بەبێ پسانەوە لە (کەنداوی فارسی) تا (ماردین) درێژ دەبێتەوە و (کۆیە) و (ڕانیە) لێک جیا دەکاتەوە. باکووری ئەو زنجیرە چیایە پێی دەڵێن (سەفین) بەرزاییەکەی (٧٠٠٠) پێیە، ئەو شوێنەیە، کە کەشتی (نوح) پێیدا تێپەڕ بووە، پێش ئەوەی لە چیای (جودی) جێگیر بێ، چیای (سەفین) لە شارۆچکەی (شەقڵاوە)یە، بە دەوەن و داری بەڕوو و کانی ئاوی گەورە بەناوبانگە، لەسەر گردەکانیش دارمێو زۆرە. ناوچەکانی (ڕواندز) بەشێکی کەمی دەگاتە بەستۆرە و لە دوای چیای سەفین فراوانتر دەبێ.

لە شوێنێکی هەردوو کەناری زێی گەورە نەوت هەیە، بەردی مەڕمەڕیش هەیە و ئاوی ژێر زەویش زۆرە و بۆ کاری خانووبەرە گەچ بەکار دێت. سەرچاوەی ئاوی دانیشتوانی لیوای هەولێر (کارێزە)، کە چەند سەرچاوەیەکی ئاوە و قووڵاییەکانیان جیاوازە و لە ژێر زەوی بەیەکەوە بەستراون و بە ئاوەڕۆیەک ئاوەکە دەگاتە سەر زەوی.


شاری کۆیە

دەڵێن لە سەردەمی (عەباسییەکان)دا لە هەولێر ٣٦٥ کارێز هەبووە و ڕێگای نێوان هەولێر و ئاڵتوون کۆپری پڕ بووە لە باغ و بیستان و بولبول توانیویەتی لە دارێکەوە بۆ ئەوی تر باز بدا. ئێستا تەنیا ٦٠ کارێز سوودی لێ



وەردەگیرێ و هەولێش بەردەوامە بۆ هەڵکەندنی کارێزە کۆنەکان، وەستا (فەتاح) لە هەڵکەندنی کارێز و دۆزینەوەی شوێنی شیاو پسپۆڕە، ئەو کارەی لە بنەماڵەکەی بۆ مایتەوە و دواتر کوڕەکەی شوێنی ئەو دەگریتەوە، لێدانی کارێز کارێکی ترسناکە، چونکە زۆرجار لێدەرەکە بەهۆی دارمان دەکەوێتە ژێرخاکەوە.

کەشوهەوا لەو لیوایە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر جیاوازە، بەگشتی مامناوەندییە. لە هەولێر بەدەگمەن ساڵی لە یەک مانگ زیاتر گەرم دەبێ. پلەی گەرما لە سێبەر ١١٠ پلەی فەهرەنهایتە (نزیکەی ٤٣ پلەی سەدی -و-) جاریش هەیە زیاترە. باران لە نێوان مانگی تشرینی دووەم و کۆتایی ئایار دەباری ڕێژەکەی لە دەشتی هەولێر ١٢ تا ١٤ بۆسەیە، لە دەشتی قەرەچووغ لەوە زۆر کەمترە و لە گردەکان لەوە زۆر زیاترە. کانوونی دووەم لە هەموو مانگەکان بە بارانترە، زستان بەشێوەیەکی گشتی سانایە، بەڵام خەڵک هەست بە سەرمای زۆر دەکەن. لە شوباتی ساڵی ١٩٢٠ بەفر بۆ ماوەی ١١ ڕۆژ باری کە ئەوە لە هەولێر یەکەم بارینی بوو لە ماوەی حەوت ساڵ. لە ساڵی ١٩١٦ بەفر ئەو وڵاتەی بۆ ماوەی ٤٠ ڕۆژ داپۆشی، ئاوی ڕووبارەکان بەهۆی بەستن بوون بە شەختە، ئەو ساڵە بە (ساڵی بەفر) ناسراوە کە کورد بۆ مێژووی ڕووداوەکان بەکاری دەهێنن، کەشوهەوا لە مانگی مارت تا کۆتایی ئایار گەرم دەبێ، بەڵام کە ڕێژنە بارانێک دەباری هەوا فێنک دەبێ. ئەو وڵاتە بە گوڵ دەرازێتەوە و خۆش دەبێ، مانگی حوزەیران و نیوەی مانگی تەمووز زۆر گەرمە، بەڵام شەوەکانی خۆشە و ساردە، لە نیوەی مانگی تەمووز تا نیوەی ئاب خەڵک هەست بە گەرمایەکی زۆر گەرمی ڕۆژهەڵاتی دەکەن. لە نیوەی دووەمی مانگی ئاب کەشوهەوا لە ئاکاو سارد دەبێ، مانگی ئەیلوول و تشرینی یەکەم نە گەرمە و نە ساردە، بەڵام هەموو شتێک وشک و خۆڵاوییە، مێشی گەلێک زۆر دەبێ، مرۆڤ حەز دەکا باران بباریێ بۆ ئەوەی ئەو پیساییەی، کە لەو کەشە گەرمە کۆ بوویەتەوە بیشواتەوە.

باری تەندروستی لیواکە بەگشتی باشە، تەنیا ئەو شوێنانە نەبێ، کە برنجی لێ دەچێنرێ نەخۆشیی لەرز و تای لێ بلاو دەبێتەوە، لەکاتی مانەوەم لە هەولێر هیچ نەخۆشێکم نەدیت، کە ڕشانەوە یان خوریکە یان گرانەتای هەبێت، کۆخەرەشە بێزاری کردبووین. پێش هاتنم لە ساڵی ١٩١٨ خەڵکێکی زۆر بە (ئەنفلۆنزای ئەسپانی) مردبوون.



سەرۆکەکانی (خۆشناو)

هەر لە شەقڵاوە ماڵی یەکێ لە ئاغەکان، هەموو ئەندامانی بنەماڵەکە مردن. ئاو بەتایبەتی لە دەشتی هەولێر زۆر پاکە، هەر لەبەرئەوەیە کە نەخۆشیە درمییەکان نییە. ژمارەی دانیشتوانی هەولێر (١٤٠٠٠) کەسە و کۆیە (٥٠٠٠) کەس و ئاڵتوون کۆپری (٢٠٠٠) کەس، ڕواندز (١٥٠٠) کەس و شەقڵاوە (٣٠٠٠) کەس و مەخموور (١٠٠٠) کەس. ژمارەی لیوای هەولێر بە کۆیە و ڕواندزەوە (١٠٥٠٠) کەسە

ڕێگاکان: نێوان مووسڵ و ئاڵتوون کۆپری و کەرکووک و سەری هێڵی شەمەندەفەر بۆ ڕۆیشتنی ئۆتۆمبێل دەست دەدا، پێش شەڕ بەهۆی ئەو ڕێگایە بازرگانی زۆر دەکرا، ڕێگای (کەلەک) زۆر ناخۆشە بۆ ڕۆیشتنی ئۆتۆمبێل، بەڵام لە ڕێگای (گوێر) بە ١٥ میل نزیکترە.

پەڕینەوە لە زێی گەورە بە (قەیاغ) دەبێ، تورکەکان پردێکی

چاکیان دروست کردووە، بەلام تەواو نەبووە. ڕێگایەکی تر لە ئالتوون کۆپری بۆ دیبەگە و گوێر دەڕوا. ئەو ڕێگایانە هەمووی کاتی شەڕ لە نێوان مووسڵ و کەرکووک بەکار دەهێنرا.

ڕێگایەکی گرنگی تر بە (مەخموور)دا دەڕوا بۆ (شەرگات)، کە سەرە هێڵی شەمەندەفەری لێیە، لە زێی دیجلەش قەیاغ هەیە. ئۆتۆمبێل بۆ گوندەکانی هەولێر دەڕوا، بەلام بۆ سەر گردەکان زۆر خراپە، چەند ڕێگایەک لە هەولێرەوە بۆ کۆیە هەیە هەموویان زۆر خراپن، بۆ ئێران دوو ڕێگا بەناوچەکەماندا دەڕوا، یەکێکیان بەگەلی و دۆلی ڕواندز، ئەویت ڕیان بەکۆیە. کەلوپەل لە کۆیەوە بەهۆی کەلەک بەزێی گچکە بەرەو (تەق تەق) و (ئالتوون کۆپری) و (بەغدا) دەنێردرێ، یان بە قەیاغ لە زێ دەپەڕێننەوە بۆ کەرکووک دەچێ.

کایتن های بەدرێژی باسی ئاژەڵە کێوییەکانی ناوچەکە دەکا و دەڵێ: وا باوە کە مەڕ دەدزرێ، شوانەکان ڕاستییەکان نالێن و خاوەن مەڕەکان هەڵدەخەڵەتێنن، بەوەی گوایە گورگ دزییەکەی کردووە. ماسی بە تۆڕ و بەژەهر لە زێی گەورە ڕاو دەکرێ، بەهار و زستان بۆ فرۆشتن دەیبەنە هەولێر، لە ماسی زێی گچکە بەتامترە.

لە شوێنێکی تر (های) بەدرێژی باسی تەیر و تواڵەکانی ناوچەکە و مێش و مەگەز و داری بەری باغچەکان و چیاکان وەک: بەڕوو و کرۆسکی کێوی و گێوژ و شتی تر دەکا.



پردی تەق تەق

لە بەهار زەوی وەک نەخش بەگوڵ دادەپۆشرێ، ڕۆژێک لە گۆڕەپانی ماڵەوە لە ناو پانتاییەکی ٣٠ یاردە ٣٠ چەشنە گوڵم ژمارد، وەکو: گوڵاڵە سوورە بە چەندین ڕەنگ و پەنجە شێری زەرد و گوڵە سەوسەن و قەدیفە و خاشخاش و لالە و وەنەوشە و گوڵەباغ و زۆر گوڵی جوانی تر، کە لە ناو گەنم شین دەبێ، گوڵێکی تر هەیە ڕەنگی پەمەییە و قەدێکی درێژی هەیە و لە مانگی نیسان لە دۆڵە نزمەکان لە نێوان گردە لماوییەکان لە کۆیە بە کۆمەڵ شین دەبێ. گوڵێکی بچووکی تریش هەیە، ڕەنگەکەی سپی و زەرد و شینە، نێرگز لە بەرزایی گردەکان لە پانتاییەکی زۆر شین دەبێ.

## کوردەکان

دانیشتوانی لیوای هەولێر هەمووی کوردن، تەنیا ناوشاری هەولێر نەبێ، کەمێک دیان لە عەنکاوە و شەقلاوە و کۆیە هەیە و چەند گوندێکی پەرت و بلاوی عەرەب لە (شەمامک) و (قەرەچووغ) هەیە. بەناوبانگترین کورد لە مێژوو (سەلاحەدین) بووە کە سەردەمێک هەولێری کردبووە پایتەختی خۆی، لە سلێمانی و ڕواندزیش سەرکردە کوردەکان لە سەدەی شانزدەهەم ولاتی سەربەخۆیان هەبووە، بەلام پاش مردنیان بەچەند ساڵێک تێکچووە.

لە لیوای هەولێر سەرکردە کوردەکان زمانی فارسی بۆ نامە نووسین بەکار دەهێنن، لە مووسڵ بۆ کاروباری فەرمیی عەرەبی و لە سلێمانی کوردی بەکار دەهێنرێ.

زمانی کوردی دیالێکتی زۆرە، بەلام زمانی نووسین نییە، لیوای هەولێر لە نێوان هەردوو دیالێکتی باکوور و باشووردایە، دیالێکتی ناوچەی هەولێر و کۆیە سەر بە باشوورە و لەگەڵ شێوەکانی تر جیاوازە.

هۆزە کۆچەرەکانی باکووری ڕواندز

دیالێکتی باکوور بەکار دەهێنن.

خێڵی (دەربەندی)، کە کەمێک گوندیان لە دەوروپشتی (تەق تەق) لە نزیک زێی گچکە هەیە، ئەوانە زمانی ئاخاوتنیان بەراورد لەگەڵ دراوسێکانیان جیاوازە، بەکچ دەڵێن (دۆت DUAT) کە لە (DAUGHTER)ی ئینگلیزی نزیکە. (عەبدوڵڵا پاشا)، کە کوردێکی رواندز بوو، حکوومەتی عوسمانی بە قایمقام لە ئامێدی دایمەزراند، بەڵام نەیتوانی لە ئاخاوتنی خەڵکەکە بگات.

کوردەکانی لیوای هەولێر دوو بەشن: یەکەم (داندۆک خۆر)، کە لە دەشتایی نیشتەجێن، (دۆشاوخۆر)، کە لە گرد و شاخەکان نیشتەجێن.

لە کاتی دروێنە لە دەشتی هەولێر، خەڵک کڵاوێک لەسەر دەکەن، کە رۆخی هەیە و لە لباد دروست کراوە. لە بەستنی جەمەدانی سەر هەر ناوچەیە شێوەی خۆی هەیە، کە دەتوانی بەو هۆیەوە جیایان بکەیەوە: ئایا دیانن یا موسڵمانن یا لە چی تیرەیەکن.

ئاغاکانی هۆزی دزەیی پۆتینی درێژ لە پێ دەکەن. کوردەکان رێزی زۆر لە ژنان دەگرن و لەم بارەیەوە لە زۆر گەلانی تری موسڵمان پێشکەوتووترن. کچەکان تا تەمەنی ٧ و ٨ ساڵی جلوبەرگی رەنگاورەنگی کراوە لەبەر دەکەن، پاش ئەو تەمەنە بە رەنگێکی تۆختر، تەنیا ژنی سەرکردە کوردەکان نەبێ، ژنان بێ سەرپۆش دەگەڕێن. لە ناو کوردەکان ژنان سەربەستن لە قسەکردن لەگەڵ کەسی غەوارە، تەنیا (ئەورووپی) نەبێ، زۆرجار لە دیوەخانەکان لە گوندەکان ژنان پێشوازی لە میوانەکان دەکەن، بەڵام ژنی سەرکردە کوردەکان لەم بارەیەوە دوورەپەرێزن. ژنان جگە لە کاری ناوماڵ و کاری قورس، زۆرجار ئەرکی سەرۆک هۆز یا گوندی لەخۆ گرتووە. مردن لە ناو منداڵان زۆرە، شەریعەی ئیسلامی کاروباری کەسێتی و کۆمەڵایەتی رێک دەخا، ژنهێنان بەشیربایی باوە، جار هەبووە سەرکردەیەکی کورد (٥٠٠) دیناری داوە بۆ خواستنی کچێک لە بنەماڵەیەکی ناودار. جگە لە بڕە پارەیەکی تر و جلوبەرگێکی نایاب بۆ باوکی کچەکە. لە دابونەریتی هۆزەکانی کورد خواستنی کچە مامە بۆ کوڕە مام، کە بەمافێکی رەوا دادەنرێ، کە لە هەولێر بووم، لەم بارەیەوە رووداوێکی ناخۆش رووی دا، چونکە ئەو مافە پشتگوێ خرابوو.

کوردەکانی لیوای هەولێر یان نیشتەجێن یان نیمچە کۆچەرن، هەندێ خێڵ هاوینان بۆ کوێستانەکانی فارسی کۆچ دەکەن و زستانانیش لە هەولێر ژیان دەبەنە سەر، کاتێ کە گوندنشین لە گوندەکەی بێزار دەبێ یان لە نزیک هێڵی هاموشۆی سەربازە تورکەکانن، داری سەری خانووەکەی هەڵدەگرێ و بەولاغ بۆ شوێنێکی تر دەیگوازێتەوە. مرۆڤ کاتی گەشت لەو جۆرە گوندانەی زۆر بەرچاو دەکەوێ.

کاتی بەهار کوردەکان لە گوند دەچنە دەرەوە و رەشماڵ هەڵدەدەن، لەبەر هەواخۆشی و لەوەڕ و زۆربوونی کێچ و بۆنی ناخۆشی ریخی بەهاران. بۆ ئەم مەبەستە زۆرجار کەپر دروست دەکەن. کوردەکانی دەشتی هەولێر لە مانگی ئایار دەگەڕێنەوە گوندەکانی خۆیان. لە دەشتی هەولێر دیوەخانە لەسەر لووتکەی گردێک کە پاشماوەیەکی ئاشوورییە دروست دەکرێ. لە ناو کوردەکان بایەخی زۆری پێ دەدرێ، بەگوێرەی باری دارایی و پێگەی ئەو سەرۆک هۆزە لە ناو کۆمەڵ، لە ژوورێک یان سێ ژوور دروست دەکرێ. دیوەخانی (ئەحمەد پاشا) نموونەی ئەو جۆرە دیوەخانانەیە، لەگەڵ ئەوەی کە گوندی لەوانی دیکە زیاتر نییە، بەڵام دەوڵەمەندترین سەرۆکە لە هۆزی (دزەیی). گەرمکردنی ژوورەکان لە زستان بە تەپاڵە یان درک و دارە، کە زۆرجار بەم هۆیەوە فرمێسک لە چاوان دێتە خوار و بنمیچی خانووەکانیش رەش دەبن. هەر لەو دیوەخانانە کۆبوونەوەی ناوخۆ لەبارەی گرفتەکان یان پیلان دانان بۆ کوشتنی دوژمنەکان یان بۆ هەڵخەڵەتاندنی حکومەت. کورد پێی سووکایەتییەکی گەورەیە، ئەگەر بە نزیک دیوەخانی گوندا تێپەڕبووی و لات نەدا و چایەکت نەخواردەوە. من زۆرجار بەناچاری ئەو سەردانانەم کردووە.

رۆژێک سەردانی (ئیبراهیم ئاغا) سەرۆکی هۆزی دزەییم لە مەخموور کرد، کە بەناو ساڵان کەوتبوو، پاش بەخێرهاتنێکی گەرم، بەخێرایی مافوور راخران و بالیف دانران، بەرەو ژوورە سەرەکییەکەی دیوەخان رۆیشتین، زەوییەکەی رووت و زۆر

پاک بوو، خۆی قەننە و جگەرەی بەسەرمان دابەش کرد، کورد لە جگەرەکێشان ناوەستێ، تەنیا کاتی نانخواردن نەبێ، کیسەی تووتن و دەفتەری جگەرەی هەردەم بە پشتێندییەوە بەستووە، تا ئێستاش پیاوە پیرەکان بەردەئەستێ بۆ داگیرساندن بەکار دەهێنن، ئێستا زۆربەی خەڵک چەرخ بەکار دەهێنن، وا بزانم لە یابان هاتووە، هەندێ لە ئاغاکان قەننەی درێژیان هەیە، کە لە دار دروستکراوە، (حەمە ئاغا)ی بەساڵاچووی کۆیە قەننەکەی درێژی دوو پێیە، نێرگەلە لە کوردستان بەکار نایەت. لە دیوەخان پێڵاوەکانمان داکەند و لەسەر چینچکان دانیشتین، لە سەردانی سەرکردەیەکی کورد دەبی پەیڕەوی سێ خاڵ بکەی:

یەکەم: نابێ لاقەکانت بەرامبەر کەسێکی تر درێژ بکەی.. دووەم: نابێ بەدەستی چەپ نان بخۆی.. سێیەم: نابێ لەگەڵ سەگ یاری بکەی.. دواتر زەوی ژوورەکەیان بۆ فێنک کردنەوە ئاو پرژێن کرد.

زۆرجار بەبێ ئاگاداری ئێمە بەرخ سەردەبڕا، کە دەبووە هۆی دواکەوتنمان بۆ ماوەی دوو یان سێ کاتژمێر، ئەگەر نەمابایەنەوە ئەوا نیگەران دەبوون، هەروەک لەگەڵ (ئیبراهیم ئاغا) رووی دا، پاش خواردنەوەی قاوە، سەماوەر و کەرەستەی چا، کە لە ناو سندووقێک بوو دانرا، بۆ نیوەڕۆ گۆشتی بەرخ و ماستاو یان دۆ و نانی تەنک یان لە روون سوورەوەکراو. پێش نانخواردن یەکێک لە خزمەتچییەکان مەسینە و دەستشۆری هێنا بۆ دەستشووشتن، لە دوای نانخواردن دەستشۆرەکە سابوونیشی لەگەڵ دانرا، (ئیبراهیم ئاغا) بەشداریی لە نانخواردن نەکرد، چونکە پێشتر نانی خواردبوو. پاش نوێژی ئێوارە لەگەڵ (ئیبراهیم ئاغا) و میوانەکانی دیکە نانمان خوارد، کە بەشێوەیەکی باش لەسەر سینییەک ئامادە کرابوو. بۆ شەو رایەخ و لێفەی باشیان هێنا، لەو کاتەی کێچ لە مەخموور بوونی نییە، لەبەر ئەوە کەوتینە خەوێکی خۆش. ئیبراهیم ئاغا مرۆڤێکی بەساڵاچووی ژیرە، پێش کاتی نووستن بەجێمان دێڵێ. کاتێ کە رۆیشتین، بەگەرمی داوای مانەوەی لێ کردین، نیوەڕۆش لای ئەو دیسان نان بخۆین، زۆرجار وشەی بەخێرهاتنی و بەدوعای دووبارە دەکردەوە، دواتر هەردوو لا ماڵئاواییمان لەیەک کرد. لای کورد ئەسپ زۆر بەکار دەهێنرێ، لە دەشتی هەولێر هەندێ ئەسپ لە رەگەزە باشەکانی عەرەبین. نرخی ئەسپی رەسەن لە ٧٠ جونەیهە کەمتر نییە و هەندێکی تری دێرین لەوانە دەگاتە ٢٠٠ جونەیهە یا زیاتر. لە دەشتی هەولێر هێستر بۆ کاروباری کێڵان و بارکردن و باشەکەشیان بۆ سواربوون بەکار دێت. لە شارەکان کەسانی دیار و بەتەمەن لەبەر هێمنی بۆ سواربوون پەسندە، نرخەکەشی دەگاتە ٤٠ جونەیهە.

کەر لە هەموو شوێنێک هەیە و هەموو جووتیارێک باری دارایی هەر چۆنێک بێ، بەلانی کەم کەرێکی هەیە و بۆ هەموو کاروبارێک بەکار دەهێنرێ. لەبارەی دزینی کەر، ئەوە دیاردەیەکە زۆرجار سکاڵانامەم بۆ دەهات، نرخەکەی لە (٥) تا (١٠) جونەیهە دەبێ، کەری سپی گەورە گرانترە، چونکە بۆ سواربوونی ئافرەت داواکاری زۆرە.

کوردی ئەو ناوچەیە کە رەسەنن، لەگەڵ ئەو ئاژەڵانە رەفتاریان باشە، بە پێچەوانەی کوردی ناوچەی فارسی.

کورد توانای پەروەردەکردنی وشتری نییە، ئەگەر سەرۆکێکی کورد کەمێکی لەلا بێ، ئەوا بەکەسێکی عەرەبی دەسپێرێ بۆ چاودێریکردنی.

لەو ناوچەیەدا بزن و مەڕ بەخێو دەکرێ. بەرخ پێش شەڕ نرخی (٥) شلن بوو، بەڵام ئێستا هەمان بەرخ بە (٣٠) شلنە، باجی سەرانەش بۆ هەریەک لەوانە (٨) ئانەیە.

لە ئاماری ساڵی (١٩٢٠) ژمارەی مەڕ و بزن لە لیوای هەولێر (٢٠٠٠٠٠) سەر بوو، کە ئەمە داهاتێکە بۆ حکوومەت. رەشەوڵاغ زۆرە و بۆ زۆر کار بەکار دەهێنرێ، بەڵام بۆ گۆشتەکەی بەکەمی سەردەبڕێ، کاتێ کە لەسەر مردن دەبێ، گۆشتەکەشی تەنیا هەژارەکان دەیکڕن. شیری (چێڵ) بڕەکەی ئەوەندەی بڕی وڵاتی خۆمان (ئینگلتەرە) نییە، شیری بزن و مەڕ بەنرخترن، گاجووت بۆ جووتکردن و بارکردن و کاری دروێنە، بە تایبەتی لە ناوچەی گردۆڵکەکاندا، کە بۆ جووت پەسندە، جووتیارەکانی دەشتی هەولێریش بەکاری دەهێنن، پێستەکەشی بۆ پیشەسازی بەنرخە، نرخی گاجووت (١٢) جونەیهە، ژمارەیەکی زۆر لە گاجووتی هیندیان

بۆ کوردستان هێنا بۆ جووتکردن، سەرکەوتنی باشیان بەدەست هێنا. مانگا لەو شوێنانە زۆرە، کە ئاوی زۆرە، قەیماغ لە شیرەکەی بەرهەم دەهێنرێ. سەگ "گلاوە و هەموو ماڵێک بەلانی کەم دانەیەکی هەیە، جۆرەکەی گەورە و تووکن و زۆر درە". بۆ راویش (تاژی) کە ئەوانە سەگی راوی فارسین، بەکار دەهێنرێن.

پشیلە لە ماڵان هەیە، زۆربەیان کیوین. مریشک و عەلە شیش و قاز لە هەموو گوندێک بەخێو دەکرێ و هێلکەیان زۆرە.

کورد ئەگەر ڕێگای بۆ هەڵگرتنی پێ درا، ئەوا خەنجەرێک و دەمانچە و چوار فیشەکدانی پڕ لە فیشەک هەڵدەگرێ و لە قەد و پشتێندی خۆی دەئاڵێنێ. بایەخێکی زۆریش بە تفەنگەکەی دەدا. هۆزە گەورەکان چەکداری باشیان هەیە، تفەنگەکانیان تورکی جۆری (٣٠١)ە، ئەو کۆمەڵگایانەی کە دەسەڵاتیان لەوان نزمترە، ئەوا ژمارەیەکی زۆری تفەنگی ماوزەری (٤٥٠)ی کۆنیان هەیە. خەنجەر درێژی کالانەکەی یەک پێ دەبێ و لە خوارەوەی نەختێک چەماوەتەوە، کە لەلای کورد و عەرەب بەو شێوەیەیە، کاتی بێکاری کەسانێک هەن خۆیان بەڕاوکردنی کەروێشک و مامز و بزنە کێوی و بەراز خەریک دەکەن. تفەنگی راو کەمە. هەندێ یاری لێرە باوە، قومار لە گوندەکان دەگمەنە، یاری کاغەز باوە. زوڕنا و دەهۆڵی لێ دەرچێ بەکارێکی بەدڕەوشتی لە قەڵەم دەدەن. لە گوندەکان مەلا ئەرکی فێرکردنی لەئەستۆیە: بەفێرکردنی قورئان بە پلەی یەکەم و هەندێ نووسینی فارسی وەک (گولستان)ی سەعدی. زۆربەی سەرکردە بەرزەکان دەتوانن فارسی بنووسن و بخوێننەوە.

جووتیاری کورد گوێڕایەڵی سەرۆکەکەیەتی و پشتگیریی لێ دەکا، هەتا ئەگەر لەگەڵیشی خراپ بێ.

**هۆزەکان**

ئاغاکانی هۆزی (دزەیی) دەستیان بەسەر زەوییەکی زۆر داگرتووە، سوورچییەکان شوێن و پێگەیەکی بەرچاویان هەیە و بەشێکیان لەلایەکی کەناری زێی گەورە لە ناوچەی ئاکرێ دەژین، بەشەکەی تریان لە باشووری ناوچەی رواندزن، بنەماڵەیەک لە باکوور هەن سەر بەشێخە ئایینییەکانن.

لەبارەی پەیمان بەستنی هۆزەکان بە مەبەستی بەهێزکردن بۆ شەڕکردن لەگەڵ دوژمن، بڵباس و خۆشناو دیارترینیانن.

ئەو کوردانەی سەر بەهیچ هۆزێک نین. وەک نەریتێک دەبنە جووتیاری یەکێک لە ئاغاکانی شار، ئەویش هەوڵ دەدا بۆ پاراستنی مافەکانیان.

هەندێک لە ئاغاکان جووتیارەکان و کەسانی ناو هۆزەکەی دەچەوسێننەوە، بەڵام هەندێکی تریان بە پێچەوانەوە وەک باوک وان بۆ کوڕەکانی. هەندێک لە ئاغاکان ئەو جووڵەکە و دیانانەی، کە لەلایانن وەک کۆیلە سەیریان دەکەن. سەرۆک هۆز دەیەکی بەرهەمی هەیە، چونکە خاوەن زەوییە، وەک نەریتێکی خێڵەکی دەبێ لە سەرەتای ساڵ مەڕێکی ئاووس لە هەر مێگەلێک لەلایەن کێخوای گوندەکان و ئاغای خێڵە بچووکەکان بۆ سەرۆک هۆزی گەورە ببەن، هەروەک لە جەژنانیش دیاری بۆ دەبەن.

پیاوەکانی هۆز هەردەم ئامادەن بۆ پشتگیری لە سەرۆکەکانیان بەرامبەر هەر دوژمنێک، ئەگەرچی جارێک ئەندامانی هۆزی (دزەیی) لە ناکۆکییەک لەگەڵ حکوومەت پشتگیرییان لە ئاغاکانیان نەکرد.

یاسای خێڵەکی وەک یاسایەکی کۆن (یەک) بەرامبەر (یەک) پەیڕەو دەکرێ، سەرۆک هۆز هیچ دەسەڵاتێکی دادوەری نییە ئەگەر حکوومەت پێی نەدا، ئەو دەتوانی وەک ناوبژیوان هەڵسوکەوت بکا، بەو مەرجەی هەردوولا رازی بن یان داوا بکەن. سزای تاوان لە یاسای هۆزەکان تەنیا ئەوەی پەیوەندیی بە ئابڕووی ئافرەت نەبێ پەیڕەو ناکرێ.

ئەگەر یەکێک غەوارە بوو و لە گوندێک بە ئاگاداری کێخوای گوندەکە ماوە و دزی لێ کرا، ئەوا کێخوای گوند بەرپرسە بۆ گەڕاندنەوەی کەلوپەلە دزرابییەکە.

ئابڕووی ژن لای کوردان زۆر بەنرخە و یاسا زۆر توندە، هەر هەڵەیەک لەمبارەوە لەلایەن ژنان کرا ئەوا چارەنووسی کوشتنە لەلایەن مێردی یان برای یان ئەو کەسەی لێی بەرپرسە. لەو کاتەی لە هەولێر بووم، زۆر ژن بەوجۆرە کوژران و پاش ماوەیەکی زۆر ئاگادار کرامەوە. بیستم جارێک ژنێکی پاک لە ناو توورەکەیەکی بەستراو ئاخنرا بوو و

فرێ درابووە ناو زێ.

لە مانگی تەمووزی ساڵی ١٩٢٠ لە گوندی (کەپەنەک رەش) نزیک چیای (قەرەچووغ) تاوانێک رووی دا، سەرۆکی گوندەکە (خاڵە بەکر) خوشکێکی بێوەژنی بەناوی (ئامینەخان) لەگەڵ (کچە پاکەکەی وەک گوڵی بەهار) (فاتم) لە ژێر چاودێریی ئەودا بوون. ئەو کچە دوو کوڕە مامی هەبوو (فەرحانە شەل) و (رەحمان ئاغا) لە گوندێکی ئەوبەر گردەکە نیشتەجێ بوون. فەرحان براکەی نارده لای خاڵە بەکر بۆ خواستنی (فاتم) کچی خوشکی، بۆ چەند جارێک داواکارییەکەی پەسند نەکرا. دواتر یەکێ لە سەرکردە گەورەکانی (دزەیی) بەناوی (حاجی پیرداود ئاغا) بەنهێنی بۆ خواستنی ئەو کچە بۆ کوڕەکەی (مەعرووف) بەبڕی پارەیەکی زۆر داواکاری پێشکەش کرد و (خاڵە بەکر) رازی بوو، کارەکە زۆر بەنهێنی ئەنجام درا و لەلایەن قازی هەولێر بەفەرمی تۆمار کرا، بەڵام کارەکە بێ سوود بوو، لە شەوێکی تاریک لەو کاتەی کە (فاتم) لەگەڵ دایکی لە کەپرێکی دەرەوەی ماڵیان نووستبوو، دوو پیاو هەڵیان کوتایە سەر ئەو کچە و خەنجەریان خستە ناو جەستەی تا گیانی دەرچوو، دایکە پیرەکەشی بەچارەنووسێکی سەرسوڕهێنەر رزگاری بوو. (رەحمان ئاغا) یەکێک بوو لە تاوانبارەکان، ترس هەموو هۆزەکەی داگرت. کوشتنی ئەو کچە هەڵەیەکی گەورە بوو، چارەسەری دروست دەبوایە یان (حاجی پیرداود) بکوژرێ یان کچەکە هەڵبگیردرێ و بفڕێنرێ، چونکە ئەو هیچ دەسەڵاتێکی لە ماڵی (خاڵە بەکر) نەبوو. (حاجی پیرداود) هاتە لام وەک (زندیقێک) فرمێسکی نەهەنگامی هەڵدەڕێشت، سکاڵای ئەوەی دەکرد، کە کوڕەکەی تووشی ریسوایی هات. (کوڕەکەی یەکێک بوو لەو کەسانەی کە لەگەڵ من نەدەگونجا).

من لەمبارەیەوە هیچم پێ نەدەکرا، لەبەر رای گشتیی هۆز، کە پشتگیری لە بکوژ دەکا. بۆ پیاوە بکوژەکەش سزاکە سووکە و بەدانی خوێنبایی لێی رزگار دەبێ، کابتن های نموونە لەو تاوانانە دەنووسێ.

زۆرجار تاوانی کوشتن بەبڕی پارە چارەسەر کراوە و بۆ ئەم مەبەستەش هەر کەسێک لە رووداوی کوشتن جۆرە نرخێکی هەیە. نرخی جووتیارێکی کرمانج لە چینێکی مامناوەندی (٩٠) جونەیهە، ژنەکەی نرخی (٤٥) جونەیهە، یەکێ لە قاچەکان و دەستەکانی هەریەکە و نرخێکن، بۆ نموونە بڵێین (٢٠) جونەیهی، زۆرجار لە بری پارە ماڵات یان دانەوێڵە یان کچێک بەمەبەستی شووکردن دەدرێ. بۆ نموونە: ئەگەر پیاوێک نرخی (٩٠) جونەیهی. دەبێ کچێک و ٣ چێڵ و کەرێک بدرێ، ئەگەر ژمارەی کوژراو زیاتر بێ، ئەوا بڕی پارەکە زیاتر دەبێ. بۆ نەهێشتنی دوژمنایەتی و تۆڵە زۆرجار هەر لایە کچێک بەشوو بۆ لایەکەی تر پێشکەش دەکا.

لەو پێنج یا شەش ساڵەی دوایی، دوو شەڕی گەورە لە بەینی دوو لقی هۆزی (دزەیی) رووی دا، کە هەریەک لەبەرەی (ئەحمەد پاشا) و (ئیبراهیم ئاغا)، خۆیان بەمافی کڕینی گوندێک دەزانی کە دەفرۆشرا، لەبەر ئەوە (٦٠) پیاو گیانیان لەدەست دا. دووەم کە هێزەکانمان گەیشتە کەرکووک، شەڕێک لە نێوان بەرەی (ئیبراهیم ئاغا) و (حاجی پیرداود) لەسەر بیرێکی ئاو بەرپا بوو، هەر لایەنە بەهی خۆی دەزانی، یەکێ لە پیاوانی (حاجی پیرداود) کاتی دەرهێنانی ئاو لە بیرەکە کوژرا، دواتر کوڕە نۆبەرەکەی (ئیبراهیم ئاغا) کوژرا. بەگەیشتنی هێزەکانی بەریتانی کێشەکە بەخێرایی چارەسەر کرا.

کێشەکان زۆربەی لەسەر زەوی و موڵکداری و بەرەڵاکردنی ماڵات بۆ ناو کێڵگەی کشتوکاڵی لایەنی بەرامبەری و ئەبێتە هۆی کوشتن. بۆ ئەم کێشانە زۆرجار مەلا ناوبژیوانی دەکا یان سوێند دەخورێ یا پەنا بۆ حکوومەت دەبەن. سوێندیش بەم شێوەیە ئەنجام دەدرێ. دەست لەسەر قورئان دادەنرێ و دەڵێن : (واللە- باللە- تاللە) تاکی کورد لە سوێند خواردنی بەدرۆ شارەزایە و رۆژانە چەندین جار سوێندی بەدرۆ دەخوا و کاتێ، کە سوێندی خوارد متمانەی پێ مەکە.

باشترین سوێند لای کورد (تەلاقە) کە بۆ هەر ژنێک چوار جارە و ئەو سوێندە بەدرۆ ناخوا، چونکە باش دەزانێ، کە ژنەکەی لە دەست دەچێ و کەسوکاری دەیبەنەوە و دەبێ بۆ جاری دووەم بە (مارە بەجاش)، واتە لە پیاوێکی تر مارە بکرێتەوە و دیسان تەلاق بدرێ، ئەوجا لە

پیاوەکەی جارانی مارە بکرێتەوە.

هۆزە کوردەکانی نێوان هەردوو زێ (گچکە و گەورە -و-) ئەمانەن: (دزەیی) (٣٠٠٠٠) پیاو و (٦٠٠) سوارە و (٤٤٠٠) چەکداری باشی هەیە. ئەوانە لە ناوچەی گردەکان پێش سێ سەدە هاتوون و لە گوندەکانی دەوروپشتی (قوشتەپە) نیشتەجێ بوون و دواتر توانییان تا زێی دیجلە دەسەڵاتیان بەسەر ئەو زەوییانەدا هەبێ، گوندەکانی دەوروپشتی هەولێر لەگەڵ ئەوەی کە کوردن، بەڵام سەر بەهیچ هۆزێک نین، لە باکووری ناوچەکە خێڵی بچووکی (کوردی) هەیە، چالاکن و (١٥) گوندیان هەیە، پێش ماوەیەک توانییان پاشەکشێ بە (دزەیی) بکەن و سەرکەوتنییان بەدەست هێنا، ئەم خێڵە لقێکیان لە ناوچەی (کۆیە) هەیە. لە شەقڵاوە خۆشناو (١٠٠) گوندیان هەیە و ژمارەیان (١٠٠٠٠) کەسە.

لە باکووری (بەستۆرە) زراری هەیە و (١٢) گوندیان هەیە، لە پشتەوەی ئەوان (سوورچی) هەیە، کە بە درێژایی کەناری زێی گەورە تا رووباری رواندز (٤٠) گوند و لەوانیە ژمارەشیان (٢٥٠) کەس بن. ئەوانە لە شەڕی یەکەمی جیهانی تووشی نەهامەتییی زۆر هاتوون. هەندێ ئاغاکانی رواندز (٧) تا (٨) گوندیان لە ناوچەی گرد و شاخەکان هەیە.

هۆزی (باڵەک) لەبەرئەوەی رێگای سەردکییان لەبەردەستدایە، لە باکووری دۆڵی رواندزن. مەترسیداری هەیە، پیاوانی هۆزەکە هەژار و بێ زەرن، بەڵام ئاغاکانیان لە جەردەیی و دزی نەبێ، لەسەر رێگا سەرەکییەکە شتێکی تر نییە خۆیان پێوە خەریک بکەن. (٦٠) گوندیان هەیە، کە دانیشتوانی زۆری لێ نیشتەجێن.

هۆزی (شێروانی) و (برادۆست) لە ئەوپەری باکووری ناوچەی رواندزن. شێروانی لە ناو خۆیان یەکگرتوون، بەڵام زۆر دواکەوتوون، ژمارەی هەردوو هۆز (٨٠٠٠) کەسن. لەلایەک تووشی نەهامەتی هاتوون و لەلایەکی تر تووشی برسیەتی و توندوتیژی رووسەکان هاتوون.

هۆزە کۆچەرەکان سیانن: (هەرکی) و (خەیلانی) و (بۆلی) لە نێوانیان هەرکی لە هەمووان گرنگترە، ژمارەیان (٢٠٠٠٠) کەسە، هەندێکیان بە درێژایی ساڵ لەسەر چیاکانی سنووری تورکیا و ئێرانی دەمێنێتەوە، هەندێکی تریان دێنە ناوچەی ئاکرێ و پۆلێکی تریان، کە (٨٠٠٠) کەس دەبن بە رواندزدا دێنە (دیرە) و باستورە، هەرکی پیاوی ئازان و چەکدارەکانیان تفەنگی باشیان هەیە و بەهەر شوێنێکدا بچن، وەک پۆلێک کلۆ وان، دەڵێن بەهەر شوێنێکدا بچن، تاڵان و راو و رووتی دەکەن، بەڵام لە کاتی مانەوەم لە هەولێر بەشێوەیەکی دیار رەوشتیان باش بوو.

(خەیلانی) و (بۆلی) هەردوو هۆز لە چەند لقێک پێکهاتووە، بێ ئەوەی هەر کامێکیان سەرکردەیەکیان هەبێ، وا باوە کە ئارەزووی دزیکردنیان زۆرە، (خەیلانی) ژمارەیان نزیکەی (١٠٠٠) کەسە لە چیاکانی باکووری باڵەک دێن لە دەوروپشتی شاری هەولێر رەشماڵ هەڵدەدەن. (بۆلی) لەلای باشووری باڵەک کاتی زستان بەرەو (کۆیە) دەچن.

### دانیشتوانی شارەکان و نەتەوەکانی تر

ئەو هێڵەی کە لە بەرامبەر مووسڵ درێژ دەبێتەوە و بە هەولێر و ئاڵتوون کۆپری و کەرکووک و کفری و قزلەبات (سەعدیە) تا مەندەلیدا دەڕوات، هەندێ لە دانیشتوانی بەزمانی تورکی قسە دەکەن.

ئەوانە کە بەخۆیان دەڵێن (تورکمان) دەیانەوێ بیسەلمێنن، کە سەر بەئالی عوسمان نین، هەندێ ئاڵۆزی لە مەسەلەکە و تێگەیشتنی هەیە. بەگشتی و گومانی تێدا نییە، ئەوانە دەگەڕێنەوە سەر ئەو نشینگەیانەی کە (سەلاجیقە) لێی نیشتەجێ بوون، کە بنکەی فەرمانڕەواییان بووبێ. (سەلاجیقە) بەشێکن لە نەتەوەی تورک، ئەوانە لە سەدەی (١١و١٢) لە ناوجەرگەی ئاسیای ناوەڕاست دەرچوون و دەستیان بەسەر ئەو ناوە داگرتووە و فەرمانڕەواییان تێدا دامەزراندووە، یان ئەوەتا لە نەوەی (ئال عوسمانن)، زمانیشیان لەگەڵ زمانی (ئەستەنبۆڵ) جیاوازە.

لە هەولێر چیرۆکێک هەیە: گوایە ئەوانە لە نەوەی ئەو سەربازانەن، کە سەربازگەکەی فورسی (لەوانەیە خەڵکی ئازربێجان بووبن کە بە تورکی قسە دەکەن) بەجێ ماون، کە لە سەردەمی (نادر شاه) کە لە ساڵی

(١٧٣٢) ئەو شارەی داگیر کردووە. خانوو و خواردن و نەریتی تورکمانەکانی هەولێر، هەروەک کوردەکانی دەوروپشتیانن، بەڵام لەوان پێشکەوتووترن. ئاغاکان میوانخانەی دروستکراوی بەبریقە و تازە داهاتووی ئاوەدانیان هەیە، کە بە خشت دروست کراون و بە مەرمەڕ راخراون و لە ناوەوەش بە کۆڵەگە راوەستاوە. هەندێکیان کەوتوونە سەر رۆخی قەڵاکە و بەڵەکۆنێکی هەیە، کە مرۆڤ دەتوانی لە دووریی چەندەها میل ئەو زەوییانەی دەوروپشتی ببینی، ژوورەکان لە دەوری پانتاییەک دروست کراون، کەمێک درەختی لێ چێنراوە، ئاغاکان ئەو میوانانەی کە لە دەرەوەی شار دێن لەو دیوەخانەیان دادەنێن، ئەوانەی لە دێهاتەکانیش دێن، هەر لەو شوێنە نیشتەجێ دەبن، هەر سەرکردەیەک ئاشنایەتی لەگەڵ یەک یان دوو ئاغا هەیە، ئەو پەیوەندییە هەر لە کۆنەوە ئاوا بووە، وەک نەریتێک ئەو ئاغایانە لە گوندەکانیان دیاری وەکو میوەجات و پەنیر و شتی تریان بۆ دەبەن، سەرکردەی گوندەکانیش بەرژەوەندییان لە گوند رەچاو دەکەن، ئەگەر پەشێوییەکیش لە ناو هۆزەکان رووی دا، ئەوا ئەو ئاغایە نوێنەرایەتیی ئەو سەرکردە دەکا لە شار. هەندێ لە ئاغەکانی هەولێر جلوبەرگی ئەوروپی لەبەر دەکەن، کاتی نان خواردنیش زۆربەیان جلوبەرگی نیمچە ئەوروپی بەکار دەهێنن.

ئەوان لەسەر کورسی دادەنیشن و قاپ و چەقوو و چەنگاڵ و ملاک بەکار دەهێنن. دابونەریتی ژنهێنان لە شار بۆ گوند جیاوازە، لە شار کەسوکاری بووک و زاوا یارمەتیی مارەیی کچەکە دەدەن، بەڵام لە گوند دەبی گەنجەکان پارەیەکی زۆر کۆکەنەوە بۆ کڕینی کچ. ژن بە توندوتیژی خۆی دادەپۆشێ و گۆشەگیرە. ئاغاکانی ناو شار گوندێکی زۆریان هەیە و ژیانیان سەقامگیرە و زۆربەیان لە گوندەکانیان خانوویان هەیە و هەر کاتێ بەسەردان چوون لێی نیشتەجێ دەبن. زۆر بە زیرەکی بایەخ بە کشتوکاڵ دەدەن، ئەوانە ئارەزووی پەرەپێدانی بیر و هۆشیان هەیە، رۆژنامەکان بە رێکی دەخوێننەوە، بەسەربەستی باسی سیاسەتی ئەوروپی و رۆژهەڵاتی دەکەن. یەک یان دووان لەوان سامانەکانیان لە ئەوروپا بۆ بەرهەمهێنان خستۆتە گەڕ. ئەگەر بارودۆخ بۆیان باشتر بێ، ئەوا چالاکتر دەبن. بۆ بەکارهێنانی چاکسازیی تازە لە کشتوکاڵ و پەیوەندیی بازرگانەکانیان پتەوتر دەکەن. سەرۆکی بنەماڵەکان کاری فەرمانبەری لە ئاستی کەسایەتییان بەکەمتر دەزانن، بەڵام گەنجەکانی خزمەکانیان هان دەدەن بۆ دامەزران لە فەرمانگەکانی حکوومەت. سەرچاوەی سەرەکیی داراییان (گەنمە) لە ساڵانی دوای شەڕ پارەیەکی زۆریان پاشەکەوت کرد، چاوچنۆکیی ئەوانە لە سەرکردە کوردەکان کەمتر نییە، ئەوانە لە تێکۆشان و هەوڵدان دان بۆ ئەوەی کێڵگەکانیان زۆرتر بێ.

هەندێ لە ئاغا گەنجەکان زۆر بەلەنجەولار و بەفیزن، ئەوانە بەسواری ئەسپ دەچنە گوند و سەگی راو بەدواوەیانە. کاتێ خۆر ئاوابوون لە ناو شار دەبینران بەسەری قیتەوە، کەواکانیان بەرەنگی کراوە لە دواوەیان بەرز دەبۆوە.

لە کەرکووک و هەولێر ئەو کەسەی خوێندنەوە و نووسین بزانێ و خاوەن زەوییوزار بێ، پێی دەڵێن (ئەفەندی) و ئەوانە جلوبەرگی ئەوروپی لەبەر دەکەن، وشەی (ئەفەندی) تورکییە، بەرامبەر (سێر)ی ئینگلیزییە، زۆرجار (ئەفەندی) وەک رێزێک بۆ کەسایەتی و توێژەکانی تر بەکار دێت.

فەرمانگەکانی حکوومەتی تورکی پڕ بوو لە ئەفەندی تەمەڵ و گەندەڵ، هەموو رۆژ لە چایخانەکان دەبینران، دەموچاویان پاک نییە، لەشیان پیسە، قەرەوێتی ملیان نارێک بەستراوە، دوو یان سێ قۆپچەی پانتۆڵیان دانەخراوە، ئەو جۆرە کەسانە وایان لە ئەفەندی کرد، کە مانا رەسەنەکەی خۆی لەدەست بدا و بەریسوایی ناو ببرێ، یەکێک لە حاکمە سیاسییەکان بەوە زۆر نیگەران دەبوو، کە پێی بگوترابا (ئەفەندی)..

پاش چینی (ئەفەندی) خاوەن دوکاندارەکانن، کە لە بازاڕی هەولێر زۆرن، دوای ئەوان پێستە خۆشکردن و پیشەسازیی لباد، هەروەک ئەوان کاروانچی و خاوەن کەر و هێستەرەکان، کە تاکە هۆیەکی گواستنەوەیە لە بازرگانی. لە ژنان

هەن بۆ بژێوییان کاری چنینی لۆکە دەکەن. هەژاری و نەداری کەمن، بەردەستەکردنی کرێکار کارێکی زۆر قورسە.

جیاوازیی نێوان دانیشتوانی شاری هەولێر و کوردەکانی دەرەوەی ئەوەیە، کە لە هەموو شوێنێک ئەو جیاوازییە لە نێوان شارستان و خەڵکی لادێ هەیە. هەولێرییەکان گاڵتە بەو کوردانە دەکەن و بەمرۆڤی ناتێگەیشتووی رەق و وشکیان دەدەنە قەڵەم. کرمانجەکانیش ئەوان بە مرۆڤی ژنانەی بێ رەوشتی گەندەڵ لە قەڵەم دەدەن.

لەگەڵ ئەوەی کە مەی و قومار و ناپەسندی تر لە هەولێر هەیە، بەڵام لەم بارەیەوە لە زۆر شاری تری عێراق باشترە. ئاغا بەساڵاچووەکان مەی ناخۆنەوە، ئەنجوومەنی شارەوانی کارەکانیان بەراستی و بەبێ جیاوازی ئەنجام دەدەن، ئەو دیاردە نامۆیانەی، کە لە شاردا هەیە گومانی تێدا نییە لە شوێنی ترەوە بۆی هاتووە.

لەگەڵ ئەوەی کە خەڵکی شاری (کۆیە) هەموویان کوردن، ئەوان لەگەڵ خەڵکی شاری هەولێر هاوشێوەی یەکترن. بەڵام ئاغاکانیان بە ئاغای هۆزەکان دەچن، نەک بە ئاغاکانی هەولێر. هەولێرییەکان تا رادەیەک پێشکەوتووترن.

پێشکەوتنی خەڵکی رواندز زۆر لە دوای گوندنشینەکانی دەشتی هەولێر دێن. چەند تیرەیەک لە جوولەکە لە شارەکانی هەولێر و کۆیە و گوندی (بێتواتە)، کە لەوپەڕی ناوچەکانی هۆزی خۆشناوە و لە (باتاس) لە دەشتیی حەریر هەن، لە شوێنی تریش لە زۆر گوندی کوردستان دەبینرێن، کە خاوەنی کۆگای گشتیی بچووکن. لەبەرئەوەی ناوچەکە کشتوکاڵییە و بازرگانی بە پلەی دووەم دێت، جوولەکەکان وەک ئەوانی بەغدا گوزەرانیان باش نییە، دەوڵەمەندیان نییە، بازرگانیان لە هەولێر کەمە، هەندێ دوکانی کوتاڵ فرۆشتنیان هەیە، زۆربەیان کاری خۆشکردنی پێستە و چنین دەکەن، تەنیا ئەوان ئارەق لە مێوژ دەپاڵێون، چونکە بۆ موسڵمان قەدەغەیە، بەڵام هەندێ موسڵمان دەیخۆنەوە، خەڵکەکە خۆیان لە جوولەکە دەپارێزن و وەک گاڵتە پێکردنێکیش رووی خۆیان لێ وەردەگێڕن. لە گوندەکانیش زۆرجار ئەوانە هەڵسوکەوتی خراپیان لەگەڵ دەکەن، هەرچەندە من نەمبیستووە ئەوانە وەک نەریتێک چەوسانرابنەوە یان تووشی دوژمنداری هاتبن و خوێن رژا بێ. هەندێ جار کچانی جوولەکە فڕێنراون و داوای گۆڕینی ئایینیان لێ کراوە.

ئەگەر کوردێک فەرمانبەرێک ریسوا بکا، پێی دەڵێ: "جوولەکە لە تۆ باشترە" یان دەڵێن: "هەتا جوولەکە دەتوانێ خۆی بەسەردا بسەپێنێ". جوولەکەکان بەزمانی تایبەتیی خۆیان قسە دەکەن و دەنووسن، ئەوان لە شار لە بری کوردی و تورکی حەز دەکەن بە عەرەبی قسە بکەن.

دوو گوندی دیانان هەیە، لە (عەنکاوە) بە دووریی (٣) میل لە هەولێرەوە، (هەرمۆتە) لە دەوروبەری کۆیەیە. بنەماڵەی تریش لە ناو شەقڵاوە و کۆیە هەیە، لە هەر چوار شوێنیش کڵێسەیان هەیە. ژمارەی هەموو دیانەکانی ناوچەکە (٤٠٠٠٠) کەس دەبن، لەوانە (٢٥٠٠) کەسیان لە عەنکاوە نیشتەجێن. دەڵێن دوو یان سێ سەدە پارچەیەکی فراوان لە زەوی نزیک رواندز لە ژێر دەستی ئەوان بووە. تا ئێستا بەو دەشتەی باکووری رواندز دەڵێن (دەشتی دیانا): لەوانەیە پێش هاتنی محەممەدییەکان (موسڵمانەکان -و-) خاوەن هەموو



ئەو زەوییە شەپۆلاوییانە بووبن، کە لە نێــــــوان زێی دیجلە و پێش بەرزاییەکان لە رۆژهەڵاتی کەرکووک بەسەرەوە، ئەوانە سامین و زمانی کتێبە پیرۆزەکانیان زمانێکی تایبەتە، هەمووشیان کوردی دەزانن. جارێک داواکارییەکم بەدەست گەیشت، کە پیاوێک لە عەنکاوە داوای کردبوو ببێتە ئینگلیز، چونکە لەگەڵ قەشەکان بەشەڕ هاتبوو. ئەو قەشانە بۆ ئەوان نەفرەتن، لە عەنکاوە شەش و لە شوێنەکانی تریش سێ یا چوار هەن، زۆربەیان خوێندەواری باشن، بەڵام دەمارگیرن، بەبیری خۆم ئەوانە بیریان تەسکە لە جیاکردنەوەی چاک و خراپ، کار و پۆستەکەشیان بۆ زاڵبوون بەسەر خەڵک بەکار دەهێنن. بەرامبەر حکوومەتیش خۆیان بە بەرپرس و دەمڕاستی ئەوان دادەنێن. قەشەکان جلوبەرگی تایبەت بەخۆیان لەبەر دەکەن، دیانەکانی تر جلوبەرگی کوردییان لەبەرە، لە عەنکاوە کورتەکەکەیان درێژترە و سەڵتەی کورت لەسەری لەبەر دەکەن، سەروکڵاویان بچووکترە و توندتر دەیبەستن. دیانەکان چەند سەدەیەک لە ژێر دەستی ئەو محەممەدییانە بووبن، دەورەیان داون، لەبەر ئەوە ئازایەتییان لەدەست داوە، هەردەم بەوورەی لاواز و ملکەچی ناوزەد دەکرێن، ژیانی سەختیان زۆر دیوە، ئاغا چاوچنۆکەکان بەردەوام هەوڵیان داوە بۆ داگیرکردنی زەوی، مێگەلەکانیان، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی و بە ئاشکرا بە لێبووردەیی رەفتاریان لەگەڵ دەکرێ و رای گشتی بەوە نارازییە، کە دەستدرێژی بکرێتە سەریان، لە کۆتایی شەڕ حکوومەتی تورکیا فەرمانی دا، کە قەسابخانەیەک بۆ تەفرو و تووناکردنی خەڵکی عەنکاوە دابنێ، بەڵام دانیشتوانی هەولێر بەمە رازی نەبوون. لە کاتی تێکچوونی باری ئاسایش و بارودۆخی ناوچەکە، دیانەکان خاوەیان داوەتە یەکێ لە سەرکردەکانی کورد لە بری پارێزگاری و بەرگری لێیان. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوانە هەردەم ژیانێکی بەترس و گومان دەبەنە سەر. ئەوان بەردەوام پاشملە باسی خراپی محەممەدییەکان دەکەن، ئەگەر وانە بێ ئەمە بەخراپی بەسەریان دەشکێتەوە، ئەگەر رێگاشیان پێ بدرێ بچنە لای حاکمی سیاسی، هەموو رۆژ چیرۆکی زۆر دەهۆننەوە، کە زۆربەی راست نییە. ئەمەش شتێکی ناسروشتییە لەبەر ئەو رق و قینەی کە لە ناو محەممەدییەکان هەیە. دیانەکانی شەقڵاوە کە کەوتوونە ناوەندی ناوچەیەکی هۆزدەگەری، ئەوان تا رادەیەک رەفتاری باشیان لەگەڵدا دەکرێ. ئەوان باوەڕیان بەو سەرۆکە هەیە، کە گەورەیانە و لە ژێر دەستی ئەو سوود لە سامان و داراییەکانیان لە کەشێکی هێمن وەردەگرن و کەس دەست لە کارەکانیان وەرنادا. دیانەکانی شەقڵاوە و کۆیە بەکاری جۆلایی خەریکن. ئەوانەی شەقڵاوە باغچەی فراوانیان هەیە، ئەوان ئەو کالایە دەچنن، کە کوردەکانی ناوچەی گرد و بەرزاییەکان بۆ پۆشاک بەکاری دەهێنن. لەلای کوردەکان جۆلایی وەکو بۆیاغچی بەکارێکی سووکی دادەنێن.

لەوانەیە ئەوە بووەتە هۆی گوزەرانی دیانەکان لەو ناوچانەدا. لە هەرمۆتە و عەنکاوە بەکاری زەوی کێڵان خەریکن، لە عەنکاوە دۆمێکی زۆریان لە کێڵگە و لەوەڕگای گەش و سەوز هەیە، کە بەپیتترین زەوییە لە دەشتی هەولێردا.

لە ساڵی (١٩٢٠) (٦٠٠) تەن جۆ و هەمان ژمارە لە گەنمیان بەرهەم هێناوە، جگە لە بەرهەمی تر، ئەوانە باشترین جووتیاری ئەو ناوەن.

لەبەر چڕیی دانیشتوان لە عەنکاوە، ئەو زەوییانە بەشیان ناکات، پەنا دەبەنە بەر ئەو زەویوزارانەی، کە لە نزیک زەوییەکانی خۆیانن و موڵکی سەرکردە کوردەکانن، بەو مەرجەی کە وەک جووتیارە کوردەکان نەچنە پاڵیان و دوور نەکەونەوە. هەندێ لە گەورە جووتیارەکانی عەنکاوە شوێن و پایەی بەرزیان هەیە، لەوانە: (خواجە سیبی) و (خواجە شابۆ). خواجە نازناوێکە بۆ پیاوی بەساڵاچوو بەکار دێت. ئەو دوو پیاوە بەرێگای ژن پەیوەندییان بەهەندێ بنەماڵەی شکۆداری هەولێر هەیە. چونکە محەممەدییەکان کچە دیانەکانیش دەکەنە هاوسەری خۆیان، بەڵام کچەکانی خۆیان بەشوو نادەن بۆ کەسانێ، کە موسڵمان نەبن، ئەو دوو پیاوە زۆر بە رەوشت و گوێڕایەڵ و خۆشەویستن، بە تایبەتی (خواجە سیبی)، ئەو بە خۆشەویسترین بەساڵاچووی ناو دڵم دادەنێم، کە لە هەموو وڵاتانی رۆژهەڵات ناسیومن. دەسەڵاتدارانی تورکی و بەریتانی بەگوێرەی پێویست بەکاری هێناون بۆ

خەملاندنی بەروبووم، بەمەبەستی وەرگرتنی باج. لەبەرئەوەی حکوومەت و خەڵک ئەوان بە دەستپاکتر دەزانن لە محەمەدییەکان بۆ ئەم مەبەستە.

من وەک نەریتێک ئەوانم لەگەڵ خۆم دەبرد، کاتێ کە لە ناوچەکە دەگەڕام، لەو کاتەی بەروبووم پێ دەگەیشت، هەستیشم بەوە دەکرد کە دۆستایەتیان لەگەڵ سەرکردە کوردەکانی دەشتی هەولێر هەیە، ئەوانە ئارەزووی کارکردنیان لەلای موسوڵمانەکان هەیە، لەم بارەیەوە متمانەیان لە موسڵمانەکان زیاترە. ئیشکەرەکەی من، کاتێ کە لە هەولێر بووم، ناوی (فیردو) بوو، کە خەڵکی عەنکاوە بوو، مرۆڤێکی رەزا قورس بوو، بەڵام ئارەزووی لە کارکردن هەبوو، دەستپاک و راستگۆ بوو، لە ژێریشی مامناوەندی بوو. لەگەڵ ئەوەی ئەو دیانانە شت هەڵدەبەستن و قسە و رەفتاریان یەک نییە، ناکۆکی خێزانی و کۆمەڵایەتی لە ناویاندا زۆرە، وا باوە کە ماڵی دزراو لەلایان هەیە و گڵی دەدەنەوە. بەڵام نهێنییەکەیان لە راستگۆیی و دەستپاکیدایە، کە ئەمە شتێکی دەگمەنە لە رۆژهەڵات. ئەو ئایینەی ئەوان کە گاورن، پەرێشانیی پێوە دیارە، ئایینەکە بە ئازایەتی و ئارامگرتن پارێزراوە و دواتریش هەر بەو شێوەیە بەهێز و یەکگرتوو، لەو شوێنە گۆشەگیرە ترسناکە بۆ (١٢) سەدە دەچی لە چەوساندنەوە و خۆسەپاندنی محەمەدییەکان ماوەتەوە. ئەوەی سەرنجراکێش و دڵخۆشکەرە، بوونی دوو یا سێ مەزاری پیاوچاک لە حۆرییەکانی مەسیح (سلاوی خودایان لێ بێ) لەو ناوە، کە محەمەدییەکانیش بەگشتی رێزیان لێ دەگرن.

لەبەرئەوەی دەشتی (قەرەچووغ) چۆڵ بوو، هەندێ گوندی عەرەب بە پەرت و بڵاوی لەو دەشتە و لە (شەمامک) نیشتەجێن و هۆزی (تەی) لەو دەشتانە و لە کەندیناوە بەسەربەستی لە گەڕان دابوون، سەردەمێک سەرکردە دزەییەکان خاوەیان پێ دەدان. بەڵام کە کوردەکان دەسەڵاتیان فراوانتر بوو، گەیشتنە کێڵگە کشتوکاڵییەکانی ناوچەی (تەی)، ئەوانە پاشەکشێیان کرد بەبێ گرفت، بۆ بنکە سەرەکییەکەیان لە (نسیبین) گەڕانەوە، کەمێکیان نەبێ لەو ناوە مانەوە و خەریکی کاری کشتوکاڵن.

عەرەبەکان تەمبەڵ و ماستاوچین، ئەوان خۆیان وەک کوردەکان بۆ کۆکردنەوەی سامان زۆر ماندوو ناکەن و ئارەزوویان نییە لە بژێویی رۆژانەیان زیاتر پەیدا بکەن، لەبەر ئەوە لە پشوودانێکی مامناوەندین، کوردەکان هەموو زەوییەکانیان دەکێڵن، بەڵام عەرەبەکان هەندێکی بە تەنکی دەکێڵن و زۆربەی بە بەیار جێ دەهێڵن. لەبەر ئەوە کوردەکان بەردەوام هەوڵی بەرفراوانبوون دەدەن، من وای بۆ دەچم، کە لە داهاتوودا لە ناوچەکە وەدەریان دەنێن.

سەرکردە عەرەبەکان لەبەر نەژادی رەسەنی خۆیان، رێزیان زۆر لێ دەگیرێ، (شێخ حەنەش)، کە لە هۆزی (تەی)یە. جێگای مەترسییە و بەتواناش نییە، بەڵام وەک سەرکردەکانی دزەیی رێزی لێ دەگیرێ. زۆر سەرکردەی کورد شانازی بەوە دەکەن، کە بە نەژاد عەرەبن و دەگەڕێنەوە بۆ خودی پێغەمبەر (د.خ) یان یەکێک لە یاوەرەکانی. عەرەبەکان کورد بە بارگرانی بۆ سەریان دەزانن و دەیانەوێ هەڵسوکەوتیان سنووردار بکەن.

هۆزی (صارلو) دوو گوندیان لە نزیک (گوێر) هەیە، لەسەر کەناری لای چەپی زێی گچکە، لەوبەریش هەن، لەوانەیە شەش گوند یا زیاتریان هەبێ. لەڕواڵەت زۆر بەکورد دەچن، هەندێکیان کەوای درێژ و کورتەکی کورت لەبەر دەکەن، وەک دیانەکانی عەنکاوە خۆیان بە جووتیار دادەنێن. ئایینەکەیان تایبەت بە خۆیانە، کاکەییشیان پێ دەڵێن.

مرۆڤ ئەوانە لە باشووری کەرکووک دەبینێ، کە بە (عەلی ئیلاهی) دەچن، کە لە نزیک (خانەقین) و (مەندەلی) لە ئاقاری فارسەکاندا هەن. محەمەدییەکان ئەوانەی هەڵسوکەوتی راستیان هەیە بە خاوەن کتێبیان (اهل الکتاب) دادەنێن. لە راستی ئەوان بڕوایان بە قورئان هەیە، لەبەر ئەوە بە موسڵمان دادەنرێن، رێوڕەسمی بیروباوەڕیان تەنیا خۆیان دەیزانن، ئەو نەریت و رەوشتە سەیرانە بۆ ئەوان دەگەڕێتەوە. لەوانەیە (صارلو) کاتێ خۆی میللەتێکی خاوەن ئایینی تایبەتی خۆیان بووبن. بەڵام کە ئیسلام دەرکەوت، لە ترسی چەوساندنەوە و بۆ پاراستنی خۆیان چوونە ناو ئایینی ئیسلام. بۆی هەیە

لە بنەچە یەزیدی بن، چونکە وەک ئەوان پرچیان درێژ دەکەنەوە.

### کشتوکاڵ و بازرگانی

زەویی کشتوکاڵی لە هەولێر سێ جۆرە:

١- تاپۆ: ئەو زەوییانەیە کە خاوەنەکانیان بە گوێرەی بەڵگەنامەی فەرمی لە گەورە دەرەبەگەکانن.

٢- خاوەنداریەتییان بە نووسین لە بەرزاییە دوورەکان هەیە، چونکە تۆمارکردن لەو شوێنانەدا نەکراوە.

٣- (سەنیە) زەوییە خولاوەکانی سوڵتان بۆ دەوڵەت. ئەم زەوییانە هی دەوڵەتن، بەڵام کاتی خۆی سوود و بەرهەمەکەی بۆ سوڵتان بوو.

موڵکداری لەو ناوچەیەدا هەمووی ئاڵۆزە، بە تایبەتی (تاپۆ)، چونکە بەڵگەنامەکان لەلایەن فەرمانبەری بێ ویژدان و کەم توانا ئامادە کراوە و پڕە لە هەڵەی زۆر، بەمە ناکۆکی زۆری دادوەری بەدواوەیە. مەرجەکانی موڵکداری و باجی زەوی بەگوێرەی جۆری زەوی جیاوازە. زەوی (تاپۆ) دە بەشە بەشێکی بۆ حکوومەتە، هەمان ڕێژەش بۆ خاوەن زەوییەکەیە، ئەگەر خاوەن زەوییەکە تۆو یان ئاژەڵی جووت بدا بە جووتیارەکە، ئەوا بڕی باجەکە دەبێتە دوو یان سێ ئەوەندە. ئاغاکان کرێکار بۆ کاری کشتوکاڵ بەپارە بەکرێ دەگرن.

حکوومەت ١٧.٥٪ لە بەرهەمی زەوییەکانی میری وەردەگرن. سەرۆکەکان و کێخوای گوندەکان ئەم هەدە دەقۆزنەوە و بە شێوەیەکی نادروست ٢.٥٪ بۆ خۆیان گل دەدەنەوە، ئاغاکان بۆ فروفێڵ یارمەتیی جووتیارەکان دەدەن بۆ سوود وەرگرتن لە بەشەکەی خۆیان. ناوچەی هەولێر باشترین شوێنە لەم وڵاتە بۆ بەرهەمهێنانی گەنم، بنکەیەکی سەرەکیی دانەوێڵەیە، زۆربەی خەڵکەکە بایەخ بە کشتوکاڵ دەدەن، پشت بەباران دەبەستن. لە شوێنە بەرزاییەکان زەوی کشتوکاڵی کەمە، بەڵام ئاو زۆرە، لەبەر ئەوە بەرهەمەکانیان هاوینین و باغی میوەیان بۆ بژێوییان هەیە.

(گەنم) دوو جۆری سەرەکیی هەیە، جۆرێکی ڕەقە: (ڕەشگوڵ)ی پێ دەڵێن، ساواری لێ دروست دەکرێ، کە خواردنی سەرەکیی خەڵکەکەیە، جۆرەکەی تر نەرمە و (قەندەهاری) پێ دەڵێن بۆ دروستکردنی ئارد زۆر باشە، پێش شەڕ (یەکەمی جیهانی-و-) گەنم لە هەولێرەوە بۆ ئەوروپا دەنێردرا.

بەرهەمی (جۆ) زۆربەی جۆرەکەی ڕەشە. بەراوردی نرخەکان بەم شێوەیە.

پێش شەڕ: گەنم (٤٠) ڕوپیە و جۆ (٢٤) ڕوپیە لە ساڵی ١٩١٨ی زایینی (پاش شەڕ) نرخیان بەرز بووە، گەنم بوو بە (١٥٠٠) ڕوپیە و جۆ (١٢٠٠) ڕوپیە.

من کە لە هەولێر ڕۆیشتم، لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٠ نرخ بەم شێوەیە بوو:

گەنم: (٣٣٠) ڕوپیە و جۆ (٢٠٠) ڕوپیە بوو. لە باشووری عێراق بە پێچەوانەی هەولێر جۆ زیاتر دەچێنرێ.

لە مانگی کانوونی دووەم و شوبات تا مانگی نیسان زەوی هێشتا تەڕە، لەبەر ئەوە بۆ چاندنی پایز دەکێڵرێ، بەهۆی گاجووت یان هێستر و بەکارهێنانی ئامێری کۆن وەکو گاسن، زەوی دووجار دەکێڵرێ: جاری یەکەم پێی دەڵێن: (شەخم)، جاری دووەم (وەرد)، ئەوە کێڵانێکی بەپانییە. لە مانگی نیسان ئەو زەوییانەی دەوری گوندیان داوە بەهۆی پێگەیشتنی بەرهەمی پایزی پێشوو هەمووی بەبریقە و گەشاوەن، هەندێکی تری زەوی دەکێڵرێ بۆ ئامادەکردن بۆ پایزی داهاتوو.

لە مانگی ئایار تا ئاب کێڵگەکان وەک خۆی بەجێ دەهێڵرێ یان هەندێ گندۆرە یان ئارووی لێ دەچێنرێ، بۆ ئەوەی لە کۆتایی مانگی ئایار پێ بگات: ئەو دوو بەرهەمە ئاو نادرێن، بەڵام دوا بارانی مانگی ئایار پێویستە بۆ پێگەیشتنیان لە هاوین دڕک و داڵ زەوی دادەپۆشێ و تەڕایی لە زەوی بۆ سەرەوە ڕادەکێشێ، ئەمەش بۆ ئالیکی ئاژەڵ بەسوودە، کاتێ کە گیا زۆر کەم دەبێ، یان لە زستان بۆ سووتان بەکار دێت.

لە گرانیی ساڵی (١٩١٨) هەژارەکان گوڵی ئەم دڕک و داڵانەیان کۆ دەکردەوە و دەیانهاڕی و دەیانکردە نان، ئەمە قووتدانی زۆر ئەستەمە و دەبێ گەدەیەکی بەهێزت هەبێ، چونکە ئەم ڕووەکە بە پلەی یەکەم بۆ ماڵات بەکار دێ. هەر چۆنێک بێ مرۆڤ لە مردن ڕزگار دەکا.

لە مانگی ئاب و ئەیلوول و تشرینی یەکەم، زەویی ئامادەکراو تۆو دەکرێ و بە کێڵان سەراوبن دەکرێ.

ئەگەر زەوییەکە بەهێز و پتەو بوو، وەک دەوروپشتی هەولێر ئاویش زۆر بوو، ئەوا پێش چاندن بەحەوت ڕۆژ ئاو دەدرێ، بۆ ئەوەی لە کاتی کێڵان زەوییەکە لە دڕک و داڵ ڕزگار بێ، ئەمە پێی دەڵێن، (راباس) کە زووتر پێ دەگات و بەرهەمی زیاترە. پاش چاندن لە کار دەوەستن و دادەنیشن چاوەڕێی بەزەیی خودا بە بارینی باران دەکەن. بارانی زۆر (پەڵە) زەوی تێر ئاو دەکا، لە کانوونی دووەم و شوبات باران زۆر دەباری، ئادار و نیسان دوو مانگی دژوارە بۆ باران بارین، پێویستە بەلای کەم دە ڕۆژ جارێک باران ببارێ، جاری وا هەبووە لە کاتی دروێنە باران باریو. ساڵێک لە مانگی حوزەیران بارانێکی زۆر باری و لافاو دەغڵ و دانێکی زۆری ڕاماڵی.

لە مانگی تشرینی دووەم و کانوونی یەکەم کاتێ، کە یەکەم ڕێژنە باران دەبارێ و سێ یان چوار گرێ دەچێتە ناو خاک، کورد ئەو زەوییە دەکێڵێ و تۆوی دەکا، کە لەبەر نەبوونی ئاژەڵی کێلان پشتگوێی کردبوو، بەم بەرهەمانە دەڵێن (تەڕەکاڵ). لە زستانی ساڵی ١٩١٨- ١٩١٩ هەموو بەرهەمەکان بەم شێوەیە بوو، ئەمەش لەبەر بارودۆخی ناجێگیری ئەوکات و مانەوەی تورکەکان و نیازی دەستبەسەر داگرتنی بەرهەمەکانیان. زۆرجار لەبەر ئەو هۆیە کوردەکان زەوییەکانیان لە بەهاران نەکێلاوە، بەرهەمی ئەو جۆرە کشتوکاڵەش ٢٠٪ یا زیاتر دەبێ، ئەوە کەمترین بەرهەمی (وەرد)ە.

کورد لە مانگی کانوونی دووەم، زەوی بۆ پایزی داهاتوو دەکێڵێ. ئەگەر ئەمەی زوو تۆو کرابوو شین بوو بۆ لەوەڕگای ئاژەڵەکان بەکاری دەهێنێ. زۆر کەم زبڵ لە زەویی ئاودراو بەکار دەهێنێ. هەندێ جار بە مەبەستی ئالیک زەوییەکی بچووک بە (جۆ) دەچێنێ. لە مانگی ئازار هیچ کارێکی نامێنێ تەنیا بەرزیی ڕێژەی ئاو نەبێ و پاڕانەوە خودا کە بێ (ئافات) بێ.

گرنگترین نەخۆشی بۆ دانەوێڵە و (سن) و (کلۆ)یە، زۆرجار (مۆرانە)ش پەیدا دەبێ. لە ساڵی ١٩٢٠ پێش بەرزاییەکان تووش هات و زەرەر و زیانێکی زۆری هەبوو. (سن) کەروویێکە گەشە دەکا و پاش بارانێکی زۆری بەهێز لە زستان لە گەنم، بەتایبەتی (قەندەهاری) دەدا و زیانی زۆری پێ دەگەیەنێ، جووتیار دەستەوەستان دەوەستێ. هەندێ جار برێکی زۆر چەمکی گوڵەکە لە ناو دەبا و بە ترسناکترین (ئافات) دەژمێردرێ و زیانی زۆر لە بەرهەمەکان دەدا. کلۆ هەموو بەرهەمەکانی کشتوکاڵ دەخوا، ساڵی ١٩٢٠ پۆڵێک لەلای ڕۆژئاوا هات خۆشبەختانە کاتەکە درەنگ بوو. کەژی دروێنەی جۆ لە ئایار زووتر دەست پێ دەکا تا کۆتایی مانگ، بەڵام گەنم لە حوزەیران. ساڵی ١٩٢٠ تا کۆتایی تەمموز کارەکان هەرمابوون. دروێنە بەدەست دەکرێ، پیاو و ژن و منداڵ بەشدار دەبن. کاتێ کە دروێنەی ناوچە بەرزاییەکان زووتر کۆتایی دێت و بەهار زووتر لە دەشتەکان دەست پێ دەکا، خەڵک بە مەبەستی کارکردن و پەیداکردنی (خەرجییەک) ڕوو دەکەنە ناوچەی دەشتەکان، ئەوانەی دەبنە (سەپان) لە دروێنە شەش یەکی بەرهەمەکە وەردەگرن. ئەگەر بەرهەمەکە کەم بێ کەمیان دەست دەکەوێ. وا باوە کاتی دروێنە ئەگەر کەسێکی بەدەسەڵات بەو شوێنە تێپەڕ بوو، ئەوا یەکێ لە سەپانەکان بەمشتی دەست دەسکەگوڵێکی لەو دانەوێڵە بۆ دەبا، لەبەرئەوەی یەکەم بەرهەمە و بە ئومێدی وەرگرتنی برێک (بەخشیش).

دانەوێڵە درواوەکە بەهۆی تێلەکێشەکانەوە کۆ دەکرێنەوە و بۆ گۆڕەپانی کوتانەوە بە (جەنجەڕ) دەگوێزرێنەوە. ئەوەی جەنجەڕی نەبێ، بە ٢ تا ٦ ئاژەڵ دەیکوتێتەوە. ئەم کردارە لە ناوەڕاستی هاوین ئەنجام دەدرێ.

دواتر بە ئامێرێکی تایبەت، لە کاتی هەڵکردنی بایەکی گونجاو شەنەی دەکەن بۆ جیاکردنەوەی دانەوێڵەکە لە کایەکە، دواتر دەبێژرێ و پاک دەکرێتەوە، ئەم کردارانە تا مانگی ئەیلوول درێژە دەکێشێ. بەرهەمی دانەوێڵە لە لیوای هەولێر زۆر باشە ڕێژەکەشی لەیەک بەرامبەر بە ١٠ یا ١٥ لە بەروبوومی (وەرد) دەبرێ. لەیەک بەرامبەر بە ٨ یا ١٠ بۆ بەروبوومی (تەڕەکاڵ) دەبرێ. لە بەرزاییەکان یەک بەرامبەر بە ٨ بەرهەمێکی زۆر باشە، کەچی لەیەک بەرامبەر بە ٥ زیاتر نابڕێ، بەراورد لەگەڵ دەشتی هەولێر، بەڵام دەشتی (قەرەچووغ) ئەگەر باران باش بێت، یەک بەرامبەر بە ٣٠ تا ٤٠ دەبرێ،

دواتر دەغڵەكە لە شوێنێكی باشی وەكو ژێرزەوی دادەكرێ، كایەكەشی لە كادێن دەكرێ و بۆ ئالیكی ئاژەڵ تا بەهار بەكار دێ، یان بۆ دروستكردنی خشت بەكار دێ.

زۆرجار ریزە مەنجەڵێك لەسەر ئاگر دەكوڵێ و ژن چاودێریی دەكەن و دەورەیان داوە، ئەوانە ساوار دروست دەكەن، (لێرە، باسی چۆنیەتیی دروستكردنی دەكا-و-).

لە هەولێر دووكان هەیە كە موڵكی دەوڵەتە و ساڵانە بەزیادكردن بەكرێ دەدرێ، یەكێكیان بە ١٢٠٠٠ روپیە، واتە زیاتر لە ١٠٠٠ جونەیهە بە نرخی ئەو رۆژگارە.

ئاو لێرە بۆ كشتوكاڵ زۆر خۆشەویستە و خاوەن زەوی بۆ ئاو خۆی سوودی لێ وەردەگرێ و بەكرێی نادات.

برنج لە ناوچەی دەشت و تەپۆڵكەكان دەچێندرێ و پێی دەڵێن برنجی كوردی.

لە مانگی ئازار دەچێنرێ و لە تشرینی دووەم دەدرووێتەوە، لە دەشتی هەولێر رێژەی بەرهەمی لەیەك بەرامبەر بە ٣٠٠ یا زیاتر دەبرێ، بەڵام ئەگەر بەرێگای چاندنی پشتگوێ خرا، ئەوا ١ بەرامبەر بە ٨٠ زیاتر نابرێ.

لە بەروبوومە هاوینییەكانی تر (ماش) و (نۆك)ە، بایەخیان پێ دەدرێ. (كونجی) بۆ نان و (كێك) بەكار دێت، روونێكی لێ دەدرێت لای جوولەكە زۆر بەنرخە، وەكو گەنمەشامی و پەمۆ و هەرزن.

لە ناوچەی (باڵەك) كە بەفر تەواوە لە بەهار گەنم دەچێنرێ و ئاودانی دەوێ. تاقیكردنەوەی زۆر لەسەر چاندنی پەمۆی باش لەلایەن (فەرمانگەی كشتوكاڵ) كراوە و سەركەوتنیان بەدەست هێناوە.

گرنگترین بەروبوومی ئاوی ناوچە بەرزاییەكان تووتنە، جۆرە باشەكەی بۆ خۆیان بەكار دەهێنن و خراپەكانیش بۆ عارەبەكان دەچێنن. (باسی چۆنیەتیی چاندنی تووتن دەكا -و-).

سەوزەوات لە نزیك ئاوی رووبارەكان دەچێنرێ و لە بەروبوومەكانی هاوین (شووتی)، كە جۆرەكەی شیرین و زۆرباشە، ئاروو و كدوو و تەماتە و بامیە و باینجانی رەش بەرهەم دەهێنرێن. بامیە وەك زنجیر بە داوێكەوەی دەكەن وشك دەكرێتەوە.

لە زستان (شێلم) و (كوزەڵە) و (سپێناغ) دەچێنرێ. (هەنجیری دركاوی) لە كوێە هەیە. ئاغەكانی هەولێر زۆریان مەبەستە بۆ بەدەستهێنانی جۆری تازەی هەمەچەشنی سەوزەوات، لەوانە (پەتاتە)، كە جاروبار لە (مووسڵ) دەهێنرێ، فەرمانگەی كشتوكاڵ تۆی چەوەندەری شەكری دابەشكردووە، ئەگەر شێن بوو، بەباشی و كارگەی گوشینی بۆ داندرا، ئەوا قازانجی باشی دەبێت چونكە شەكر زۆر گرانە و لە هیندستان دەهێنرێت.

لە ناوچە بەرزاییەكاندا مێو زۆرە و سوودی زۆری لێ وەردەگیرێ، بە تایبەتی لە ناوچەی خۆشناو، كە ترێی كشمیشی بەرهەم دێنن. ترێ وشك دەكرێتەوە و مێوژی لێ دروست دەكرێ. دیانەكان شەرابی لێ دروست دەكەن، بەڵام جۆرەكەی زۆرباش نییە. لە دەشتایی دارمێو هەیە و ئاوەدەرێ و جۆرەكەشی سپی و سووری تۆخە.

میوەكانی دیكەی ناوچەی دەشت و بەرزایی لە گوندەكان: خۆخ- هەڵووژە- قەیسی- سێو- هەرمێ- هەنجیر- هەنار-ن. شەقڵاوە بەمیوە بەناوبانگە. بەڵام لەبەر بێ بایەخی بە باغچەكان ناگاتە ئاستی چەشنەكانی ئینگلیزی. بەرهەمی (سێو) كە لە حوزەیران پێدەگا، جۆرەكانی خراپە، بەڵام بەرهەمی سێو لە باڵەك جۆرەكەی زۆر باشە. هەنار وەك دەرمان بۆ (تا) بەكار دێت، پەلكەكەشی لە خۆشكردنی پێستە بەكار دێت. هەنجیر بەرهەمی زۆرە و بەداوێكەوە وشك دەكرێتەوە. (توو) لە بەرزایی و دەشتایی هەیە و سپی و سووری هەیە بۆ زستان وشك دەكرێتەوە و دارەكەشی زۆر بەنرخە.

(گوێز) لە ناوچە بەرزاییەكان هەیە، زۆربەی گەورە و نایابە، هەندێكم دیت هەندەی هێلكەی مریشك دەبوو، لە دارەكەی چونكە پتەوە ئامرازی جووتی لێ دروست دەكرێ. لە دەورووپشتی هەولێر دار فستق دەبینرێ.

(ئەسپیندار) سوودی زۆر لێ وەردەگیرێ بۆ كاروباری خانووبەرە. (چنار)یش بۆ هەمان مەبەست بەكار دێت.

(مازوو) كە بەرهەمێكی سروشتییە، كۆ دەكرێتەوە و بەرەو بەغدا دەنێردرێ و دواتر بۆ ئەورووپا، بۆ خۆشكردنی پێستەش بەكار دێت. بۆ حكوومەت داهاتێكی باشە، چونكە یەك بەرامبەر بە ١٠ باجی

لێ وەردەگیرێت.
(کەتیرە) لە بنچک و دەوەنەکانی سەرگردەکان کۆ دەکرێتەوە.
(سماق) بۆ گۆشت و چێشت بەکار دێت، (جاتەرە) لە دەشتایی و گردەکان نزیک ئاوەکان زۆرە، پێش شەڕ لەلایەن کۆمپانیاکانی ئەوروپی و ئەمریکی سوودی لێ وەردەگیرا.
من دڵنیام ئەگەر بارودۆخی ئاسایش ئارام بێ، کشتوکاڵ لە هەولێر دواڕۆژێکی گەشی دەبێ. پسپۆڕانی (جیۆلۆجی) دەڵێن: دەشتی هەولێر زۆر لەبارە بۆ هەڵکەندنی بیری ئیرتیوازی و زۆر بە ئاوە. برنج و پەمۆی هەولێر هەروەها گەنمەکەی بەناوبانگە. خاکەکەی زۆر بەپیتە. ئەگەر تۆوی گەنمی باش و ئامێری کشتوکاڵ و جووتکردنی باش بەکار هێنرا، ئەوا بەرهەمەکەی دەبێتە دوو هەندە و زیاتریش بەرهەمە نێردراوەکانی هەولێر ئەمانەن: دەغڵ و دان، خووری، تووتن، مازوو، کەتیرە، دار، پەنیر، مێوژ و میوەی تریی وشککراوە، ئەمانە بار دەکرێ بۆ سەری هێڵی شەمەندەفەر لە (کفری) و (شەرگات) یان بە کەلەک بار دەکرێ لە (تەق تەق) و (ئاڵتوون کۆپری) بۆ بەغدا دەنێردرێ.
گەنم لە مووسڵیش دەفرۆشرێ، زۆرجاریش دەکرێ بەمەبەستی بەرزکردنەوەی نرخی دراو.
هاوردە سەرەکییەکانیش بۆ هەولێر ئەمانەن:
تۆچا، شەکر، قاوە، کەلوپەلی دروستکراو لە بەغدا، رەشەوڵاخ لە فارس، لە هەولێرەوە دوو رێگای سەرەکی هەیە بۆ ئێران، کاروانەکان بەرەو سابلاخ و ورمێ دەچن و چاو قاوە و شەکر و کەلوپەلی پیشەسازی، بەتایبەتی کاڵا دەبەن لە گەڕانەوەیان مافوور و ئاوریشم و پێستە و فەروە و سەماوەر و رەشەوڵاخ لەگەڵ خۆیان دەهێنن. لە کانوونی یەکەم تا ئازار رێگەکان بەهۆی بەفر دەگیرێ. هۆزەکانی بەرزاییەکان میوە و تووتن بەدانەوێڵەی هۆزی (دزەیی) ئاڵوگۆڕ دەکەن. لە هەولێر (بانق) نییە، لەبەرئەوەی کوردەکان حەز دەکەن سامانیان کۆ بکەنەوە و هەڵی بگرن، ئارەزووشیان لە بەگەڕخستنی سامانیان هەیە ئەگەر هەلیان بۆ رەخسا، دەوڵەمەندە گەورەکان پارە دەدەنە بازرگانە بچووکەکان و لە زەرەر و قازانج هاوبەشن. (ربا) لە ئیسلام کارێکی نارەوایە، بەڵام زۆر ئاساییە. دەڵێن (ئەحمەد پاشا) ٥٠ هەزار پاوەندەی بە قازانج خستۆتە گەڕ بە قازانجی ٣٣٪ی ساڵانە ئەگەر ساڵەکە نەهاتی بوو، ئەوا جووتیارە بەدبەختەکە ناچار دەبێ زەوییەکە لە بری قازانجەکە بدات و دڵیشی وەک ئاگرێکی دەسووتێ. بەمجۆرە ئاغاکان بوونە خاوەن موڵکێکی زیاتر لە هی خۆیان. (لیرە)ی تورکی مامەڵەی پێ دەکرێ و نرخی ماڵات و دانەوێڵەی پێ دادەنرێ. لیرەی تورکی پێش شەڕ نرخی کەمێک لە یەک پاوەند کەمتر بوو. زێڕ لە ناو خەڵک زۆرە. حکوومەتی بەریتانی روپیە بۆ داهات دەدا و لە ناو خەڵک باوە. کە وڵاتم بەجێ هێشت لە تشرینی یەکەم ساڵی ١٩٢٠ نرخی یەک لیرە ١٤ روپیە بوو. دراوی کاغەزی هیندی لەبەر سووکی بەکار دەهێنرێ. دراوی کاغەزی تورکی ١٥٪ی نرخی راستەقینەیەتی.
کێشان و پێوان لە شارێک یا لە گوندێک بۆ شوێنێکی تر جیاوازە و زۆریش ئاڵۆزە. دانەوێڵە پێوەری خۆی هەیە بۆ پێوان. ئێستا هەوڵ دەدرێ سیستەمی کیلۆغرام لە هەموو وڵات دەستەبەر بکرێ.
هەندێ لە بازرگانەکانی هەولێر پەیوەندیی فراوانیان لەگەڵ بریکارەکانیان لە حەلەب و بەغدا هەیە. پێش شەڕ لەگەڵ کۆمپانیاکانی (مارسیلیە) نووسراو لە نێوانیاندا هەبوو. لە ئاڵوگۆڕی بیروڕا شارەزا و زیرەکن. لە ساڵی ١٩٢٠ (ئەحمەد پاشا) وەک نەریتی جارانی بڕێکی زۆری روپیەی بۆ بەغدا نارد بۆ گۆڕینەوەی بە پاوەندی ئینگلیزی، ئەو بڕە پارەیەی دەیان نارده حەلەب بەزێڕ دەیگۆڕییەوە. لیرە لەوێ نرخی (٩) روپیە بوو، بە وڵاغ دەگوێزرایەوە و قازانجی هەر مامەڵەیەک ٢٥٪ بوو.

**(سەردانی یەکەمی هەولێر) (لە کتێبەکەی کاپتن های (اربیل) نووسراوە -و-)**

لە کاتژمێر یەکی پاش نیوەڕۆی ١٩١٨/١١/١٠ گەیشتمە هەولێر، لە رێگا چاوم بە (مەحموود یابا): کێخوای گوندی (قوڵتەپە) کەوت. پیاوێکی رووخۆش لە ناوەڕاستی تەمەنیدا بوو، زۆر رێزی لێ گرتم. سەرەتا وا مزانی درۆزن و نەگریسە، بەڵام دواتر بۆم دەرکەوت رادەبەدەر راستگۆیە، دۆستی (ئەحمەد ئەفەندی) سەرۆکی شارەوانیی

هەولێر بوو. بۆم دەرکەوت کە کوردەکان لێرە لە زۆر خێڵی نیشتەجێی باشووری زێی بچووک پیاوترن و لە هۆزە دواکەوتووەکانی بەرزاییەکان زیرەکتر و تێگەیشتووترن، زۆرم خۆش ویستن و بۆیان بە پەرۆشم. هەولێر ئەو شارە پیرۆزە کۆنەی ئاشووری، کە هەمان ناوی هەبووە، لە سالی ۱۸۰۰ی پێش لەدایکبوونی عیسا، شاهەکان لەو شارە نوێژیان دەکرد و داوایان لەخواکەی دەکرد کە سەریکەون. زۆربەی سەرکردەکان لە بەرامبەر بەرنوێژی (عەشتار) پێستی دیلەکانیان دادەمالی. لێرە (ئەسکەندەری گەورە) پاش سەرکەوتنی بەدوای (دارای) ژێرکەوتوو کەوت، لەگەڵ ئەوەی کە نائومێد بوو، لە گرتنی قوربانییەکەی، بەلام توانی دەست بەسەر گەنجینە شاهانەکەیدا بگری. لێرە سەردەمێک سەلاحەدین کە بەناوبانگترین کورد بووە لە مێژوو فەرمانڕەوایی کردووە.

کە گەیشتینە هەولێر، کۆمەڵێک خەڵک ئامادە بوون، ژاندرمەکان ریزیان گرتبوو، سەرکردەکەیان یەکەم کەس بوو بەخێرهاتنی کردم. دواتر سەرۆکی شارەوانی و موتەسەریفی هەولێر، لە شارەوانی چا و قاوەیان پێشکەش کردم.

بەشی سەرەوەی شارەکە لەسەر ئەو گردە بازنەییە دروست کراوە و وەک قەلایەکی گەورەیە و بەسەر ئەو دەشتەدا دەنوارێ، دیوارەکانی لای دەرەوە زۆر بەرزن، پەنجەرەی ریکی تێدایە، بەلام بچووکن، هەندێک بەڵکۆن لەلایەن ئاغا دەولەمەندەکان دروست کراوە. دوو رێگا هەیە بۆ چوونە ناو قەلا، یەکێکیان بەو دەرگا گەورەی لای باکووری بەژێر سەرادا دەڕوات، ئەوی تر بچووکترە و لەلای رۆژهەلاتێتی.

شەقامەکانی ناوەوەی سەخت و تەسکن، بەکەڵکی رۆیشتنی گالیسکە نایەت. دەڵێن پێش دوو یان سێ سەدە ئەو شارە دروست کراوەتەوە و خەڵکی گوندەکان بەزۆر کاریان تێدا کردووە. لەوانەیە پاشماوەی ناوەوەی لە هی (نەینەوا) و (ئاشوور) کۆنترە. بەشی خوارەوەی شارەکە دەکەوێتە لای باکووری رۆژهەلاتی. بازاڕێکی گەورەیە، دووتاقی باش و دووی رووخاوی لێیە کە لەوانەیە بەم زووانە چاک بکرێتەوە، کەلوپەل لە دوکانەکان نمایش کراون، بازرگانەکان ئەو کەلوپەلانە بۆ خانەکان دەگوازنەوە و بۆ بەیانی دەیهێننەوە بۆ دوکانەکانیان، بازاڕ شەمەکی باشی لێیە، کوردەکان لە هەموو لایەک دێن بۆ کڕینی شتومەک.

هەولێر لە شەڕ دوور بوو، توانییان ئەمباری گەنم بشارنەوە، لەبەر ئەوە لە گرانی کەسێکی زۆر کەم مردن.

منارەکە کە کەوتووەتە ناو کێڵگەکانی قەراغ شار، درێژییەکەی ۱۱۰ پێ و تیرەی بنکەی بازنەکەی ۱۲ پێیە. بە خشتی سوور دروست کراوە. سەرەوەی رووخاوە و بەنارێکی هەندێکی بڕایەتەوە. هەندێ پاشماوەی کاشی رەنگاورەنگ و بەشێوەیەکی رەق رازاوەتەوە و لەسەری ماوە. بنکەکەی دارزاوە، ئەگەر چاک نەکرێ لە کۆتایی دەڕووخێ.

هیچ پاشماوەیەکی دیاری مزگەوتەکە نییە، کە منارەکە بەشێک بووە لەو، بەلام کێڵگەکانی دەوروبەری تەخت نین، لەبەر ئەوە وا مەزەندە دەکرێ، کە لە رابردوو شارەکە لێرە دروست کرابێ. لە شار دەمماوددم دەڵێن: ئەو منارە لە سەردەمی خولەفا دروست کراوە، لەو کاتەی بنکەی هەولێر لەلایەن دەسەلاتدارێکی سەربەخۆ فەرمانڕەوایی کراوە. نانی نیوەڕۆم لەگەڵ (ئەحمەد ئەفەندی) خوارد، مرۆڤێکی شۆخ و بەتوانایە و تەمەنی نزیکەی ٤٠ ساڵە، یەکێکە لەو بنەماڵە بەرێزانەی هەولێر کوڕی مامی (مەلا فەندی)یە، (کە یەکێکە لە پیاوە ئاینییە پێشکەوتووەکانی باشووری کوردستان)، باوک و باپیری ئەحمەد ئەفەندی پێشتر پیاوی ئایینی بوون. هەروەک تاکە برایەکەی کە لە ژیاندا ماوە، لە سەردەمی تورک داواکاری گشتی بووە، پێش داگیرکردنی ئێمە سەرۆکی شارەوانی بووە. درێژییەکەی ٥ پێ و ٩ گرێیە، هەندێ کووڕی پێوە دیارە، جەستەی بەگشتی سووک و سادەیە، رووخساری توندە، کەپووی درێژ و چەماوەیە، چاوی لە رادەبەدەر بریسکەدارە، هەروەک هەموو ئەندامانی بنەماڵەکەی لەوانەیە لە داهاتوودا تووشی نەخۆشیی (سیل) بێت، ئەمەش کاری خودایە، جلوبەرگی ئەورووپی لەبەر دەکا، کەسێکی دیموکراسییە،

بەرژەوەندیی میللەتەکەی بەتایبەتی دەستکورت و هەژارەکان لە ناو دڵیدایە و ئەو هەردەم لە ریزی ئەواندایە بەرامبەر ئاغاکان، لەبەر ئەوە حەزی لێ ناکەن. لە تەنگانە پشت و پەنای حکومەتە بەبێ گوێدان بە ئاکامەکەی، ئەو باش دەزانێ ناسەقامگیریی ئاسایش بە پلەی یەکەم لە دژی هەژارەکانە. دووجار شارەکەی لە سەردەمی تورکەکان رزگار کردووە. جاری یەکەم لەبەر هەڕەشەی هەموو کەسایەتییەکانی شار، لەبەر ئەوە توانی بڕوا بە (ئیبراهیم ئاغا) بهێنێ و شارەکە رزگار بکا.

دووەم جار پێش هاتنم بوو، خێڵەکان خۆیان ئامادە دەکرد بۆ هێرشکردن بۆ سەر شارەکە، زۆر رێگای بەکار هێنا بۆدوورخستنەوەیان، پاسەوانیشی لەسەر ئەمباری دانەوێڵە دانا، بۆ ئەوەی تالان نەکرێ. جارێکی تریش کە پەشێوی لە ئەیلوولی ١٩٢٠ رووی دا، پێش هەموو کەسێک پشتگیریی کردم، بۆ ئەوەی لەو تەنگژە بێ زیان بم، لە هەموو کاتێک پشتی پێ بەستراوە و هیچ جارێک فێڵ و هەڵخەڵەتاندنم لێ نەدیوە. لەگەڵم راستگۆ بوو، لایەنگیریی بۆ من بێ مەبەست بوو، گومانم لەوەدا نییە کە لە تەنگانە ژیانی خۆی بۆ من بەخت بکا. کە نانی نیوەڕۆم خوارد و لە کاتژمێر ٣ی پاش نیوەڕۆ چووم بۆ سەربازگەی تورک، کە لە بەشی رۆژئاوای شاردا بوو بۆ ئەوەی رێورەسمی رێز لە فەرماندەی تورک بگرم، ئەو پیاوێکی بەجەستە بچووکە، شایستەی پێکەنینە، خەڵکی قەوقازە، بە تورکییەکی تێ نەگەیشتوو و بەگرژبوون و هەڵقرچان قسەی دەکرد، وا پێ دەچوو ئەو بە دیدەنی من دڵخۆش نەبوو. بەهاوارکردن فەرمانی بە پەیامنێرەکەی دا و قاوە و جگەرە هات... ئەو یاداشتنامەم پێ دا، کە پێم درابوو. زمانی فەرەنسیی دەزانی... چەند وشەیەکی خوێندەوە و خۆی وا نیشان دا، کە هەمووی تێ گەیشتووە. بەوە رازی بوو کە بۆ بەیانیی رۆژی دواتر بار بکا. پێشنیازیشی کرد، کە نەخۆشەکانی لە هەولێر بێیننەوە، من بەباشم زانی، کە پزیشکێکیان بۆ دابنێم، بەڵام رازی نەبوو، بەڵێنی دا کە نەخۆشەکانی لەگەڵ خۆی ببا. بەڵام کاتی رۆیشتنیان سەیرمان کرد لە ماڵان دابەش کراین. ئەفسەرێکی تورکم لەگەڵ خۆم برد بۆ ئەوەی ئاماری دانەوێڵە و کۆگاکان وەربگرم. ئەمە کاتێکی زۆری برد، چونکە بڕێکی زۆر لە گەنم و جۆ لە ئەمبارەکان بوون.

لە مەزارگایەکی ستانێک زیاتر لە (٥٠٠) نارنجۆکی جۆراوجۆرمان دۆزییەوە. دواتر نانی ئێوارەم خوارد و لە میوانداری (ئەحمەد ئەفەندی) نووستم. بارانێکی زۆر بە درێژایی شەو باری، دڵۆپە لە بنمیچی خانووەکە، کە بە قوڕ سواغ درابوو بە لێشاو دەهاتە خوارەوە.

وام بەباش زانی بەسواری ئەسپەکەم بچم بۆ بەڕێکردنی فەرماندەی تورک ئەو وا پێ دەچوو، بە مەزەندەی خۆی بۆیە من چووم بۆ لای لەم بارودۆخە، کە بۆ ئەوان سووکایەتییە و پێی پێدەکەنم.

شارەکە پڕ بوو لە فەرمانبەرانی تورک، زۆربەیان لە کەرکووک و شوێنانی تر وەکو: ژاندرمە و ئەو سەربازانەی کە راژەیان کۆتایی پێ هاتبوو. پاش نیوەڕۆ کەسایەتییەکانی شار سەردانیان کردم. لە ١٩١٨/١١/١٣ (نەقیب موری) لە شوێنەکەی من دەستبەکار بوو، منیش دیسان بە یاوەریی دوو ژاندرمە و کارەکەرەکەم و نوینەکەم، کە لەسەر هێسترێک بەسترابوو بۆ (ئاڵتوون کۆپری) بە رێ کەوتم، لەبەر باران بارین ناچار بووم جارێکی تر بۆ لای (مەحموود یابا) و ئاگری بۆم کردەوە و جلە تەڕەکانم گۆڕی و نانی ئێوارە، کە ساوار و سەوزەوات بوو خواردم. لەگەڵ (شێخ رەزا) دانیشتم، کە کوردەکان بەشێتی دادەنێن، لەوانەیە لەبەرئەوەی کە زۆر سوعبەتچی و خۆش مەشرەب و وریا بوو، ئەو ناوەیان بەسەردا بڕیوە. لەگەڵ بەیانییەکی زوو بەرێ دوتم بەگوندی (قورشاغلو)دا رۆیشتم، کە سەر بە (ئەحمەد پاشا) بوو، ئەو بۆ ناوچەی خۆشناوەتی بۆ پرسەیەک چوو بوو، دەبووایە لە رێگایەکە بپرسم، زۆر سەرسام بووم، کە کەسێک لەمبارەیەوە ئامادە نەبوو تەنیا قومێک ئاویشمان بداتێ، کە ئەمە لە دابونەریتی گوندی کوردەکان زۆر دوورە.

لە (دیبەگە) لەگەڵ (رەسووڵ ئاغا) نانم خوارد. دواتر بۆ (ئاڵتوون کۆپری) رۆیشتم لە ١٨ی مانگ لەگەڵ (مەحموود ئاغا)ی شێخ

بزەینی، کە لە ناوچەی کۆیە نیشتەجێیە چاوپێکەوتنم لەگەڵدا کرد.

لە کۆیە برووسکەی زۆر دەهات داوای حاکمی سیاسیان دەکرد، حاکمی تورکی نەخۆش بوو، هیچ دەسەڵاتێکی نەمابوو، بارودۆخەکە بەرەو خراپی دەچوو، لە بەغداوە فەرمانم پێ درا، کە بە پەلە بەرەو کۆیە بچم، لە ١٢ی کانوونی یەکەم برووسکەیەکم لە کۆیە بۆ هات، کە هۆزی (پیران) هێرشی بردۆتە سەر شار و راووڕووتی تێدا دەکەن، منیش برووسکەکەم بۆ بەغدا نارد و پێشنیازم کرد کە بەزووترین کات بچم.

لەسەر هێڵی کراوە، لە کاتژمێر (١)ی دوای نیوەڕۆ نامەیەکم پێ گەیشت ڕێگام پێ درا، کە بچم و دەسەڵاتیشم پێ درا چارەسەری ئەو ئاژاوانەی، کە رووی داوە بکەم. خۆم ئامادە کرد و لە کاتژمێر ١٠ی بەیانیی ڕۆژی ١٣ی مانگ لە (ئاڵتوون کۆپری) دەرچووم.

### کۆیە و رانیە

لەگەڵ (مەحموود ئاغا) لە (گوندی سارتک) بەرەو کۆیە رۆیشتم، لە کاتژمێر (٣)ی پاش نیوەڕۆ گەیشتینە گوندی (ئیلینجاغ). لە ڕێگا نامەیەکم لە (حەمەئاغا) پێ گەیشت، منیش وەڵامم داوە و بەحاکمی کۆیە ناوم برد. ئەو سەرۆکی بنەماڵەی (غەفووری) و تەمەنی لە (١٣٠) ساڵ نزیکبووەتەوە، بیر و هۆش و مێشکی ئێستاش زۆر بەتوانایە، لەگەڵ بنەماڵەی (حەوێزی) بۆ چەند سەدەیەک دەچێ دوژمنکار و نەیاری یەکترن، غەفوورییەکان شەڕکەریان زیاترە، لەبەر ڕێزی زۆری لای هەردوو لایەن، موقەدەم (نوبل) (حەمە ئاغا)ی بە حاکمی شار هەڵبژارد.

حەوێزییەکان لەگەڵ لاوازییان بەرامبەر نەیارەکەیان، بەڵام شانازی بەوە دەکەن، کە مرۆڤی بەتواناتریان هەیە: وەکو (عەبدوڵلا ئاغا)، لای تورکەکان ڕێزی زۆری هەبوو، کە ئەوان نەمان غەفوورییەکان بەهەلیان زانی بوونی خۆیان بسەلمێنن. هەندێک لە غەفوورییەکان بەبێ ئاگاداری (حەمە ئاغا) (سوار ئاغا)ی سەرۆکی خێڵی (پیران)یان هان دا بۆ ئەوەی هێرش بکەنە سەر ماڵ و سامانی (عەبدوڵلا ئاغا) و چەند کەسێکی خێڵی (بلباس) دەوری ماڵەکەیاندا و یەکێ لە کوڕەکانی بەسەختی بریندار کرا. (حەمە ئاغا) بەتاریکی شەو لە ناو جێگاکەی بەنەخۆشی کەوتبوو، هەڵسا و چوو بارودۆخەکەی هێمن کردەوە. ئەم ڕووداوە پێش هاتنم رووی دابوو.

لە دووریی یەک کاتژمێر لە شار (حەمە ئاغا) و (عەبدوڵلا ئاغا) و (٥٠) سوار پێشوازییان لێ کردم. ژوورێک لە سەرای حکوومەت بۆم ئامادە کرابوو. ناسراوەکانی شار و مەلاکان ئامادە بوون، پاشپێشکەش کردنی قاوە و چایە (مەلا محەمەد ئەفەندی)، کە موفتی و کەسایەتییەکی ئایینییە، وتارێکی درێژی لاواندنەوەی بۆ پێشوازی بە زمانی فارسی پێشکەش کردم، منیش



حەمە ئاغای کۆیە

بەباشترین شێوە وەڵامم داوە. (حەمەئاغا) بەهێمنی و بێدەنگی دانیشتبوو، ناوە ناوەش پرخەی لێوە دەهات. ئەو وەک باوکێکی بەسۆزە سبیلێکی دەکێشا درێژییەکەی دوو پێ زیاتر بوو، بەژنی مامناوەندی و چوارشانە بەشێوەیەکی رادەبەدەر. دەڵێن بەدرێژایی تەمەنی هەتا لە ڕۆژانی زۆر ساردیش ئاوی گەرمی بۆ دەستنوێژ و خۆ شووشتن بەکار نەهێناوە. تەمەنی راستەقینەی ٩٥ تا ١٠٠ ساڵ دەبێ. زیاتر لە ٦٠ ساڵ دەبێ سەرۆکی بنەماڵەکەیەتی. سەردەمی فەرمانڕەوایی سلێمانی و رواندزی لە بیرە، کە بە نۆبەت فەرمانڕەوایی کۆیەیان دەکرد. لە کاتی شکۆیی و لاویدا لەگەڵ تورکەکان جەنگاوە و دەستگیر کراوە و بە ١٥ ساڵ بەند کراوە. لەو ململانێیە هەندێک لە گوێچکەی براوە، هەرچەندە کە چاکبووەتەوە، بەڵام شوێنەکەی کێمی لێ دێت و بەردەوام پاکی دەکاتەوە، لەگەڵ هۆزەکانی دەوروپشتی کۆیە و هۆزی

(هەمەوەند) پێکدادانی هەبووە. (٥٠) گوندی لە دەوروپشتی کۆیە هەیە. ئەو بەمردنی ناوەختی منداڵەکانی نیگەرانە. کە تەمەنی گەیشتە (٩٠) ساڵ کوڕێکی بوو بە ناوی (محەمەد زیاد)، کە مەلایەک پێشبینیی کردبوو. کە گەیشتمە کۆیە تەمەنی هەشت ساڵان بوو. لە گوندێک بە دووریی چەند کاتژمێرێک دەژیا. پیرێکی رووخۆش و خۆشەویستە. زەردەخەنەی سەرلێوانی میهرەبانی دەسەلمێنی، ئەوەش گیانی لێبووردەیی و خۆشییە. لە ناو خەڵک بە پیرێکی بەخشندە باس دەکرێ. لەگەڵ پاکی دڵی و جوانی رواڵەتی، زۆریش سەرکەش و لاسارە. بەرامبەر بە خزمەکانی زۆردارە و سینگی فراوان نییە، بێ ویژدانە و بەرامبەر دوژمنانی لێبووردەیی نییە. هەردەم رووداوی ساکار دەورووژێنێ، کە ساڵانێکی بەسەردا رۆیشتووە، خۆشەویستی و رق و قینی کەسێتی کاریگەری زۆری لەسەر رەفتاری هەیە.

(عەبدوڵڵا ئاغا) سەرۆکی بنەماڵەی (حەویزی)یە، بە جەستە لاوازە و هەندێ کووری پێوە دیارە و تەمەنی لە دەوری (٦٥) ساڵدایە، رەنگێکی زەرد هەڵگەڕاوی هەیە، برۆکانی پڕن و بەرەنگی رەش بەلای شین دەشکێتەوە و بۆیاغیان دەکا، کاتێ کە بەرگی ئەوروپی دەپۆشێ، بە شۆڕشگێڕ دەچێ، لە پیلان دانان زیرەکە، کە گەیشتمە کۆیە سەرۆکی شارەوانی بوو، زۆربەی خەڵکەکە بەدڵیان نییە، خزمەکانی هیچ داواکارییەکی لێ ناکەن، بەڵام بەچالاکی بیر و هۆشی سەرسامن، لەم بارەیەوە لە (حەمە ئاغا) بەتواناترە. (جەمیل ئاغا) کوڕی مامێتی، ئەو بەراستی پیاوێکی ناوازە، بۆ چاودێریکردنی، باوکی بە حەمەغای دەسپێرێ و دواتر دەبێتە زاوای، لەبەر ئەوە پەیوەندیی باشی لەگەڵ هەردوو بنەماڵە هەبوو، پێگەی ئەو هەردەم بەیەکگەیشتنی هەردوولا بووە، لەو کوردانەی ناسیومن لە هەمووان راستگۆ و دەستپاکترە، نموونەی لە خواترسییە، دەمارگیر نەبوو، خەڵک بەپارێزەری جوولەکەکانیان دادەنا، هاوشێوەی دیانەکان کە لە گەڕەکەکەی ئەو نیشتەجێن، هەندێک لەوانە لە کێڵگەکانی ئەو جووتیارن. لە تافی لاویدا بۆ ماوەی چوار ساڵ سەرۆکی شارەوانی بووە، لەو پۆستە ئەو یەکەم کەس بووە، کە کاری بۆ بەرژەوەندیی دانیشتوانی شارەکەی کردووە، هیچ بەرژەوەندییەکی تایبەتی خۆی لەوەدا نەبووە، بەژنێکی درێژی قیتی هەیە، نێوچەوانێکی بەرز، دەموچاوی لاوازە، لە رۆژانی سەخت ئەو قوربانیی داوە، دوو برای هەیە: (جەلال) و (جەلیل) هەردووکیان زیرەکن.

لە کۆیە مەلا زۆرن، لە پێشەوەیان: مەلا محەمەد ئەفەندی (مەبەستی مەلای گەورەی کۆیەیە- و-) دێت، نازناوی (مەتران)مان بۆ داناوە، مرۆڤێکە بە تەمەن مامناوەندی، بەژن درێژ، شارەزاییەکی زۆری لە زانست و زانیاری هەیە. ئەو بەهرەیەکی رادەبەدەری لە قسەکردن هەیە، لە هەر شوێنێک بێ، ئەو قسەکان بۆ خۆی پاوان دەکا، خۆشبەختانە ئەو بە بەهرە وریا و زرنگە، کە ئەمە وای کردووە لە هەموو کەس خۆش مەشرەبتر و کۆمەڵایەتیتر بێ. شانازی بەوە دەکا، کە لە هەموو مەلایەکانی کوردستان زاناترە، ئەمەش پیاهەڵدانێکە لە ناو ئەم توێژەدا هەیە. لە ژێر فەرمانڕەوایی ئێمە بوو بە (دادوەری شەرع) لە کۆیە، زانیارییەکانی لە سەرووی گومانەوەیە، بەڵام ژیری و دادوەری ئەو بایەخ بە لایەنی ئایین و زانست دەدا، ئەو بە پەرۆشە بۆ کۆمەڵگا و پێداویستییەکانی ژیان.

دواتر بەرەو ئەو ماڵە چووم، کە (حەمە ئاغا) بۆی ئامادە کردبووم، لەگەڵم هات و هەوڵی دەدا بەزمانێکی سەیری تێکەڵاو لە فارسی و تورکی قسەم لەگەڵ بکا، دەنگی توندوتیژ بوو، بەگرانی تێ دەگەیشتم، لە وەڵامەکانم بەدەگمەن تێ دەگەیشت، چونکە گوێی تووشی کەڕی بووە، پاش پێشکەشکردنی خواردنێکی نایاب (حەماغا) بەجێی هێشتم و پاش نیوەڕۆ پێشوازیم لە کەسایەتییەکانی شار کرد.

بڕیارم دا (حەمە ئاغا) ببێتە حاکمی شار، پۆستەکانی تریش لەسەر رکابەرانی دابەش کران. ئەو شارە ١٨٠٠ پێ لەسەر رووی زەوی بەرزە (لەسەر رووی دەریا راستترە- و-) بەرزاییەکانی لای رۆژهەڵات و باکووری ٣٠٠٠ پێ بەرزە.

کە شەڕ و گرانی نەما ژمارەی دانیشتوان لە ١٠٠٠٠ کەس بوو بە ٤٠٠٠ کەس، نیوەی خانووەکان بەتاڵە یان کەلاوەیە و رووخاوە،

خەڵکەکە لە هەژارییەکی زۆر رادەبەدەر دەژین، نرخەکان بەشێوەیەکی نائاسایی زۆر بەرز ببوونەوە، پاش چەند رۆژێکی کەم لە گەیشتنم نرخەکان ٥٠ ٪ دابەزین، بۆ ئەوەی هەندێ لە ئازارەکان کەم بکەمەوە خانەی هەژارانم کردەوە، کە ٣٠٠٠ کەس سوودیان لێ وەرگرت، کە زۆربەیان بێ کەس بوون. کۆڵانەکان تەسکن، سەربازگەی تورکیی کۆن کەوتۆتە لای رۆژئاوای شارۆچکەکە، لەسەر تەپۆڵکەیەکی گەورەیە، بەسەر شار و دەوروپشتیدا دەنواڕێ.

لەم کاتەدا (شێخ وەسمان) لەلایەن (شێخ مەحموود) نێردرا بۆ کۆیە وەک قایمقام، منیش (حەمە ئاغا)م لەو پۆستە دانابوو. ئەوان بەمەبەستی یارمەتیدانم بۆ گەڕانەوەی ئاسایش و گوێڕایەڵی (سوار ئاغا)ی پیران دەستەبەر بکەن.

(شێخ عوسمان) مرۆڤێکی پایەداری خانەدان، خاوەن پیاوەتی، سروشتێکی ئاشتیخواز و هێمن و نەرمی هەیە، لەشی بچووک و لاوازە، بەڵام پەسەند و سەرسوڕهێنەرە. مرۆڤێکی وەک ئەوم بەشکۆیی و بەرزی نەدیوە، دەستپاک و راستگۆ بوو لەگەڵم. ئەو بەنیاز نەبوو ببێتە قایمقام لە کۆیە. دوو کەس و هەندێ سەرباز یاوەری بوون، یەکێکیان (شێخ عەبدوڵڵا) کوڕی مامی بوو، مرۆڤێکی بەهێز و خوێندەوارتر بوو، ئەو پیلانی دانابوو بۆ لابردنی (حەمە ئاغا) و دانانی یەکێک لە شێخەکانی سلێمانی لەو پۆستەدا، ئەوی تریان: (رەشید



مەلیک مەحموود

ئەفەندی) کە ئەفسەرێکی پێشووی تورک بوو، کەسێکی فێڵباز بوو، ئەو کاتەکانی ژیانی بەبەندکردنی (جوولەکە) و (دیان)ە بێ تاوانەکان بەسەر بردووە و راو و رووتی لەگەڵ دەکردن.

لەبەرئەوەی هەڵوێستم زۆر شلۆق بوو، لەگەڵ (حەمە ئاغا) رێککەوتم، کە بەشێوەی کاتی پۆستەکەی بووەستێنم.

داواشم لە (شێخ عوسمان) کرد کە بەناوی باوەڕپێکراوی تایبەتی (شێخ مەحموود) فەرمانڕەوای شارەکە بکات و ئەو دوژمنداریییەی لە نێوان هەردوو بنەماڵەی (حەوێزی) و (غەفووری) هەیە، یەکلا بکاتەوە. ئەگەر ئەو کارە ئەنجام بدا کۆیە جێ دەهێڵێ. لە کۆیە کەس بە دیدەنی شێخەکان دڵخۆش نەبوو. دوژمنداریییەکیش هەبوو کە درێژەی کێشابوو لە نێوان (حەمە ئاغا) و ئەو بنەماڵەی سلێمانی.

پاش نیوەڕۆ سەردانی قایمقامە تورکەکەی پێشووم کرد، بەهۆی نەخۆشییەکی ترسناک کەوتبوو، مرۆڤێکی بەجەستە بچووک بوو، خەڵکی (کریت) بوو، من بەزەییم پێدا هات، کە بەو لاوازییە لە نێوان خەڵکانێک جێیان هێشتووە کە هیچ بەهایەک بۆ یاسا دانانێن. ئەو لە دڵەوە دڵخۆش بوو بە دیدەنیم، قاوەیەکی ئەستەنبوڵی نایاب و خۆشاوێکم لای خواردەوە، داوای لێ کردم کە مووچەکانی پێشووی و دەرماڵەکانی تری بۆ دابین بکرێ، بۆ ئەوەی بگاتەوە وڵاتی خۆی، کە دوورە، منیش بەباشترین شێوە کە لە توانام دابوو وازیم کرد، دواتر باسی (پیران) کرا و هەناسەیەکی هەڵکێشا و دەنگی بەبارێکی هەڵبڕی و گوتی: ( لەوکاتەی کە حکوومەت بەهێزە ئەو میللەتە وەکو بەرخی بارمتەکراو وایە، بەڵام کە لاواز دەبێ (لێرە وەستا و لە ناکاو لە شوێنەکەی بەرز بۆوە و بازی دا و هاواری کرد) ئەوانە وەک شێر دەمرێنن.

(شێخ عوسمان) کە مرۆڤێکی سۆزدار و خۆش مەشرەب بوو، کامێرایەکی وێنەگرتنی جۆری (کۆداک)ی ئەڵمانی پێ دام، کە پیاوەکانی لە ئەفسەرێکی ئەڵمانیان

ستاندبوو. لەگەڵی رێککەوتم بۆ چارەسەرکردنی بارودۆخەکە و دوورخستنەوەی ئاژاوەگێڕان، هەریەک لە (محەمەد ئەمین ئاغا)ی غەفووری و (کەریم ئاغا)ی کوڕی برای (عەبدوڵلا ئاغا)م گرت و بۆ سلێمانی دوورم خستنەوە. لە رێگا پیاوانی شێخ کاتژمێر و پارە و پوولیان لێ سەندبوون، بەمە زۆر نیگەران بووم.

(حەمە ئاغا) بەمە زۆر پەست بوو. دواتر موقەددەم (نویل) بەدامەزراندنی (حەمە ئاغا) بە فەرمانڕەوا و (جەمیل ئاغا) بەجێگری رەزامەند بوو. (سوار ئاغا) بۆ پێکهاتنەوە لەگەڵ (عەبدوڵلا ئاغا) دەستبەجێ رازی بوو، پابەند بوو بە گەڕانەوەی هەموو ئەو سامانانەی کە لێی دزرابوو، بەڵام بەدبەختی کاتی واژووکردنی پێکهاتنەکە، کوڕی (عەبدوڵلا ئاغا) کە پێشتر لە رۆژی ٢٤ی مانگ لە هێرشەکەی (سوار ئاغا) بریندار ببوو، مرد.

## سەردانی (خۆشناو) و چەند گەشتێکی تر

سێ هەفتەی یەکەمی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩١٩ بەهێمنی رۆیشت. بەهۆی یارمەتیی (جەمیل ئاغا) توانیم رێگە لە هەر کردارێکی خراپ و ستەمێک بگرم، کە سەرچاوەکەی (حەمە ئاغا) بێ. پەیوەندیی باشم لەگەڵ خەڵکەکە هەبوو و زۆرجار لە ماڵی ئەوان نانم دەخوارد، (عەبدوڵلا ئاغا)ش جاروبار دەهاتە لام، بەمەبەستی پرسیارکردن لەو پۆستەی پێی دەسپێرم و مانگانەکەی چەندە، مەبەستی من ئەوە بوو لە دەسەڵاتی کەم بکەمەوە و دەسەڵاتی (جەمیل ئاغا) پتر بکەم و ببێتە سەرۆکی هۆزی (حەویزی)، بەڵام بێ سوود بوو.

ئاسایش باشتر بوو، نرخ لە بازاڕ دابەزی، دوکانی تازە کرایەوە، خانەی پەککەوتووان کەسێکی زۆری رزگار کرد، فەرمانبەرە تورکەکانم لە کار دەرکرد، مووچەی خانەنشینم بۆ دیل و کوژراوەکانی شەڕ تەرخان کرد، مووچەم بۆ مەلا زەرەرمەندەکانی شەڕ بڕییەوە، بودجەم بۆ تەکیەکان دانا، بەڕای زۆر کەس ئەگەر ئینگلیز مانگێک لە ناردنی نوێنەری بۆ کۆیە دواکەوتبا، ئەوا دانیشتوان شاریان بە کەلاوەیی و وێرانی بەجێ دەهێشت و هەزاران کەسیش لە برسان دەمردن. دواتر بارانێکی باش باری و بەرهەمێکی باشیش دروێنەکراو بەو بارانە دانیشتوان بووژانەوە و هیوایەکی باش کەوتە دڵیان.

لە ٢٣ی مانگ بە یاوەریی بەساڵاچووی قەڵەو (مەلا رەسووڵ)، کەمێکیش لە ژاندرمە، بەرەو گوندی (بانەقەڵات) رۆیشتین، دوو جووتیاری کورد میوانداریيان کردین، یەکێکیان (کێخوا حەوێز) و ئەوی تریان (کێخوا سالم) کە دوو پیاوی ساویلکەی رووخۆش بوون، بەتایبەتی (کێخوا حەوێز)، کە لە ناکاو قسە و سوعبەتی بۆ دەکردین، ئەوەی تا رادەیەک نیگەرانی کردم ئەو پیاوە شێتە بوو، کە (کەڕولاڵ) بوو، بایەخی زۆری بەمن دەدا و مشەمشی لێوە دەهات و ددانی چیڕ دەکردەوە و سەری بەلای من دەجووڵاند. پاش نانخواردنی بەیانی گەیشتینە گوندی (حاجی وسوو) لای (حەسەن ئاغا) دواتر بۆ (ئەشکەفت سەقا) گوندی (غەریب ئاغا).

لە ٢٥ی مانگ نزیک ناوچەی خۆشناو بووینەوە و لە دوای ئەو دەربەندەی کە پێیدا رۆیشتین (مەبەستی دەربەندی گۆمەسپانە - و-)، (میرانی قادر بەگ) کەسایەتییەکی پایەدارە و لەشی بەخۆوەیە و لە ناوەڕاستی ژیانێتی و چاوەکانی هەڵاوساوە، (میران) نازناوێکی هۆزیٚ خۆشناوە. (میر محەمەلی) تیرەیەکی لە پێشی ئەو هۆزەیە، کە (میرانی بایز بەگ) دوا سەرۆکی بوو، ئەو پیاوێکی قەبەی رادەبەدەر قەڵەو بوو، جارێک لە گەشتێکی بۆ کۆیە، کە تەنیا ٣٣ میل دوورە بەچوار رۆژ گەیشت و سێ ئەسپ لە ژێریا توێین، بە نەخۆشیی ئەنفلۆنزا لە سەرەتای مانگی تشرینی دووەم کۆچی دوایی کرد، ئەو کاتە کوڕەکانی بچووک بوون، ناکۆکی لە نێوان هەردوو برای (رەشید بەگ) و (قادر بەگ) سەری هەڵدا دووەمیان دایکیان لەگەڵ ئەوان جیا بوو، بەڵام لە رەشید بەگ بەتەمەنتر بوو، (قادر بەگ) زۆر بەقورسی نەخۆش بوو و وا مەزەندەی دەکرد، کە چاک نابێتەوە، لەبەرئەوە لاریی نەبوو بەدانانی (رەشید بەگ) بەسەرۆک هۆز، بەڵام پاش چاکبوونەوەی و بڕیاری بەریتانییەکان بەدانانی سەرۆک هۆز بەفەرمانڕەوا و بڕینەوەی مووچە بۆیان لە بڕیارەکەی پاشگەز بۆوە. دەبووایە

من یەکێکیان هەڵبژێرم. (قادر بەگ) هەروەک کەسانی تری هۆزەکەی مرۆڤێکی زەبەلاح و درێژ و قەڵەو بوو، دەموچاوی خڕ و پان بوو، ریشی هەبوو، لەبەر لەیەکچوونی بە (هنری هەشتەم)ی شاهەنشا ناومان نابوو، نەخوێندەوارە و تەنیا بە کوردی قسە دەکا، لە ژێر کاریگەریی نووسەری رقاوی و خزمی پیلانگێڕە، لە رۆژانی سەخت بیرکردنەوە و ئەندێشەی زۆر لاوازە، بەڵام پیاوێکی دەستپاک و نیازی باشە. ئەو هەمیشە سەرکردەی میللەتەکەیەتی، ئەگەر راوێژکاری باشی هەبایە. ئامۆژگاری بکردایە، ئەوا دەبووە سەرکردەیەکی نموونەیی. (قادر بەگ) لە گوندەکەی (قەڵاسنج) دەژی و (رەشید بەگ) لەبەر سەرپەرشتی موڵک و سامانی بنەماڵەی برا کۆچکردووەکەی لە شەقڵاوە دەژی.

نانی نیوەڕۆمان لە (قەڵاسنج) خوارد، جگە لە قادر بەگ دوو سەرکردەکەی تر ئامادە بوون، یەکەمیان پیلانگێڕی گەورە میرانی (سالح بەگ) سەرۆکی تیرەی (میر یوسفی)، پیاوێکی رەقی قەبە، دڵ گوشاد، میوانداریکی باش، چەند مانگێک بەردەوام بوو لە هاوڕێیەتیم. ئەو گەرمترین هەستی بەرامبەرم هەبوو، هەردەم شانازی بەوە دەکرد، کە ئەو کورد نییە، ئەو چۆن خۆی بەسەربەست دەزانی لە شێوازەکانی فێڵبازی و خوێنی رژاو، کە خزم و کەسی دروستی دەکەن.

خۆشترین یادەوەریم لە کوردستان لەلای (مستە فاغا) لە کۆڕێ لە دەرەوەی گوند لە ژێر دار تووە گەورەکەی بەسەرمان بردووە، وا باس دەکرێ کە ئەو چەند برایەک و خزم و دۆستێکی لەناو بردییە، بەڵام لەو پیاوەم پاکتر نەناسیوە، بەڵام مرۆڤێکی لاوازە، لە هەموو ئەو کوردانە دوورترە لە ئیرەیی و لە هەمووان دڵسۆزترە، من قەرزاریە بەگیانم، بەلانی کەم لە یەک بارودۆخ پێم سەیر بوو، کە دۆستێکی نزیکی (ئەحمەد ئەفەندی ئەربیللی)یە.

لە رێگا تووشی (خورشید بەگ) بووین، ئەو پیاوێکی بەساڵاچوو، سەرکردەیەکی خەڵکی (هەکاری)یە، راوڕووتی رووسی لە کوردستانی باکوور ناچاری کردووە، کە ئاوارەی ناوچەی خۆشناوەتییە، ترسی بەسەر ئەو ئاوارە کەمانە هەبوو، کە لەگەڵی دابوون، کەس نەیدەتوانی لە ئامادەیی ئەو دابنیشێ یان جگەرە بکێشێ، ئەو نیگەرا نبوو لەو دەرماڵە کەمەی کە پێی دەدەن، هەوڵم دا لە گوندێکی چۆڵ نیشتەجێیان بکەم، بەڵام ئەوان رازی نەبوون، کە بۆ بژێوییان کار بکەن، لە کۆتایی ساڵی ١٩٢٠ بۆ وڵاتی خۆیان رۆیشتن. دواتر چاومان بەمیرانی (رەشید بەگ) و هەردوو کوڕەکانی خوالێخۆشبوو (بایز بەگ) عومەر و سلێمان کەوت. (میرانی رەشید بەگ) مرۆڤێکی بەژن درێژە و ریشێکی رەشی هەیە، زۆر قەڵەو نییە، لە (قادر بەگ) لەسەرەخۆترە، چاوێکی خێلە، خوێندەوارێکی باشە و دەتوانی بەتورکی و فارسی و کەمێک عەرەبی قسە بکا، جگە لە زمانەکەی خۆی (کوردی). ئەو لە راوێژکردن لە برایەکەی چالاکترە، تا رادەیەک بیرێکی ساویلکەی هەیە، من خۆشم نەویستووە.

دواتر (رەشید بەگ) دانی بەرکابەرەکەی دانا، لەبەرئەوەی برا گەورەیەتی، بەڵام تکای زۆری لێ کردم کە لەبەر موڵک و ماڵی بایز بەگی برای و خێزانەکەی لە شەقڵاوە نیشتەجێ بێ و لەگەڵ قادر بەگ جیاوازی نەکرێ. دواتر (قادر بەگ)م بە فەرمانڕەوا دانا و پێشم راگەیاندن بۆ چارەسەری ناکۆکییەکان، سەردانی مامی بەساڵاچوویان (عەزیز بەگ) لە (بالیسان) بکەن و بۆ راستگۆییان سوێند لای ئەو بخۆن، بەڵام بێ سوود بوو. (قادر بەگ) جگە لە فەرمانڕەوایی، بووە سەرۆکی هەرسێ لقی هۆزی خۆشناو و خێڵی (کۆڕێ).

(رەشید بەگ) و (سالح بەگ)یش هەریەکە بووە سەرۆکی لقێک لەو هۆزە، لە ٢٦ مانگ گەڕانێکم بەناو شەقڵاوەدا کرد بە یاوەریی (حاجی نەورەس)، کە خەڵکی رەواندزە و بەڕەگەز فورسە و بەڕێوەبەری پێشووی شەقڵاوە بوو. ژمارەی شەقڵاوە ٣٠٠٠ کەسە و نیوەی دیانن، سەردانی ماڵی (بایز بەگ)م کرد و سەرێکی کڵێسەی دیانانمدا پێشوازییەکی گەرمیان لێ کردم، زۆرم بەزەیی پێدا هاتنەوە.

ویستم بۆ (کۆیە) بچم، لە هیران میوانی (عەلی بەگ) بووم. کاتی خۆی لە دژی تورک هەڵساوە، میوانداریەکی رادەبەدەری کردم. ئەو بارگرانیی زۆری لەسەرە، چونکە گوندەکەی دەکەوێتە ناوەندی رێگای کۆیە و شەقڵاوە. (میرانی ئەحمەد بەگ)یش بەهەمان شێوە گرفتارە.

بەیانیی زوو گەیشتمە گوندی (نازەنین) کە باغچەی فراوانی لێیە و هەنجیر و مێووژ و هەناریان بۆ هێنام، هەنارەکەی لە باشترین جۆری هەنارە لە کوردستان و بەناوبانگە. دواتر گەیشتینە (جەلی) کە ئاوێکی کانزایی گۆگردی لێیە، کە بۆ نەخۆشیی پێست بەکار دێت. لە کۆیە کێشەی (سوار ئاغا)م کۆتایی پێ هێنا.

لە کۆتایی مانگی کانوونی دووەمی ۱۹۱۹ لەبەر چەند هۆیەکی خێزانی، داوای مۆڵەتم کرد بۆ گەڕانەوەم بۆ بەریتانیا، نەقیب (بارکەر)م لە شوێنی خۆم دانا، کە بە یاریدەدەرم دامەزرا بوو.

سەردانێکی ناوچەکەم بە (بارکەر) کرد، بەپیادە هەیبەت سوڵتانمان بڕی بەرەو بیتوێن، لە ڕێگا بەکێڵگەی چنارۆکدا تێپەڕ بووین، کە هاوینەهەوارێکی (مەترانە) (مەبەستی مەلای گەورەی کۆیەیە -و-) کورد هەستێکی جوانی دەگمەنی هەیە لەناو گەلانی ڕۆژهەڵات. زەوی بە نەخشی وەک مافووری ئاوریشم، بەخمی سوور گوڵاڵە سوورەی ڕەنگ جۆراوجۆر لە سپی و ئاڵ تەنی بوو.

کابتن های زۆر ستایشی بابەکر ئاغای پشدەری دەکا و بەزاناترین و بەرزترین سەرکردەی کوردی دادەنێ.

دواتر کارەکەی بە نەقیب (بارکەر) دەسپێرێ و نەقیب (بیل) لە شوێنی دادەمەزرێ و بۆ بەغدا بەڕێ دەکەوێ.

هاری دەڵێ: کە پشتم لە (کۆیە) کرد، نیگەرانییەکی زۆر دایگرتم، چونکە خۆشەویستی ئەو شارۆچکە دووره بچووکە دڵخۆشکەرە و خەڵکەکەی لە دڵم گەشەی کردبوو، من ئەو دوو مانگەی کە لە (کۆیە)م بردە سەر، لە خۆشەویسترین مانگەکانم بوو لە کوردستان.

## جارێکی تر هەولێر

لە ۱۹۱۹/٦/۳۰ بەڕێگای حەلەب و مووسڵ گەڕامەوە هەولێر و پۆستی (یاریدەدەری حاکمی سیاسی)م لە (ڕاندموری) وەرگرت.

شاری هەولێر نائارام بوو، خەڵکەکە لە ژاندرمە و پۆلیس بێزار بوون.

کۆمەڵەیەکی نهێنی لە دژی بەریتانیا پروپاگەندەیان بڵاو دەکردەوە، هەندێ لە کەسایەتیی ناو شار پشتگیرییان لێ دەکردن. لەوانە (حاجی ڕەشید ئاغا)، کە لە سەردەمی تورک نا ئارامی دەورووژاند و داوای هاتنی بەریتانییەکانی دەکرد، کە ئەوان هاتن بیروڕای بووە پێچەوانە. ئەو خوێندەوارییە کەم بوو زیاتر مەبەستی تاڵانکردنی زەویوزار و خۆ دەوڵەمەندکردن بوو، لەبەر ئەوە زۆر مەترسیی لێ نەدەکرا. کوڕە گەورەکەی (عەتائوڵڵا ئاغا) کە مرۆڤێکی پاشکەوتوو و لاوازە و بەرگی ئەورووپی دەپۆشی، ڕۆژانە لە بازاڕ بە شپرزەیی دەبینرێ و تەزبیحەکەی بەدەستەوەیە و پروپاگەندە لە دژی بەریتانیا دەکا. (عەلی پاشا) (۱) لەگەڵ ئەو جیاوازە، لە تافی لاویدایە و، ڕەوشتی دەچێتە دڵەوە، پەروەردەیەکی بەرز کراوە. لە کاتی شەڕی یەکەمی جیهانی ئەو نازناوەی وەرگرتووە. کاتی خۆی ئەندامێکی چالاکی کۆمەڵەی (الاتحاد والترقی) بووە، لەگەڵ حاجی (ڕەشید ئاغا) پشتگیرییان لە چەتە ڕێگرەکان دەکرد، کە کاریگەریی خراپیان لەسەر بارودۆخی هەولێر هەبوو، قایمقامی تورکیش توانای چارەسەری نەبوو و وەک داردەستێک بوو بەدەست ئەو دوو ئاغایە. جگە لەوانە ئەو فەرمانبەرە تورکانەی، کە لە کارەکانیان دەرکرابوون، هەروەها حاجی (سەعید ئاغا) (نووسراوە سوید ئاغا -و-)، کە سەرخۆشێکی بەرچاوە و لەگەڵ بنەماڵەکەی، ئەوانە هەمووی لە دژی بەریتانیا پروپاگەندەیان دەکرد.

لە ۹/۷ ڕووداوێکی تۆقێنەر ڕووی دا، کە دەستەیەک بریتیبوون لە (حاجی سەعید ئاغا) و کوڕەکەی (یونس) و (ئەحمەد بەگ) کوڕی (سالح بەگ) و (ئەمینا)ی سەرتاش لە مەیخانەی (بوبو) دەیانخواردەوە و یاریی کاغەزیان دەکرد، لەسەر کێشەیەکی پێشوو بووە هەرا و ناخۆشی و لەو ناوە (عەریف میشون) کوژرا و حاجی (سەعید ئاغا) بەسەختی بریندار بوو، (عەریف کینارد) و پیاوێکی (حاجی سەعید ئاغا)ش بریندار بوون. باشچاوەش (عزەدین) دارودەستەی (حاجی سەعید ئاغا)ی دەستگیر کرد. دواتر (یونس) بەدەستی (عەبدولوەهاب) کە پێشتر کێشەی لەگەڵ هەبوو، بەسەختی بریندار کرا. دواتر دادگا بڕیاری دا بە لەسێدارەدانی (عەبدوڵڵا فەندی) کە دەمانچەیەکی لە ماڵەوە دۆزرابۆوە و

لە هاوشێوەی ئەو فیشەکە بووە، کە عەریف (مشیون)ی پێ کوژرابوو. (عەریف مشیون) لە نزیک عەنکاوە لەسەر گردێک نێژرا.

بۆ چارەسەری کێشەی هۆزی (دزەیی) بە ئۆتۆمبێل سەردانی دیوەخانی (حاجی پیرداود ئاغا)م کرد لە گوندی مێرغوزار، کە هەرسێ سەرۆکی هۆزەکە لە دیوەخان ئامادە بوون، (کێشەکە دانی باج و بارودۆخی ناوچەکە بوو -و-) (ئیبراهیم ئاغا) تەمەنی نزیکەی (٧٠) ساڵە، بەڕواڵەت بچووکتر دیارە، لەبەرئەوە سەر و ڕیشی بەرەنگی ڕەش بۆیاغ دەکا، بەژنی مامناوەندییە و نێوچەوانی بەرزە، دوو چاوی ڕەشی بریقەدار و کەپوویەکی بەرزی هەیە. بەهۆی غەم و پەژارە دەموچاوی لۆچاوییە، کەسایەتیی کاریگەرە، خزم و کەسی دەیپەرستن، ئەویش سۆزی زۆری بۆیان هەیە، لەبەر ئەوە ئەو پیاوێکی پیری بەتوانا و زیرەکە، گفت و لفتێکی باشی هەیە و بە بەهرەیە، لە ماوەی (٣٨) ساڵ کە باوکی لە ژیاندا مابوو، هۆزەکەی بەرەو چیای (قەرەچووغ) برد و (مەخموور)ی دامەزراند. دەربارەی شەڕەکانی بەرامبەر بە عەرەبەکانی (شەمەڕ) و تورکەکان بۆ چەندین ساڵە سروشت و بوونی خۆیانی پاراستووە. دەشتی (قەرەچووغ) (مەبەستی قەراجە-و-)کە بیابان بوو بەویست و خواستی ئەو بووە شوێنی نیشتەجێ و چاندنی کشتوکاڵ. کوڕە نۆبەرەکەی لەبەر دووبەرەکی لەگەڵ سەرکردەکانی تری دزەیی لەدەست داوە. یەک کوڕی کە ناوی (مشیر ئاغا)یە لە ژیاندا ماوە، کە گەنجێکی تەمەن (٢٠) ساڵەیە و چوست و چالاکە، بەڵام دەست بڵاوە، تا ئێستا هەستی بە لێپرسراوی ژیان نەکردووە، دەڵێن (ئیبراهیم ئاغا) لە گەنجایەتی ئەوها بووە، لەبەر ئەوە ئومێد هەیە، کە ئەویش بێتە سەر ڕێگای باوکی. ئەو لەگەڵ برایەکانی (٣٠) گوندیان هەیە، بەناوی لقی (بایز) کە باوکییەتی ناسراون. کۆمەڵەی ئەو بنەماڵەیە لە نەیارەکانی هۆزەکە بەجەستە و بیروڕا سەرکەوتووترن، تەنیا (خدر)ی کوڕە گەورەی (ئەحمەد پاشا)ی لێ دەرچێ.

(ئەحمەد پاشا) زۆر قسە دەکا، لەشێکی بچووک و بەهێزی هەیە، تەمەنی (٦٠) ساڵی زیاترە، خوێندەواریی کەمە وەک ڕەفتاری، بازرگانێکی سەرکەوتووە، ئەو زیاتر مەبەستی قازانجە نەک سەرۆک هۆز، ئامانجی پارە کۆکردنەوەیە، بە (کافرۆشی) ناسراون. لەبەر بێ کارامەیی جڵەوی زمانی ناگرێ، لەبەر ئەوە بۆ برادەرایەتی دەست نادا، وەک دوژمنێک سۆزمان بۆی نییە، ڕێبازی ژیانی زۆر سەیر و سەمەرەیە، لە سەرەتای ژیانی هیچی نەبوو، لە چایخانەکانی هەولێر ڕۆژانی ژیانی بەیاریی (تاوڵە) بردۆتە سەر، کە لەو کارە بێزار دەبێ ڕۆژێک بە ئەنقەست جووتێک هێستری دزی و بۆ کەندێناوەی فڕاند، بەمەبەستی نیشتەجێبوون گوندێکی دامەزراند و چەند جووتیارێکی لەسەر دانا. بەرهەمی ساڵی یەکەمیان نەهات بوو، لەبەر ئەوە داوای قەرزی لە حکوومەت کرد، بۆ ئەوەی لە بەهاری داهاتوو دانەوێڵەی پێ بکڕێ، پاش وەرگرتنی قەرزێکی زۆر هەمووی بۆ خۆی گل دایەوە، کە دەبوایە بەسەر جووتیارەکانی دابەش بکا، دواتر بە قازانجی زۆر بە قەرز دایدەنێ و ناوبانگی دەرکرد و دارایی زۆر باش بوو، خۆی و کەسانی نزیک ئەو لە هۆزەکەی بوونە خاوەنی (١٨) گوند، دەڵێن (٢٠٠٠٠٠) جونەیهە زێڕی لەماڵەوە هەیە، جگە لەو بڕە پارە زۆرانەی، کە بە قازانج بەخەڵکی داوە، هەردەم دەیتوانی بەهۆی ئەو سامانەوە پشتگیریی حکوومەتی تورکی بۆ خۆی ڕابکێشی، دەربارەی بەتاڵانبردنی زەویوزاریان بۆ ڕکابەری لەگەڵ (ئیبراهیم ئاغا)، کە تا ڕادەیەک پیاوێکی هەژارە، چونکە کەمێک نەبێ هیچی لە جووتیارەکانی وەرنەدەگرت و پارە و سامانیشی بۆ میوانداری بەفیڕۆ دەدا.

(ئەحمەد پاشا) کە زانی دادپەروەری بەریتانیا ناکڕدرێ، بەپەلە بووە لایەنگری ئێمە، لەوانەیە ئەو بزوێنەری یەکەم بووە بۆ بەردەوامیی ئاژاوەکان.

(حاجی پیرداود) ڕێبازی ئەو جیاوازە. پیاوێکی بەجەستە بچووکە و رووخساری تا ڕادەیەک باشە، تەمەنی ٥٥ ساڵە، دوو چاوی تیژی هەیە، سمێڵی درێژە، دەنگی نەرم و جوانە، کەسم وەک ئەو نەدی، کە شیعری فارسیی بەو شێوە باشە بخوێنێتەوە، کەسانی بنەماڵەکەی نزیکەی هەموویان موویان سوورە، لەشیان لە مامناوەندی نزیکن،

زۆربەیان نەخۆش بوون. لە هەولێر بە (نەفرەت لێکراو) ناسراون، واتە ئەو کۆمەڵەی کە باش نین.

خـــوێندەوارێکی باشــــە و پیلانگێرێکی بەتوانایە، بەرامبەر بە حکوومەت لەگەڵ (ئەحمەد ئاغا) یەکگرتووە، ئەو رینومایی و بیروڕا بەبزووتنەوەکە دەدا و بودجەشی بۆ دابین کردووە. ئەو بە ئارەزووی خۆی بەڕێدا دەڕوا، زیرەکە، فێڵبازە ناکەوێ، هەردەم خۆی بە ئیماندار دادەنێ و حەجی ماڵی خوای کردووە، لەگەڵ ئەندامانی هۆزەکەی (١٨) گوندیان هەیە.

چوارەم کەس لەو پۆلە سەرکردانە (رەسووڵ ئاغا)یە، کە ناسیمان، بەراورد لەگەڵ ئەوانی دیکە وەک نەبێ وایە. ئەوانە ئەو پیاوانە بوون، کە لە دیوەخانەکەی (میر خوزار) چاوم پێیان کەوت، کەوتنە مەترسی، لەبەر ئەوە یەکیان گرت، هەریەکە بەزەیی بە ئەوی دیکەدا دەهاتەوە، نەوەک بۆ هەولێر بچێ و لەبەر سوودمەندیی، نەمتوانی مەرج لەسەریان دابنێم، چونکە هێشتا کارەکەم لە رائید (موری) وەرنەگرتبوو، ئەوان مەزەندەی ئەوەیان دەکرد، کە ئازاردانێکی زۆر چاوەڕێیان دەکا. پێشنیارم کرد کە (ئیبراهیم ئاغا) بە ئۆتۆمبێلی خۆم لەگەڵم بێ ئەوانی دیکە نەیانهێشت. پاشان بەوە رازی بوون، کە رۆژی دواتر بۆ ماڵی (مەلافەندی) لە (باداوە) لە دەردوەی هەولێر بێن، بۆ باسکردنی مەرجەکان لەگەڵ رائید (موری)، بەڵام مەرجەکەیان بەجێ نەگەیاند تا رائید (موری) نەڕۆیشت زاتی ئەوەیان نەبوو بێنە کۆبوونەوەی (باداوە). ئەوان بەگومان و دوودڵ بوون لە سووربوونی من، شەوانە دەگەڕانەوە گوندەکانی خۆیان. بەناوبژیوانی (مەلافەندی) و (ئەحمەد ئەفەندی) سەرۆکی شارەوانی، ئەو سەرکردانە بەمەرجەکانی من ئاشنا بوون، ئەویش: دانی (٢٠٠) تفەنگ و دانانی (١٥٠٠) لیرەی عوسمانی بۆ ماوەی شەش مانگ بۆ دەستەبەری مەرجەکان. من مەبەستم دابڕانی (ئیبراهیم ئاغا) بوو لەوان، بۆ ئەوەی متمانەی لە هەولێر هەبێ، بەڵام (ئەحمەد ئەفەندی) کە نوێنەری من بوو، ئەو گفتوگۆیە نەیتوانی بە تەنیا دیداری لەگەڵ بکا، ٣ یا ٤ رۆژ تێپەڕ بوو لەو ماوەیەدا وتووێژێکی زۆر کرا، بەڵام بێ بەرهەم و لاواز بوو، تا رۆژی ٢٠ی مانگ (باداوە)یان جێ هێشت و بەرەو گوندەکانیان گەڕانەوە. نائومێدیی باڵی بەسەرم داکێشا، بیرم لە کردارێکی سەربازی کردەوە. ئەوە بوو کتوپڕ (ئیبراهیم ئاغا) هاتە لام و لە خۆشییان گریانم هات، تەنگژەکە بە ئاشتی تێپەڕ بوو.

رۆژی داهاتوو سەرکردەکانی دیکەیش هاتنە لام. تفەنگەکانیان هێنا و پارەکەیان دا تەنیا (٥٠) لیرە نەبێ، کە ناکۆکیی لەسەر بوو. دواتر (ئەحمەد پاشا) دای.

(ئیبراهیم ئاغا)م بە سەرۆکی هەموو هۆزەکە ناساند و ویستم یارمەتیی بدەم، لەبەرئەوەی ئەو چاکەی زۆری لەگەڵ کردبووم، کارەکان کەوتە ژێر دەستی کۆمەڵەی ئەو.

(جەمیل ئاغا) سەرکردەی هۆزی (گەردی)، کە لە گوندی (بەحرکە) نیشتەجێیە، لەو کێشەی دوایی پشتگیریی لە هۆزی (دزەیی) نەکردبوو، بەهەلم زانی بۆ ئەوەی بچم سوپاسی بکەم. (جەمیل ئاغا) مرۆڤێکی چاوچنۆک و خۆپەرست و خۆهەڵکێشە، هەردەم بیر لە شتێک دەکاتەوە، کە سوودی بۆ خودی خۆی هەبێ، هەندێ کورسیی دانابوو، کە بەقەدیفە، باشترین دارتاشی هەولێر بەرگی کردبوون، خواردنێکی نایاب و نائاسایی پێشکەش کردم. دواتر ریش سپییەک بەچڕینی چەند گۆرانییەکی فۆلکلۆری دانیشتنەکەی رازاندەوە. دواتر لەگەڵ (خواجە سیبی) عەنکاوەی بەقرچەی گەرما سەردانی (٣٠) گوندی ناوچەی قوشتەپەمان کرد بۆ تۆمارکردنی باجی داهاتی دانەوێڵە. رۆژانە لە هەولێر سەیری (٣٠) سکاڵای هاووڵاتییانم دەکرد لەبارەی کێشەی زەویوزار و پاداشت و سزا و چاوپێکەوتنم لەگەڵ دەکردن.

لە کۆتایی مانگی ئاب (ملازم کرتن) بوو بە یاریدەدەرم و لە مانگی تشرینی یەکەم (نەقیب برادشۆ) شوێنی ئەوی گرتەوە، بۆ ماوەی ساڵێک لەگەڵم ماوە، من قەرزاریمە، هەستێکی بەرز و ئارام گرتنێکی رادەبەدەری هەبوو.

(٣٥) پۆلیس لە ژێر فەرمانی (میستەر روبنز)، کە زۆر زیرەک بوو بۆ پاراستنی ئاسایش و چەسپاندنی یاسا. (١٥٠) ژاندرمەش (عەریف کینارد) مەشقیان پێ دەکردن، لە تشرینی یەکەم بەدواوە، ئەو پۆستە بە

(سەید عەلی ئەفەندی) سپێردرا، کە گەنجێکی عەرەبی سووری بوو، چالاک و تەمەنی ٢٦ ساڵ دەبوو. ئازا بوو، بەڵام زوو شپرزە و بێزار دەبوو، کارم زۆر پێ سپاردبوو، باشترین کەس بوو کە بۆ من لایەنگیر و دڵسۆز بێ.

رۆژانی هەینی و یەکشەممە پشووم بوو، لە هەینی پێشوازیی کەسایەتییەکانی شارم دەکرد و پاش خواردنەوەی چا و قاوە باسی کێشە و گرفتەکانمان دەکرد، ناوم نابوو (پەرلەمان) راوێژکاری هەمووانم دەکرد. ئەوانەی بەردەوام ئامادە بوون: (مەلافەندی) و (عەبدوڵلا پاشا) و (موفتی) و (عەلی پاشا) و (حاجی رەشید ئاغا) و هەندێ کەسی دیکە. لە هەمووان پایەدارتر (مەلافەندی) بوو، کە زۆرجار لە (باداوە) سەردانی ماڵەکەیم دەکرد، شوێنێکی دڵگیرە، باغچە و دارمێو دەوری داوە، لەملای رۆژهەڵات حەوزێکی ئاو هەیە و گوڵی وەرزی دەوری داوە، لە نزیکەوە بۆنی خۆشی دەکەی. خانووەکەی دوو نهۆمە، لە خوارەوە نافوورەیەک هەیە، ژووری سەرەوە کەمەر چینێک، کە لە دار گوێز هەڵکەنراوە بەشێوەیەکی جوان لە دەرەوەی جیا دەکاتەوە. ناوەوە بەرایەخی جوان راخراوە و کەلوپەلی چێشتخانەی نایابی تێدایە، شێوازی خانووەکە بەگشتی بە نەخشی جوان رازاوەتەوە، بنمیچەکەز نۆیاغی جۆراوجۆر کراون.

هەندێ پارچەی (میکا) لێرە و لەوێ دەبینران. (مەلافەندی) بە رۆژ لە مزگەوتی گەورەی هەولێرە و ئێوارە



**مەلافەندی**

دەگەرێتەوە. ناوی (ئەبوبەکر)ە بە (مەلافەندی) یا (مەلا گچکە) ناسراوە، باڵای کورتە، رووخساری لووس وەک بازە، خواپەرستە، لە ژیانم دەستی وا لاوازم وەک هی ئەو نەدیوە، کەوایەکی درێژی بۆری لەبەر دەکاتە هەردوو پێیەکانی. فێستێکی لەسەرە، کالایەکی موسلینی شینی کراوەی بەدەوریدا پێچراوە. لە کوردستان لای هەموو کەس مرۆڤێکی پیرۆزە. بنەماڵەکەی ناودار بوون و زیانی کەسیان نەبووە، موڵک و سامانیان زۆرە، رۆژی هەینی پێش نوێژ و ئامۆژگاری خەڵک لە مزگەوتی گەورە دەکا. بەپێچەوانەی کەسانی هاوشێوەی خۆی ئەو بە ئاشکرا پێشکەوتووە، ئەو بلاوکراوانە دەخوێنێتەوە کە لە میسر و تورکیا دێت، لە گفتوگۆ و بابەتەکانی سیاسی و زانستی زیرەکە، رۆژێک پرسیارم لێ کرد، بیروڕات چییە بەرامبەر بارودۆخی ئێستای ئەو وڵاتە؟ لە وەڵامدا گوتی: هەموو تاکێک حەز دەکا کە وڵاتەکەی (دایک) سەربەخۆ بێ، بەڵام ئێستا ئێرەیی لە هەردوولا ئێمەی لەیەک جیا کردووەتەوە، کەسێک نییە بە کەڵکی فەرمانڕەوا بێت، دەمانەوێ ئێوە کارەکانمان بەرێوە ببەن تا ئاسایش و ئاشتی بۆمان دەگەرێتەوە و خۆمان توانای فەرمانڕەوایی خۆمان دەبێ، ئەو بە راستگۆیی و دڵسۆزی لەسەر ئەو سیاسەتە ماوە، هەردەم بەیەکەوە بووین، هیچ پۆستێکی حکوومی وەرنەگرتووە و نەیویستووە، بەهەموو توانای خۆی دەستی یارمەتیی بۆ حکوومەت درێژ کردووە. ئەو کاریگەریی لەسەر رای گشتی هەولێر هەبووە. (ئەحمەد ئەفەندی) کوڕی مامی بە ئامۆژگاری ئەو کار دەکا. زۆربەی ئەندامانی بنەماڵەکەی تووشی نەخۆشیی (سیل) بوون، ئێستا ژنەکەی و سێ کچی لەو نەخۆشییە نزیکبوونەوە، تەنیا کوڕێکی پێنج ساڵەی بچووکی ماوە.

لە کەسایەتییەکانی تری شار (عەلی پاشا) و (حاجی رەسووڵ)، کە پێیان گەیشتم هەروەها (سەید عەبدوڵلا پاشا) کە پێشەوایەکی پیری پایەدار و مەزنە لە شار، هەردەم لە دەرەوە بەسواری هێسترێکی سووربای نایاب دەبینرێ. ئەو دەوڵەمەندە بەڵام سامانی زۆر خۆش دەوێت، بیروباوەڕەکەی ئەو پووڵ و سامانەکەیەتی، خوێندەوارێکی باشە سەردانی میسر و سووریا و ئەستەنبوڵی کردووە. (موفتی) کە برای سەرۆکی شارەوانییە، بەساڵاچوویێکە زۆر قسە دەکا، وا راهاتبوو، کە رۆژانە بۆ لام بێ،

بەیەکەوە فارسی بخوێنینەوە، ئەوانەی لەگەڵی تێکەڵن بە مرۆڤێکی لەسەرخۆ و سەنگینی دادەنێن.

لە هەفتەی یەکەمی مانگی ئەیلوول ئاهەنگی (جەژنی قوربان) گێڕدرا، شار بە رووخسارێکی جوان رازایەوە. دانیشتوان باشترین و پاکترین جلوبەرگ لەبەر دەکەن. بەتایبەتی منداڵان بەجلوبەرگی ئاوریشمی جۆراوجۆری رەنگاورەنگ و بەخشڵی زێڕ نەخشێنراون. بە (بازاڕی گوند) لە ئینگلتەرا دەچێ. لە شوێنی هاتنە خوارەوەی قەڵا، جۆلانە و چەرخ و فەلەک دانرابوون، هەریەکە و بە (ئانە)یەک سوار دەبوو، بەرامبەر ئەوانە دوکانی فرۆشتنی حەلوا و یاریی منداڵان هەبوو، بەگشتی دیمەنێکی شادی و خۆشحاڵی دەبەخشی.

کاتژمێر ۳۰.۸ بەیانیی یەکەم رۆژی جەژن، سەردانێکی سەرام کرد، بەهاویشتنی گوللە تۆپێک پێشوازیم لێ کرا. (سەید عەلی) و پاسەوانی شەرەف ئامادە بوون لەم پێشوازییە. کە دانیشتم میوانەکان سەردانیان کردم، لە پێشدا کەسایەتییەکانی شار گچکە و گەورەیان، بازرگانە پێشکەوتووەکان، ئەوانە (۳۰) کەس دەبوون تەوقەم لەگەڵ هەمووان کرد. هەریەکە پارچەیەک لە حەلوا و جگەرەیەک و چایە و قاوەیان پێشکەش کرا. پاش ئەوان فەرمانبەرانی حکوومەت بەهەمان شێوە بەرێ کران. ئەوەی سەرنجی راکێشام ئەم زنجیرە ناولەپانە بوو، کە هەندێکیان کاتی تەوقەکردن دەلەرزانەوە و بەددەستەوە دەنووسان، هەندێکی تر وشک و دڕکاوی بوون.

بۆ رۆژی دواتر منیش سەردانی کەسایەتییەکانی شارم کردەوە، کە ۱۰ یا ۱۱ماڵ دەبوو و لە هەر ماڵێک یەک چارەگ دەمامەوە.

لە سەرەتای ئەیلوول مۆڵەتێکی سێ رۆژیم پێ درا بۆ سەردانی ناوچەی (خۆشناو)، بۆ ئەوەی جارێکی تر هەوای پاکی چیاکان هەڵبمژم. لە (کۆڕێ) (مستەفا ئاغا) و لە شەقڵاوە لە میرانی قادر بەگ، کە کارەکانی بەدەست نووسەرێکە بەناوی (ئەحمەد مەدحەت ئەفەندی)یە، کە نەخوێندەواری سەرۆکەکەی زۆر دەقۆستەوە، کە لە شەقڵاوە بووم دار گوێزیان رادەتەکاند بۆ کۆکردنەوەی بەرهەمەکەی، هەنجیر و هەڵووژە و هەرمێ و هەنار بەدرەختەکان مابوونەوە.

پاش نیوەڕۆ بەسەر چیای سەفین کەوتم، کە ٦٥٠٠ پێ بەرزە بۆ ئەوەی بۆ (خۆران) لای (ساڵح بەگ) بچم، لەسەری سەفین مێگەلێک بزنەکێویمان دیت، زێی گەورە و بەشێک لە دیجلەمان لێ دیار بوو، دەڵێن ئەگەر ئاسمان بێ گەرد بێ کەرکووکیش دیارە، چاڵە بەفری هەولێرمان دیت. ئێوارە گەیشتینە خۆران و ئەحمەد بەگی کوڕی ساڵح بەگی لە پێشوازیماندا بوو، دوو شەو لای ساڵح بەگ مامینەوە. دواتر بەیاوەری ئەو چووینە کۆڕێ، کە رۆژی ۱۰ی موحەڕەم بوو، سەرەتا ساڵح بەگ و مستەفا ئاغا بەرۆژوو بوون، دواتر هەردووکیان نانی نیوەڕۆیان لەگەڵ خواردم. ساڵح بەگ هەروەک تورکەکان، دەیویست ئێمەش هەڵبخەڵەتێنێ و خۆی لە دانانی باج دوور بخاتەوە. دواتر بۆ خەمڵاندنی بەرهەمی برنج بۆ هەولێر و لەوێوەش لەبەر چەند کارێکی گرنگ بەرەو بەغدا رۆیشتم.

## دامەزراندنی لیوای هەولێر

شارۆچکەی هەولێر تا تشرینی دووەمی ساڵی ۱۹۱۹ بەشێک بوو لە لیوای مووسڵ، پێشتر پێشنیاز هەبوو، کە لیوایەک بەناوی (هەولێر) لە هەریەک لە شارۆچکەی (کۆیە)، کە سەر بەلیوای سلێمانی بوو، شارۆچکەی (رواندز)، کە یاریدەدەری حاکمی سیاسی پەیوەندی یەکسەری لەگەڵ بەغدا هەبوو دابمەزرێ، هەردوو شارۆچکەش پەیوەندییان بە هەولێر ساناتر بوو.

بۆ ئەم مەبەستە لەگەڵ (ئەحمەد ئەفەندی) سەرۆکی شارەوانی بۆ بەغدا بەرێ کەوتین، لە (شەرگات) یەکەم جار بوو ئەحمەد ئەفەندی شەمەندەفەر ببینێ، زۆر بە بایەخەوە سەرنجی راکێشا بوو و پێی سەرسام بوو. (های) باسی رووداوەکانی (بیرەکەیرە) لە ئاکرێ و رووداوی هۆزەکانی ئەو ناوچەیە و بارزان و دەڤەری زێبار دەکا.

چوار یا پێنج رۆژ مایەنەوە. دواتر لە ۱۹۱۹/۱۱/۱ لیوای هەولێر دامەزرا و لە ۱۱/٥ بە برووسکە ئاگادار کرامەوە و بەحاکمی سیاسیی هەولێر دامەزرام و نەقیب (رندل) لە کۆیە و نەقیب (کیرک) لە رواندز بەیاریدەدەری حاکمی سیاسی دامەزران. لە ۱۸-ی مانگ

بەسەردانێک بۆ کۆیە چووم دوو یان سێ ڕۆژ مامەوە.

(کۆیە) زۆر نەگۆڕا بوو، کە لە شوباتەوە جێم هێشت بوو، پاشی من نەقیب (بیل) و دوای ئەو نەقیب (رندل) لە شوێنی من دامەزران. (حەماغا) و (جەمیل ئاغا) و (مەتران) (مەلای گەورە-و-) لە کارەکانیان بەردەوام بوون. (مەتران) بەگەرمی بەخێرهاتنی کردم و گوتی: "جاری یەکەم کە هاتی بارانت لەگەڵ خۆت هێنا، ئەگەر ئەو جارەش بۆمان نەهێنی، لە شارەکەمان لاتدەبەین" خۆشبەختانە، لە ماوەی چەند چرکەیەک نمەبارانێک باری و لە توانجەکەی رزگارم بوو.

لە ڕووداوەکانی کۆیە لەگەڵ شۆڕشی شێخ مەحموود، یاریدەدەری حاکمی سیاسی لە بنکەکەی خۆی گۆشەگیر بوو و هەواڵی نەزانرا. (حەماغا) هەڵوێستی باشی هەبوو و مەبەستی پێکهاتن بوو، پشتگیریی حکوومەتی کردبوو. (عەبدوڵلا ئاغا) رۆڵی فێڵبازی گێڕابوو، دەیویست خۆی بە لایەنگری هەردوولا لە قەڵەم بدا، لەبەر ئەوە بۆ بەغدا دوور خرایەوە.. (میرانی قادر بەگ)، کە نامەی لە (شێخ مەحموود) بەدەست گەیشتبوو لەسەر پشتگیرییەکەی خۆی بۆ ئێمە مایەوە.

بارودۆخی (کۆیە) گەشەی پێوە دیار بوو، بازار پڕ بوو لە کەلوپەلی هاوردە و بازرگانیی نێردراو دەستی پێ کردبوو، ئەو دانیشتوانەی کە هەندەی نەمابوو لە برسان بمرن بەدڵێکی خۆش بۆ کارەکانیان



**مەلای گەورە**

گەڕانەوە، ئەندامانی هەتیووخانەکە لە شارەوانیی مەشقیان پێ کرابوو، لەبەر ئەوە کەمێکیان مابوونەوە. هەستم بەوە کرد کە دیمەنی شارۆچکەکە زۆر گۆڕابوو، زبڵ و خاشاک لابرابوو، هەوڵ درابوو بۆ چاکردنی ناوەڕۆکان، کۆیە هاوینان شوێنێکی ناتەندروستە، ئەفسەرەکان هەموویان تایان لێ بوو، رەشەباش هەردەم مەترسیی گەردەلوولی لێ دەکرا، لە وەرزی هاوین ژیان زۆر ناخۆش بوو.

سوار ئاغا دەستگیر کرا و بۆ بەغدا دوور خرایەوە، من هەرچەندە پەیوەندیم بە کۆیە و قەڵادزێ نەمابوو، بەڵام مەبەستم ئاگاداری ڕووداوەکان بوو. لە هەولێر زۆرجار چاوم بە (سوار ئاغا) دەکەوت، کە لە بەغدا گواسترابۆوە هەولێر.

دواتر بەرەو شەقڵاوە و دەشتی حەریر ڕۆیشتم، کە درێژاییەکەی ٢٠ میل دەبێ لە (باتاس) سەردانی (عەبدوڵلا پاشا)مان کرد، کە پێش ساڵێک کوڕەکەی (سەعید ئاغا) کوژرابوو، ئەو بەساڵاچووە و ئەو نازناوەی لە حکوومەتی تورکی پێ دراوە، ١١ ساڵ قایمقامی هەولێر بووە، ماوەیەکیش بریکاری موتەسەریفی سلێمانی بووە. حکوومەتی تورکی متمانەی زۆری پێ هەبوو، لایەنگری حکوومەتی بەریتانیایە و متمانە بە ئامۆژگارییەکانی دەکرێت، نەوەکەی کە پێش ساڵێک باوکی کوژرابوو ماڵی بردۆتە (رواندز).

لە ٢٤ی تشرینی دووەم بەرێگای (ماوەران) و (کۆرێ) گەڕامەوە (ماوەران)، سەردەمێک بنەماڵەی ناوداری مەلایەکان بەناوی (حەیدەری)ی لێ نیشتەجێ بووین، کاتی خۆی ٢٠٠ یان ٣٠٠ ماڵ دەبوون، لەو کاتە زانیمان، کە (عەزیز ئاغا) لە (خرە) کە کوردێکی نەخوێندەوارە ٣ ژاندرمەی لە دیوەخانەکەی کوشتووە.

لە ٢٩ی تشرینی دووەم عەقید (ویلسۆن) بەرێگای ئاسمان گەیشتە هەولێر، لە ٣٠ی مانگ گەڕایەوە، نەقیب (کیرک) لە باتاسەوە گەیشت و بەمەبەستی چوونی بۆ (ئاکرێ) و چاوپێکەوتنی بەعەقید (ویلسۆن)، کە لەگەڵ منیش باسی دوارۆژی کوردستانمان کرد، دواتر بە ئۆتۆمبێلی خۆم بۆ سەردانی (سۆن) بەرەو سلێمانی کەوتمە ڕێ.

## ڕواندز و گەلی

شارۆچکەی (ڕواندز) پێش شەڕ ژمارەی دانیشتوانی زیاتر لە ۱۰۰۰۰ کەس بووە، مزگەوت و گەرماو و بازاڕی فراوانی لێ بووە.

لە سەرەتای ساڵی ۱۹۱٦ ڕووسەکان ڕواندزیان داگیر و کاول کرد، کاری ناڕەوا و تۆقێنەریان ئەنجام دا، ئەمە بووە هۆی ئەوەی، کە کوردێکی زۆر لە هەولێر و کۆیە و ڕانیە خۆیان بدەنە پاڵ هێزەکانی تورک، کە لەسەر چیای (کۆڕەک) بنکەیان بەهێز کردبوو، زۆر سەرکردەی کورد وەک (حەماغا)، کە لەو کاتە سەختە ناخۆشە بەهێمنی خەوێکی خۆشی لێ دەکەوت، بۆ هاوکاریی تورکەکان هاتبوون و لە پێشکەوتنی لەشکری ورووسی ڕێگر بن، خەڵکەکە لە تورکەکان بێزار ببوون، چونکە نەیاندەتوانی، ئازووقەی ئەو هەموو خەڵکە زۆرە دابین بکەن، ڕووسەکان نەیانتوانی بەسەر چیای کۆڕەک بکەون، لەبەر ئەوە پاشەکشێیان کرد، دواتر تورکەکان داگیریان کردەوە و ئەوەی بە ئاوەدانی مابۆوە، ئەوجارە ئەوان کاولیان کرد. لە ساڵی ۱۹۱۸ کە شەڕ وەستا ۲۰٪ی خەڵکەکە مابوون، ئەوانەش لەسەر مردن بوون. پاش داگیرکردنی هەولێر، بە چەند ڕۆژێک ئەوانیش ڕزگار بوون.

کاتێ خۆی ئەگەر (سەعید بەگ) کوڕی (عەبدوڵلا پاشا) نەکوژرابا، ئەوا دەیتوانی بەدەسەڵاتی زۆری خۆی بەسەر ناوچەکەدا زاڵ بێ، لە سەردەمی تورکەکان دووجار فەرمانڕەوای شار بووە، کوڕە تاقانەکەی (ئیسماعیل بەگ) شوێنی ئەوی گرتەوە.

لە کانوونی یەکەمی ۱۹۱۸ (نویل) بەیەکەم (یاریدەدەری حاکمی سیاسی) لەو شارە دامەزرا. کارەکانی ڕێکخست و مووچەی بۆ سەرکردەی هۆزەکان بڕیەوە و زۆر فەرمانگەی دیکەی دامەزراند. لەبەر ئەو ئاژاوەی ڕووی دا بڕیار درا، کە چۆڵ بکرێ و فەرمانگەی یاریدەدەری حاکمی سیاسی بۆ (باتاس) بگوازرێتەوە. دواتر (نووری باویل ئاغا) دەستگیر کرا، بەڵام توانی لە دەست پاسەوانەکانی خۆی ڕزگار بکا و بۆی دەرچێ. سەرۆک هۆزەکان مووچەیان بڕا، تەنیا (شێخ محەمەد ئاغا) نەبێ، کە سەرۆک هۆزی (باڵەک) بوو، ئەو ڕێگای ئێرانی کردەوە و یارمەتی و پشتگیریی حکوومەتی کردبوو. دانیشتوانی ڕواندز ئارەزووی زۆریان هەبوو لە گەڕانەوەی حکوومەت.

کاپتن های دەنووسێ: (نووری باویل ئاغا) ڕازی نەبوو گوێڕایەڵی فەرمانەکانی (یاریدەدەری حاکمی سیاسی) بێ، (نووری) دەستگیر کرا، بەڵام توانی لە دەست پاسەوانەکانی خۆی ڕزگار بکا.

لە بەشی دووەمی کتێبەکەی هایدا هاتووە: کە گەیشتمە ڕواندز، چوومە ماڵی (ئیسماعیل بەگ)، کۆمەڵێک پیاوی چەکدار دەوریان دابووم، خانووەکە کەلوپەلی باشی تێدا بوو، جگە لە شتی ئەنتیکەی دیکە، کە (سەعید بەگ)ی خوالێخۆشبووی باوکی کۆی کردبۆوە، ژوورێکیش بۆ (سەید عەلی ئەفەندی) و میوانەکان و سەرۆک هۆزەکان تەرخان کرابوو. (سەید عەلی) لە ڕواندز زۆر چاودێریی دەکردم و دوو یان سێ ژاندرمەش بەدوامدا دەڕۆیشتن.



ئیسماعیل بەگ

(ئیسماعیل بەگ) گەنجێکە تەمەنی ۱۹ یان ۲۰ ساڵە، جلوبەرگی ئەورووپی دەپۆشێ، فێسێکی سووری تاریک لەسەر دەنێ، ڕووخساری جوانە، جەستەی هەندێک لاوازە، ڕەزای سووکە و لەشی قورس نییە، خودا هەستێکی ناسک و ڕەوشتێکی جوانی پێ بەخشیوە، مرۆڤێکی ئاڵۆز نییە و خانەخوێیەکی بەخشندەیە، زۆر بایەخت پێ دەدا و دەچێتە ناو دڵەوە. هەردەم هەستیارە و دەیەوێ کارەکان بەڕاستی ئەنجام بدا، ئەوەی نیگەرانیی دەکا کوشتنی باوکی (سەعید ئاغا)یە. ئەویش هەردەم بیر لەو ڕۆژە دەکاتەوە و هەوڵ دەدا بۆ

لادانی ناحەزانی، دایکی دڵی پێوەیە و بەردەوام چاودێریی دەکا. کاتێ کە خواردنی نیوەڕۆ ئامادە دەکرا، (باویل ئاغا) هات و داوای لێبووردنی لێ کردم لە (نووری)، منیش پێم ڕاگەیاند کە نووری دەبێ خۆی بێتە ژێر دەسەڵاتمان و داوای لێبووردن بکا، ئەو کاتە مەرجی سانای بۆ دادەنێم.

لە دوای نیوەڕۆ پێشوازیم لە هەموو کەسایەتی و ئەو سەرکردانەی، کە لە ڕواندز بوون کرد، لەوانە (شێخ محەمەد ئاغا) سەرۆک هۆزی باڵەک، ئەو شێوەی بە بابەکر ئاغای پشدەری دەچێ، تەمەنی ٥٠ ساڵە و بەژنی مامناوەندییە، لەشی قورسە و دەموچاوی خڕە، کەپووی نەختێک چەماوەیە، هەندێک کووڕە، دەنگی قەبەیە، لە قسەکردن زمانی ڕەوانە، پیاوێکی سەرڕاستە و هەردەم ئاگادارە، لەبەر ئەوە بووە سەرۆک هۆز، هەرچەندە دوو برای لە خۆی گەورەتری هەیە، ئەو ماوەیە کردبوومە ڕاوێژکاری خۆم، بە تایبەتی لەو شەش ڕۆژە نائاساییەی کە لە ڕواندز بووم. مرۆڤێکی دەستپاکە و بەسۆز و میهرەبانی ناسراوە. لە ڕۆژانی سەخت بە تایبەتی کە هەواڵی شۆڕشی شێخ مەحموود بڵاو بۆوە، ئەو تاکە سەرکردە بوو، کە پشتگیریی لە یاریدەدەرەکانی حاکمی سیاسیی پێشووی ڕواندز کردووە. لە گوندی (ولاش) نیشتەجێیە، سەبارەت بەو پشتگیرییە دڵسۆزییەی بۆ حکوومەت (محەمەد ئاغا) گوتی: کاتێ خۆی باوکم کە تەمەنی گەیشتبووە ١١٠ ساڵ ئەو ئامۆژگاری ئێمە کردووە، کە لە هەموو بارودۆخێک پشتگیریی حکوومەت بکەین.

ئەو وەک (ساڵح بەگ)ی خۆرانی ئاماژەی بە (یووسف بەگ) کردووە، کە سەرچاوەی هەموو ئاژاوەیەکە و بەلادانی ئەو بارودۆخە کە هێور دەبێتەوە.

پاش ئەو حاجی (نەورەس ئەفەندی) و (کەریم بەگ) هاتن، حاجی نەورەس کە پێشتر باسمان کرد باپیری ئەو بەرەگەز (فارس)ە، لەلای پاشای کۆرە چەکی دروست کردووە، ئەو یەک دوو تۆپە کۆنەی کە لە نزیک شارەوانی دانراون بەڵگەیەکە بۆ ئەو کەسایەتییەکانی شار بە کەسێکی غەوارەی دادەنێن، بەڵام لەم دواییە پارێزگاری لە پلە و پایەی خۆی کردووە. (یووسف بەگ) کە زاوایەتی بە تۆقێن و زمانی تیژ و پیسی پشتگیریی لێ دەکا، چونکە خزمەتی مەرامەکانی دەکا، لە ئاژاوەکانی تشرینی دووەم سەرسامی دایگرت، کە دڵسۆزی خۆی بۆ کێ دەربڕێ، (یووسف بەگ) یان (حکوومەت)، قسە زۆر دەکا و هەڵچوونیشی پێوە دیارە، داوای لێ کردم بەوە ڕازی بم، کە دەست لە کارەکەی بکێشێتەوە، بەڵام من پەلەم نەکرد.

دوای ئەوان (محەمەد عەلی ئاغا) و برایەکەی (خەلیفە ڕەشید) هاتن، یەکەمیان پیاوێکە ساکار و تەمەنی مامناوەندییە، هەندێ گوند و (٢٠) چەکداری هەیە. دواتر (قازی) و پیاوە ئایینییەکان هاتن، لە ناویان (مەلا سەعید ئەفەندی)، کە



**محەمەد عەلی ئاغا**

پیاوێکی خواپەرستی ساکارە، هیچ خواستێکی نییە، لە هەموو بارودۆخێک بەسەختەکانەوە ئەو پشتگیریی حکوومەتی کردووە. دوای هەمووان (یووسف بەگ) هات ئەو لە شەش برایەکەی گەورەترە، هەندێک گوندیان لەلایەکەی دیکەی نزیک ڕواندز هەیە. (ڕائید نویل) بە لێپرسراوی ئەو ناوچەیەی دانا، لەبەر ئەوە دەسەڵاتی پەیداکرد، کەسایەتیی بەهێزە و زمان لووس و بەفریوە، لەبەر ئەوە توانی بەترس و تۆقێن سۆزی خەڵک بۆ خۆی ڕابکێشێ، دامەزراندنی (حاجی نەورەس)ی خەزووری بە فەرمانڕەوای شارۆچکە، دەسەڵاتی زیاتر کرد، زۆرداری ئەو سنووری نەبوو، بۆ بەهێزکردنی پێگەی خۆی تۆوی دووبەرەکی لە نێوان سەرکردە و ئاغاکانی دیکە چاند، ڕەوشتی لە خراپەی بەناوبانگە، زۆرجار دەچێتە ماڵی

هەژارەکـان و ژنی یەکـێکیـان لە باوەشی مێردەکەی هەڵدەگرێ. لەبەر ئەوە خەڵک بێزیان لێ دەبێتەوە، بەڵام کەس ئەو زاتەی نییە، کە بەرامبەری راوەستێ، لە دابەزینی ڕێسا و یاسای حکوومەت بیری لەوە دەکردەوە، کە فەرمانڕەوایی سەربەخۆی هەبێ. هەردەم ئەو لەگەڵ یاخیبووەکان بووە. پێش چەند رۆژێک لە گەیشتنم هاوپەیمانی لەگەڵ (کەریم بەگ) و (میر محەمەد ئەمین بەگ) بەست. بۆ رۆژی دوایی بە پاشماوەی شارۆچکەکە گوزەرم کرد. دوو خەرەند، کە چەند سەد پێیەک قووڵن لەگەڵ هەردوو لای جووتن. دیمەنەکانی دەوروپشتی شارەکە زۆر قەشەنگە و دەچێتە ناو دڵان. لە باکوور (دۆڵی ئاکۆیان) بە لووتکە چیای پڕ بەفر کۆتایی پێ دێت، سنووری لای راستی شارەکە چیای (کۆرەکە)، هەر لە باکوور چیای (هەندرێن)ە، کە بەرزاییەکەی ۸۰۰۰ پێ زیاترە و بەفر چەند مانگێک لەسەری دەمێنێتەوە، چیای (زۆزک) کە بەسەر شارۆچکەکەدا دەنوارێ ئەویش ۸۰۰۰ پێ بەرزە.

بەشی سەرەوەی شارۆچکەکەماڵی (ئیسماعیل بەگ)ی لێیە تێک نەچووە، ئەو چەند خانووەی هەبوو هەمووی پێویستیی بەنۆژەنکردنەوە هەبوو، کەمێکیش دووکان هەبوو، بەرەو خوارەوە چووین بە فەرمانگەی برووسکە و گەیاندن تێپەڕین، بەچایخانەیەکدا رۆیشتین، پیاوێکی تەڵخ کە چاکێتێکی لەبەر دابوو سەرپەرشتیی دەکرد، تا ئێستا چاوی بەد وەک چاوەکانی ئەوم نەدیوە، بە (مستەفا ڕیوی) ناسراوە. لە خوارەوە نزیک پردەکەی خەرەند خانووی (محەمەد عەلی ئاغا) مابوو، چونکە رووسەکان بۆ چێشتخانە بەکاریان دەهێنا. زۆر کەس هاتبوون داواکاری جیاجیان پێشکەش دەکرد.

ئەو رۆژە تاکە میوانم (میر محەمەد ئەمین بەگ)ی (دەرگەڵە) بوو، ڕێگرێکی بەرواڵەت زۆر جوان بوو، بەژنی کورت بوو، ریشێکی کورتی رەشی هەبوو، پیاوێکی بەد نییە، بەمرۆڤێکی دڕ دێتە پێش چاو، بەڵام لە ناوەوە هێمنترە.

(حاجی نەورەس) دەستی لە کارەکەی کێشایەوە، لەبەر رەفتاری چەوتی (یووسف بەگ) هیچ کەسێک لە ئاغاکان رازی نەبوون بەوەرگرتنی ئەو پۆستە، دەبووایە یان (یووسف بەگ) بۆ ئەو پۆستە دابنێم یان لێی رزگار بم، رۆژێک لە رواندز کارێکی نارەوای کرد و ئاژاوەیەکی زۆری نایەوە، لەبەر ئەوە دەستگیرمان کرد، بەڵام بەرگریی لە خۆی دەکرد، پاسەوانەکان ناچار بوون دەمی ببەستن و لەسەر پشتی ئەسپێک بیبەستنەوە، بۆ ئەوەی بۆ هەولێری ببەن، بەڵام لەبەر توندی بەستنی دەمی لە دووریی نیو میل لە رواندز بە خنکان گیانی لەدەست دا. ئەو رۆژە لە رواندز بوو بە جەژن و ئاهەنگ گێردرا.

برایەکانی (یووسف بەگ) بەنیازی کۆکردنەوەی هێز بوون، بەڵام (حاجی نەورەس) نامەی بۆ ناردن، کە (یووسف بەگ) بێ زیانە و نابێ ئەو کارە بکەن، چونکە ئاکامەکەی خراپتر دەبێ، (رەشید بەگ)ی زربرای (یووسف بەگ) بوو ستەمی زۆر لە دەست دیوە، پیاوێکی لاوازە، بەڵام دڵسۆزە، برایەکانی تری، کە لەدایک و باوکێن: (بەکر بەگ) لاوازە و کەسایەتیی نییە، (بەگۆکم) تا ئێستا نەدیوە، گەنجێکی سەرکێش و بە هەڕەشەیە تۆڵەکردنەوەی برایەکەی مەبەستییەتی.

لە ۱۳ی مانگ (جەمیل ئاغای گەردی) کە لەسەر داوای من لەگەڵ ۱۵ پیاو هاتبوو بۆ بە هاناهاتنمان، ئەو هاوڕێی (باویل ئاغا) بوو، داوای لێ کردم، کە لە (نووری) ببوورم. لە ١٤ی مانگ (نووری) خۆی هاتە لام، بێ چەک بوو، داوای لێ کردم کە دیسان بە ئەفسەری ژاندرمەی دابنێم لە هەولێر. لە ئێوارەی ۱۳ی مانگ چاوم بەسەرکردەکانی (شێروان) و (برادۆست) دەکەوێ، کە هەریەک لە (ئەحمەد ئاغا شێروانی) و (محەمەد سەعید بەگی برادۆست) بوون، ئەوانە نانی ئێوارەیان لای من خوارد، خوانێکی گەورەی شکۆدار لەلایەن (ئیسماعیل بەگ) ئامادە کرابوو بۆ پۆستی فەرمانڕەوای رواندز، داوام لە (شێخ محەمەد ئاغا) کرد، کە رازی بێ بەڵام وەرینەگرت، دواتر بڕیارمان دا (ئیسماعیل بەگ) لەم پۆستە دابمەزرێنین، هەرچەندە تەمەنی گچکە بوو و ئەزموونی لەمبارەیەوە کەم بوو، بەڵام (محەمەد ئاغا) گوتی: بەهیوای ئەوەین بەهۆی ئەو پۆستە ببێتە پیاو، لەبەر یادگاری باوکی لە ناو هۆزەکان و دەوڵەمەندی و لێبووردەیی بۆ ئەم پۆستە زۆر شیاوە. بۆ ئەم مەبەستە وەک کۆنگرەیەک



نووری باویل ئاغا ساڵی ١٩٤٦

کۆبوونەوەیەکم بە کەسایەتییەکانی شار کرد، هەردوو سەرۆکی (شێروان) و (برادۆست) ئامادە بوون. (محەمەد ئاغا) و (ئەحمەد ئاغا) داوایان لە ئامادەبووان کرد، کە پشتگیری لە (ئیسماعیل بەگ) بکەن، بۆ ئەوەی رواندز ئاوەدان بێتەوە و بەرژەوەندیی تاکە کەسی و تۆڵەسەندنەوەیان لە پێش چاو نەبێ. (قورئان) هات و هەمووی سوێندیان بۆ لایەنگیری (ئیسماعیل بەگ) خوارد، تەنیا (باویل ئاغا) نەبێ، کە لە کاتی سوێند خواردنەکە گوتی: ((من پەیوەندیم بە ئیسماعیل بەگ بەندە بەو دادپەروەرییەی، کە هەردوو لامان پێی پابەند دەبین)).

دواتر هەندێ رێنومایی ئیدارییم تێ گەیاند و نووسەرێکی خاوەن ئەزموونیشم بۆ دانا، بۆ ئەوەی یارمەتیی بدا، منیش لە ١٨ی کانوونی یەکەم گەیشتمەوە هەولێر.

### سێ مانگی خۆشگوزەرانی

کاتێ کە گەیشتمەوە هەولێر (نەقیب برادشۆ) بۆ خانووە تازەکەی گواستبۆوە، کە (رائید موری) نەخشەی بۆ دانابوو، وا رێککەوت جەژنی سەری ساڵ بوو لە کاتژمێر ٩ی بەیانی کۆمەڵێک لە دیانەکانی عەنکاوە، کە بریتی بوون لە ١٢ قەشە و ریشسپی لە جیاتی هەموو دانیشتوانی عەنکاوە بۆ پیرۆزبایی هاتبوون، دواتر سەرۆکی شارەوانی بەیاوەری ٢٠ تا ٣٠ فەرمانبەری خۆجێیی، خوانێکی ژەمی نیوەڕۆمان بۆ فەرمانبەرە بچووکەکان ساز دا، دواتر چووینە فڕۆکەخانە بۆ ئامادەبوون لەو یارییانەی کە (عەقید بی- ام. کارول) و ئەفسەرانی یەکەی (٨٧)ی پەنجاب رێکیان خستبوو، هەندێ ژاندرمە و پۆلیسی لای خۆم بەشدارییان تێدا کرد، هەموو کەسایەتییەکان و زۆربەی دانیشتوان هاتبوون بۆ سەیرکردن. کە یارییەکان کۆتایی هات، سەرکردە و کەسایەتییەکان بۆ ئەوە هەوڵیان دا، کە بچن سەردانی خانووە تازەکەمان بکەن (٢)، پاش خواردنەوەی چایە و قاوە رێگایان پێ درا کە بەناویدا بگەرێن. هەر بەم بۆنەیەوە پێشبڕکێی یاریی (جۆکان) کرا و (مشیر ئاغای ئیبراهیمی ئاغا) بەشداریی تێدا کرد. لە هەفتەی دوایی هەموو کەسایەتییەکانم بۆ خوانی نیوەڕۆ بانگ کرد، ئەوانیش وەڵامی بەخشندەیی منیان داوە و لە ماڵەوە داوەتیان کردم.

لە سەرەتای کانوونی دووەم سەردانی یەکەمم بۆ (شێخ مستەفا ئەفەندی) کرد، ئەو لەو خانەقایەدایە، کە بریتییە لە مزگەوت و شوێنی خواپەرستی، کەوتۆتە کۆتایی ئەوپەڕی لای رۆژهەڵاتی شار. ئەو پیاوە رەنگێکی زەرد هەڵگەراوی هەیە لەگەڵ ریشێکی چوار گۆشەی رەش و دوو چاوی نزمی قووڵ.

بەهێزترین مرۆڤی لە خواترس و میهرەبانە، کە چاوم پێ کەوتبێ. رووخساری سۆزگەریی پێوە دیارە، ئەو کاتێکی زۆر بەنوێژکردن دەباتە سەر. لە پلە و پایە دوای (مەلا فەندی) دێت، ئەمەش بەهۆی دوورەپەرێزی خۆیەتی لەو ژیانە، بەڵام ناوبانگی پیرۆزی لەو زیاترە، بوو بە هاورێیەکی زۆر گرنگ بۆ من. لەبەرئەوەی لە کۆبوونەوەکانی پیاوە ناسراوەکانی شار دڵتەنگ دەبێ، بۆیە لە ماڵەوە سەردانی تایبەتیم دەکا.

لە ٧ی کانوونی دووەم (نەقیب لیتلدیل) گەڕاوە هەولێر، پاش ئەوەی بەفرۆکە (بجێل)ی لە ناوچەی (ئاکرێ) بۆردومان کرد، (شێخ عوبەیدوڵلا) بریندار بوو و میوانێکی بەناوی (عەزیز هوودی)، کە سەرکردەیەکی هۆزی خەیلانی بوو لەگەڵ دوو خزمانی کوژران، لەبەر ئەوە (سوورچی) ئامادەباشی دا پیاوەکانی. (شێخ عوبەیدوڵلا) بەم دواییە پێشوازیی لە (فارس ئاغا)ی زێباری و یەکێک لە بکوژەکانی (مستەر بیل) و (نەقیب سکوت) کردبوو، لەبەر ئەو رەفتارانەی جێگای دڵنیایی ئێمە نەبوو. لەبەر ئەوە داوام لە بەغدا کرد، کە هێزێکی

گورزوەشێنی سەربازی لە هەولێر پێک بهێنین، کە ژمارەکەی لە (٢٠٠) کەس کەمتر نەبێ، پێشنیازەکە پەسند کرا و کارەکە بە (نەقیب لیتلدیل) سپێردرا.

مانگی (شوبات) زۆر سارد بوو، بە تایبەتی لە رۆژی پێنجەم و بۆ چەند رۆژێک بەفر باری و برەکەی گەیشتە (٣) گرێ و زەویی هەموو داپۆشی، لە (١٣)ی مانگ بایەکی ساردی بەهێزی هەڵکرد، لەبەر ئەوە ئەو هێرشەی نیاز وابوو ئەنجامی بدەین دواخرا تا کۆتایی هاوین.

لە سەرەتای (شوبات) سەردانی گوندی (لهێبان)م لە کەندێناوە کرد، بۆ یەکەم جار چاوم بە (خورشید ئاغا)، برای (ئیبراهیم ئاغا) کەوت، رووخساری بە (ئیبراهیم ئاغا) دەچوو، زەردەخەنەکەی لەو شەیداتر بوو، لەو لاوازترە و دەموچاوێکی درێژتر و ریشێکی مامناوەندیی ماش و برنجی هەیە، حەز ناکا بۆیاغی بکا، لە برایەکەی رەقترە، برایەکەی سیاسی و ئەویش جەنگاوەرە و مرۆڤێکی بەهێز و توندە، لە بەرگریی رەقە، وەرەی بەرامبەر دوژمنانی دانابەزێ، لەبەر ئەوە بۆ شەڕ سەرکردایەتیی هێزی لقی بایزی پێ سپێردراوە. (ئیبراهیم ئاغا) زیاتر لەو دیبلۆماسیترە. (خورشید ئاغا) بۆ برایەکەی دڵسۆز و لایەنگیرە. بەهەردوو برا باشترین کەسن بۆ چارەنووسی هۆزەکە، بەڵام (خورشید ئاغا) بیرکردنەوەی نییە، رق و کینەی هەیە بەرامبەر بە (ئەحمەد پاشا) و (حاجی پیرداود)، کە هەردووکیان رکابەری ناو بنەماڵەکەن، دڵێکی باشی هەیە و پێنج کوری هەیە. یەکێکیان بەناوی (عەلی ئاغا) بە (عەلۆ) ناسراوە، تەمەنی نزیکەی (٣٠) ساڵە، لە سەردەمی عوسمانییەکان بە مرۆڤێکی نەگبەت ناسرابوو، بەڵام ئێستا ریگای ژیری گرتۆتە بەر، زوو هەڵدەچێ و بەدڵتەنگی دەردەکەوێ، لە هەموو ئاغا گەنجەکانی دزەیی باشترە.

لە (لهێبان) بەرەو (مەخموور) رۆیشتم، شەوێک لای (ئیبراهیم ئاغا) بووم، لەو کاتە کوری (١٧)یان بووبوو، کورە تاقانەکەی، کە لە ژیاندا مابوو (مشیر) لە تەمەنی (٢٠) ساڵیدا بوو و درێژبییەکەی شەش پێ دەبوو. لە ٢٣ی شوبات کاتژمێر ١٢.٣٠ شەو لە پەنجەرەوە تەقەیان بۆ ژوورەکەم کرد، بەڵام بەرنەکەوتم.

لە ٢٦ی شوبات بەرەو رواندز بەرێ کەوتم و لە ٢٩ی مانگ بەیاوەریی (ئیسماعیل بەگ) و (محەمەد عەلی ئاغا) بۆ دەشتی (دیانا) و گوندی (باڵەکیان) چووین، رووبەری ئەو دەشتە (٤ط٦) میلە، فرۆکەخانە لەو شوێنەیە و فرۆکەیەکی تێکشکای لێ بوو، سەرێکی (باپشتیان)مان دا بۆ لای (خورشید بەگ)ی ناحەزی (یووسف بەگ).

(ئیسماعیل بەگ) خوانێکی ئێوارەی ئامادە کردبوو، هەموو کەسایەتییەکانی بانگ کردبوو، پاش نانخواردن (فاتمەخان) گەیشتە لامان و داوای چاوپێکەوتنی لەگەڵ کردم، هاوسەرەکەی پێش هاتنی هێزەکانی بەریتانیا کۆچی دوایی کردبوو. سامانێکی زۆری لە هەردوو گوندی (ئاکۆیان) و (فەقێیان) بۆ جێ هێشتبوو، کە دوو یان سێ میل لە رواندز دوورن. (رائید نویل) بە فەرمانڕەوای ئەو دۆڵەی دانابوو، بەڵام هەندێ پیاوانی ئەو بەوە نارازین کە ژنێک سەرکردەیان بێ، دەڵێن بۆ ئابروومان باش نییە، لەبەر ئەوە ناکۆکی و ئاژاوە پەیدا بوو، (یاریدەدەری حاکمی سیاسی) ناچار بوو لە کارەکەی لای بدا، (فاتمە خان) دەربارەی مافی ژنان خاوەن بیروڕای پێشکەوتووە، لە پایزی رابردوو کچەکەی بەشوو دا بۆ (شێخ مازۆ سوورچی)، بەڵام برایەکەی (تەقیدین بەگ)، کە خۆی بەخاوەن بڕیار دادەنا رازی نەبوو، لەبەر ئەوە توندوتیژی بەکار هێنا، ئێمەش ناچار بووین بۆ ماوەیەک زیندانیی بکەین، لەبەر ئەوە (شێخ عوبەیدوڵلا) مامی (شێخ مازۆ) بوو، کە نەیاری ئێمە بوون لەم بارەیەوە هۆشداریم دایە. (فاتمە خان) جلوبەرگی شینی لەبەردا بوو، رووپۆشێکی فراوان دەموچاوی داپۆشیبوو، کە بەدەگمەن دەمتوانی ببینم، دەمێکی فراوان بەبۆنێکی ناخۆش دەردەکەوت، زۆر نائارام بوو، (ئیسماعیل بەگ) ناوبژیوانمان بوو. لە رۆژی دووەمی مانگ بۆ هەولێر گەڕاینەوە.

### سەردانی رواندز و سنووری فارسی

کاپتن های باسی نائارامیی ناوچەی سوورچی، ئەوبەری زێی لە ناوچەی قەندیل دەکا، کە دژی

حکوومەت بوون، بەلام سوورچییەکانی دەشتی حەریر، کە (عەلی بەگ) سەرکردەیانە ڕێزی زۆری های گرتبوو.

های دەڵێ: بەگوندی (باردین)دا ڕۆیشتین کە خاوەنی (شەوکەت ئەفەندی)یە خەڵکی (مووسڵە) لە رواندز لەبەر رەفتاری خراپی لێیان داوە. ئێستا لە گوندەکەی خۆی نیشتەجێیە. دەربارەی (سوورچی) زانیاریی باشی پێ دام. لە گوندی (ساویر) کە حەوت ماڵە دارێکی چناری رووتمان دیت گەلای پێوە نەبوو، تیرەی قەدەکەی نزیکەی ١٠ پێیە، ناوی رەش و کلۆر و رزیبوو، کانییەک لە ژێر رەگەکانی بەگوڕ دەهاتە دەر، خەڵکەکەی ئەو ناوە دەڵێن چنار (١٠٠٠) ساڵ دەژی، کوێخوای گوندەکە ناوی (عەلی بەگ)ە برای (هارس ئاغا)ی بیاوییە کە پیاوێکی بە رەوشتی خۆشەویستە، لەگەڵمان بەشداریی نانخواردنی کرد، کە بریتی بوو لە: کەرە و نانی دروستکراو لە ئاردی بەڕوو و هەندێ پارچە گۆشتی سوورکراوە و هەندێ بەڕوو و قاپێک ماستاو.

لە نزیک رواندز (ئیسماعیل بەگ) و (شێخ محەمەد ئاغا) لە چاوەڕوانیماندا بوون. لە ٢ی ئایار باسی درێژترین گەشتی دەکا لە کوردستاندا، کە کردوویەتی: لە پێشا باسی دژایەتیی هۆزی (هەرووتی) بەرامبەر حکوومەت دەکا. دواتر دەچێتە (دەرگەڵە) و (وەرتێ)، دەڵێ: دەرگەڵە کاتی خۆی گوندێکی فراوان بوو، لەلایەن رووسەکانەوە خاپوور کراوە و تەنیا (٢٠) ماڵ ماوەتەوە. لەو گوندە (میر محەمەدئەمین بەگ) و کوڕی برای (میرۆ)، کە لاوێکی تا بڵێی شۆخ و ئێسک سووکە، میواندارییەکی باشی کردین.

هەر لەوێ (شێخ محەمەد ئاغا) و برا گەورەکەی (کاکەمین)، کە پیاوێکی نەگریس و رەوشت خراپە لە چاوەڕوانیماندا بوون.

بۆ رۆژی دواتر بۆ گوندی (شێخ محەمەد ئاغا) (ولاش) چووین، کوڕەکانی خزمەتی باشیان کردین، بەتایبەتی (سەعید) (نووسراوە- سوید- و-)، کە لاوێکی تەمەن ١١ ساڵانە لە هەردوو برایەکەی تری رووخۆشتر و بیرتیژتر بوو. کە خواردنی ئێوارە هات تووشی شۆک بووم، هەر لەو کاتەدا قسەی هەندێ لە ئاغاکانی دزەییم بیر هاتەوە، کە دەڵێن: (میر محەمەدئەمین بەگ) لە (محەمەد ئاغا) پیاوترە. لە ناو خواردنەکە تەنیا دومەڵانەکە نەبێ، کە بە دڵمان بوو کە لەو ناوە لە بەهاراندا پەیدا دەبێ. (سەعید) دوو بێچووی ورچی بەو دواییە لە گردەکان دۆزیبۆوە، زۆر بەبێ بەزەیی دەیویست بە شەڕیان بدات. (شێخ محەمەد) بەڵێنی دا، کە بەدیاری بۆ هەولێر بۆ منی بنێرێ، بەلام پاش چەند رۆژێکی کەم تۆپین. باسی چیای هەڵگوردی کرد کە لە نزیکمان بوو گوتی: پێش شەڕ هیندییەکان لە نزیک لووتکەکەی دەگەڕان بۆ کۆکردنەوەی گژوگیای نامۆ. دواتر باسی کرمی ناو بەفر کرا و گوتیان: درێژی یەک پێیە، قەڵەوە و رەنگی سپییە و دەم و کەپوو و چاو و شتی سروشتی تری نییە، تەنیا کلکێکی براوە نەبێ، ئەگەر بۆ خواردوە بیهێنی دەتۆپی، ئەگەر لە ناو ئاو کرا، ئەوا ئاوی زۆر گەرم سارد دەکا. لە (ولاش) بەکر بەگم دیت برای (یووسف بەگ) و (مەلا یووسف ئاغا)ی هۆزی (باڵەکیان)، ئەوانە ملکەچیی خۆیان بۆ من نیشان دا و پاساویان بۆم هێنایەوە و منیش رازی بووم. بەلام نەیانتوانی (بەگۆک) لەگەڵ خۆیان بهێنن.

لە ٧ی ئایار بۆ (رایات) و سنووری فارس چووین، لە رێگا بە نشێوێکدا رۆیشتین لە ناو خەڵک بە (هێسترکوژ) ناسراوە. بەگوندی (ناوپردان) رۆیشتین و (عەلی بەگ)ی رایات لە دەروازەی ئەو دۆڵە پێشوازیی لێ کردین و پێش نانخواردن (رێواس)مان خوارد.

لەگەڵ (ئیسماعیل بەگ) بەڕێ کەوتین، شەش میلیمان مابوو بگەینە سنوور بە مەزاری (شێخی باڵەکیان)دا رۆیشتین، کە پیاوچاکێکی کوردە.

(های) باسی ناوچەی سنووری ئێران دەکا و زۆر پێی سەرسام بووە. (های) دەڵێ: (دار ئەلسەلام) (نووسراوە دار الامان-و-) کە هەردوو شێخ (عوبەیدوڵلا) و (عەلائەدین)، کە ئامۆزای یەکترن لێرە نیشتەجێن، پێش سێ یان چوار ساڵ باوکیان کۆچی دوایی کردووە و پێش ٥٠ ساڵ لە ناوچەی (لاجان) هاتوون، لەلای (مامش) و هۆزە کوردییەکانی تر زۆر پیرۆزن. لەو گوندە پەناگەیەکیان بۆ بەهاناهاتنی

رێبوار و هەژارەکان داناوە، ئەوانەی لە دەربەندەکە تووشی سەرما و سۆڵە دەبن، چونکە ئەو ناوە لە نێوان کانوونی دووەم و ئادار هەمووی بە بەفر دادەپۆشرێ، بەم کارەیان زیاتر ناوبانگی پیرۆزیان بلاو بۆوە. لە ساڵی ١٩١٦ کە رووسەکان هاتن، ئەوان رایان کرد و هەموو ماڵ و سامانیان خاپوور کرا، ئێستا منداڵەکانیان هاتوونەوە و بەهەمان کاری باوکیان خەریکن.

(شێخ محەمەد ئاغا) تکای لێ کردم، کە بە یاوەریی (ئیسماعیل بەگ) و (محەمەد عەلی ئاغا) بچین بۆ داخوازی خوشکی (شێخ عوبەیدوڵلا) بۆ برایەکەی، کە ئەمە بۆ من سەربڵندییەکی زۆر گەورە و رێزلێنانێکە بۆ من. کارەکە پێکهات و ئێمەش گەڕاینەوە لای (محەمەد ئاغا) لە (رایات) دواتر لەگەڵ ئەوەی کە باوباران بوو سەردانێکی (ولاش)مان کرد بۆ لای (کاکەمین)ی برای- (محەمەد ئاغا) کە مرۆڤێکی ناتەواوە و دەموچاوی بە (یوسف بەگ) دەچی.

لە ٨ی مانگ گەڕاینەوە رواندز و لەگەڵ (محەمەد عەلی ئاغا) چایەمان لە (جوندیان) خواردەوە، کە ناوچەکە موڵک و ماڵی ئەوە و هاوینان لێرە نیشتەجێ دەبن. ئەو سەربازانەی کە لێرەدن لە تورکمانەکانی هەولێر و کەرکووک و کوردەکانی دەشتی هەولێر و کۆیە و کەمێک لە دیانەکانی عەنکاوە پێک هاتوون و هەموویان بەختیارن. لە رواندز پێشوازیم لە (فاتمە خان) و (حەوێز ئاغای هرووری) و نوێنەری (محەمەد سەعید بەگ)، کە پێی راگەیاندم لەبەر نەخۆشی نەهاتووە و ئەگەر داواشی بکەم بە نەخۆشی و بە تەختی نووستنەوە دێت، لەگەڵ هەندێ لە برادەرە دێرینەکانم لە هۆزی (شێروان) کرد. لە گەڕانەوەماندا بە (بالیسان) بەماڵی (عەزیز بەگ) تێپەڕین، کە مامی (میرانی قادر بەگ)ی شەقلاوەیە. دواتر دەشتی بێتوێنمان بڕی و بە (چناروک)دا رۆیشتین بۆ (کۆیە) لای (نەقیب برادشۆ)، بۆ بەیانیی رۆژی دووەم بۆ هەولێر زوو بەڕێ کەوتین. کە نزیک هەولێر بووینەوە شتێکی سەیرم دیت، دانیشتوانی هەموویان رەشماڵیان لە دەرەوەی شار هەڵدابوو، دەوڵەمەندەکان خێوەتی باشتریان هەڵدابوو، چونکە بوومەلەرزە لە هەولێر رووی دابوو، من پێشتر شتێکی کەمم بە تەلەفۆن بیستبوو.

لە ٨/٥/ ١٩٢٠ لە سەرەتا سووک بووە دوای چارەگێک بەهێزتر بووە، زیانی کەم بووە، بەلام خەڵکەکە ترسا بوون. لە ناو خەڵک دەنگۆی ئەوە هەبوو گوایە کابرایەکی شێت خەونی دیوە، کە هەموو جیهان کاول دەبێ.

لە ١٢ و ١٣ی مانگ بوومەلەرزەیەکی بەهێزتر رووی دا ١٠ خانووی تێک دا و زیانی بە خانوویێکی زۆر گەیاند و دوو پیاو مردن و زۆر کەسی تریش برینداربوون، خەڵکەکە لە دەرەوەی شار چەند شەو و رۆژێک بەنوێژ و پاڕانەوە لە خودا دەپاڕانەوە.

## کێشەی نووری و دەستگیرکردنی

کاتێ لە رواندز گەڕامەوە هەولێر، (نووری باویل ئاغا) لەلایەن (نەقیب لیتلدیل) دەستگیر کرا، (حاکمی گشتی شاهانە) بەم بۆنەیەوە برووسکەی پیرۆزبایی نارد. تەقینەوەیەک لە (تەلەعفەر) رووی دا و کاردانەوەی خراپی لە هەولێر هەبوو، بە تایبەتی لەسەر رەوشت نزمەکان و هاموشۆکەری چایخانەکان.

دواتر لە قرچەی گەرمای حوزەیران و تەمووز سەردانی زیاتر لە (٧٠) گوندم کرد، بەمەبەستی هەڵسەنگاندنی داهاتی گەنم و جۆ. کە رەمەزان داهات بەو دیاردەیە سەرسام بووم، کە خەڵکەکە ئێواران رۆژ و بەجگەرەکێشان دەشکێنن.

ئەو ماوەیە سەردانەکانم زۆربەی لە ناوچەی (دزەیی) بوو، زانیاریی باشم دەربارەی ئاغاکان پەیدا کرد، لەگەڵ گەنج و پیر و گچکە و گەورە تێکەڵ بووم. ئەوەم بۆ دەرکەوت کە ئەوانە باشترن لە سەرۆکەکانی ناوچە بەرزاییەکان، کە دڵیان رەقە و بەسروشت وشکن. ئێستا هەموو خزمەکانیان دەناسم و ئاگاداری ناکۆکییە بچووکەکانیان و ئاوات و خواستەکانیانم، هەست دەکەم کە من یەکێکم لەو هۆزە. کوردەکان زۆرجار دەربارەی ئینگلتەرە و خزمەکانم و ژنهێنان و کشتوکاڵ لەو وڵاتە پرسیاریان لێ دەکردم.

زۆرجار لەگەڵ (نەقیب ولیمسون) پزیشکی گشتی لە هەولێر سەردانی (ئیبراهیم ئاغا)مان لە (مەخموور) دەکرد، جارێک کە سەرەتای نیسان بوو نەخۆش کەوت، کاتێ بەیەکەوە لە

بەغدا گەڕاینەوە برینێک لە سییەکانی پەیدا بوو، هەوڵ درا بۆ چاکبوونەوەی، بەڵام بەشێوەی کاتی بوو، لە ١٥ی حوزەیران کە تەندروستیی زۆر خراپ بوو سەردانیم کرد، خێوەتێکیان لە پانتایی ماڵەکەی بۆ دامەزراندبوو بۆ مانەوەی بەشەو، بەرۆژیش لە ژوورێکی بچووکدا کە پڕ بوو لە خشڵ و ئالتوونی بەنرخ و بە نەخش رازابۆوە. هەر جارەی سەردانیم کردبێ دەستە لاوازەکەی بۆ درێژ دەکردم و دەستی بە توندی دەگرتم، چاوەکانی بە قووڵاییدا چووبوو و دەموچاوی گرژ ببۆوە. کاتێ کە دەچووم ئەگەر توانیبای دابنیشێ و پێشوازیم لێ بکا ئەوا (خورشید ئاغا) و یەکێ لە خزمانی یارمەتییان دەدا. منیش لە تەنیشتی لەسەر بالیفتێک دادەنیشتم، ئەگەر لێی بێزار بووم، یان خۆم وا نیشان دا لە شوێنەکەم ئاسوودە نیم، قسەی دەبڕیم و بە زەردەخەنەیەکی شیرین و بەدەنگێکی هێمن دەیگوت: (ئیسراحەت-ئیسراحەت)، هەموو شتێکم لە بیر بچێ ئەو چاوپێکەوتنانەم لە بیر ناچێ، کە لەگەڵ ئەو بەساڵاچووەدا ئەنجام داوە، زۆریشم خۆش دەوێ، ئەو زۆر حەزی دەکرد دەستم بگوشێ و قسەم لەگەڵ بکا، من وای بۆ دەچم کە ئەو وای تێگەیشتبوو ئەگەر کەسێک هەبێ رزگاری بکا ئەوا منم، حەزی دەکرد کە زوو سەردانی بکەم، ئەگەر لە هەفتەیەک زیاتر نەچووبامە لای ئەوا گلەیی لێ دەکردم.

ئەو جارەی کە ١٥ی حوزەیرانە، بێ هێزی زۆری پێوە دیار بوو، بەئەستەم قسەی بۆ دەکرا، کە چوومە لای فەرمانی دا، کە چایە و قاوەم بۆ بهێنن، دوایی تەنیا من نەبێ بە دانیشتوانی ژوورەکەی راگەیاند، کە بچنە دەرەوە، پاش ئەوەی کە دەستی گوشیم گوتی: ((لەوانەیە چەند رۆژێکی کەم بژیم، دەزانم لەم جیهانە کۆچ دەکەم، هیچ زیندوویێک لە ژیان تا سەر نامێنێ)، ئاه.... چارەنووسم نزیک بوویتەوە (مردن گەشتێکە لە ماڵێکی لەناوچوو بۆ ماڵێکی جێگیر)، لە قسەکان بەردەوام بوو و گوتی: (خورشید ئاغا)ی برام لە شوێنی من دادەنیشێ، یەک تکام لێت هەیە، ئەویش ئەوەیە: لەگەڵ ئەو بە بەزەیی بە، هەروەک لەگەڵ من وا بووی، رەفتاری باشت بۆ من چۆن بوو، بۆ ئەویش بەهەمان شێوە. من بۆ ژیان بە پەرۆشم، ئەگەر لە ژیاندا مام ئەوا شتێکی مەزنت پێشکەش دەکەم، کە هەموو جیهان پێی سەرسام بێ. پێش ئەوەی وەڵامی بدەمەوە دیار بوو بوورابۆوە، منیش زۆر دڵتەنگ بووم و ژوورەکەم جێ هێشت، ئەو شەوە تەندروستیی بەرەو خراپی دەچوو و هاوارێکی زۆر لە ماڵەوەیان بەرز بۆوە. بەیانییەکەی قسەی پێ نەدەکرا، بەڵام من کە چووم بۆ دیدەنی ناسیمییەوە. ئەو لەگەڵ ژیان لە ململانێدا بوو، چەند جارێکی تر سەردانیم کرد، هەندێ جار بەباشی دەمدیت، باسی کێشەی هۆزەکان و بارودۆخی سیاسیمان دەکرد، هەموو جار منی دەگرت و بە ئومێدی مانەوەی ژیان سەیری دەکردم. جارێک باسی راسپاردەیەکم کرد، کە ئەو لە جیاتی نووری بەنامە ناردبووی، هەرچەندە من نامەکەم نەدیبوو، بەڵام لەو بارەیەوە ئەو گوتی: من مەبەستم شتێکی وا نەبوو، بەڵام پێشنیازەکەم ئەوە بوو، کە رێگا بدەی ئەو گەنجە بەرامبەر بەدەستەبەرێک لە هەولێر بمێنێتەوە و سەربەست بێ. های دەڵێ: ئەگەر بە ئامۆژگاری ئەوم بکردبایە زۆر باشتر بوو.هەردەم سێ یان چوار خزم لای ئامادە بوون، بەڵام ئەگەر تەندروستیی زۆر خراپ بایە، ئەوا ٢٠ یان ٣٠ کەس لە ئاغا و کوڕی و برایەکانی و ئامۆزاکانی و رەحمان ئاغا و برا بچووکەکەی (محەمەدئەمین ئاغا)، کە تەمەنی ٣٠ ساڵە و شۆخ و لەش سووک و بەخشندەیە لەلای بوون. لە خزمە دوورەکانی دیارترینیان (حوسێنی مەلا) و (جوکل ئاغا)ن. یەکەمیان مرۆڤێکی شکۆداری گوندنشینە تەمەنی ٦٠ ساڵە، دەموچاوی سوور باوە و هەڵسوکەوتی خۆشە، لە سەردەمی عوسمانییەکاندا رەفتارەکانی نابەجێ بوون، لەگەڵ بارودۆخی پاشەگەردانی بوو، لە ئێستاوە باشترین کەس کە بۆم بەپەرۆش بێ. (جوکل ئاغا) مرۆڤێکی باشە و کەسایەتییەکی بەهێزی نییە و لە کێشەی هۆزەکان رۆڵی نییە. کوڕێکی رووخۆشی بچووکی هەیە، کە تەمەنی ١٠ ساڵ دەبێ و ناوی (ئاغا)یە، ئەو رووناکیی چاوی (ئیبراهیم ئاغا)یە و لای زۆر بەرێزە، رۆژێک کە گەیشتمە مەخموور لام زۆر سەیر بوو، کە بە پارچە هەڵبەستێکی فارسی بەخێرهاتن، کە خۆی دایبابوو

پێشوازیی لێ کردم.
لە ٢٩ی حوزەیران خۆم دادگایی نووریم کرد، تاوانەکەی کە درابوویە پاڵی، وورووژاندن و ئاژاوە و پیلان دانان بوو لە دژی حکوومەت، (ئیسماعیل بەگ) دوو شایەتی ناردبوو، کە یەکێکیان (خورشید بەگ)ی برای (فاتمە خان)، کە یەکێک بوو لەوانەی بەشداریی شۆڕشیان کردبوو، (نووری) بەرگرییەکی باشی لە خۆی کرد و ئەو تاوانانەی کە درابوونە پاڵی، هەمووی ڕەت کردەوە، بە قیتی و بەرێزەوە وەستابوو و چاوەکانی دەبریقانەوە، پێنج ساڵ زیندانیی بەسەر سەپێنرا، وام دانابوو کە بۆ (مووسڵ)ی بنێرم، بەڵام لەو ساتەدا شەیتان فریوی دام، کە بۆ کەرکووکی بنێرم. هەروەک لە ڕواندزەوە چۆن بەنهێنی هێنابوویان ئەوها بە یاوەریی چەند پاسەوانێکی باوەڕپێکراو لەوانە: عەریف (یونس)، کە عەرەبێکی دڵسۆز و ئازا بوو، لەگەڵ شەش سەربازی دیکە کە (سەید عەلی) دایانابوون. لە ٣ مانگ هەواڵم پێ گەیشت، کە بەبێ گرفت گەیشتۆتە کەرکووک، سێ ڕۆژ لە کەرکووک مانەوە و لە کاتی گواستنەوەی لە کەرکووکەوە بۆ سەر هێڵی شەمەندەفەر لە (کەنگربان) بەمەبەستی ناردنی بۆ بەغدا بەیارمەتیی کەسێکی تر توانییان بەرتیل بە دوو ژاندرمە بدەن و (نوری) ڕزگار بکەن و عەریف (یونس) بریندار بکەن و ئەسپەکەی بکوژن.
لە ڕواندز (نەقیب دیکسن) (باویل ئاغا)یان زیندانی کرد، من بە تەلەفۆن ئیسماعیل بەگم ئاگادار کردەوە، کە براکانی (نووری) بگرن و دەستبەریان لێ وەربگرن. لە ٩ی تەمووز هەر چوار برای نووری ویستییان شارۆچکەکە جێ بهێڵن، بەڵام پیاوانی (ئیسماعیل بەگ) بەدوایان کەوتن و تەقەیان لێ کردن، ئەوانیش بەتەقە وەڵامیان دانەوە و ئاکامەکەی کوژرانی دوو برای نووری و ڕاکردنی دووانی دیکە. هەندێک دەڵێن ئەمانە بێ چەک بوون و بەفەرمانی (ئیسماعیل بەگ) کاتێ کە لە ڕووبار پەڕینەوە هەوڵی کوشتنیان دراوە. (نووری) لە ناو خەڵکەکە و هۆزەکان پشتیوانی نەبوو، بەڵام ئەم ڕووداوە سۆزداری و پشتگیریی خەڵک و هۆزەکانی بۆ (ئیسماعیل بەگ) کەم کردەوە، ئەوەی زیاتر خەڵکی نیگەران کرد ئەو دەنگۆیە بوو، کە گوایە پیاوەکانی ماڵی نووریان پشکنیوە و منداڵێکی شیرەخۆرەیان کوشتووە، بەڵام ڕاستییەکەی ئەو منداڵە بە (تا) مردبوو. هەر لەو ڕۆژەی ئەو هەواڵەم پێ گەیشت (باویل ئاغا)م لە بەندیخانە ئازاد کرد و کوژرانی دوو کوڕەکەم پێ ڕاگەیاند. ئەو پیاوە پیرە وەک شێتی لێ هات و زۆر دڵتەنگ بوو و هەڵچوونێکی زۆری پێوە دیار بوو و گوتی: ئەو ڕووداوەم هەمووی پێش کارەساتەکە بەخەون بینی، دەستی کرد بەجنێودان بە (ئیسماعیل بەگ) و داوای لێ کردم، کە تۆڵەی بۆ بکەمەوە، بەدرێژایی چەند ڕۆژێک وەک کەسێکی بێ سەروبەر و سەرسام لە شارۆچکەکە دەسووڕایەوە و خەڵکی دەوەستاند و باسی بەدبەختی خۆی دەکرد. لە ١١ی تەمووز بۆ دووەم جار چوومە کۆیە، (حەمە ئاغا) ئێوارەخوانێکی بۆ من و (نەقیب برادشۆ) و کەسایەتیی شار و فەرمانبەرە گەورەکان لە ژێر دار توویێکی گەورەی نزیک ئامارێکی ئاو ئامادە کردبوو، هەشت کۆمەڵەی گەورە برنج و (٥٠) یان (٦٠) قاپی گچکە لە ناوەڕاست و پێشەوەی خوانەکە دانرابوون، ئەوە جاری دوایی بوو، کە بەشداریی بەخشندەی زۆری ئەوم، سەردەمێکە نەخۆشە، بەڵام ئێستا باشترە، پاش نانخواردن بزەیەکی بەزەییانە لەسەر لێوی بوو و ڕووی لە من بوو. بۆ بەیانی چووم ماڵئاوایی لێ بکەم، لێم پرسی، ئایا لە کۆیە کارەکان بەباشی بەڕێوە دەچی، هیچ تەگەرە و کێشە هەیە؟ بە بزەیەک وەک بزەی منداڵ وەڵامی داوە و گوتی: (هەندێ کار هەیە...)، گوتم: چییە؟ نەیویست ئاشکرای بکا و زەردەخەنە لێی جیا نەدەبۆوە و گوتی: (لە جاری داهاتوو... لە جاری داهاتوو)، ناچار بووم واز لە داواکارییەکەم بهێنم و ماڵئاوایی لێ بکەم، دواتر جارێکی دیکە نەمدیتەوە.
لە یەکی ئاب برووسکەیەکم لە کۆیە لەلایەن (جەمیل ئاغا) پێ گەیشت، داوام لێ دەکا کە بەپەلە پزیشکێکی لە بەغداوە بۆ چارەسەری (حەمە ئاغا) بنێرم، بەڵام بۆ ڕۆژی دواتر کۆچی دوایی کرد و زیانێکی گەورە بوو بۆ ئێمە، چونکە ئەگەر دوو مانگی دیکە بمابایە، ئەوا لە ئاژاوە و ناجێگیری دوور دەکەوتینەوە، کەس

نەبوو شوێنی بگرێتەوە، بەمردنی کۆیەش وەک رواندز کەوتە ژێر دەستی ئاغا پیلانگێڕەکان.

لە ٤ی ئاب هەواڵی کۆچی دوایی (ئیبراهیم ئاغا)مان پێ گەیشت بە مردنی ئەو لەو نەخۆشییە بە ئازارە درێژخایەنەی رزگاری بوو. ئەو (مەخموور)ی دامەزراند و ٣٧ ساڵ سەرۆکی رەسەنی هۆزی گەورەی (دزەیی) بوو، پشتگیریی ئێمەی دەکرد و رێزێکی زۆرمان بۆی هەبوو.

لە ٦ی ئاب لەگەڵ (ئەحمەد ئەفەندی) چووینە پرسەکەی. لەبەردەرگاکە ئاڵای رەش هەڵدرابوو، (خورشید ئاغا) پێشوازیی لێ کردین و بەسەرۆک هۆز دەستنیشان کرا و (مشیر)ی کوڕی ئیبراهیم ئاغا لەبەر تەمەنی کە بچووک بوو بۆ کاروباری ناوماڵ و هاموشۆی هەولێر، لە کاتی شەڕیش وەک سەرکردەیەک دیاری کرا. ئامۆژگاری و پشتگیریم کردن و ستایشی (ئیبراهیم ئاغا)م کرد. بەناوی بنەماڵە (حوسێنی مەلا) سوپاسی کردم. دواتر لە زمانی (خورشید ئاغا) زانیم، کە (ئیبراهیم ئاغا) پێش مردنی منی بەو سپاردووە و هەموو بنەماڵەکەشی ئاگادار کردووەتەوە کە تا ئەو ماوەیەی لە هەولێر دەمێنمەوە بمپارێزن و خزمەتم بکەن، هەروەک من سەرکردەی هۆزەکەیان بم.

### دەستپێکی ئاژاوەکان

لە ٤ی ئاب سوورچیی ئاکرێ بەهۆی (ئەحمەد بەگی زراری) داوای ملکەچییان کرد. دواتر گەشتێکمان لەگەڵ (ملازم بوا) و (ئەحمەد ئەفەندی) و (مستەفا ئاغا) و کانەبی قاوەچی و کێخوا عەبدوڵڵای گراوی و چەند کەسێکی دیکە بۆ رواندز کرد، لە نزیک رواندز (ئیسماعیل بەگ) و (شێخ محەممەد ئاغا) پیاوانی ئیسماعیل بەگ پێشوازییان لێ کردین.

خەڵکەکە بە ئانقەست و سەرسامی سەیریان دەکردین و بەزەییان پێمان دادەهات، وەک ئەوەی کە ئاژاوە و خراپی بارودۆخ نزیک بووبێتەوە، لە شەوی ١١ی مانگ کەسایەتی و سەرۆکەکانی رواندزمان بۆ ئێوارە خوانێک لە سەربانی ماڵی (ئیسماعیل بەگ) بانگ کرد، پێیم راگەیاندن کە نیازمان نییە ئێستا یان لە داهاتوویێکی نزیک رواندز جێ بهێڵین.

بۆ بەیانی کاتژمێر ٣٠.٤ گەڕاینەوە و لە گەڵی عەلی بەگ تووشی کەمینی دوژمن هاتین و کانەبی قاوەچی کوژرا و لە ١٥ی مانگ گەڕامەوە هەولێر. لە هەولێر پروپاگەندە بۆ شۆڕش زۆر بوو. (حاجی رەشید) پۆلێک فەرمانبەری بەدی لە شوێنی فەرمانبەرەکانی من دامەزراند، بەڵام خەڵکەکە تەنانەت بۆ ماوەی یەک هەفتە پەسندیان نەکرد. (عەبدوڵڵا ئاغا)ی بۆ لای خۆی راکێشا و کردیە (دادوەر)، ئەم کارانەی بە پشتیوانیی هۆزەکان ئەنجام دا. هەریەک لە (ئەحمەد پاشا) و (حاجی پیرداود) بە کرێگیراوی ئەو بوون، ئەوانە لای (جەمیل ئاغا) لە (بەحرکە) ئەو جۆرە نەخشە و پیلانەیان دانا، ویستم رای کەسایەتییەکان وەرگرم، لەبەر ئەوە، تەنیا (حاجی رەشید ئاغا) نەبێ، کەسایەتییەکانم بۆ کۆبوونەوەیەک بانگ کردن. (عەلی پاشا) بە قورسی رازی بوو، کە چەند کەسێک دەستگیر بکەم، ئەویش بۆ ئەوەی خۆی وا نیشان بدا، کە رکابەری ئێمە نییە، ئەوانی دیکە ئەو هەستەیان دەرنەبڕی.

(ئەحمەد ئەفەندی) سەرۆکی شارەوانی، وەک نەریتی جارانی لە هەموو مەینەتەکانم راوێژکاری سەرەکیم بوو. لە ١٧ی مانگ بەیەکەوە نانی نیوەڕۆمان خوارد، ئەو لەگەڵ (شێخ مارف)ی خەزووری، گەشتێکیان بۆ (کۆیە) بۆم رێک خست، کە ئەوە بۆ من کارێکی گرنگ بوو.

لە شەوی ١٨ی مانگ لە (هەڵەجە) لای (شێخ مەعرووف) مامەوە، ئەو بۆ من هاورێیەکی خۆبی و نیازپاک بوو، زۆر بە ئاخاوتنە، قۆشمە و گەشبینە، زۆر خواپەرستە، لەم گەشتە کۆمەڵێک لە کوڕەکانی و کوڕە مامەکانی یاوەرم بوون و بۆ رۆژی دواتر بۆ کۆیە بەرێ کەوتین، لە رێگا لاماندا بۆ لای (کەریم ئاغا) و نانی نیوەڕۆمان لەلای ئەو لە (گۆمەشین) خوارد، ئەو خەریکی کۆکردنەوەی باج بوو، پێی راگەیاندین کە یاسا و رێسا لە هەموو شوێنێکدا زاڵە. ئەو تاکە کەسەی، کە ناخۆشیی بۆ دروست دەکا (شێخ محەممەد ئاغا)ی هۆزی (کوردی)یە بە مرۆڤێکی گەمژە و سێبەندی ناسراوە، لەبەر رووخساری و قسە گێڕانەوە و گەیاندنی.

لە کۆیە (برادشۆ) بەختیار بوو،

تەنیا کێشەی سامان و جێگری (حەمە ئاغا) نەبێ، برازایەکەی (رەسووڵ ئاغا) بەساڵاچوویەکە تەمەنی (٨٠) ساڵ بوو، کەپوویەکی سوور و لەشێکی لەرزۆکی هەبوو، ناو و ناتۆرەی شەیتانی ئەو لە هەموو شوێنێک بڵاو ببۆوە، ئەو لە ناوچەی (رانیـــە) هاتبـــوو بـۆ ئەوەی لە ساتەکانی دوایی ژیانی حەمە ئاغا ئامادە بێ، کە لە ناو گـۆڕ نێـژرا، داوای سـەرۆکـایەتیی بنەمـاڵەی غەفووری و بەشێکی زۆری ماڵ و سامانی دەکرد، ئەوەشی راگەیاند کە ســاڵانێکی زۆرە بە دوژمنکاری و زۆرداری بێ بەشـیـــان کـــردووە، بانگەشەی بۆ چەند دووکـانێک و دیوەخانی خودی (حەمە ئاغا)شی بۆ خۆی دەکرد. لەم بارەیەوەش گوتی: (کـە باپیـرم مـرد دەبووایە باوکم لە شوێنی ئەو دابنیشێ)، کە زیاتر لە سەدەیەکە کۆچی دوایی کردووە. من گوێم شل کرد بۆ بیستنی کێشەکە، (مـەتران) و هەمـوو خـانەدانەکـان لەسـەر ئەوە کـۆکن، کـە بەزووترین کـات کـۆیە لەو پیـاوە نەویسـتـراوە رزگار بکەن.

دواتر لە دیوەخانەکە دەریانکرد، بەڵام لەگەڵ (عەبدوڵڵا ئاغا)، کـە دوژمنێکی کۆنی (حەمە ئاغا) بوو پەیمانی بەست و لای ئەو جێگیر بوو، هەر حەمە ئاغاش بوو، کە رێگای بە عەبدوڵڵا ئاغا دا لە مانگی ئایار لە بەغدا بگەڕێتەوە، هەر کـاتێک کـە حکوومـەت سـامی نەمـا و یاسـا بەرقـــەرار نەبوو، ئەوا دیودخـــانی (رەسووڵ ئاغا و عەبدوڵڵا ئاغا) لە مـــیـوانان جـــمـەی دێ. لە کـاتی ئاژاوەکـان کـەسـایەتیی ئەوان لە هی (جـەمـیـل ئاغـا) بەهێـزتر بوو و لە توانایاندا هەبوو، کـە بارودۆخـەکـە هێور بکەنەوە.

(جەمیل ئاغا)مان بە حاکمی شار دانا، ئەوەک (عـــەبدوڵڵا ئاغـــا) هەولی بۆ بدا، غەفوورییـەکان داوای یاریدەدەری شـاریـان دەکـرد، لەگـەڵ ئەوەی، کە (جەمیل ئاغا) پێویستیی بە یاریدەدەر نەبوو، بەڵام من بەڵێنم دانێ، کە ئەگەر چارەسەری ناکۆکی بنەمـاڵەکـەیان بکەن، ئەوا سـەیری داواکەیان دەکەم.

هەردوو برازای (حـەمـە ئاغـا) (مـەلا ئەحـمەد ئاغا)، کـە شێـوەی دەمـــوچاوی هەر بە بەرخ دەچێ و (مـەلا حەوێز ئاغا)، کـە مرۆڤێکی لاوازە، ئەو دووانـە توانیـــــــــان سـەرکـەوتن بە دەست بێنن و پێگەی خۆیان لە دیوەخانەکەی (حەمە ئاغا) بچەسپێنن، توانییـان دەستی کورە بچکۆلە قـەڵەوەکـەی بگرن، کـە تەمـــــەنی (٨) ســـاڵانە و ناوی (مـــحـــەمـــەد زیاد)ە و بۆ هەمـــوو شـوێنێک لەگـەڵ خـۆیان بیـبـەن، بۆ ئەوەی بیسـەلمێنن کە ئەو پیاوە مەزنە (حەمە ئاغا) جێگرێکی هەیە وەک سەرۆکی بنەماڵە. بەو گورزە توانییان (رەسووڵ ئاغا)دا بمرکێننەوە، ئەوانە دەوڵەمـــەند بوون و لە ناو خـەڵک خۆشـەویست بوون، بەڵام ساویلکە بوون، ئەگـەر زیرەک بان دەیانتـوانی وەک سـەرکـردەیەک بارودۆخـەکـە بۆ خۆیان بقۆزنەوە، هەر لەسـەر رێبـازی (حەمە ئاغا) رۆیشتن و لە سەختترین کـاتی شلۆقی بەلایەنگری نەگۆڕاو بۆ حکوومەت مانەوە.



مەلا حوێز ئاغا

بۆ رۆژی دواتر ئامـادەی پرسـەی (حـەمە ئاغـا) بووم، هەمـوو خزم و پیاوە ناسراوەکان ئامادە بوون، تەنیا (عـــەبدوڵڵا ئاغـــا) نەبی، کـــوڕە شۆخەکەی کە هەندێ هەڵاوسانی پێوە دیار بوو، لە ریزی پێشەوە بوو.

دواتر لەگـــەڵ (برادشـــۆ) بەرەو (باتاس) کـەوتینە رێ بە (جەلی) و لای رۆژهەڵاتی چیـای (سـەفین) و بە (نازەنین) و (هیران)دا رۆیشتین. من ئەم رێگایە بە خـۆشـتـرین رێگا دادەنێم، کـە لە کـوردسـتـان پێـیـدا رۆیشتبم، ئەو رێڕەوەی، کە لە دوای (جـەلی) درێژ دەبێـتـەوە، لەوەڕ و قـامیش و گوڵزارێکی زۆری لە خۆ گرتووە، (نەعنای کـیـوی) هەوای پڕ بۆنی خۆش کردووە، هەندێ ژنمان دیت خـەریکی کـۆکـردنەوەی گـەڵا تووتن بوون بە مەبەستی وشککردنەوەی. لە هیـران کـێخـواکەی (عەلی بەگ) لە سـەربانی ماڵەکەی خۆی پێشـوازیی لێ کـردین، خـواردنێکی سـاکـار و

پێشوازییەکی زۆر گەرمی لێ کردین، ڕێبوارەکان لە نەبوونی شوێنی حەوانەوەی میوان نیگەرانن. ئەوەشی پێ ڕاگەیاندین، کە (قادر بەگ) بەوە سەرقاڵە، کە هێزێکی گەورە کۆ دەکاتەوە بۆ ئەوەی لە دژی (سوورچی)یەکان بجەنگێ. دواتر لە گوندی (بەرەکە) (مام کاک)، کە بەساڵاچوویەکە بەردەوام ڕووخۆشە لە نزیک کانییەک، کە دارێک سێبەری لێ کردبوو خواردنی بۆ ئامادە کردین، ئەویش گوتی: ئەو پیاوەی توانای هەبوو لە ناو گوند چەکی هەڵگرت و بە فەرمانی (قادر بەگ) بەرەو (باتاس) ڕۆیشتن. (نووری) و (حەمەدەشین) و (شێخ عوبەیدوڵلا) لە (بجێل) بەرهەڵستکاری ئێمە بوون. (مستەفا ئاغا) و (ساڵح بەگ) و (ڕەشید بەگ) بەژمارەیەک لە هێزی هۆزەکان ئامادە بوون. لە ژووری (یەحیا بەگ) لەگەڵ (١٧) سەرکردە کۆبوومەوە و گفتوگۆمان کرد، باسەکە ئاڵۆز بوو، پاش چەند خولەکێک (قادر بەگ) و هەرسێ سەرکردە داوایان کرد کە لەگەڵیان کۆببمەوە. لە نووسینگە لە پێشەوە دانیشتم و مێزێک لە پێشەوەم بوو، ئەوانیش لەلای ڕاستم لەسەر لاتەختێک دانیشتبوون، (قادر بەگ) نیگەرانیی پێوە دیار بوو، (ڕەشید بەگ) و (ساڵح بەگ) بێزاریان پێوە دیار بوو، توانایان نەبوو سەیری دەموچاوم بکەن، (مستەفا ئاغا) بەدرێژایی کاتەکە بەدڵە ڕاوکێوە دەیڕوانیە من، باری دەروونی خراپ بوو، دواتر (قادر بەگ) گوتی: ئەوان لەگەڵ برایەکانی ئامادەن، کە هەر فەرمانێکی پێیان بدەم جێبەجێی بکەن و بۆ ئەم مەبەستەش (٤٠٠) پیاویان ئامادە کردووە، بەڵام بەربەستێک هەیە، ئەویش مەلاکانن کە دەڵێن: شەڕکردنی موسڵمانان لەگەڵ یەکتر کارێکی ناڕەوایە، ئەگەر بەفەرمانی حکوومەتێکی گاوری، نەخاسمە ئەو شەڕە لە ڕۆژی جەژن بێ و لە بری قوربانی خوێنی موسڵمانان بڕژێ، ئەوا ڕیسواترە، هەرچەندە برایەکانی لە زۆر لەو مەلانەیان داوە و زیندانییان کردوون، ئەوان ئامادەن گوێڕایەڵی فەرمانەکانم بن و با سەرپێچی فەتوای ئەوانیش بێ، ئامادەشن لە پێناو من ببن بە (گاور). بەڵام ناتوانن لە ناو دڵ و دەروونی پیاوەکانیان بگەن، ئەگەر فەرمانیشیان پێ بدەم ئامادەن پیاوەکانیان بۆ ناو زێ ببەن، بەڵام لە ئاکامەکەی شەڕ دەترسان، کە شەرمەزار بن و تووشی کارەسات بن، هەرچەندە بەو قسانە دڵتەنگ بووم، بەڵام لەسەر ئەوە ڕێککەوتین کە بۆ ئەوەی پیاوەکان هەست نەکەن و ئابڕوومان بچێتە بڕیارەکانمان وا پێ ڕاگەیاندن، کە لەبەر ئەو جەژنە مەزنە و لەبەرئەوەی پێویستە پیاوەکان لە ناو ماڵ و خێزانیان بن، ئەوا جموجۆڵەکانمان ڕاگرت. ئاگاداریشی کردمەوە لە هەڵوێستی گومان لێکراوی سوورچییەکانی دەشتی هەریر، بە تایبەتی (عەلی بەگ) و (شەوکەت ئەفەندی). (مستەفا ئاغا) هۆشداریی پێ دام، کە بۆ هەولێر بگەڕێمەوە، لەو کاتەی لەگەڵ (یەحیا بەگ) نانی نیوەڕۆم دەخوارد، کۆمەڵێک لە پیاوی هۆزەکان بەمەبەستی لەناوبردنم ژوورەکەمیان ئاگر دا و سووتاند، بەڵام خۆشبەختانە لەگەڵ (قادر بەگ) بەسەریاندا زاڵ بووین.

## هەڵگیرسانی ئاژاوەکە

هەولێر هێمن بوو، ئەو جەژنە لە جەژنەکانی تر خۆشتر و ڕازاوەتر بوو، شەقامەکان پڕ بوون لە منداڵ، پێکەنین و دەنگی هەرا و هۆریایان بەرز ببۆوە، ئەوەش بەهۆی ئەو ئارامییە و دڵخۆشییەی هەستیان پێ دەکرد. لە ٢٥ی ئاب، کە یەکەم ڕۆژی جەژن بوو، هەروەک نەریتی جاران، پێشوازیم لە کەسایەتی و فەرمانبەران کرد، دواتر منیش سەردانی ئەوانم کرد، تەنیا (حاجی ڕەشید ئاغا) نەبێ کە هەڵوێستی ئەم دواییەی بەرامبەرمان باش نەبوو، دواتر پاڕایەوە و داوای چاوپێکەوتنی لەگەڵم کرد. لە پاش نیوەڕۆی ڕۆژی دووەمی جەژن سەردانێکی درێژی شێخی ئایینی (مستەفا ئەفەندی)م کرد، دەربارەی ئایینی دیانان پرسیاری لێ کردم، داوای دانەیەک لە کتێبی پیرۆزی (ئینجیل)ی لێ کردم، بە هەر زمانێک نووسرابێ، کە ئەو بتوانێ بیخوێنێتەوە، بۆ ڕۆژی دواتر دانەیەکی عەرەبیم بۆ نارد، کە لەلام هەبوو.

لە ٢٧ی مانگ هێڵی پەیوەندیی لەگەڵ باتاس نەما، کە فەرمانبەرێکی برووسکە پێی ڕاگەیاندم، لەبەر ئەوە پیاوێک و هەندێ ژاندرمەم نارد بۆ چاکردنەوەی هێڵەکە.

لە ٢٨ی مانگ کە لە مەخموور

گەڕامەوە، سوورچییەکان ئاژاوەیان لە باتاس دەستی پێ کرد و هەندێ ژاندرمە کوژران و باتاس گیرا و، قادر بەگ، جوولەی نەبوو.

لە هەولێر هەموو شتێک ئارام بوو، تەنیا (رەشید ئاغا) و (جەمیل ئاغا) نەبێ، کە چالاکانە پیلان و ئاشووبیان دەناوە، نامەیەکم بۆ (خورشید ئاغا) نارد، داوام لێ کرد لەگەڵ پیاوەکانی بێنە هەولێر بۆ پشتگیریم.

دیانەکانی عەنکاوە، ژیانێکی تۆقێنەریان بەسەر دەبرد، داوای تفەنگیان لە من دەکرد، ئەگەر پێمبدابان ئەگەری ئەوە هەبوو بیفرۆشنە پیاوانی هۆزەکان. لە ٢٩ی مانگ مەتران (کرکون ئەستیفان) لە عەنکاوە بۆ خوانی ئێوارە داوەتی کردم، لەگەڵ مولازم (بوا) چووم، پاسەوانەکانم کە دزەیی بوون یاوەرم بوون. لە سەربانی خانووەکەی کە لە تەنیشت کلێسە بوو، نانی ئێوارەمان خوارد، ئەوانە بەراستی شایستەی بەزەیی هاتنەوەن، (ئەحمەد نەفەندی) گوتی: دڵم بۆیان گڕ دەگرێ، هەروەک لەسەر مەقلییەک بسووتێ، ئەگەر شۆڕشی هۆزەکان سەربکەوێ. بێگومان ئەوانە تووشی هێرشێکی درندانە دەبن.

سوورچییەکان مەبەستیان هێرشکردنە سەر هەولێر بوو، بارودۆخی شاریش خراپ بوو، نەدەکرا هێز یان فرۆکەمان بۆ بنێرن.

(نەقیب لیتنلردیل) ویستی هێرش بکا، بەڵام لە دواوە لەلایەن خۆشناوەوە ناچار بەرەو هەولێر گەڕایەوە و لە ڕێگاش لە گوندەکان



تەقەیان لێ دەکرا. لەو ١٠٠ کەسەی پێشتر ڕۆیشتبوون ٦٠ یان ٧٠ کەسیان گەڕانەوە، ٣٦ سوارەشیان لەگەڵ بوو، چوار ئەسپ بزر بوون، هەندێ سەرباز لەلایەن (قادر بەگ)ەوە بەند کران، هەندێکی تریشیان لەلایەن شۆڕشگێڕانەوە تاڵان کران و ئازاد کران، کەمێکیان کوژران، چوار سەرباز پەنایان بۆ (ئازۆی ماوەرانی) برد بوو، پاش ئەوەی چای پێشکەش کردبوون، لە ناکاو هەڵی کوتایە سەریان و سێیان کوژران و ئەوی تریان بە برینداری رایکرد. ئەفسەرێک بەناوی (حەمید ئەفەندی) لە هێرشەکەی باتاس بریندار بوو و کەوتە ژێر دەستی (شێخ عوبەیدوڵلا)، ئەویش لە سەربانێکی بەرز فڕێیدایە خوارەوە بۆ سەر بەردەڵانێک و گیانی لەدەست دا، دەنگۆی ئەوە هەبوو، کە گوایا کاتی خۆی بەرپرسی ژاندرمە بووە لەو گوندە و خراپەی لەگەڵ ژنێک کردووە و کەسوکاری ئەو ژنە داوای تۆڵەیان لێ کردووەتەوە.

کە رواندز گیرا بە تەلەفۆن قسەم لەگەڵ (برادشۆ) کرد لە کۆیە و هۆشداریم دایە، کە ئامادە بێ بۆ جێهێشتنی دەمودەست. من دەمویست بۆ ماوەیەکی درێژتر لە هەولێر بمێنمەوە، چونکە بەرۆیشتنم بارودۆخەکە خراپتر دەکا، برادەرانیشمان وەک (ئەحمەد ئەفەندی) دەبووایە رابکەن و ماڵ و سامانیشیان جێ بهێڵن و دواتر وێرانی بکەن، عەنکاوە زیاتر بەمە گرفتار دەبن و ئەگەری ئەوە هەیە، کە ئەو دیانانە وەک بەرخ سەرببڕن. پەیوەندیان لەگەڵ بەغدا پچڕابوو و تەنیا بە بێتەل لەگەڵ (مووسڵ) پەیوەندیمان هەبوو، هەولێر تاکە هۆ بوو بۆ پەیوەندیی ئەو شارە لەگەڵ کەرکووک، دەنگۆی هێرشکردنی خۆشناو بۆ سەر کۆیە و هەولێر هەبوو، هەفتەیەکم بۆ گەیشتنی هێز

دانابوو. لە ٢ی ئەیلوول پەیوەندییەکی درێژم لەگەڵ (برادشۆ) کرد لە کۆیە، چونکە بارودۆخەکە بەرەو باشتر دەچوو، ئەگەر (جەمیل ئاغا) پیاو بووایە، دەبووایە خاوەن هەڵوێستی گەورەی خۆی بێ، ئەو خۆی دوورەپەرێز گرتبوو بەرامبەر ئەو پەیمانەی، کە هەریەک لە (عەبدوڵڵا ئاغا) و (رەسووڵ ئاغا) و (مەلا حەمە ئاغای مام سلێمان) لەگەڵ یەک بەستبوویان و خۆی لاواز نیشان دەدا، ئەوانە لقێکی بچووکتری بنەماڵەی غەفووری بوون، کۆمەڵەیەک بوون دەسەڵاتیان هەبوو بەسەر بارودۆخەکە، بەرهەڵستکاری ئەوان (مەلا ئەحمەد ئاغا) و (مەلا حەویز) بوون. ئەوانە بە لایەنگری حکوومەت مانەوە و زانیارییان بە (نەقیب برادشۆ) دەدا، هێزیشیان کۆ دەکردەوە بۆ بەرگری لە هێرشە چاوەڕوانکراوەکەی خۆشناو.

(نەقیب برادشۆ) لەسەر گردی قشڵە نیشتەجێ بوو، کە بەسەر شارەکەیدا دەنواڕێ. لە ٢ی ئەیلوول کۆمەڵەیەک بەرێگایەک توانییان بچنە حەوشەی ناوەوە و دەستڕێژی بە تفەنگ لە بنکەی (یاریدەدەری حاکمی سیاسی) بکەن، خۆشبەختانە هیچ زاینێک نەبوو، تەنیا ئەسپێک نەبێ، کە بە فیشەکی ژاندرمەکان کوژرا، کەسایەتییەکانی کۆیە بۆ یارمەتیدان چوون. من دڵنیام ئەم کارە لە ئامادەکردنی (عەبدوڵڵا ئاغا)یە، چونکە بۆ رۆژی دواتر برازایەکی چاوێکی کوێر بوو، هەروەک بە گوللە لە دەستی دابێ، مەبەست لەم هێرشە زیان گەیاندن بە (برادشۆ) نەبوو، بەڵکو زیاتر بۆ جێهێشتنی شار بوو، بۆ بەیانی (جەمیل ئاغا) ئامۆژگاری کردم، کە شار جێ بهێڵێ، پارە و پووڵ و شتومەکی حکوومەت بە لیژنەیەکی چوار کەسی سپێردرا، بۆ رۆیشتنی (حەویز ئاغا) و پاسەوانێکی زۆر یاوەری بوون، وا باس کرابوو کە خۆشناو نامەیان ناردبوو، ئەگەر (یاریدەدەری حاکمی سیاسی) دەرنەکەن، ئەوا هێرش دەکەنە سەر کۆیە. ئەو چوار کەسەش بەڵێنیان دا، کە تا ئارامبوونەوەی بارودۆخەکە کاری بەڕێوەبردنی شار ئەنجام بدەن... پیلانەکە بەسەرپەرشتی (عەبدوڵڵا ئاغا) بوو.

لە ئێوارەی رۆژی سێیەمی مانگی ئەیلوول (نەقیب برادشۆ) ٣٠٠٠ رووپیەی بە (جەمیل ئاغا) دا، بۆ ئەوەی وەک سپاردەیەک بەسەر ئەو چوار کەسەی دابەش بکا و لە ئەستۆی ئەوان دابێ. (برادشۆ) بە یاوەری (مەلا حەویز) و بەرێگایەکی نهێنی گەیاندرایە (هەرەجە) بۆ ماڵی (شێخ مەعرووف).

ئاژاوە لە کۆیە بەردەوام بوو، (جەمیل ئاغا) بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵ کردم، کە یاریدەدەری حاکمی سیاسی و هەندێ لە سەربازەکان بگەڕێنەوە کۆیە و پێشنیازی کرد، کە ئەو ماوەیە میستەر (محەمەد سادق بات)، کە ژمێریار بوو بە شێوەیەکی کاتی کاروباری شار بەڕێوە ببات.

(مەتران) یان مەلا محەمەد ئەفەندی ئەو کەسەی، کە لەو دوو ساڵەی دوایی شوێن و پێگەی زۆر بەرز بووەوە، بەڵام لەبەر رێبازی ستەمکاری ئەو خەڵکی وا لێ کرد، کە پەسندی نەکەن، کە یاریدەدەری حاکمی سیاسی شاری جێ هێشت، ئەویش شاری جێ هێشت و بۆ گوندەکەی خۆی رۆیشت و تا ماوەیەک لە سیاسەت دوور کەوتەوە. لە ناوچەی رواندز بارودۆخەکە بە نائارامی مایەوە.

### خورشید ئاغا بەڵێنەکەی بەجێ گەیاند

لە ٢ی ئەیلوول (خورشید ئاغا) بەخۆی و ٨٠ پیاوی لەو ١٢ رۆژەی داهاتوو بووە حاکمی راستەقینەی شار. لە دوای نیوەڕۆی ٤ی مانگ (رائید لونگریک) لە کەرکووکەوە بە یاوەریی (مولازم بیکنول) گەیشت، کاروانێکی گەورەی ئۆتۆمبێلی (فۆرد)ی پێ بوو، بۆ ئەوەی زۆرترین ئەو پارە (رووپیانە)ی، کە لە گەنجینەکەمدا هەبوو بگواستەوە، کە زۆر لە کەسایەتی و سەرکردەکان چاویان تێ بڕیبوو، حکوومەت سامی نەما و خەڵکەکەش وایان دانابوو، کە بەم زووانە شار جێ دەهێڵم. ئەو دەسەڵاتەی هەمبوو نەمابوو، بەهۆی ئەو رێکخستنە باشەی، کە (خورشید ئاغا) و (ئەحمەد ئەفەندی) پەیڕەویان دەکرد، کە جێگای سوپاسە، توانیم هەندێک لەو دەسەڵاتانەم بەکار بهێنم.

شتێکی باش بوو کە ئەو پارانە گواسترایەوە، بۆ ئەوەی لە دەستدرێژی (عەبدوڵڵا پاشا) و (ئەحمەد پاشا) بەدوور بێ.

کاتی رۆژ ئاوابوون (نەقیب برادشۆ) بە سەلامەتی گەیشت.

خواتێکی ئێوارەمان بەپێکی شامپانیا بەو بۆنە خۆشەوە ئامادە کرد، کە هەمووماني کۆکردەوە و شتێکی دەگمەنیش بوو، منیش دڵنیا بووم کە ئەفسەر و سەربازە بەریتانییەکان لەو شوێنە دوورانەوە بەسەلامەتی گەیشتنەوە لای خۆمان، کە پێشتر بۆ پاراستنیان هیچ کارێکم پێ نەدەکرا.

لە ٥ی مانگ هەواڵمان پێ گەیشت کە (سوورچی) و (خۆشناو) و (کوردی) لە ناوچەی کۆیە، هێزەکانیان کۆکردووەتەوە بە مەبەستی هێرشکردن. لەگەڵ ناودار و کەسایەتییەکانی شار کۆبوونەوەیەکی بە پەلەمان ئەنجام دا، (عەلی پاشا) بە مەبەستی ترساندنم لە شار رایکرد. (خورشید ئاغا) کارێکی باشی کرد، بەوەی فەرمانی دا پیاوانی هۆزەکەی هەموویان بێنە ناو شار.

(نەقیب برادشۆ) و (مولازم بوا) بۆ مووسڵ بەرێ کەوتن، هەندێ لە فەرمانبەرەکان و ئەو هیندییانەی، کە لەلامان بوون تۆمارگە نهێنییەکانیان لەگەڵ خۆیان لەسەر هێڵی شەمەندەفەر لە (شەرگات) برد.

(نەقیب دیکنسن) رۆژ هەبوو بە ئۆتۆمبێل سێ کاروانی بۆ (گوێر) بەچوون و گەڕانەوە ئەنجام دەدا، هەرچەندە ئەوە کاری ئەو نەبوو، بەڵام ئەو شوفێرەی کارەکەی پێ سپێردرابوو بە مۆڵەت بۆ بەغدا چوو بوو. فەرمانبەر و کەلوپەلەکان لە گوێرەوە بە ئۆتۆمبێلی دیکە بۆ مووسڵ دەچوون، کارەکە لەبەر چەتە و ڕێگر مەترسیدار بوو بۆ ئێوارە (دزەیی) کۆبوونەوە و شار پڕ بوو لە چەکدار و توانیم بەسەربەستی بگەڕێم، پێشتر ژیانم پڕ بوو لە مەترسی، سیستەمی پاسەوانی باشمان هەبوو، بە تایبەتی لە چوار سووچی سەربان، شەستیرێکی جۆری (لویس) لامان بوو، کە (نەقیب لیتلدیل) کە فڕۆکەیەک سەردانی کردبووین دایمالی بوو.

بۆ رۆژی دواتر چوومە ناو (قشڵە)، کە لە رۆژئاوای شار راستەوخۆ لە ژێر قەڵاکە بوو، بۆ ئەوەی کە ماوەیەکی زۆرتر خۆمان رابگرین، کاتی هێرشکردن من چوونی مووسڵم پێ باشتر بوو لەو قەیرانەی، کە لەسەرم بەردەوام بێ. لەبەرئەوەی بارودۆخەکە رۆژ بە رۆژ بەرەو خراپی دەچوو، سەرباز و ژاندرمەکان ئازاد بوون لە جێهێشتنی کارەکانیان. ٥٠ سەربازی تازە و ٢٠ ژاندرمە و ٣٥ پۆلیسی شارمان لابوو، پۆلیسەکان هیچ کاتێک بەجێیان نەهێشتین، ئەوانەی لەگەڵمان بوون خۆڕاگر و ئازا بوون، چونکە بەردەوام دەکەوتنە بەر تانە و توانجی پیاوی هۆزەکان و ریسوایان دەکردن.

(خورشید ئاغا) بانگەوازی شەڕی بۆ هەموو لایەنگرانی لە ناوچەکە نارد: بەهۆزی (تەی)یەوە. ئەوانە بەرەو شار هاتن و ژمارەیان گەیشتە ٣٠٠٠ کەس. زیاتر ئەوانە بە ئاغاکانەوە بەمەبەستی دەستکەوتی شتومەکی شەڕ هاتبوون، من ترسم هەبوو بارودۆخەکەمان لە دەست دەربچێ و بە (خورشید ئاغا)ش نەوەستێ.



**خورشید ئاغا**

لە بازاڕ غەڵبەغەڵب پەیدا بووە و خەڵکەکە بەلێشاو و بەپەلە بەلای من دەگەڕانەوە و هاواریان دەکرد (هاتن... هۆزەکان وا هاتن)، پاسەوانەکان دەیانویست بە خێرایی بمبەنە ناو قشڵەکە، بەڵام من زۆر بەهێواشی رۆیشتم بۆ ئەوەی خەڵکەکە بەترسنۆکم لە قەڵەم نەدەن. (حوسێنی مەلا) بە پەشێوی تێپەڕ بوو، کووتەکێکی بەدەستەوە بوو و دەموچاوی لە هەموو کاتێک سوورتر هەڵگەڕابوو، (نەقیب لیتلدیل) کەڕەنای وریاکردنەوەی لێ دا و ئامادەباشی ڕاگەیەنرا. پاش چەند خولەکێک بارودۆخەکە هێور بۆوە و (ئەحمەد ئەفەندی) هات و رووداوەکەی بەدرێژی گێڕایەوە، کە گرژییەک لە نێوان کرمانجێک و دووکاندارێکی جوولەکە رووی دابوو و کرمانجەکە دەیویست شتومەک بکڕێ و پارەیەکی کەمتر لە نرخەکەی خۆی بداتە جوولەکەکە و ئەویش رازی نابێ و هاوار دەکا و ئەو ئاژێشەی لێ پەیدا بوو. (حوسەینی مەلا) بەکووتەکە ئەستوورەکەی بەلێدان و

جنێودان و مشتەکۆڵە و زللە و پاڵپێوەنان توانی بارودۆخەکە هێمن بکاتەوە، جوولەکەکەمان دەستگیر کرد کە بەهاواری ئەو، ئەو هەرا و هۆریایە رووی دا و ئەو کەلوپەلانەی بردرابوو بۆ خاوەنەکانیان وەرگێرانەوە. ئەمە ئەوەی بۆ سەلماندین، کە دانیشتوانی شار بەگومانن و پیاوی هۆزەکانیش خۆیان ئامادە کردووە بۆ قۆستنەوەی یەکەم هەل بە مەبەستی راورووتی و تالانکردن.

ئەو هەشت رۆژەی دوایی (حوسێنی مەلا) ئەرکی پۆلیسی خستە ئەستۆی خۆی، کە شایستەی رێزە بە ئازایەتی ئەو توانی خۆی بسەپێنی بەسەر هەزاران کەسی چلێس لە چەکدارەکانی هۆزەکان و بە تەواوی دەستی بەسەر بارودۆخەکە داگرتبوو، هیچ تاوانێک رووی نەدا، تەنیا یەک رووداوی کوشتن نەبێ، کە بەهۆی تۆڵەسەندنەوەی دوژمنایەتییەکی کۆن بوو و بکوژەکە زوو دەستگیر کرا و خرایە زیندان.

بە یارمەتیی (رەحمان ئاغا)ی کوڕی (خورشید ئاغا) خواردنی رۆژانەیان لەسەر ئەرکی خۆیان بەسەر ئەو خەڵکە زۆرە دابەش دەکرد، کە بۆ یارمەتیی حکوومەت هاتبوون، هەرچەندە گەنمێکی زۆرمان لە ئەمبارەکاندا هەبوو، بەڵام جەنجاڵیی خەڵکەکە وای کرد، کە گلەیی زۆر لە چاودێرانی دابەشکردنی ئازووقە بکەن لەبارەی جۆر و چەندی برەکە.

(سوار ئاغا)ی پیرانی کۆنە دوژمنم، کە لە پایزی ١٩١٩ لەلایەن (نەقیب بارکر) دەستگیر کرابوو و بەبەندکراوی بۆ بەغدا رەوانە کرا و دواتر بۆ لای منیان نارد لە هەولێر دەستبەسەر بێ و بە دەستەبەری سەرکردەی (دزەیی) حاجی پیرداود لە هاموشۆی سەربەست بێ. بۆ ئەوەی رانەکا و لەو ئاژاوەی ناوچەی رانیە دوور بێ و گرفت دروست نەکا، بەبەندکراوی بۆ مووسڵم نارد، هەرچەندە کە ژنەکەی (سوار ئاغا) خۆی خستە بەردەم پێی (خورشید ئاغا) و تکای زۆری لێ کرد، کە بەزەیی بە مێردەکەی دابێ، کە ئەمە لە کوردەواری بەرامبەر ژنی سەرکردەیەکی کورد بەژێر دەستی و شکانەوە لە قەڵەم دەدرێ، بۆیە (خورشید ئاغا) هاتە ژێرباری داواکاری ئەو ژنە و هات ئەو داوایەی لە من کرد، هەرچەندە ئەو لەو بارەیەوە کەللەرەقە و واز ناهێنی و بۆ ماوەی سێ رۆژ هەوڵی دا بۆ پووچەڵکردنەوەی بڕیارەکەم، بەڵام بێ سوود بوو و رازی نەبووم.

دەنگۆی هێرشی (سوورچی) و (خۆشناو) بڵاو بۆوە، متمانەم بە (عەبدوڵڵا پاشا) و (حاجی پیرداود دزەیی) و (جەمیل ئاغا)ی گەردی نییە و کاتی خۆی داوای یارمەتیم لێ نەکردن، بەڵام ئەوانە بە فروفێڵ و هەڵخەڵەتاندن خۆیان بەهاوکار نیشان دەدا. لایەنگرەکانی (حاجی رەشید ئاغا) و (عەلی پاشا) ناحەزی ئێمەن. متمانە بەس بە لایەنگرە تایبەتییەکانی (خورشید ئاغا) و (مشیر) و (ئەحمەد ئەفەندی) دەکرێ.

هەوڵم دا (قادر بەگ) لە دوژمن دابڕم، چونکە ئەو پیاوە بە سووڕانەوەی فڕۆکەکان بەسەر (شەقڵاوە) و (سیساوە)دا تۆقی بوو، دەڵێن ئەو داوای پەنای بۆ لێبووردنی لە ئێمە دەکا، ئەگەر مەرجی سووک و ئاسانی بۆ دابنێین، دوای نیوەڕۆی شەشی مانگ بە تەلەفۆن بە درێژی قسەم لەگەڵ، هەندێ لە کەسایەتییەکانی کۆیە کرد. لەو کاتە (کەریم ئاغا) لە شار بوو، لە کاتی قەیرانەکە تەنیا تاکە پیاوێک بوو، کە بە هەستێکی روون و ئاشکرا لایەنگیرمان بێ. ئەوەشی پێ راگەیاندم، کە (عەبدولرەحمان بەگ) بە ٢٠٠ پیاو لە هۆزی خۆشناو لە گوندی (نازەنین)، کە چوار کاتژمێر لە کۆیەوە دوورە. پێم راگەیاند کە داوای فڕۆکەم کردووە و چی ترم پێ ناکرێ و ئارام بگرە، پاش چەند خولەکێک هێڵەکەی کۆیە برا.

لە ئێوارە برووسکەیەکم لە (حاکمی گشتی: سرارنلد ولسفۆی) پێ گەیشت، کە لە ٨ی مانگ بەسێ فڕۆکە سەردانم دەکا، ئەوە منی دڵنیا کردو، هەواڵەکەم لە شار بڵاو کردەوە و کاریگەر بوو، بە برووسکەیەک وەڵامم داوە، ئەگەر بارودۆخەکە گونجاو نەبوو، شار جێ دەهێڵم، پێشم راگەیاندن ئەگەر ئاڵا لەسەر (قشڵە) نەبوو مانای ئەوەیە من لە شار نەماوم و نیشتنەوەتان جێگای مەترسییە.

(ئەحمەد ئەفەندی) پێی راگەیاندم، کە بارودۆخەکە ترسناکە، بەڵام بێ ئومێد نییە، لەبەر ئەوە تفەنگ و فیشەکی زۆرم بەسەر لایەنگرانمان دابەش کرد. شەوێکی

درێژ و تاریکمان بەرێ کرد، جلوبەرگمان گۆڕی بوو و ئەسپەکانمان زین کردبوو، (ئەحمەد ئەفەندی) و دوو یان سێ ئاغای دزەییم لەگەڵ بوو، هەردەم بۆ ڕۆیشتن ئامادە بووین، کەمێک تەقە کرا و (نەقیب لیتلدیل) و پیاوەکانی لە ئامادەباشی دابوون، بۆ بەیانی زوو هەروەک ڕۆژەکانی دیکە خەڵکێکی زۆری شار لە دەوری بنکەکانمان کۆبوونەوە، بۆ ئەوەی دڵنیا بن ئێمە لەگەڵ ئەوان ماینەوە، ڕەفتاریان دڵسۆزانە بوو، ئازووقەیان بۆ سەربازە تازەکان هێنابوو، چونکە چوونە بازاڕ بۆ ئەوان شتێکی نادروست بوو.

(خورشید ئاغا) کە هاوکاری باشم بوو و هەردەم پابەند بوو بە ڕاسپاردەی برا خوالێخۆشبووەکەی بە چاودێری و ئاگاداری من، داوای زۆری لێ کردم دەربارەی (سوار ئاغا)، ناچار بووم لە مووسڵەوە بیهێنمەوە (مەخموور)، لەلایەن کۆمەڵێک لە (دزەیی) لە گوێڕ پێشوازییەکی سەرکەوتووی لێ کرا. بەهۆی ئەمە بارودۆخەکە هێورتر بۆوە، دواتر سەرکردەکان کە بریتی بوون لە: (خورشید ئاغا) و (حوسێنی مەلا) و هەموو سەرکردەکانی لقی (بایز) لە پەناگەیەک کۆبوونەوە و سوێندیان بە (تەڵاق) خوارد کە بۆ ماوەی ١٠ ڕۆژ هەولێر بەرامبەر هەر دەستدرێژییەک بۆ ناو شار بپارێزن، ئەگەر ئەو ماوە بەسەرچوو و بارودۆخەکە باش نەبوو و، یارمەتیی سەربازی نەگەیشت، ئەوان یارمەتیمان دەدەن بەپاشەکشێ لە شارەکە بەبێ زیان، ئەو کارە هاوشێوەی کارەکانی (ڕەسووڵ ئاغا) و (سلێمان ئاغا)، کە کوڕی مامی (حاجی پیرداود)ە و (محەمەد ئاغا)ی هۆزی کوردی لە (کۆیە)، بەڵام من لە ڕەفتاری (سلێمان ئاغا) دڵنیا نەبووم.

ڕۆژانە کاتژمێرێک لە نووسینگەکەم دادەنیشتم، پاش سەردانی بنکەکان، لە شوێنی حەسانەوەم چیرۆکم دەخوێندەوە.

لە ٢٧ی مانگ ئەو پارەی مابوو جگە لە کەمێکی نەبێ بۆ کەرکوک گواسترایەوە، لە ڕێگا لە دەرەوەی شار لە پەنای پەرژینێک تەقەی لێ کرابوو، بۆ ڕۆژی دواتر فڕۆکەخانەمان ئامادە کرد بۆ پێشوازی لە (حاکمی شاهانەی گشتی)، لە ٤٥.٧ فڕۆکەکان گەیشتن، پاسەوانی بەهێزمان لە فڕۆکەخانە دانابوو، بە هەوڵ و تێکۆشانی (ئەحمەد ئەفەندی) و (خورشید ئاغا) خەڵکەکە لە ناو شار مانەوە. منیش لەماڵەوە خواردنی بەیانیم بۆ ئامادە کردن، سەرەتا ئەوان ئۆتۆمبێلەکانیان بۆ ناو شار بەناو خەڵک دەهاژوا، سوارەیەکی زۆری (خورشید ئاغا)ش دەوریان دابوون، دواتر هەمووومان گەڕاینەوە ماڵ و نانی بەیانیمان خوارد، داوای هێزێکی بچووکی سەربازیم کرد لە شار جێگیر بێ، بۆ ئەوەی دۆستەکانمان دڵەڕاوکێیان نەمێنێ و دوژمنەکانیشمان بێ ئومێد بن. دواتر چووینە سەرای حکوومەت و حاکمی گشتی پێشوازی لە تێکڕای کەسایەتی و سەرکردە کوردەکان کرد، سەرم سوڕما کە لە ناویان (ئەحمەد پاشا) و (حاجی پیرداود) و (جەمیل ئاغا)م لە ناویان دیت.

وتارێکی پێشکەش بەهەمووان کرد، کە شایستەی ئەو پلە و پایە بوو، دواتر (مەلاغەندی) و (خورشید ئاغا) وەڵامیان داوە، ئەوانیش داوای ناردنی بەپەلەی هێزی سەربازیان کرد. دواتر بە تەنیا لەگەڵ (ئەحمەد فەندی) و (خورشید ئاغا) کۆبۆوە و سوپاسی ئەو پشتگیرییەی کردن. پاشان گەڕاینەوە ماڵ و نانی نیوەڕۆمان، کە ئامادە کرابوو خوارد، خواردنەکەش زۆر نایاب بوو، بۆ ئەم مەبەستە خانوویێکی نزیک فڕۆکەخانە ئامادە کرابوو. لە کاتژمێر ٢ی پاش نیوەڕۆ بەفڕۆکەکانیان ڕۆیشتن (خورشید ئەفەندی) و (ئەحمەد ئەفەندی) لە بەرێکردنەکە ئامادە بوون، ئاگاداریشیان کردمەوە، کە (حوسێنی مەلا) تازە لە ناوچەی خۆشناو گەڕاوەتەوە، کە بۆ وتووێژ چوو بوو، نامەیەکی لە (قادر بەگ)ی هێنابوو، کە تێیدا هاتبوو ئەگەر لە کردارەکانی پێشووی ببووردرێ و هیچ سزایەکی لەسەر نەسەپێنرێ، ئەوا خۆی و هەموو خزمانی گوێڕایەڵی فەرمانەکانی حکوومەت دەبن، پێشنیازیان کرد، کە ئەو هەلە بقۆزمەوە و بۆ ڕەزامەندی بەحاکمی شاهانەی گشتی رابگەیەنم، (ئەحمەد ئەفەندی)م بۆ ئەم مەبەستە ڕاسپارد، ئەویش چوو پێی گوت، پاش ئەوەی کە لە ناو کورسیی فڕۆکەکەی دانیشتبوو پێی ڕازی بوو، فڕۆکەکان بە ئاسماندا فڕین. دواتر زانیم کە (مەلافەندی) خۆی، (ئەحمەد پاشا) و یاوەرانی بۆ ئەم پێشوازییە داوەت کردبوو.

لەم کاتەدا سوورچییەکان

بەسەرکردایەتیی (شێخ عوبەیدوڵلا) نووریشیان لەگەڵ بوو، بەدووریی ١٢ میل لە هەولێرەوە نزیک (دیرە)ن بەدرێژایی رووباری بەستۆرە. خۆشناو لە دووریی ٩ میل لە دەورووپشتی گوندی (مەلا ئۆمەر) بوون، لەبەر ئەوە هێرشەکەیان لە هەولێر نزیک ببۆوە.

ئومێدێکی زۆرم بە (خورشید ئاغا) هەبوو، زۆر بەدڵسۆزی سەرپەرشتی لەو کۆمەڵە ئێشکگرانە دەکرد، کە بۆ رووباری بەستۆرەی ناردبوو بە مەبەستی چاودێریی جموجۆڵی دوژمن. (مشیر)یش بڕیاری دابوو، ئەگەر لە رووباری بەستۆرە بپەڕنەوە ئەوا خوێن دەرژێ ئەوجا ئەوانە محەممەدی (موسڵمان - و-) بن یان نا.

کاتی بەیانی (خورشید ئاغا) و (شێخ مەعرووف)، کە پایەدارێکی پیرۆزە و ناوبانگی بڵاو بۆتەوە، بۆ لای (شێخ عوبەیدوڵلا)ی نارد بۆ ئەوەی هۆشداریی بداتێ، کە لە رووباری بەستۆرە نەپەڕێتەوە، دەنا خوێنی موسڵمانێکی زۆر دەرژێ. لە کاتژمێر ٣ی پاش نیوەڕۆ کۆمەڵەیەکی زۆر لە (خۆشناو) بەرەو شار هاتن و ترس و تۆقین لە شار بڵاو بۆوە، سەربازەکان لە ئامادەباشی دابوون و نەقیب (لیتلدیل) مەترەلۆسەکەی پڕ لە فیشەک کرد و (مشیر) جەنگاوەرەکانی بەسەر بنکەکان دابەش کرد و لە ئامادەباشی دابوون، (عەلۆ) و کەسانی تر کە پێشتر لە دەرەوەی شار بوون، بەمەبەستی دابینکردنی بژێوی بۆ پیاوی هۆزەکان، بە ئەسپەکانیان بەغار هاتنەوە ناو شار.

دوایی زانیمان ئەوانە بەرەو ماڵی (مەلافەندی) لە باداوە رۆیشتوون و (ئەحمەد ئەفەندی) بەسواری چوو بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵیان، کە گەڕاوە گوتی: ئەوان هەڵچوونێکی زۆریان پێوە دیار بوو، ئەوان ئەویان بەگاور ناو برد، چونکە لایەنگری ئێمە بوو، (مستەفا ئاغا) و (خدر بەگی بالیسانی) ئەو دوو کەسەی کە بە سووکی سەیرم دەکردن، لە کاتی ئاژاوەکە بە (قادر بەگ)یان راگەیاند بوو، کە لەسەر پشتگیری بۆ ئێمە بێنێتەوە، بە پێچەوانەی (ساڵح بەگ) و (رەشید بەگ)، کە دەیانویست وردی بڕووخێنن و لە دژی ئێمە بێ. ئەو پیاوە دوودڵ بوو، (مەلافەندی) بەزمانی پاراوی دەیویست بۆ لای راستی بهێنێتەوە. ئەو شەوە چەند تەقەیەک کرا و ترسمان لێ پەیدابوو، کە (خۆشناو) لە فرۆفێڵ و هەڵخەڵەتاندن بن.

بەیانیی رۆژی دەیەم بەهێمنی رۆیشت، کاتژمێر ١١ی بەیانی (ئەحمەد ئەفەندی) هات بۆ چاوپێکەوتنم. لە هەڵوێستی هۆشداریم دایە، بەڵام ئەو بە فێڵ و خەڵەتان دەستی ماچ کردم، لایەنگری هەمیشەیی بۆ خودی خۆم دڵنیا کردەوە، ئاماژەشم بەو برادەرایەتییە تایبەتییەی پێشوو، کە لە نێوانماندا هەبوو کرد. بەڵام ئەو نارەزایی دەربڕی، کە (خۆشناو) دەستدرێژیی گوللەیان لە کۆمەڵەی (لیتلدیل) نەکردووە. ئەوان لە حکوومەت بەگومانن، نەوەک تەمێیان بکەن. دواتر چاوپێکەوتنێکیان بۆ رێکخستم لەگەڵ (قادر بەگ) و سەرکردەکانی تری خۆشناو.

کاتژمێر ٢ی دوای نیوەڕۆ چوومە سەراو دیار بوو سەرکردەکانی (خۆشناو) دەهاتن، خەڵکێکی زۆریش لە رۆخ شەقامەکان وەستابوون، دزەییەکان گاڵتەیان بەسوارچاکی ئەوان دەکرد، هەندەی نەمابوو ئاژاوە و دەنگەدەنگ پەیدا بێ، لە پێشدا (قادر بەگ) هاتە ژوور و دوای ئەو (خورشید ئاغا) و دوای ئەو (ساڵح بەگ) و (رەشید بەگ) و (مستەفا ئاغا) و (خدر بەگ) و (غەریب کوردی). رێککەوتین بەوەی کە هێزەکانیان بڵاوە پێ بکەن و بۆ ناوچەکانیان بگەڕێنەوە، گەڕانەوەی کەلوپەلەکانی حکوومەت کە لەلایانە، مانگانەکانیان بەردەوام بێ و رەفتاری باشی وەک جارانیان لەگەڵ بکەم، ناچار بووم بەو مەرجانە رەزامەند بم، بۆ ئەوەی ئابڕوویان بێنێ، چونکە سوێندی گەورەیان لە بەردەم (عوبەیدوڵلا ئاغا) خواردبوو، کە تا دوایی شەڕ لەگەڵ حکوومەت بکەن، بەدڵێکی شکاو پێیان گوتم: کە هێمنی و بێدەنگی لەگەڵ (سوورچی) پەیڕەو بکەم، منیش بەڵێنم نەدا، بەڵام بە هەموو توانام هەوڵ دەدەم، دواتر کۆبوونەوەکە کۆتایی پێ هات.

پێش ئەوەی نووسینگەکەم جێ بهێڵم، (شێخ مەعرووف) هات بۆ چاوپێکەوتنم و چیرۆکێکی سەیری بۆ گێڕامەوە و وتی: کە سوورچییەکان نزیک بوونەوە، (شێخ عوبەیدوڵلا) بە سووکایەتییەکی زۆر پێشوازیی لێ

کردم و گوتی: تۆ سەیدی و لە نەوەی پەیامبەری، بۆ لەگەڵ ئەو گاورانە کار دەکەی، پەیوەندی بەئێمە بکە و یارمەتیمان بدە بۆ دەرکردنی ئەو نەفرەت لێکراوانە لە ناوچە پیرۆزەکانمان، دواتر هەر (شێخ عوبەیدوڵلا) خۆی گوتی: ((ئەگەر حکوومەت بە سەرکردەی هۆزەکەم دابمەزرێنی و مووچەیەکم بۆ ببڕێتەوە و هێزێک لە هۆزەکەم وەک ژاندرمە دامەزرێنێ، من ئامادەم هەموو باجەکانی بەباشی بۆ کۆ بکەمەوە و بەحکوومەتی بدەم، بە باشترین شێوە لایەنگیری و بەدڵسۆزی خزمەتی بکەم)).

پاش گفتوگۆیەکی زۆر سەرکردەکانی (خۆشناو) ڕۆیشتن و شەو لە (بنەسڵاوە) لە دووریی ٦ میل مانەوە.

پاش نیوەڕۆ بەسواری ئەسپەکەم لە (بادەوە)، سەردانی (مەلافەندی)م کرد: بۆم دەرکەوت، کە ئەو دەنگۆ و بەندوباوەی، کە ترس و تۆقینی بلاو کردبۆوە، هیچ کاریگەریی لەسەر ئەو نەبووە، هەروەک جاران بەسۆز و ڕێزەوە پێشوازیی لێ کردم، قسە و باسی خۆشمان کرد و ئامۆژگارییەکانی دڵسۆزانە بوو، ئەو گروتینی بەئێمە بەخشی و زۆریش بە پەرۆش بوو بۆ هەموو ئەوانەی، کە دەستی یارمەتییان بۆ ئێمە درێژ دەکرد، ئەو ڕابەرایەتیی ڕای گشتی کرد، ئەو ڕێنومایی بە (ئەحمەد ئەفەندی) دەدا بۆ هەر بڕیارێک، کە ئەنجامی دەدا، ئەو سروشتی توندوتیژی (خورشید ئاغا)ی هێور کردەوە، ئەو گفتوگۆی لەگەڵ سەرکردەکانی خۆشناو کرد بۆ ئەوەی هەڵوێستی ڕاست وەربگرن، تا ئێستا هیچ پیاوێکی وا بێ فیزم نەدیوە، بەدەگمەن نەبێ. ئەو گوێ لە ستایش و پیاهەڵدان ناگرێ، ئەو دەڵێ: هەروەک نەریتی جاران هەردەم تێدەکۆشێ بۆ بەرژەوەندیی وڵات و دانیشتوانەکەی.

لەگەڵ ئەوەی کە (خورشید ئاغا) پێی ڕاگەیاندین کە شار جێ بهێڵێت، بەڵام ئەوجارە (ئەحمەد ئەفەندی) پەشیمانی کردینەوە. شەوێک کاتێ کە سەرکردە دزەییەکان بەیەکەوە بوون، (ساڵح بەگ) توانی بێتە ناو شار و لە نزیک ئەوان هاوار بکا (ڕاکردن.. ڕاکردن... سوورچی وا پەلاماری بۆ هێنان، هەرچەندە کە غەڵبەغەڵب پەیدا بوو و ئامادەباشیمان ڕاگەیاند، بەڵام سەرکردەکانی دزەیی بۆیان دەرکەوت، کە ئەوە پیلانە لە دژیان، دواتر ئاغا لاوەکانی دزەیی، بەدکارییان گرت و بۆ منیان هێنا. بەڵام (خورشید ئاغا) بەرهەڵستی لە گرتنەکە کرد و لەبەر دابونەریتی هۆزگەری و میوانداری (ساڵح بەگ) یان ئاگادار کردەوە، کە شار جێ بهێڵێ و ئەویش بە سەرکۆنەکراوی و وەک مرۆڤێکی بەزبو بۆی دەرچوو.

لە ١٤ی مانگ کۆمەڵەی هێزی پشتیوانیی کەرکووک گەیشت، من و هەندێ سەرباز و (مشیر ئاغا) چووین بۆ پێشوازییان، کاتژمێر ٣٠.٩ی بەیانی هاتنە ناو شار، پیاوی هۆزەکان و دانیشتوان لە هەردوو لای شەقامەکان وەستابوون و هەندێ ژن هەلهەلەی سەیریان لێ دەدا بۆ بەخێرهاتنی کۆمەڵەکە، بۆ نیوەڕۆ کۆمەڵەی هێزی مووسڵیش گەیشت کە پێک هاتبوو لە: پەلی سوارە و دەستەی پیادەی هیندی و دوو تۆپیشیان پێ بوو. خێوەتیان لەو شوێنە هەڵدا، کە بۆمان دیاری کردبوون. خەڵکەکە بەتاک و کۆمەڵ بۆ سەردانیان دەچوون، فرۆشیارە گەڕۆکەکان میوە و بسکویت و جگەرەیان بۆ فرۆشتن هێنابوو، لەگەڵ (خورشید ئاغا) و (ئەحمەد ئەفەندی) گەشتێکمان بەناویاندا کرد.

(های) لە ستایشی هەندێ کەسایەتی دەڵێ: (ئەحمەد ئەفەندی) لە سەرۆکایەتیی شارەوانیی هەولێر پشتگیریی زۆری لە چینی هەژار و دانیشتوان لە دوکاندار و وەستای پیشەکان و بێوەژن و بێ نەوایان کردووە، زۆرجار لە ستەمی ئاغاکان داکۆکی لێیان کردووە.

(خورشید ئاغا) ئەگەرچی لەلایەن (ئیبراهیم ئاغا)ی برای ڕاسپاردرا بوو، بەڵام بۆ من لە ناخۆشترین بارودۆخ، زیرەکانە بەهانام هاتووە و هیچ کاتێک لای ئێمەی بەرنەداوە، بە تایبەتی لە ڕۆژانی تەنگانە، کە حکوومەت لەوپەڕی لاوازیدا بوو دەیانگوت: دوا هەناسەیەتی. جارێک (باوکی ئاغا) بۆ کارێک بەدوایدا دەگەڕا تا لە مزگەوت کە بە تەنیا بوو دۆزییەوە

و ۱۰۰۰ پاون زێری پێ دا، بۆ ئەوەی داوا لە من بکا برایەکەی (سەعید ئاغا) لە زیندان ئازاد بکرێ، کە بەتاوانی کوشتنی (عەریف میشوین) بەند کرابوو، ئەو بە توندی ئەو بەرتیلەی رەت کردەوە.

**دیسان بنیاتنانەوە**

لەبارەی ئەو ئاژاوەی دوایی دەمەوێ ئەوە بڵێم، کە جەماوەری هەولێر و کۆیە و ناوچەی خۆشناو لایەنگری حکوومەت بوون، چونکە لە ئاغا چڵێسەکانیان بێزار بووبوون، ئەگەر فەرمانڕەواییەکی دادپەروەریان لە لیوای هەولێر هەبا و فەرمانبەرەکانی حکوومەت لە شارۆچکەکان ئازاریان نەدابان، ئەوا هیچ هێڵێکی بڕووسکەی نێوان هەولێر و کەرکوک و مووسڵیان نەدەپچڕاند، لە کۆیە ئەگەر (حەمە ئاغا) لە ژیان مابا، ئەوا بارودۆخەکە باشتر دەبوو و خەڵکەکە لە خۆشگوزەرانی دەژیان. نەفامی (قادر بەگ) لە ناوچەی خۆشناو و چاوچنۆکی و ئێرەیی خزمانی هۆی ئەو دیاردە دوژمنکارییانە بوون. هۆی سەرنەکەوتنی ئەو ئاژاوانەش ئەوە بوو، کە ئاغاکان هەستیان کرد، کە پیاوەکانیان گوێڕایەڵیان ناکەن، لەبەر ئەوە لە نەفامیی خۆیان پەشیمان بوونەوە، ناوچەی رواندزیش خەڵکەکەی وشک و رەق و توند و تیژن.

لە ۱۰ی ئەیلوول (شێخ عوبەیدوڵڵا) بە (شێخ مەعرووف)ی راگەیاند بوو، کە لە کاتی ئاژاوەکە



ویلسۆن

ئەو بەرێنومایی (قادر بەگ) هەڵسوکەوتی کردووە.

لە ۱۲ی ئەیلوول سوورچییەکان گەیشتنە (گردەمامک) لەلای زێی گەورە. لە ١٤ی مانگ پەلاماری رێگای مووسڵ و ئاکرێیان دا، هێرشەکەیان بە توندی رێی لێ گیرا و رایانکرد و زیانی گیانی زۆریان لێ کەوت، کاتێ کە لە زێی نزیک چیای قەندیل (لەوانەیە نووسەر مەبەستی گوندی قەندیل بێ نزیک بێخمە-و-) پەڕینەوە، زیانی زۆریان لێ کەوت و دەڵێن زۆریان لە ناو ئاوەکە خنکان. بەم رووداوە وردیان زۆر دابەزی و ئەو باوەڕەیان لە ناو هۆزەکاندا نەما.

لە ٨ی ئەیلوول کاتێ (ویلسۆن) سەردانی کردین وای بۆ دانام، کە لە کۆتایی ساڵ بۆ (هیند) بگواستەوە، من تکام لێ کرد کە مۆڵەتم پێ بدا لەبەرئەوەی دەزگای ئیداری لیواکە تێکچووبوو، دیسان رێکی بخەمەوە، بەهاتنی هێزی سەربازی بۆ هەولێر حکوومەت سامی پەیدا کردەوە و بۆ ماوەی هەفتەیەک کارەکان وەک جاران بەڕێوە دەچوو.

لە ١٥ی ئەیلوول بەیاوەریی (خورشید ئاغا) و (ئەحمەد ئەفەندی) سەردانی (شێخ مستەفا)مان کرد، بۆ ئەوەی سوپاسی بکەین، کە لە کاتی ئاژاوەکە یارمەتیی داین، لەبەرئەوەی شوێنی نیشتەجێی لە دەوروبەری لای رۆژهەڵاتی شارە و لایەنگرانیشی لە گوندەکانی نزیک رووباری بەستۆرەن، بۆیە ئەو زانیاریی باشی پێ داین، جگە لەوە فتوایەکی ئایینیی دەرکرد، کە هێرشکردن بۆ سەر هەولێر بەکارێکی ناپاک دادەنرێ، داوای لە موسڵمانان کرد پشتگیری لە حکوومەت بکەن.

لە ١٨ی مانگ (سەید تەهای شەمزینی) ئەو پیاوە مەزنە، کە پێگەی خۆی هەیە. لە ناوچەکانی باکووری رواندز، باپیری شۆڕشی لە دژی تورکەکان بەرپا کردووە، بەهیوای سەربەخۆیی بۆ نەتەوەی کورد، مامی (شێخ عەبدولقادر) پلە و پایەی لای سوڵتان عەبدولحەمید هەبووە، تا ئێستاش خەڵک لە ئەستەنبوڵ بە مرۆڤێکی پایەداری دادەنێن. ساڵی پار نیاز وا بوو (سەید تەها) بکرێتە حوکمدار لە

ناوچەکانی رواندز هاوشێوەی (شێخ مەحموود)، بەڵام داواکاری رادەبەدەری هەبوو، لەبەر ئەوە کارەکە ئەنجام نەدرا، بەهۆی سەرۆکی هۆزی (شکاک) (سمکۆ) ئێستا دەسەڵاتی کەمبووەتەوە، کە پێشتر هاوپەیمانی یەکتر بوون. بە یاوەریی (ئیسماعیل بەگ) بەرێگای کۆیە هاتە هەولێر، دواتر لەگەڵ (مەلافەندی) هاتە ماڵەوە، پۆشاکی سوارەی ئەورووپی لەبەردا بوو، سەری لەسەر شێوەی عارەبی بەدەسماڵێک بەستبوو، بەملپێچێکی دوو رەنگ پێچرابوو، ئەگەرچی تەمەنی لە ٢٨ ساڵ تێپەڕ نەدەبوو، بەڵام لەشی قەبە بوو. درێژی لە ٦ پێ زیاتر بوو، لەشی گۆشتن بوو، سەری گەورە بوو، روومەتەکانی شل و خاو بوون، چاوەکانی بچووک و تیژە، لە ولاتی رووسیا گەرابوودوە: زمانی رووسی باش دەزانی، زمانی فەرەنسیشی دەزانی، ئاستی بیر و هۆشی زۆر بەرزە، چوار رۆژ لە هەولێر ماوە، هەموو رۆژ بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێک گفتوگۆی لەگەڵ دەکردم. من هەستم دەکرد بەرامبەر ئەو وەک مریدی سوقرات مشتومڕی لەگەڵ دەکەم. لە ٢٠ی مانگ بەیەکەوە چووینە (گوێر) بۆ لای (عەقید نولدر). ئەو بۆ ئەوە هاتبوو، کە داوای یارمەتیی چەک و تەقەمەنی پارە و پووڵ و پێداویستیی تری لە ئێمە دەکرد، بە مەبەستی دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ. خۆی بە کەسێکی زیرەکی باش نیشان دا. کاتێ لە ماڵی (مەلافەندی) لە باداوە لە ٢٣ی مانگ بەرێم کرد بەمن زۆر دڵخۆش بوو.

بەهۆی رزگاربوونی (نوری)، (ئیسماعیل بەگ) زۆر نیگەرانە، ئێستا هەموو سەروەت و سامانی بەدەست دوژمنایەتی، لەبەر ئەوە مووچەی مانگانەی ئەومان هێشتەوە.

لە ٢٢ی مانگ خاتوو (مارتن) بە سواری کەرێکی سپی گەیشتە هەولێر، کە پێش مانگێک یان دوو رۆیشتبوو، بە مەبەستی کاری موژدەبەری بۆ دیانەکانی کلدان.

لە ٢٤ی ئەیلوول (قادر بەگ) زاتی دا بەر خۆی و بە یاوەریی (ساڵح بەگ) و (مستەفا ئاغا) هات، لە هەڵوێستی دڵنیا بووم، ئەو بەوە رازی بوو کە هەموو سامان و کەلوپەلی حکوومەت بگەرێنێتەوە. ئەوەشی پێ راگەیاندم، کە (ئەحمەد مەدحەت ئەفەندی) و (ساڵح بەگ) بەرپرسن لە چەواشەکردنی، بەڵێنی دا: یەکەمیان، کاتی گەرانەوەی بۆ شەقڵاوە بکوژێ، کە ئێستا رایکردووە، (ساڵح بەگ)یش لەو کاتەدا وازی لێ دەهێنن تا رۆژێک دادێ بەگوێرەی کردەوەی رەفتاری لەگەڵ دەکرێ.

(مستەفا ئاغا)م پاداشت کرد بەو خزمەتەی، کە کردوویەتی بەزیادبوونێکی کەمی مووچەی و سەرپشکم کرد بۆ قەرەبووی زیانی ئەو پیاوانەی، کە لە (گەلی) لەگەڵم بوون.

لە کۆیە لیژنەی چوار کەسییەکە لەگەڵ کەمووکوریان، بەڵام لە کارەکانیان سەرکەوتوو بوون. رەفتار و بوونی (میستەربات) لە کۆیە زۆر ژیرانە بوو، هۆکارێک بوو بۆ ئەنجام نەدانی خۆپیشاندان لەلایەن دوژمنانەوە، لەو کاتەدا بەدرێژی بە تەلەفۆن قسەم لەگەڵ هەموو ناودارەکانی شار کرد، تەنیا (ردسووڵ ئاغا) و (مەتران) نەبێ، کە ئێستا دوورەپەرێزە و دەبووایە بۆ باسکردنی بارودۆخەکە بێتە هەولێر.

دیسان (حەمیل ئاغا)م بەحاکمی شار دانا و (عەبدوڵڵا ئاغا)ش بە بەرێوەبەری (تەق تەق)، زۆر کەسیش بەهۆی دامەزراندنیان بە فەرمانبەر و پێدانی مووچە بۆیان بوونە لایەنگری ئێمە.

(قادر بەگ) پێی راگەیاندم، کە سوورچییەکان داوای لێبووردن دەکەن.

لە ٢ی تشرینی یەکەم (رائید مارشل) گەیشت و خۆم ئامادە کرد بۆ رۆیشتن. لە ٥ی مانگ بەیاوەریی ئەو بەشارەکەدا سوورامەوە و سەردانی هەموو سەرکردە ناسراوەکانی دزەییم کرد. (خورشید ئاغا)م دیت زۆر دڵخۆش بوو بەو ئۆتۆمبێلە تازەی جۆری (فۆرد)، کە (حاکمی شاهانەی گشتی) لە پاداشتی ئەو خزمەتەی پێشکەشی کردبوو.

لە ١٧ی تشرینی یەکەم (نەقیب لیتلدیل) لە نزیک (تەرجان)



(حاجی رەشید ئاغا)یان دەستگیر کرد و بە بەندی رەوانەی مووسڵیان کرد، زۆر لە کەسایەتیی شار داوای ئازادکردنیان لێ کردم.

لە رۆژی ١٢ی مانگ خوانێکی خواردنی نیوەڕۆم بۆ فەرمانبەرە بەرزەکانی لای خۆم ئامادە کرد. دواتر کارەکەم بە فەرمی بە (رائد مارشال) وەک حاکمی سیاسی سپارد.

بۆ رۆژی دواتر بە مەبەستی ماڵئاوایی سەردانی هەموو کەسایەتییەکانی شارم کرد، لەوانە: (شێخ مستەفا) ئەفەندی. پاش نیوەڕۆ بە سواری ئەسپەکەم چوومە (باداوە) بۆ کۆبوونەوە لەگەڵ (مەلافەندی).

دواتر فەرمانبەرەکانی خۆجێیی و هیندییەکان ئاهەنگێکیان بۆ ساز دام، کاتژمێرێکی زێڕم دا (ئەحمەد ئەفەندی)، کە لەلایەن (حاکمی شاهانەی گشتی بەریتانی) بەدیاری بۆی هاتبوو، وەک پاداشت لەبەر خزمەتی زۆری. چەندین جاریش فرمێسکی لە چاوەکانی دەباری.

(نەقیب لیتلدیل) نیشانەی جۆری (m.c) پێ درا، (سەید عەلی ئەفەندی) نیشانەی جۆری (m.m)ی پێ درا.

لە بەیانیی رۆژی دواتر کاتژمێر ٣٠.٦ (شێخ مستەفا ئەفەندی) بۆ ماڵئاواییم سەردانێکی تایبەتی کردم. پیرۆزی خودی خۆی پێ بەخشیم و داوای لێ کردم، کە نووسراوی بۆ بنووسم. لە کاتژمێر ٨ی ئێوارە ٦٠ کەس لە کەسایەتی و فەرمانبەران هاتنە ماڵەوە، هەموومان بەیەکەوە چاو و قاوەمان خواردەوە، بۆ دواجار کەسایەتییەکان داوایان لێ کردم، کە (رەشید ئاغا) ئازاد بکەم. تەوقەم لەگەڵ هەمووان کرد و لە ناو کورسیی ئۆتۆمبێلەکەم دانیشتم و کۆمەڵێکی زۆر دەوری ئۆتۆمبێلەکەیان دابوو، زۆر بەگەرمی بەڕێیان کردم.

هەریەک لە (خورشید ئاغا) و (ئەحمەد ئەفەندی) و (ئەنوەر ئەفەندی) فەرمانبەری سەرەکیی دارایی و (سەید عەلی ئەفەندی) یاوەرم بوون، دوو یان سێ کاتژمێر لە (مەخموور)ماینەوە و دیسان بۆم رەخسا بەشداری لە دوا ژەمی خواردنی کوردەواری بکەم.

(خورشید ئاغا) و (مشیر) باشترین خواردنیان ئامادە کردبوو، بەدڵنەوایی ماڵئاواییم لێ کردن. لە دوورەوە چاوم لە (مەخموور) بڕی، کە شوێنە بەرچاوەکانی بزر دەبوو. هەریەک لە (ئەحمەد ئەفەندی) و (سەید عەلی ئەفەندی) و کوڕەکەی (خورشید ئاغا) (عەلۆ) تا زێیەکە لەگەڵم هاتن، بۆ ئەوەی ئاگاداری

پەرینەوەم بن بە قەیاغ بۆ ئەوبەر، کە ماڵئاواییم لە هەمووان کرد، دوا دیمەن کە لە یادم مابێ، رووخساری (ئەحمەد ئەفەندی) بوو، کە بەلاری وەستا بوو و بێ هێزیی پێوە دیاربوو.

لە کوردستان هاورێم زۆر بوو، دوژمنیشم کەم نەبوو، لەوانە (ساڵح بەگ)ی خۆشناو، کە ناتوانم لێی ببوورم، چونکە بە تەواوی هەڵیخەڵەتاندم. هەریەک لە (ئەحمەد پاشا) و (حاجی پیرداود) دوژمنی بەویژدان بوون، لایەنگری و دڵسۆزییان بەدڵ نەبوو، فرۆفێڵیان بۆ من بەلەزەت و خۆش بوو.

بەرزترین کەسایەتی کە وێنەکەی لە مێشکمدا مابێ کەسایەتیی (نووری)یە، ئەو پیاوە لە جەستەی (مەبەست) هەبوو، نەوەک (ئازایەتی) کە هاووڵاتیی ئەو ناوچەیە پێی ناسراون. ئەو وەک پاڵەوان و نیشتمانپەروەر مرۆڤ لە بری ئەوەی بۆ سێدارە ببا، بە پەرۆشەوە حەز دەکا لەگەڵی ئاشتیخواز بێ. بەرامبەر بە حکوومەت هێزێک بوو، دۆستایەتی لەگەڵی ئەستەم بوو، رەفتاری لاسارییەکی زۆری بۆ دروست کردین. ئەوەش وای کرد بۆ فەرمانڕەوا بەسەر خەڵک دەست نەدا. لە نێوان ئەو هاورێیانەی کە لە لیوای هەولێر پەیدام کردن: (ئەحمەد ئەفەندی)یە، هەردەم لە تەکمەوە دەوەستا و بەدرێژی مێژووی پێشووی هۆزەکانی بۆ روون دەکردمەوە، هەموو چرپە و دەنگۆی بازاڕی پێ رادەگەیاندم. هەموو رۆژ لە نووسینگەکەم سەردانی دەکردم. لە کاتی ئاژاوەکە هەر دوو یان سێ کاتژمێر بۆ لام لە هاموشۆ دابوو، وا راهاتبوو مانگێ یەک یان دووجار لە ماڵەکەی خۆی لەگەڵ ئەفسەرە بەریتانییەکان داوەتی دەکردین، ئەوەی لە یادم مابێ کە بەراورد لە نێوان ١٣ یان ١٤ جۆر خواردەمەنی باشیان بۆ لێ دەنایین بەردەوام پێشکەشی دەکردین.

لە هاورێکانی ترم: مەلافەندی و شێخ مستەفا ئەفەندی و خورشید ئاغای بەساڵاچوو و مشیری لاو و (مستەفا ئاغای کوردی)، کە لەوانە ئەحمەد ئەفەندی لە هەمووان دڵسۆزتر بوو. دواتر (مەتران) (مەلا محەمەدی کۆیە-و-) و جەمیل ئاغای کۆیسنجاقی و بەساڵاچوو عەبدوڵلا پاشا و شێخ محەمەد ئاغای باڵەک و میرانی قادر بەگی شەقلاوەی (هێنری هەشتەم). لەگەڵ ئەوەی ئێستا لێیان دوورم، بەڵام هەر لە یادم ماون و بە پەرۆشم کە لە هەریەکەیان بپرسم، کە لە دواجاری دیدنیم بۆیان و ئێستا چۆنە، سەید عەلی ئەفەندی کە عەرەبێکی سوورییە، کە هیچ بەرژەوەندییەکی لەو وڵاتەدا نییە. خزمەتی حکوومەتی زۆر کرد و لە زۆر بارودۆخ نزیک بوو، بۆ ئەم مەبەستە گیانی خۆی بکاتە قوربانی. جگە لە یاریدەدەرەکانی حاکمی سیاسی، کە لە شوێنە دوورەکان بەدڵسۆزی کارەکانیان ئەنجام دەدا، لێرە دەبێ باسی بوارەکانی پزیشکی و پەروەردە و هی تر بکەین. (نەقیب ویلیەمس) کە ئەفسەرێکی پزیشک بوو، لە ئاداری ساڵی ١٩٢٠ هاتە هەولێر، بە هاوکاریی پزیشکێکی عارەب چاکسازییەکی باشیان لە خەستەخانەکەی شاردا کرد، ژمارەیەکی زۆری لە نەخۆشە هەژارەکان و خەڵکێکی زۆری ناو هۆزەکان و گوندنشینەکانی نزیک شاری بەبێ بەرامبەر چارەسەر دەکرد. دواتر ستایشی ئەفسەرە بەریتانییەکان و هیندییەکان و فەرمانبەرەکانی دیکە و حاکمی شاهانەی گشتی (ویلسۆن) دەکا و باسی ئازایەتیی ئەوان و خۆڕاگری و ورەبەرزی (ویلسۆن) لە تەنگژەکەی ساڵی ١٩٢٠ دەکا.

**(١) مەبەستی (عەلی دۆغرەمەچییە) کەسایەتیی هەولێر، ئەندامی ئەنجوومەنی پیاوماقووڵانی سەردەمی پاشایەتی بووە- فوئاد جەمیل.**

**(٢) دواتر ئەم خانووە بووە شوێنی نیشتەجێی ماڵی موتەسەریفەکان- فوئاد جەمیل.**

*** حاکمی سیاسی بەریتانی لە هەولێر**

**ساڵی چاپکردن- ١٩٢١ لەندەن- بەزمانی ئینگلیزی**

**گۆڕینی بۆ زمانی عەرەبی : فوئاد جەمیل، بەغدا ساڵی ١٩٧٣**

**و:هۆشیار محەمەدئەمین کۆیی**




# ڕێگایەک لە کوردستان

**دانەر: ای- ام- هاملتۆن- لەندەن بەزمانی ئینگلیزی**
**گۆڕینی بۆ عەرەبی: جەرجیس فەتحوڵڵا- بەغدا ١٩٧٣**
**گۆڕین و پوختەی بۆ کوردی: هوشیار محەمەدئەمین کۆیی**
**پێشەکیی لەلایەن لیوا هـ- راون- رۆبن نووسراوە**

ڕێگای (هاملتۆن) لە هەولێرەوە درێژ دەبێتەوە و لە بەرزاییەکانی ئێران کۆتایی دێت، لە کارە باش و بەکەڵک و ناوازەکانە، هەردوو گەلی ڕواندز و بەرسرین دەبڕی، کە دوو کۆسپی زۆر ئەستەمن، با ئەو کەسە چاونەترس و جەربەزە بێ، یان کەرەستەکانیشی زۆر باش بن و کرێکارەکانیشی بەتوانا و کارامە بن لە کارەکەی بێگومان تووشی شپرزە دەبێ.


ای- ام- هاملتۆن

میستەر (هاملتۆن) کەرەستەکانی زۆر سادە و ساکار بوو، ئەو تاکە ئەورووپییەک بوو لە ناو کرێکارەکانی، رووخان و لابردنی شاخ و کردنەوەی ئەو ڕێگایە ئەزموونێکی شکۆداری بۆی هەبوو، خۆی بەتەنیا چاودێر و بەڕێوەبەری کاردکان بوو، خۆی خواردنی بە کرێکارەکانی دەدا و کرێی ڕۆژانەی دەدانێ، ئەو وەک سەرۆک و باوک و ئەندازیار بوو، ئەو ڕۆڵی ئەو سێ کارەی بە هەموو لێپرسراوییەکانییەوە

لە ماوەی ئەو پێنج ساڵە بە قرچەی گەرمای هاوین و بە سەرما و سوڵی زۆری زستان، بە گڕ و تینێکی زۆرەوە ئەو کارە مەزنەی ئەنجام دا. خۆشحاڵ بووم بەدیدەنی ئەو لە کاتی کارکردنی لە کوردستان، لەو کاتەی کە ئەو وڵاتە لە شۆڕش و نائارامی دابوو، کورد و عەرەب، کورد و کورد یەکتریان دەکوشت، ژیانی مرۆڤ لە مەترسیدا بوو، لە رێگای (هاملتۆن) رێسا و یاسا پەیڕەو دەکرا، کۆمەڵەی کرێکارەکان ئێرانی و کورد و ئاشووری و عەرەب بوون، کەس ئازاری نەدەدان و بە ئارەزووی خۆیان هامووشۆیان دەکرد. ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ بەڕێوەبردنی سەرکەوتووانەی ئەو، بەرژەوەندی و مافی پیاوەکانی لە سەرووی هەموو شتێکەوە بوو، ئەو رێز و لایەنگرییەی ئەو بووە هۆی سەرکەوتنی لە کارەکانی، جگە لەو پیاوەتییەی لە دڵ و دەروونی پیاوی هۆزەکانی جێ هێشت، کە زۆر دواکەوتوو و دوور لە شارستانی بوون.

**هاملتۆن بیرەوەرییەکانی دەنووسی و دەڵێ:**

لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٨ لە بەڕێوەبەرایەتیی کاری گشتیی عێراق دامەزرام لە فەرمانگەی کاری (دیوانیە) وەک ئەندازیارێک دەستبەکار بووم، هەر لەو شارە هەوڵم دا خۆم فێری زمانی عەرەبی بکەم.

لە ناوەڕاستی هاوینی ئەو ساڵە بۆ کوردستان گواسترامەوە، لەبەرئەوەی حکوومەت سوور بوو لە کردنەوەی رێگایەکی دەرەکی لە سنووری چیاکانی باکووری رۆژهەڵات، کە بە (رێگای رواندز) دەناسرا و لە بەرزاییەکانی ئێران کۆتایی دێت و بەچیای زۆر سەخت تێپەڕ دەبێ، کە بەئەستەم هاموشۆی پێدا دەکرێ. مەبەست لەو رێگایە، بەرقەراربوونی یاسای حکوومەت و سەپاندنی دەسەڵاتی حکوومەت بەسەر هۆزە کوردییەکان بوو، چونکە ئەو ناوچەیە جێگا و شوێنی شۆڕشگێڕەکان و ئەوانەن، کە پێشێلکاری یاسا دەکەن و هەردەم حکوومەت دەربارەی بارودۆخی ناوچەکە دڵنیا نییە.

سەرەتا بە بیرۆکەکە نائومێد بووم، چونکە لە ناوچەی دەشتایی و دیوانیە راهاتبووم، بەهەمەموو کەموکورییەکانەوە، بەڵام کارەکە بۆ خودی خۆی هاندەرێکی باش بوو. نۆکەرەکەم (حەسەن) کوردێکی شاری (تبلیس) بوو، کە لەوپەڕی باکووری وڵاتی کوردستانە، لە سەرەتای دامەزراندنم یاوەرم بوو و لێی رازی بووم و زۆریش دڵسۆز بوو، بەبیستنی هەواڵی گواستنەوەم چاوەکانی گەش بۆوە و دەستی کرد بەگێڕانەوەی چیرۆکی سەیروسەمەرە دەربارەی ناوچە شاخاوییەکانی کوردستان، لە نیشتمانی خۆشەویستی خۆی دڵنیای کردم، کە بەکەشوهەوایەکی خۆش و نایاب دڵشاد دەبم، (حەسەن) باسی هەموو سروشت و شار و بوارەکانی تری کوردستانی کرد و بەراوردی لەگەڵ ناوچە دەشتاییەکان کرد و لە خۆشییان زمانی تێکئاڵا و پێی گوتم: حەز دەکەم بەچاوی خۆت ببینی.

بەڕێوەبەرەکەم لەو کاتەدا لە نزیک (رواندز) بوو بۆ پشکنینی شوێنی پێشنیارکراوی ئەو رێگایە، برووسکەیەکی بۆ لێ دام، کە یەکسەر بەرێ بکەوم، لەبەرئەوە بە سواری شەمەندەفەر بەرەو کەرکووک رۆیشتم، بەو بیرە نەوتانەدا رۆیشتین کە تازە هەڵکەنرابوون، لە دەوراوپشتی کەرکووک گڕی ئەو ئاگرە دیار بوو، کە لە ئاکامی دەرچوونی پاڵەپەستۆی ئەو غاز و نەوتەی ژێر زەوییە، کەسیش نازانی کەی داگیرساوە. لە (کەرکووک) (رائید پیری) (بەڕێوەبەری کارەکانی ناوچەی باکوور) کە بەرپرسم بوو، ئەو ئامۆژگارییانەی کردم: (دەبێ ئەوە بزانێ، کە کرێکارەکانمان مافی خۆیانە، ژیانێکی خۆش ببەنە سەر، دەبێ هەڵسوکەوتی باشی یەکسانیان لەگەڵدا بکرێ، دەبێ تۆش لە کارکردن لەگەڵ کرێکارەکان لە یەک ئاستدا بێت)، ئەو وڵاتە تا ئێستا لە سەردەمی تاریکدا دەژی، بارودۆخی ناوچەکە پەیوەندیی بەکارەکەت هەیە، ژیانی کەساسیی ئەوان بە پلەیەکی کەم لە ژیانی کۆیلایەتی باشترە، ئێمە دەبێ بۆ چاکسازی لە ژیانی ئەوان تێبکۆشین.

هەوڵم زۆر داوە کە رۆژانەی کرێکار بگەیەنمە ١٨ پنس (٧٥ فلس) کە ئەوە پارەیەکی باشە بۆ خواردن و جگەرەیان، بەو مەرجە کە

بازرگانە چلێیسەکان لە ناوچەکانیان نرخی شتومەک بەرز نەکەنەوە، ئێستا من بۆ ئەوە تێدەکۆشم کە قەرەبووی ئەو کرێکارانە بکرێتەوە، کە لە کاتی کارکردن زامدار دەبن و چارەسەری بەخۆڕاییان پێ بدرێ، مووچەی خانەنشینی یان یارمەتی بۆ ژن و منداڵی ئەو کرێکارانە بدرێ، کە لە کارکردن گیان لەدەست دەدەن، بەڵام تا ئێستا بەو هیوایە نەگەیشتم، لە نێوان فەرمانبەرەکان و کرێکارەکانت دادپەروەر بە، هەڵیان مەخەڵەتێنە، دواتر دەبنە هاورێت و فروفیلت لەگەڵ ناکەن.

کاتێ کە بەرێ کەوتین لە شوێنێکی دیاری کەرکووک نابینایەکی سواڵکەرم دیت کە چوارمەشقی لەلایەکی رێگاکە دانیشتبوو و دەستەکانی درێژ کردبوو، و ئەو شوێنەی بۆ خۆی دیار کردبوو، کە زەوییەکی بەردەڵانی رووت بوو، لەو بیابانە بەتەنیا بوو هیچ هاوەدەنگییەک یان گوندێکی لێی نزیک نەبوو، سۆزم بۆی چوو بەیەک رووپیە یارمەتیم دا (دەکاتە ٧٥ فلسی ئەو سەردەم، پارەیەکی باش بوو -و-) ئەویش دوعایەکی زۆری بە زمانی کوردی بۆ کردم و بۆ سەلامەتیی من لە خودا پاڕایەوە. (*) من گوێبیستی هەندێ هەواڵ بووم، کە مرۆڤ پێویستی بە دوعا و پیرۆزیی خودا هەیە، بۆ ئەو کەسەی کە دەیەوێ لە کوردستان بژی یان کار بکا. لە (ئاڵتوون کۆپری)یەوە ٣٠ میلمان بڕی و گەیشتینە هەولێر، ئەو شارە بە ١٢٠ پێ لە دەشتەکەی بەرزترە، وەک پارچە گومەزێکە هاوشێوەی گرکانێکی دامرکاو.

دیواری مەزن بەخشتی سوور دەوری داوە، ئەوە کۆنترین شاری ئاوەدانە لەسەر رووی زەوی، هەولێر بۆی هەیە شانازی بەو کەلەپوورە گەورە بکا، کە شارێکی ئەوها لەسەر ئەو گردە مەزنە کەڵەکە کراوە، پێشتر چەند شارێک خاپوور بووە و هی تری لەسەر دروست کراوە و بەرز بووەتەوە ئاستی ئێستای.

لە گەشتنامەکانی (تەورات)دا هاتووە کە (ئەربێلا- ئەربائیلۆ- چوار خوا) یەکێک بووە لە چوار شارەکانی ئاشوور کە لە کۆنەوە هەبووە، کە ئەوانەن: (ئاشوور، نەینەوا، نەمروود، ئەربیلا)، لەو سەردەمە زیارەتگایەکی ئایینیی لێ بووە، کە پێش سەردەمی ئاشووری هەبووە و لە شارەکانی تر پیرۆزتر بووە، پێش (٣٠٠٠) ساڵ شارەکە بەکۆن دەژمێردرا و پەرستگای خوایەکانی سەردەمی سۆمەری لێ بووە، کەس ناتوانی مەزندەی ئەوە بکا، کە چی شتێکی شاردراوە لە ژێر ئەو گردە هەیە، کە دەگەڕێتەوە چاخی بەردینی دواکەوتوو، لەبەرئەوەی شوێنەکە تا ئێستا ئاوەدانە پشکنینی پاشماوەی تێدا نەکراوە، کە ئەمە کارێکی زۆر قورسە و ئامێری هەڵکەندن و رامالینی باشی دەوێ. هۆکارەکانی مانەوەی بەردەوامی هەولێر بەئاوەدانی هەر لە کۆنەوە بۆ ئاوی کارێزی ژێر زەوی دەگەڕێتەوە، کە داگیرکەر نەیتوانیوە تێکی بدات، وەک جۆگەکانی ئاوەڕۆی (بابل و ئوور) و شارەکانی تری باشووری عێراق، کە دوژمن خاپووری کردن. لەوانەیە بوونی ئەو خوایانەش هۆکارێک بن بۆ پاراستنی. هەولێر پەناگەیەک بووە بۆ (داریۆس) کە بەرامبەر ئەسکەندەری گەورە بەزیوە و رای کردووە، (ئەسکەندەر) بە یەکەم داگیرکەری ئەورووپی بۆ ئاسیا دادەنرێ، ئەو شەڕە یەکلاکەرەوە لە ساڵی ٣٣١ پ.ز لە دووریی چەند میلێکی کەم لە کەناری زێی گەورە رووی داوە و دواتر (ئەسکەندەر) چووە ناو چیاکانی کوردستان. ناوی ئەو داگیرکەرە لە رۆژهەڵات زۆر بەناوبانگە و ئەفسانەی زۆری ئەو دەماودەم دەگێڕدرێتەوە و شوێنی زۆریش بەناوی ئەو کراوە.

دەڵێن سەردەمێک پایتەختی (سەلاحەدینی ئەیوبی) بووە، کە لە سەدەی دوانزەهەم ماوەیەک بەسەر خاچپەرستەکاندا زاڵ بووە، مەگۆلەکان ئەو شارەیان تاڵان کردووە، بەڵام وەک شارێکی نەمر مایەتەوە و نەیانتوانیوە بنەبڕی بکەن. تورکەکان زۆر شتی ئەو شارەیان بەشڕ و وێرانی جێ هێشتووە، چەند رۆژێک پێش ئەوەی بەریتانییەکان داگیری بکەن تورکەکان شارەکەیان جێ هێشتووە و یەک فیشەکیان نەتەقاندووە، لەبەرئەوە یەک بۆمبا نەکەوتە ناو شارەکە، بەرۆژ هەولێر وەک شاخ بە بەرزی دیارە. بەشەو چراکانی وەک چرا وان بۆ ماوەی چەند میلێک دەدرەوشێتەوە. ئەو شارە مێژووییە سەرەتای کارەکانمانە

و ئەو بەربەستە دەبڕین، کە لە پێشمانە ئەویش چیاکانی کوردستانە.

**ڕێگاکە**

لە هەولێرەوە بەرەو شاخەکان بەڕێ کەوتین، کاتی دروێنەی دەغڵ و دان بوو، لێرە پۆشاکی کوردەکان لە هی عەرەبەکان جیاوازە، کێڵگەی کشتوکاڵی زۆرە و لە زستان باران زۆر دەباری، لە کۆنەوە دەشتێکی بەپیتی هەیە، ئامێری جووتکردن زۆر کۆنە و دواکەوتووە، تۆوکردن شێوەکەی هەروەک پێش چوار هەزار ساڵ وایە، شێوازی سەردەمی تازە بەکار ناهێنرێ.

دانەوێڵە پاش بارانی بەهاران بەداس دەدروێتەوە. هەروەک نەریتێکی کۆن کاتێ بەلای کێڵگەیەکی دانەوێڵە کاتی دروێنەدا تێپەڕ بووین. یەکێک لە جووتیارەکان بەڕاکردن بەداسەوە بەرەو روومان هات و بەمەشتی هەردوو دەست گەنمی بۆ هێناین و منیش لێم وەرگرت و هەندێ لە پارەی زیوم پێ دا، ئەو کارە بۆ یەکەم ڕێبوار ئەنجام دەدرێ، بەمەبەستی بەشداریکردن لە خۆشی و شادی یەکەم بەرهەم، پێشتر (حەسەن) لەو نەریتە ئاگاداری کردبوومەوە و گوتی: چونکە تۆ ڕێزی ئەو بەرهەمەت گرت و چاکەت لەگەڵ ئەو نابینایە کرد لە کەرکووک، دڵنیا بە لە کوردستان کامەران دەبێ. کووتانەوەی دانەوێڵە لای کورد ڕێگایەکی هونەریی تایبەتی خۆی هەیە، دەغڵەکە لەسەر زەوییەکی تەخت دادەنرێ، گالیسکەیەک کە لە ژێرەوەی باگردێنێکی لوولەیی هەیە و تیغی تیژی ئاسنی لێ بەرز بوویتەوە، هێستر یان گاجووتێک ئەو گالیسکەیە ڕادەکێشێ و بەسەر گوڵە گەنم یان جۆیەکە دەسووڕێتەوە و دەنکەکە لە گوڵەکە جیا دەکاتەوە و دواتر بە شەن کە وەک چەنگاڵی نانخواردن وایە و کاتی هەڵکردنی بایەکی بەهێز شەنە با دەکرێ و دەنکە دەغڵەکە و کایەکە هەریەکە و لەلایەک کۆ دەبێتەوە و دواتر لە ئەمبار هەڵیدەگرێ، (مەلافەندی)، کە خواپەرستێکی دەوڵەمەندە بڕێکی زۆری لەو بەرهەمە هەیە و خەڵک بەمرۆڤێکی پاک و ژیر باسی دەکەن.

ئەگەر (کلۆ) نەبێ ئەوا دەشتی هەولێر بەسەدان تەن لە دانەوێڵە بەرهەم دەهێنرێ. ئۆتۆمبێلەکەمان بەڕێگایەکی خۆڵاوی تەسکدا تێپەڕی، کە لە نێوان کێڵگەکانی گەنم درێژ دەبۆوە، بەزەوییەکی بەردەڕێیانی ڕک سەرکەوتین تا گەیشتینە باریکەڕێی (خانزاد)، کە سەردەمێک سنووری وڵاتی ئەو شازادە کورد بووە، پاشان سەری ئەم ڕێگایەمان بۆ دەرکەوت، کە مەبەستمان بوو پرۆژەکەی لێ دەست پێ بکەین. دەستم کرد بە لێکۆڵینەوە لە ڕێگا کۆنەکەی لە ژێرمەوە بوو، کە زۆر وشک بوو، بەڵام لە زستان پیادە و ئاژەڵ ناتوانێ بەناویدا بڕوات.

لە بەستۆرە بەو ئۆتۆمبێلە بەکرێگیراوە پەڕینەوە کە جاری یەکەممان بوو، دواتر بەردەوام سەردەکەوتین تا گەیشتینە گوندی (بانەمان) و لەو شوێنە کانییەک ئاوی لێ بوو، دواتر بەڕێگایەکدا سەرکەوتین کە بەردڕێژ کرابوو تا گەیشتینە سەرەوەی چیاکە، لەو شەش کاتژمێرەی ڕابردوو، دوو هەزار پێ بەرز بووینەوە، هەستمان بەشنەبایەکی سارد کرد، کە لە لووتکە دوورەکان بۆمان دەهات، کەواتە ئەوە وڵاتی کوردستانە، تا چاو دەتوانی بۆ باکووری ڕۆژهەڵات بنواڕی چەندین ڕیزە چیات دێتە پێش چاو، کە یەک لەوی تر بەرزترە. کە هەندێکیان تا ئێستا بەفر داپۆشیبوون، لەلای ڕاستمان ڕیزە چیای (سەفین) بەرز بۆوە، کە گوندی (شەقڵاوە) دەکەوێتە لای خوارەوەی، کە دەبووایە ئەو ڕۆژە بۆ ئێوارە بگەمە ئەوێ، لە (شەقڵاوە) کرێکارەکانی ڕێگاکە کاریان دەکرد و خۆم بە بەڕێوەبەری فەرمانگەکەم ناساند، لەگەڵ سەرکردەی کۆمەڵەی ئەندازیاری، تازە لە ڕواندز گەڕابوونەوە. هەر لەو ڕۆژە شەڕێک لە نێوان کرێکارەکانی ڕێگاوبان رووی دابوو، کاتی دابەشکردنی کرێی مووچەی نیوەی مانگ بوو، بەرد و دار و چەقۆیان بەکار هێنابوو. دواتر ئاژاوەکە دامرکابۆوە و بریندارەکان تیمار کرابوون، من کە گەیشتم ئەو ناوە کشومات بوو، یەکەم چاوپێکەوتنم لەگەڵ کرێکارە ئێرانییەکان ئەنجام دا.

(شەقڵاوە) بەپیتترین گوندی کوردستانە و بەرهەمی لە هەمووان زیاترە، کەوتیتە دامێنی چیای

(سەفین)، ئاوێکی تەزی زۆر بەتەوژم لە کانییەکان دەرژێتە سەر زەوییەکانی بناری (سەفین)، کە رووبەرەکەی چەندین میل چوارگۆشە دەبێ و تێر ئاویان دەکا. لە باغەکانی شەقلاوە درەختی چنار و گوێز هەیە، بەرهەمی میوەش: هەرمێ و خۆخ و سێو و هەڵووژە و بەهێ و ترێی بەچێژ و تامی خۆش و بە قەبارەی گەورە هەیە، دار مێو لە دۆڵ و بەرزاییەکاندا پانتاییەکی زۆری داگیر کردووە، ئەو دارە بەرگریی سەرما و گەرما و بێ ئاوی دەگرێ. (شەقلاوە) سالانێکی زۆر شوێنی دووبەرەکی و ئاژاوە بووە، سەرۆکی گوندەکە (قادر ئاغا) بوو، کە بەریتانییەکان بە (هنری هەشتەم) ناویان دەبرد. نەک لەبەر توندوتیژی، بەڵکو لەبەر لەیەکچوونی لەگەڵ تابلۆی (هنری هەشتەم) کە وێنەکێشی (هولبن) کێشاویەتی، کە پەیوەندیم لەگەڵ پتەو کرد هیچ خەسڵەتێکی خراپم لێ نەدیت، گوندەکە زۆربەیان موسڵمانن هەندێ بنەماڵەی دیانیان تێدا هەیە، لە ناوچە کوردییەکاندا گوندی دیانان هەیە، کە لە (دیوانیە) نەبوو، وا پێ دەچێ (شیعە) بە پێچەوانەی کورد کە (سونەن) ئەمەیان لا خۆش نییە.

خێوەتگاکەمان لە فراوانترین باغچەی شەقلاوە دامەزراند، کە لە دوو سەربازگە پێک هاتبوو، یەکێکیان بۆ نووستن ئەوی تریان بۆ بارەگای کاری فەرمانگەکان. بەڕێوەبەری پرۆژەکە باسی کارەکەی کرد و گوتی: کردنەوەی ڕێگاوبان لە کوردستان جیاوازیی زۆری لەگەڵ ناوچەکانی باشووردا هەیە، زۆرجار پێویستمان بەکونکردنی شاخی لایەکی چیا هەیە بۆ درێژکردنەوەی ڕێگا، بۆ پەڕینەوە لە رووبارەکان دەبێ پردی ئاسن دروست بکەین. ئەمە کات و کارێکی زۆری دەوێ، بودجەی پارەش لەوە زۆر زیاتری دەوێ، کە بۆی دەخەملێنرێ، بەڵام بەتەواوبوونی سوودێکی بەردەوامی بۆ دانیشتوان دەبێ. پرسیارم لێ کرد، کە بۆچی ئەم ڕێگایە دەکرێتەوە، لە وەڵامدا گوتی: هۆی یەکەم بازرگانییە و دووەم بۆ چەسپاندنی یاسا و ئیدارەی حکوومەت. کە دانیشتوانی زۆر دواکەوتوون، جگە لە زیادبوونی ئاڵوگۆڕی بازرگانی لە عێراق و کورتکردنەوەی ماوەی گەشت لە ئەورووپاوە بۆ پایتەختی ئێران. ئەو پرۆژەیە لەگەڵ شای ئێران باس کرایە، ئەو پێی رازی بووە، دەبێتە هۆی دامرکاندنەوەی هۆزە کوردییەکان، کە بۆ ئێرانییەکان و عەرەبەکان زۆر گرنگە، کە بەشێک لە کوردستان کەوتیتە خاکی تورکیا و ئێران، شا بەوە رازی بوو، کە ڕێگایەکی تەواوکەر بۆ بەستنەوەی بەو ڕێگایە لە ناو خاکی ئێران دروست بکا و لە چیای (زینی شێخ) لەسەر سنوور نزیک گوندی (رایات) بەیەک بگەن و هەردوولا لە یەک کات دەست بەپرۆژەکە بکەن.

نیاز وا بوو پێشتر ڕێگایەکی هێڵی ئاسنی یەک مەتری شەمەندەفەر دابمەزرێ، ئەندازیارێکی هێڵی ئاسن پێش ساڵێک بۆ ئەم مەبەستە پێوانەی تۆپۆگرافی لە ناوچەکە ئەنجام دا و دیزاینی بەشێک لەو ڕێگایەی تەواو کردبوو، کە ئەو بەشە بوو ئیمرۆ لە هەولێرەوە بۆ شەقلاوە پێیدا، تێپەڕ بووین و نیوەی ڕێگاکە تەخت کرابوو، دواتر پرۆژەکە پشتگوێ خرا، بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کار بۆ ئەنجامدانی پرۆژەکە لێژایی و پێچەکانی تا ریزە چیاکانی سەر سنوور بەشێوەیەکی گونجاو بڕی بوو، ئەوەی لە پێشماندا هەبوو پراکتیکی دیزاینەکان بوو بە کردەوە، لە وڵاتی مەترسی و دەردەسەری (کوردستان). هێڵی ئەو ڕێگایە پێشنیاز کراوە، بەشێوەیەک بەرز دەبێتەوە تا دەگاتە سنووری ئێران، پێنج زنجیرە چیا دەبڕی و بەرزایی دەگاتە ٦٠٠٠ پێ، کەشوهەوا لە چیاکانی باکوور بەراورد لەگەڵ دەشتایی باش و ساردترە، لە زستانی کوردستان لەبەر ساردی کارەکان لە نێوان تشرینی دووەم و شوبات دەوەستێ، تەنانەت ئەو بەشە ڕێگایەی لە هەولێرەوە ئامادە کرابوو کاتی بەفر بارین دەبێتە قوڕ و چڵپاو و هێستر ناتوانی یەک پێ بەناویدا بڕوا. دەبووە هۆی دابڕانمان لە ناوچەکانی تر. پرۆژەکەمان لە ناوچەیەک بوو، کە هەردەم لە ئاژاوە و شۆڕش دابوون، دانیشتوانی بکوژ و خوێنڕێژ و شەڕانگێزن، ڕێگری و دزی و مرۆڤی بەزیانی لێیە، ئەوان بەنەریتی شەڕ فرۆشتن پابەندن، کە مرۆڤ بێزی لێ دەکاتەوە، ئەوانە ژیری و دانایی و وردبینی ریسوا دەکەن، بەڵام گەلێکی دلێر و ئازان مانای ترس نازانن، میوانداری

بەخشندەن، مرۆڤ پێیان ئاسوودە و دڵخۆش دەبێ، لە دادوەری و راستی و رەوشت هیچ میللەتێک نایانگاتێ، رووخساریان گەش و جوان و بەرچاوە، هەردەم شانازی بەشۆخ و شەنگی و گورج و گۆڵی خۆیان دەکەن، ئەوانە هەمووی بۆچوونی دژ بەیەکن.

رێگایەکە تاکە و دڵ و شیوی زۆری تێدایە، گرنگترینیان گەلی رواندوز (عەلی بەگ -و-) و (بەرسرینە)، کە کارلێکردن لەو قوولاییانە زۆر سەختە.

ئەگەر کرێکاری کارامەی بەردەوام و ئامێر و کەلوپەلی گونجاو هەبێ لە هەر شوێنێک بێ شتێکی ئەستەم نییە، بەڵام کرێکارەکانمان بەتایبەتی ئێرانی و عەرەبی ساکارن، نەزانن بەکارپێکردنی ئامێرەکان وەکو: ئامێری کونکردنی شاخ، کە بەپاڵەپەستۆی هەوا کار دەکا و ئامێری باگردێنی هەڵمی قورس، ئەگەر مەشقیشیان پێ بکرێ، ئەوا دەبێتە هۆی شکان و لەکار کەوتنیان، چاکردنەوەی ئەو ئامێرانەش تەنیا لە کارگەی بەغدا دەکرێ، کە ٣٠٠ میل لە ئێمەوە دوورە!، گرووپی کرێکارەکان ئێستا تەور و خاکەناز و نوێڵی ساکاری کانزایی بەکار دەهێنن، پێشنیازی ئامێری تازەمان کرد، بەڵام گەیشتنی چەند مانگێکی دەوێ، چونکە دەبێ لە ئینگلتەرا بێتە بەسرا، کە ٦٠٠ میل لە ئێمەوە دوورە و بۆ کەرکووکیش بەشەمەندەفەر و بۆ شەقڵاوە بەلۆری و بۆ شوێنی کارکردنیشی بەهێستر و وشتر. ئەگەر ئامێری باش هەبێ، ئەوا گەورەترین پرۆژە بە ماوەیەکی کەم تەواو دەبێ.

پەیوەندیشمان بە بریکاری کۆمپانیای (تاج) بۆ کاروباری وڵاتانی ژێردەست بۆ دابینکردنی ئەو ئامێرانە کرد، بەڵام گرفتی زۆرمان هەبوو، لەوانە بودجەی پارە بوو، چونکە خەملاندنی ساڵانەی زۆر ئەستەم بوو، چونکە پابەند بوو بە پێشبینیی بارودۆخی گشتیی ناوەوەی وڵات، کە پێشبینیکردنی شتێکی نادیار بوو. لەگەڵ ئەو هەموو گرفتانە گیانی جەربەزەیی بەسەر بیر و هەستم زاڵ بوو.

دەبوایە برگەی یەکەمی رێگاکە بۆ (سپیلک) درێژ بێتەوە، کە ناوچەیەکی دوور و ناخۆشە و ناوبانگی خراپی هەیە و ٢٠ میل لە شەقڵاوەوە دوورە و رووداوی کوشتن و راووڕووتی زۆری لێ ئەنجام دراوە.

پاش چەند رۆژێک لەگەڵ کاروانێکی بچووک، کە خێودت و ئازووقەمان پێ بوو، بە یاوەریی فەرمانبەرێکی خەڵکی ئەو ناوچەیە و (حەسەن)ی خزمەتکارم و ئاشوورییەک ناوی (گۆرگیس)ە، کە بۆ کاری چێشتلێنان و یاریدەدەرێک بۆ کاروباری خێوەتگاکەم بەرێ کەوتین.

بەسەر رێگای شاخی (میراوە) هەڵکشاین بۆ دۆڵی (باتاس) شۆڕ بووینەوە، لەسەر هێسترەکەم بەشێنەیی سەرنجم لە دەورووپشتم دەدا، لای راستم چیای (هەریر)ە، کە زۆر لێژە، شاخێکی رووتە و درەختی کەمە، لووتکە گەورەکەی پاشماوەی قەڵایەکی کۆنی شازادە (زاد) (خانزاد -و-)ی لێیە. دەڵێن نەخشێک لەو شاخەدا هەیە زۆر کۆنە. بەڵام پیشەی من شوێنەوار نییە، بۆیە بیرم هەر لەو پێچە زۆرانە دەکردەوە، کە بۆ ئەو دۆڵە جوانە دەڕۆیشت و دەگەیشتە رێگا شاخاوییەکی سپیلک.

## خێوەتگامان لە سپیلک دامەزراند

کە گەیشتمە (سپیلک) زانیاریم دەربارەی دانیشتوان زۆر کەم بوو، یەک وشە کوردیم نەدەزانی، بەڵام گیانم بەدیمەنی جوانی چیاکان بووژایەوە، دڵم زۆر خۆش بوو و شادومان بووم بەو کەشوهەوایە سازگارە.

دەگەرام بۆ دەستنیشانکردنی شوێنێک بۆ خێوەتگایەکە، دواتر لە نزیک کانییەک شوێنێکی گونجاومان لە نزیک گوندی (قەلەشین) (راستییەکەی "کەلەکین" د-و-) دۆزییەوە. چاودێرێکم بۆ دامەزراند بەناوی (رەمزی ئەفەندی)، کە پێشتر سەرکردەیەکی شۆڕشی شێخ مەحموود بوو. زمانی ئینگلیزیی نەدەزانی و لە رێگاوبان نەشارەزا بوو. هەوڵم دا فێری وردەکارییەکانی کارەکەمی بکەم. چاودێرێکی ترم هەبوو ئاشووری بوو، ناوی (بنیامین یونان) بوو، لەبەرئەوە دیان بوو، هێزی لیڤی کە ئاشووری بوون کاتی خۆی لەگەڵ هێزی ئاسمانی شۆڕشی شێخ مەحموودیان کوژاندبۆوە، جۆرێک لە

دوژمنایەتی لە نێوان ئەو چاودێرە و رەمزی و موسڵمانەکان هەبوو. بۆیە پرسیارم لە خۆم دەکرد، ئایا ئەو دوو چاودێرە لەگەڵ یەک دەگونجێن، زەویپێوەکە لە تیرەی هیندۆسەکان بوو، نووسەرە فەرمانبەرەکەم دیانی کلدانی بوو، لەگەڵ ئەو تێکەڵاوییە توانیم ١٠٠ کرێکار بەکرێی رۆژانەی بەرز یەک رووپیە (٧٥ فلس-و-) دابمەزرێنم، وەستا و کارسازەکانیش کە زۆربەیان عەرەب و ئێرانی بوون بەرۆژانەیەکی هەندێک زیاتر. شارەزا لە کاری رووخانی ئەرمەنی بوو، دەیگوت لە سوپای تورکی فێر بوویم. هیچ رەگەزپەرستییەک لە ناوماندا نەبوو.

لە هاوینی ساڵی (١٩٢٨) کەشوهەوا لە سپیلک زۆر گەرم بوو، پلەی گەرما لە ناوەراستی رۆژ لە سێبەر (١١٠ پلەی فەهرەنهایت بوو) (نزیکەی ٤٣ پلەی سەدی -و-) ئەوە یەکەم ئەزموونم بوو لە کارکردن لەو پلە گەرمییە، کارەکە زۆر سەخت بوو، هەفتەی حەوت رۆژ کارکردن بوو. لە شارەکانی عێراق رۆژانی هەینی پشووی موسڵمانان بوو، شەممەوان پشووی جوولەکە و یەکشەممەو پشووی دیانان بوو، بۆ چارەسەری ئەو کێشەیە بریارمان دا کار بەو پشووانە نەکەین. هەستم کرد کە پێویستە رۆژێک لە هەفتە بۆ پشوو دابنێم بۆ حەم ا نەوە و دوای نیوەرۆش دوو یان سێ کاتژمێر کاتی هاوین بۆ حەسانەوە بەو مەرجەی قەرەبووی کاتەکە لە بەیانییان یان دوای نیوەرۆ بکەینەوە. لەو ناوە مێشوولە هەبوو لەبەرئەوە حەبی (کینین)م دەخوارد، یان ئاگرێکی چرم بە تەرسی ئەسپ دەکردەوە بۆ ئەوەی بە دووکەڵەکە برۆن و دواتر خۆم دەخستە ناو (کوللە) بۆ نووستن.، دووپشک زۆر بوو لە بنمیچ دەکەوتنە خوارەوە. چەند جۆرێک لە مار و هەژدیها بە قەبارە و رەنگی جیاجیا هەیە، هەندێ جار سەردانی خێوەتەکەمیان دەکرد، کە سەیرم دەکردن بەخێرایی دەخشینە کەلێنی دارەکان یان ژێر بەردەکان.

(گۆرگیس) ناوە ئاشوورییەکەی (جورج) بوو چێشتلێنەرم بوو، خواردنی سەیروسەمەرەی تورکی بۆ ئامادە دەکردم، بیانووی زۆر بوو دەیگوت تەنیا دوو بەرد و تەنەکەیەک نەوتم لەلایە، ئەو یەکێک بوو لەو کەسانەی، کە لەگەڵ سوپای رووسیا لەگەڵ هەندێ ئاشووری لە رواندز راووڕووتی کردبوو، لە بەکارهێنانی چەک پسپۆرە، زمانی ئاخاوتنی هەیە کە لە فارسی و کوردی و تورکی و عەرەبی بوو، لەبەرئەو خواردنە تیژانەی ئەو، کە پڕ بوون لە بەهارات رۆژانە هێلکەی کوڵاو و نانی خۆماڵی سپیی تەندوور و پەنیری خۆماڵیم دەخوارد. دواتر خواردنەکانی باشتر بوو.

(لیڤی) سەربازگەیەکی هەمیشەییان لە (دیانا) کردەوە، کە ٤ میل لە رواندز دوورە و پانتاییەکیش لە زەویی هەیە بۆ نیشتنی فڕۆکە، ساڵی ١٩٣١ بنکەی (لیڤی) هەڵوەشاوە، لەو نۆ ساڵەی رابووردوو بووە گوندێکی گەورەی ئاشوورییەکان. دانیشتوان یارمەتیی زۆری منیان دا، وەستا و فەرمانبەر و لێپرسراوی گەنجینەم لەوان دامەزراند، کە بەراستی بەتوانا بوون.

لە کوردستان خێڵی کۆچەر هەن لە پایزان ناوچەی شاخەکان جێ دەهێڵن و بەرەو دەشتاییەکان دەچن و لە لەوەڕگایەک نیشتەجێ دەبن، هەموو مەڕوماڵات و ئاژەڵەکانیان لەگەڵ خۆیان دەبەن، هەر کەسێکیش رێگایان لێ بگرن بە چەک وەڵامیان دەدەنەوە. رۆژێک شەرێک لە نێوان هۆزی (سوورچی) کە نیشتەجێی (سپیلک)ن و هۆزی (هەرکی) کۆچەر رووی دا، (خدر ئاغا)ی سوورچی و پیاوانی بەشێوەیەکی زۆر باش فیشەکیان لە پەنا بەردەکان دەهاویشت، (خدر ئاغا) نیشانەشکێنێکی زۆر چالاک و باش بوو. هەرکییەکان بە پیاو و ژنەوە بەتفەنگ شەڕیان دەکرد. ژمارەی کوژراوەکان ١١ پیاو و ٤ ژن بوو، دواتر پۆلیسی سوارەی باتاسی گەیشت و شەڕەکەیان راگرت.

زۆرجار خێوەتیان لە نزیک رێگاکانمان دادەمەزراند، کە ئۆتۆمبێلم هێنا بۆ ئەو ناوە، یەکەم جار بوو ئۆتۆمبێل ببینن، سەیریان پێ هات و بەهەڵچوونەوە پێی سەرسام بوون، داوام لە هەندێکیان کرد کە سواری بن.

جارێک کاتی هەڵکەندنی زەوی پەیکەری سەری مردوویەکیان بۆ هێنام. فەرمانەکانمان ئاشکرا و روونە کاتی دۆزینەوەی پەیکەری مردوو لە کاتی کارکردن دەبێ بەشێوەیەکی

شیاو و پەیڕەکردنی دەستووری ئایینی بینێژن.

**(حەمەدەشین)ی ڕێگر**

(کەلەکین) گوندێکە دەکەوێتە سەر ڕێگای (کاروان) لە سپیلک، قەڵای (کانی وەتمان)، کە چۆڵ کراوە نزیک ئەوە و لە پێچکردنەوەی بەسەریدا دەنواڕێ. دانیشتوانی (کەلەکین) بە ئازایەتی ناسراون و شانازی بەخۆیان دەکەن، کە لەگەڵ سروشتی ئەوان دەگونجێ. ئەوانە بەرەچەڵەک و چەند سەدەیەک لەمەوپێش کاری دزی و ڕێگری دەکەن.

خاوە لە ڕێبواری ئەو کاروانانە وەردەگرن، کە لە دوورگەی عەرەبییەوە لە شوێنێکی دوورەوە دێن و بەرەو باکووری ئێران دەڕۆن و بە سپیلکدا تێپەڕ دەبن، دەڵێن سەرکردەی دزەکان بەمەبەستی یارمەتیدانی ئەو کاروانانە دزییان لێ دەکەن، چونکە باریان قورسە و بۆیان سووکتر دەکەن! زۆرجار سامان و پاڵتۆ و تەنانەت پێڵاوەکانیشتان لێ دەستێنن لە بری ئەوەی بەساغ و سەلامەتی لە دوورگەی سپیلک بپەڕنەوە، شوێنی (سپیلک) بەرزە و بۆ چەند میلێک ڕێگاکە دیارە و بازرگان و کاروانەکانیش دەناسرێن. بازرگانەکان تاڵان دەکرێن، بەو مەرجەش ئازاد دەکرێن، کە دەنگ و هەرا بەرپا نەکەن. ئەگەر هێزی چەکدار و فەرمانبەری غەوارەیان لەگەڵدا بوو، ئەوا لە پەنابەردەکانی سپیلک کەمینیان بۆ دادەنێ و لێیان دەدرێ. پێشتر (حەمەدە شین)، کە سەرۆکی گوندەکە بوو، لەو کەسە ستەمکار و لووتبەرزانە بوو بەزەیی لە دڵیان نەبوو، ئێستا شێخێکی بەساڵاچووە و چالاکیی ئێستای کەمترە لەوەی لە سەردەمی تورک هەیبوو. گێڕایانەوە (ئەگەر ڕاست بێ) فێڵبازی ئەو هەندەی تۆسقاڵێک کەمی نەکردووە. (خدر ئاغا)ی کوڕی کە بە ئەفسەری سەنگینی ئەو دادەنرێ، پیلانەکانی باوکی جێبەجێ دەکا، چاودێرە ئاشووربییەکە وەک تفەنگ هاوێژێکی باش لەو شەڕەی نێوان سوورچی و هەرکی ستایشی زۆری کرد.

من ناوبانگی خراپی سپیلکم بیستبوو، بەڵام لەبەر سەرقاڵیی خۆم بیرم لێ نەدەکردەوە. لەبەر کورتبینی و سەربزێوی خۆم خێوەتم لە شوێنێکی زۆر نزیک لەو گوندە دامەزراند، کە بەخراپترین گوندی ناوچەکە دەناسرێ. هاوڕێم (برایسن)، کە ئەفسەری هەواڵگری بووە لە ناوچەکە و شارەزای ڕەوشتی سەرۆک هۆز و کەسانی دیکە هەیە، ئەوەی بۆ نووسیم: وریا بە لەو.... (حەمەد ئاغا) و کوڕەکەی لە گوندی (کەلەکین).

من هەندێ پشکنینم لە ڕێگای فەرمانبەر و کرێکارەکانمەوە کرد دەربارەی ڕەفتاری (حەمەد ئاغا) و هۆزی سوورچی، گوێبیستی ئەوە بووم، کە ڕێگری بوویتە پیشەی خۆیان.

جارێک (حەمەدە شین) لەبەرئەوەی بەخەنجەر لە کەسێکی دابوو، کەوتە ژێر دەستی (نەقیب های)، (خدر ئاغا) ویستی (های) لە تۆڵەی باوکی بکوژێ، هەر لەو ڕۆژەوەش کە باوکی ئازاد کرا، ئەو فیشەکێکی لە پەنجەرەیماڵەکەی لە هەولێر بۆ های هاوێشت و بەرێکەوتێکی سەیر لە مردن رزگاری بوو، ئەویش بە وریایی (لیمنگتن) بوو، کە بێ چەک هێرشی بردە سەری و ئەویش رای کرد.

هاملتۆن ئاماژە بەرووداوی مانگی ئابی ١٩٢٠ دەکا، کە لە گەلی عەلی بەگ بۆسە بۆ های دانرایتەوە و بەسەلامەتی دەرباز بووە و یەکێک لە یاوەرانی کوژراوە و گشت هۆزە کوردییەکان نارەزاییان دەربڕیوە، ئەوەش بەڵگەیە بۆ سۆز و خۆشەویستی ئەوان بۆ های، دەنگۆی ئەوە هەبوو، کە (خدر ئاغا) بەهاوکاریی (نووری باویل ئاغا) ئەو تاوانەیان کردبێت.

لە ڕووداوێکی تر (حەمەدە شین)ی نەگبەت جارێکی دیکە خەریک بووە های تووشی مردنێکی مسۆگەر بکا و دیسان (لیمنگتن) پیلانەکەی پووچەڵ کردیتەوە، لە ڕووداوێکی دیکە (حەمەدە شین) ویستوویەتی (کلارک) کە ناوی (چاپمان)ە لە ناو کوردەکان بە (چەکپو) ناسراوە، لە کۆبوونەوەیەکی ئاشتیخواز ویستوویەتی بەخەنجەر بیکوژێ، بەڵام (چەکپو) وەک برووسکە دەستی گرتووە و نەیهێشتووە.

پێویستم بەئەسپێک بوو بەکرێی بگرم. نرخی کرێی ئەسپ لە

کوردستان بەگوێرەی رەسەنی و جۆری و تەمەنیەتی و دابینکردنی ئالیک یان مەیتەر بۆی، ئەوانە هەمووی کار دەکاتە سەر کرێی ئەسپەکە، کاتێک کێشەیەکم لەگەڵ (حەمەدە شین) هەبوو لەسەر بەکرێگرتنی ئەسپێک لەو، بەڵام رەفتارەکەی زۆر ناشیرین بوو بەرامبەرم و هەرەشەی لەسەر کەمیی کرێیەکە لێ کردم و پێی ریسوا بوو. (حەمەد ئاغا) بە حەسەنی راگەیاندبوو، کە ئەو لە تخووبی ئەو رەشماڵەیان هەڵداوە و بەمیوانی خۆی دادەنێ، دەبووایە بێنە لام بۆ سەردانم، ئەگەر بهاتبایە لام ئەوا قەڵەوترین بزنم بۆ سەردەبڕی و هەنگوینم بۆ ئامادە دەکرد. بەڵام تۆ بەو کرێیە کەمە وەڵامت دامەوە و پێم سووکایەتی بوو بۆ خۆم و گوندەکەم لەبەرئەوە ناچار بووم بەو شێوەیە رەفتارت لەگەڵ بکەم. دواتر بە (حەسەن)م گوت: بە (حەمەد ئاغا) بڵێ من نەمدەناسی، ئەگەر بمناسیبا هەڵسوکەوتێکی وام لەگەڵ دەکرد، کە شایستەی پێگەی ئەو بێ وەک کەسێکی سەرۆک، کرێیەکەش بەرز دەکەمەوە بۆ ئەوەی شایانی پێگەی ئەسپی سەرۆک بێ، ئەسپەکەی بەتەمەنە، بەڵام وەک خاوەنی لە تافی لاوی بەهێزە. من داوای لێبووردنی لێ دەکەم، هۆیەکەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە نەمناسیوە، ئەگەر لەسەر هەڵوێستی خۆی ماوە بۆ بانگکردنم، ئەوا بەسوپاسەوە سەردانی دەکەم. هیوادارم کە هۆزە مەردەکەی پاش مردنی هەردووکمان بەباشی باسی (حەمەدە شین) بکەن، وەک کەسێکی هاوکار و دڵسۆز لەگەڵ بەریتانییەکان و حکوومەتی عێراق و بە پشتگیریی ئەنجامدانی پرۆژەکان باس بکرێ، چەند ساڵێک بۆ (سپیلک) دەهاتم و دەچووم و شەوانی زۆر دەمامەوە و پارەیەکی زۆری کرێی کرێکارەکەشم لەلا بوو، نە خۆم نە پیاوانم تووشی هیچ دزییەک نەهاتین، پەیوەندیم لەوپەڕی باشیدا بوو لەگەڵ (حەمەدە) و کورەکەی (خدر) و گشت پیاوانی گوندەکە. ئەزموونم ئەوەی سەلماندووە، کە برادەرایەتیی بێ گەرد باشترین خەسڵەتی میللەتی کوردە.

**گەلی عەلی بەگ**

لە سەرەوەی (سپیلک) تا رادەیەک لە کارەکانمان سەرکەوتنمان بەدەست هێنا، لەو کاتە فەرمانێکم پێ گەیشت، کە لەگەڵ (فرانک لن) کە پشکێنەری پۆلیس بوو، بچم بۆ ناوچەی رواندز بەمەبەستی دیاریکردنی شوێن بۆ بنکەکانی پۆلیس لە ناوچە شاخاوییەکانی بەرامبەر سنووری تورکیا و ئێران. بەوە دڵخۆش بووم، چونکە ئەمە کاری ئەندازیارە و زیاتریش شارەزای ناوچەکە و هۆزەکان دەبم. ئەو هێزانەی پۆلیسیش بۆ ئێمە پێویست بوو. زۆریش مەبەستم بوو، کە سەردانی حاکمی بەناوبانگی رواندز (شێخ سەید تەها) بکەم: وەک فەرمانبەرێکی حکوومیی هاوکار بۆ کردنەوەی ئەو رێگایە، کە پرۆژەیەکی حکوومییە. هەندێ کەس لە کوردەکان دەڵێن: لەبەر پێگەی ئایینی (سەید تەها) و بنەماڵەکەی کاری سەرسوڕهێنەری هەیە، بە دەست پێداهێنانی بۆ ئەو کەسە و نەمانی دەرد و بەڵای، بەڵام ئەو لای ئینگلیزەکان دان بەوە دانانێ.

ئەو مرۆڤێکی ئاساییە، بەژنی درێژە و شەش پێ دەبێ، دەفەی شانی بەهێزە و جومگەکانی پتەوە، توانای رادەبەدەری جەستەیی هەیە، لە یاری (پولو) تاکە و هاوشێوەی نییە و نیشانەشکێنەکی زۆر باشی ئەم وڵاتەیە، (دەڵێن) لە دووریی ٣٠ هەنگاو بە تفەنگی ئینگلیزی ١٠ جگەرە دەپێکێت. ئەو، تفەنگی ئینگلیزی لە هی رووسی و تورکی پێ باشترە. لە راوی ورچ و بزنەکێوی و بەور ناوبانگی باشی هەیە. هەستم بەمەترسی (سەید تەها) و کاریگەری لەسەر پرۆژەکە کرد، تەنانەت لە توانایدا هەیە کە بمگواستەوە.

رۆژێک بە رێکەوتێکی سەیر لە دەربەندی سپیلک چاوم پێی کەوت و کرێکارەکان پۆل پۆل دەچوون بۆ ئەوەی سڵاو لەو سەرکردە بەناوبانگە بکەن، چەکدار و داورودەستە و وەرگێڕی زۆری لەگەڵ بوو، کاروانێکیش لە کەلوپەل لە بەغدا کڕابوون، ئەو بەمەبەستی گفتوگۆ لەگەڵ شا فەیسەڵ و مەندوبی شکۆداری بەریتانی چوو بۆ بەغدا، بەدەگمەنیش گەشت بۆ شارەکانی باشوور دەکا. سواری ئەسپێکی زۆر رەشی قەبە ببوو، کە نزیکم بۆوە دابەزی و بە ئینگلیزییەکی زۆرباشی سڵاوی لێ کردم. من هەستم کرد بەرامبەر ئەو پەیکەرە دیپلۆماتییە

گەورە رووخۆشە هیچ نیم، ئەو بەوردی چاوی تێ دەبڕیم و بە رەوشتەوە پرسیاری لێ دەكردم و دەیگوت: كارەكە چۆن بەڕێوە دەڕوا؟ كەی دەگەنە رواندز؟ چی خزمەتێك پێویستە بیكەم بۆ ئەوەی زووتر بگەنێ؟ لەوانەیە لە قسەكانی راستگۆ بێ و بەپێچەوانەوەش ئەو ڕێگایەی پێ باش نەبێ لەبەر كەمكردنەوەی دەسەڵاتی لە ناوچەكە، (سەید تەها) پاش سڵاوكردن سواری ئەسپەكەی بوو و رۆیشت. دواتر پەیوەندیم لەگەڵ باشتر بوو و، باشترم ناسی.

جارێك لەگەڵ (نەقیب فرانكلین) و ١٢ پۆلیسی سوارە و بەڕێوەبەری پۆلیسی هەولێر گەشتێكی خۆشمان بە سواری هێستر كرد.

هاملتۆن، بەدرێژی باسی رووباری رواندز دەكا و دواتر تێكەڵبوونی بەزێی گەورە و رۆیشتنی بۆ دەربەندی بێخمەی مەزن.

رواندز شوێنێكی سەیری هەیە، دەڕوانێتە لای رۆژهەڵاتی، گەلی هەروەك سپیلك كە دەڕوانێتە زاركی رۆژئاوای و ١٥ میل لێی دوورە، لە ناو رواندز هیچ ڕێگایەك بۆ كاروان نییە، تەنیا ئەو ڕێگایانە نەبێ، كە بۆ بازاڕی كۆنی شار درێژ دەبێتەوە و بە بەردی لووس بەردرێژ كرایە و زۆر ركە و هێسترەكەم ساتمەی لێ كرد.

رواندز سەر ڕێگای كاروانی توركیا و ئێران بوو و شوێنی كۆكردنەوەی باجی حكوومەت بوو، ئەگەر حكوومەت دەسەڵاتی نەبووایە، ئەوا سەركردە دەسەڵاتدارەكان ئەو كارەیان دەكرد. رووسەكان لەگەڵ كۆمەڵێك لە ئەرمەن و ئاشوورییەكان (گۆرگیسی خزمەتكارەكەم لەگەڵ ئەوان بوو) رواندزیان خاپوور كرد، كە تا ئێستاش زۆربەی خانووەكانی خوارەوەی شار نزیك رووبارەكە تێكچووە و چاك نەكراێتەوە. (گۆرگیس) بە شانازییەوە دەیگوت: دووجار رواندزم ئاگر داوە. لەبەرئەوەی من دەمویست ببمە هاوڕێی كورد، ئاگادارم دەكردەوە كە كەمتر باسی ئەو رووداوە بكا. خانووەكانی زۆر سادە و ساكارن، مەرجی تەندروستییان تێدانییە، ئەو جۆگە ئاوەی بەناو بازاڕی رواندزدا دەڕوا لە ناو ماڵەكان زۆر پیس دەبێ و خۆم یەكێك بووم لەو كەسانەی، كە بەو ئاوە نەخۆش كەوتم، دڵخۆش بووم بەوەی، بیستم پاش ساڵێك بۆڕی ئاوی پاك بۆ خانووەكانی رواندز راكێشراوە.

زۆربەی سەركردەكانی ئەو شارە بەكوشتن لەناو چوون. شارەكە لەبەر شێوەی سروشتی فراوان ناكرێ. زۆر لە ناسراوانی كورد لەو شارە نیشتەجێ بوون، بەرزترینیان لەو سەردەمە (ئیسماعیل بەگ)، كە (نەقیب های) پێش ٩ ساڵ كردبوویە حاكمی شار و تەمەنی ئەو كاتە لە ٢١ ساڵ كەمتر بوو. ئێستا پلە و پایەی حكوومیی نییە، تەنیا ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەران نەبێ.

لە شارەكە (حوزنی ئەفەندی) بەڕێز، كە خاوەنی رۆژنامەی كوردی ئەو ناوچەیە و بە تەنیا خۆی بابەتەكان دەنووسێ و چاپی دەكا و بەدەستی خۆی دەیپێچێتەوە، لەبەرئەوە نموونەیەكی تاكە لە جیهاندا. ئەو رۆژنامەنووسە وەك هەر رۆژنامەنووسێك كە دەیەوێ رووداوی سەیروسەمەرەی لە دەست نەچێ، لەبەرئەوە حەزی كرد لە گەشتەكەمان یاوەرمان بێت، دەفتەرێكی گەورەی تێبینیی پێ بوو، بە قەڵەمەكەی وێنەی پوختی تێدا دەكێشا، كە ئەمە بەڵگەی بلیمەتییەكی گەورەیە.

سەرۆكی شارەوانیی رواندز (محەمەد عەلی ئاغا)یە. ئەو مەبەستی تەنیا كۆكردنەوەی سامانە بەبێدەنگی، لای گرنگ نییە كێ دەبێتە حاكمی رواندز. وا ڕێك كەوت، كە بنكەی خێوەتگام لە نزیك ماڵی ئەو بوو، لەبەرئەوە هاموشۆی زۆر دەكردم و داوای هەندێ شتی تایبەتی دەكرد، كە نەمدەتوانی بۆی دابین بكەم. چەند گەشتێكم بۆ خوێندكارانی قوتابخانەكان ئەنجام دا (ئەوە لە بیر ناكەم كە ئەو خواردنی بۆیان ئامادە كردبوو). رۆژ بە رۆژ پەیوەندیم لەگەڵ پیاوانی شار بەهێزتر دەبوو، دانیشتوانی ئەو ناوچەیە وەكو دانیشتوانی ناوچەی شاخاوی ئسكۆتلەندا بە پارێز و گوشەگیر بوون، بۆ میوانی غەوارە وەك عەرەب رووخۆش نەبوون و خوو و رەوشتیان نەرم نییە. بەڵام من رەفتاری تایبەتمەندیی ئەوانم لە هی ئەوان زۆر پێ رەسەنترە، ئەوەیان بۆ باس كردم كە ئەوانە لە عەرەب رژدترن و بۆ میوانداری بەخشینیان كەمترە، بەڵام بۆ دادپەروەری بەخێرایی ئەو درۆیەم

بۆ ئاشكرا بوو. داهاتی كوردەكان بەهۆی سروشتی خاكەكەیان كەمە، لەبەرئەوە میللەتێكی هەژارن، بەڵام بەرێز و شكۆمەندن.

لەگەڵ ئەنجوومەنێكی پیاوماقووڵانی شار چایە و قاوەمان خواردەوە و جگەرەمان كێشا، دواتر وەڵامی هەندێ پرسیاری رەق و لە هەمان كات دۆستانەم داوە، دواتر (شێخ سەید تەها) هاتە پاڵمان و بەیاوەریی ئەو، دەمە و خۆرئاوا واندزمان جێ هێشت، بەرەو (جوندیان) رۆیشتین كە (سەید تەها) خوانێكی نایابی بۆ ئامادە كردبووین. من بەو پێشوازییە گەرمە سەرسام بووم، كە بە هەستێكی ناسك، بچووك و گەورە بە یەكسانی بایەخیان پێ دەدرا.

كانی (جوندیان) زۆر سەیرە كە من تا ئێستا ئەو چەشنە ئاوەم نەدیوە كە بەخوڕ دێتە دەر و رۆژانە ٥ یان ٦ جار دەوەستێ، ئەو ئاوە لە كونێكی تولّی چیای (هەندرێن) دێتە دەر، كە بەرزییەكەی لە ٨٦٠٠ پێ زیاترە. پاش رۆیشتنی رۆژێك گەیشتینە گوندی (شێتنە) بۆ دیاریكردنی شوێنی پۆلیسخانەیەك، سەرۆكی گوندەكە بەمە دڵخۆش بوو.

ئێستا لە سنووری ناوچەیەكی ترسناكین ئەویش تخووبی دەسەڵاتی (شێخ ئەحمەدی بارزانی)یە، ئەو سەركردەی هۆزێكی تا رادەیەك دەمارگیرە. هیچ كاتێك دۆستی ئینگلیز نەبووە، بەڵام ئەو، ئەو دوژمنایەتییە بەدەر ناخا كاتێ قشڵەیەكی گەورەی پۆلیسخانەمان لە (بلێ) كردەوە، بەوە سەرسام بووم كە (شێخ ئەحمەد) بەو بڕیارە رازی بوو.

لە شێتنەوە بەرەو (كانیی رەش) چووین، كە دووریی ٢٠ میل دەبوو. لە رۆیشتن زۆر ماندوو بووم و گەیشتمە رووباری (بەرازگر)، پێشنیارم كرد پردێك لەسەر ئەو ئاوە دروست بكرێ. لە (شێتنە) و (كانیی رەش) بڕیار درا، كە دوو پۆلیسخانە بكرێتەوە، پەیوەندیی (كانیی رەش) بە (شێتنە) و ئەویش بە (دیانا) بەهۆی (راقمی ئیشك)ەوە، (سیستەمێكی سەربازییە پشت بەئاوێنە دەبەستێ، بەهۆی رەنگدانەوەی ئیشك بۆ لێك تێگەیشتن هەر هێمایەی مانایەكی تایبەتی خۆی هەیە -و-). ١٠٠ هێسترمان ئامادە كرد بۆ گەیاندنی كەلوپەلی دروستكردنی بنكەكان و پارەی كرێی كرێكارەكانمان گواستەوە.

پیاوەكانی هۆزی (بارزان) كە لەو ناوە ترسناكە بوون، لە كاركردنمان لارییان نەبوو، تەنانەت ئاژەڵەكانی خۆشیان بۆ كاركردن بەبێ كرێ بۆ هێناین. دواتر دەمەو ئێوارە گەیشتینە بنكەی لیڤی ئاشووری نزیك گوندی (دیانا).

ئەوانە ئاشووری بوون و سۆزم بۆیان هەبوو، فڕۆكەخانەیەك و ئامێرێكی بێتەلی لێ بوو و بەتەلی دركاوی دەور درابوو، ئەوانە لە رووداوە ناخۆشەكان رزگاریان ببوو و هەندێكیان لە (باتاس) و دەوراوپشتی (كانیی رەش) و شوێنی تر نیشتەجێ بوون. (دیانا) لە سەردەمێكی كۆنەوە گوندێكی دیانانە، زەویی ئەو ناوە خاوەنەكەی (ئیسماعیل بەگی رواندزییە)، بەڵام كوردێكی موسڵمانە و دەرەبەگێكی ستەمكار و زۆردار نییە، لەبەرئەوە جووتیارەكانی و وەرزێرەكانی بەمەبەستی پیرۆزبایی هەموو جەژنان سەردانی دەكەن.

رێگای (بەرسرین) زۆر سەختە، تەنانەت هێستریش ناتوانی پێیدا بڕوا. بەسەر بەرزاییەكاندا رۆیشتین تا گەیشتینە (رایات) و ناوچەی (زینی شێخ) لەسەر سنووری ئێران، كە چیایەكەی ئەو ناوچە ٦٠٠٠ پێ لەسەر رووی دەریاوە بەرز دەبێ، درێژكردنەوەی رێگاكە بۆ ئەو ناوە ئارامییەكی زۆری دەوێ، لەو گەشتە تووشی نەخۆشیی سكچوونی خوێناوی بووم، لەبەرئەوە لەگەڵ (فرانك لن) بۆ چارەسەر چووینە (كەركووك).

قۆناغی یەكەمی رێگاكە، لە بەشی (سپیلك) تەواو بوو. بەهۆی كۆمەڵەی ئەندازیاران دەستمان بەدرێژكردنەوەی كرد بۆ گەلی. كارەكەم بە (بنیامین یونان) سپارد بۆ سەرپەرشتیی كارەكە و من بەمەبەستی فراوانكردن و قیرتاوكردنی ئەو رێگا تەسكەی نێوان هەولێر و شەقڵاوە رۆیشتم.

پرۆژەكەمان ناوبانگی بەهەموو كوردستاندا بڵاو ببۆوە، خەڵك بۆ كاركردن بە كۆمەڵ دەهاتن. لە (پیرمام) ٦٠٠ كرێكارم هەبوو و لەو شوێنە یەك چاودێر یارمەتیی دەدام، كاركردن یەكەم ئامانجمان بوو، خۆم بەكاری ئەندازیاری و پزیشكی و

گۆڕینەوەی پارە و کاری دادگا و لێپێچینەوە لە سەرپێچیکاران بۆ هەموو کرێکار و کارمەندانی تر هەڵدەستام.

چاودێریی دووەمم (سەبری ئەفەندی)، کە یەکێک بوو لە شۆڕشگێڕەکانی شێخ مەحموود، گرنگی لە چاودێری یەکەمم (ڕەمزی) کەمتر نەبوو، چونکە ئاشتی و ئاسایشی لە ناو کرێکارەکان دەپاراست، لەگەڵ ئەوە هەندێ لە پیاوخراپ و کەسانی ناپەسەند (ئەگەر هەلیان بۆ بڕەخسابا) جار هەبوو بە ساختە کرێی ڕۆژانەی یەکێکی تریان وەردەگرت، ئەگەر ئاشکرا بووایە، ئەوا سزای قامچیی لێدانی سووکم بۆ ئەنجام دەدا، باشترین سزا، کە تاقیمان کردبێتەوە نیشاندانی تاوانبارە بەرامبەر هاوەڵەکانی بەو شێوە ناشیرینە، کە ئەوە دەبێتە هۆی نەنگی بۆ ئەو. هەندێ سزای پارەمان بەسەر کۆڵهەڵگرەکان دادەسەپاند، لەبەر تەمەڵی و کەمتەرخەمییان. نەمتوانی خەڵات و پاداشتی ئەو کەسانە بکەم، کە لە کارەکانیان سەرکەوتوو بوون، چونکە ژمارەیان زۆر بوو. لەگەڵ ئەو کارە توندانە لەبارەیان، هەموویان ڕازی بوون و نیگەران نەبوون، ڕۆژێک لە ڕۆژان بیریان لە مانگرتن و دەست لە کارکێشانەوە نەدەکردەوە، لەگەڵ درێژیی ڕێگاکە لە کارکردن گەرمتر بوون و نیگەران نەدەبوون.

بەرهەمی ماندووبوونی چوار ساڵەیان گەیشتن بوو بەدوایین خاڵی ڕێگاکە لەسەر سنوور، حەز و ئارەزوویان لە تەواوکردنی ڕێگاکە و فێربوونی کاری هونەری زۆر بوو، هەرسێ نەتەوە لە کرێکار و کارمەندانم کورد وعەرەب و ئێرانی بۆ میوانداری زۆر بەسۆز بوون.

کوردەکان لە دێهاتەوە بەخەنجەرەکانیانەوە بۆ کارکردن دەهاتن، سەرەتا کاری ئاسانیان پێ سپێردرا و دواتر خۆیان داوای کاری قورس و هونەریان دەکرد. کاتی نوێژکردن چەند جارێک کار دەوەستا، ئێمەش چاومان لەوە دەپۆشی، بەڵام دواتر بۆم دەرکەوت، کە هەندێکیان بە ئانقەست لە نوێژکردن خۆیان دوا دەخەن، بەمەبەستی دواکەوتن لە کارەکانیان، دوایی ئەوانە چاویان لە هاوڕێکانیان کرد و لە کارکردن پێشبڕکێیان دەکرد، کورد وەک عەرەب لە کارکردن پێویستیی بەپێگوتن و هاندان نییە.

کرێکارە عەرەبەکان ژمارەیەکی زۆریان لە هاوین دێن و لە پاییز دەگەڕێنەوە، چونکە زستان لەگەڵ سروشتی ئەوان ناگونجێ. زۆربەیان لە دەوروپشتی مووسڵ دێن و لەو هۆزانەن، کە باری ئابووریان خراپە. ئەوانە ١٠٠ میل دەبڕن بۆ ئەوەی بگەنە سەری ڕێگاکە و کەلوپەلەکانیشیان لە ناو پارچە پەڕۆیەک گرێ دەدا و لەسەری دارێکیان دادەنا و بەسەر پشتیاندا شۆڕ دەبۆوە وەکو گەڕۆکەکانی ئینگلیز. ئەوانە کەسانێکی ڕووخۆشن، لە کورد زیاتر قسە دەکەن و زیاتر حەزیان لە گاڵتەوگەپ و قسەی خۆشە، لە خۆدزینەوە لە کاری قورس زیرەکترن. ئەوانە پێمەڕە دەم بچووکە سەیرەکانیان لەگەڵ خۆیان دەهێنن، کە جێگای پێکەنینە، کرێیان وەک کرێکارەکانی ترە. خەرجییەکانیان زۆر کەمە و پارە زیاتر بۆ کاتی بێکاری لە زستان پاشەکەوت دەکەن، لەبەرئەوە بەهۆی کەمخواردن و برسییەتی تووشی لاوازیی جەستەیی بوون. من هەردەم هانیان دەدەم بۆ ئەوەی خواردنی باش بخۆن، بەڵام بێ سوودە. ئەوەی من توانیم بیکەم، ئامادەکردنی خواردن بوو بەنرخێکی گونجاو. ڕێنومایییان دەربارەی خواردنی باش و باری تەندروستییان دەکەم. دابەشکردنی خواردن بەسەریان بە بڕینی بڕێک پارە لە کرێی ڕۆژانەیان لەبەر پەرت و بڵاوەیان شتێکی ئاسان نییە، عەرەب رقیان لە چیاکانە، لەبەرئەوە کاری هەڵکەندنی خۆڵیان پێ دەسپێرم. ئەوانە بەهاران پاش توانەوەی بەفر دێن. وام لێ هاتبوو کە ئاشنایەتی لەگەڵ هەموویان پەیدا بکەم. جار هەبوو لە یەکێکم دەپرسی کوا فلان؟ لە وەڵامدا بەروویەکی خۆش دەیگوت: (خۆشی بۆ ژیانی ئەفەندی، لە وەرزی زستان کۆچی دوایی کرد). جار هەبوو رقم لێیان هەڵدەستا و پێم دەگوتن: جاری پێشوو پێم ڕاگەیاندن کە مەیەنەوە، کاری هەڵکەندنمان نییە، هەر خۆتان دەڵێن کورد دەمانکوژن و دزیمان لێ دەکەن، باشە بۆ دێن؟ لە وەڵامدا دەیانگوت: تۆ ڕاستی، هەرچەندە هاوارمان لەسەر دەکەی، بەڵام بۆ بەرژەوەندیی ئێمەیە و هیچ

کەسێکیش دزی لێ نەکردین. گرنگترین کرێکارەکانم کوردی ئێرانن، ئەوان بەردەوام کاریان دەکرد و پرۆفیشناڵ بوون لە کارەکانیان و رێگاکەیان بەرنەدەدا، چونکە ماڵێکی تریان نەبوو. هەواڵمان بۆ هات کە کۆمەڵێک لەبەر کاری خراپە گوندەکانیان فەرامۆشیان کردبوون و لێیان بێ بەری بوون، بە عێراقدا بەدوای کاردا دەگەڕان. ئەوانە دوو هەندەی کرێکارەکانی تر کاریان دەکرد و زۆر بە کارامەیی ئاسنی کونکردنیان بەکار دەهێنا، جگە لە بەکارهێنانی نوێل و شتی تر و هەر کرێکارێک لەوانە بارتەقای دوو کرێکار ئەو کارەیان دەکرد، ئەوانە زۆربەیان سەڵت و ژن و ماڵیان نییە، کە بیری لێ بکەنەوە، لەبەرئەوە بەو کرێیە خواردنی باش دەخۆن و ئەوەی دەمێنێتەوە بە قومار و بە حەز و ئارەزووی خۆیان خەرجی دەکەن. کوردەکانی ئێران جلوبەرگی سەیروسەمەرەی بەکار هاتوو (لەنگە)، لەبەر دەکەن، کە دەستاودەست لە ئەوروپاوە بۆیان دێ.

کوردە ئێرانییەکان لە تێکدانی شاخەکان و دروستکردنی پرد پسپۆرن، ئاشوورییەکان بە پلەی یەکەم دێن لە دروستکردنی دیوار بە بەرد و بەردڕێژکردنی رێگا بە وردەبەرد. لە (بانەمان) یەکەم یەکەی ئامێری کارگەمان دامەزراند، لە ساڵی کۆتاییش کۆمەڵێکی گەورەی ئامێری دروستکردنی رێگامان هەبوو.

باگردینێکی هەڵمی و شکێنەرێک و تراکتۆرێکمان بۆ هات. زۆر جار رووداوی ناخۆشمان تووش دەبوو، بریندارمان دەبوو، خۆم برینەکەم دەپێچایەوە و بە ئۆتۆمبێلی خۆم بۆ چارەسەری بەپێی توانا بۆ لای ئەو پزیشکە سوورییەم دەبرد. داوای قەرەبوومان بۆ دەکردن، بەڵام پاش ساڵێک یان دوو ساڵ نزیکەی هەشت جونەیهی بۆ دەهاتەوە.

سندووقێک دەرمانم لە فەرمانگەی تەندروستی بۆ هاتبوو، کاتی پێویست لەو پزیشکە سوورییەی برادەرم لە هەولێر رێنومایییم وەردەگرت.. لەو دەرمانانەی لام بوون: (یۆد، کینین، ترشی بۆریک، ئەسپرین، خوێی ئینگلیزی رەوان، مۆرفین لەسەرم نووسیبوو (ژەهر)، رۆنی گەرچەک، پەرمەنگەناتی پۆتاسیۆم) زۆر کەلوپەلی پزیشکیی دیکە.

لە ژێر خێوەتەکەم شەو خۆم لیستی کرێی کرێکار و کارمەندانم هەناو دووپشک و پێشکە، هەر نیو مانگ جارێ کاتی زۆری دەویست کە ژمارەیان لە ٦٠٠ کرێکار زیاتر بوون، دابەش کرابوون بۆ چەند کۆمەڵەیەک و هەر کۆمەڵەی ٢٠ کرێکار بوون و چاودێرێکیان هەبوو، ئەگەر شتێکیان بزر کردبا، ئەوا لە کرێیەکەمان دەبڕی. ئاردمان لە هەولێر دەکڕی و دابەشمان دەکردە سەریان و دواتر لە کرێیەکەیان دەمانبڕی. بۆیە ئەگەر کرێیەکەیان کەمتر با نارەزاییان دەردەبڕی، ئەگەر زیاتریش با ئەوا بە مافی خۆی دەزانی و بەو بەشەی کە خوا بۆی بڕیتەوە رازی دەبوو (سەبری نەفەندی) ناوی نیوەی لیستەکانی بەکوردی یان بە عەرەبی دەنووسی. لە گەنجینەی دارایی هەولێر پارەی کاغەزی کۆن و رزی و پیسمان وەردەگرت کە مرۆڤ بێزی لێ دەکردەوە.

پێش دەرچوونی پارەی عێراقی، پارەی هیندیمان بەکار دەهێنا کە شڕ و دڕاو بوون، دەیان لەوانە دوو یان سێ پارچە بوون، دەگەڕاین بۆ دۆزینەوەیان و بە رۆخی پوول یان دەبووس پێکمان دەنووساندن و زۆرجار هەندێ پارچەی بزر دەبوو. زۆرجاریش پەڵەی چەوری و مەرەکەب و خوێنی بەسەرەوە بوو.

بەهەرحاڵ دەبوایە هەر جارەی ئەو پارە کاغەزانە بژمێرم، جگە لە چەند هەزارێک لە رووپیەی زیوی و لە جۆری بچووک، ئەو فەرمانبەرە دراوگۆڕە هەولێرییە رەنگ زەرد هەڵگەڕاوە سیلاوییە، کە تا ئێستا هیچ هەڵەیەکی لەمبارەیەوە نەکردووە، بڕوای رەها لە نێوانماندا هەبوو، پارەی پاکیشم بۆ هەڵدەبژێری لەو پارە پیسانەی کە لایەتی، دەیتوانی فروفێڵم لێ بکا، بە کەمکردنەوەی ژمارەی پارە پێچراوەکە بەرامبەر بەئەندازیارێک کە هەردەم سەرقاڵە.

جار هەبوو هەموو پارەکان زیوی دەبوون و ئۆتۆمبێلەکەمی قورس دەکرد، بۆ کۆمەڵەکان دابەشمان دەکرد، ئەوەی باش بوو، کەرتی پارە لامان نەدەماوە. رێنومایییەکان وایان دەخواست، کە هەر کەسەی پارەکە

وەردەگرێ، دەبووایە بەپەنجەی دەستی لە سێ لیست مۆر بکا، کە هەر جارەی دەکاتە ۱۸۰۰ پەنجەمۆر کە مرۆڤ شەکەت و ماندوو دەکا، زۆرجار تا بەیانی دادەنیشتم کە یەک فانۆسم لابوو و بەسەدان کەس بەئارامی چاوەڕێی نۆرەی خۆیان دەکرد.

کاتی باران بارین زۆرجار لیستەکان تەڕ دەبوون. دەبووایە لیستەکان بۆ دیوانی ژمێریاری بنێرین بۆ پێداچوونەوە و پاش ساڵێک یان دوو ساڵ ئەنجامی وردبینەکە دەگەڕایەوە. جارێک ئەو ڕەخنەمان بۆ هاتەوە.: لەبەرچی (کەریم خان) بەپەنجەی دەستی ڕاست مۆری کردووە و کرێی ڕۆژی هەینیشی وەرگرتووە؟ وەڵام: چونکە یەک دەستی هەیە و کارەکەی پاسەوانی (ئەمارە). جارێک لە وردبینیدا هاتبوو، کە ٨ ئانە کەم بوو، کرێکارەکەشی ئێرانی بوو و ڕۆیشتبوو، ناچار بووم خۆم پارەکەم دا. لە دوورەوە دەنگی هاڕەی ئامێری شکێنەرەکان دەهات، پاش ١٢ کاتژمێر لە کەشوهەوایەکی هاوینی زۆر گەرم دەنووستین، بیرمان لە سبەی نەدەکردەوە.

**قووڵاییە**

**مەزنەکەی (گەلی عەلی بەگ)**

لە زستانی ساڵی ١٩٢٨ خۆمان لە خێوەتگای گەلی عەلی بەگ دۆزییەوە و دوو ساڵی تێدا ماینەوە. شکانی ئەو بەربەستە بەهێزە زۆر ئەستەم بوو. لەو دوو ساڵە شتی سەیروسەمەرەمان دیت بۆمان دەرکەوت، کە سەرکەوتنی هەموو پرۆژەکە بەندە بەزاڵبوون بەسەر (گەلی عەلی بەگ). بۆ یەکەم جار بۆ پشکنین ڕێگای کاروان و بزنەکێوی لەسەر دەست و چۆکمان یان لەسەر سک دەخشین، جار هەبوو لە بەردێک بۆ بەردێکی تر بازمان دەدا و زۆر کارێکی ئەستەم بوو، تووشی زۆر مەترسی هاتین. ئەو کاتە هەستمان کرد، کە تا قیکردنەوەیەکی زۆر ترسناک چاوەڕێمان دەکا. ڕۆژێکی باراناوی (ڕائید بیریم) لەو گەلییە بزر کرد تا شەو نەمدۆزییەوە. کرێکارێک ئاو بردی باش بوو خۆی بە بەردێک گرتەوە، جارێک کرێکارێکی تر بەردی لە شاخە بڵندەکان لادەبرد، پێی هەڵخلیسکا و بەرەو ئەو لێژاییە ڕکە گلۆر بۆوە و هەموو جەستە و ئێسقانەکانی شکا بوو و هاوڕێکانی تەرمەکەیان ناشت. لەگەڵ ئەو ڕووداوانەش کارەکە بەباشی بەڕێوە دەچوو.

پێش هاتنی زستان و گیرانی ڕێگاکان بە بەفر (سوجان سنغ) کە سەرپەرشتیارێکی هیندی بوو لە شوێنی خۆم دانا و بەرەو ڕێگای (بەرسرین) ڕۆیشتم، بۆ ئەوەی رووپێوی ئەو ڕێگایە تا سنووری ئێران ئەنجام بدەم. ئەم گەلییە زۆر سەرسوڕهێنەر و قەشەنگە، بەڵام لە گەلی عەلی بەگ کراوەترە، شوێنەکە زۆر خۆشە و دەڵێی بەهەشتە. ماسیی ئەو ڕووبارە زۆر بەتامە، بەڵام ئێسقانی زۆرە. گەیشتینە شوێنێک، کە شای چیاکانی کوردستان (هەڵگورد) بە بڵندی ٢٤٩.١٢ پێ دیار بوو، کە بە بەفری زستان داپۆشرا بوو.

لە (ڕایات) (عەلی ئاغا)، کە پیاوێکی بەساڵاچووی بەڕێزە، لەو کاتەی کە بەفر دەباری پێشوازیی لێ کردین، لە دیوەخانی ئەو نانمان خوارد و چایە دابەش کرا، دەورمان لە سۆپایەکی گەرمکراو بەداری بەڕوو دابوو، کە هەواڵی منی ئەندازیار لە گوند بڵاو بۆوە، زۆر کەس هاتن. لەوانە: فەرمانبەری گومرگ و بەڕێوەبەری قوتابخانە و (شێخ عەلائەدین) سەرۆکی گوندەکەی نزیک ڕایات، (باشچاوەش) کە بەپەلە بەرگە فەرمییەکەی خۆی لەبەر کردبوو.

لە پشتەوەی (ڕایات) گردێک هەیە پێشتر بنکەی سوپای رووسی بوو، قەبرێکی زۆری ئەو سەربازانەی لێیە، کە لە پاشەکشێی ڕواندز کۆچی دواییان کردووە. لەبەرئەوە لەو گوندانە لامان داوە و لێی ماینەوە، کە گەڕامەوە گەلی عەلی بەگ فەرمانم دا، کە خواردن و شوێنی مانەوە لە خێوەتگایەکەم بۆ هەموو ڕێبوارێکی کورد فەراهەم بکەم.

کارەکان لە (گەلی عەلی بەگ) شەو و ڕۆژ بەردەوام بوو. ژمارەی کارمەندەکان لە کۆتایی پاییز گەیشتە نزیکەی ١٠٠٠ کەس، ئەو ژمارە لە وەرزی زستان کەمتر دەبۆوە. کرێکارەکان شارەزایی باشیان پەیدا کردبوو، بۆ هاوینی داهاتوو ئامێری کونکردنی گونجاو و پارچەکانی پردی ئاسنمان لە ئینگلتەرا بۆ هات و کارەکانمان زۆر پێشکەوت.

بۆ کونکردنی بەردێک دەبێ دوو

کرێکار رۆژێکی تەواو بەکونکەرێکی پۆڵا کار بکەن، کونەکە دەبێ ٣ پێ قووڵ بێ، دواتر بەتەقەمەنی پڕ بکرێتەوە، دواتر فتیلەی بۆ دروست بکرێ و ئاگر بدرێ و بتەقێتەوە و پارچە بەرد و شاخ بەئاسمان بڵاو دەبۆوە و زەوی دەلەرییەوە، کارێکی ترسناک بوو، کرێی رۆژانەی ئەو جۆرە کرێکارانە زیاتر بوو.

لە خانووە قوڕەکەم لە گەڵی عەلی بەگ بوو لە ژێرەوەی قاسەی پارەم بە بەردێکی لە ناو زەویی چەقیو بەزنجیرێک بەستبۆوە و خانووەکە دڵۆپەی دەکرد، خانووەکەی تەنیشتم چەند تەنێک لە (جنکلایت)ی لێ بوو کە بەیەک فیشەکی دوژمن دەتەقییەوە، ژوورێکیش بۆ ئەو پۆلیسانە بوو، کە (سەید تەها) ناردبووی، گرتووخانەیەکیشمان هەبوو بۆ بەندکردنی ئەو کرێکارانەی، کە تاوانیان دەدرا پاڵ و دواتر بۆ رواندزمان دەناردن. خێوەتگای کرێکارانیش جیا بوو.

من بۆ چوونە هەولێر هێسترم بۆ هێنانی پۆستە و کرێی کرێکارەکان بەکار دەهێنا، کە سێ رۆژی دەخایاند، ئەگەر باران با، زیاتری دەخایاند. زۆر جار لە رێگا ئاو هەڵدەستا خۆم و نوێنی گەشتم دەبرد، لە چایخانەیەکی رێگا دەمامەوە و پارەی کرێی کرێکارەکانم لە ژێرەوەم دادەنا و لە ناو دووکەڵی ئاگر و مێشوولە و لە نزیک ئاژەڵ نووستن زۆر ئەستەم بوو. دەمانچەکەم سوار دەکرد و لە نزیک دەستم دادەنا و ئامادە دەبووم بۆ هەر رووداوێکی لە



سەید حوزنی ئەفەندی، فرانسز همفریز (المندوب السامي لحكومة صاحب الجلالة في العراق) و ئیسماعیل بەگی رواندزی لە خواردنگەی لیڤی لە دیانا ساڵی ١٩٣٢

ناکاو، بەڵام تا ئێستا لە ناو کوردەکان دڵنیا بووم.

لە جەژنی سەری ساڵی ١٩٢٨/١٢/٢٥ بریارمان دا دەست لەکار هەڵگرین و بەم بۆنەیەوە بۆ ئاهەنگگێڕان بەرەو هەولێر گەڕاینەوە.

**بەفر دەتوێتەوە**

لە کۆتایی ئادار بەفر دەتوێتەوە و کەشوهەوا گەرم دەبێ و گوڵی جوان بەدەردەکەوێ. لەوانە: نێرگز کە لە نزیک (کانیی وەتمان) زۆرە و گوڵی دەشتەکان جیاوازیی لەگەڵ گوڵی ناو چیاکان هەیە، لە زەوییە کێڵراوەکان گوڵ بەبڕێکی زۆر بەدیار دەکەوێ، مرۆڤ وا هەست دەکا، کە لەسەر مافوورێکی پڕ لە گوڵی بچووک دەڕوا.

کورد زۆر بایەخ بە گوڵ و سەوزە دەدا و دڵی پێی خۆش دەبێ، بەتایبەتی لە بەهاراندا. هەندێ

شتڵی (یۆکالیبتۆس)م لە خیوەتگایەکەم چاند.

**ئەشکەوتی کۆسپە سپی**

لە پایزی ساڵی ١٩٢٨ رووپێوی گەلی بەرسرینم تەواو کرد، چەند هەفتەیەک لە بنکەکەم دوور کەوتبوومەوە و لە نزیک گوندە کوردییەکان خێوەتم هەڵدەدا، شەوێک لەگەڵ سەرۆکی گوندی (بەرسرین) (عەزیز ئاغا) دانیشتم و گفتوگۆی زۆرمان لە بابەتی هەمەجۆر کرد و من پرسیاری ئەو ئەشکەوتە مەزنانەی کوردستانم لێ کرد، ئەویش بەڵێنی پێ دام، کە بۆ ئەشکەوتی (کۆسپە سپی)م، ببات کە لەسەر ئەو رێگایە نزیکە و بۆ پشکنینی چووینە ناو ئەشکەوتەکە.

(سەید حوزنی ئەفەندی) مێژوونووسی کوردی یەکەم کەس بوو، کە پێی راگەیاندم کە لە سەرچاوەکان خوێندوویەتییەوە، ئەشکەوتێکی گەورەتر لە (کۆسپە سپی) لە چیای (برادۆست) هەیە، چیرۆکی سەیری تێدا رووی داوە. ئەو وەک رۆژنامەنووسێک تابلۆیەکی مسی لەبەر دەرگاکەی هەڵواسراوە و تێیدا نووسراوە (زاری کرمانجی). ئەوە ناوی رۆژنامەکەیەتی کە خۆی سەرپەرشتیار و نووسەری سەروتارە توندەکەیەتی، کە دەربارەی کارەساتەکانی میللەتی کوردە، پیتەکانی چاپ لە دار بەرووی ناو چیا دروست دەکا، بەنەخش و نیگار رۆژنامەکەی دەرازێنێتەوە، خۆی چاپخانە ساکارەکەی بەرێوە دەبا و رۆژنامەکەی چاپ دەکا و دەیپێچێتەوە وەک گۆڤارێکی مانگانە، دانەیەکی بۆ (مەندوبی سامی) و یەکێکی تریش بۆ بنکەی (کۆمەڵەی گەلان) لە (جنێف) دەنێرێ. بە گۆڤاری مانگانە ناودەبرێ، بەڵام راستییەکەی بڵاوکراوەیەکی بچووکە، زۆر جار بەهۆی رووکاری کوردایەتیی فەرمانرەواکانی بەغدا، کە ئەوان پێیان باش نییە رایدەگرن. بەجلوبەرگی کوردی و پشتێندە سەوزەوەی، کە ئاماژەیەکە بۆ گەرانەوەی بۆ (پەیامبەر). ئەو ئەفسانەکانی ئەشکەوتی (جوندیان) و (برادۆست)ی بۆ کردم.

هاملتۆن... بەدرێژی باسی راوی بزنەکێوی دەکا.

**کارەکانمان لە**
**(گەلی عەلی بەگ) تەواو کرد**

بەهاتنی هاوینی ساڵی ١٩٢٩ دڵنیا بووم لەوەی، کە هەموو هۆیەکانی کار و ئامێرەکانمان ئامادەیە بۆ ئەوەی بەرەو پێشەوە بچین بۆ برینی گەلی رواندز، هۆزەکان و کەسانی تری ناوچەکە حەزیان لە کردنەوەی رێگاکە دەکرد، بەڵام لەبەر سەختیی گەلییەکە گومانیان هەبوو، کە ئێمە بتوانین ئەم کارە بکەین، پێیان وا بوو لە کارەکەمان پاشەکشێ دەکەین. لە رێگای کەرکووک-هەولێر لە ناوچەی هۆزە کوردییەکان رووداوی رووتکردنی ئۆتۆمبێلەکان رووی دا و دوو شوفێر بەناڕەوا لەلایەن دزەکان کوژران.

بەکارکردنێکی بەردەوام توانیمان بگەینە دووریانی باڵەکیان. گەلی عەلی بەگ وەک فابریخانەی لێ هاتبوو، هەریەکە بەکارێک خەریک بوو.

دانانی پرد کێشەیەک بوو بۆ ئێمە کە پێویستمان بە پێنج پرد هەبوو دەبووایە پارچەکان بگاتە ئێمە.

لە بەهاری ساڵی (١٩٣٠) ماندووبوونمان بەسەرکەوتن کۆتایی هات. سیمێکی ئەستوورمان لەسەر رووباری باڵەکیان دانابوو بۆ گواستنەوەی کەلوپەل تا پردەکە دادەنێین، کە قورسایی ١٠ تەن دەبوو. یەکەم ئۆتۆمبێل گەیشتە ئەو ناوە. دواتر بەکارکردنێکی بەردەوام پردە ئاسنینەکە لەسەر دوو پێچکەی کۆنکریتی دانران و رێگاکە تا (جوندیان) تەواو بوو.

**دوو تۆڵەسەندنەوە لە رواندز**

سێ ساڵ پێش ئێمرۆ یەکەم خێوەتگامان لە (سپیلک) نزیک (کەلەکین) دامەزراند. ئێستا کارەکەمان لە رواندز دوورە و لە دوا قۆناغەکانین. ئێمە ئەوە دەزانین، کە رۆژی تەواوبوونی رێگاکە دەکەوێتە رێکەوتی رۆژی کۆتاییهاتنی نوێنەرایەتیکردن (ئینتیداب).

خزمەتکارەکەم (حەمید) پێی راگەیاندم، کە (ئیسماعیل بەگی رواندزی) دەڵێ: رۆژی هەینی دێمە لای بۆ سەردانی و سەیرکردنی رێگاکە، منیش گوتم: هەر کاتێک هات خۆشحاڵم بە دیدەنی (ئیسماعیل بەگ).

(ئیسماعیل بەگ) کاتی خۆی بەدەسەڵاتترین سەرکردەی رواندز بوو. چەند ساڵێک بوو نوێنەری ناوچەکە بوو لە پەرلەمانی عێراقی،

لە باب و باپیریەوە زەویی ئەو ناوچەیەی بۆ ماوەتەوە، بەریتانییەکان ئەو زەوییانەی ناوچەی (دیانا)یان لێی بەکرێ گرتبوو بۆ فرۆکەخانە و نیشتەجێی هێزی (لیڤی). لەلایەن کورد و ئاشوورییەکان ریزی لێ دەگیرێ. (ئیسماعیل بەگ) لایەنگری یاسا و ریسا بوو. دوودڵ نەبوو بە دامرکاندنەوەی سەرکێشی هەر هۆزێکی سەرپێچیکەر بەرامبەر حکوومەت و (ئینتیداب). دەسەڵاتی خۆی بەکار دەهێنا بۆ دڵنیاکردنی میللەتەکەی دەربارەی سوودی ئەو ریگایە بۆیان. بەڵام ئەو بەکۆتاییهاتنی (ئینتیداب) نیگەران بوو. لەبەرئەوە کە میوانی دەبووم لە رواندز تێبینیی ئەوەم کرد، کە پاسەوانی تایبەتی بەهێز لە لایەنگرانی هەردەم لێی جیا نابنەوە. لەگەڵ ئەوە من سەرسام بووم، کە مرۆڤێکی بێ فیزە و ئەو پاسەوانانەش لەگەڵ حەز و ئارەزووی ئەو ناگونجێ. ئەو خۆشەویستە و پێویستیی بەو پاسەوانانە نییە، هەستم کرد کە ترسێکی نادیار لە ناو مێشکی ئەو کوڕە جوامێرەدیە، لە (حەمید)م پرسی جۆری ئەو ترسە چییە؟ لە وەڵامدا گوتی: (ئیسماعیل بەگ) فەرمانی مردنی بەسەر دراوە لەلایەن (نووری باویل ئاغا)ی رواندزییەوە. پاسەوانێکی خۆم بەناوی (سلێمان بەگ) لەم بارەیەوە گوتی: من لە لایەنگرانی (ئیسماعیل بەگم)، بەڵێ ئەمە راستە و بەدەستی (نووری) دەکوژرێ، من و هەموو کۆمەڵەی (دەرگەڵە)، کە پاسەوانی خێوەتگاکەتین لەوانەیە تۆ ئاگادار نەبیت، کە پێشتر فەرمانمان لەلایەن (ئیسماعیل بەگ) پێ دراوە، کە تۆ و پرۆژەکەت بپارێزین. هاملتۆن دەڵێ: ئەمە راستە من لەم بارەیەوە بەڵگەم هەیە، کە لە زۆر رووداو بەهانام هاتین.

لە ساڵی ١٩١٨ (سەعید بەگ) باوکی (ئیسماعیل بەگ) لە باتاس کوژرا، کە ئەوکات ئیسماعیل بەگ هەرزەکار بوو، پەنجەی تاوان بۆ بنەماڵەی (باویل ئاغا) درێژ کرا.

((درێژەی ئەو باسە لە گەشتەکەی کاپتن های نووسراوە)).

**کارەساتی سەرکردەیەکی کورد**

ئیسماعیل بەگ کە دەهاتە لام میوانێکی روح سووک بوو، جارێک لێی پرسیم: ئایا دەتوانی، کە لە مۆڵەتەکەت لە بەریتانیا گەرایەوە ئامێرێکی رادیۆم بۆ بهێنی؟ دەڵێن ئێستگەی زۆر لە ئەوروپا و تورکیا و رووسیا هەیە، من زۆر حەز لە گوێگرتنی ئێستگە ئینگلیزییەکان دەکەم، چونکە ئەو زمانە دەزانم و دەتوانم بەدواداچوون بە هەواڵەکاندا بکەم و گوێش لە میوزیکی رۆژئاوا بگرم، بەتایبەتی کە ئێستا ئەو زانستە زۆر پێشکەوتووە، ئەوەت لێ ناشارمەوە، کە زۆربەی کاتەکانی شەو بەشەونخوونی بەسەر دەبەم، لەبەرئەوە ئەو ئامێرە بۆ من خۆشی و ئاسوودەییە. کە مۆڵەتەکەم تەواو بوو و گەرامەوە بنکەکەم لە گەلی (بەرسرین) رادیۆیەکم لەگەڵ خۆم هێنابوو، بەڵام هەندێ تەگەرەی لە کارکردن هاتە پێش، بۆ ئەوەی کار بکا سێ (ئەنتینا)ی هەوایی کورتم لەسەر خانۆچکە قوڕەکەم دانابوو، یەکێکی تریشم بەسەر رووبارەکە پەڕاندبۆوە تا دار بەڕووە بەرزەکە، ئەوی تر هەزار پێ درێژ دەبوو، کات لە کۆتایی وەرزی هاوین بوو، پیلەکانی وزەیان دابەزی بوو، لە وزەی کارەبای ئۆتۆمبێل پروزەمان دەکردەوە. کاتێ ویستم کاری پێ بکەم، (ئیسماعیل بەگ) لە نزیکمەوە بەسەرسامی و ئارەزوو ورد ببۆوە. پاش تاقیکردنەوەیەکی زۆر بۆم دەرکەوت، کە شەپۆلی کورت لەو کەشوهەوایە لە شەپۆلەکانی تر بەهێزترە، توانیمان هەموو ئێستگەکانی ئەوروپا وەربگرین، جگە لە ئێستگەی (لەندەن ناشناڵ). لە شەوانی درەنگ، کە کەشوهەوا بێ گەرد دەبێ و ئێستگەکانی تری ئەوروپا دەوەستن، ئەو کاتە بەباشی گوێبیستی ئێستگە ئینگلیزییەکان دەبین، کە نزیکترینیان (لەندەن ناشناڵ)ە، ماوەکەی لە ٢٠٠٠ میل کەمتر نییە.

کاتژمێرەکەم لەسەر دەنگی لێدانی کاتژمێری (بگ بن) چاک دەکرد. بەهۆی برادەرێک توانیم راپۆرتێک دەربارەی شەپۆلی پێنجی کورت بۆ ئێستگەی بەریتانی بنێرم. سەیروسەمەردش لەوە بوو، کاتێ کە میلی رادیۆکەم دەگەڕاند گوێبیستی دەنگی دوو کەس دەبووم، کە لە (لەندەن) و (سیدنی) لەگەڵ یەک بەتەلەفۆنی بێتەل قسەیان دەکرد، کە هەواڵی ئەم سندووقە سەیرە بڵاو بۆوە کوردەکان لە دوور و نزیکەوە دەهاتن بۆ بینینی و گوێ لێگرتنی.

(ئیسماعیل بەگ) رادیۆکەی بردە رواندز و خۆم چووم بۆ دامەزراندنی و دواتر رادیۆکە لە کار کەوت، لەو شەوانەی رادیۆکە کاری نەدەکرد ئیسماعیل بەگ باسی کاروباری میللەتەکەی و ولاتەکەی دەکرد، تێبینییەکانی، کە لە پارچە کاغەزێک تۆمار کردبوو لە ناو باخەڵی دەردەهێنا و دەیگوت: بەیارمەتیی ئێوە پێش دەکەوین و دەبێ ئێوەش هانی ئەو پێشکەوتنە بدەن. پێویستە کوردستان لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست، وەک سویسرا وا بێ لە ئەوروپا. ئێمە لەسەر سێ ولات دابەش کراوین. من دەربارەی زۆر بەشی جیهان بابەت دەخوێنمەوە و ئەو تێبینییانە تۆمار دەکەم، کە کوردستان پێویستی پێی هەیە، ئەوەش ئەو شتانەیە، کە تۆمارم کردووە: خەستەخانە و قوتابخانە و پرۆژەی پیشەسازی، نەوەی چاکراوی باشی مالات بۆ ئەوەی خوری و گۆشتی باشتر بێ، پێویستە کارەبا لە رووبار و تاڤگەکان بەرهەم بهێنرێن، پێویستمان بەچاکسازی لە بواری رستن و چنین و دروستکردنی مافوور هەیە، بۆ ئەوەی پێشبرکێ لەگەڵ بەرهەمی مافووری ئێرانی بکەین، پێویستە پرۆژەی ئەماری ساردکردنەوە و بەستن بۆ گۆشت و میوە دابمەزرێنین، چونکە لە کەژی خۆی بەرهەمیان زۆر دەبێ، پرۆژەی ئاودێری گەورە سوودی بۆ ئێمە و ئاشوورییەکان دەبێ، ئەگەر لە ناوچەکانی ئێمە مانەوە، دەبێ چاکسازی لە کشتوکاڵ و میوەی باغەکان بکرێ، ئێمە تووتن بەرهەم دەهێنین، کە داهاتێکی گرنگی جیهانی ئیمرۆیە.

بۆی هەیە کوردستان بەیەکەم ولاتی ئاسیا دابنرێ، ئەگەر لە هەمووان جوانتر نەبێ، (لێرە سەیری کاغەزێکی تری کرد)، گەشتیارەکان لە ولاتانی دوورەوە دێن بۆ ئەوەی بەدیمەنە سروشتییەکان شاد بن، جگە لە حەز و ئارەزووی راوکردن و سەرکەوتنی چیا و وەرزشی دیکەی زستان، زۆریش سەرسام دەبن بەگوڵ و گوڵزاری بەهاران. تۆ ئێستا دەتوانی بە دوو یان سێ رۆژ لە دەریای سپیی ناوەڕاستەوە بگەیە کوردستان. ئێمە ناتوانین ئەم کارانە بە هەنگاوێک ئەنجام بدەین، تا ئەو کاتەی بەشێک لە داهاتی نەوت بۆ یارمەتیمان تەرخان نەکرێ، لە بری ئەوەی لە شەڕی ناو ئەو شاخانە بەکار بهێنرێ و قین و رق لە گیانی کورد بچێنرێ، ئەوەش لە بیر نەکەی، کە کێڵگە نەوتەکانی عێراق لە کوردستانن (ئەو سەردەمە نەوت تەنیا لە کوردستان دۆزرابۆوە -ج-)، مافی خۆمانە کە داوای بەشێک لەو داهاتانە بکەین، بەلام ئەوەی لەو داهاتە وەریدەگرین فیشەک و تەقەمەنییە. ئەوە نموونەیەک بوو لەو گفتوگۆیانەم لەگەڵ ئەو. بۆچوونی ئەو لاوە کوردە خانەدانە رواندزییە لەوانەیە بەرهەمێکی باشی لە ولاتەکەی هەبێ، ئەگەر بوارێکی باشی بۆ بڕەخسێ بۆ گەشەکردنی، بەلام مەترسی هەردەم سەری لێ هەڵنەدەگرت، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو سەرقاڵی تێڕوانینی شێوازی ژیانی میللەتانی دیکە و پلاندانان بۆ پێشکەوتنی ولاتەکەی، ئەو رەخنەی لە حکوومەت دەگرت، کە پشتگیری لە دەست هەڵگرتنی پێشینەی حکوومەتی شکۆداری بەریتانیا دەکرد لە عێراقدا، چونکە ئەمە هەمبەرێکە لەگەڵ پێشنیازەکانی ئەو ناگونجێ، جگە لە رێسا و یاسا دواکەوتووە سەرەتاییەکەی، کە میللەتەکەی (کورد) پەیڕەوی دەکا.

(نووری) بەرامبەر نێچیرەکەی ئارامی گرت، چونکە چاوەڕێی سزادانی ئیسماعیل بەگی دەکرد، لەلایەن حکوومەتی ئینتیدابەوە. لەبەرئەوە کوشتنی ئەوی بۆ دوای ئینتیداب جێ هێشت.

زۆرجار ئامۆژگاری (ئیسماعیل بەگ) دەکرا، بەوەی کە ولات جێ بهێڵێ و لە ئەوروپا بژی و پشت بەو سامانە زۆرە ببەستی، کە هەیەتی، ئەو ئەمەی رەت کردەوە و وەک خۆ بەزل زانینێک گوتی: وەک کوردێک چیاکانی ولاتەکەم لە هەموو ولاتێک خۆشترە، ئەو میللەتە دواکەوتووەی من لە هەموو میللەتێکی سەر رووی زەوی باشترە، بەو شێوەیە ماوە و ژیا و چەک لێی جیا نەدەبۆوە. لە ساڵی ١٩٣٢ (ئینتیداب) کۆتایی پێ هات و یەک رۆژ پاشتر کاتێ ئیسماعیل بەگ لە شەقامەکانی هەولێر دەڕۆیشت کوڕێکی (نووری) لە نزیکەوە فیشەکێکی بۆ هاویشت و شەویلکی شکاند و خوێنێکی زۆری لێ رۆیشت، بکوژەکە وای مەزەندە کرد کە گیانی لەدەست دا، بەلام (ئیسماعیل بەگ) پاش چەند هەفتەیەک لە مانەوە لە خەستەخانە چاکبۆوە و کوڕەکەی نووریش بەچەند

ساڵێک بەند کرا.

ئەو رووداوە و دەستگیرکردنی کوڕەکەی (نووری) تووڕەیی و قینی زیاتر بوو، سوێندی خوارد، کە کوشتنی (ئیسماعیل بەگ) دەبێ بەدەستی خۆی بێ. لەگەڵ ئەو رووداوەشدا (ئیسماعیل بەگ) بەردەوام جێهێشتنی کوردستان و ژیان لە تاراوگەی بە مەبەستی سەلامەتی رەت دەکردەوە. بەوەش نەوەستا شتێکی خراپی کرد، کە هێشتا بەهۆی برینداربیەکەی لاوازی و بێ هێزی پێوە دیار بوو، هەولێری جێ هێشت و بەرەو رواندز بەیاوەریی پاسەوانە چەکدارەکانی خۆی کەوتە رێ. ئەو ئاگاداری ئەوە نەبوو کە (نووری) بەرگی کۆمسپێری پۆلیسی داکەندووە، کە پێشتر ئەو پۆستەی پێ سپێردرا بوو: بەخۆی و بەو پیاوە چەتانەی پێشووی هۆزی سوورچی لە گەرووی (سپیلک) بەمەبەستی کوشتنی ئەو لە بۆسە خۆیان مەڵاس داوە. یەکەم جار ئۆتۆمبێلی فەرمانگەی کاری رێگاوبان تێپەڕی، کە پارەیەکی زۆری کرێی کارمەندانی تێدا بوو، لەگەڵ ئەوەی کە ئەوانە هەر لە منداڵییەوە چەتە بوون، ئەو پارە بۆ ئەوان شتێکی زۆر باش بوو، بەڵام ئەو کارەیان نەکرد لەبەرئەوەی مەبەستیان ئەنجامدانی ئەو کوشتنە بوو و کاری پێشووی نووری، کە لە دەزگای پۆلیس بووە و هیچ کەموکوڕی نەبووە و نەیویستووە ناوزڕ بێ، هۆیەکی تریش برادەرایەتیی بێ گەردی من و سوورچییەکان بوو.

پاش ماوەیەک ئۆتۆمبێلی (ئیسماعیل بەگ) تێپەڕ بوو. لە ناکاو لە پەنا هەر دارێک و بەردێک فیشەک بەلێزمە بەسەریاندا باری، ئەو سەرنشینانەی، کە لە ناو ئۆتۆمبێلەکەدا بوون و بەر ئەو فیشەکانە نەکەوتبوون زۆر ئازایانە وەڵامی تەقەکانیان داوە و شەڕێکی نائومێدی باشیان بۆ گەورەکەیان کرد، ژمارەیەکی زۆر لە هێرشبەران کوژران و پێش ئەوەی دوا پیاوی (ئیسماعیل بەگ) بکوژرێ خودی (نووری) خۆشی بریندار بوو، (سلێمان بەگ) کە پاسەوانی من بوو بریندار بوو، دواتر (نووری) فیشەکی دەمانچەکەی لە سەری دوژمنەکەی (ئیسماعیل بەگ) بەتاڵ کرد.

خوێنەکەی ئەو رێگایەی سوور کرد کە پشتگیریی لە دروستکردنی کردبوو، با ئەو رێگایە ببێتە پەیکەرێکی یادگاری بۆ ئەو فەرمانڕەوایە لاوەی کە داوای خۆشی و پێشکەوتنی بۆ میللەتەکەی دەکرد.

**گەیشتن بە ئامانج**

لە کۆتایی مانگی رەمەزان و دوایی کەژی زستان، ساڵی (١٩٣٢) رێگاکە تەواو بوو. ئەورۆ دەهات، کە خێوەتگاکەم لە کۆتایی رێگاکە جێ بهێڵم، فەرمانەکەم بەئەندازیارێکی عێراقی سپارد (ئەحمەد شەوقی حوسەینی بوو -ح) بە نهێنی بەرەو رووبان ببمەوە.

پێش ئەوەی، کە ئۆتۆمبێلەکە بڕوا، پاسەوانی گەنجینەکە چاوێک و دەستێکی هەبوو، (ئەو کەسە بوو، کە (جکلنایت)ی لە دەست تەقییەوە و شەو بەخێراییەکی رادەبەدەر گەیاندمانە هەولێر و لە مردن رزگارمان کرد). لە دەرەوەی خانوو ساکارەکان لە دەربەندی (بەرسرین) وەستا بوو، تا لە بەرچاومان بزر بوو. بەدەستە ساغەکەی ماڵئاوایی لێ کردین، خوا دەزانی، کە رۆژانی داهاتوو ئەو هەژارە شێوە تێکچووە چی بەسەر دێت؟ پاسەوانە باوەڕپێکراوەکانی هۆزەکان ئەوانەی (محەمەدئەمین ئاغای دەرگەڵە) بۆی دانابوون تفەنگەکانیان بەسەر سەریاندا بەرز کردەوە و دوا ماڵئاواییان لێ کردین.

**تێبینی:** لە چاپی دووەمی ئەو کتێبە بە ئینگلیزیدا هاتووە، کە بودجەی پارەی تێچووی ئەو رێگایە کە ١١٥ میلە (نزیکەی ١٨٥ کیلۆمەتر -و-) دەبێ (٢٠٠٠٠٠ جونەیهی ئیستەرلینی)یە. ماوەی تەواوبوونی نزیکەی (چوار) ساڵە.

(١) ئەو نابینایە تا کۆتایی شەستەکانی سەدەی بیستەم لە ژیاندا مابوو -ح-.

(٢) ای-جی- چاپمان ئەفسەرێکی پەیوەندییەکان بووە لە کۆمپانیای نەوتی کەرکووک بۆ کاروباری ناوچە کوردییەکان. ئەو مرۆڤە لە ناوەراستی پەنجاکانی سەدەی بیستەم رایسپاردووە کە جەستەی بسووتێنرێ و لە ناوچەی (ولاش) خۆڵەمێشەکەی بڵاو بکرێتەوە، لەبەر خۆشەویستی و دڵسۆزی بۆ دانیشتوانی ئەو ناوچەیە کە کاتی خۆی قاچی شکاوە و بایەخیان پێ داوە و چارەسەریان کردووە و چاک بوویتەوە. راسپاردەکەی جێبەجێ کرا. -ح-.

# هەولێر لە نووسینەکانی سی.جی. ئەدمۆندز

**هۆشیار محەمەدئەمین کۆیی**

ناوی سیسل جون ئەدمۆندزە، لە سالّی ١٨٨٩ لە شانشینی بەریتانیا لەدایک بووە، لە کۆلیژی بمبروک (کمبردج) خوێندوویەتی. سالّی ١٩١٠ وەک قوتابییەکی وەرگێڕ لە قونسولّیەی بەریتانیای گشتی لە کەناری رۆژهەلاّتی دەریای سپیی ناوەڕاست دامەزراوە. سالّی ١٩١٣ بەبریکاری قونسولّی بەریتانی لە (بوشیر) دامەزراوە. لە سالّی ١٩١٥ بووە یاریدەدەری ئەفسەری سیاسی لە عێراق. لە سالّی ١٩١٧ بووە بەئەفسەری سیاسیی هێزەکانی بەریتانیا لە باشووری رۆژئاوای ئێران. دواتر لە رۆژئاوای ئەو وڵاتە کاری کردووە تا سالّی ١٩١٩. لە سالّی ١٩٢٢ بەکارێکی تایبەتی بۆ باشووری کوردستان نێردراوە. لە سالّی ١٩٢٤ بەراوێژکاری بەش و پشکێنەری ئیداری حکوومەتی عێراق لە هێزەکانی سەربازی کەرکووک و سلێمانی دادەمەزرێ. لە سالّی ١٩٢٥ ئەفسەری پەیوەندییەکان بووە لە لیژنەی نێودەولّەتی لە بابەت کێشەی ویلایەتی مووسڵ. لە سالّی ١٩٢٦



یاریدەدەری راوێژکاری وەزارەتی ناوەخۆی دەولّەتی عێراق بووە. سالّی ١٩٢٨ بووە بەقونسولّ، لە سالّی ١٩٣٥ تا ١٩٤٥ راوێژکاری وەزارەتی ناوەخۆی عێراق بووە، کە خزمەتی لە حکوومەتی عێراق کۆتایی پێ هات، نیشانە (وسام)ی رافیدەنی پێ درا. لە سالّی ١٩٤٨ پلەی وەزیری لە وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا پێ درا، لە سالّی ١٩٥٠ خانەنشین کرا.

بلاّوکراوە و نووسینی بەعەرەبی و فارسی و کوردی هەیە، لەگەڵ بەهەشتی تۆفیق وەهبی فەرهەنگی ئینگلیزی و کوردی بەپیتی لاتینییان داناوە، لە ئۆکسفۆرد لە بەریتانیا بەچاپ و بەرگێکی جوان لە سالّی ١٩٦٦ چاپ کراوە. بەباشمان زانی، کە لەبەر گرنگیی نووسینەکە ئەو بەشەی، کە پەیوەندیی بەهەولێرەوە هەیە بیگۆڕینە سەر زمانی کوردی.

سنووری کۆنی ئێران و دەولّەتی عوسمانی لە کەنداوی فارسەوە تا چیای ئارارات نزیکەی ١١٨٠ میلە (نزیکەی ١٨٩٩ کیلۆمەتر)، (٧٠٠) میل بەخاکی کوردستانی عێراق و تورکیا تێپەڕ دەبێ، عێراق نزیکەی (٩٢٠) میلی لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بۆ ماوەتەوە، (٤٤٠) میل کەوتووەتە کوردستانی عێراق.

کوردستان کە کەوتۆتە سەر سنووری نێو نەتەوەیی دوو وڵات، لەبەرئەوە هەموو ئەو کێشانەی لەم ناوچەیە روویان داوە کاریگەریی هەبووە لەسەر باری ئابووری و سیاسیی کورد.

لە مانگی ئاداری ساڵی ١٩٢١ لە کۆنفرانسی قاهیرە بڕیار درا کە فەیسەڵ کوڕی دووەمی حوسێنی شەریفی (مەککە) بەپاشای عێراق دابنرێ، بەگوێرەی ڕاپرسی لیواکانی عێراق ٩٦٪ دەنگیان بۆ دا. تەنیا لیوا کوردەکان نەبێ، کە پشتگیرییان نەکرد، بەڵکو داوای ئیدارەیەکی ئۆتۆنۆمیی کوردییان کرد. لەبەر داواکاری کوردەکان کاتی خۆی کۆنفرانسی قاهیرە چەند پێشنیارێکی لەبارەی ناوچە کوردییەکانی (عێراق) بڵاو کردەوە کە بەم شێوەیە بوو:

١- ناوچە کوردنشینەکانی لیوای مووسڵ لە ژێر چاودێریی فەرمانبەرێکی ئینگلیز دەبێ، بەپلەی جێگری موتەسەریف. فەرمانبەرانی تریش کورد دەبن، ئەگەر عەرەبیش بن دەبێ زمانی کوردی بزانن، ئەو ناوچەش دەبێ سەر بەعێراق بێ.

٢- هەولێر و کۆیە و ڕواندز لەلایەن ئەفسەرە ئینگلیزەکان وەک بەشێک لە بەڕێوەبردنی قەزاکان، ڕەچاوی ویستی خەڵکیش دەکرێ لەبارەی دامەزراندنی فەرمانبەرانەوە.

٣- لەبارەی سلێمانییەوە وەک موتەسەریفییەت دەمێنێتەوە و ڕاوێژکارێکی ئینگلیز لەگەڵ ئەنجوومەنی شارەکە دادەنرێ.

حکوومەتی بەغدا وای بەباش زانی کە ئیدارەی پێشووی عوسمانی بەو شێوە دابمەزرێنێتەوە کە هەولێر و کۆیە و ڕواندز وەک قەزای سەربەخۆ سەر بەلیوای کەرکوک بن، بەڵام بەهۆی ڕاسپاردەی نوێنەری باڵای بەریتانی (المندوب السامي البريطاني) هەولێر سەربەخۆییەکی زیاتری پێ درا و وەک لقێکی لیوای لێ هات و کوردێک بەجێگری موتەسەریف دانرا. ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر لە لیوای کەرکوک دادەبڕا. لەسەر دەرگای سەرای حکوومەت ئاڵای عێراق هەڵکرا، بەڵام موتەسەریفی کەرکوک و قایمقامی ڕواندز کە سەر بەئەو بوو، ئەو کارەیان نەکرد.

(فەتاح پاشا) موتەسەریفی کەرکوک ئەفسەرێکی باڵای سوپای سەردەمی عوسمانی بوو، خەڵکی دووزخورماتوو بوو، هەرچەندە ئیدارەی هەولێر سەر بەئەو بوو، بەڵام بەکردەوە سەربەخۆ بوو، بەرژەوەندیی هەردوولاشی هاوبەش بوو، (ئەحمەد ئەفەندی) کە یاریدەدەری موتەسەریف بوو، لە سەردەمی تورکەکان لە هەولێر سەرۆکی شارەوانی بوو، لە بنەماڵەیەکی بەدەسەڵاتی هەولێر بوو، ئەوانەی لەگەڵ ئەو لەو شارە کاریان دەکرد (نەقیب لاین) و (نەقیب س/ لتلدیل) کە سەرپەرشتی پۆلیسی دەکرد پەیوەندیم لەگەڵیان هەبوو.

لە مانگی تەمموزی ساڵی ١٩٢١ ئاژاوەگێڕەکانی سوپای تورک، لە گرووپی بچووکی سەربازیدا لە سنووری ڕۆژهەڵاتی عێراق هۆزەکانیان بۆ یاخیبوون و هەڵگەڕانەوە و بەرپاکردنی شۆڕش هان دەدا، لە باکووریش بەهەمان شێوە پروپاگەندە بڵاو دەکرایەوە. لەگەڵ ئەوەی کە زۆر کەس لایان وا بوو کە گەڕانەوەی حکوومەتی عوسمانی عێراق تووشی بەڵایەکی مەزن دەکا، بەڵام گێرەشێوێنییەکان بواری دەربڕینی ئەو بیروڕایەیان نەدەدا.

لە ١٩٢٢/٣/١٧ حکوومەتی (ئەنقەرە) ئەرکی قایمقامی ڕواندزیان بە (ڕەمزی بەگ) سپارد، کە یەکێک بوو لە داروودەستەکانی تورک، لە کۆتایی مانگی ئایار گەیشتە ناوچەکە و بەهۆزەکانی ڕاگەیاند کە بەم زووانە هێزێکی گەورە لە تورکیاوە دێت بۆ ڕزگارکردنی هەولێر و کەرکوک و سلێمانی لە دەست ئینگلیزەکان، لە ناوەڕاستی مانگی حوزەیران سەرهەنگێکیان بەناوی (عەلی شەفیق) ناسراو بە (ئۆزدەمیر) بۆ ناوچەکە نارد. ئەم ئەفسەرە خەڵکی سەر سنووری هان دەدا و ڕاشی دەگەیاند کە ئەرکی ئەو وەرگرتنەوەی تەواوی ویلایەتی مووسڵە بە زەبری هێز.

کاتێک کە گەیشتمە کەرکوک سەرقاڵی بیرکردنەوە بووم لە هەڕەشەی تورکەکان کە بەهێزێکی کەم کۆیەیان داگیر کردبوو و هەولی گرتنی ڕانیەیان دەدا.

هێزی یەکەکانی کۆیە گەیشتنە زێ و دواتر تەق تەق، فڕۆکەکانیش ئاگادارییەکیان بەسەر دانیشتوانی کۆیە بڵاو کردبۆوە: ماوەی سێ ڕۆژیان مۆڵەت بەخەڵکەکە دابوو بۆ دەرکردنی تورکەکان لەو شارە. ئەگەر ئەوە نەکەن ئەوا کۆیە بۆردومان دەکرێ. من ئەوەم پێ دروست نەبوو، خەڵکەکەش پێیان وا بوو ماوەکە درێژ بکرێتەوە لەبەر بوونی هەندێ لە هۆز و خێڵەکان لە بەرەی دوژمن. ئێمە دەزگای هەواڵگری و کۆکردنەوەی زانیارییەکانمان نەبوو، لەبەرئەوە هەواڵمان بەئەستەم

بەدەست دەگەیشت، لەو کەلەکوانانەی کە لە میرزا رۆستەمەوە هاتبوونە ئالتوون کۆپری بیستم کە (ئۆزدەمیر) ئاغـایەکی رقـاوی کـۆیەی بەبەرێوەبەری (تـەق تـەق) دامەزراندووە، هەواڵێکی تر، هۆزی (شێخ بزەینی) کە لە کەناری زێ و لەسەر رێگای کەرکووک و کۆیە نیشتەجێن بەتەواوی لەگەڵ بەرەی دوژمنن.

لە ٣١ی ئەیلوول، پاش دوو رۆژ هێزی ئاسمانی لە بنکەکانی کەرکووک و مووسڵ بەتوندی سەربازگەی کۆیە و گوندەکانی شێخ بزەینییان بۆردومان کرد، لە ٥ی تشرینی یەکەم (سێرجان سالمۆند) بەفڕۆکە گەیشتە کەرکووک. میوانی من بوو و شەوێکی لەبیر نەکراومان بەیەکەوە رابوارد، لەبارەی کۆیەوە بڕیار درا کە ئەگەر دوژمن بەبۆردومانی فڕۆکە لە کۆیە دەرنەکرا ئەوا هێرشی سەربازیی بەکۆمەڵ دەنێرینە ئەو شارە.

لەو کاتەدا چەند ئاغایەکی شێخ بزەینی هاتن و باسی خۆ بەدەستدانەوەیان لەگەڵ کردین و هەندێکی تریان بەباشیان زانیبوو کە بۆ لای شێخ مەحموود و نوبل بۆ سلێمانی بچن.

تورکەکان کە سەربازگەی کۆیەیان قایم کردبوو، بەهۆی نارەزایی و هەڵوێستی دانیشتوان، بەرامبەریان ناچار کران کە لە بەرواری ٧/ ١٠ کۆیە بەجێ بهێڵن لە ١١/ ١٠ من و (لاین) بەسواری ئۆتۆمبێل بۆ هەولێر بەرێ کەوتین، دواتر (لاین) و (لیتلدیل) بەیاوەریی کاروانێکی پۆلیس بۆ گرتنەوەی کۆیە رۆیشتن. لە ١٤/ ١٠ بەبێ گرفت شارەکە کەوتە ژێر دەستمان. هەولێر شارێکی خۆش و سەرنجڕاکێشە، لەسەر گردێکی چوار سووچی بەرزی لێژ، کەوتۆتە ناو دەشتێک، هەر لە نزیک ئەو شوێنە (داریوس) بەرامبەر (ئەسکەندەری مەقدۆنی) لە شەڕی (گەدگەمیلا) لە گۆڕەپانی شەڕ دۆڕاندی و هەڵات کە بەشەڕی (ئەربیلا) بەناوبانگە. ئەم شوێنە دەکەوێتە نزیک گوندی (کرملیس)ی دیانان کە ١٦ میل لە رۆژهەڵاتی مووسڵەوە دوورە. بنەماڵە ناودارەکانی شار بەکورد و تورکەوە بەپێچەوانەی کەرکووک، لەسەر قەڵا نیشتەجێن کە لە باپیرانیان بۆیان ماوەتەوە. ئەو خانووانەی لە رۆخ قەڵاکە دروست کراون، وەک شوورە دەوریان داوە، چوون بۆ ناو قەڵا تەنیا بەسێ یا چوار رێگای باریکی لێژ دەکرێ، شێوەی ئەو قەڵایە زۆر بەرچاوترە لە قەڵای کەرکووک و (ئەکر و بولیسە) وێرانەکەی جاران. گرنگیی ئەو شارە لەوەدایە کە ناوەندێکی بازاڕی گەنمە و دەکەوێتە سەر رێگای گشتیی کەرکووک و مووسڵ و بنکەیەکی بازرگانیشە، چونکە وەک بازاڕێکە بۆ ئەو هۆزانەی کە لە چیاکانی رۆژهەڵات و باکوور نیشتەجێن.

لە کاتی بەرێوەچوونی کرداری هێرشی سەربازیی زەوی و ئاسمانی، هەندێ لە سەرۆک هۆزەکان هاتنە کەرکووک و هەولێر و سلێمانی و داوای لێبووردن و بەخشینیان کرد، زۆریشیان لە ترسان لەگەڵ دوژمن بوون. لەو کاتەدا من بەکاری رێنومایی لەگەڵ فڕۆکەکان بووم، لە نێوان کەرکووک و هەولێر و کۆیە و کفری و بەغدا دابووم، شوێنی گرنگم بۆیان نیشانە دەکرد. لە کۆتایی مانگی تشرینی یەکەم وەرچەرخانێکی لە ناکاو لە رووداوەکان رووی دا، ئەویش گەیشتنی (سمایل ئاغا) ناسراو بە(سمکۆ) سەرۆکی بەسامی هۆزی شکاک کە لە ناوچەی (قوتوور) لەسەر سنووری نێوان ئێران و عوسمانییەکان نیشتەجێن. بۆ گوندی (دێرە) هاتن کە ١٨ میل لە باکووری هەولێر دوورە. ئەو وەک شۆڕشگێڕێکی نەتەوەیی کورد دەیویست بناسرێ، ناوچەکەیان لە دیلمانەوە تاکو بانە رۆژئاوا کەوتبووە بەر هێرشی سوپای تورک، لەولاشەوە لە رۆژهەڵات رێگای لێ گیرا بوو، چونکە سوپا تازەکەی ئێران کە رەزاخان زیندووی کردبۆوە لەو ناوە بوون. سمکۆ تەنیا چەک و تەقەمەنییەکانی مابوو، ژنەکەی لەو هێرشە کوژرا بوو، کوڕە شەش ساڵەکەی کە زۆری خۆش دەویست بەدیل گیرا بوو. بۆ یارمەتی هاتبووە عێراق و لەبەرئەوەی رێگامان پێ نەدا راستەوخۆ بێتە هەولێر، زۆر دڵگیر و نیگەران بوو.

کێشەی هاوکارە باشەکەی سمکۆ (سەید تەها) لە کێشەی ئەو جیاواز بوو، ئەو بەتەنیا پاش ئەو بەیەک یا دوو رۆژ هاتبوو، (سەید تەها) سەر بەعوسمانییەکان بوو، بەڵام تێکەڵاوی و موڵک و ماڵی هۆزەکەی لە قەزای رواندز هەبوو، ئەومان بۆ پلەیەکی بەرز دانابوو، بەڵام رەوتی

رووداوەکان ناچاری کردین کە ئەم پلەیە بەشێخ مەحموود بسپێرین، داوای لێ کرا یەکەم جار بێتە کەرکووک، هەر لەوێ لە ٣١ی مانگ چاوم پێ کەوت، (سەید تەها) پیاوێکی بەجەستە قەبەو بەخۆوە بوو، کێشی لەشی نزیکەی (١١٢) کیلۆ بوو، بەرگی لە شێوەی کوردی باکوور لەبەردا بوو، شەرواڵەکەی دەلینگی بەرین بوو لە قوماشێکی رێرێی رەنگ بۆر دروست کرابوو، پەستەکێکی لەسەر رانکەکەی لەبەردا بوو کە لە خوری خۆماڵیی ئەستوور دروست کرابوو، کڵاوێکی چنراوی لەسەر بوو کە لە کڵاوی رووسی دەچوو، گوڵینگەیەکی حەقیقی لەسەر بوو وەک هێمایەک بوو بۆ بزووتنەوەی نەتەوەیی تایبەت بەکورد، وەک نەریتی ئاسیەوییەکان ئەو پیاوەم وەک کەسێکی زیرەک و تێگەیشتوو و زۆر بەرێز هاتە بەرچاو، گفتار خۆش بوو، ماسولکە پتەو لەگەڵ ئەوەی کە قەڵەو بوو، بەڵام زۆر چالاک بوو، نیشانەشکێنەکی باش و بێ هاوتا بوو لە تفەنگ هاویشتن، نوێنەری باڵای حکوومەتی بەریتانی لە عێراق رەزامەندیی بەپێشنیارەکەی نەدا لەبارەی چالاکییەکان لە دەردوەی عێراق. ئەو ئامادە بوو بۆ هاوکاری و گەڕانەوەی دەسەڵاتی ئێمە لە رواندز و وەدەرنانی تورکەکان کە تەنیا لە ناوچەی رانیە (١٣٠) کەس و لە رواندز (١٢٠) کەس و لە زێبار (٥٠) کەس لە رۆژئاواکەی هەیە، ئەو گوتی: ئامادەیە لە هۆزەکەی خۆی کە ئەو کاتە (٣٠٠) خێزانیان لە



سەید تەها

عێراق بوون، دەتوانی پیاوەکانی هۆزی (هەرکی) کە ئەو رۆژگارە لە بنکەی زستانیان لە ئاکرێ نزیک ببوونەوە بانگهێشت بکا. باوەڕ بەو سەرۆک هۆزانەش بهێنی کە پەیوەندییان بەو هەیە و لەم بارەیەوە سوودیان لێ وەربگرێ. ئەوەی ئەو داوای لە ئێمە دەکرد پشتیوانیی هێزی ئاسمانی و تفەنگ و تەقەمەنی و بودجە بۆ بژێویی لەشکرەکەی لە خۆراک، بۆ خۆی داوای هیچ پاداشتێکی نەکرد بەرامبەر ئەو کارە. ئەو دەیویست قەزاکانی رواندز و ئاکرێ و ئامێدی لە ژێر فەرمانڕەوایی ئەو بێ، هاوشێوەی فەرمانڕەوایی شێخ مەحموود لە سلێمانی.

لەو ساتەدا بڕیارێکی سیاسیی خێرام بەبیردا هات، لەبارەی رواندز و ئەو پلانەش بەمەبەستی گەڕانەوەی دەسەڵاتمان بوو بۆ سەر ویلایەتی مووسڵ و چارەسەری کێشەی سلێمانی بەپچڕانی پەیوەندییەکانی شێخ مەحموود بە تورکەکان، بەغدام بەتەواوی لەو پلانە ئاگادار کردەوە. (بۆردیللوت) بە گەرمی پەسەندی کرد و (سەید تەها) بەفڕۆکە نێردرایە بەغدا بۆ ئەوەی بەشدار بێ لە کۆبوونەوە سێ قۆڵییەکەی نێوان شا فەیسەڵ و (نێردراوی باڵای بەریتانی مەندوبی سامی) و نوێنەرانی سلێمانی، لەبارەی پەیوەندییەکانی داهاتووی ئەو لیوایە و حکوومەتی عێراق، داواشی لە من کرد بچم (سمکۆ) ببینم.

لە ٤ی تشرینی دووەم بە سواری فڕۆکە چوومە کۆیە بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ (لاین)، کە ئەو لە کۆیە بەئۆتۆمبێل گەڕابۆوە، لەگەڵ (ئەحمەد ئەفەندی) و (لیتلدیل) بەئۆتۆمبێل بۆ دیتنی (سمکۆ) چووینە گوندی (بەحرکە)ی سەر بە هۆزی گەردی لە رێگای (دیرە) ١٠ میل دوور بوو. (سمکۆ) لەگەڵ ئەحمەدی برای و دوو سێ خزمی ردێن سپی و نزیکەی (٢٠) کەس یاوەری بوون ئاغەکان جلوبەرگی جوانی هاوشێوەی یەکیان لەبەردابوو کە لە کاڵای فاسۆن دروست کرابوو و سوپای بەریتانیش بەکاری دەهێنێ، پۆتینی سوارەی رووسی درێژیان لە پێدا بوو، کڵاوەکەیان لوولەیی درێژ بوو، بەحەریرێکی توند لە دەوری پێچرابوو کە شاردبوویەوە، ئەمە لای هۆزی شکاک باوە، کەواکانیان لە هەردوو لا دوگمەی هەبوو، باخەکانیان بەرز و پتەو بوو، لەلای ملەوە دوگمەدار بوو، پاڵتۆکانیان بەهی سوارچاکان دەچوو.

شەرواڵەکانیان زۆر جوان بوو دەتگوت لە (سافیل رو)[1] کرابوو، هەریەکەشیان فیشەکدانی جۆراوجۆریان پێوە بوو و هەندێکیشیان دووربینیان بەشانەوە بوو.

(سمکۆ) پیاوێکی بەهێز و بەشان و شکۆ و قەدێکی باریک و باڵای بەرز و سیمای جوان بوو، لە ئەوروپییەکان دەچوو، سمێڵی قاوەیی و زبری وەک فلچەی ددان بوو، رێکیی لەشی بەم شێوەیە بۆ ئەفسەرێکی بەریتانی دەگونجا، زەردەخەنە سەرنجراکێشەکەی ددانە سپییە بە بریقەکانی دەردەخست، واش مەزەندە دەکرا کە زەردەخەنەی شەرم و بێ فیزی بێ. هەڵوێستی وەکو (سەید تەها) بوو، ئەو گوتی: بەرامبەر ئێرانییەکان نیگەران نییە، ئەوەندەی ئەوان ئازاریان داوە، ئەویش ئەوەندە ئازاری ئەوانی داوە، چەندیشیان پێ داوە ئەوەندەی وەرگرتۆتەوە لێیان، بەڵام دەیەوێ بەرامبەر تورکەکان تۆڵە بسێنێتەوە، چونکە خۆیان وا نیشان دا کە پشتگیریی لێ دەکەن دواتر لێی هەڵگەڕانەوە، سەری لەوە سوڕما کە ئێمە بە پارێزەوە باس لە وروژاندنی هەستی دژایەتیی ئێرانییەکان دەکەین، ئەو رای گەیاند بەدرێژایی سنوور ئێرانییەکان هاوکاریی تورکەکان دەکەن لەو شەڕەدا، بەتایبەتی پاش دەرکردنیان لە رواندز و رانیە. ئەو گوتی: بەو هیوایە هاتووم کە پشتگیریم بکەن بۆ ئازادکردنی گەلی کورد و وەستان لە دژی ئەو دوو حکوومەتە کە دوژمنمانن، ئەگەر بیروڕاکەشم هەڵە بوو، ئەوا داوای پەنابەری لە ئێوە ناکەم، بەڵکو دەگەڕێمەوە ناو هۆزەکەم و ناوچەکەم بەتەنیا ئەو کارە ئەنجام دەدەم، لەم دیدارەدا وەڵامی ئەو هەموو پرسیارانەم لا روون بۆوە کە بیرم لێ دەکردەوە لەبارەی پیلانەکانی هۆزی کوردی، کۆبوونەوەکەمان لە پشت دەرگای داخراو بوو لە دیوەخانی خانەخوێمان (جەمیل ئاغا)ی گەردی ئەنجام دا، خزمەتچی دیوەخانەکە هەر جارەی کە دەهاتە ژوور بۆ دابەشکردنی قاوە بەدوو یا سێ سووڕانەوە دابەشی دەکرد لە شێوەی ناوچەی عەرەبەکان، پاشان پاڵی بەسووچی دەرگاکە دەدا وەک ئەوەی کە گوێبیستی هیچ قسەیەک نەبێ، وا پێ دەچوو دانیشتوانی ژوورەکە هەست بەوە نەکەن کە ئەو قاوەچییە گوێ لە قسەکانمان دەگرێ، تەنیا من و (لاین) لەمبارەیەوە هۆشدار بووین و کاتی پێویست دەماننارده دەرەوە یان قسەکانمان دەوەستاند.

ئەنجامی گفتوگۆی بەغدا بەدڵی من نەبوو، (سەید تەها) داواکارییەکەی لە تفەنگ و تەقەمەنی زیاد کرد، بۆ ئەم مەبەستە (١٥٠) چەکداری کوردی سەر بە هێزی سەربازی سوپای عێراق بۆ بەهێزکردنی هێزی هۆزەکان بەخواستی خۆیان بۆ ماوەی مانگێک بڕیاریان دا لەگەڵ (سەید تەها) کار بکەن.

بڕیار بوو بچم بۆ هەولێر و لەوێوە بۆ ئاگری سەرپەرشتی کارەکان بکەم، دەبوایە بەیاننامەیەک لەلایەن هەردوو دەوڵەتی بەریتانیا و عێراق دەبارەی مافی گەلی کورد بڵاو بکرێتەوە.

وا باش بوو ئەو ناوچانەی کە دانیشتوانی بەهۆی هەرەشەی تورک یان خێڵەکی داوای چۆڵکردنی ناوچەکانیان لێ دەکرێ، بە هێزێکی رێکوپێک وەک (لیڤی) ببێتە پاڵپشت بۆ خەڵکەکە و زاڵبوون بەسەر هێرشبەرەکان، ئەو (١٥٠) سەربازە کوردەی کە لە سەربازگەکانیان دابڕابوون بەخۆیان و سێ تۆپەکانیانەوە و بێبەشبوونیان لە خزمەتگوزاری و بژێویی پێویست لە گۆڕەپانی شەڕ، هۆکارێک بوو بۆ سستی و لاوازی و ئاڵۆزبوونی کردارەکە، ئەوانە وەک نەخشە لە مێشکمدا بوون.

پێویستە کارەکان لە هەولێر بە (ئەحمەد ئەفەندی) و (لاین) بسپێردرێ کە سەرپەرشتیی فەرمانڕەوایی ئەو شارە دەکەن، هەروەها من و (نویل) نابێ لە دەرەوەی ئەو بازنەدا بین.

هەولێر هەر بەرواڵەت سەر بەکەرکووک بوو، لە کۆتایی ساڵ سەربەخۆیی خۆی وەرگرت. منیش لە ٢١ی مانگ بەرەو هەولێر بەرێ کەوتم.

کە (لەشکری رواندز) دەستی پێ کرد تووشی نەهامەتی هات، لە ١٧ی مانگ بۆ ماوەی سێ هەفتە لەسەریەک و بە بەردەوامی بارانێکی زۆر باری. ئەو سەربازانەی بەخواستی خۆیان لە بەغدا و مووسڵ هاتبوون بۆ بەشداریکردن لەو کردەوە سەربازییە، لەبەر بارانی توند و سەرما و قوڕ و چڵپاو و بەبێ

کەلوپەلی پێویست لە ٢٦ و ٢٨ی مانگ گەیشتنەجێ و بێزاری و تووڕەییان پێوە دیار بوو، پێداویستییەکانیشیان دوای چەند ڕۆژێک گەیشت کە دەرکەوت زۆربەیان بێ سوودن و بەکەلوپەلی بێ کەڵک و کات بەسەرچوو تۆمار کرابوون. (سەید تەها)ش لەبەرئەوەی زێدەڕۆیی لە قسەکانی کردبوو و داهاتەکەشی لەو ئاستە نەبوو کە باسی کردبوو، هەرکییەکانیش کە هیوای زۆری پێیان هەبوو، ئامادە نەبوون هاوکاریی بکەن. ئێمەش ئومێدمان بەو نەما بوو، چونکە هیچ پلانێکی دیاریکراوی بۆ هەڵسووڕاندنی کاری ناوچەکانی نەبوو، ئەو پشتی بە بۆردوومانی بێ پلان و هەڕەمەکی بۆ سەر دوژمن و ناوچەکانی ئەو سەرۆک هۆزانەش کە ئامادە نەبوون هاوکاریی بکەن، لەو کاتەی کە هیچ ڕووناکییەک لە پێشکەوتن لە ئارادا نەبوو، سەربازە خۆبەخشەکان پرسیاریان لە داهاتووی خۆیان دەکرد، ئەگەر دوای تەواوبوونی مانگە خواستراوەکە ئەگەر نەگەڕێنەوە ناو سەربازگەکەیان چی روو دەدا؟ دواکەوتنی ئەو بەڵێنەی کە بۆ بڵاوکردنەوەی بەیانێکی سیاسی درابوو، نائارامیی خستبووە ناو ئەفسەرەکان.

هەفتەی یەکەم لە مانگی کانوونی یەکەم تێپەڕی کە (راولاش) (لەشکری رواندز) چاوەنوار نەدەکرا کە بەم زووانە بەڕێ بکەوێ و منیش دەستەوەستان وەستابووم.

بڕیارم دا سەردانی کۆیە بکەم بۆ ئەوەی ئەگەر کارێکی وا بکەم بۆ دانانی کۆسپ و دواخستنی دوژمن کە هێشتا لە ناوچەی رانیە مابوون، دوایی بگەڕێمەوە کەرکووک.

بابەکر ئاغا لە هەولێر سەردانی کردین و (٧٠) چەکداری پشدەری سوارەی لەگەڵدا بوو. لە٨ی کانوونی یەکەم بۆ کۆیە بەڕێ کەوتین، دوای سێ هەفتە لە مانەوەم، لەگەڵ دەرکەوتنی یەکەم تیشکی خۆر بەرۆیشتنێکی (٨) میلی بەدەشتێکی پڕ کەند و کۆسپە، گەیشتینە شوێنێکی نارێک، کە دۆڵ و ئاوەڕۆی زۆر لە بەینی خێزەڵانە سوور و بۆرەکاندا هەبوو. بە رەشماڵەکانی هۆزی (بۆلێ)دا تێپەڕین کە خەریکی رۆیشتن بوون بۆ لەوەڕگای زستانەیان لە دەشتی هەولێر، تا خۆرئاوابوون تەنیا تووشی گوندی (شاخەپیسکە) بووین کە سەد ماڵێک دەبوون، جەماوەری گوندەکە کە هاتبوون بۆ بینینمان، لە ناویاندا کۆنە سەربازێکی تورکی شاری (ادرنە- ادریان پول) هەبوو، ئامێرێکی میوزیکی لابوو کە لە دووزەلە و هەنبانەی دەستکرد پێکهاتبوو، کاتێ کە فووی لە هەنبانەکە دەکرد بەهۆی دووزەلەکەوە پڕ با دەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا کە دەمی لە دووزەلەکە هەڵدەگرت تا ماوەیەک لە دەنگ نەدەوەستا، بە ئاوازەکەی گوێبیستی گۆرانییەکی تورکی بووین. لە کۆیە لای قایمقام (جەمیل ئاغای حەویزی) میوان بووین، لە دەفتەری یاداشتی رۆژانەم نووسیومە: ژنانی ئەو ماڵە خواردنێکی ئەوەندە بەتامیان بۆ ئامادە کردبووین کە تا ئێستا لە کوردستان لەو خواردنە خۆشترم نەخواردووە. لەو کەسانەی کە بۆ دیتنی من هاتبوون (زیاد) کورە خۆشەویستەکەی بەساڵاچوو (حەمە ئاغا)ی غەفووری بوو لەگەڵ (رەشید بەگ) سەرۆکی هۆزی (پشت گەلی)، ئەوەی پێ راگەیاندم کە تورکەکانی رانیە لە ترسی هێرشی هێزی ئاسمانی ئێمە تەنیا بەشەو هاموشۆ دەکەن. بەرێگای (بێتواتە) لە شێوی نزیک رانیە لە رۆژئاوای (شاوور) تێپەڕ دەبن و بەرەو رواندز پاشەکشێ دەکەن. بۆردوومانی بەردەوامی (مەرگە و پشدەر) (عەباسی مەحموود ئاغا)ی هاوپەیمانی هەرە نزیکی تورکەکان ناچار کرد کە پاشگەز بێتەوە بۆیان.

دەنگۆی ئامادەباشیی سەربازی لە هەولێر، تورکەکانی تووشی مەترسی کرد لەبەر ئەگەری پچڕانی هێڵی پەیوەندیی رێگاوبان. ئەمەش بەڵگەیەک بوو کە بیرۆکەی (لەشکری رواندز) هەرچەندە لەبەر هۆکاری سەرما و کەشوهەوا سەرکەوتنی تەواوی بەدەست نەهێنا، بەڵام کارێکی باش بوو.

(نویل) لە هەوڵدان بەردەوام بوو، بۆ بەیەکگەیشتنی (سەید تەها) و (سمکۆ) و (شێخ مەحموود) بۆ کاری هاوبەش، بەڵام سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا، لەبەرئەوەی کە (سەید تەها) و (سمکۆ) هیچ ئومێدێکیان بەتورک نەبوو، (شێخ مەحموود) بەپێچەوانەی ئەوان بوو، جگە لەوە دەیویست هەردووکیان بەکار بهێنێ بۆ گەیشتن بەخواستەکانی.

ماڵئاواییم لە (بابەکر) کرد پاش

ئەوەی دوو شەو لە کۆیە مامەوە، ئەو لەوە دڵگران بوو کە نەمتوانی بەڵێنێکی پێ بدەم بەداگیرکردنی خێرای رانیە و پشدەر. رۆژی دەرچوونم لە کۆیە خۆرەتاوێکی خۆش بوو، سواری ئەسپەکەم بووم بەناوچەیەکی تاریکدا تێپەڕ بووین، کە ئاودڕەکانی بە گوڵە ژاڵە داپۆشرا بوون، بەر لە فراوین لە دووریی ۳ میل لە زێ دابەزین، لێرە ئاوی جۆگەلەیەکی روون بەسەر خیزەلانێکدا دەڕۆیشت و لەوبەریش (خالخالان) و گردە سەوزەکانی (شوان) دەبینران، لە رۆژهەلات چیا نارێک و بەد سیماکانی (حاسنە) و (قەمچوغە) لە پشتی لای سەرووی (هەیبەت سوڵتان) سەریان بەرز کردبۆوە و لووتکە بەفرگرتووەکەی پیرەمەگروون، هەرچەندە ٤٠ میل لە ئێمەوە دوور بوو، بەلام چونکە بەسەر (قەرەسەرد)دا دەڕوانی زۆر نزیک دەهاتە بەرچاو، شەو لە (تەق تەق) ماینەوە و بەیانی بە (کەلەک) لە زێ پەڕینەوە، رێگاکە سەرەتا بەنێوان مێرگوزارێکی نەرم و تەردا تێپەڕی و دوای سەرکەوتن و دابەزین بەچەند جۆگە و دۆڵ و کەندڕ کە ناژمێردرێن تێپەڕین، لە هەموان بەرینتر (بەستی ئۆمەرمەندان) بوو. ئەو شوێنەی کە بە بەرزایی ۲٥٠٠ پێ رێگاکەی لە خالخالان پێ تێپەڕ دەبێ دیمەنێکی زۆر جوانی چیاکانی باکوور و رۆژهەلات دەخاتە بەرچاو و لەو سالانەی دوایی کاتێ کە شەقامی ئۆتۆمبێلی بۆ کێشرا، بۆیە سەیرانگای ئەو کەسانەی کە لە باشووری عێراق دەهاتنە کەرکووک.

**(کوی کول) کاروانی کۆیە**

لە ۲٠ی تشرینی دووەمی ساڵی ۱۹۲۲ کۆنفرانسی ئاشتی (لۆزان) دەستی بەکارەکانی کرد و، هەموو چاوەکان بڕابوونە ئەو کۆنفرانسە، (لۆرد کۆر زون) و (عیسمەت ئینونۆ) نوێنەرانی بەریتانیای مەزن و تورکیا بوون. تورکیا داوای گەڕانەوەی گشت ویلایەتی مووسڵی تا شاخەکانی حەمرین دەکرد. بەریتانیاش داوای درێژکردنەوەی ئەو سنوورەی دەکرد لە هێڵی باکوور، لەبەرئەوەی هیچ لایەک لە هەڵوێستی خۆی دانەبەزی، کۆنفرانسەکە وەستا و بۆیە لە ٤ی شوبات بڕیار درا کە کێشەی مووسڵ لە بەرنامەی کۆنفرانس دوور خرایەوە و هەردوو وڵات بۆ ماوەی ساڵێک وتووێژی لەسەر بکەن، ئەگەر لەو ماوەیە نەگەیشتن بەیەک، ئەوا کێشەکە بە (کۆمەڵەی گەلان) بسپێرن. دەبێ لەو ماوەیە هەردوو لایەن پابەند بن بەو بارودۆخە. ئەو بڕیارە نێگەتیڤە، پەیمانە نەزۆکەکەی سیڤەر و بەڵێنی دەوڵەتی بەریتانیا بۆ رێگەدان بەکوردەکانی عێراق بۆ یەکگرتنەوەیان لەگەڵ دەوڵەتێکی کوردی کە دەبووایە لە پارێزگاکانی رۆژهەلاتی تورکیادا پێک بێت، زیندەبەچاڵ کرا.

بەخت یاوەرمان بوو، ئەو راپۆرتە درێژەی کە لە نزیک مووسڵ کەوتە ژێر دەستمان کە لە (ئۆزدەمێر)ەوە نێردرابوو بۆ ژەنەراڵی تورک سەرکردەی هێزەکانی بەرەی جەزیرە بوو، راپۆرتەکە بەهاوپێچەکەیەوە تەنیا باسی هێرشکردنی بۆ سەر کەرکووک و کۆیە نەدەکرد، بەڵکو باسی هاوکاریی شێخ مەحموودی دەکرد لەو هەڵمەتەی تورک، هەر لەو راپۆرتەدا هاتووە کە (ئۆزدەمێر) بەنیازە هێرش بکاتە سەر هەولێر و نیازی وا بوو کە هێزەکانی بۆ ئێران رابگوێزی و هاوکاری لە هۆزەکانی ئێران و شەرکەر داوا بکا و بۆ ئەم مەبەستە پەیوەندیی بە دوو فەرماندەی سوپای ئێرانی لەودیوی سنوور کردبوو.

لە ۷ی ئادار (جون سالموند) کە مرۆڤێکی بەتوانا بوو، بۆ ئاگاداربوون لە بارودۆخی ناوچەکە هاتە کەرکوک، بۆ رۆژی دواتر بەمەبەستی دیتنی (لاین) بەفڕۆکە گەیشتە هەولێر، دواتر بەرەو مووسڵ بەڕێ کەوت بۆ ئەوەی ئەو کردارە جێبەجێ بکات کە من و (بوردیللون) پێش سێ هەفتە باسمان کردبوو.

بڕیار درا کە دوو کاروان پێک بهێنرێ: یەکەمیان بەناوی کاروانی کۆیە (کۆی کول) بە سەرۆکایەتیی سەرهەنگ (بی- ڤینسنت) لەو هێزانە پێک بێت: ئەندامانی سەر بە هێزی ئیمپراتۆری وەک (یەکەکانی کامیرۆن لیوای یورکشایر) یەکەکانی ۱/۱۳ (۱٥ی پێشووپسنج) بوو یەکەکانی تۆپخانەی سەحرایی پەنجاب و یەکەی تۆپخانەی چیاکە لەسەر پشتی هێسترەکان بار کرابوون، لە مووسڵ بەڕێ دەکەون و بەرەو کۆیە دەچن. کاروانی دووەم ناوی (کاروانی سەر سنوور) بوو بەسەرۆکایەتی سەرهەنگ (هـ-ت- دوبین) کە لە لیڤی و لە یەکەکانی هێزی ناوچەیی و هەرسێ هێزی یەکەی (۲-۳-٤) و کۆمەڵەی

یەکەی سەربازی چیایی و یەکەکانی پۆلیس لە هەولێر کۆببنەوە و بەو رێگایە گرنگەی کاروان لە (دێرە) و (دوین قەلا) و پێچ و پەنای (سپیلک) تێپەڕی و بەرەو (رواندز) بچێ، ئەم کارانە چوار تا پێنج هەفتەی دەویست بۆ ئەوەی ئامادە بن. بڕیار درا کارەکانی خۆجێیەتی کەرکووک و سلێمانی و هەولێر پشتگوێ نەخرێ.

لە ٢٣ی مانگ، (سەرهەندی دوبس) بە سواری فڕۆکە گەیشتە کەرکوک، لە رۆژی دواتر لەگەڵی چوومە هەولێر بۆ گفتوگۆ لەگەڵ شازادە (زەید) برا بچووکی شا فەیسەڵ، پشکێنەری ئیداریی مووسڵ و (لاین) بەشدارییان کرد، ئەمیر زەید لە سەرەتای مانگ هاتبووە مووسڵ تا عەرەبەکان دژی هێرشی تورکەکان رێک بخات، کاری کۆبوونەوەکە ئەو سیاسەتەی دەستنیشان کرد کە دوای گرتنەوەی رواندز پەیڕەوی بکەین. من پێش گەڕانەوەم بەهەلم زانی کە پێ دابگرم کە ئەم کردارە سەربازییە دەبێ گرتنەوەی سلێمانیشی بەدوادا بێت، وا بڕیار بوو کاروانی کۆیە لە ٤ی نیسان بگاتە کۆیە، منیش بەپەرۆش بووم بۆ دیتنی سەرهەنگ (وینسنت) و (لاین)، (لاین) ئەفسەرێکی سیاسیی کاروانەکە بوو، بڕیارم دا بەفڕۆکە نەچم، بەرێگای زەوی بچم و بەناوچەی شوان و گوندەکانی شێخ بزەینی کە هەردوو لای زێیان گرتبوو تێپەڕیم و خۆمیان پێشان بدەم، لەم دواییەش خەڵکەکە هەندێک لێمان سارد ببوونەوە، بەسواری ئۆتۆمبیل بە دووریی ١٤ میل (نزیکەی ٢٣ کیلۆمەتر) لە کەرکووکەوە بچین، لەوێشەوە بەسواری ئەسپ درێژەم بەگەشتەکەم دا بۆ (تەق تەق). لەو کاتەدا کە بەهۆی توانەوەی بەفر و باران بارینی زۆری رۆژانی پێشوو، زێی هەستاندبوو، ئاوەکە پانتاییەکی ١٥٠ یاردەی داگیر کردبوو و بەتوندی هاژەهاژی دەهات، کاتی پەڕینەوەمان شالاوی ئاوەکە کەلەکەی ئێمەی لەگەڵ خۆی برد و تا هێنامانەوە ئەوبەری رۆخی زێیەکە ٥٠ خولەکی خایاند.

کە گەیشتینە کۆیە، پڕ بوو لە سەرباز، دوای بارانێکی زۆر بەقوڕ و چڵپاو داگیر کرابوو. لەماڵی (مەلا حەوێز) ئاغای غەفووری دابەزیم. ئەو لەگەڵ (جەمیل ئاغا)ی قایمقام بەخواردنی زۆر خۆش و بەتام و سنگی فراوانەوە کە رەوشتی کوردانە، خزمەتی زۆریان بە فەرماندە و ئەفسەری باڵا کرد.

(سرجون سالموند) لە ٩ی مانگدا بەفڕۆکە گەیشتە کۆیە بۆ پێدانی فەرمانی پێویست بۆ کرداری هەڵمەتەکە، بۆ رۆژی دواتر کاروانی کۆیە بەرەو (سەرخمە) بە (هەیبەت سوڵتان)دا تێپەڕی، جگە لە بۆمبارانی هەوایی، بووە یەکەم چەسپاندنی دەسەڵاتی حکوومەت لە ناوچەی (رانیە)، کە پێش حەوت مانگ لە پاشەکشە خەفەتبارەکەی هێزەکانی کاروانی رانیەدا بوو.

چونکە تا چەند رۆژی تر، ئاڵوگۆڕێک چاوەڕوان نەدەکرا، بڕیارم دا بچمە ئاڵتوون کۆپری و دوای ئەو ناحیەی مەلحە ببینم، کە تا ئێستا لەبەر گیروگرفت و سەرقاڵبوونم بەرووداوەکانی سلێمانی لێی بێ ئاگا بووم. دوای بیست خولەک رێ، لە (هەرمۆتە) تێپەڕیم کە گوندێکی قەزای کۆیەیە و بەتەنیا ئەو گوندە دانیشتوانی هەمووی فەلەن. چەند میلێک بە رۆخی رووباری (کۆیە)دا ئەو رێگایە تێدەپەڕی، کە لەو وەرزەی ساڵدا ئاوی زۆرە، بەرواڵەت بەر لە گەیشتنی بەباریکەرێیەکی بەشی رۆژئاوای، کە دەچووە گوندەکانی (ئۆمەر گومبەت) و (سێ گردکان) چەند جار پەڕینەوە.

سەروبەندی رۆژ ئاوابوون گەیشتینە رەشماڵەکانی (مەحموود ئاغای شێخ بزەینی) کە لە قەراغی بەستی (هەوار) هەڵیاندابوون و یەک میل لە گوندی (سارتک) و ٣٠ میل لە کۆیە دوور بوو. شەوێکی ئارامم لە ناوەندی ئەو مێرگە سەوز و جوانە بردە سەر، کە مرۆڤ وا هەست دەکا، بە هەزاران میل لەو شوێنەی کە بەیانی جیهان هێشتووە دوورە. خانەخوێیەکەم گوتی: خەڵکی ئەو دوو گوندەی کە من ئەمڕۆ لێیان تێپەڕ ببووم، (ئۆمەر گومبەت و سێ گردکان) بە زاراوەیەکی تایبەت بەخۆیان دەدوێن، گوتی: ئەوانە وەک گوندەکانی ئەو ناوچەیەی هەردوو لای زێ، شێخ بزێنین، ئەوان بەپێچەوانەی ئەندامانی تری ئەو تیرەیە زمانە کوردییەکەی خۆیان پاراستووە، چەند نموونەیەکیشی لە وشەی ئەو زمانە گوت، کە بەڕای من لە زاراوەی کوردی کرماشانی یا لەکی باکووری لورستان دەچوو، وام بیستووە کە شێخ بزێنییەکان بەگوێرەی داستانێک لە بنەڕەتدا لە

مووسڵ یا لە بەشەکانی باکووری ئەو شارە هاتوون. لەبەرئەوە ئەو ئاخافتنە هەروەک (جەمال ئاغای کۆیی) کە خەڵکی ئەو دوو گوندەیە بۆی باس کردم سەر بە هۆزێکن بەناوی (دەربەندی) و لە ناوچەی (زەهاو) لە سەرووی رێگای گشتیی ئێرانی نزیک دۆڵی گەلی (تەقیەگرە) هاتوون، ئەو شوێنەی کە رووباری (حەلوان) بەرێگای (قەسری شیرین) و (خانەقین) دەچێتە ناو دەربەندی (دەرتەنگ).

لەو ماوەیەدا تا ١٥ی نیسان پوختەی رووداوەکان کە ئەدمۆندز نووسیوبەتی بەم شێوەیەیە: کاروانی سنوور گەیشتە دەشتی هەریر. دەنگۆی گرتنی سپیلک لەلایەن دوژمن هەبوو، لەبارەی هێزەکەی کۆیەوە سەرکەوتنی باشی لە (بیتوێن) بەدەست هێناوە، تۆیە گیراوەکانی کاروانی رانیە وەرگیرانەوە تەنیا یەکێکیان نەبێ کە کلیلی داخەرەکەی نەما بوو، ئەویش دواتر لە رواندز دۆزرایەوە، فەرماندەی کرداری هێزی ئاسمانی رای گەیاند کە بە هێرشی ئاسمانیی ئەستەم سپیلک رزگار بکرێ، چونکە پێچ و پەنای زۆرە، دەبێ بە هێزێکی هاوبەش بێ، لە دیدارێکدا لە کۆیە (فنستت) داوای لە من و (لاین) کرد کە زانیاریی باشی بۆ ئەو رێگایەی کە پێیدا چووبووین بۆ کۆ بکەینەوە، چونکە پێشتر لەسەر نەخشە دیاری نەکرا بوو.

کردارەکە لە سەدی سەد سەرکەوتنی بەدەست هێنا، لە رۆژی یەکەم و نۆزدەهەم هەروەک پێشبینی دەکرا کاروانەکە لەودیوی (بالیسان) تووشی شەڕ و پێکدادان هاتبوو، بەڵام بە هاوکاریی هێزی ئاسمانی تەنیا پێنج سەربازمان لێ بریندار بوو و هیچ زیانێکی ترمان پێ نەگەیشت دوژمن بەزیانێکی زۆر پاشەکشێی کرد. لە شەوی ١٩-٢٠ی مانگ (ئۆزدەمیر) بەبێ ئەوەی یەک فیشەک بتەقێنێ بنکەکانی لە (سپیلک) بەجێ هێشت، ئەوەی گوترا بوو لەبارەی سەختی و قایمیی ئەو شوێنە درۆ نەبوو، رواندز دوای نیوەڕۆی رۆژی ٢٢ی مانگ بەبێ بەرگری کەوتە دەست ئێمە.

چۆنیەتیی بەڕێوەبردنی (رواندز) بۆ ئێمە گرفت بوو، دەوڵەتی عێراق: شا و سەرۆک وەزیر و موتەسەریفی هەولێر بە پشتیوانیی (کورنوالیس و بوردیللون و لاین) دەیانویست کارمەندێکی ئاسایی بکەنە قایمقام، بەڵام سر (هنری دوبس) بەپشتیوانیی فەرماندەی هێزی ئاسمانی بەباشیان دەزانی کە (سەید تەها) ببێتە قایمقام، چونکە قایمقامێکی (گوللەبەند) دەیتوانی کارەکان بەباشی بەڕێوە ببات. بەبێ وەرگرتنی یارمەتی لە حکوومەت لە کاتی رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ گێرەشێوێنەکان، چونکە بەپێی زانیارییەکی باوەڕ پێکراو، پاش جێهێشتنی رواندز تورکەکان دەیانویست ژمارەیەک تێکدەر بۆ ئاژاوەگێڕان و نائارامی بنێرنە ناوچەکە. لەبەرئەوە کاری لەناوبردنیان پێ سپێردرا بەبێ یارمەتیی سەربازی.

لە بەغدا لەو کاتەی نانی ئێوارەم لەگەڵ سەرتیپی ئاسمانی (ل.ی جارلتون) و فەرماندەکانی تیپ (هیرسن و ماکنیس و بودیللون) دەخوارد کە ئەو برووسکە خۆشەم پێ گەیشت، کە رواندز کەوتەوە دەستمان. ئەو سەربازە تازانەی کە کاروانی کۆیەیان پێک هێنابوو (رتل کۆی) لە گەڕانەوەیان تووشی نەخۆشیی زگچوون و مایەسیری و نەخۆشیی تر کە پتر ئەو سەربازە نوێیانە دەیگرن، ئەوانە لە پەلوپۆ کەوتبوون، لەبەرئەوە بڕیار درا کە دوو پۆل لەو سەربازانە بگۆڕدرێ بەدوو پۆلی خاوەن ئەزموونی سوپای هیندستان و سوودیان لێ وەربگیردرێ بۆ گرتنەوەی سلێمانی.

لە رۆژی ٢٧ی نیسان گەڕامەوە کەرکووک و بەیانی بۆ رۆژی دواتر بەفڕۆکە لەگەڵ ئەفسەری فڕۆکەوان (ا.و. ود) بۆ کۆیە بەڕێ کەوتم، کاتێک کە لە شار نزیک بووینەوە تووشی رەشەبایەکی توند و بەهێز بووین، کە بەشێوەیەکی زۆر ترسناک بەبناری چیای هەیبەت سوڵتان دەهاتە خوارێ و فڕۆکەکەی ئێمەی وەک تۆپی یاری دەسووڕاندەوە، کاتێ کە نیشتین تەوژمی با ئێمەی لەسەر کورسییەکان بەرز کردەوە کە تا ئێستا بەم شێوەیە تووشمان نەبووە. مەبەست لەو چاوپێکەوتنانە درێژەدان بوو بەپەیوەندییەکانمان لەگەڵ هۆز و ئاغاکانی ناوچەی رانیە.

**کۆمیسیۆنی مووسڵ**
**(لیژنەی ویلایەتی مووسڵ)**

پەیمانی لۆزان کە لە ٢٤ی تەمووزی ١٩٢٣ مۆر کرا، نۆ مانگ ماوە بەئیمزاکەرەکان درا کە ئەو

پەیمانە لەو ماوەیەدا لە نێوان خۆیان بەشێوەی دۆستانە کێشەکەیان چارەسەر بکەن.

کاتی پێکهێنانی کۆنفرانس، نوێنەری تورکیا داوای گەڕانەوەی هەموو ویلایەتی مووسڵی بۆ وڵاتەکەی دووپات کردەوە. لەلایەکی ترەوە (سر. برسی. کۆکس) داوای سنوورێکی تری ویلایەتی مووسڵی کرد کە لە هێڵی باکووری ئەو ویلایەتە زیاتره تەنانەت ویلایەتی کۆنی ئاشوورییەکانیشی دەگەڕاندەوە سەر عێراق کە ئەو ئاشوورییانە لێی نیشتەجێ بوون، ئەم داوایەش لەو پێشنیارانەدا نەبوو کە ئاراستەی کۆنفرانسی (لۆزان) کرابوون. دواتر هەردوو لایەن بەقەد تۆزقاڵێک لە هەڵوێستی خۆیان دانەبەزین.

لە ٥ی مانگی شەش کارەکانی کۆنفرانس هەڵوەشا و لە ٦ی مانگی ئاب پاش مانگێک دوای نۆ مانگە دیاریکراوەکە، حکوومەتی بەریتانیا کێشەکەی بە کۆمەڵەی گەلان (عصبة الامم) سپارد.

لیژنەکەی کۆمەڵەی گەلان لە ١٦ی مانگ گەیشت و ئەندامانی لەم بەڕێزانەی خوارەوە پێک هاتبوو: (ا- ف- فیرسن) کە بەرەگەز سوێدییە، (کونت بول تلیکی) بەلجیکی، (سنیور رودولو) ئیتاڵی و (دی بورتالیە) کە بەرەگەز سویسرییە، هەردووکیان بەنووسەری بڕیاردەر دەستنیشان کران. (فیرسن) یەکێک لە وەزیرەکانی پێشووی بەرزی باڵیۆزگەری بوو، هاوڕێکانی بەسەرۆکی لیژنەکە هەڵبژارد لەبەرئەوەی وڵاتەکەشی (سوید) بەدرێژایی شەڕ (شەڕی یەکەمی جیهانی) بێلایەن بوو. بەڵام کەسایەتیی ئەو زۆر بەهێز نەبوو، چونکە هەوڵی زیاتری بۆ چارەسەری کێشەکە بەسازدان ئەنجام دەدا نەک بە چارەسەرکردنی بنەمای کێشەکە، (تیلکی) مرۆڤێکی نەسرەوت بوو بە پێچەوانەی (فیرسن). (تیلکی) جگە لەوەی کە لە تەمموزی ساڵی ١٩٢٠ تا نیسانی ١٩٢١ سەرۆک وەزیری وڵاتەکەی بووە، ئێستاش سەرۆکی رێکخراوی دیدەوانیی هەنغارییە [٢].

ئەو بایەخی بەلایەنی جوگرافی و رەگەزناسی و نەتەوەیی دەدا.

ژمێریارێک و فەرمانبەرێکی تریش کە سویسری بوون، بۆ نووسەرە بڕیاردەرەکان دامەزران. (ج.ه. کرامرز) کە رۆژهەڵاتناسێکی گەنجی هۆڵەندییە وەک وەرگێڕی زمان بۆ لیژنەکە زیاد بوو، کە زمانی سەرەکیی تورکی بوو. خزمەتچی (تنیلکی) چێشتی بۆ لیژنەکە ئامادە دەکرد.

(تیلکی) ئینگلیزیی باش دەزانی، (فیرسن) هێندێ دەزانی، بەڵام بەفەرەنسی قسەی دەکرد.

لیژنەی تورکەکان بریتی بوون لە: ژەنەراڵ (جەواد پاشا) بە راوێژکار و سەرۆکی لیژنەکە دانرا کە پشکنەری گشتیی سوپا لە بەرەی جەزیرە و ئەگەر شەڕ دژی عێراق دەست پێ بکرابا ئەوا دەبووە فەرماندەی گشتیی ئەو بەرەیە. ئەندامانی تری ئەم لیژنەیە (کامل بەگ) بۆ لیوای



لە چەپەوە بۆ ڕاست: فتاح، بدری، کرامرز، شاریر، رودولو، بورتالیس، ویبر، پیکو
دانیشتوان لە چەپەوە بۆ ڕاست: ناظم، ادموندز، جواد، پاولس، ڤیرسن، تیلیکی، جاردین، صبیح، کامل.

مووسڵ، (نازم بەگ نەوتچی زادە) بۆ لیوای کەرکووک، (فەتاح ئەفەندی) بۆ لیوای سلێمانی و دواتر ئەفسەرێکی گەنج بەناوی (بەدری بەگ) گەیشتە لیژنەکە.

ئەندامی لیژنەکە (کامل) ئەفسەرێکی باش بوو، شارەزای کوردستان بوو، ئەرکەکانی کە قورس بوو، زۆر بە توانا و راستی ئەنجام دا، (نازم) ئەو کەسە بوو کە دوو ساڵ پێشتر لە کەرکووک رایکردبوو، (فەتاح) زاوای شێخ مەحموود بوو، هەردووکیان لە شەڕی سارد پێش گەیشتنی لیژنەکە چالاک بوون، (نازم) کاتی خۆی ئەفسەری سیاسیی ئەو هێزەی تورکیا بوو کە لە جەزیرەوە بۆ (چال) دەچوو لە ناو خاکی عێراق. راوێژکاری بەریتانی لیژنەکە (جاردین) بوو، یاریدەدەرەکەی نوێنەری حکوومەتی عێراق بوو ناوی (سەبیح بەگ نەشئەت).

منیش کە خاوەن ئەزموونێکی زۆر و زمانەکانی فەرەنسی و ئەڵمانی و ئیتالی و کەمێکیش تورکی دەزانم بە (لێپرسراوی پەیوەندیگر) بۆ کۆمیسیۆن دانرام، لێکدانەوەی زۆر بۆ ئەو کێشەیە کراوە، گوتراوە: بەغدا و بەسرە هەرگیز ناتوانن بەبێ مووسڵ دەوڵەت پێک بهێنن، بەهۆی لێکدانەوەی ئابووری و سەربازی، بڵاوکراوەکانی جیهان ئەو کێشەیان بە پێشبڕکێ دادەنا بۆ گەیشتن بۆ چاڵەکانی نەوت، شا فەیسەڵ لە یاداشتێکدا گوتبووی: (مووسڵ وەک سەرە بۆ لەش و مەسەلەی هەموو عێراقە و چارەنووسی چوار ملیۆن کەس لە دەست ئەو کۆمیسیۆنە بەرێزەدایە).

بارودۆخی هەولێر و کەرکووک و سلێمانی لەگەڵ مووسڵ جیاوازە، گشت کاربەدەستانی باڵای ئەو سێ لیوایە خەڵکی ناوچەکەن عەرەبیان لە ناودا نییە، ئەوانیش وەک ئێمە نایانەوێ لەگەڵ ئەو وڵاتە تازە دامەزراوە بن، بەم دواییەش ئامادە بوون ئاڵا هەڵکەن و لە هەڵبژاردندا بەشدار بن.

لەبەرئەوەی هەستی دانیشتوانی ئەو سێ لیوایە روون و ئاشکرا بوو، لە دژی پێکهێنانی لیژنەکانی بەرگری راوەستاین و کاتێک لە بەغداوە دوو کەسیان بۆ پێکهێنانی ئەم جۆرە لیژنانە ناردبووە کەرکووک، ئەوانەمان لە وێستگە بەیەکەم شەمەندەفەر رەوانەی بەغدا کردەوە.

بەیانیی رۆژی ١١ی شوبات بەسواری فڕۆکە لە مووسڵەوە چوومە هەولێر و توانیم بەر لەوەی کە (لاین) خۆی بەئەندامانی کۆمیسیۆنی ئەو لقە بناسێنێ، لە سنووری لیوا لە رۆخی زێی گەورە چاوم پێی بکەوێ و گفتوگۆیەکی کورتی لەگەڵ بکەم. گفتوگۆیەکی دووروودرێژیشم لەگەڵ (ئەحمەد ئەفەندی) موتەسەریف کرد. ئەزموونی مووسڵ بەڵگەیەکی دروستی ئەو بڕیارە بوو، کە ئێمە لەسەر ئەو سێ لیوایە دابوومان و دڵنیا بووین لەگەڵ ئەو رێکخستنە سازگار دەبێ، کە کۆمیسیۆن دوای کۆسپ و ماندووبوونێکی زۆر بەم ئەنجامە گەیشت. بڕیار درا خۆپێشاندانی هەریەک لەو دوو لایەنانە قەدەغە بکرێ. دەبێ ئەو کەسانەی کە بۆ شایەتی (شاهید)ی دەستنیشان دەکرێن، دەبێ بەشێوەی مووسڵ، بەپێی بارودۆخی کۆمەڵایەتی ناوی کەسایەتییەکان بۆ شاهیدی هەڵبژێرن. نابێ وەک مووچەخۆرێکی ئاسایی بیروبۆچوونیان لە بەرچاو بگیرێ، ئەوانەی لایەنگری تورکیاش دەکەن، نابێ پشتگوێ بخرێن، بەڵام دەبێ بۆ ئەندامانی لیژنەکە روون بکرێتەوە کەچی دیاردەیەک پتر بووەتە هۆی پێشاندانی ئەم هەستە لەلایەن ئەوانەوە، دەبێ پۆلیس لە لیژنەکە دوور بخرێتەوە.

هەنگاوەکانی موتەسەریفی هەولێر لەم بارەیەوە کاریگەر بوو، کاتێک ئەو رۆژە لە کاتی عەسر لەگەڵ (باولس و بورتالیە) بە بازاڕ و بە کۆڵانەکانی قەڵاتدا دەڕۆیشتین، هەستمان بەبێدەنگی و هێمنی رادەبەدەر کرد، دوور لە کاردانەوە و هەڵچوون، خاوەن کارەکان و دوکاندارەکان و سەوزەفرۆشەکان، سەریان بە کارەکانیانەوە قاڵ بوو، بەڕادەیەک کە پێمان شتێکی دەگمەن بوو کە سەرنجی میوانەکانی راکێشا بوو، چاویان لە کارەکانیان بڕیبوو، کاتێک کە پرسیاری نرخی شتومەکەکانت لێ دەکردن لەبەر مژولی خۆیان سەریان بەرز نەدەکردەوە.

ئەو شەوە (لاین و لتلدیل) خوانێکی خواردنی ئێوارەیان لە خانووەکەیان ئامادە کردبوو کە لە دەرەوەی شار بوو، (ئەحمەد ئەفەندی) موتەسەریفیش ئەرکی میوانداریی چاودێرە تورکەکانی خستە ئەستۆی خۆی، میوانەکان دۆش دامابوون، نەیاندەزانی لەگەڵ ئەو دوو مرۆڤە هەستی خۆیان چۆن

دەربڕن کە هەست بە بەرپرسیارییەتی ناکەن. (لاین و تیلیلکی) زۆربەی کاتەکانی ئەو دوو هەفتە بەیەکەوە بوون و پێکەوە لە ناوچەکانی لیوا دەگەڕان و پەیوەندییان بەیەکەوە زۆر پتەو بوو و هەردووکیان یەکتریان باش دەناسی. هێمای بنەماڵەکەی (تیلیکی) بزنەکێوییەک بوو کە لەسەر تاجێک بازی دەدا، لەبەرئەوە زۆری حەز دەکرد کە سەری بزنەکێوییەک لە چەشنی ئاسیەوی لەگەڵ خۆی بەرێتەوە وڵاتەکەی، لەبەرئەوە کاری لیژنەکەی ٢٤ کاتژمێر راگرت، بۆ ئەم مەبەستە چووە چیای (سەفین) کە دەکەوێتە ناوچەی خۆشناوەتی و ٦٥٠٠ پێ بەرزە و (٢٥ میل) کەوتووەتە رۆژهەڵاتی باکووری هەولێر، بەڵام لە بەدبەختی (کۆنت) نەیتوانی نیشانەکە بپێکێ لەو کاتەی کە (لاین) بزنەکێویەکی زۆرباشی نیشان دابوو، (تیلیکی) مرۆڤێکی بەهێز نەبوو، بەهۆی گەشتی زستانەی لە کوردستان نەخۆش کەوت و لە هێرشەکەی رواندزیش دواکەوت.

لە ٣ی ئازار گەیشتینەوە کەرکووک، پاش مانەوەی شەوێک لەو شارە بەرەو هەولێر بەرێ کەوتین بۆ تەواوکردنی لێکۆڵینەوەیەک کە (باولس) پێش سێ هەفتە بەنیوەچڵی بەجێی هێشتبوو.

لە دوای نیوەڕۆ گەیشتینە هەولێر و (جەواد) داوای لێ کردم: بەیەکەوە گەشتێکی ناو شار بکەین. بەو قسەیە دەستی پێ کرد کە پێشتر پێشبینیم دەکرد: ئەویش رەخنەی لە مەئموورەکانی گرت کە نەگونجاین و لەو خزمەتە نالەبار بووین و داوای لابردنی خۆی کردووە، بەڵام گوێیان نەداوەتێ، هەروەها ئەو گوتی: دەبوو ایە ئەو کێشەیە (کۆمەڵەی گەلان) نەسپێرن بۆ چارەسەری، خۆمان ئەو کارەمان ئەنجام دەدا، لەبەرئەوە من زۆر نیگەرانم. دەوڵەتی خاوەن شکۆی بەریتانیا هەلێکی گەورەی لەدەست دا کە داوای تورکیا و عێراقی نەکرد بۆ کۆنگرەیەک کە ئەو تێیدا ناوبژیوان بێ، هەم مافی تورکیا بپارێزی و هەم ئاواتەکانی عێراق بهێنێتە دی، شوێن و پێگەی بەریتانیاش پێی سەربەرز دەبۆوە.

لەوانە بوو، رێگاچارەیەک بدۆزرێتەوە بەگەڕانەوەی ئەو تورکانەی کە لەو ویلایەتە جێنشین بوون بۆ تورکیا و لەبەرچاوگرتنی هەستی نەتەوەیی کوردیش، ئەمە دەبوو ایە هێڵێک بۆ تورکیا بکێشرێ، بەڵام ئێمە داوای بەشێک لە ویلایەتی هەکاریان کرد، بەمە کارەکە دژوارتر بوو.

لە ٥ی مارت ئەندامانی لیژنەکە گەڕانەوە مووسڵ بۆ ئەنجامدانی دوا قۆناغی لێکۆڵینەوەکان، منیش لەبەرئەوەی کارێکی وام نەبوو لەو ماوە کورتەدا، بەفڕۆکە بەرەو بەغدا رۆیشتم و میوانی نێردراوی باڵا (المندوب السامی)، هەر لەو شوێنە بە دیداری (تیلیکی) شاد بووم کە ئەویش میوان بوو، کاتێکی خۆش لە ئاستێکی بەرزی خۆشگوزەرانیی ئەو ماوەیەم بەسەر برد، بەشداریم لە بەخاک سپاردنی (هـ.س. بوللی) کرد کە جێگری راوێژکاری وەزارەتی ناوەخۆ بوو، کە هاورێیەکی بەرێزم بوو و زۆریش نیگەران بووم.

دواتر لیژنەکە لە مووسڵ و دهۆک و ئامێدی و زاخۆ و شێخان و ئەلقوش و ناوچەکانی تری بادینان درێژەی بەکارەکانی دا، هاوشێوەی کارەکانی پێشووی لە کەرکووک و ئاڵتوون کۆپری و سلێمانی و کفری و ناوچەکانی تر. لە هەموو ناوچە و شارێک شایەت لە دانیشتوانی شار و گوند و هۆز و سەرۆک هۆز هەریەک بەتەنیا بانگهێشت دەکرا و لەبەرچاوی سەرۆک و ئەندامانی لیژنە ئەو پرسیارەیان لێ دەکرا کە ویلایەتی مووسڵ سەر بەعێراق بێ یا تورکیا.

لیژنەکە لە ١٨ی مانگ گەڕایەوە مووسڵ، پێنج رۆژ ماینەوە بۆ ئەوەی یارمەتیی ئەندامانی بدەم و وردبینیی ئامار و تێبینییەکان بکەین و رێکیان بخەین. لە ٢٣ی مانگ دوای وێنەگرتن و گۆڕینەوەی ناونیشانی شوێنمان و دەربڕینی خۆشەویستیی دوو لایەنە، ماڵئاواییمان لە یەکتر کرد و لێک دابڕاین، گرووپی تورکەکان بەرەو (نسێبین) لەوێوەش بۆ (ئەنکەرە) بەرێ کەوتن.

سەرەڕای ئەو هەموو هەستە راستییە دۆستانەی کە لە نێوانماندا گەشەی کردبوو، هەمووممان بەوە خۆشحاڵ بووین کە پەیوەندیمان بەیەکتر لەبارەی کارەکانی ئەو لیژنەیە کۆتایی هات.

من بەباشی دەزانم کە هەستی خۆم بەوە دەربڕم کە لە یاداشتی رۆژانەم تۆمارم کردبوو، نووسیبووم: (کاتێ کە بیر لە کارەکانی پێشوو دەکەمەوە، دەبینم کارەکانی لێکۆڵینەوەی لیژنەکە بەبێ رووداوی ترسناک و تەقینەوە جێگای

سەرسوڕمانە، لەو کاتەی مەلبەندێکی وا کە هەمیشە ئامادەی داگیرسان و گڕگرتن بوو، ئێمە وامان مەزندە دەکرد کە کارەکە بەسەرکەوتوویی بەبێ گرفت جێبەجێ نەکرێ. پاشماوەی داستانەکە دواتر زانرا کە لە راپۆرتی لیژنەکە دوای شیکردنەوەی داواکارییەکانی هەردوو لایەنی کێشەکە و لە بەرچاوگرتنی ئاکامەکانی لێکۆڵینەوەی کارەکانی لیژنەکە و بەهەند وەرگرتنی ئەو دوو مەرجەی خوارەوە راسپارد کە هێڵی برۆکسل لە نێوان عێراق و تورکیا بەسنوورێکی کۆتایی پەسند بکرێ، دوو مەرجەکەشی بەم شێوە بوو:

١- ناوچەی کێشەکە ویلایەتی مووسڵە بۆ ماوەی (٢٠ ساڵ پێشنیار کرا) لە ژێر سەرپەرشتیی (کۆمەڵەی گەلان) (عوسبەتولئومەم) بمێنێتەوە.

٢- ویست و داوای گەلی کورد لەم بارەیەوە لە بەرچاو بگیرێ کە لێپرسراوانی ئیداری و پەروەردە و دادوەری کورد بن و زمانی کوردیش لە دەزگاکان و قوتابخانە و پەیمانگاکان بەزمانی فەرمی بناسرێ.

بەگوێرەی بڕگەیەکی تر کە بڕیار و دۆخی پێشهاتی تێدا گونجا بوو، راگەیەنرا: ئەگەر (کۆمەڵەی گەلان) بەپێویستی زانی کە ناوچەی کێشە لەسەر دابەش بکات، باشترین هێڵی ئەو دابەشکردنە هێڵی ئاوی زێی بچووکە.

لە ئەیلوولی ساڵی ١٩٢٥ راپۆرتی لیژنەی ویلایەتی مووسڵ کەوتە بەرباس لە شووراى (کۆمەڵەی گەلان) بۆ لێکۆڵینەوە، تورکیا لەم باوەڕەدا بوو کە شوورا مافی بڕیاردانی نییە و نابێ ئەو دوو لایەنە بڕیارەکە بەڕێوە ببەن، دواتر کێشەکە بۆ دادگای دادی نێودەوڵەتیی هەمیشەیی بەرز کرایەوە. دیوانی دادوەری ئەم دادگایە لە ٢١ی تشرینی دووەم رای گەیاند کە بڕیاری شوورا بەزۆربەی دەنگ پەسند کراوە و هەردوو لایەنی کێشەکە پێویستە بڕیاری شوورا لە بەرچاو بگرن و بڕیارەکە دەستەبەر بکرێ بۆ دیاریکردنی سنوور دەبێ (دەنگی ئەو دوو لایەنە هەژمار نەکرێ).

تورکیا ئامادە نەبوو بۆ سەلماندنی بڕیاری دیوانی دادوەری، لەبەرئەوە لیژنەیەکی سێ کەسی پێک هێنرا بەسەرۆکایەتیی (سوێدییەک)، لە سەرەتا لیژنەکە لای وا بوو کە بیرۆکەی هێڵی زێی بچووک، واتە دابەشکردن باس بکرێ، بەڵام ئەنجوومەنی گەلان لە کۆتاییدا بڕیاری دا کە هێڵی برۆکسل بۆ سنوور بەفەرمی بناسرێ ئەوەش لە بەرواری ١٦ی کانوونی دووەم بوو. دەنگۆی ئەوە هەبوو کە گوایە ئاکامی بڕیارەکە بۆ (تیلیکی) دەگەڕێتەوە ناتوانین بڵێین کە (تیلیکی) لە دژی بەرژەوەندیی تورکیا هەوڵی داوە، بەڵام ئەو دژی هەر بڕیارێک بوو کە منداڵێک بکرێتە دوو پارچە بۆ ئەوەی دوو دایک رەزامەند بن.

بۆ ئەنجامدانی ئەو مەرجانەی کە ئەو بڕیارەیان پێ بەسترابووەوە، کات بەفیڕۆ نەچوو. گفتوگۆ بۆ بەستنی پەیمانی نوێ بەپەلە دەست پێ کرا و پەیمانێک لە ١٣ی کانوونی یەکەم ساڵی ١٩٢٦ ئیمزا کرا و بەپێی ئەو ماوەی تەمەنی دیاریکراو لە پرۆتۆکۆڵی سەر بەپەیمانی ساڵی ١٩٢٣ی ئینگلیز و عێراق وەلانرا و پەیمان لە ١٩٢٥/١/١٦ ماوەکە بۆ ٢٥ ساڵ نوێ کرایەوە (مەگەر بەر لە تەواوبوونی ماوەی دیاریکراو ببێتە ئەندام لە کۆمەڵەی وڵاتانی سەر بە (کۆمەڵەی گەلان)[٣] بە پێچەوانەی پەیمانی پێشوو، پاش پێنج رۆژ لە ئیمزاکردنی بەزۆرینەی دەنگ لەلایەن پەرلەمانی عێراق پەسند کرا و لە مانگی مارت لە شووراى ئەنجوومەنی گەلان باس کرا. دوای دڵنیابوون لە دانی بەڵێن لەسەر خواستی گەلی کورد بۆ بەڕێوەبردنی ناوچەکەیان بەدەستی خۆیان، لە ناوچە کوردنشینەکان، شوورا پەیمانەکەی پەسند کرد. تورکەکان لەگەڵ ئەم بڕیارە نەبوون، بەڵام لە ئاکامی گفتوگۆی راستەوخۆی لێزانانەی بالیۆزی بەریتانیا لە تورکیا (سێر رۆناڵد لیندزی) بەهەندێ ئاڵوگۆڕ لە بڕگەیەکی هێڵی برۆکسلدا پەیمانێکی سێ قۆڵی لە نێوان بەریتانیا، عێراق و تورکیا لە بەرواری ١٩٢٦/٦/٥ ئیمزا کرا و ئەو ناکۆکییە ناسروشتییەی نێوان تورکیا و بەریتانیا کۆتایی پێ هات کە ١١ ساڵی خایاند و رێزگرتن و هاوکاریی دوو لایەنە کە پەیرەو دەکرا، بەرەزامەندیی هەردوولا کە مەبەستیان بوو. بڕیاری ١٦ی کانوونی یەکەم لە عێراق پێشوازییەکی گەرمی لێ کرا، شا فەیسەڵ برووسکەیەکی سوپاسنامەی بەسۆزی بۆ شا (جۆرج) نارد، سەرۆکی وەزیران (عەبدولموحسین ئەلسەعدون) کە لە شوێنی (یاسین ئەلهاشمی) ببووە سەرۆک وەزیر برووسکەی پیرۆزبایی بۆ (مستەر

بالدوین) نارد. بۆ ڕێزگرتن لە پشتیوانیی زۆری بەریتانیا لە بەرژەوەندییەکانی عێراق لە (کۆمەڵەی گەلان) (عەبدولعەزیز ئەلقەساب) موتەسەریفی مووسڵ داوای لە حکوومەتەکەی کرد کە باخی تازەی شارەوانی بەناوی (ئیمری پارک) باخی لۆرد ئیمری ناو بنێن و پێشنیارەکەی پەسند کرا. ئێمەش کە لە شەڕەکاندا لە بەرەی پێشەوەدا بووین، ئەو سەرکەوتنە یەکجارەکییەش تەنیا هەر بۆ ئەوە نەبوو کە ئەو مۆتەکە ڕەشە کە لەو ساڵانەی دوایی بەدڵەڕاوکێی زۆر لەسەر سەرمان دەسووڕایەوە لابەرێ، بەڵکو بۆ پتەوکردنی دۆستایەتییەک کە تا پێش ساڵی ١٩٤٥ کەس بیری لێ نەدەکردەوە. ئەو ناوانە (جاردین و سەیح)، (عەبدولعەزیز و لوید و عەبدولحەمید)، (ئەحمەد عوسمان و لاین و لتدیل)، (مەجیدە یەعقوبی و میللەر و مراد)، (عومەر نەزمی و کورنز)، (جامان و ئەحمەدی تۆفیق)، زۆری تر لە قایمقامەکان و بەڕێوەبەری ناحیەکان و ئەفسەرەکانی پۆلیس و هاووڵاتیی ئاسایی، کاتێ سەیری لیستی ئەو ناوانە دەکەم دڵخۆشتر و گەرمتر دەبم، بەرامبەر ئەو هاوڕێیەتییە نەمرانەی کە لەو سەردەمە پەیوەندیی توندمان بەیەکەوە هەبوو.

ڕۆژێکی ڕەش بوو کە کاری پەروەردە و فێرکردن کەوتە ژێر دەستی کەسانێک کە لەم بارەیەوە زانیارییان نەبوو، کۆچبەرانی سووری و ئەوانەی کە تێڕوانینیان بەرامبەر بێگانە باش نەبوو، لەم ماوەیەدا نەوەیەکی تازە پێگەیشت کە بچووکترین ئاگادارییان لەوە نییە، کە بەهۆی وڵاتێک فێری ئەمەکناسی بوون، هەم لەدایکبوونی و هەم لەسەر پێ ڕاوەستانی لە زۆربەی قەیرانەکاندا قەرزاری هاوکاریی دەوڵەتی بەریتانیان لە یەکەم سەرۆکی دەوڵەتییەوە تا بەلایەنی کەم باوکی هەندێ لە نەوەی ئێستا.

کوردەکان بەگشتی بەمەرجەکانی (کۆمەڵەی گەلان) ڕازی بوون و لە ناو خەڵکی سلێمانی کاردانەوەی باشی هەبوو. بەپێچەوانەی ڕاوبۆچوونی هەندێ کەس کە لایەنگری تورکیا بوون، بەڵام ئێستا لەگەڵ بەرەی ئێمەدان. ڕاپۆرتی (کۆمەڵەی گەلان) پشتگیریی باشی لە داخوازییەکانی گەلی کورد کرد، لەو کاتەی کە بارودۆخی عێراق زۆر ترسناک بوو، بڕیار درا کە پەیمانی ئەنگلو- عێراقی لەو شەوە مێژوویییەی ١٩٢٤/٦/١٠ مۆر بکرێ. ئێستاش بەو هەڵوێستە کە لە سلێمانی جارێکی تر وڵاتیان لە لەتبوون و دابەشبوون ڕزگار کرد. ڕێبەرانی کوردیش هەم لە خۆیاندا هەستی سەربازییان دەکرد و شانازییان بە وڵاتێک دەکرد کە پێیان وا بوو بۆ ئەو وڵاتە دانیشتوویەکی بێ کەڵک نەبوون، هەلومەرجێکی مەزن بوو.

کە لە (دهۆک) بووم، نامەیەکم لە (کورنوالیس) پێ گەیشت کە ئەرکی جێگری ڕاوێژکاری وەزارەتی ناوەخۆی وڵات وەربگرم. پاش دوودڵی و تێڕوانینێکی ورد، بەپێشنیارەکە ڕازی بووم. ئەوە سەرەتای هاوکاریی بێ گەرد بوو لەگەڵ (کورنوالیس) کە دە ساڵی خایاند و لەو ماوەیەدا جگە لە خۆشەویستی و لێبووردن و هێمنایەتی، شتێکی ترم لێ نەبینی، تا سەرەنجام لە ساڵی ١٩٣٥ شوێنی ئەوم گرتەوە.

سپاردنی کارەکانم بە (میللر) کە زۆرجار کارەکانی لە جیاتی من ئەنجام دەدا، ڕێوڕەسمی بەڕێکردنم زۆر بەکورتی ئەنجام دا و کاتی زۆری نەبرد، چونکە مانگی ڕەمەزان بوو. بۆ بەیانی لە ٢٧ی مارت لەو کاتەی (حەمەعەلی) لە پشتەوەی ئۆتۆمبێلەکە و لە ناو دەستەنوێن و جانتاکاندا دانیشتبوو و منیش لە کورسیی پێشەوە ماندوو و شەکەت بووم و لە کاتێکدا هەزاران زنجیرەی دۆستی و خۆشەویستی لە دڵمدا کۆببوونەوە، بە (خەلیل)م گوت کە ڕێگای باشوور بۆ بەغدا کە بە(حەمرین) دادەڕوا بگرێتە بەر.

١- گۆڕین و پوختەی لە عەرەبییەوە بۆ زمانی کوردی، ئەو بەشەی کە پەیوەندیی بەناوچەی هەولێر هەیە لە کتێبی، کورد- تورک- عەرەب وەرگیراوە.

گۆڕینی لە زمانی ئینگلیزی بۆ زمانی عەرەبی (جەرجیس فەتحوڵڵا)

چاپخانەی تایمس- بەغدا ١٩٧١

(١) (سافیل رو) دووکانێکی گەورەی فرۆشتنی جلوبەرگە لە لەندەن.

(٢) (تیلکی) هەژار دووبارە سەرۆکی حکوومەتی (مەجەر) ساڵی ١٩٣٩ هەڵبژێردرا، لە نیسانی ١٩٤١ بەدەستی خۆی خۆی کوشت، چونکە پێی باشتر بوو، لەوەی خاکی وڵاتەکەی بەداوای (هیتلەر) بۆ سەربازەکانی ئەڵمانیا بەکار بهێنرێت.

(٣) عێراق لە ١٩٣٢/٩/٣ بەئەندام لە کۆمەڵەی گەلان وەرگیرا.

# هەولێر لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی بەریتانیادا

ئا : لیژنەی ئینسایکلۆپیدیا

بەڵگەنامە سەرچاوەیەکی گرنگ و بەنرخە بۆ نووسینەوەی مێژوو بەهەموو بەشەکانیەوە، بەداخەوە لە ولاتی ئێمە لەبەر بارودۆخی نالەبار یا لەبەر کەمتەرخەمی ئەو بایەخەی پێ نەدراوە و لەبەرئەوە زۆربەی بەڵگەنامەکان لەناوچوون و فەوتاون.

بەریتانیا لە رووی پاراستنی بەڵگەنامە و ئەرشیف زۆر پێشکەوتووە. هەر لە ساڵی (١٧٠٣)ی زایینی رووناکبیران دەرکیان پێ کردووە و لیژنەیەکیان پێکهێناوە بۆ رێکخستنی بەڵگەنامەکان و تۆمارکردنیان لە تۆمارگەی تایبەت و لە کات و ساتی خۆی بلاو کراوەتەوە و سوودیان لێ وەرگرتووە. لە ١٨٣٨/٨/١٤ یاسای دامەزراندنی بەڵگەنامەی نەتەوەیی دامەزرا، کە گەورەی دادوەران لەو ولاتە سەرپەرشتیی دەکرد. بۆ ئەم مەبەستەش پرۆژەیەکی یاسایی پاراستنی بەڵگەنامەکانی پێشکەش بەپەرلەمان کرد. دواتر باڵەخانەیەکی تایبەت بەناوی (باڵەخانەی بەڵگەنامەی نەتەوەیی) بۆ ئەم مەبەستە تەرخان کرا، کە لە رێکەوتی ١٨٥١/٥/٢٤ بەردی بناغەی دانرا بوو، لە ساڵی ١٨٥٦ هەموو بەڵگەنامەکان بۆ ئەم باڵەخانەیە گواسترانەوە و بەگوێرەی بابەت لەسەر بەشەکان پۆلین کران و ئەو فەرمانگەیە زۆر بەشی گرنگی لە خۆ گرتبوو. لەوانە: چاپکردن و کۆپی و وێنەگرتن و گەلێ بەشی دیکە.

ئەوەی لە یاسای بەڵگەنامەی بەریتانیدا هاتووە. کە تا تێپەربوونی ماوەیەکی زۆر. کە یاسا دەسنیشانی دەکا نابێ بلاو بکرێتەوە. بۆ نموونە بەڵگەنامەی ساڵانی بیستەکانی سەدەی بیستەم پاش تێپەربوونی زیاتر لە هەشتا ساڵ بلاو کرایەوە.

بەڵگەنامەی ژمارە (٥) لە ١٩٢٠ /٣/٧/ لەلایەن سی/ ئەی / راندول یاریدەدەری ئەفسەری بەریتانی لە کۆیە نووسراوە و بۆ ئەفسەری سیاسیی بەریتانی لە هەولێر نێردراوە.

راندول نووسیویەتی: لەگەڵ مەلا محەمەد (مەبەستی مەلای گەورەی کۆیەیە) و جێگری دادوەری شەرع (جەمیل ئاغا) دانیشتم. ئەوان پێشتر یاداشتێکیان ئامادە کردبوو وا بۆتان دەنێرم. (مەلا محەمەد) بەتوندی نارەزایی خۆی دەربری لەبارەی گەرانەوەی فەرمانرەوایی خراپی تورکە عوسمانییەکان بۆ کوردستان و رێز و خۆشەویستی و رەزامەندیی خۆی بۆ فەرمانرەوایی بەریتانی دەربری لەبەر چالاکییان و دادپەروەرییان و دەستپاکییان و گوتی:

(دوارۆژی کوردستانیش بەندە بە بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا، کە بەبێ چاودێری و راسپاردەی ئەوان و ئەگەر تورکەکان بێنەوە کوردستان. ئەوا دۆخی کورد زۆر خراپ دەبێ و کۆرەو لە ناوچەکە دەست پێ دەکا).

بە راندولی راگەیاندووە. کە پێویستە فەرمانرەوایەکی

گشتی بۆ کوردستان دابنێن. مەبەستیشی (حەمید بەگ)ی بابان بووە. راندول دەڵێ : حەمید بەگ بەڕای پیاوماقووڵانی هەولێر کوردێکی رووناکبیرە. لەوانەیە بۆ بەرژەوەندیی کورد هەوڵ بدات و لەگەڵ راوێژکارە بەریتانییەکانیش بگونجێ.

دانیشتوانی کۆیە هەرچەندە پشتگیریی شێخ مەحموودیان نەکردووە، بەڵام پێیان باشە. دواڕۆژی لیواکە بە کوردستان ببەسترێتەوە، نەک بە ئیدارەی بەریتانی.

راندول دەڵێ: مەلا محەمەد لە زۆربەی کەسانی تری کورد لە لیوای هەولێر زیرەکتر و رۆشنبیرترە. بیروڕاکانیشی هەمان بیروڕای کەسایەتییەکانی لیوایە.

دەربارەی تێکڕای کورد مەلا محەمەد دەڵێ: ئێستا خەریکی نان پەیداکردنی رۆژانەن. کە زۆر بەئەستەم بۆ خێزان پەیدا دەبێ.

بەڵگەنامەی ژمارە (٦) لە ٩/ ٣/ ١٩٢٠ ژمارە **F5/71-5069** لە یاریدەدەری ئەفسەری سیاسیی بەریتانی لە کۆیە بۆ ئەفسەری سیاسیی لیوای هەولێر:

کاپتن سی. ئە ی. راندول نووسیویەتی: کۆبوونەوەی دووەممان لەگەڵ (مەلا محەمەد) و (جەمیل ئاغا) لە کۆیە ئەنجام دا و نیگەرانی و دڵەڕاوکێی خۆیان نیشان دا لەبارەی ئاکامە خراپەکانی گەڕانەوەی ئیدارەی تورکی بۆ کوردستان و جەختیان لەسەر دانانی حوکمدارێک بۆ کوردستان کردەوە. کە سەر بە بەغدا بێت. هەروەها بۆچوونی پێشووم (حەمید بەگی بابان)یان پێ باش بوو بۆ ئەم پۆستە. (مەلا محەمەد) پێی باش بوو. لەمبارەیەوە، پرس و ڕا بەکەسایەتییە کوردییەکان بکرێ. ئامادەیی خۆشیان نیشان دا بۆ هەر یارمەتییەک و داوایان لێ بکرێ بۆ نەگەڕانەوەی تورکەکان.

بەڵگەنامەی ژمارە **F5/371-5069**

دانەیەک لە بەڵگەنامەی نهێنی / آیس. سی. ١٥٥ ١٩٢٠/٧/١٧

لە ئەفسەری سیاسیی هەولێر بۆ مەندوبی سامی بەریتانی لە بەغدا

ئەفسەری سیاسی لە هەولێر لە یاداشتەکەیدا باسی گەشتەکەی بۆ کۆیە دەکا و بارودۆخەکە بەباش دادەنێ. دەڵێ: ئەو گفتوگۆیەی. کە لەگەڵ مەلای گەورەی کۆیە و ((ئەو بە مەلا فەندی ناوی دەبا)) (جەمیل ئاغا) کردبووم لەبارەی دوارۆژی کوردستان زۆر جیاوازیی نییە لەگەڵ ناوەڕۆکی ئەو دوو برووسکەی کاپتن (راندول). کە پێشتر بۆم ناردبوون.

لە دانیشتنەکەدا سەرەتا مەلا محەمەد گوتی: باوەڕ ناکەم ئەندامانی کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس ئەوەندە نەزان بن. ئەگەر دەوڵەتێکی سەربەخۆ لە باکووری کوردستان دابمەزرێ. کوردەکانی ویلایەتی مووسڵ لەگەڵیان یەک بگرن. ئەمە بیرۆکەیەکی پووچە. چونکە هەر دەوڵەتێکی کوردی لە دەرەوەی ویلایەتی مووسڵ دابمەزرێ. ئەوا کوردەکانی ئەو ویلایەتە لەگەڵیان یەک ناگرن.

مەلا محەمەد کە بەناوی کوردەوە گفتوگۆی لەگەڵمان دەکرد گوتی: بە هەموو هێزێکەوە لە دژی بیرۆکەی باشووری کوردستانی سەربەخۆ دەوەستن. چونکە زیاتر باوەڕیان بە ئیدارەی بەریتانی هەیە سەرپەرشتییان بکا.

یاداشتی ژمارە **No. P.2807-1-1** لە ١٩٢٠/٨/١٤

لە ئەفسەری سیاسیی بەریتانی (سلێمانی)

بۆ مەندوبی سامی بەریتانی لە عێراق - بەغدا

باسی کۆبوونەوەی خۆی لەگەڵ موفتی هەولێر (مەبەستی مەلافەندی)یە دەکا و دەڵێ: دڵسۆزترین و خۆشەویستترین کەسە بۆ مەلا محەمەدی کۆیی.

مەلا محەمەد گاڵتەی بەئەگەری یەکگرتنەوەی کوردەکانی باکووری مووسڵ کرد و گوتی: ئەگەر هاتوو یەکیشیان گرت. ئەوا کوردەکانی باشووری کوردستانیش لەگەڵ ئەوان یەک ناگرن. هەروەک لە یاداشتی پێشووم هەمان خاڵم بۆ نووسیبوون. کە لەگەڵ لێدوانەکەی مەلا محەمەدی کۆیی هاوبیر بوون. لەگەڵ زۆر کەسانی دیکەی هۆشمەند لەم بارەیەوە وتووێژم کردووە. کە گۆڕانکاریی ئیدارییان لە کوردستان پێ

شتێکی باش نییە.
دەستنیشانکردنی (حەمید بەگ) بۆ فەرمانڕەوایی کوردستان بە باشترین هەڵبژاردنی دادەنێن. کە تا ئێستا گوێبیستی بووین. لەگەڵ پێشنیازی مەلا محەمەد هاورام. چونکە بیروڕای توێژێکی زۆرە لە کۆمەڵگای باشووری کوردستاندا.

ئەفسەری سیاسی باسی سنووری داهاتووی کوردستان دەکا و دەڵێ: پێویستە بەشێک لە ناوچەی کەرکووک و کفری و ناو شاری کفری و ئەو ناوچانەی نێوان هەولێر و مەخموور بخرێنە سەر کوردستان. بەڵام پێمان باش نییە شاری کەرکووک و هۆزی (دزەیی) سەر بەو ناوچە بن.

ژمارە F5 371//11460
ئەم بەڵگەنامەیە لەلایەن (ئەی - ئار - بورد لون) جێگری مەندوبی سامی گشتی لە عێراق بۆ وەزیری کاروباری (مستعمرات) لە ١٠/ ٢ / ١٩٢٦ نووسراوە.

باسی ئەو خاڵانە دەکا. کە لە (کۆمەڵەی نەتەوەکان) دەربارەی ویلایەتی مووسڵ و کێشەی سنووری نێوان عێراق و تورکیا کە لە ١/١٩ / ١٩٢٦ بڕیاری لەسەر دراوە.

باسی پڕۆژەی فەرمانڕەوایی ئۆتۆنۆمی لە ناوچەکە دەکا. کە پێش دەرکردنی حامیەی تورک پێی شتێکی باش بووە. بەڵام پاش وەدەرنانی تورکەکان لە ڕەواندوز ساڵی ١٩٢٣ پێی باشترە ئەو ویلایەتە سەر بەحکوومەتی ناوەندی بێ لە بەغدا. پێشنیاز دەکا کە زاراوەی (ئۆتۆنۆمی) لە نووسراوی لیوا کوردییەکان بەکار نەهێنرێ. چونکە بۆچوونی جیاوازیی ترسناکی لێ دەکەوێتەوە و حکوومەتی عێراق و کۆمەڵەی نەتەوەکانیشی بەشێوەیەکی خراپ لێکی دەدەنەوە.

دەڵێ: لەگەڵ ئەوەی کە هەندێ لە ڕووناکبیرانی کورد داوای ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان دەکەن. بەڵام ڕای گشتیی کوردی لەگەڵ بەستنەوەی لیوا کوردییەکانن بەحکوومەتی بەغدا. لەبەر ئەو پەیوەندییە ئابوورییە و پیشەسازییەی کە لە نێوانیاندا هەیە.

پێشنیازەکانی مەندوبی سامیش بەم شێوەیە بوو:
١- دامەزراندنی لیوای دهۆک لە قەزایەکانی: ئاکرێ و ئامێدی و دهۆک و زاخۆ لە ژێر چاودێری و کارگێڕیی ئەفسەر و فەرمانبەرانی بەریتانی تا ئەو کاتەی فەرمانبەری شیاو لە کوردی ناوچەکە دادەنێن.
٢- مەندوبی سامی ڕێکخستنی گونجاو لەگەڵ ئیدارەی هەولێر و ئەفسەرە بەریتانییەکان لە کۆیە و ڕەواندز دەکا بەدامەزراندنی فەرمانبەری کارگێڕی بۆ ناوچەکە. کە هەست و ڕای هاووڵاتییانی ناوچە کوردییەکان بەرز ڕادەگیرێ.

پێشنیازەکانمان لە مووسڵ و هەولێر جێبەجێ کران بەپێچەوانەی سلێمانی. کوردەکانی شار و شارۆچکەکانی مووسڵ وایان پێ باش بوو. کە سەر بەشاری مووسڵ بن.

دەڵێ: پێشنیازەکانمان جێبەجێ نەکرا و حکوومەتی بەریتانیش لەمە بەرپرسە. هۆیەکەشی بۆ ناکۆکی لە ناو کورد دەگەڕێتەوە. کە نەیانتوانی سوود لە بەیاننامەکەی ٢٤/١٢/ ١٩٢٢ وەربگرن و هێمنی و ئارامی لەو ڕۆژگارە سەختە بپارێزن. دواتر باسی زمانی کوردی دەکا. کە لە هەولێر پەیڕەو دەکرا و دەڵێ:
لە دادگاکانی سلێمانی و کۆیە کە سەر بە لیوای هەولێرە زمانی کوردی بەکار دەهێنرێ. پاشان دەڵێ: ئێستا بە دڵنیاییەوە دەڵێم. کە هەموو کۆکن لەسەر داوا نەکردنی (ئۆتۆنۆمی) بۆ لیوا کوردییەکان. بەڵام بەدووری نازانم کاتێ کە ئاشتی و پێشکەوتن لە کوردستان بەرقەرار بێ ئەو هەڵە بقۆزنەوە و ئەو داواکارییە نەتەوەییەی کورد سەر هەڵبداتەوە. بەدووریشی نازانم. کە خەونی کوردەکان لە کوردستانێکی گەورەی سەربەخۆ. کە لە کۆنگرەی (سیڤەر) بڕیاری لەسەر درابوو بێتە دی. بەڵام ئێستا لەو کاتەدا ئەم داواکارییە زیان بە حکوومەتی عێراق و شارە کوردییەکان دەگەیەنێ.

هۆبەی هەواڵگریی سەربازی تایبەت / کەرکووک
ژمارە ARB/10/Air/1/8 ڕێکەوتی ١٩٢٦/٨/٧

باسی ئەو هەواڵە دەکا کە لە چەند سەرچاوەیەک وەرگیراوە:
(شێخ عەلی رەزا) کوڕە گەورەی (شێخ سەعید). گفتوگۆی لەگەڵ (دکتۆر مورادیان) کردووە لەبارەی ئینتیدابی رووسی بۆ کوردستان.
(ئەحمەد سەبری) کوڕی (سەید عەلی رەزای دەرسیمی) کە لە حەسەکەوە بەرەو مووسڵ هاتووە، داوای رێپێدان دەکا بۆ ئەوەی بەرەو رەواندز بچێ. بەڵام حکوومەتی بەریتانیا داوای بەڵێنێکی زامنی لێ کرد کە لە دژی تورکیا کار نەکا. (شێخ عەلی رەزا) داوای لە حکوومەتی بەریتانی کرد. کە (عەبدوڵلا باتاس) وەک دەستەبەر پەسند بکا و دژایەتیی تورکیاش نەکا. حکوومەتی بەریتانیا بەمە رازی نەبوو. تا ئێستاش (شێخ عەلی رەزا) لە مووسڵە. بە شوفێری ئۆتۆمبیلەکەی گوتبوو: ئەمین ئەفەندی کە نووسەری پێشووی بووە. ئێستا نیشتەجێی (بەحرکە)یە لە نزیک (هەولێر). بەکرێگیراوێکی حکوومەتی تورکیایە.
(قادر بەگ) سەرۆکی هۆزی خۆشناو ئەوەی درکاند کە ئاواتەخوازە حکوومەتی بەریتانیا هەمان کاری باشمان پێشکەش بکا. کە لەگەڵ عەرەبی کردووە. (قادر بەگ) باسی هەندێ نوکتەی لەسەر پاشکەوتن و نەزانی عەرەب کرد.

راپۆرتی سێیەم لەبارەی بارودۆخی کوردستان
ئامادەکردنی سی. ج - ئەدمونز ١٩٢٩/٦/١٤
ئەدمۆنز دەڵێ: دەربارەی رازیبوونی (شانەیەک) بەدابەشکردنی لیوای هەولێر و کەرکووک لەسەر سیستەمی نەتەوە. ئێمە پێمان هەڵەیە لە رووی سیاسی و ئیدارییەوە. چونکە تۆوی دووبەرەکی دەچێنێ لە نێوان کورد و عەرەب و پاشاگەردانی لە ناوچەکە دەنێتەوە. دەربارەی نەتەوەکانی شاری هەولێر دەڵێ: ئەو ژمارانەی پێشوو دەربارەی تورکمان راگەیەنراوە زێدەڕۆیی زۆری تێدایە. چونکە لیوای هەولێر وەکو لیوای سلێمانی شارێکی کوردییە. عەرەبیش لە لیواکە لە ناوچەی گوێڕ نیشتەجێنە. ئەگەرچی کەمێکیش لە ناو هەولێر هەنە. لەبەرئەوە دابەشکردنی ئەو لیوایە لەسەر بنچینەی نەتەوەیی پەسند نییە.
بەپێویستی دەزانم، خوێندن لە قۆناغی دواناوەندی هەروەکو سەرەتایی لە هەولێر و کەرکووک بەزمانی کوردی بێت لەگەڵ خوێندنی وانەیەک بەزمانی عەرەبی.

راپۆرتی سەرپەرشتیاری ئیدارەی بەریتانی لە هەولێر
ج. سی. کجنگ لە ١٤ / ٩ / ١٩٣٠ بۆ کنهان کورن والس راوێژکار لە وەزارەتی ناوەخۆ باسی رۆژی رەشی شەشی ئەیلوولی ساڵی ١٩٣٠ لە شاری سلێمانی دەکا و دەڵێ: ئەو هەواڵە لە ناو خەڵک لە هەولێر بە خراپ باس کراوە و پێشنیاز دەکەم. کە بۆ دانیشتوان بەباشی روون بکرێتەوە. بۆ ئەوەی دانیشتوانی هەولێر لە راستییەکە تێبگەن.

نووسینگەی سەرپەرشتیاری ئیداری لە (هەولێر)
راپۆرتی - سیجنگ ژمارە ١١ ١٩٣٠/٢/١٢
بۆ راوێژکار لە وەزارەتی ناوەخۆ
باسی دامەزراندنی کۆمەڵەکانی کوردی لە هەولێر دەکا. بۆ نموونە:
(کۆمەڵەی پشتیوان) هەروەها باسی (مەعرووف جیاووک) دەکا، کەسێکی چالاکە لەو بوارەدا. باسی مەترسییەکانی شۆڕشی بارزان لە دژی ئەوان دەکا و دەڵێ:
کاتێ کە هێزەکانی ئینگلیز لە عێراق دەکشێنەوە، ناثارامی دەکەوێتە ناوچەی هەولێر و کوردستان.
لە نووسینەکەدا هاتووە: نیشتمانپەروەرانی کورد مەبەستیان بەشداریکردنە لە پێکهێنانی حکوومەت لە بەغدا. بە پێچەوانەوە هیچ کوردێک بەدەسەڵاتی عەرەب لەسەر کوردستان رازی نییە.
ئەگەر هاتوو نەتەوەپەرستەکانی عەرەب بەردەوامبوون لە هەڵوێستیان لە دژی کورد لە ناوچە شاخاوییەکاندا. ئەوا بۆ ئێمە کێشە و ماندووبوونێکی زۆر دروست دەکا بۆ هێمنکردنەوەی بارودۆخەکە. زیاتر لەو هەولانەی کە پێشتر دابوومان.

نهێنی / فەرمانگەی هەواڵگریی سەربازی / هێزەی هەولێر ٣٠ / ٧ / ١٩٣١

هێزی ئاسمانی شاهانەی بەریتانی / فەرماندەی عێراق (هنێدی)

بابەت // کوردستانی ناوە ڕاست و باشوور

باسی ئەو سەردانە دەکا کە سێ کەسایەتیی مووسڵ (قاسم چەلەبی سابوونچی) و (بەکر چەلەبی بەرگدروو) و (عاسف ئەفەندی قاسم ئاغا). سەردانی هەولێریان کردووە و میوانی (عەلی پاشا) بوون. کە (ئەندامی ئەنجوومەنی پیاوماقووڵانە). ئەوەیان بە هاوپیشەکانیان لە هەولێر ڕاگەیاندووە. کە حکوومەتی عێراق بەنیازە باجێکی تازە بۆ شارەوانییەکان دابنێ. لەبەرئەوە ڕۆژێک دەستنیشان دەکەن، لە هەموو عێراق مانگرتن لە دژی ئەم بڕیارە دەست پێ بکات. لەبەرئەوە داوا لە هاوپیشەکانیان لە هەولێر دەکەن وەک ئەوان هەڵویستیان هەبێ و (بەکر چەلەبی) بە ئەندامی پەیوەندی داندرا.

لە ١٠ / ٧ / ١٩٣١ (ڕۆستەم چەلەبی) کە بازرگانە لە هەولێر و (حاجی عوسمان) نامەیەکیان لە (بەکر چەلەبی) پێ گەیشت. کە سکاڵانامە کۆ بکەنەوە لە دژی ئەو بڕیارە.

لە ١٣/ ٧ / ١٩٣١ هەواڵی مانگرتنی گشتیی بەغدا گەیشتە هەولێر.

لە هەمان ڕێکەوت کۆبوونەوەیەکی فراوان لە مزگەوتی گەورە لە قەڵات ئەنجام درا و زۆربەی بازرگان و خاوەن پیشەکانی هەولێر ئامادە بوون و لیژنەیەکیان پێک هێنا بۆ نووسینی سکاڵایەک لە دژی باجی تازەی شارەوانییەکان.

پاشکۆی ژمارە ٣

باسی دارشتنی پرۆژەی (کۆمەڵەی هۆگری) کۆمەڵایەتی دەکا. کە لە ماڵی (ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی) ساڵی ١٩٢٦ ئەنجام درابوو بە یارمەتیی ئەو کەسانە : (سەید تەها) و (ئەمین ڕەواندزی) کە ئەو ڕۆژە مۆڵەتی هەبووە. کۆمەڵەکە زیاتر مەبەستی بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیری و مێژووی کورد و پەرەپێدانی کەسایەتیی تاکی کوردە بەزمانی کوردی. سیاسەت لە بەرنامەیاندا نییە.

(وەزارەتی ناوەخۆ ڕێگای بەدامەزراندنی کۆمەڵەکە نەدا)

عێراق - وەزارەتی ناوەخۆ - بەغدا

١ / ٤ / ١٩٤٢ بۆ سیرکورن والس

جەنابی باڵیۆزی حکوومەتی بەریتانیای شکۆدار/ بەغدا

لەو نووسینەدا باسی سێ کەس دەکا کە سەر بە حزبی شیوعی بوون و سزا دراون بەدەرکردنیان و دوورخستنەوەیان ئەوانەش:

١-(حەمە عەبدوڵڵا) کە لە هەوادارانی سەید ئەحمەدی خانەقایە لە کەرکووک. بە پشتگیریی (عەقید لیون). لەبەرئەوە کەسێکی بێگانە بوو لە وڵات. بڕیارەکەمان پووچەڵ کردەوە و بەڵێنی کارنەکردنی سیاسیی لێ وەرگیرا.

٢- پارێزەر (عەونی یوسف) لە هەولێر کە بە ڕاپۆرتی موتەسەریفی هەولێر کە تورکمانە و ڕق و کینەی لە(کورد)ە. لەبەرئەوە ناوبراوی دوور خستۆتەوە بۆ (فاو). بەڵام بەهەوڵی وەزیرە کوردەکان لە بەغدا بڕیارەکە پووچەڵ کراوە و پۆستی دادوەری لە باشووری عێراق لە داهاتوو بدرێتێ. (عەونی یوسف) بەهەڵە تێگەیشتبوو. کە من هەوڵم بۆ داوە بۆ گەڕانەوەی. خۆشی دانی بەهەڵەکانی نا. کە ئێستا زووە بۆ داواکارییە نەتەوەییەکان.

٣- (ڕەشید عارف) کە گێرەشێوێنێکی دژی ئینگلیزە. کە ناوی زۆر جار بەخراپ هاتووە بەرامبەر ئێمە. خۆشی لە ٢٨ / ٣ لە وەزارەت هاتە لام. زۆری پێ ئاسایی بوو. کە بەو شێوە باس کراوە. چونکە خۆی لە منداڵییەوە هەر لە پۆلی شەشەمی سەرەتاییەوە چالاکیی نیشتمانپەروەری هەبووە و پێی باش بووە. کە داوای ئەو مافانە بکا. کە بە ڕەوای دادەنێ.

# گرانیی گەورە لە کۆیە

تاهیر ئەحمەد حەوێزی

شەڕ بەنیسبەت هەردوولا، چاکە و خۆشیی لێ نابینرێ. خوێن و عارەقەیەکی زۆری لێ دەڕژێ، زۆر لاو و پیر تێدا دەچن، زۆر شوێن وێران دەبێ.

لەو ولاتانەی کە چاویان لە ئاسمانە بارانیان بۆ ببارێنێ، ئەگەر ساڵێکی درەنگ پەڵەی بدا، یا لەوسەری لە بەهاردا، بارانەکەی بگرێتەوە، یا کشتوکاڵ تووشی ئافاتی ئاسمانی وەک: تەزرە، سن، کیسەڵە، کلۆ، بێ گرانی پەیدا دەبێ. تەنانەت بارانی زۆریش دەبێتە نەهاتی و قات و قڕی. گەنم و جۆش زۆر بەگران دەست دەکەون، خۆ نائەمینی و خەرمان سووتاندن، ئەمە بەجارێ خەڵقی نائومێد دەکا و بازاڕی گرانفرۆشان باش دەگەڕێ. کوردەواریی ولاتی ئێمە بەگەنم و جۆیان گوتووە (قووت). تەنیا بەنانیان گوتووە (زاد). لە دوای ئەوەی هەرچی نێرینەی ئیشکەری هەبوو، ناردرانە عەسکەری، زۆریان شەهید و بریندار بوو. مەئمورەکانی حکوومەتیش بەناوی (مبایعە) و یارمەتیی عەسکەر، زاد و زەخیرەیەکی زۆریان لە میللەت ستاند.

زەخیرەی عالەمەکەیان دەبرد، دەیانگوت: (بابە ئێمە لە برسان دەمرین) دەیانگوت: (دەوڵەت سەلامەت بی ئێوە با بمرن، قەیدی ناکا). بە هەر فێڵێک با هەبوو هەندێ زەخیرەی دەشاردەوە، هەر دەیاندیتەوە و عارد و دیواریان دەکۆڵی، کە زەخیرەکەیان دەبرد، بەپاڕانەوە و دەست ماچکردن، ماڵەکەی خۆیان پێ دەفرۆشتنەوە. ئەوجارەی تاقمێکی تر دەهاتن، زەخیرەکەیان دەبرد، بەبرسێتی دەیانهێشتنەوە!.

زەخیرەی ناو شارەکەیان لە (ئیدارەی = رێژەی) عەنبار دەکرد، مەئموورەکان لەگەڵ هەندێ خەڵقی شارەکە رێککەوتبوون، ئارد و گەنم و رۆنیان پێ دەفرۆشتنەوە، بەڵام بەزۆر گران.

گەنم و جۆی لادێیەکانیش، بەشێکیان دەنارده (تەقتەق) و هەندێکیش دەیانبرده (دوکان) لەوێ خۆڵیان لەگەڵ تێکەڵ دەکرد و بۆ عەسکەریان بە کەڵەکی رەوانەی بەغدا دەکرد.

خەڵقی لادێ گەنمەکەیان دەفرۆشت و هەر نانی جۆیان دەخوارد، هەندێ ماڵیان نانی مزاشیان هەبوو، خەڵکی شار بەشی زۆری نانی مزاش و زۆر کەم گەنم بوو ئەوی تریش نانی گەنم بوو ئەوی تریش نانی جۆیان دەخوارد.

لە زستانێ گرانی دەستی پێ کرد، لە بەهاری (١٩١٨) شیدەتی ستاند، لەم دوو کەژە زۆر کەس فەوتان، کێلەی گەنمی (٦٠) کیلۆ گەیشتە (٢٧) قران، کۆتکی ئاردی بووە (٢) لیرە. لە ساڵی (١٩١٠) کێلەی گەنمی بووە (٢) قران. گەلێک کەس تێکچوون و ناخۆشی کەوتە ناویان. گرانیی گەورەکە لە ساڵی (١٨٧٥) بووە، کێلەی گەنمی گەیشتە (٢٠) قران، زۆر کەس فەوتان، کابرایەکی ئیختیار لەو ساڵانە دەیگوت: (تفەنگە رەشکەیەکم هەبوو، زۆر گورگ و سەگم لەسەر کەلاکی ئینسانی مردوو، کوشتووە).

لە گرانیی گەورە زۆر فەلاحی (ئەنادۆڵ) و (ئەرمەنی) لە زەمانی سوڵتانی عوسمانی (عەبدولعەزیز کوڕی سوڵتان مەحموودی دووەم، منداڵی خۆیان فرۆشت، تا ئاردی پێ بکڕن)[1].

نرخی گەنم و جۆ لە پێش حەربی عەلبەی کۆیە بە (٤٠) روپیە و

(٢٤) روپیە بوو، بەڵام لە ساڵی (١٩١٨) گەیشتە (١٥٠٠) روپیە و (١٢٠٠) روپیە وە لە تشرینی یەکەمی (١٩٢٠) گەیشتە (٣٣٠) روپیە و (٢٠٠) روپیە، لە (١٩٣٠)ش کێلەی بووە (٢) روپیە!.

بەهاری گرانی کەنگر یەکجار زۆر بوو، بەهارەکەی درێژ کردەوە، کەنگر تا درەنگ پیر نەبوو، زۆر کەس کەنگری دەکوڵاند و پێی دەژیا، بەڵام لەبەر بێ خوێیی خەڵق تامەزرۆیان دانەدەکەوت، چەشنە خاکێکیان لە ئاوی دەکرد هەویریان پێ دەشێلا.

لەلای گوندی (تاڵەبان) لە شاخی کرێژی خوێیان لێ دەکردەوە و بەکاریان دەهێنا، لە گوندی (مەرزان)یش ئاوەکەی سوێر بوو ئیشیان پێ دەکرد، زۆر کەس بە گیاو گۆڵی دەژیان، هەتا جۆ فەریک بوو، خەڵق دەچوون بەداسووکەی گوڵەکەیان هەڵدەبری و هەڵیان دەگلۆفت، زۆر کەس لەسەری کوژران.

(مەلا ئەحمەد)ی رەش کۆیی لە ترسی عەسکەری بە ماڵەوە چووبووە دەشتێ، لادێیەکان، هەندێ زەخیرۆکەیان لە پریسکان - وەک تێچێنان - دەیانکردە بالیفۆکە، دەیانهێنا ماڵی مەلای، مامۆستا سیپارەی بۆ منداڵەکانی نووسیبۆوە، کە جەندرمەکان دەهاتن، خێرا خێرا سیپارەکانیان بە دەنگ دەخوێندەوە، جەندرمەکان دەیانگوت: (ئەوە مەلایە دەرسی دەخوونن وا وەرن) وازیان لێ دەینان.

دوو کەسی عەشیرەت لە گوندێکی دێنە ماڵێکی داوای نانی دەکەن، ژنەکەش تەشتی نانیان لە بەردەمی دادەنێ و دەست بەخواردنی دەکەن، لەو کاتەی مێردەکەی دێتەوە بە ژنەکەی دەڵێ: (دەک خێرت نەنووسی) دەڵێ: (بۆ؟ پیاوەکە) دەڵێ: (ئەوانە بێ تاقەتن و برسیشیانە، ئێستا ئەوەندەی دەخۆن، دەمێکیکە دەمرن، ئەوجا ئەمن زەلامی لە کێ بینم، بیانشێرمەوە؟)، کە تێر دەخۆن، لە نزیک ئاوایی لە کەندێکا، هەردووک دەمرن، چونکە مەعدە و ریخەڵۆکەیان وشک بیۆوە پێی حەل نەکرابوو، هەر لە جێی خۆیان هەندێ گڵ و خۆڵیان بەسەردا کردبوون. ئەم گرانییە زۆر شوێنی گرتبۆوە، لە (رانیە) کە تۆڵەکەیان بەبێ خوێ دەکوڵاند لە پاش خواردن ئەستوور دەبوون و دەمردن. گەزی خامی ببووە (٥) مەجیدی گەزی چیتی ببووە (٧) مەجیدی تەیارەشکێن، خەڵق هەر هەوڵی ورگی دەدا.

کابرایەک پێنج کچی هەبوو، هەمووی بە نیو کۆتک جۆ دان. زۆر ئافرەت بە چۆرێک ئاوی سەروپێی، خۆی لە پیاوێک مارە دەکرد، ئافرەت زۆر بوو نێرینە کەم بوو.

عەشایرەکی زۆر بە برسیەتی روویان لە شاری کردبوو، بە تایبەتی (سوێسنی)یەکان[٢]، لە بازاڕ و لە کوچە و کوڵانەکان دەکەوتن، ئافرەتێک منداڵەکەی مەمکی دەمژی و خۆشی مردبوو، پیاو نەمابوون بیانشارنەوە، دوو دوو سێ سێیان، لە قەد کەندی گۆمەکانی شاری و لە کاولەکان دەشاردەوە، هەر بای ئەوەندەی دەعبا دەریاننەینی، بەشەر زۆر بێ قیمەت ببوو.

لە پاش گرانییەکە کابرایەک پرس بەجەنابی مەلای دەکا: (قوربان شایی دەکەم، دەمەوێ لە بۆ کوڕەکەم ژن بینم). مەلای گەورەش، پێی دەڵێ: (هێشتا کەلاکە برا و خزمەکانت لە ناو قەبری نەرزیون، کە لە برسان مردن، نەیهێشت شایی بکا).

(کەریم چاوسوور)ی دەباغچی گێڕایەوە: (سێ کەس هاتنە دەباغخانان، دوویان ئەوی دیان لە عاردی دا و خواردیان، دوایی دووەکەی دیش ملیان لەبەر ملی یەک نا، ئەوی بەهێزیان، ئەوی دی خوارد، منداڵێک هاواری کردمێ: (مامە بمگەیە، ئەوە دەمخوا)، منیش کە چووم، کابرا گوتی: (ئەتو حەقت چییە؟ کوری خۆمە و دەیخۆم!) سبەینێ کە چوومەوە ناو خانووەکە، هەندێ پەنجەی لێ کەوتبوو!).

(حەمەدەمین بەگ کوڕی حاجی عەولا بەگ) بۆی گێڕامەوە: (لە گرانییەکە گەنمی زۆرمان هەبوو، ژنەکان هەموو رۆژێ نانیان دەکرد، هەتا سبەینێ هیچ نەدەما)، بە بابمیان گوت: (ئێمە بەنانکردنێ بە هیلاک چووین، لە بۆ خۆت نانکەرێکی رابگرە) نانیان دەکرد، کە بەشی فەقیریان دادەنا، بابم یەک دووەکی دەخستە بن چۆکی دەیشاردەوە، جارێکی کابرایەک بە عەبا و بە بەردەرکەماندا هات - باش نییە ناوان بڵێین - برسی بوو، بۆنی نانی کردبوو، هەر دەچووە خواری و دەگەڕاوە، بابم دیتی گوتی: (ئەوە برسیەتی، دەی خێرا، نانەکی لە بۆ ببەن) کە نانەکەمان لە بۆ برد،

منداڵان دەورەیان دابوو، نانەکەی لێ بستێنن، ئەویش بە گۆچانەکەی، لە خۆی دوور دەخستنەوە، بابم گوتی: (خێرا نانی بۆ ئەو منداڵانەش بهێنن، با لە یەقەی بێنەوە).

زۆر کۆیی کە لە بەرگی یەکەمی مێژووی کۆیە نووسیومانە، دەرگای لەسەر خۆی داخست و بەخۆی و منداڵییەوە لە ژوورێ لە برسان مردن.

(حاجی نەجیب کوڕی حاجی تاهیر چەلەبی) گێڕایەوە: (جەمیل ئاغا و جەلیل ئاغا و مەلا برایم و تاهیر چەلەبی باوکم و چەند کەسانێکی دی لەسەر ئیجارە گرتن گیرا بوون)، هەر ئاغایە (٥ - ٦) دێی (حق الارض) لە حکوومەت بەئیجار دەگرت، (حەمە ئاغا)ش بە کەفالەتی بابم ئیجارەی گرتبوو، پارەکەی نەدابوو، لە جیاتی (حەمە ئاغا)ی باوکمیان گرتبوو، منیش چێشتم لە بۆ بابم دەبرد، گەیشتمە ئاقاری ناڵبەندان (پەلە فیرە)م لێ پەیا بوو، مشتێ (خۆڵەمێش)ی پێ داکردم و قاپەکەی لێ فڕاندم و خۆی بەعەردی دادا، هەتا هەمووی نەخوارد قاپەکەی نەدامەوە. جارەکی دی چوومەوە ماڵ، خواردنی دیم بۆ بابم بردە حەپسخانە، بابم پێی گوتم: (هەڕوو بە حەمە ئاغای بڵێ، بابم کەفیلە بۆچی حەپس بم؟ کە چووم بە حەمە ئاغام گوت: ئاغا بابم دەڵێ: ئەمن لەسەر چی حەپس بم؟ حەمە ئاغا گوتی: هەرامە کوڕم بابت حەپس بێ چاترە، ئەمن ئەو دەغڵەی نادەمە حکوومەت، بیدەمە فەقیران باشترە، بابت هەر بەردەبێ!).

هەموو ڕۆژێ چەند کێلە نارد لە ماڵی (حەمە ئاغا)ی دەکرا نان، چێشتێکی زۆر لێ دەندرا بەسەر فەقیر و مزگەوتەکاندا دابەش دەکرا، بەستڵۆکانیش بۆ ماڵە خزمەکانیشی دەچوو.

(مەعرووف سۆتەل) و (ئەحمەد زلە) لە گرانی قەبریان هەڵدەقەند. (ئەحمەد)ی (کاکەلی) باخچەوان و دەشتەکی بوو، لە گرانی ئیعدامیان کرد.

کابرایەک مادەیەکی لە حەمە گرانی کڕی لەگەڵ چێتیلەک ماست، کە بە نانی بخوا، لەسەر دەستی دانابوون، لە دوکانی مام حەمەدی هەندێ دوورکەوتەوە، لە ئاقاری کورتاندرووان (پەلە فێرە) خۆی مات کردبوو، پەلاماری دا و نانەکەی لێ فڕاند، خۆی بە عەردییەوە نووساند، کابرا هەرچەند پێلەقەی لێ دا، نانەکەی نەداوە و خواردی هەر خواردی.

کچێکی عازەب لە گرانی لە برسان، لە بن قادرمەی مزگەوتی (حاجی مەلا ئۆمەر) مردبوو، سەگ مەمکی دەخوارد، جۆتە گوارەی لە گوێ بوو، بازنی زیوی لە دەستی بوو.

(ئاورەحمان)ی زەوڵێ - خزمی (حەمە حاجی)، ماڵی لە گەڕەکی (قۆرتێ) بوو، ئەگەر یەکێک بمردبا بەکۆڵی دادەدا و لە پشت (سەرای نوێ) لە قۆرتێکی دەنا.

ڕۆژێ نزیکی (١٠ - ١٥) کەس دەمرد، لە کۆڵانە و بن دەرگاکان دەکەوتن، هەبوو باران و ئاوی پلوسکێی لێ دەدان، لە گوندان لە بن دیواران دەکەوتن و دەمردن، هەبوو ئێسکی خڕ دەکردەوە و دەیخستە سەر ئاگری، ڕەژووەکەی دەخوارد، کابرایەک لە (چنارۆک) ڕەگەدارێکی لە دەمی خۆی نابوو، دەمێژی، کە مردبوو دارەکەی هەر لە دەمدا بوو، ئافرەتێک منداڵی دەبێ، منداڵەکەی لە ناو مەنجەڵێکی دەنێ، ئاوی تێ دەکا و لەسەر ئاگری دادەنێ، منداڵەکەی دەخوا[٣].

هەبوو (سمرکە) یا (گۆرمزە)ی دەکوڵاند و دەیخوارد، هەندەی پێ نەدەچوو دەمرد. لە دەشتێ پێ ڕانەدەگەیشتن قەبری هەڵبقەنن، سێ چار مەیتیان دەخستە ناو چاڵە دەغڵێ و بە گڵ و خۆڵ پڕیان دەکردەوە.

**پەراوێزەکان:**

١- بۆ ئەم چەند قسەیە، تەماشای کتێبی (عبدالحمید ظل الله علی الارض) بکە، لاپەڕە (٥٦)، کە لە ساڵی (١٢٩٧ هـ) ڕووی داوە.

٢- سوێسنی عەشیرەتێکی زۆرن، لە پایزێ لەلای خۆیان تۆیان دەکرد، زستانیش بۆ فەقیری و حەمباڵی دەهاتنە کۆیە، بەتایبەتی خەڵکی گوندی (ئەحمەد برێو) و (نێسوچەوان)، بەهارێکی دردنگ دەگەڕانەوە جێگای خۆیان، هاوینان ڕەز و باغیان هەبوو، هەبوو لە کۆیە دادەنیشت و حاڵی خۆش بوو، ئێستا زۆر لەوانە بوونە خاوەن ماڵ و موڵک.

٣- کە لە مێژووی بنەماڵەکانی شارەکە دەکۆڵمەوە، ماڵ نییە یەک دووەکی بە سفربرلگی نەهاتبێتەوە، نزیکی (٣) هەزار گەنج و پیاوی فەوتاو نەهاتۆتەوە.

* ئەم بابەتە لە کتێبی (مێژووی کۆیە)ی تاهیر ئەحمەد حەوێزی، بەرگی دووەم، چاپی یەکەم، ١٩٨٤ وەرگیراوە.

# سەفەركردن

## محەمەد دارياس

لە ساڵانی شەستەكان بەرەو خوار سەفەركردن لە كۆیەوە بۆ هەولێر بەم شێوەیەی خوارەوە بوو: ئەو كەسەی كە لە كۆیە نیازی سەفەری بووایە، دەبوو ئێوارەی رۆژی پێشوو بچێتە گەراج و ناوی خۆی تۆمار بكات، بۆ بەیانی حەماڵێكی گەراج كە دەلاڵەكە خۆی بوو بەشوێن ئەو كەسە دەهات و جانتای سەفەری بۆ هەڵدەگرت، كە بریتی بوو لە كەلوپەلی پێویست، لە پێش نەفەرەكە بەرەو گەراج دەرۆیشت، ئەو كات گەراج شوێنێكی تایبەتی نەبوو، بەڵكو بریتی بوو لە شەقامێكی سەرەكیی ناو شاری كۆیە كە چەند ئۆتۆمبێلێكی جۆری"ستێشن" لەوێ رادەوەستـــان. بۆ بەرێكردنی ئەم نەفەرەش بگرە زۆربەی جیـرانەكەی دەهاتنە دەرەوە بۆ خـواحافیـزی و بەرێكردنی بەدوعـای بەخێـر بۆ سەلامەتیی ئەو نەفەرە. ئیتر جانتا و كەلوپەلی نەفەرەكان لەسەر چەمچەی سەیارەكە باش دەبەسـترا و بەشریت قایم دەكرا، ئینجا هەر كەس لە شوێنی خۆی دادەنیشت.

لە یادمـە پێشـەوە و ناوەندی ئۆتۆمبێلەكە بە"٤٠٠" چوارسەد فلس بوو، خانەی دواوەش بە"٣٠٠" سێسەد فلس بوو، كە شوێنی خەڵكی سادە و هەژاران بوو. ئیتر سەیارەكە لە كۆیەوە بەرەو هەولێر بەرێ دەكەوت، رێگا قیر نەبوو، بەڵكو هاوینان تۆز و خـۆڵ و زسـتـان قـوڕ و چڵـپـاو بوو، بۆیە زنجیریان لە تایەی سەیارەكان دەبەست و نزیكەی"٣" سەعاتی دەخایاند، تا دەگەیشتنە هەولێر. زۆرجار سەیارەكە لە قـــوڕ دەچەقی و دوای ئەزیەت و مـاندووبوونێكی زۆر و پاڵپێـودنان تا سەیارەكە لە قوڕ دەردەهات. لە دێگەڵە كـــە نیـــوەی رێگایە بۆ پشـــوودان خەڵكەكە دادەبەزین لە چایخانەكەدا كە بریتی بوو لە ژوورێكی قوڕ بەقەد پاڵی گــردێكەوە نان و چا یا ســـاردی و ماسـتاو دەخورایەوە و زۆرجار یەكێك لەم دوانزە نەفـەرەی ناو سـەیارەكـە بەتایبـەتی ئەوەی مـووچەخـۆر با، یا دەوڵەمەندێكی دڵتێر با، ئەوا پارەی نانخواردنی هەموو نەفەرەكانی دەدا جا هەرچی خـورابا كــە برە پارەكــەش هەمووی دەیكردە "٦٠٠-٧٥٥" فلس. خــواردنەكــەش بریتی بوو لە نان و مـاست و هێلكە و گـۆشت مـریشكی كولاو.

زۆر كـەسـیـش لە ترسی رشـانەوە نەیدەوێـرا هیچ بخــــوات، بە ژەمی بەیانی و نیـوەڕۆوە بەخـورێنی خـۆی رادەگرت تا ئێوارە. بەگشتی ئەوكات ژیـان ســــادە بـوو هـەتـا لـە رووی بیـركردنەوە و خەڵكەكە سادە و سانا بوو. بڕوا بكەن خێزانی ئەو كەسەی كە دەچووە سـەفـەر ئێـوارە هەمــوویان بەعـــادزی لە مـــاڵەوە دادەنیـــشـتن دەیانوت: بەڕاسـتی جـێگای فـلانە كەسمان پێوە دیارە و شوێنەكەی چۆڵە، بەشەر تەیری بێ باڵە دوێنێ ئەو كـاتە لێرە دانیشتبوو ئەمڕۆ وا لە هەولێرە، ئیتر لەگەڵ ئەم قسانە و یادكردنەوەیەدا مـــرۆڤ گـــریانی دەهات و مــات و مەلوولییەک سەرتاپای ناو خێزانەكەی دادەگرت، كاتێكیش كە دەگەڕایەوە بۆ كۆیە ئەوا جیرانە نزیكەكان دەچوون بۆ بەخێـرهاتنەوەی و دەیانوت: سـەفـەر سـەلامـەت، ئەویش بەدرێژی باسی سـەفـەرەكـەی خـۆی بۆ خـەڵكەكـە دەگێڕایەوە كە شۆفێرەكەیان كێ بووە، ناوی هەموو نەفەرەكان و هەریەک بەچ مەبەسـتێک چۆتە هەولێـر لە دێگەڵە چییـان خواردووە و كێ پارەكەی داوە، گەر زستان بووایە چۆن سەیارەكەیان لە قوڕ دەرهێناوە.

لە رێگا قسـە و باسەكـان لەسەر چی بووە، نەفـــەرەكـــان چیـــیـــان دەگێڕایەوە، سـەعـات چەند گـەیشـتنە هەولێـــــر و چۆن چووە بۆ مـــاڵی خـــانەخـــوێكەی، چاك و چۆنی و پێشـوازییـەكـەیان چۆن بوو، چییـان خوارد، لە هەولێر چاوی بەكێ كەوت و چییـان وت، ئیـتـر گـەڕانەوەكـەشی بەم شێـوەیە دەگێـڕایەوە و كـاتێـكیـان بەم قسانە بەسەر دەبرد. منیش دەڵێم: ئای ژیانی سـادە و سـاكـار چەند خـۆشـە! دوور لـە تـەمـــــاح و چاولێـكـەری و پێــشــبــــڕكێ لەســەر مــادده و خۆدەوڵەمەندكردن لەسـەر حیسـابی خوێنی شەهیدان و میللەت.

ئەمـەی گـێـڕامـەوە چیـرۆكـێكی راسـتەقینەی"٤٥" ساڵ بەرەو خوار بوو بۆ سەفەرێكی سادە، كەچی ئێـستا گەر لە"هۆنۆلۆلۆ" بێــیــــــەوە كـــەس ماندوونەبوونت لێ ناكـا!!. سـەفـەری هەولێریش گۆڕاوە بۆ سەفەری هۆڵەندا و ئەڵـمـانیـا و بەریتـانیـا و سـوید و نەرویج. سـەفـەری جـاران بۆ هەر مەبەستێک بووایە حەوت رۆژی زیاتر پێ نەدەچوو كـەچی ئێـسـتـا "٧-١٥" ساڵیش دەخایەنێت.

# مستەفا عەبدولڕەزاق و نوگرە سەلمان

فکرەت عزەت شەفیق

لەوانەیە نەوەی ئێستا نەزانن نوگرە سەلمان چییە، بەلام ئێمەمانان هێندە ئەم ناوەمان گوێ لێ بووە، دەزانین کە گرتووخانەیەکی هەرە کۆنی عێراقییە و لە بیابانێکی چۆڵ وشکایی و خوارووی عێراقە.

لەبەر برادەرایەتیی پۆلی یەکەمی سەرەتاییم لە ڕەواندز لەگەڵ "کاک شوان ئەنوەر عەلی" کە ئەوسا باوکی بەڕێوەبەری قوتابخانەی سەرەتایی خوارەوە بووە لە ڕەواندز، بەڕێکەوت لەگەڵ مام مستەفا باوکی عەبدولڕەزاق - کە مامی باوکییەتی- ئاشنا بووین. هەرچەندە ئەم کابرایە لەدایکبووی ساڵی (١٩١٨)یە، بەلام بیرەوەرییەکانی خۆی زۆر چاک دەگێڕێتەوە و زۆربەی هەرە زۆری نووسیوەتەوە، چونکە چەندەها جار لەسەر کوردایەتی گیراوە و زۆربەی بەندیخانەکانی دیوە.

مام مستەفا دەڵێ: لە ڕۆژی دووشەممەی ١٩/٤/١٩٤٨ بۆ یەکەم جار لە رواندز گیرام، چوار کەس بووین: من و سەیدا عومەر و یوسف رەشید ئاغا ناسراو بە وسو ئاغا و بەهرام ئیبراهیم، رەوانەی بەغدا کراین و لەوێشەوە بەشەمەندەفەر چووینە سەماوە، ئینجا بە لۆری بۆ نوگرە سەلمان، ئەم گرتووخانەیە کە لە پارێزگای موسەننایە گرتووخانەیەکی گەورە و سامناک بوو، یەکێک بوو لە کۆنە سەربازگەکانی ئینگلیز، (١٠) هۆڵی هەبوو، هەردەم ئەم هۆڵانە پڕ لە میوان بوون، لە بیرمە کابرایەکی شەقلاوەیی (٣) جار گیرا و (٣) جار بەردرا و هاتەوە نوگرە سەلمان، دیوارەکانی تا بڵێی بڵند و بەرز بوو، کەس نەیدەتوانی رابکا، هیچ سەرچاوەیەکی ئاوی نزیک نەبوو، ئاو و نان بۆ ئێمە بەتانکی دەهات، کابرایەک رایکرد لە دەرەوە لە ڕێگا خنکا بوو، ئەوسا پارتی دیموکراتی کوردستان نوێنەری تایبەتی خۆی بۆ هەموو

گـرتووخـانەکـان دەنارد، کـە ئەندامـانی پارتی لێ بگیـرابا بۆ ئەحـواڵ پرسین و کـۆمـەککردن و گـەیاندنی هەواڵی مـاڵ و منـاڵی گـیـراوەکـە بۆ نێـو بەندیخـانە. نوێنەری ئێـمـە لە بەندیخـانە لە رواندزەوە دکتۆر خورشید شەوکەت بوو کە ئەوسا لە رواندز مامۆستا بوو. بەڵام لە سـاڵی (١٩٦٣)وە چووە دەرەوە لە وڵاتی ئەڵمـانیـا دکتـۆرای لە یاسا وەرگرت. ساڵی (١٩٦٣) من لە هەولێـــر بووم. بەریدی رواندز سووتا، یەکسەر بێ پرسـیـار و وەڵام هاتن لە هەولێـر منیـــان گـــرت و مـــاوەیەک لە بەندیخـــانە مـــامـــەوە، بەڵام بۆ خـۆشـبـەخـتی من بەیاننامـەی لامەرکەزی سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیرانی حکوومـەتی عـێـراقی ئەوسـا عـەبدولڕەحـمـان بەزاز دەرچوو. دەنا لەسێـدارە درا بووم. بەهۆی ئەو بەیاننامەوە ئازاد کرام و لە نوگـرە سـەلمان رزگـار بووم لە بیـرمـە لە سـاڵی ١٩٢٢ یەکـەم قـوتابخـانە لە رواندز کـرایەوە، ئەمـیش بەهۆی هەوڵ و کـۆشـشی قائیمقامی ئەوسا کە ناوی سەید تەهای شـەمـزینان بوو، کـابرایەکی تا بڵـێـی خـانەدان و کـوردپەروەر بوو. مەلایەکان کەوتنە دژایەتی و داوایان لە خەڵکی کـرد کە کـەس منـاڵی خـــۆی نەنێـــرێ بۆ ئەم قـوتابخـانەیە، چونکە ئەمـە هی کافـرە و ئەوەی بچێـتە قوتابخـانە کـافـر دەبێت، بۆیە سـەید تەها بەزیرەکی خـۆی (٢) مـەلا (مـەلا حـەسـەن و مـەلا حـەمـەدەمین)ی لەوانەی کـە زۆر هەرەشـەیان لە خەڵکی دەکرد، کردنی بەمامۆستای ئەم قوتابخانەیە. یەکێکیان دەرسی دینی دەگـوتەوە، ئەوەی دی دەرسی قورئان، ئینجا مەلایەکان گـوتیـان مادام دین لە قوتابخانە دەخوێندرێ برۆن بۆ قـوتابخـانە و کـەس کـافـر نابێـت. سـەید تەها هەمـــوو پێنجشەمموان لە ماڵی خۆی نانی بۆ خـەڵـک دروست دەکـرد و جێ قشڵەی ئێستا گۆڕەپان بوو. هانی گـەنجـەکـانی دەدا لەوێ تۆپانێ بکەن، یارمـــەتیـــیـــەکی زۆری خوالێخۆشبوو حوسێن حوزنی دا بۆ هێنانی چاپخـانەکـەی لە شـاری حەلەب بۆ رواندز. کابرایەک هەبوو کـورتەباڵا بوو ناوی مـام چەلەبی بوو، ئەوسا تەمەنی (١١٠) ساڵ دەبوو. زانیـــاریـــەکی تەواوی دەربارەی محەمەد پاشای رواندز و مـیـرانی سۆران هەبوو، ئەم کـابرایە هەردەم لە چاپخـــانەکـــەی ئەو دادەنیـشت حـوزنی زانیـاریـیـەکی تەواوی لەو کـابرایە وەردەگـرت و بڵاوی دەکردەوە.

جـارێکیـان لە شـەسـتـەکـان (١٠) پێـشـمـەرگـە لە چیـای هەندرێن هەواڵیان دامێ کە نان و ئازووقـــەمـــان نەمـــاوە و دەبێت هێندێ ئازووقـەیان بۆ بەرێ بکەم، منیش کـەوتمە قـەرز لە خـەڵکی، بەناوی ئەوەی سـەفـەری هەولێـر دەکەم لەوانە هێندە پارەم لە دکتـۆر محەمەد سەرسۆر، وەرگرت، بەڵام دوای دوو رۆژ لە بازاڕ منی بینی، گـوتی: بۆ سەفـەرت نەکرد؟ ناکـا خـیـلافت کـردبێت و یەکسـەر لەو کاتە چاوی بە پیکابێک کەوت کە پڕ بوو لە ئارد و رۆن و برنج و... تا، کەوتە گومان گوتی: ئەمانە بۆ چییـە؟ منیش گـوتم: هیچ. گـوتی بۆم باس بکە، گـوتم مـەسـەلەکـە بەمجۆرەیە. بێ سێ و دوو گوتی: یەکـسـەر ئەمـەت بەمن گـوتبـا و هەموو پارەکەت لە من وەرگرتبا و لە کـەس قـەرزت نەکـردبا کـە ئازووقە گەیشتە پێشمەرگەکان پارەکـەیان ناردەوە منیش دووبارە ئازووقـەم پێ کـڕی و ناردمـەوە. گوتم: خۆ ئەمە پارەی من نییە و هی خەڵکە وەرم گرتووە. بۆ منیان ناردووە، بۆیە وەری ناگـرم و ئەمـە پارەی میللەتە.

# ماڵی ئێمە و هەولێری دەوروبەری جەنگی دووەمی جیهانی

پرۆفیسۆر: د. مارف خەزنەدار



**گەڕانەوەی دایکم بۆ ماڵی خۆمان**

تەنگوچەڵەمەی دەروونی و گیانیم لە ئەنجامی دووریم بوو لە دایکی خۆشەویستم، ئەگەرچی تا پلەیەک بەم دوورییە راهاتبووم و سۆزی باوەژنم (زڕداکم) هەندێ بۆشایی ناو پەڕەکانی دڵمی پڕ کردبوودوە، بەڵام بێ دایکی بەهیچ شتێک چارە ناکرێ، کەس نابێ بەدایکی کەس.

چەند مانگێک لەمەوبەر بەهۆی ئەوەی باوکم ژنێکی دیکەی بەسەر دایکم هێنابوو ئەمەیان کۆرپە ساواکەی برامی لە باوەش کردبوو رووی کردبووە ئەوبەری بەستی هەولێر، لە گەڕەکی تەعجیل وەکو کەسێکی زیزبوو لە ماڵی حەسەن کاروانچیی باوکی مابوودوە. من ئەگەرچی باوەژنم خۆش دەویست، بەڵام بیر و خەیاڵم هەمیشە لای دایکم بوو.

ئەو بەیانییە رۆژی هەینی بوو، هەندێ درەنگ لە خەو هەڵسام، دڵم خۆش بوو نەمدەزانی بۆچ! بەیانییان نانی باشم نەدەخوارد، کەچی ئەو رۆژە هەستم بەبرسییەتی دەکرد، سەرتووی ماستی هەولێریان بۆ دانام، شیری ناو قەیماغەکەم تێکەڵ بەچای کرد، نازانم بۆچ سکم بەم شیرە ژانی نەدەکرد، کەچی بە شیری دیکە تووشی سک ئێشە دەبووم.

پێش ئەوەی باوکم بچێتە دەرەوە بانگی کردم و وتی: نیوەڕۆ برۆ بۆ ئەوبەری بەستێ بۆ لای دایکت! ئەمەی وت و پشتی تێ کردم و رۆیشت بۆ بازاڕ. لە خۆشیاندا بیر و هۆشم وەستا، هیچم بۆ نەکرا، نەمتوانی بیر لە هیچ شتێک بکەمەوە! نەمزانی باوکم ئەم قسەیەی تەنیا بەمن وتووە یا خەڵکی ناوماڵمان هەموویان دەیزانن! بیزانن یان نەیزانن گرنگ نییە، باوکم لە هەموویان گەورەترە و سەریشکە بۆ هەموو شتێک و بڕیاریش هەر بەدەست ئەوەوەیە.

پێش نیوەڕۆ رووم کردە ماڵی باپیرم، لە دوورەوە چاوم لێ بوو دایکم لە ناو دەرگا دانیشتووە و چاوەڕوانی من دەکا، هێشتا زۆری مابوو بگەمە ناو دەرگاکە، بەغار بۆم هات و دەستی کردە ملم، ماچی دەکردم و دەیگوشیم و دەمی بەنێوچەوان و چاو و رووومەت و لووت و گەردەنم دەخشاند هەناسەی قووڵی هەڵدەکێشا و لە ئۆخەی ئۆخەی بەولاوە هیچ شتێکی دیکە لە دەمی دەرنەدەچوو، لە پاشاندا بردمی بۆ ژوورەوە، سەرمی خستە سەر سنگی خۆیەوە. دەیوت: ئێ! شوکور لە قوتابخانە سەرکەوتی! هەق ون نابێ، گەشتی گوندی کێلە زیندان خۆش بوو! دەڵێن باوەژنت خۆشی دەوێی.

شەو لە ماڵی باپیرم مامەوە، لە ژووری عەمباری مێوژ، لە نێوان دایکم و داپیرم نووستم، جۆلانەی جەمالی برام لە تەک ئەولای دیکەی دایکمەوە بوو، چاوی چووبووە خەودوە، ئەگەرچی نەورۆز نزیک بووبوودوە، بەڵام هێشتا هەر سارد بوو. مێوژ و ئەستوورکە هەنجیر و گوێز و باوی و تووڕدق و دۆشاو تامیان مابوو. داپیرم لە ژووری خۆیدا

ئەگەر بەتەنیا بووایە زیاتر حەزی بەقەندیلۆک (قوتووی چرای نەوت) بوو بۆ رووناکی، ئەگەر میوانیشی بووایە لامپاییێکی بچووکی هەبوو دایدەگیرساند، ئەو شەوە رووناکیی لامپاکە دیکۆرێکی سەیری دروست کردبوو لە بنمیچ و دیوار و کەلێنی ئەو جەوالانەی لە بنبانی ژوورەکە ریز کرابوون و پربوون لە میوەی وشککراو. نیوە تاریک بوو، تارمایی وێنەی جۆراوجۆری دەنواند: ئادەمیزاد، ئاژەڵ، ژنی بەعەبا یا چارشەو پەچە، قوتابییان لە ریز وەستاون و سروود دەچرن، هەندێ جاریش وێنەی ترسێنەر. ئەگەر ئاگری فتیلەی لامپاکە لەرەی تێ بکەوتایە یا زیاد و کەمی بکردایە ئەوا دیمەنی دیکۆرەکان هەموویان تێک دەچوون و شتی تازە دروست دەبوون.

ئەو شەوە لەگەڵ دایکمدا تێر قسە بووم، بەڵام ئەو هەموو قسانە بایی ئەوە نەبوون، کە لێم پرسی: کەی دەگەرێییەوە ماڵێ! فرمێسک لە چاویدا قەتیس مابوو کە وتی: لەبەر چاوی تۆ دەگەرێمەوە، بەبێ من قوتابخانەت بۆ تەواو ناکرێ. بەیانی تۆزێک زووتر نانی دەرخوارد دام و بەرێی کردم بۆ ئەوەی بەوە رابگەم لە ماڵی خۆماندا دەفتەر و کتێبەکانم هەڵبگرم و بەرەو قوتابخانە بکەومە رێ. لە دوای یەک دوو رۆژ جمووجووڵێکی نائاسایی کەوتە ماڵمانەوە، دیار بوو هەموو شتێک جێبەجێ کرابوو و دایکم و باوکم ئاشتبوونەوە، دایکم و جەماڵی شیرەخۆر گەرانەوە ماڵێ، ژوورەکەمان ئاوەدان بووەوە، باوەژنم کۆشکی بەجێ هێشت و ماڵی بار کرد بۆ خانووی خزمێکیان لە کۆڵانی پشت ماڵەکەی خۆمانەوە، خانوویێکی بچووک و رێکوپێک و جوان بوو، چوار ژووری تێدا بوو، دووانی خاوەنی تێیدا دانیشتبوو، دووانەکەی دیکە باوکم و باوەژنم، لە دواییشدا باوکم نیوەی خانووەکەی لە خزمەکەمان کڕی و بوون بەهاوبەش.

بەمجۆرە بووم بە خاوەنی سێ ماڵ، ناوم نابوون ماڵی باوکم، ماڵی دایکم، ماڵی هەمینەی داپیرم. بەمە بەختیار بووم و هیچ تەنگوچەڵەمەییێک بەرەو رووم نەدەبووەوە، کامە لا زیاتر نازی هەڵبگرتمایە دەچوومە ئەولا، ئەمە بووە هۆی ئەوەی هەموو لاییێک بێ دڵیم نەکەن، هەر کەسە بەشێوەیەک بایەخی پێ دەدام بۆ ئەوەی مەیلم بۆ لای ئەو زیاتر بێ، بەتایبەتی باوکم و دایکم، زۆری کاتم هەر لەلای دایکم بووم و کتێب و دەفتەرەکانیشم هەر لە ناو دەلاقەکەدا بوون لە ژووری ئەودا.

### سەیرانی بەهار و رابواردنی کۆمەڵایەتی

سەیرانی بەهار دەستی پێ کردبوو، بەتایبەتی چوارشەموان، گوڵ و گوڵاڵەی سەوز و سووری سروشت لەگەڵ جلوبەرگی ئاڵاو واڵای منداڵان و هەرزەکار و کیژۆڵە و شۆڕەژنان تێکەڵ بەیەکدی دەبوون، ئەمیان لە جێی خۆی سەمای دەکرد و ئەویان شەپۆلی لە جێیەک بۆ جێیەکی دیکە دەبزووتەوە لە بەهاران شار گەورەتر دەهاتە پێش چاو، شەقامەکان فراوانتر دەبوون، ئاسمان بەرزتر خۆی دەنواند، ئادەمیزادیش خۆی بەنرختر دەهاتە پێش چاو.

بەهار لای ئێمە تەنیا تۆڵەکە و کەنگر و کاردی و پیشووک یا قەیسی و شیلان و بەلاڵووک، یا ماست و پەنیر و فرۆ و لۆر، یا نێرگز و بەیبوون و وەنەوشە و گوڵاڵەی نەدەهێنا، تەنیا جوانی دلبەر و نازەنین و قژ زەرد و چاوکاڵانی نەدەخستە روو، تەنیا قەدپاڵی قەڵا (بەدەن)ی نەدەکردە مێرگ و مێرغوزار، تەنیا ئەمانە نەبوون جموجۆڵی کۆمەڵایەتیشی دەهێنا سەر شەقام و ناو کۆڵانەکان.

لەولا مەیموونە کاتێک پەیدا دەبوو، کەس نەیدەزانی خەڵکی کوێیە، منداڵە وردکە لە دەوری کۆدەبوونەوە، لە هەریەکەیان دوو فلسی وەردەگرت، ئینجا دەستی دەکرد بەهەڵپەراندنی مەیموونەکە و وەرزشی پێ دەکرد، دارێکی بەدەستەوە بوو، بەهەردوو دەست دەیگرت و بڵندی دەکرد، مەیموونەکە خۆی پێ شۆڕ دەکردەوە. جار ناجار ئەگەر مەیموونەکە سەری لە منداڵێک نزیک بکردایەوە، منداڵەکە لە ترسان رای دەکرد، مەیموونی پاشەڵ سوور کردەوەی ئادەمیزاد و ئاژەڵی دەکرد، هەموو ئەم جموجۆڵییە لە پێنج چرکە زیاتری نەدەخایاند و دوایی بە شانۆکەی دەهێنا. ئیدی خۆی و مەیموونەکەی دەچوون بۆ لاییێکی دیکە و چاوەڕوان دەبوون تا خەڵکی کۆدەبنەوە، بۆ ئەوەی شانۆکە دووبارە بکاتەوە.

لەلایەکی دیکەوە کابرایەکی زەلامی چوارشانەی لۆزەنددرێک بوو بۆ خۆی (ئەستەمبووڵە بەخان) بینینی ئەستەمبووڵێکی بەکۆڵییەوە بوو، دوو کورسیی بچووکی

چەماوەی بەدەستەوە گرتبوو لە کۆلان و شەقامەکاندا بانگی دەکرد ئەستەمبوولە بەخان، ئەستەمبوولە بەخان، ئەمە بریتی بوو لە قوتوویێکی گەورە لە تەنەکە دروست کرابوو، دوو داری تیرۆگ ئاسایی لەملا و ئەولای قوتووەکە چەسپ کرابوو، ریزێک وێنەی رەنگاورەنگی هەمەجۆر بەدارەکانەوە نووسێنرابوو، کە دارێکیان بادەدا وێنەکان هەڵدەکرانەوە. لە پێشەوە دوو کونی بۆ کرابوو، ئیدی هەر منداڵێک ئارەزووی تەماشاکردنی بکردایە ئەستەمبوولە بەخانەکەی لەسەر ئەرز دادەنا و دوو کورسییەکەشی لە پێش دادەنا، هەریەکەی منداڵێک لەسەری دادەنیشت، کرێی پیشاندانەکەشی وەردەگرت، لە هەر منداڵێک دوو فلس، ئیدی دەستی پێ دەکرد، بەقسە و بەئاوازی گۆرانی و دەنگەوە دارەکەی بادەدا و وێنەکان بەپێش چاوی منداڵە بینەرەکان تێ دەپەرین. دیمەنی شەقامەکانی ئەستەمبوولی پیشان دەدا، زۆرجار وێنەی باغ و باڵەخانەی جۆراوجۆری وڵاتە ئەوروپییەکانیشی دەخستە روو، هەندێ وێنەی فۆلکلۆری میللی و حیکایەتەکانی رۆستەمی زاڵ و ئەسکەندەری مەکدۆنی و هی دیکەشی پیشان دەدا.

خاوەنی ئەستەمبوولە بەخانەکە بەزمانی کوردی و تورکی و عەرەبی دیاردەکانی لێک دەدایەوە، قسەکانی هەمووی کەچ بوون، فۆنیم و فۆنەتیکی هیچ زمانێکیانی دروست نەبوو، بەراستی پیاو نەیدەزانی ئەم کابرایە کوڕی چ نەتەوەیەکە، لە ناو وێنەکاندا هەندێ جار وێنەی مستەفا کەمال دەردەکەوت، کابرا بە ئاوازەوە دەیوت: مستەفا کەمال لە ژوورە، پەنجەرەکانی بەللوورە.

هەندێ جار کە بەهار پیر دەبوو و تاقیکردنەوەی سەری ساڵ نزیک دەبووەوە، کابرایەک پەیدا دەبوو عەلی پاڵەوانیان پێ دەوت، لە عەجەمەکانی ئازربێجانی ئێران بوو. ئەمە ئێواران لە خانوویێکی تەنیشت خانەکەی مام عوسمان کەردزی خەڵووزفرۆش و مام سلێمانی گەچفرۆش لە پشت قوتابخانەکەمانەوە. زۆرخانە و پاڵەوانبازی دەکرد، کرێی تەماشاکردن عانەیێک بوو (چوار فلس). بەزۆری بینەران منداڵ بوون، بەڵام لاو و پیاوی گەورەشیان تێدا دەبینرا.

یەکێ لە یارییەکانی عەلی پاڵەوان ئەوە بوو دەچووە ژێر ئۆتۆمبیلێکی بچووکی تەنتە، لە تەنیشت تایەی پشتەوە لەسەر پشت رادەکشا، تەختەدارێکی لەسەر سنگی دادەنا، بەهەردوو دەست لە ژێرەوە ئەملا و ئەولای دەگرت. ئۆتۆمبیلەکە لەسەرخۆ دەکەوتە بزووتنەوە، عەلی پاڵەوانیش بەهەموو هێزییەوە تەختەکەی بڵند دەکرد تا ئۆتۆمبیلەکە بەسەر تەختەی سەرسنگی عەلی پاڵەواندا دەرباز دەبوو، ئیدی چەپڵە بۆ پاڵەوانی هەڵکەوتوو و بێ هاوتا لێ دەدرا. ئەمە بوو هەندێ وێنەی خۆش و رابواردن و فێربوون بۆ گیان و مێشک لە سەردەمی منداڵیماندا.

### ئاهەنگی خەتەنە سوورانە (سوونەتکردن)

رۆژگارێکی پڕ لە شادی بوو، هەڵسوکەوت ئارامی گیان بوو، دایکم و باوەژنم بوون بە دەستەخوشک و یەکتریان خۆش دەویست، ژنانی هاوسێ و گەڕەک و کەسوکار و ناسیاو سەریان لەم دیاردەیە سوڕمابوو، دوو هەوێ لەگەڵ یەکتریدا هەڵبکەن، نەخێر یەکتریشیان خۆش بوێ، باوەژنم هاتە ماڵی دایکم و بەخێرهاتنەوەی لێ کرد، لەمەودوا باوەژنم هاتوچۆی ماڵی دایکمی دەکرد، بەڵام دایکم نەدەچووە ماڵی ئەوان. لەو سەردەمەدا ناوی ماڵی دایکمیان ناو نابوو ماڵە گەورە.

تازە لە تاقیکردنەوەی قوتابخانە رزگاریم بووبوو سەرکەوتبووم، بەم رۆژگارە لە ماڵی ئێمەدا خۆئامادەکردن بوو بۆ ئاهەنگی خەتەنە سوورانە، ئاهەنگێک بوو بۆ خۆی. بەرگی دۆشەک و لێف و سەرین تازە دەکرایەوە. قاپ و قاچاغی ئاسنجاو سپی دەکرانەوە، لۆکس و لامپا و لالە ئامادە کران، چوار پێنج سەبەتەی نارجیلی پردێ بە قوماشی رەنگاورەنگ و ئۆیە نەخشێنران، شەکرشکێن و تەبەق و شەکردان و گوڵدان و گوڵاودان پاک کرانەوە، برنج و رۆن بەقەسناغ و هیزە دەهاتنە ماڵەوە. بەرخ و مریشک بەخێو دەکران بۆ ئەوەی قەڵەوتر بن. جلوبەرگی نوێ بەبالای هەموو خەڵکی ماڵی خۆمان برابوو، مەحەلەبی و پاقلاوە و کولیچە لە ژوورەکاندا دانرابوون، لە هەمووی گرنگتر پۆپەشمینێکی ئاوریشمی حەوت رەنگ لە کۆنەوە هەڵگیرا بوو بۆ ئەو رۆژەی منداڵان خەتەنە دەکرێن بۆ ئەوەی بەسەر سەریانەوە بیلەرێننەوە.

ئەو رۆژانە لە حەوشەی ماڵی خوارەوەمان بەیانییان لەگەڵ عومەری برام تۆپێنم دەکرد، تۆپێکی بچووکمان

هەبوو بۆ یەکتریان فڕێ دەدا، من بە دەست دەمگرتەوە و بۆ ئەوم فڕێ دەدا ئەویش بۆ من، بەمجۆرە کاتمان دەبردە سەر، جاری واش هەبوو عومەر پشتی تێ دەکردم تۆپەکەی هەڵدەدایە دیوار و بەدەست دەیگرتەوە، ئەمە دەبووە مایەی بێزاری و تووڕەیی من، هەرچەندە ڕێزیشی دەگرتم، چونکە لەو گەورەتر بووم، بەڵام بزێو و کەللەڕەق بوو. زۆرجار ناچار دەبووم وازم لە تۆپەکە دەهێنا و لە دار تووە خۆشەویستەکەم نزیک دەبوومەوە، خانووی خواردوەمان باغی نەبوو، وەکو زۆربەی هەرە زۆری ماڵە هەولێرییان، بەڵام لە بیرم بوو هێشتا نەچووبوومە حوجرە نەمامێکی بچووکی دار تووم لە کوڵان دۆزیبووەوە، لە بەردەرگای ژوورەوەی حەوشەکە چاند بووم، ئەم دارە گەورە بوو، بەڵام زڕتوو بوو و بەری نەبوو، ئەو ڕۆژە یەکجار هەوەسی چوونە سەر دارم هەبوو، پێی هەڵگەڕام تا گەیشتمە سەر دیواری دەرەوەی ماڵەکەمان، ماوەیێک لەوێ ئازایەتیی خۆم پیشانی خەڵکی دەدا، ئەو دار تووە نەوەکو تەنیا بۆ من دروشمێک بوو، بەوەی ئاگاداری مێژووی ژیان و بەسەرهاتی بووم، بەڵکو لە گەڕەکەکەش بەناوبانگ بوو، چونکە لە ماڵەکانی دەوروبەر هیچ جۆرە شینایییەک نەبوو، بۆ ناساندنی ماڵی خۆمان و ماڵی خەڵکی دیکە دەیانوت: لە ماڵەکە یا نزیک ماڵەکەی سەر بەستێ، کە دار توویێکی تێدایە.

هەرچەندە کاتی سوونەتکردن نزیک دەبووەوە، من زیاتر ترس دەچووە ناو دەروونمەوە، لەلایەکی دیکەشەوە زۆر بەختیار بووم وام دەزانی پاش ئەم کارە دەبم بە پیاو و دەتوانم حەز لە کیژۆڵان بکەم. سەرەتای هاوین بوو بەڵام ئاووهەوا هێشتا هەر فێنک بوو. ئەو بەیانییە ماڵی ئێمە یەکێکی دیکەی نەدەگرت، سەما و هەڵپەڕکێ و گۆرانی بۆ کوڕان، جۆلانە لە ژووری دایکم بۆ کیژۆڵان، ژنان خەریکی مەتبەق و مەنجەڵ بوون، نزیک نیوەڕۆ پۆل پۆل پیاو دەهاتن بۆ نانی نیوەڕۆ، خۆیان دەڕۆیشتن و ژن و منداڵیان دەمانەوە، ئەمە تا نزیک عەسری خایاند، پێش بانگی شێوان وەستا عەبدوڵڵای گۆرانیبێژ خۆی و تیپەکەی بەدەف و تەپڵەوە هاتن. کابرایێکی شەدە و پشتێند سەوز جانتایێکی لەوانەی پزیشک بەکاری دێنن بەدەستەوە بوو هات و لە نزیک حەوزەکەوە دانیشت و دەستی کرد بەئامادەکردنی کەلوپەلی نەشتەرگەری. لە پاشاندا دوو کەس چمکەکانی پۆپەشمینەکەیان بەدەستەوە گرت، دەفژەنەکان هەڵقەیان بەست، دەنگ و سەدای سەڵەوات بەرز بووەوە، دەفژەنەکان بەهەموو هێزیانەوە دەفیان دەژەنی، مامە سەیدی خەتەنە لە ژێر پۆپەشمینە دانیشت، دەستی کرد بەخەتەنەکردن، یەکەمیان من بووم، ئینجا هەردوو برام عومەر و جەماڵ، دوو پوورزاشیان لەگەڵ ئێمەدا خەتەنە کرد، گەورەکەیان عوسمان لە ترسان هەڵات، بچووکەکەیان عەباس خەتەنە کرا. هەڵاتوویان لە ژێر پردەکەی ڕێی کەرکووک دۆزیبیەوە، بەڵام پێش تاریکایی هێنایان و ئەوی پێویست بوو بۆیان کرد، ئەو شەوە تا پاش نیوەشەو دەنگی گۆرانی و غەزەلخوانی و دەف و تەپڵ و خوێندنی مەولوود گەڕەکەکەمانی پڕ کردبوو لە جموجۆڵ، ڕووناکیی لۆکس هەموو لایێکی کردبوو بە چراخان.

**شیعر و شەوچەرە و ئەلەتریک (کارەبا)**

لە ناوەڕاستی قۆناغی سەرەتایی بووم، کە بۆ یەکەمین جار هەستم کرد بەجۆرێکی دیکە لە شیعر دەگەم، لە پێش قوتابخانە شیعرم لەبەر بوو، لە قوتابخانە شیعر و سروودی دیکەی کوردی و عەرەبیم لەبەر کردبوو، بەڵام بە هوشیاری نەبوو، زیاتر بەلامەوە شیعر ئاواز و مۆسیقا و کێش و قافیە بوو، تا ئەو ڕۆژەی شیعرێکی نالی جموجۆڵی و بزووتنەوە و شۆڕشی بیری لە مێشکمدا بەرپا کرد:

**لە دوگمەی سینە دوێنێ نوێژی شێوان**
**بەیانی دا سپێدەی باغی سێوان**

ئەوەی لە بیرم مابێ ئەوەیە، هەر لە دوای ئەم شیعرە، شیعرەکەی حاجی سەرنجی ڕاکێشام، ئەوەی دەڵێ:

**خاکی جزیر و بۆتان یەعنی وڵاتی کوردان**
**سەد حەیف و سەد مخابن دەیکەن بەئەرمەنستان**
**وا ڕێگەتان دەبەستێ عێلاتی جاف و بلباس**
**گەر مردوون لە گەرمان مەمنوعە بچنە کوێستان**

لەم دوو شیعرەوە بیروڕای تازەم دۆزییەوە بەرامبەر شیعر و شاعیر، شاعیر بەلامەوە سەرووی ئادەمیزاد بوو، شیعریش قسەی کردگارە، لە زۆر شیعر نەدەگەیشتم، بەڵام دەیجووڵاندم، بیری ناوەوەم وای دەردەخست وەکو بڵێی لە شیعر دەگەم، کەچی ڕاستییەکەشی ئەوە نەبوو.

زستانەکانی پێشوو بەتایبەتی لەو زستانەشدا دانیشتنی شەوانمان بەردەوام بوو. لە شەوچەرەی زستاندا خزم و کەسوکار و هاوسێ دەهاتنە ماڵەوە، ژن و پیاو و منداڵ تێکەڵ دەبوون، لە ژووری دایکمدا دادەنیشتین، سەروسەربردە و گێڕانەوەی ئەفسانەیی و حیکایەتی بەرگوێی ئاگردان زۆربەی کات دەچووە سەر، گۆرانیش بەشی خۆی هەبوو، بەتایبەتی حەیران.

هەندێ شەو ئیسحاقە گولەی حەیرانبێژ بەدەنگە خۆشەکەی زاخاوی چێژ و نەشئەی دەخستە ناو دڵی دانیشتوانەوە، ئەم گۆرانیبێژە لە بێخدا کرمانجی دەشتی هەولێر بوو، بە ئایین جوولەکە بوو، بەپیشە جۆلا بوو، جاجم و بەرماڵی نایابی دروست دەکرد، شەرواڵ و مرادخانی لەبەر دەکرد و کڵاوی سوورمەچن و مشکی و سرکەیی لە سەری دەپێچا. لەو دانیشتنانەدا خواردنەوە چایە و قاوە و شیر بوو، میوەی وشککراو لەگەڵ ئەشرەسی خواردن بوو، ئەم کۆڕانە هەندێ جار تا پاش نیوەشەوی دەخایاند، بەڵام لەبەرئەوەی شەوانی هەینی بوو، ترسی چوونە قوتابخانەم نەبوو، بۆ بەیانی ئەگەر ڕۆژ خۆش بووایە و هەتاوی زستان گەرم بووایە، ئەوا لەگەڵ یەکەم هاوڕێی سەردەمی منداڵیم ئەحمەد شێخ محەمەد ئۆتراقچی یا حەماوی، لە گەڕەکی خۆمان، بەتایبەتی لە ناو بەستەکە رامان دەبوارد. جارجارە بزێویمان دەکرد، بەلامانەوە ئاسایی بوو ئەگەر کاتێکمان لەگەڵ کەرێکی گەڕی بەرەڵڵا ببردایە سەر، بەدار لێمان دەدا، کلکیمان رادەکێشا، تۆمترەقەمان لە بن کلکی ئاگر دەدا، کەرەکە هەڵدەبەزی و دادەبەزی و لەقە و لووشکەی دەهاوێشت، گەلێ جاریش لە ناو بەستەکە تووشی (کەرێ شێن) دەهاتین، ئەمە کابرایێکی جوولەکە بوو، پیر و رزیو بوو، هەندێ شێتۆکە و کەم هۆش و نەفام بوو، ناوی حسقێل بوو، بەڵام لە ناو خەڵکی بە کەرێ شێن ناسرا بوو، ماوەیێکیش لەگەڵ ئەومان رادەبوارد، وەکو کەر مامەڵەمان لەگەڵدا دەکرد و بە کورش.... کورش بانگمان دەکرد.

لە هەولێر لەو سەردەمەدا گەڕەکی جوولەکان هەبوو، بەڵام گەڕەکەکە تێکەڵاو بوو، موسڵمان و جوولەکەی تێدا بوو، راستە کۆڵانێکی باریکی درێژی وەکو ئەبوسێفێن زۆربەی جوولەکە بوون، بەڵام لەوێشدا ماڵی موسڵمان زۆر بوون، وەکو ماڵی مەلا شەریفی موختاری گەڕەکەکەمان و حەسەن خەدیجی بازرگانی بەناوبانگی هەولێر و میکایلی بەقاڵ و هی دیکە، کەچی ماڵی یۆنانی موختاری جوولەکان لە ئەبوسێفێن نەبوو، بەڵکو لەو کۆڵانەدا بوو کە زۆربەیان موسڵمان بوون.

ئەو گەڕەکە تێکەڵاوە شانۆی جموجۆڵی سەردەمی منداڵیمان بوو، لەگەڵ ئەحمەددا زۆر کە لە گاڵتەکردن بە کەرێ شێن دوور دەکەوتینەوە و پێش ئەوەی بگەینە دوکانی قادر شووگن بۆ کڕینی نوقڵ و ترش و شیرین، چاومان بە قەسابباشی جوولەکان دەکەوت، ناوی زەکای بوو، بەڵام لە ناو خەڵکیدا بە (بەبێو) ناوبانگی دەرکردبوو، زۆری پێ ناخۆش بوو بەم ناوە بانگ بکرایە.

بەبێو کابرایێکی زەلامی چوارشانەی یەکجار قەڵەو بوو، سوور و سپی بوو، لە قورسییاندا مشەی دەهات، هەر لە دوورەوە کە پێمان دەوت بەبێو... بەبێو وەرامەکەی ئەوە بوو دەیوت: یەک داک و هەزار باب، لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەندیی نێوان جوولەکان و خەڵکی گەڕەکی خۆمان دۆستانەتر بوو لە پەیوەندیی خەڵکی گەڕەکەکانی دیکە لەگەڵیاندا، ئاشێری کوڕی ساڵح یوسف نووری سەرۆکی تایفەی جوولەکان و حەبیبی کوڕی یۆنا موختار و شەمعوون رەحیم و هی دیکە دۆست و هاوڕێی قوتابخانە بوون، لە کۆڵانیشدا پیاسەمان لەگەڵیاندا دەکرد و لە یاریکردندا بەشدارییان لەگەڵماندا دەکرد. لە ناو جوولەکەکانیشدا کچێک هەبوو بە بەدریە کوڕانی ناوی دەرکردبوو، کچێکی ئەسمەری باڵابەرز بوو، لە تەمەنی ئێمەدا بوو، شەرواڵ و چاکەتی لەبەر دەکرد، رەوتی کوڕانە بوو، هەڵسان و دانیشتنی لەگەڵ کوڕاندا بوو، هەروەها خۆی بە کورد دادەنا. هەرچەندە لە ناو ئێمەدا جوولەکە بەگشتی بەترسنۆک ناویان دەرچووبوو، بەڵام چەقاوەسووی وەکو (روبێن)یشیان هەبوو، ئازا و بەهێز بوو، دەستدرێژیی لە کەس قبووڵ نەدەکرد، بەلێدانیش بووایە بەسەر ئەو منداڵانەدا زاڵ دەبوو ئەگەر بیانویستایە دەستدرێژیی بەسەردا بکەن.

هەندێ جار ئەگەر لە دوکانی قادر شووگنیش رەت بووینایە، روومان دەکردە چایخانەکەی مام حەبیب، کە لە مزگەوتی ناو بازاڕەوە نزیک بوو، لەوێ چایەمان بێ پارە

دەخواردەوە، چونکە ناسیاوی و خزمایەتیمان لەگەڵیدا هەبوو.

لە زستاندا قوژبنی لای دەستە ڕاستی دەرگای ژووری دایکم لە ماڵماندا نسار بوو، هەتاوی لێ نەدەدا، گەلێ جار ئێمە نزیکبوونەوەی بەهارمان بەوە دەزانی، کە ڕۆژ لەو قوژبنە نزیک دەبووەوە. لە پاش نەورۆز ڕۆژ بەتەواوی ئەوێی داگیر دەکرد. تەلی کارەبا ئەوکاتە ئەلەتریکیان پێ دەوت - هێشتا نەگەیشتبووە بەردەرگای ماڵی ئێمە، کوڵەگەی لێ داندرابوو، گڵۆپی پێوە نەبوو، گڵۆپەکانی ئەوبەری بەست بەئاستەم لای ئێمەی ڕووناک دەکردەوە.

باوکم دەمێک بوو هەوڵی دەدا لەودیو بەستەکەوە تەلی کارەبا رابکێشێ، لە پێشانا کارەبای هێنایە خانووی بچووکی خواردەوەمان، دیاربوو پارەی زۆری تێ دەچوو ئەگەر بۆ هەردوو خانووی بکێشایە. لە خانووی خوارەوە تەلێکی کێشا بۆ خانووی سەرەوە، گڵۆپێک لە بن داڵان (قەنتەرە) و گڵۆپێک لە ژووری دایکم داندرا، ئەم ڕووداوە گۆڕانکارییەکی یەکجار بنچینەیی و گەورە بوو، خانوو و ژوورەکانمان بەشێوەیەکی دیکە دەهاتنە پێش چاو، لە جاران گەورەتر خۆیان دەنواند، بەڵام ئەم تازەگەرییە، هەندێ لە ڕۆمانتیکییەتی لامپا و لالەی کەم کردەوە، هەندێ کەل و قوژبنی شاراوەی لە ماڵەکەدا ئاشکرا کرد، لایەنی مەتریالییەکە بەسەر لایەنی گیانییەکەیدا زاڵ بوو، بەڵام دەبوو ئەنجامیش هەر ئەوە بێ چونکە دروشمی پێشکەوتن بوو.

ئەو شەوە یەکەمین شەو بوو لەبەر ڕووناکیی ئەلەتریک دانیشتین، پیتەکانی کتێبی قوتابخانە ڕوونتر دیار بوون لە پێش ئەم ڕۆشنایییە، ئەوەی لە هەمووشی گرنگتر بێ ئەوە بوو پێویستمان بەشووشەی لامپا نەمابوو ئەوەی هەندێ جار لەسەرمان دەشکا، جاری واش هەبوو لە کاتی پاککردنەوەدا شەقی دەبرد، نازانم چۆن بوو لە یەکەم بینینی ڕۆشنایی ئەلەتریک شەوێکی ئەو زستانە تازە تاریکایی داهات بوو، لامپای ژوورەکەمان ئاوی پێکەوت و شەقی برد، لەو کاتەدا بەستەکە ئاوێکی زۆری پێدا دەڕۆیشت، لافاوی دروست کردبوو، دوو عانە (هەشت فلس)م لە دایکم وەرگرت و چووم بۆ سەر شەقامە تاقانەکەی شاری هەولێر، لافاوەکە زۆر بوو بۆم نەدەکرا لە ئاوەکە بدەم، ناچار بەسەر پردەکەی ڕێی کەرکووک پەڕیمەوە ئەوبەر، بۆ لای دوکانەکەی ئەحمەد شەبەکی باوکی هاوڕێم نووری، لە ژێر قەڵا بوو، ئیدی باش بوو مام ئەحمەد تەنیا شووشەیێکی مابوو، لێم وەرگرت و بەلای منەوە نرخی ئەم شووشەیە هەموو گێتی بوو.

لەو بەهارەدا بوو کۆمەڵێک منداڵی گەڕەکی خۆمان بەسواری کەرەوە بەرەو مێرگی گەشتوگوزار چووبوون، لە مێرگ و مێرغوزاری بەهار، بەلای گۆڕستانی چراغەوە تێپەڕین، گۆڕەپانەکەی پۆلۆی پشت گۆڕستان قەڵەباڵغ بوو، خەڵکێکی زۆر وەستابوون، سوارچاک تەراتێنیان دەکرد، هەندێکیان بەغار، هەندێکی دیکەیان مەشقیان دەکرد، لەوێوە ئاوا بووینە گۆڕستانی جوولەکان، ئینجا گەڕاینەوە لای ئاوی میری.

شار چۆڵ بووبوو، دەشت و دەر بووبوو بە ئادەمیزادستان، هەرچی خواردەمەنییەکی فرۆشیارە گەڕۆکەکان لە ناو قیر تەبەق و سەبەتە و شتی دیکە دەیانفرۆشت، کەوتبوونە ئەم چۆڵە. ئێمەش ناوە ناوە سواری کەرەکانمان دەبووین، هەندێ جاریش ڕەشمەمان بەدەستەوە دەگرت و کەرەکانمان دەدایە دوای خۆمان.

ئەو دیمەنەی بەبیرمدا نەدەهات ڕۆژێ لە ڕۆژان چاوم پێی بکەوێ ئەوە بوو، کە لە نزیک ئاوی میری چاوم پێی کەوت. دەبینین حەمە عەلی بۆیاغچیی پێڵاو لە قوتابخانەماندا بەسەرخۆشی و بێ هۆش لەسەر ئەرز کەوتووە، خەڵکی لە دەورەی کۆبوونەتەوە، ئەمەمان پێ سەیر بوو، چونکە حەمە عەلی پیاوێکی ماقووڵ بوو خەڵکی ڕێزیان لێ دەنا، ئێمەی منداڵانی پۆلەکانی بەرایی قوتابخانە شەرمان لێی دەکرد، ئەمە دەبووە هۆی ئەوەی پێڵاوەکانمان لای بۆیاغ نەکەین، دیمەنی حەمە عەلی بینینی یەکەمین دیمەنی سەرخۆش بوو لە ژیانمدا. ئاسمان هەوری دەهێنا، لایێک ڕەش هەڵدەگەڕا، لایێکی دیکە نمەباران، بەرامبەر ئەو پەلکەزێڕینەی تاقی کاکێشانی گەردوون خۆی پیشان دەدا، تیشکی خۆر و نمەی باران پەشمەی حەوت ڕەنگی سروشتیان دەتەنی، نەوەکو تەنیا بەزمی بولبول و گوڵ بوو، خاوەن کەرەکانیش کوڕێکیان بۆ خۆیان بەستبوو، بەم بەهارە خۆشە کەرەکانیان لە یەکتری چاک دەکرد.

### مەلیک غازی مرد

نزیک رۆژ ئاوابوون بوو، لە بن دالآنی خانووی خوارەوەمان دانیشتبووین، بەهار سروشتی گولاوپژێن کردبوو کە باوکم هاتەوە، زۆر بە هێمنی و لەسەرخۆ وتی: مەلیک غازی مرد، خەڵکەکەی ماڵمان هەریەکە بەجۆرێ هەستی خۆی دەربڕی، بەگشتی بێدەنگی باڵی بەسەریان داکێشا، گرژییان پێوە دیاربوو. بەلای منەوە هەواڵەکە ئەوەندە گرنگ نەبوو، ئەو زانیارییانەی مامۆستا لە قوتابخانە فێریان کردبووم لەبارەی مەلیکەوە هاتنە یادم. من مەلیکم خۆش نەدەویست، زیاتریش لەبەرئەوەی زمانی کوردی نەدەزانی، لەو سەردەمەدا بەلای منەوە ئەگەر ولآتێک لە دوو نەتەوە پێکهاتبێ، پێویستە مەلیکەکەی زمانی هەردوو نەتەوەکە بزانێ، دڵیشم بەوە خۆش بوو کە لە باوکمم بیست بەیانی رۆژی ماتەم دەبێ، قوتابخانەکان و کارگێرانی میری کار ناکەن. بۆ رۆژی دووەم شار رەشپۆش بوو، دوکان و بازاڕ و دیوار و دەرگای ماڵان بە قوماشی رەش داپۆشرابوو، بۆینباغی هەموو خەڵکی ئەفەندی رەش بوو، هەموو کەسێکیش پارچە قردێلەیێکی رەشی بەیەخەیەوە کردبوو. خۆپیشاندانی سنگ کوتان و لەخۆدان و گریان و شین و شەپۆر بوو، ئەوەی دەوڵەت لە چاکەی دابوو بەکوڵ دەگریا، ئەوەی دیکە بایەخێکی ئەوتۆی بەرووداوەکە نەدەدا، منیش ئەگەرچی لەگەڵ قوتابییانی قوتابخانەی خۆمان لە خۆپیشاندانەکاندا بووم، بەلآم چاوم فرمێسکی تێدا قەتیس نەمابوو، دڵم خورپەی نەدەکرد، هەروەها وەنەبوو دڵشاد و گوشادیش بم، چونکە مردن نابێ ببێتە مایەی خۆشی، کابرایێکی قەڵەوەی سوور و سپی بەتای فانیلە بوو، دەیلاوانەوە و لە سنگی خۆی دەدا، دیمەنەکە لە شەخسی وەحش و سینگ کوتانی تازیەی عاشوورای دەکرد، نزیک نیوەڕۆ بوو لە دوای ئەوەی چەند جارێک بەسەر شەقامەکە سووڕانەوە، لە خوار دەرگای قەلآ بەرێبەری کابرا قەڵەوەکە سنگ کوتانێکی بەهێز دەستی پێ کرد لە پاشاندا فاتیحە خوێندرا، ئینجا کابرا بەعەرەبی سێ جار وتی: مەلیک مرد، مەلیک دەژی، خەڵکەکە هەرسێ جار بەدەنگی بەرز رستەکەیان دەگێڕایەوە، لە دواییدا وتیان. پاش نیوەڕۆ خەڵکەکە لە گۆڕەپانی بەردەرگای سەرا کۆ دەبێتەوە. مەبەست لە (مەلیک مرد) مەلیک غازی بوو، مەبەستیش لە (مەلیک دەژی) مەلیک فەیسەڵی دووەم بوو، بەلای منەوە پیاوی بەتەمەن و گەورە ئەگەر بشبێ بە مەلیک رێی تێ دەچێ، بەلآم منداڵێکی چوار پێنجساڵی، کە هێشتا زمانی نەکراوەتەوە چۆن دەبێ بە مەلیک! بۆیە لەگەڵ رژێمی مەلیکی دانوومان پێکەوە نەدەکوڵا.

ماوەی ماتەم ئەگەرچی چەند رۆژێک بوو، بەلآم قوماشی رەش بەسەر سەرا و قوتابخانەکان و قردێلەی رەش بەیەخەی خەڵکەوە هێشتا هەر دەبینران.

### کتێبی قوتابخانە و رادیۆ و جەنگ

تاقیکردنەوەی سەری ساڵ نزیک بووبووەوە، رۆژ لە دوای رۆژ هەوەسم لەسەر خوێندن و کتێبی قوتابخانە نەدەما، هەموو کتێبێک بەلامەوە کتێب نەبوو، چەند رقم لە کتێبی قوتابخانە دەبووەوە ئەوەندە و زیاتریش کتێبی دەرەوەم خۆش دەویست، دوورکەوتنەوەم لە کتێبی قوتابخانە نزیکبوونەوەم بوو لە کتێبی دەرەوە، نەمدەزانی چ نهێنییەک رامدەکێشێ بۆ کتێبی دەرەوە! ئەمە بووە هۆی ئەوەی لە وانەکاندا باش نەبم، بەتایبەتی زانستییە پراکتیکییەکان، بایی ئەوەندە کۆششم دەکرد لە تاقیکردنەوەدا سەربکەوم و هەموو ساڵێک پۆل بگۆڕم، کەس لەم راستییەی من نەدەگەیشت، نە باوک نە دایک نە کەسوکار، نە مامۆستا و قوتابی، نە کەسی دی، بەلای خەڵکەوە زیرەکی لەوەدا بوو هەموو ساڵێک بەنمرەی بەرز دەربچی.

لەو سەردەمەدا ئەحمەد ناجی کارگێری قوتابخانە گوێزرایەوە شەقلاوە، عەبدوڵڵا عەزیز بوو بە کارگێری قوتابخانەکەمان (ئوولا). دیدەوانی باو بوو، مامۆستایان بەجلی ئەفسەری و قوتابییانیش بەجلی دیدەوانی. جۆرە جموجۆڵ و ژیانێکی تازە کەوتبووە ناو قوتابخانەوە، کارگێر و هەموو مامۆستاکان منیان دەناسی بەهۆی ناسیاوییان لەگەڵ باوکمدا، بەلآم پەیوەندی و هەڵسوکەوتیان وەکو یەک چاک یا خراپ نەبوو لەگەڵ مندا. ئەوەی سەیر بێ ئەوە بوو زۆرجار نزیکییان لەگەڵ باوکمدا دەبووە هۆی ئەوەی زیاتر پێم بخوێنن و سەرکوتم بکەن، لە ناویاندا نامیق کەمالی نەجیب نەبێ، ئەمە

دۆستێکی نزیکی باوکم بوو، رێزی لێ دەنام و هانی دەدام بۆ خوێندن.

بەشێکی دیکە لە مامۆستایان بەجۆرێ سەرکوتیان دەکردم باوەڕم بەخۆم نەمێنێ، حاجی کەریم ئەفەندی بەجوببە و عەمامەوە وانەی ئایینی پێ دەوتین، زۆر نزیکی ئێمە بوو، هاتوچۆی ماڵمانی دەکرد، کەچی یەکێ لە قسە ناخۆشەکانی بەمن، ئەوە بوو دەیوت: تۆ کوڕی باوکێکی چاکی بەڵام لە دوارۆژدا شوتی و کاڵەکیشت بۆ نافرۆشێ! بێگومان ئەم مامۆستایە لەم بڕیارەیدا ناڕاست بوو لە رووی سایکۆلۆجی و پەروەردەییەوە، کەچی تاهیر عەبدوڵلا لەبەرئەوە سەرزەنشتی دەکردم چونکە لە زانستی ژمارە (حیساب) خراپ بووم، رێی چارەسەرکردنی ئەمە ئاراستەکردن بۆ چاکە و ئامۆژگاری بوو، بەڵام ئەو و مامۆستایانی دیکە دار و حەیزەرانیان بەکار دەهێنا. رەوشت و کرداری ئەم جۆرە مامۆستایانە لە دڵسۆزییەوە بوو، وایان دەزانی بەمجۆرە زانستی و خوێندەواری پێش دەکەون.

من و دایکم لە ژووری خۆمان لە خانووی سەرەوە دەژیاین، باوەژنم و باوکیشم لە خانووی خوارەوە بوون، من لە هەردوولا بووم، باوەژنم زۆر هاتوچۆی لای دایکمی دەکرد، دایکم کەمتر سەری ماڵی ئەوانی دەدا، باوکیشم کەم لە خانووی سەرەوە دەبینرا.

باوەژنم ژیانی خۆش دەویست، زۆر پاک و تەمیز بوو، خۆی ئارایش دەکرد، خۆی بەجلوبەرگی جوان و نایاب و گرانبەها دەڕازاندنەوە، دەستەخوشکی زۆر بوون بەسەریانی دەکردەوە و میوانداریشیانی دەکرد، هەرچەندە لە پێش هاتنی باوەژنم بۆ ماڵمان ماڵی ئێمە بەخواردن بوو، بەڵام ئەو گەلێ جۆری دیکەی خواردەمەنی هێنایە ماڵەوە، کە لە خواردەمەنی هەولێریانی نەدەکرد.

بەمنداڵی زۆر هۆگری هەردوو دایکم بووم، هەمیشە نازێ خانی باوەژنم وەکو بووکێک دەهاتە بەرچاوم و دایکم وەکو حۆرییەکی بەهەشت، یادی پیرۆزیان لە ناخی دڵ و دەروونم نەخشی کێشاوە.

لە رۆژانی ئەو هاوینە فێنکەدا بوو، کە دایکم لە باوەژنم زیاتر داوای لە باوکم دەکرد کە رادیۆمان بۆ بێنێتە ماڵەوە، بەلایەوە کارێکی ماقووڵ نەبوو ماڵێک ئەلەتریکی تێدا بێ رادیۆی لێ نەبێ، دیار بوو باوکیشم دەمێک بوو راسپێری کردبوو، بەڵام هێشتا رادیۆ بۆ وەکیلەکە نەهاتبوو، وەکیلی رادیۆ لە هەولێر ولیەمی خەیات بوو، دوکانی لە ژێر قەڵا بوو، لە پاڵ بەرگدروویەتییەکەی وەکیلی فرۆشتنی رادیۆ بوو، هەرکەسێکی بیویستایە لەو داوای دەکرد، ئەویش لە مووسڵەوە دەیهێنا و بەسەر کڕیارەکاندا دابەشی دەکرد، رادیۆکەی ئێمە وێستینگهاوس بوو، لە باشەکان بوو، نرخی هەژدە دینار بوو، لە پێشەوە دینارێک درا بوو، ئەوەی دی کرا بوو بەکۆمپیالە، مانگی دینارێک بدرێ بەوەکیلەکە.

پاش نیوەڕۆ بوو رادیۆ هاتە ماڵەوە، بەخۆشی و پێکەنین و زەماوەند پێشوازی کرا، هەواڵ بۆ مەلا سابیری ناسراو بە مەلا قەمبوور وەستای ئەلەتریک (وایەرمان) چوو، ئەویش هات. دوو داریان لە سەربان چەقاند، تەلێکیان لە هەردوو سەری رایەڵ کرد، لە ناوەڕاستی تەلەکە تەلێکی دیکەیان لێ شۆڕ کردەوە بۆ ناو رادیۆکە، ئەمە ئەنتێنا بوو، رادیۆ لە ناو دەلاقەی پەنجەرە دانرا، پەنجەرەکە دەیڕوانییە ناو حەوشە، تەلی زەمینی رادیۆکە لە کەلێنی پەنجەرەکەوە برابوو بۆ ئەودیو، ئینجا خرابووە ناو خۆڵی مەرکانێکەوە کە لەسەر زەوی لە خوار پەنجەرەکەوە دانرابوو، بەپەشمەبێکی ئاوریشمینی رەنگاورەنگ رادیۆی خۆشەویستیان داپۆشت.

لە دوای رۆژ ئاوا مالمان قەڵەباڵغ بوو، دۆست و ناسیاو و هاوسێ بەمیوانی هاتبوونە ماڵمان، زۆربان ژن و منداڵ بوون، بەتایبەتی ژنەکانی هاوسێی خۆمان، ئەمانە لە نزیکەوە رادیۆیان نەدی بوو، پێیان سەیر بوو، دەنگ و ئاواز و گۆرانی لە تەختەدارەوە دەربچێ، ئەو شەوە تەنیا گوێگرتن بوو لە گۆرانی.

هاوین پیر بوو، رۆژ بێ هێز بوو، پاییز دیار نەبوو زۆر نزیک بێ، سروشت دیمەنی هیچ کەژێکی پیشان نەدەدا، میوە زۆر بوو، ترێی رەش خەریک بوو خۆش دەبوو، ئەو سەوزاییە کەمەی لە شاردا دەبینرا گەرداوی و بۆز بوو، قوتابخانە نەکرابوونەوە. بەڵام قەڵەم و دەفتەر و کەرەستەی پێویستی قوتابییان لای عەتارەکان دەست دەکەوتن.

پاش نیوەرۆیەکی درەنگ بوو، لە ژووری دایکم خەریکی کتێبەکانی دەرەوەی قوتابخانە بووم، هەر

نەمدەویست چاوم بترووکێ بۆ لای کتێبەکانی قوتابخانە، کە رەزایان لە پێش چاوم گەلێ قورس بوو، لەو کاتەدا دایکم وتی: ئەوا باوەژنت ناردوویەتی بەدواتا بچی چایە بخۆیەوە. رووم کردە خانووی خوارەوەمان، وەکو هەموو رۆژانی دیکە باوەژنم خەریکی سەماوەر و قۆری و ئیستیکان و شەکردان و کەلوپەلی چای بوو، دەوری سینی سەماوەرەکەی بە کولیچە و گالگالێ و بورمە و ناوساجی و شیرینی دیکە رازاندبووەوە، خەڵکی ماڵەوەمان دەوریان دابوو، بەڵام لای دەستە راستی چۆڵ بوو، ئەمە جێگەی من بوو، لە کاتی چایە خواردنەوەدا، باوکم خۆی کرد بەژووردا، بەلامانەوە کارێکی ئاسایی نەبوو، بۆ هاتنەوەی ئەو هەندێ زوو بوو، دیار بوو تۆزێ رەنگیشی تێک چووبوو و، وتی: شەڕی عالەمگیری دەستی پێ کرد!! هەموو لە جێی خۆیان وشک و بێدەنگ بوون، دەتوت باڵندەی هوما بەسەر سەریانەوە دەسووڕێتەوە. ماوەیێک لە گیزەی سەماوەر بەولاوە گوێت لە هیچ شتێکی دیکە نەدەبوو، تاپووری گەورەم پەردەی بێدەنگی کون کرد و وتی: شەڕ لە ناو گاورانە و ناگاتە ئێرە! باوەژنم وتی: هاوار بەماڵم گرانی دادێ! باوکم وتی: زۆر شت دەگۆڕێ، منیش بەڕاکردن چوومە خانووی سەرەوە بۆ ئەوەی هەواڵەکە بەدایکم بگەیەنم، دایکم وتی: خودا کەریمە ئەویش هاتە خانووی خوارەوەمان و ئیدی باوکم چووە لای رادیۆکەوە، بەمجۆرە لەو کاتە و لە دوارۆژی نزیک و دووردا تا کۆتایی جەنگ رادیۆ بوو بەبەشێکی گرنگ و بەکەڵک.

بەزۆری رادیۆ بۆ دەنگوباسی جەنگ بوو لەو سەردەمەدا، ئێستگەکانی بەغدا و ئەنقەرە و قاهیرە و لەندەن (بی بی سی) باو بوون، ئێستگەی بەرلینیش بەدزییەوە دەکرایەوە، چونکە لەو سەردەمەدا قەدەغە بوو، من هەرچەندە بەبیروباوەڕ مەیلم بۆ هەواڵەکانی بەرلین بوو و ئینگلیزم خۆش نەدەویست و بەلای ئەڵمانیا دەشکامەوە، بەڵام لەمەدا ئێستگەی بی بی سی جێگەیەکی فراوانی لە ناو دڵمدا داگیر کردبوو، لە ئینگلیزیدا دوو شتم بەدڵ بوون، یەکەمیان شادۆتەکەیان ئەلیزابت، هێشتا نەبووبوو بە شا و لە تەمەنی دوازدە سێزدە ساڵیدا بوو. دووەمیان بی بی سی. یەکەمیان لەگەڵ رۆژگاردا تارمایی خۆشەویستییەکەی ون بوو، بەڵام دووەمیان هەر ماوە.

لە پێش جەنگ هەموو رۆژێ رۆژنامەی (البلاد)ی عەرەبی بەغدامان هەبوو، کە جەنگ دەستی پێ کرد کردمان بە دوو رۆژنامە، رۆژنامە درەنگ لە هەولێر بەدەستمان دەگەیشت، چونکە لە بەغداوە بۆمان دەهات، بەیانییان کە لە بەغدا ژمارەی ئەو رۆژە بلاو دەکرایەوە بەشی ئێمە بە شەمەندەفەر بار دەکرا، شەو دەگەیشتە کەرکووک و لەوێ دەمایەوە، رۆژی دوایی بە ئۆتۆمبیل بار دەکرا بۆ هەولێر و ئیدی بۆ نیوەڕۆ یا پاش نیوەڕۆ دەگەیشتە هەولێر، لە نامەخانە تاقانەکەی هەولێر کە ناوی (نامەخانەی شیمال) بوو وەرمان دەگرت، رادیۆ بۆ هەموو خەڵک و رۆژنامە و کۆوار بۆ خوێندەواران سەرچاوەیێکی گرنگی هەواڵەکانی جەنگ بوون، زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی لای خۆمان لە راستیی هۆیەکانی داگیرساندنی جەنگ نەگەیشتبوون، دەیانزانی دەستپێکەر ئەڵمانیا بوو، بەڵام نەیاندەزانی تاوانبار کێیە و خاوەن ماف کێیە! هەموو شت بە پێچەوانەوە بوو، لایەنی ئەڵمان دەگیرا با دەستدرێژیش ئەو کردبێتی، چونکە ئینگلیز بەحیساب دوژمن بوو، کەم کەس بیریان لەوە دەکردەوە بۆ چ ئینگلیز دوژمنە! بۆ چ خراپەی لەگەڵ کورددا کردووە! نەیاندەزانی ئینگلیز لە چاکەی خۆی دەگەڕێ، نەماندەزانی چۆن هەندێ لە چاکەی ئەوان لەگەڵ چاکەی خۆمان بگونجێنین، بۆ ئەوەی نەبین بەدوژمنی یەکدی، وا تێگەیشتبووین، یا تێیان گەیاندبووین، کە دوژمنایەتیی ئینگلیز لەگەڵ ئێمە خۆڕسکە، سروشت دروستی کردووە، کەچی راستییەکەی وا نەبوو، ئەوان دەیانزانی چۆن هەڵسوکەوت دەکەن، ئێمە نەماندەزانی! بەمجۆرە لێکدانەوە ساویلکەییە ئینگلیز بووبوو بە دوژمن، ئەڵمانی هیتلەری خوێنڕێژ بووبوو بەدۆست و رزگارکەری ئێمە.

بەدبەختی لەو هەڵسوکەوتەدا ئەوە بوو خراپە بەچاوی چاکە تەماشا دەکرا. بوونی هەموو کەسێک بەلایەنگری ئەڵمان بەنیشتمانپەروەری بۆی لە قەڵەم دەدرا. ئەم ئایدیۆلۆجییەتە نالەبار و ناهەموارە تا نزیک کۆتایی جەنگ مێشکی ئەم خەڵکەی بەنج کردبوو، بیری چەپڕەوی و کۆتایی جەنگ بەشکانی ئەڵمان بوونە هۆی خاوێنکردنەوەی مێشک و دڵ و دەروونی ئەم خەڵکە.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری هەولێر / ژمارە ١٥ی هاوینی ساڵی ٢٠٠٢ وەرگیراوە.

# دار زەیتوونە سووتاوەکانی باسکی عارەبیان

## ئازاد دڵزار

ڕۆژی ١/٥/٢٠٠٨ لە کۆیێ بووم، جگە لە سەردانی هەندێ شوێنان، ڕێگاشم کەوتە هەردوو گۆڕستانی (عارەبیان و دەروێش خدر)ی ئەوەی لە باسکی عارەبیاندا سەرنجی ڕاکێشام ئەوە بوو کە دار زەیتوونێکی کۆنەساڵ بەلادا هاتبوو و سووتێنرا بوو لە تەنیشتیشییەوە تایەێکی سووتاو دامرکابۆوە و تەلەکانی ناوی دەرکەوتبون، وام زانی ئەمە ڕێکەوتە و ڕەنگبێ هەندێ منداڵی لاساری بەرەڵلا ئەم کارە ناهەموارەیان ئەنجام دابێ، بەڵام نەختێکی تر داکشام سەیرم کرد وا دار زەیتوونێکی لەوی پێشدان گەورەتر و بەباغەڵتر سەرنخوون بۆتەوە و بەهەمان شێوە سووتێنراوە، هەندێکی تر ڕۆیشتم دار زەیتوونی سێیەم لاڵ و پاڵ کەوتبوو، بەڕاستی جەرگم ژانی کرد، یەکسەر یادەوەریی پتر لە پەنجا ساڵ بەر لە ئێستایان لەلا وروژاندم، سەردەمی منداڵیم بیر کەوتەوە کە بەدوای دایکم و نەنکم دەکەوتمە سەرقەبران و ئەوان تێیان هەڵدەکردنە سەردولکان و فینگەفینگی گریانێ و ئێمەش لەگەڵ منداڵانی تردا وەک سمۆرە بەسەر ئەو دار زەیتوونانەدا هەڵدەگەڕاین و لە پەنا کێلاندا چاوشارکێمان دەکرد و دەتریقاینەوە، ئەوساکە ئەوەی کە بەبیرماندا نەدەهات مردن بوو! .

دواییش کە گەورە بووین بەسەرسامییەوە لە بەردەنووسی سەرگۆڕەکان ڕادەماین، لەسەر گۆڕی (ئەحمەد ئاغای زولاڵ) کە یەکێک بوو لە ناودارەکانی دوازدە سوارەی مەریوان و خەڵکی کۆیێ بوو، ئەم دوو بەیتە فارسییە نووسرا بوو:

**(چشم عبرت بر گشا ای مردم صاحب کمال**
**نیست بر تخت بقا جز پادشاه لایزال**
**گرکسی باشیری قدرت تابی میدان داشتی**
**در جهان هرگز نرفت احمداغای زلال)**

دڵزاری شاعیریش حەوت بەیتە شیعری لەسەر گۆڕی (جەمیل ئاغای حەویزی) نووسیبوو
کە ئەمە چواریانە:

**ڕەفیقان کارساتێکی ئەوەندە گەورە ڕووی داوە**
**لە پاش کۆچی ئەمین ئاغا ئەمە نەبووە و نەبیسراوە**
**سیاهەورێکی ماتەم ئاسمانی کۆیێ پۆشیوە**
**لەبەر شین و گرینی گەل زەمین یەک بارە شێواوە**
**چشیوەن شیوەنی شومی وەفاتی سەروەری کۆیێ**
**دلێر و نائبی میللەت جەمیل ئاغا کە ناسراوە**
**حەیف بۆ خانەوادەی خانەوێرانی حەویزی حەیف**
**شکا پشت و برا جەرگی بەبێ سەردار و سەرماوە**

بەم دواییانەش لەسەر گۆڕی عەزیزی حەمەدەمینی حاجی ئەفەندی ئەم دێرانە نووسراون:

**گەرچی جەستەی پر برینم ئێستا گیرۆدەی گڵە**
**هەر لەلای ئێوە بەجێمان ئەو ڕۆح و گیان و دڵە**
**من(عەزیز)ی ئێوە بووم توخوا فەرامۆشم مەکەن**
**باغەکەم زوو زەرد بوو بۆیە بێ ئەمام و بێ گوڵە**

بەداخەوە زۆربەی ئەم بەردەنووسانەش وەک دار زەیتوونەکان بەدەستی خەڵکانی کاڵفام شکێنران

جا من تا گەیشتمە شوێنی مەبەست تەنیا ئەو سێ بنە

زەیتوونەم بینین سووتێنرا بوون، ئایا دەبێ چەندی تریش سووتێنرا بن؟! چەند پرسیارێکیشم لەلا دروست بوون، خۆ داری تریش لە گۆڕستانی عارەبیاندا هەنە بۆ تەنیا زەیتوونەکان سووتێنران؟!، دەبێ کێ ئەو تاوانەی ئەنجام دابێ؟ تۆ بڵێی لێپرسراوان لەم رۆژگارەدا حەوسەڵەی ئەوەیان هەبێ لەم جۆرە کارانە بتۆژنەوە ؟! رەنگبێ هەندێکیش ناهەقیان نەبێ گەر پێم بڵێن کاکە تۆ لە گۆلکە سوورێ دەپێچیتەوە؟!!.

بەراستی بەهۆی ئەو دار زەیتوونانەوە گەلێ شتی تریشم بیر کەوتنەوە و سەرنجم لێدان، هەر ئەو رۆژی کە چوومە گۆڕستانی (دەروێش خدر)یش بەر لەوەی لە رووباری بپەرمەوە پردێکی شەت و شلۆقم هاتە پێش، گەر فریای نەکەون دوور نییە کارەساتێکی لێ بکەوێتەوە!.

سەیرێکی قۆنگرێم کرد، کە منداڵ بووین کەلابەردمان لە شاخەکانی ئەوێدا لە چەرخ دەدان، بەردی ئەو کەلایانەمان لە باواجی دەهێنان، شوێنێک بوو پێیان دەگوت (حەمە خالدان) بەردی رەنگاورەنگی ئێجگار جوان بوون دەبووایە ئێستا ئەو حەمەخالدانە باشترین کانگەی بەردە مەرمەڕ بووایە!.

بەراستی کەلایانێ یارییەکی زۆر جوان و خۆشە، رێسای تایبەتی خۆی هەیە و هەڵدەگرێ بکرێتە یارییەکی جوانی (ئۆلۆمپی)، کاتی خۆی لە پشت ئەو (قۆنگر)ەیدا نەک هەر منداڵان گەورەش پێوەی خەریک بوون، هەندێ وشەی تایبەتی لە کەلایانێدا بەکار دەهاتن وەک: بەگ، پاشبەگ، قرە، پێش قرە، پاش قرە، سەرشار، هەلگرتنە، خشکۆری، پیساوپیس بەردانەوە، جفتبوون، تیلکردن، رادان، حاپوول، مووشە، شەش پیتکە...)

جگە لەوەی (زێنەبە رەق) هەبوو، ژنێکی قسەخۆشی وشک هەڵگەڕاو و بەساڵاچوو بوو، چای دەستگێڕی هەبوو هەندێ جار سەماوەرێشی دەهێنایە قۆنگرێ، خەڵکی دەوریان دەدا و چایان لێ دەکڕی و بەمەردانە ژیانی دەگوزەراند، بەبەردەوامیش قوت قوت قوت پێ دەکەنی و سێ چوار ددانە رەش هەڵگەڕاو و درێژۆلەکانی لە دەم و زارێکی وێراندا گر دەکردنەوە، تازەترین دەنگوباسی شاریشی لادەست دەکەوت !

ئەو شوێنە جوانە کە بەچەند شەقاوێک لەلای بەنزینخانەکەوە دەیگەیشتێی و یەکسەر دیمەنە جوانەکانی چیای رەنگاورەنگی ( قەشقە ) و بناری (هەیبەت سوڵتان) و (میر سەید ) و باواجی و شیوی رەزان لە هەمێزی دەگرتی و چاو و مێشک و دەمارەکانی دەحەساندنەوە، کەچی ماوەیێکی زۆرە چەند خانوویێکیان لێ قیت کردوونەتەوە بێ ئەوەی حیسابێک بۆ ئەم خەڵکە بکرێ کە شوێنێکی گشتییە و لە هەموو دنیادا ئەو شوێنانە دەپارێزرێن و بۆ خەڵکی خۆش دەکرێن و بەشی نەوەکانی داهاتووشیان پێوەیە، ناکرێ کەسانی تر بۆ بەرژەوەندیی تایبەتی خۆیان دەستی بەسەردا بگرن.

جگە لەمانە بینیم نە (کانییە بسکان ) و نە کۆڵانەی رەزان و نە (گەرمۆک) و نە (تەمتەمان) و نە (شاخی کۆیلی) و نە (کانیلە) وەکی خۆیان ماون . شاخی مشکەی و بەیاری ئۆمەر خوچانێ بوونەتە زبڵگە.

شاخی مشکەی کە پاییزی جاران خەڵکی کۆیێ، بەتایبەتی خەڵکی گەرەکی (هەواوان ) روویان تێ دەکرد و بەنۆرە لە مەنجەڵی گەورەی زنجیرداردا ساواریان دەکوڵاندن و لەسەر شاخەکانی ئەوێدا لەبەر تاوێ هەڵیان دەخستن و دوایی لە جۆنیانیان دەکوتانەوە و بەبایان دەکردن، چەند شەو و چەند رۆژان ئەو خەڵکە بەیەکەوە لەو چۆڵییەیی و لەسەر ئەو شاخانەدا بەتەبایی و خۆشی بەرێیان دەکرد و شایی و رەشبەڵەکیان دەگێڕان، دەیانگوت وەک سەمەنی کوڵاندنێ رێورەسمێکی گەلێ خۆشی ئەو سەردەمی بوو، هەندێ ساڵان نەورۆزیش لەو شاخی مشکەی کراوە، کەچی ئێستا شوێنێکی پیس و پۆخڵە!

وەک بیستوومە گەرەکی هەواوان بۆ یەکجاری لە نەخشەی شارەوانیی کۆیێدا سڕاوەتەوە وەک هەر نەبووبێ!

راستە پرۆژەی تازە و خانووی مۆدێرن و زانکۆکەی کۆیێ دڵان فێنک دەکەنەوە، بەڵام دیمەنی گەرەکی بەناو (ئازادی) شارەکەی زۆر ناشیرین کردووە، دەکرێ ئەو گەرەکە هەژارنشینە بگوێزرێتەوە بۆ شوێنێکی تر و خانووی باشتر بۆ دانیشتوانەکەی دروست بکرێن کە لایەق بن بەمرۆڤی ئەو سەردەمەی کورد، شوێنەکەش بەمەرجی ئەندازیاری تایبەتی مۆڵەتی بیناسازیی لێ بدرێ، چونکە

هەر لە پشت ئەو گەڕەکەوە وا خەریکە شارێکی جوانی وەک گوڵستان دەپشکووێ!.

لە بازاڕی کۆیێدا دوکانداره کەونینەکانی من دیبوومن شتاقیان لە ژیاندا نەماون تەنیا کاک ( جەلال جۆبار )ی شاعیر نەبێ خوا تەمەن درێژی بکا هەر لە شوێنەکەی جارانیدایە . نە گوزەری کورتاندرووان وەکی خۆی ماوە، نە گوزەری دارتاشان و نە ئی کاڵەکدروو ئێمەنی درووان و نە ئی خەنجەرکەران و نە کورەدەفێن و نە دینگەدینگ و پزوو ئاورینگی دەستگای ئاسنگەران ماون و نە زرمەزرمی پەرەکەران و نە تەق و تۆقی تەنەکەچی و مزگەران و نە چەکوچکاری وەستاو وەستاکاران و نەهات و بات و هەرمێنی سبەینانی ناو بازاڕی و نەجموجۆڵی لادێییەکان و نە هارەهاری خەیاتەکانی ناو قەیسەرییەکان و نە تاووتوو و بگرە و بەردەی ژنە بۆڵی و بلێباسە ڕێشمە بەدەست و توور لە پشتەکان و نە غەڵبەغەڵبی کاروانسەراکان. خۆزیا مەیدانی سەرێ بەگشتی و بن تاقەکەیی و (خانی مەحموود ئاغا)ی بەتایبەتی دەزگای ئاسەوار دەیپاراستن، ئەمەی دواییان خەریکە دەڕمێ.

مزگەوتی حاجی (بەکراغا )ی حەوێزی جاران زۆر لە ئێستا جوانتر بوو، باخچەیەکی ئاوەدان و ڕەنگینی هەبوو، لەمساڵانەی دواییدا زۆر نارێک نۆژەن کراوەتەوە و لە شوێنی باخچەکە و حوجرەکانیدا هەندێ بینای تەرسە و بەمیعمارێکی جەڵەبی دروست کراون بەتایبەتی هەردوو دەرگاکانی، کە جاران لە دار دروست کرابوون و بەبزماری سەرپانی گەورە داکوترا بوون، ئێستا گۆڕاون بەدەرگای ئاسنی ساردوسڕ، تەنیا منارەیەک بۆ ئەو مزگەوتە زیاد کراوە کە ئەویش زۆر ئاساییە و هونەرێکی ئەوتۆی لێ خەرج نەکراوە، دەکرێ ئەو مزگەوتە جوان و مێژوییە جوانتر نۆژەن بکرێتەوە و ڕەچاوی جۆری بیناسازییەکەی بکرێ، هەر نەبێ لە داهاتوودا لەوە خراپتری بەسەر نەهێنن ئەوەش هەر باشە!.

ئەو شیوی ڕەزانەی کە (حاجی قادر)ی نەمر بەسەریدا هەڵداوە و فەرموویەتی:

**" نموونەی جەننەتە شیوی ڕەزانی**
**بەهاری شامە ئەییامی خەزانی "**

ئێستا ئەو شیوە بۆتە سیان و ئاوەڕۆی پیس، لە ساڵەکانی (١٩٥٧ و ١٩٥٨ )ی چەرخی ڕابردوودا لەو شیوی ڕەزانەیدا کەپرێکمان کردبوو لەسەر ڕەزی خۆماندا بووین، ئەوەدەمای ئاوێکی ڕۆشنی لەبەر دەڕۆیشت، هەرچەندە بۆ خواردنەوەی ئاومان لە شارییەوە دەکێشا، بەڵام ڕێژوپێژمان هەر بەو ئاوەی بوو، هەندێ لە باغەوانەکانی تر دەشیانخواردەوە.

(قالە ڕەش) هەبوو کە باغەوانێکی کۆن و بەتەمەن بوو، ئەوساکە تەمەنی خۆی لە سەد ساڵان نزیک کردبۆوە، دەیگوت:

" ئێمە تاقەتمان نییە لە شاریرا ئاوێ لۆ خواردنەوەی بینین، وەڵڵا هەر ئاوی کانییە درێژی دەخۆینەوە!"، کانییە درێژ مەبەستی رووبار بوو.

باغەوانە بەناوبانگەکانی شیوی ڕەزان کە من دیبوومن یا ناویانم بیستوون ئەمانە بوون (قادری تۆپاری، حەمە قەوان، سابیری حەسەنی، تایەر و مەلای عەولای ونسی، ئەحمەد شوان، ئەمینە کوڕ، ئەحمەدی شینەی، حەمە سدیق، سابیری شینەی، کاکەی مامە زەرگانی، حەمە دەروێش، قالە ڕەش و کورەکانی، سابیری حەمە غەفووری، حوسێن و حەسەنی تەهای عەولا بۆری، قالە جگ، عەوێزی دەروێش سمایلی، سوارەی عەولای جانداری، مەلا ڕەووف، مستەفاغا، عەبداغا، عەلە کەچەڵ، ڕەشۆ)

وەک بیستوومە شاعیری شیعر پاراوی بەناوبانگ (ئەمیناغای ئەختەر) هەموو پاییزان زیافەتێکی زۆر گەورەی لە (بەستی شەمە)ی شیوی ڕەزاندا دەکرد و هەموو پیاوە بەدیمەن و لێوەشاوەکانی کۆیێ بانگهێشت دەکردن و یەکە یەکە بەسەری دەکردنەوە و لە هەواڵی دەپرسین، تێکڕای ڕەزەوانەکانی (شیوی ڕەزان )یش بەدەست و دیاری باشترین مێوەی باشقە و هەڵبژاردەوە لەو کۆڕە گەورەیەدا ئامادە دەبوون، دوای مردنی (ئەمیناغا) (مستەفاغا)ی خوشکەزای ئەو ڕێوڕەسمەی تا رادەیەک پاراستبوو، پاییزان میواندارییەکی فراوانی بە (زێرچەنە)ی لە هەمان شوێندا ئەنجام دەدا.

لە سەردەمی ئێمەدا کە شاگردی قوتابخانە بووین (سابیری حەمە غەفووری) لەسەر ڕەزی ئۆمەر خوچانێ بوو

قسەخۆش و قۆشمەچی بوو، لە وەرزی ساردیدا ئەگەر باران نەبووایە کۆمەڵێک بووین ئاگرێکی بەمەشخەڵانمان لە بن دار تووەکانی ئۆمەر خوچانێ هەڵدەکرد و دەورمان دەدا، مام سابیریش دەهاتە لامان و ئێمەش دەمانزانی چۆنی بەدەنگ بهێنین، بەدڵفراوانییەوە کیسەی تووتنەکەی لە بەردەمی دادەنایین و سیخارەمان لێ تێ دەکرد، کە بەبزۆتێک دامان دەگیرساندن و هەڵمانەدەمژین، سەری خۆمان بادەدا و دەمانگوت: تووتن نییە لەو تووتنەی سووکتر و بۆندارتر، ئەویش کەیفی دەهات و دەیگوت: کاکە ئەوە تووتنی (زارگەری و بەرگەری)یە، رۆژێکی تر دەیگوت تووتنی (سەرنەوس و بن نەوسان)ە رۆژی دواتر دەیگوت: ئی (لێوژێ و مێوژێ)یە رۆژی تر دەیگوت ئی (هێرۆ و هەرشۆ)یانە یان هی (نواوە و دواوە)یە ئاخیری دەیگوت ئی (قەسر و ماکۆسان)ە، ئەگەر بۆ کارێکیان پێ گوتبایە و نەیویستبا بیکا دەستی لەسەر چاوە مجرۆیەکەی دادەنا و دەیگوت: " بەسەر ئەو چاوەم!". پیرە کەرێکی بۆزی هەبوو شتاقە شیلەی پێ نەمابوون وەک رێورەسمێک کە ئێمە خاوەن ردز بووین حەفتانە رزقی بۆ دەهێناین، جارێکی یەکێک لە ئەندامانی خێزانی ئێمە پێی گوتبوو: مام سابیر کەرەکەت ئی بەرەڵلاکردنێیە!، ئەویش گوتبووی: "حەیفت نەکرد، بەکۆشکی ماڵی (جەمیلاغای)یدا هەڵروانی بوو گوتبووی: ئەو کۆشکەی لە پشتی کەرەبۆزی نێم و (ئامە)شی لەسەر سوارکەم ئەوجا هەر فرکەی دێ!."

ئەو پیاوە قۆشمە و روح سووک و دەستکورتە، رۆژێک نەمدیت نانی یەکێک بخوا یان دەست لەبەر کەس پان کاتەوە، سەبەتەیەکی پڕ لە بەرسیلەی لەسەر تەپڵی سەری خۆی دادەنا و بەناو بازاڕ و کۆڵانەکانی کۆیێدا دەگەڕا و بانگی دەکرد " وەرن ئەوەتانێ ترێی داری زەرد!" هەزاران درووود لەو گیانە پاک و بێ گەردانە بن، کۆیێ جگە لە پیاوە ئاقڵمەندەکانی بەو کەسایەتییە بێ وێیی و سافیلکانەشەوە جوانتر بوو.

زۆر جاران کە لەسەر رەزی (شەمە)ی بووین بۆ (جۆماڵ)ێ دەیاننادم کە بەسەر ئاوێدا بچم، لە کوێندەرێ جۆگا شکابا یان ئاوی بدەلاندبا توند و بەندم دەکردەوە، زۆربەی ئێوارەی هاوینان لە پشت (گۆمی کەونە پردێ) و لە نزیک بناوانی شەمەی چەند کەسێک گرد دەبوونەوە، سەری خۆیان گەرم دەکرد و هەندێکیان هەتا درەنگی شەوان گۆرانییان دەچڕی، لە نێوانیاندا خوالێخۆشبووان (عەونی شاعیر و ئەحمەدی حەمەمەلایی و عومەری مام عەولا )م دووربەدوور دەدیتن، چریکەی (تایەر تۆفیق)یش هەر لە شیوی ردزانەوە بەرز بووە و چیا لە چیای سەندەوە تا لە هەموو کوردستاندا دەنگی دایەوە! بەم دواییانە (مامۆستا باکوری)ش لێی بێ بەش نەبوو. جا تخوا حەیف نییە ئەو (شیوی ردزانە)ی رۆژێک لەرۆژان حاجی بەسەریدا هەڵدابێ و تایەر تۆفیق غەزلی تێدا خوێندبێ و (سێوە) خەرەکی لێ رستبێ و سەیرانگەی ئەو هەموو ئاشق و دەنگخۆشانە بووبێ، ئێستاش بووبێتە نۆین و زێراو؟!

لە هەموو دنیادا بایەخ بەدەروازەی شار و چوونە ژوورەوەی دەدرێ بەڵام هەر لە بازگەی (تۆبزاوا)وە بەجووت سایدێک لە کۆیێ بەژوور دەکەوی کە بەهەردوو سایدەکانی سایدێکی ئاساییان تێ نابێ! ئەوەی لە هەولێرڕا بچێتە کۆیێ بەسەنتەردا تێ ناپەڕێ و لە قەراغی شارەوە دەردەچێ! جگە لەوەی هەموو شەقامەکانی ئەو شارە پێویستیان بەفراوانکردن هەیە، هاتوچۆکردن لەوێ زۆر عاجباتییە! ئەرێ بەراست هەر ئاوا دەمێنێتەوە؟!.

لە راستیدا کەسانی ماندوونەناس و جگەرسۆز بەردەوام لە کۆششدان، بەڵام حکوومەت تەنیا گرنگی بەهەولێر و سلێمانی و دهۆکێ دەدا، خزمەتگوزاری بۆ گوند و شارەکانی تر زۆر کەم بوونەتەوە.

وەک پێشتریش گوتوویانە کۆیێ شارۆچکە نییە و شار بەگەورەیی و ژمارەی دانیشتوانی پێوانە ناکرێ بەڵکو شارستانییەت پێوەرە، کۆیێش هەر لە کۆنەوە بنکەیەکی گەورەی شارستانیتی کوردستان بووە سەد ئەوەندەی شایانە کە بۆی کراوە، شاری ئەو حاجی قادرەیە کە کوردایەتیی فێری هەمووان کرد، مامۆستا هێمنی نەمر ئاوا روو دەکاتە حاجی و دەفەرمووێ:

**" لە تۆ فێربوون خەبات قازی و مەلامان "**
**مخابن بۆ دار زەیتوونە سووتاوەکانی باسکی عارەبیان!.**

# گەشەی زانستی لە هەولێر سەردەمی هەزبانی و ئەتابەگی

دکتۆر ئومێد ئیبراهیم جۆزەلی
کۆلێژی ئاداب - زانکۆی سەلاحەددین

**١- بایەخی شوێن و ئاوو هەوا:**

هەولێر دەکەوێتە سەر هێڵی پانی ٣٦.١١لەباکوورو هێڵی درێژی ٤٢.٢ لەرۆژهەلاتەوە[١]، خاکەکەی کەوتۆتە نێوان هەردوو زێی "گەورەو بچووک". لەباکوورەوە ولاتی تورکیاو بەشێک لەپارێزگای موسڵ، لەباشوور پارێزگای کەرکووک، لەرۆژهەلاتەوە ولاتی ئێران و بەشێک لەپارێزگای سلێمانی، لەرۆژئاواوە موسڵ[٢] دەوردەیان داوە. بۆیە هەولێر ببووە کاروانسەرای کاروانە بازرگانییەکان، چونکە شوێنێکی ستراتیجی هەیە لەلایەنی بازرگانییەوە. رێگای کۆن کە لەبەغداوە دەست پێدەکات و بەکەرکوکدا دێت و تا دەگاتە هەولێرو موسڵ، لەهەولێریش دوو رێگای لێ دەبێتەوە بەرەو رۆژهەلات و باکوور، کە چەندان بەردەبازی شاخاوی عاسێ دەبرن و لە ئازربایجان[٣] کۆتاییان دێت. یەکەمیان لەباکووری رۆژهەلات بە رواندزدا دەروات و دووەمیشیان لەرۆژهەلاتەوە بەکۆیەدا دەروات تا دەگاتە هەولێر[٤]. ئەم شوێنە کاری لەسروشتی ناوچەکە کردووەو ناوە کۆنەکەی خۆی پاراستووەو[٥]، بازرگان و گەرێدەکان ناویان[٦] هێناوەو ئەمەش دەیسەلمێنێ، کە بازرگانەکان لەبووژانەوەی جوولانەوەی زانستی لەشارەکەدا دەوریان بینیوە. جگە لەکەلوپەلی بازرگانی جۆرەها کتێبیان بۆ شارەکە هێناوە، جۆرەها خەڵکی بیروڕا جیاواز روویان تێکردووە تا بووەتە بنکەی گردبوونەوەی زانا و رۆشنبیرانی جۆرەها ناوچە، هەروەکو لەیاقوتدا هاتووە "قصدها الغرباء وقطنها كثير منهم حتي صار مصرا كبيرا من الأمصار"[٧].

شوێنی هەولێر کاری لەسروشتی ئاوو هەواکەشی کردووە، چونکە خاکە پێچاو پێچە کشاوەکەی لەناوچەی شاخاوی باکووری رۆژهەلات لەلایەک و ناوچەی دەشتایی باشوورو خوارووی رۆژهەلات لەلایەکی دیکە[٨] بووەتە هۆی ئەوەی کاریگەری ئاو هەوای دەریای ناوەڕاستی بەسەرەوە بێت، (هاوینی گەرمەو، زستانیشی ساردە)[٩] لەدەرەنجامی ئەوەی باسمان کرد، گرنگی شوێنی هەولێرو سروشتی ئاوو هەواکەی کاریگەرییەکی زۆریان لەچالاکی زانستی کردووە، ئەمەش بەهۆی کارلێکەری بەردەوامی نێوان رۆشنبیرییە فرە جۆرەکان و رەنگدانەوەی کەشوهەواکەی بەسەر سروشتی مرۆڤی خەڵکەکەوە سەرهەڵدەدا.

**٢- دەوری دەوڵەت لە بووژاندنەوەی ژیانی زانستی:**

سەقامگیربوونی بارودۆخی سیاسی و بەرقەراربوونی ئاسایش، و جگە لەپێشکەوتنی بوارەکانی ئابووری و کۆمەلایەتی کە شاری هەولێر لەسەردەمی ئەتابەکی بەخۆیەوەی بینی، کاریگەرییەکی

زۆریان بەسەر بووژانەوەی ژیانی زانستی لەو شارەدا هەبووە[10].

هەولێر لەچوارچێوەی ئەو دەوڵەتۆکانە بوو، دوای لاوازبوونی دەوڵەتی عەباسی جیابوودەوە، ئەو دەوڵەتۆکانە قەوارەی سەربەخۆیان هەبوو، ناوبانگی میرو فەرمانڕەواکانیان لەناوبانگی خەلیفەی بەغدا زیاتر بوو، هەروەها ئەو دەوڵەتۆکانە بە بایەخ پێدانیان بەزانایان، هانی بزووتنەوەی زانستییان دەدا[11]، ئەمەش لەپێناوی دابینکردنی پێگەیان و بەرزکردنەوەی پایەیان لای جەماوەر بەگشتی و کەسایەتییەکان بەتایبەتی[12].

ئەو ماوەیەی کە باسی لێوە دەکەین دوو میرنشین فەرمانڕەوایی هەولێریان کرد، میرنشینی هەزبانی و ئەتابەکی، پێویستە ئاماژە بەڕۆڵی هەریەکەیان لەهاندان و بووژاندنەوەی جولانەوەی زانستیدا بکەین.

**ا) میرنشینی هەزبانی:**

ئەم میرنشینە لەنێوان ساڵانی (٤٢٠ک/ ١٠٢٩ز تا ٥٢٦ک/ ١١٣١ز) فەرمانڕەوایی هەولێری کردووەو ڕۆڵێکی دیاری لەدیارکەوتنی شارەکە لەسەر شانۆی سیاسیدا بینیوە. سەرەڕای ئەوەی فەرمانڕەوایانی ئەم میرنشینە لەرووی شارستانییەوە هیچ دامەزراوو ڕژێمێکی تازەیان لەناوچەکەدا نەهێنایەکایەوە، بەڵام هەوڵیاندا بارودۆخی ناو خۆیان ڕێک بخەن و سوود لەو ڕژێمانە ببینن، کە هاوسەردەمییان بوون. جگە لەهەندێک دەسکاری، کە لەگەڵ دەزگای کارگێڕی و سروشتی کۆمەڵایەتیان بگونجێت، بەتایبەتی ئەو ڕژێمەی کە لەدەوڵەتی سەلجووقی هاوسەردەمیانەوە فێری بوون، ئەو سەلجووقیانە کاریگەرییەکی شارستانییان، نەک هەر بەسەر میرنشینی هەزبانی، بەڵکو بەسەر زۆربەی میرنشین و دەوڵەتەکانی ناوچەکەوە هەبوو، بەتایبەتی لەلایەنی شارستانییەوە.

هەزبانییەکان بایەخێکی زۆریان بەلایەنی ئاوەدانی دا، بەڵام لەم رووەوە زیاتر لایەنی سەربازیان ئاوەدانکردەوە، ئەمەش بەهۆی باری ناجێگیری میرنشینەکەو هەڵکەوتەی شوێنەکەی لەنێوان هێزە زۆرانبازەکان وایکرد لە هەڵوێستی رووبەڕووبوونەوەو بەرەنگاری دابێت[13].

ئەمانە بەهیچ جۆرێک ئەوە ناگەیەنن، کە لەو میرنشینە هیچ چالاکییەکی زانستی و دامەزراوی تایبەت بەزانست نەبوو بێت، پێش پەیدابوونی قوتابخانەو دامەزراوەکانی دیکە مزگەوتەکان دەورێکی گەورەیان لەبواری فێرکردندا بینیوە، چونکە دروستکردنی مزگەوت یەکەم شت بووە، کە موسڵمانەکان لەکاتی دروستکردن یا داگیرکردنی شارێک بیریان لێ کردبێتەوە[14].

مزگەوتی جامع لەقەڵا لەسەردەمی ئەمەوی دروست کراوە، خەڵکی هەولێر ئەو کاتە تەنیا لەقەڵا دادەنیشتن و روویان لەدامێن نەکردبوو، هەولێر "ئەو کاتە تەنیا قەڵا بوو" ناچێتە عەقڵەوە و ناکرێ بێ مزگەوت بووبێت. بەتایبەتی کە موسوڵمانەکان نوێژی هەینی و هەردوو جەژنەیان تێدا دەکرد[15].

ئەو گەڕانە شوێنەواریانەی، کە لەمزگەوت و منارەی موزەفەرییەدا کراون، ئەوە پیشان دەدەن مزگەوتەکە پێشتر هەبووەو منارەکەی پێوە لکێندراوە. پاشماوەی مزگەوتێکی کۆنتر لەمنارەکە دۆزرایەوە، کە بۆ سەردەمی ئەمەوی دەگەڕێتەوە یاخود بۆ سەرەتای سەردەمی عەباسی[16].

کەواتە مزگەوتی قەڵا لەهی دامێن کۆنترە، بە بەڵگەی ئەوەی خەڵکەکە دوای ئەوەی لەقەڵا جێگەیان نەبۆوە روویان لەدامێنی شارکرد.

مزگەوتەکان لەو کاتەدا بەشدارییەکی گەورەیان لەبواری بزووتنەوەی زانستیدا کرد، بەتەنیا هەر شوێنی خواپەرستی و نوێژکردن نەبوو، بەڵکو مەڵبەندی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی بوو، زانایان تێیدا کۆدەبوونەوە[17].

زانیارییەکی ئەوتۆمان لەلایەنی زانستییەوە لەبەردەستدا نییە ئاماژە بۆ ڕۆڵی میرەکانی هەزبان بکات، ئەوە نەبێت قازی ئەبوبەکر محەمەد قاسم موزەفەر عەلی شارەزووری "ت٥٣٨ک- ١١٤٣ز" کە نازناوی (قاضی الخافقین) کە فەقیهە و زانایەکی بەناوبانگ) بوو[18] ئامادەی کۆڕێکی "میر ئەبی هیجای هەزبانی" بووە. هەروەکو ئیبن مستەوفی لەسەر زمانییەوە ئاماژە بۆ ئەمە دەکا و دەڵێ: "ئامادەی کۆڕی میر عیزەدین مەهدولدەولە ئەبی

هیجا حوسێن موسای هەزبانی بووم-خوا توانای زیاتر بکات"[19]، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت میر لەگەڵ زانایان کۆدەبووەوەو هەروەها کۆڕی تایبەتی ساز داوەو لەگەڵ گەورە بەرپرسانی دەوڵەت کۆبووەتەوە.

هەزبانییەکان بایەخیان بەزانستەکان بەتایبەتی ئەدەب و شیعر داوە، کۆڕی تایبەت بۆ شیعر خوێندنەوە ساز دراوەو شاعیرەکان بەئازایەتی و شەڕو شۆڕی میرەکانیان هەڵدەدا، میر حیسامەدین عەلی هەزبانی دەستی ئەدەب و شیعری هەبووە[20].

سەرەڕای ئەو بارە ناجێگیرەی کە میرنشینەکە پێیدا تێپەڕی، بەڵام ئەمە نەبووە کۆسپ لەبەردەم بووژانەوەی هەولێر لەلایەنی شارستانی، بەتایبەتی زانستییەوەو چەندان کەسایەتی زانستی لەو ماوەیەدا هەڵکەوتن[21].

**ب) میرنشینی ئەتابەگی:**

سەردەمی ئەتابەکی لەهەولێر سەردەمی بووژاندنەوەی رۆشنبیری ئیسلامی بوو، میرەکانیان لەپێشکەوتن و بووژاندنەوەی جووڵانەوەی زانستی بەهەموو بوارەکانییەوە دەورێکی باڵایان بینیوە.

ئەسڵی ئەتابەکیان بۆ ئەو میرە تورکانە دەگەڕێتەوە، کە دەورێکی دیاریان لە دەورەی سەلجوقیەکان بینیوەو ئینجا دوایی وەکو هێزێکی سیاسی لەجیهانی ئیسلامی دەرکەوتن[22]، بڵاوبوونەوەیان و پەروەردە بوونیان لەوڵاتە ئیسلامیەکان و بەئیسلام بوونیان کاریگەرییەکی زۆری لەسەر رۆشنبیریانەوە هەبوو، بەتایبەتی رۆشنبیری و ئەدەبی ئیسلامی[23].

میرە سەلجوقیەکان دەورێکی گەورەیان لەبوژاندنەوەی جووڵانەوەی زانستی لەهەولێردا بینیووەو سیاسەتێکی حەکیمانەیان بۆ ئاسانکاری بەکارهێناو هەموو توانای خۆیان بۆ بەدیهێنانی هیوای زانایەکان تەرخانکرد، خۆیان لەکاروباری فێرکردن و پەیڕەوو پرۆگرامی زانایان هەڵنەدەقورتاند، بەڵکو یارمەتییان دەدان و ئەو شتانەیان بۆ دەستەبەرکردن، کە لەبواری زانستیدا بەکاریان دەهێنا[24]، هەولێر لەسەردەمی ئەواندا مەڵبەندی زانست و پەناگەی فێرخوازان بوو، بەتایبەتی سەردەمی زەینەدین عەلی کچک بکتکین، فەرمانڕەواییەکەیان لەساڵی (٥٢٦ک-١١٣١ز تا ٦٣٠ک-١٢٣٢ز) خایاند[25]. هەولێر لەچوارچێوەی ئەتابەکیەی عیمادەدین زەنگیدا بوو کە دوایی تەسلیم بەسەرکردەی سوپاکەی زەینەدین عەلی کچکی کرد ساڵی ٥٢٦ک-١١٣١[26].

زەینەدین عەلی کچک لە (٥٢٦ک-١١٣١ز تا ٥٦٣ک-١١٦٧ز) فەرمانڕەوایی هەولێری کردووەو دامەزرێنەری میرنشینی ئەتابەکی بوو[27] لەهەولێر پیاوێکی خێرخوازو رەوشت چاک و سوارچاک و پارێزگاری سەردەم و دەست پاک و کەم جەور بووە[28] جگە لەوەی بەهێزو خاوەن شەهامەت[29] بووە، بۆیە نازناوی سوارچاکی ئیسلامی پێبەخشراوە[30].

سەرچاوەکان هیچ زانیارییەکمان لەبارەی رۆڵی ئەو میرە لەلایەنی زانستی، بەتایبەتی لەهەولێر پێنادەن، تەنیا هەندێک وردە زانیاری نەبێت، کە دەڵێت پیاوێکی بەخشندەو ناندەربووە. بەتایبەتی بۆ سەربازەکانی و لەدوا دوای ژیانیدا هەندێک قوتابخانەو رابیتەو بەردەبازو پردی دروست کردووە[31]، بەڵام هەموو ئەو شتانە لەهەولێردا نەکراون بەو بەڵگەیەی ئەو میرە لەبری عیمادەدین زەنگی و کوڕەکانی حاکمی موسڵ بووە لەساڵی (٥٣٩ک-١١٤٤ز تا ٥٦٣ک-١١٦٧ز)، بۆیە وێدەچێت ئەو دامەزراوانەی لەموسڵ یا لەو شوێنانەی، کە حوکمڕانی تیاکردوون دروستکرابن[32].

جووڵانەوەی زانستی لەهەولێر دوای جێگرەکانی و ئەو میرانەی، کە لەدوای زەینەدین هاتن گەیشتە چڵە پۆپە، "سەرفتکین ئەبو مەنسور عەبدوڵلا زەینی (ت ٥٥٩ک-١١٦٣ز) بایەخی بەلایەنی زانستی و زانایان داوەو کاریگەری پەروەردەی ئیسلامی بەسەرەوە بووە، پیاوێکی خێرەومەندو کاریگەرییەکی بەهێزی هەبووە، لەهەولێرو گوندەکانی چەند مزگەوتێکی دروست کردووەو ساڵی (٥٣٣ک- ١١٣٨ز) قوتابخانەیەکی لەهەولێر دروست کردووە[34] کردەوە چاکەکان و سیاسەتە حەکیمانەکەی ئەو میرە

کاریگەرییەکی گەورەیان بەسەر بووژاندنەوەو بەگەڕ خستنی جووڵانەوەی زانستییەوە هەبوو، یەکێک لەکارە گرنگەکانی (خچر بن نەسر بن عوقەیل)ی هەولێری زاناو فەقیهی شافیعی (ت٥٦٧ک-١١٧١ز) لەو قوتابخانەیە دامەزراند[٣٥] جگە لەمەش لەپارەی خۆی خەرجی دامەزراوەکانی دەکرد[٣٦].

دوای مردنی سەرفتگین میر موجاهیدەددین قایماز هاتە جێگای و لە (٥٥٩ک-١١٦٣ز) تا سالی (٥٧١ک- ١١٧٥ز) حوکمی هەولێری کردووە، وەکو جێگری زەینەدین عەلی کچک، میرێکی رەوشت چاک و خێرەومەندو چاکە کار بوو[٣٧].

میر موجاهیدەددین قایماز بەشدارییەکی کاریگەری لەبوژاندنەوەی جووڵانەوەی زانستی لەهەولێردا کرد، بایەخی بەلایەنی ئاوەدانی داو لە بەر ئەوەی حەزی لەخێرو ئایین بوو، چەندان دامەزراوی ئاینی دروستکرد. یەکێکە لەو میرانەی کەزۆر حەزی لەبنیاتنان و ئاوەدانکردوە بوو[٣٨]، لەکاتی حوکمڕانی کردنی هەولێردا چەندان دامەزراوی فێرکردنی دروست کرد، کەخزمەتێکی زۆر لایەنی زانستیان کرد. ئیبن خەلەکان لەم بارەیەوە دەڵێت "لەهەولێر قوتابخانەو خانەقایەکی دروست کردووەو وەقفی زۆر کردوون"[٤٠]. جگە لەرەوشتە چاکەکانی ئەو میرە فەقیهێکی شارەزای مێژوو و شیعرو هەقایەت بوو[٤١]. زانایان و ئەدیبان لێی نزیک بوونەوەو ئەمیش بەرامبەریان بەخشندە بووەو بەرگری لێکردوون[٤٢]، لەئەنجامی بایەخدانی بەزانایان ژمارەیەکی زۆر لەشاعیران ستایشیان کردووە، لەمانە شاعیری ناودار سەبەت تەعاویزی (ت٥٨٤-١١٨٨ز)[٤٣]، هەروەها لەلایەن زانایان و ئەدیبانەوە کتێبی پێشکەش کراوە، ئەدیب ئەسعەد کوڕی قاسم عەلی ئەساری ئەبو لمەعالی وەراق عەزیری (ت٥٦٨ک-١١٧٢ز) کتێبێکی بەناونیشانی "الاعجاز في حل الاحاجي والالغاز برسم الامير مجاهدالدين قايماز" لەسەر داناوەو ئەمیش پاداشتی ئەوی داوەتەوەو ڕێزی لێناوە[٤٤]، هەر لەو شاعیرە هەولێریانەی ستایشی ئەو میرەی کردووە عەدل ئەبوو قاسم ئەربلی بووە: (ت٥٨٩ک- ١١٩٣ز)، کە وتویەتی:

**يامن يسلم طرفه من سحرة**
**سلم فؤاد محب من هجره**
**لما اكتسى حلل الجمال بأسره**
**اضحى الفؤاد بأسره من امره**
**فان الخلائق بالمحاسن مثلما فاق**
**المجاهد ذوالعلاء بوفره[٤٥].**

بەمجۆرە موجاهیدەددین قایماز لەبوژاندنەوەی زانستی لەهەولێردا ڕۆڵێکی دیاری بینی. بەتایبەتی لەئاستی بەرزکردنەوەی رووناکبیری و فیکری و بەرزکردنەوەی ئاستی زانست. ئەمەش بەهۆی بەهێزیی کەسێتی و هزری کراوەیی جگە لەحوکمی عادیلانەو خێرو چاکەکاری[٤٦].

دوای مردنی زەینەدین عەلی کچک لەساڵی (٥٦٣ک- ١١٦٧ز) زەینەدین یوسف نیالتکینی کوڕی لەژێر سایەی موجاهیدەددین قایماز هاتە جێگای دوای ئەوەی موزەفەرەدین گوگبری لەهەولێر*[٤٧] دەرچوو، ئەو ئەمیرە بەسەخاوەت و بەخشندەیی باسی کراوە، لەساڵی (٥٧١ک-١١٧٠ز) حوکمی ئەو میرنشینەی کردووە، بەتایبەتی دوای ئەوەی موجاهیدەددین قایماز هەولێری جێهێشت تا فەرمانڕەوایی قەڵای موسڵ بەدەستەوە بگرێت و ببێتە جێگری ئەتابەک تا ساڵی( ٥٨٦ک-١١٩٠ز).

سەرەڕای درێژی ماوەی حوکمڕانی ئەو میرە، مێژوونووس و ژیننامەنووسەکان باسی ژیان و کارەکانی ئەو میرەیان نەکردووە بەتایبەتی لەلایەنی زانستییەوە، عەباس عەزاوی لەم بارەیەوە دەڵێت "من الغريب ان المؤرخين لم يذكروا اعماله فيها كأنها لمحة بصر وبرق خاطف"[٤٩] تەنانەت مێژوونووسەکان باسی کارە سەربازیەکانیشی ناکەن[٥٠] دوای مردنی، سوڵتان موزەفەرەدین گوگبری ساڵی (٥٨٩ک- ١١٩٣ز) لەلایەن ناسر سەلاحەدین ئەیوبی حوکمڕانی هەولێری گرتە دەست[٥١] سەردەمی ئەو درێژ بوونەوەی سەردەمی ئەتابەکی بوو لەهەولێر. میرەکانی ئەو سەردەمە لەکاری خێرو چاکە بەردەوام بوون و لەلایەنەکانی سیاسی و زانستی و ئایینی خزمەتی مەملەکەتەکەیان کرد، کە ئەمانەش

لەکارگێڕو ڕێکخستنی میرنشینەکەدا ڕەنگیان دایەوە[٥٢].

لایەنی پێشکەوتنی زانستی لەو سەردەمەدا گەیشتە چڵە پۆپە، ئەمەش بەهۆی سیاسەتی حەکیمانەی ئەو میرەوە بوو لەبایەخدانی بەزانایان، ئیبن خەلەکان لەم بارەیەوە دەڵێت: "کان له فعل الخیرات غرائب لم یسمع ان احدا فعل ذلك"[٥٣].

میر موزەفەرەدین گوگبری بایەخی بەزۆر لایەنی زانستی دا، چەندان دامەزراوی فێرکردن و خێرخوازی کردەوە لەمانە خانەقا بۆ سۆفی و لانەوازو کوێران، شوێنی حەوانەوە بۆ بێوەژنان و هەتیوو بێکەسان، دروستکردنی نەخۆشخانەیەک تا سەرپەرشتی باری تەندروستی میرنشینەکان بکات، میوانخانەیەک بۆ ئەوانەی روویان لەمیرنشینەکە دەکردو، دروستکردنی قوتابخانەیەک، کە هەردوو مەزهەبی شافیعی و حەنەفی تێدا دەخوێندراو بۆخۆی سەرپەرشتی دەکردو خەرجی دەکێشاو هەموو هۆکارێکی ئاسوودەیی بۆ دەستەبەر کردبوو[٥٤]. جگە لەدروست کردنی دەزگایەکی تایبەت بە- حەدیس- کە بەناوی خۆیەوە بوو[٥٥]، هەروەها یەکێک لەکارە ئاوەدانکردنەوەکانی، کە خزمەتی لایەنی زانستی کرد دروست کردنی منارەی مزگەوتی موزەفەرییە بوو[٥٦].

موزەفەرەدین پەروەردەی دەستی رۆشنبیرییەکی ئایینی بوو، ئەمەش کاریگەری بەسەر ژیانی گشتی و تایبەتییەوە هەبوو، ژیانێکی سادە دەژیاو وەکو تیفتیفەی ژیانی مەلیکان نەبوو، بەرەوشتی بەرزو بەخشندەیی و باوەڕ چاکی ناسرابوو، ئارەزووی بەلای ئەهلی سوننەو زانایان و فوقەهاو موحەدیسان بوو، حەزی لەمێژوو بوو و لەشاعیرانی سەرف دەکرد[٥٨]، ئەوەی لەماوەی حوکمڕانی ئەو میرەدا تێبینی دەکرێت لەمیرنشینەکەیدا هەموو شتێکی حەرامکراوی قەدەغە کردبوو و[٥٩] لێنەدەگەڕا بێتە ناو وڵاتەوە.

هەر لەبایەخەکانی ئەو میرە بەلایەنی زانستی، کۆبوونەوەو سەردان بوو لەگەڵ یارانی زانست لەفوقەهاو موحەدیسان[٦٠]. لەقەڵا دیوانێکی هەبوو، کە کردبووی بەئەنجوومەنێک بۆ راوێژکردن لەبارەی کاروباری دەوڵەت و لەگەڵ زانایان و ئەوانەی روویان لەمیرنشینەکە دەکرد کۆدەبۆوە*[٦١].

لەلایەکی دیکەوە ریباتی "المنظرة"ی کردبوو بەشوێنی کۆبوونەوە لەگەڵ فوقەهاو خوتبە بێژو موحەدیس و زانایان*[٦٢].

لایەنێکی دیکەی رەنگدانەوەی بایەخدان بەزانست لەهەولێر، کە کردبووی بەرووگەی زانایان و کەسایەتییەکان مەولوودی پێغەمبەر (د.خ) بوو، کە بۆنەیەکی ئایینی پیرۆزە لای موسڵمانان، چ مەلیک و سوڵتانێک لەزەمانی کۆن و نوێ وەکو سوڵتان موزەفەرەدین گوگبری بایەخی بەجەژنی لەدایکبوونی پێغەمبەر نەداوە[٦٣] ساڵانە حەشامەتێکی زۆر لەفوقەهاو سۆفی و خوتبەخوێن و قورئانخوێن و شاعیرو زانایان روویان لەهەولێر دەکرد[٦٤] و بەشێوەیەکی راستەوخۆ کاریان لەرۆشنبیری و بوژاندنەوەی ژیانی زانستی لەهەولێردا کرد*[٦٥].

ئەم کارەی سوڵتان موزەفەرو خەرجکردنی لەجەژنی مەولوددا بەنموونە هێنراوەتەوە[٦٦]، سەبەت ئبنو لجوزی "ت٦٥٤ک-١٢٥٦ز" کەساڵی (٦٠٠ک-١٢٠٣ز)[٦٧] سەردانی هەولێری کردوو، لەم بارەیەوە وتوویەتی: "لەهەولێر بۆیان گێڕامەوە سوڵتان موزەفەر لەمەولودی هەر ساڵێک سێ سەد هەزار دینار خەرج دەکات[٦٨].

ئەو ئاهەنگە بەبۆنەی مەولودی پێغەمبەر (د.خ) سەرنجی هەندێک لەو زانایانەی راکێشا، کە دەهاتنە هەولێر، لەوانە حافز ئەبولخەتاب عومەر حوسێن عەلی ناسراو بەئیبن دەحیە ٦٠٤ک-١٢٠٧ز هاتە هەولێرو چاوی بەسوڵتان موزەفەرەدین گوگبری و ئەو مەولودە فراوانە کەوت، بەم بۆنەیەوە کتێبێکی بەناونیشانی "کتاب التنویر في مولد السراج المنیر" داناو بۆخۆی بۆ سوڵتانی خوێندەوەو ئەمیش بەهەزار دینار خەڵاتی کرد[٦٩].

لەوەی باسمان کرد، بەدیار دەکەوێت موزەفەرەدین گوگبری گەورەترین کاریگەری لەسەر پەرەپێدانی زانست و ئاداب و بڵاوکردنەوەی رۆشنبیری و زانیاری لەمیرنشینەکەدا هەبوو ئەمیش بەچاودێری کردنی زانایان و کردنەوەی قوتابخانەو ئەو

دامەزراوانەی کەخزمەتی ئەو لایەنانەی دەکرد جگە لەهاندانی زانایان بۆ روو کردنە میرنشینەکە، سەردەمی سوڵتان موزەفەر سەردەمی رووکردنە پاشەڕۆژی زانستی و رۆشنبیری پرشنگداری میرنشینەکە بوو.

بەهۆی مردنی موزەفەرەدین گوگبری ساڵی ٦٣٠ک-١٢٣٣ز و داگیرکردنی هەولێر لەلایەن خەلیفە موستەنسیر بیللا (٦٢٣-٦٤٠ک/ ١٢٢٦-١٢٤٢ز) ئەبا موزەفەر شەمسەدین بانکین کوڕی عەبدوڵلای رۆمی (ت ٦٤٠ک-١٢٤٢ز) میری بەسرە کرا بەجێگیری خەلیفە لەهەولێر[٧٠]، لەسەردەمی خۆیدا هەندێک چاکەکاری کرد، وەک لابردنی زۆربەی (الضمانات) باج و سەرانەو چاککردنەوەی شوورەکان و بایەخ دان بە (خەندەقەکان). زۆر شارەزایشی لەقورئان و زانستەکان و مێژوو و هەواڵ و شیعردا هەبوو[٧١]، هەولێر لەسەردەمی ئەودا لەلایەنی زانستییەوە زۆر بووژایەوە، دوای ماوەیەک ئەبا موزەفەر هەولێری جێهێشت و دوای ئەوەی هێرشی مەغۆلەکان دەستی پێکرد لەبەغدا کۆچی دوایی کرد[٧٢]. سەرەڕای ئەو رووداوانەی بەسەر میرنشینەکەدا هاتن، بەڵام هەر لەژێر دەسەڵاتی خەلیفەدا مایەوەو دوا کەسیش کە لەسەری دامەزرا تاجەدین ئەبو مەکارم محەمەد نەسر یەحیا هاشمیی عەلەوی ناسراو بەکوڕی سەلایا بوو "٦٥٦ک- ١٢٥٨ز"[٧٣*]، زانایەکی ژیرو تەگبیرکارو سوارچاک و دیندار بوو، بەڵام بەدەستی هۆلاکۆ کوژراو هەولێریش کەوتە دەستی مەغۆل[٧٤].

## رۆڵی وەزیرەکان لەبووژاندنەوەی جووڵانەوەی زانستی:

پەیدابوونی رێکخراوەکان و وەزیفە کارگێڕییەکان لەهەولێر گەورەترین کاریگەریان بەسەر بوژاندنەوەی جووڵانەوەی زانستییەوە هەبوو، رێکخراوەکان لەسەردەمی میرنشینی هەزبانییەوە پەیدابوون، دەورەکەیان لەو کەسانە بەدیارکەوت کەوەزیفەکانیان وەردەگرت، زاناکان لەمەدا دەوری سەرەکییان هەبوو، چونکە وەزیفەکان دەبوایە ئەو کەسانە وەری بگرن کە رۆشنبیرو دیندارو شارەزای کاروباری دەوڵەت و ژیانی مەلیکان بن[٧٥].

"وەزارەت" لەپێشەوەی وەزیفەکان بوو، بەو پێیەی لەسەرەوەی دەزگای کارگێڕی دەوڵەتەوە بوو، ئەو کەسەی ئەو پایەیەی پێدەدرا، دەبوایە کۆمەڵێک سیفاتی تێدا دەستەبەر بوایە، زیاتر بەکەسانی رۆشنبیرو دیندارو شارەزا لەکاروباری دەولەت و یاساکانی[٧٦] دەدرا، واتە دەبوایە لێوەشاوەبا، ئەو کارەی کەپێی دەسپێردرا لێی شارەزابا[٧٧].

جێگەی باسە ئەم وەزیفەیە تەنیا لەسەر خەڵکی هەولێر تاپۆ نەبوو، بەڵکو دەدرا بەو زانایانەی، کە دەهاتنە میرنشینەکە، لەوانە زانا عەمید فەخرولکیتاب ئەبو ئیسماعیل حوسەین عەلی محەمەد عەبدولڕەحمان نازناو بە موئەیەدین ئەسفەهان مەنشی ناسراو بە توغرائی "ت٥١٥ک-١١٢١ز"، ماوەیەک لەهەولێر وەزیر بوو[٧٨] لەشیعرو کیمیا زانابوو[٧٩] زمان پاراوو لەزانا دیارەکان بوو[٨٠].

وەزیفەی وەزیری لەسەردەمی میرنشینی ئەتابەکی گەیشتە چڵەپۆپە، بەتایبەتی لەرۆژگاری سوڵتان موزەفەرەدین گوگبری (ت ٦٦٣٣ ک- ١٢٣٣ز)[٨١] هەر ئەو وەزیرە بەناوبانگانەی ئەو پایەیان وەرگرت و دەورێکی گەورەیان لەبووژاندنەوەی جووڵانەوەی زانستیدا بینی ئەبولبەرەکات موبارەک مەنعوت بەشەرەفەدین ئیبن مستەوفی هەولێری بوو (ت٦٣٧ک- ١٢٣٩ز)، مێژوو نووس و ئەدیب و خاوەنی کتێبی مێژووی هەولێر "نباهة البلدا الخامل بمن ورده من الاماثل" لەزانا بەناوبانگەکان بوو، ئیبن خەلەکان لەم بارەیەوە وتوویەتی "سەرۆکێکی خاوەن رێزو بێ فیزو سەخی بوو"[٨٢].

ئیبن شەعاریش هەر لەم بارەیەوە وتوویەتی "زاناو ئەدیب و نووسەری زمانزان و شاعیری دیار بوو[٨٣]، دیندارو خێرەومەندو زاناو زانیارانی خۆشویستووە، سەری لەکوڕەکانیان داوە[٨٤] ماڵەکەی شوێنی نەجیب زادەو غەریبان بوو[٨٥]. جگە لەوەی ئەرکی وەزارەتی بەئەستۆ بوو لەزۆر بواری تریشدا دەست رەنگین بوو. لەبەگەڕخستنی جووڵانەوەی زانستی لەهەولێردا بەشداری کرد، کۆڕی زانستی و رۆشنبیری لەماڵەکەیدا ساز دەدرا، ئەدیبان و شاعیران بەشداریان تێدا دەکرد[٨٦]، لەمەوە

دەگەینە ئەو دەرەنجامەی کەکۆڕە زانستییەکان هەر بەتەنیا میرەکان نەیان دەگێڕا، بەڵکو لە ماڵی وەزیرەکانیش ئەم کۆڕانە ساز دەدرا[87]، ئیبن مستەوفی هەر بەتەنیا بەوە نەوەستا بەڵکو هەر زانایەک رووی لەهەولێر بکردبا، ئەوا سەردانی دەکردو دیارییەکی وای بۆ دەبرد کە شایانی بێت[88]، ئەوەندە حەزی لەئەدەب بوو کەم کەس هەبوو رێی بکەوێتە هەولێر باسی ئیبن مستەوفی نەکات و یا قسەیەکی لەبارەوە نەگێڕێتەوە[89].

### ٣- گەشتە زانستییەکان و رۆڵی لەبوژانەوەی ژیانی زانستیی هەولێر:

گەشت واتە گواستنەوە لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە بۆ بەدیهێنانی مەبەست یا ئامانجێکی دیاریکراوو چەند جۆرێکە[90]، بەڵام ئەوەی ئێمە مەبەستمانە گەشتە زانستییەکانە، بەو پێیەی کەوا هۆکارێکە بۆ تێکەڵاوبوونی خەڵک و نەتەوەکان و وەسفکردنی رۆشنبیری و ژیانی رۆژانەیان و زانستییان بەتایبەتی کە بەهایەکی فێکردنی بۆ رۆشنبیرکردنی ئادەمیزاد هەیە[91].

ئیبن خەلدوون زۆر بایەخ و ئامانجەکانی گەشتە زانستییەکان دوویات دەکاتەوە، چونکە تێکەڵاوبوونی زانایان بەشێوەیەکی راستەوخۆ دەرس گوتنەوەو چاوپێکەوتنی پیرو دنیادیدان لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە جیایە[92].

چاوپێکەوتنی پیرو دنیادیدان بەشێوەیەکی راستەوخۆو دانیشتن لەگەڵیان چاکترە لەپشت بەستن بەکتێب و دەفتەران، ئامانجی مرۆڤی فێرخواز پەیوەندی کردنە بەژمارەیەکی زۆر لەزاناو پیران[93]، جگە لەمەش مرۆڤی زانا مەبەستی لەگەشت ئەوەیە زانستەکەی بڵاو بکاتەوەو ئەوەی نایزانێت لەخەڵکی دیکە فێری ببێت[94]، ئەمەش وای لەزاناو موسڵمانەکان کرد گەشتەکان بکەن بەعادەت و پەیڕەوو پرۆگرامێک بۆ خۆیان[95].

هەولێر دەورێکی گەورەی لە لەباوەشگرتنی زانایان لەچەندان وڵاتی جیهانەوە بینی، چونکە هەولێر دامەزراوەکانی وەکو مزگەوت و قوتابخانەو ریبات و خانەقاو ماڵی حەدیسی تێدابوو. جگە لەو پێداویستیانەی کە زانایانی هاندا روو لەو میرنشینە بکەن، بایەخی رووتێکردنی زانایان لەهەولێر لەسەردەمی سوڵتان موزەفەر گەیشتە چڵەپۆپەی، ئەمەش کاری لەئاستی زانستی و رۆشنبیری میرنشینەکە کردو پایەی بەرزکردەوەو سومعەیەکی چاکی پەیدا کرد[96].

سوڵتان موزەفەرەدین گوگبری حەزی لەزانست و زانایان و هاندەری جووڵانەوەی زانستی بوو، بەوە ناسرابوو، کە ساڵانە بەبۆنەی جەژنی لەدایکبوونی پێغەمبەری مەزن (د.خ) ئاهەنگی گەورەی گێڕاوەو هەموو پێداویستییەکی بۆ دەستەبەر کردووە، ئەمەش بەجۆرێکی راستەوخۆ کاری لەخڕبوونەوەی زانایان کرد تا روو لەهەولێر بکەن[97]، جگە لەشوێنی ستراتیژی هەولێرو رۆڵی دانیشتوانەکەی، کە بە بەخشندەیی و رێزگرتنی غەریبان و حەزکردنیان لەزانست ناسرابوون، ئەمانە بوون بەهۆی ئەوەی هەولێر ببێتە وێستگەی زانایان و پەیوەندی زانستی لەگەڵ جیهانی ئیسلامی پەیدا بکات.

لێرەدا نابێت دەوری بازرگانان و گەڕیدان لەبیر بکەین لەهێنانی کتێب، کە بوو بەهۆکارێک بۆ بووژاندنەوەی زانست لەهەولێر.

بارەی ئەو زانایانەی روویان لەهەولێر کردووە مێژوونووس و ئەدیبی هەولێری ئەبو بەرەکات شەرەفەدین موبارەک ناسراو بەئیبن مستەوفی (ت٦٣٧ک-١٢٣٩ز) مێژووی هەولێری لەچوار جزوبەند نووسیوە[98] بەناونیشانی "نباهة البلد الخامل بمن ورده من الاماثل" کەتیایدا باسی هەموو ئەو زانایانە دەکات، کە هاتوونەتە هەولێر جگە لەباسکردنی کۆمەڵێک زاناو پیاو ماقووڵی هەولێری[99].

### ٤- بڕوانامە "ئیجازات"ی زانستی

لەو دیاردە زانستییانەی کە دەوریان لەبووژانەوەی جووڵانەوەی زانستی لەهەولێردا بینی سیستەمی "ئیجازات" بوو کە لەرۆژی ئەمڕۆدا بەرامبەر بەبڕوانامەی زانستییە.

ئیجازە رووخسەتێکە ناوەڕۆکەکەی ئەو مادە زانستییە دەگرێتەوە، کە لەپێناویدا دەردەچێت، لەلایەن شێخەوە بەو کەسە دەدرێت

کە ریوایەتی ماددەکەی بۆ دەگێڕێتەوە[١٠٠]، هەروەها ئیجازە بۆ ئەوەبوو پیاوی زانا زانیارییەکەی بلاو بکاتەوەو بواری رۆشنبیرییەکەی کە لەشێخەوە فێری بووە بەجۆرێکی دروست بیخاتەروو[١٠١]، هەروەها ئیجازەکە ئاستی زانستی ئەو کەسە پیشان دەدات کەوەری دەگرێ، جێگەی باسە ئیجازە بەو کەسە دەدرا کە خاوەن زانیاری بان، ئەوەی کە ئیجازەکەشی دەبەخشی دەبوایە لەئایین و زانست شارەزا بوایە[١٠٢]، ئیجازە تەنیا لەبواری زانستی "حەدیس"دا نەبوو، بەڵکو هەموو جۆرە زانستەکانی دەگرتەوە تا وای لێهات بوو بەشێوەی فێرکردن و پەیڕەوی زانایان[١٠٣].

بەهایئیجازەکە لەسەر پایەی مامۆستا "شێخ" و ناوبانگی لەنێوەندە زانستییەکان دەوەستا[١٠٤]، ئیجازە بەدوو جۆر دەدرا، بەشێوەی زارەکی کەهەرە کۆنەکەیانە یاخود بەنووسین کەچەند جۆرێکە[١٠٥].

ئیجازەدان بوو بەهۆی گواستنەوەی زانستە هەمەجۆرەکان و خوێندنیان و هەروەها بوو بەهۆی ئەوەی کە قوتابی هان بدات و شانازی پێوە بکات، ئیجازە وەرگرتن بەتەنیا تاپۆ نەبوو لەسەر تاکە شێخێک، بەڵکو قوتابی مافی ئەوەی هەبوو چەند ئیجازەیێک لەفرە زانستەکان لەسەردەمی خۆیدا وەربگرێت.

لەهەولێر کۆمەڵە زانایەک پەیدابوون کەئیجازەیان دا بەقوتابییەکانیان لەوانە، ئەبو سلێمان داودو محەمەد حەسەن خالیدی هەولێری (٤٩٣-٥٧٣ک ١٠٩٩- ١١٧٧ز) کەئیجازەی داوە بەعەبدوڵڵا ئەبی موزەفەر موبارەک تاهیر خوزاعی بەغدایی (ت٦١٣ک-١٢١٦ز)[١٠٦].

ئیبن مستەوفی دەڵێت "فەقیە ئەبو ثهنا ء مەحمود عەلی بەکر هەولێری ناسراو بەخەواتیمی "ت٦١٩ک-١٢٢٢ز" هەرکە دەهاتە هەولێر ئیجازەی بەخشیوەتە ئەوانەی بەتەمەن لەخۆی گەورەتر بوون[١٠٧].

### ٥- فرۆشگای کتێب فرۆشان "الوراقین"

فرۆشگای کتێب فرۆشان بەشداریان لەبووژانەوەی جووڵانەوەی زانستی لەهەولێردا کردووە، ئەو شوێنانە ببوون بەمەڵبەندی گردبوونەوەی زانایان و ئەدیبان، لەوێ کتێب روونووس و لەبەرگ گرتن دەکردراو دەفرۆشرا، ئیبن خەلدون ئاماژەی بەرۆڵی ئەو فرۆشگایانە لەدانانی کتێب و لەبەرگ گرتنی و هەڵەبڕی و لێکدانەوەیان کردووە جگە لەوەی، کە سەرچاوەیەک بووە بۆ بڵاوبوونەوەی زانستەکان[١٠٨]. ئیبن مستەوفی دەڵێ: ئەبالغەزل سەقە کوڕی عەلی کوڕی ناسر کوڕی عەبدوڵڵای بەغدایی سەری لەهەولێر دەدا بۆ کتێب فرۆشتن[١٠٩].

ئەمانە ئەوە بەدیار دەخەن لەهەولێردا فرۆشگاو شوێنی تەرخانکراو بۆ فرۆشتنی کتێب هەبووە، خەڵکی کتێب کڕیش هەبوون، ئیبن شەعار دەڵێت "ئەحمەد داود بیلال مەعالی هەولێری کەخوتبەو قورئان خوێن و زاناو ئەهلی زانست و قورئان لەهەولێر دەلالی کتێبان بوو[١١٠].

لەمەوە دەگەینە ئەو دەرەنجامەی، کە خەڵکی هەولێر بایەخیان بەکتێب داوەو لەبواری کتێب دانان چالاکیان نواندووە، لەئەنجامی ئەمەدا روونووس کاران "النساخون" پەیدابوون، کە بەشداریان لەبووژانەوەی جووڵانەوەی زانستیدا کرد بەبڵاوکردنەوەی زانیاری و رۆشنبیری لەنێوان خەڵک، ئەمیش بە روونووسکردنی کتێب و فرۆشتنیان بەخەڵکی لەفرۆشگاکانیان، لەو زانایانەی، کە لەهەولێر ئەم کارەیان کردووە، لەوانە ئەبو عەبدوڵڵا حوسێن کامیل عەلی محەمەد عەلی حوسێن کامیل موسڵی (ت٦٠٤ک-١٢٠٧ز) کە شێخێکی خێرخوازو چاکەکار بوو، کە دەهاتە هەولێر بەپارە کتێبی روونووس دەکرد[١١١]، هەروەها ئەبو حەسەن عەلی مەلاعب هەولێری بەئەسڵ خەڵکی موسڵ بوو (ت٦٠٤ک-١٢٠٧ز) دەهاتە میوانخانەکانی هەولێرو بەکرێ کتێبی دەنووسییەوە(١١٢) هەر لەو زانایانەی کە لەم بوارەدا کاریان کردووە قاسم عەبدولسەلام محەمەد عەبدولعەزیز ژەنگاری بوو[١١٣] (ت٦٠٥ک- ١٢٠٩ز) کە خوتبە خوێنی ژەنگار بوو، دەهاتە هەولێرو بەکرێ کتێبی روونووس دەکرد[١١٤]، جگە لەئەبو سهنا مەحمود عەلی محەمەد بەکر هەولێری زێڕینگەر (ت٦١٩ک- ١٢٢٢ز)[١١٥] و ئەبو

عەباس ئەحمەد شوجاع کوڕی منعەی هەولێری بەرەگەز تکریتی (ت٦٢١ک- ١٢٢٤ز) کتێبی بەکرێ رونووس دەکرد[١١٦].

لەمەوە بەدیار دەکەوێت کە بایەخێکی زۆر بەکتێب و دانراو دراوە، رونووسکردنی کتێب هەر لەلایەن کتێب فرۆشانەوە ئەنجام نەدەدرا، بەڵکو ئەوانەی بایەخیان بەزانست و رۆشنبیری دەدا ئەم کارەیان دەکرد، جگە لەمەش ئەم پیشەیە بەتەنیا لەسەر خەڵکی هەولێر تاپۆ نەبوو، بەڵکو ئەوانەی کە روویان لەشارەکە دەکرد پەرەیان بەم پیشەیە دەدا، بایەخدان بەروونووسکردنی کتێب بوو بەهۆی پەیدابوونی جووڵانەوەی وەرگێران "ترجمە"، ئەبو حەسەن سەفییەدین عەلی مووبارەک کە مامی مێژوونووسی هەولێر ئەبو بەرەکات شەرەفەدین مووبارەک مستەوفی(ت٦٣٧ک- ١٢٣٩ز) کتێبی "نصیحة الملوك"ی ئیمام ئەبی حامید محەمەد غەزالی (ت٥٠٥ک- ١١١١ز) لەفارسییەوە کرد بەعەرەبی[١١٧].

ئەوەی کە پەیوەندی بەروونووسییەوە هەبوو خەت بوو، کە دەورێکی گەورەی لەبواری کتێب دانان و روونوسیدا بینی، لەو زانایانەی، کە لەخەتخۆشی داهێنەر بوون سولەیمان موزەفەر موسا مەنسور عیسا ئەبو رەبیع هەولێری بوو، لەهەولێر مامۆستا بوو، خۆشنووسێکی چاک بوو، لەهەولێر نووسینگەیەکی هەبوو مێردمندالانی فێر دەکرد[١١٨].

ئیبن فوتی دەڵێت: "میر موحیبەدین ئەبو موزەفەر نەسر کوڕی عەبدولعەزیز کوڕی عوبدولڕەحمان هەولێری کە زانایەکی فەقیهو شارەزای ئەدەب و مێژوو بوو کتێبێکی لەسەر وەسفی خەت و ئامێرەکانی داناوە[١١٩].

لەکاتی خوێندنەوەی کتێبی "تاریخ اربل"[١٢٠] شەرەفەدین ئەبو بەرەکات ئیبن مستەوفی هەولێری (ت٦٣٧ک- ١٢٣٩ز) تەسنیفی کردووە، توانای شارەزایی دانەرمان لەبواری خەتخۆشیدا بەدیار دەکەوێت[١٢١].

**٦- کۆشکەکانی میوانداری**

کۆشکەکانی میوانداری لەبووژانەوەو بەگەڕخستنی ژیانی زانستی لەهەولێردا دەوریان بینیوە. ئەمیش بەپێشوازیکردنی ئەو زانایانەی کە بۆ بەدەست هێنانی زانیاری روویان لەشارەکە دەکرد.

سوڵتان موزەفەرەدین گوگبری لەهەولێر کۆشکی میوانداری دروست کردبوو، هەر فەقیهو زانایێک رووی لەشارەکە کردبا لەوێ دەحەوایەوەو مووچەی پێدەدرا جگە لەخواردن و خزمەتگوزاری، هەر کاتێکیش شارەکەی جێهێشتبا ئەوا کرێی گەڕانەوەشی وەردەگرت، جێگەی باسە ئەوەی مەشروبخۆر بوایە نەدەبوایە روو لەشارەکە بکات[١٢٢].

سەبەت ئیبن جوزی دەڵێت سوڵتان موزەفەر بۆ بەڕێوەبردنی کۆشکی میوانداری سەد هەزار دیناری تەرخان کردبوو[١٢٣].

ئەو کۆشکانە لەلایەنی دارایی و چاودێرییەوە سەرپەرشتیاری تایبەتی هەبوو لەناوەوەو دەرەوە، لەو سەرپەرشتیارانە ئەبو حەسەن عەلی مەلاعب عەلەوی هەولێری (٦٠٤ک-١٢٠٧ز) بوو[١٢٤].

لەمەوە دەگەینە ئەو دەرەنجامەی، کە ئەو دامەزراوە هانی زانایانی داوە روو لەمیرنشینەکە بکەن و لەوێ چاودێری بکرێن و خزمەتگوزاریان پێشکەش بکرێت، لەو زانا بەناوبانگانەی، کە لەو کۆشکانە دابەزیون ئەبو حەفس عومەر مەحاسن ئەبی پهنا موسڵی بوو لەسەدەی (شەشەم/حەوتەمی ک- دوازدەو سێزدەی ز)، ئەو زانایە قورئانی لەبەر بوو، لەو کۆشکانەوە سەردانی مزگەوتەکانی هەولێری دەکرد[١٢٥].

لەم خوێندنەوەیەدا بۆمان روون دەبێتەوە کە لەم دوو سەدەیەدا، هەولێر مەڵبەندێکی گرنگی زانستی و رۆشنبیری بووە، سوڵتان و وەزیر و دەسەڵاتدار و زاناکانی شاری هەولێر، جگە لەوەی زۆربەی خۆیان زانا و رۆشنبیر بوون، دەزگا و مەڵبەندی رۆشنبیریشیان دامەزراندووە و پێویستیەکانیان بۆ ئامادە کردووە و هەر لە منداڵیەوە خراونەتە بەر خوێندن زانای تێدا پێگەییوە و زانای هاتووەتێ و زانای لێوە حەواوەتەوە و ئەمانەش هۆیەک و ئەنجامێکلا گرنگی رۆشنبیری و زانستین.

**سەرچاوەو پەراوێز:**

١- سترك: دائرة المعارف الاسلامية (مادة

اربل)، ٢/٥١٦.
٢- عبدالرزاق الحسني: العراق قديما وحديثا/ ٢٣٥.
٣- ئازەربایجان: لەهەرێمە گەورەکانەو شارو قەڵای بەخۆوە گرتووەو چیاو ڕووباری زۆری تێدایە لەو وڵاتانەیە کە کەوتۆتە لێواری دەریای قەرم. یاقوت الحموي: البلدان، ١/١٢٨-١٢٩، القزويني: اثار البلاد وأخبار العباد/ ٢٨٤، ٢٨٥، ابو الفداء تقويم البلدان: ٣٨٦-٣٩١. بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی ئازەربایجان بڕوانە: د.حسام الدين النقشبندي: (ازربيجان/ ٣٤).
٤- سترك: د.س، ث٢/ ٥٢١.
٥- طه باقر، فؤاد سفر: المرشد الى مواطن الاثار والحضارة، الرحلة الخامسة، بغداد، ١٩٦٦، ٣.
٦- كي لسترنج: بلدان الخلافة- المشرقية/ ١٢٠.
٧- ياقوت: د.س، ث/ ١٣٨.
٨- عبدالباقي- الحيدري: التجديد الحضري لقلعة اربيل، الموصل، ١٩٨٥ ٥٧.
٩- جاسم محمد خلف: محاضرات في جغرافية العراق الطبيعية والاقتصادية والبشرية، القاهرة ١٩٦١/ ١٠٩، شاكر خصباك: الاكراد دراسة جغرافية اثنوغرافية بغداد- ١٩٧٢/ ٤٤.
١٠- لەبەشی بەرایی ئەو باسەدا ڕوونمان کردۆتەوە.
١١- د.ناظم رشيد: الادب العربي في العصر العباسي، الموصل ١٩٨٩/ ١٩٠، معالم الحياة العلمية والادبية في عهد مظفرالدين كوكبوري "باسێکی بلاونەکراوەیە".
١٢- عبدالجبار حامد: الحياة العلمية في الموصل في عصر الاتابكة، رسالة ماجستير علي الالة الكاتبة، كلية الاداب، جامعة الموصل، ١٩٨٦/ ٥٧.
١٣- بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە احمد عبدالعزيز: الهذبانيون/ ١٢٥،١٢٧،١٦٣،١٧٤،١٧٦،١٨١
١٤- محمد عبدالرحيم غنيمة: تأريخ الجامعات الأسلامية الكبري، المغرب ١٩٥٣/ ٣٣.
١٥- لەکاتی وتوێژو دایەلۆگ لەگەڵ د.حسام الدين نقشبندی گەیشتینە ئەم دەرەنجامە.
١٦- بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی ئەم بەدوا داگەڕان و ئەنجامەکانیان بڕوانە: كامل حسين: التنقيب حول المئذنة المظفرية في اربيل، مجلة سومر ج١، ٢، مج ١٨ لسنة ١٩٦٢/ ٢٠٥-٢٠٧.
١٧- حسن ابراهيم: تاريخ الاسلام، ٤/ ٣٣٦-٣٣٧، محمد مفيد الياسين: الحياة الفكرية في العراق في القرن السابع الهجري، بغداد، ١٩٧٩، ٢٠٧.
١٨- السمعاني: الانساب، بيروت ١٩٨٠، ٧/ ٤١٨-٤١٩، ابن المستوفي: تاريخ اربل، ١/ ٢٠٣،/ ابن خلكان: وفيات الاعيان، ٣/ ٢٣٣، ابن الفوطي: تلخيص مجمع الاداب في معجم الالقاب، دمشق، ١٩٦٥. ٣:٤/ ٥٠-٥٥١.
١٩- ابن المستوفي: د: س.ث، ١/ ٢٠٦.
٢٠- اليونيني: ذيل مراة الزمان، ١/ ٣٨٤-٣٨٥، احمد عبدالعزيز: الهذبانيون/ ١٩٢.
٢١- محسن محمد حسين: اربيل/ ٣٥.
٢٢- بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی ئەتابەکە بڕوانە: القلشقندي: صبح الاعشي في صناعة الأنشا، بيروت، ١٩٨٧، ١٨/٤، لين بول: الدولة الاسلامية ١/ ٣٤٠.
E. r. art. Atabak, leiden, 1960 vol01 p.731
٢٣- سعيد الديوهجي: الموصل في العهد الأتابكي، بغداد، ١٩٥٨/ ٩٢.
٢٤- العزاوي: امارة ال بكتكين، ٢٢/ ١٣٩- ١٤٠.
٢٥- د.ناظم رشيد: معالم الحياة العلمية والأدبية في عهد مظفر الدين گوگبري/١.
٢٦- ابن واصل: مفرج الكروب، ٩٧/١.
٧٢- بۆ زیاتر زانیاری، بڕوانە محسن محمد حسين: ن.م/ ٤٣-٥٦.
٢٨- ابن الأثير: الباهر، ١٣٥/ ابو شامة: الروضتين، ٢:١/ ٣٨٤، ابن واصل: مفرج الكروب، ١٥٤، ابن العبري: تأريخ مختصر الدول/ ٢١٢، ابن الفرات/ تأريخ ابن الفرات، ٤، ١٣/١.
٢٩- ابن خلكان: وفيات الأعيان، ٣/ ٢٧٥، الذهبي دول الاسلام، القاهرة، ١٩٧٤، ٧٧/٢، العبر في خبر من عنبر، الكويت ١٩٦٣، ١٨٢/٤، بن العماد الحنبلي: شذرات الذهب، ٢٠٩/٤.
٣٠- ابن دحية: النبراس في تأريخ خلفاء بني العباس، بغداد، ١٩٤٦/ ١٥٥- ١٥٦.
٣١- ابن الجوزي: المنتظم في تأريخ الملوك والأمم. ٢٢٣/١٠هـ(١) ابن الأثير: ن.م/ ص سبط ابن الجوزي: مرأة الزمان، ٧. ٢٧٣، ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة، القاهرة ١٩٣٥، ٣٧٨/٥.
٣٢- الأصفهاني: تأريخ دولة أل سلجوق/ ١٨٨-١٨٩.
٣٣- العزاوي: امارة ال بكتكين، ١٥٥/٢١.
٣٤- ابن المستوفي: تأريخ أربل ٤٤٥/٢-٤٤٦، ابن خلكان: ن.م.
٣٥- ابن المستوفي: ن.م ٥٦٧/٢، محسن محمد حسين: أربيل/ ٢٨٤/٥٩.
٣٦- ابن خلكان: ن.م، ص.
٣٧- ابن خلكان: ن.م ٢٤٦/٢، محسن محمد حسين: اربيل/ ٦١/٦٠.
٣٨- د.ارسن موسي: دور مجاهدالدين

قايماز في سياسة وادارة امارتي أربيل والموصل/ مجلة الأبحاث/ كلية الأداب، جامعة صلاح الدين/ ج١. ع٢،٣ لسنة ١٩٩٠/ ٢٨.
٣٩- ابن واصل: مفرج الكروب، ٣/١٠٣ه.
٤٠- وفيات الأعيان، ٣/٢٤٦.
٤١- ابن الأثير: الباهر/ ١٩٣، الكامل ١٢/ ١٥٣، ابو شامة: الروضتين، ٢:١/ ٦٩٤، ابن الساعي الخزان: الجامع المختصر ٨/٩، ابن الفوطي: تلخيص مجمع الأداب في معجم الالقاب، ٣:٥/ ٨٣-٨٤.
٤٢- د.ارسن موسي: ن.م/ ٢٩.
٤٣- ابن خلكان: ن.م، ٣/٢٤٧، ابن أبي عذيبة: انسان العيون/ ٨٩.
٤٤- ابن خلكان: ن.م، ص اسماعيل باشا البغدادي: هدية العارفين "اسماء المؤلفين واثار المصنفين"، استنبول، ١٩٥١، ١٩٨٤/١.
٤٥- ابن المستوفي: تأريخ أربل، ٧٦/١، ه، ارسن موسي: دور مجاهدالدين قايماز/ ٣٠.
٤٦- ابن خلكان: ن.م ص/ ٢٤٦-٢٤٧، الغساني/ المجد السبوك/ ٢٥٢.
٤٧- ابن خلكان: ن.م ٣/ ٢٧٠-٢٧١.
٤٨- ابن واصل: مفرج الكروب، ٢/٣٣٩، ابن الفرات: تأريخ ابن الفرات، ٢٣٥/١٠٤.
٤٩- امارة ال بكتكين، ٢١/٥٥٤.
٥٠- محسن محمد حسين: أربيل/ ٦٨-٦٩.
٥١- ابن خلكان: ه.س، ث ٣/٢٧١.
٥٢- العزاوي: ن.م ٢١٥/ ٥٢٨-٥٢٩.
٥٣- وفيات الأعيان: ٣/٢٧٢.
٥٤- سبط ابن الجوزي: مرآة الزمان، ٨/ ٦٨١-٦٨٢ ابن خلكان: ن.م.ص، الذهبي: تأريخ الأسلام، ٢/ ٣٥٨ الغاني: المسجد المسبوك/ ٤٥٣.
ابن عذيبة: انسان العيون: ٢٩٥، ابن العماد الحنبلي: شذرات الذهب ٥/ ١٣٨.
EI, art-Begteginias vol -I -p 1160-1161
بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی سولتان موزەفەرەدین گوگبری و کەسێتی و کردەوەکانی بڕوانە عبدالقادر أحمد گلیمات: مظفرالدين گوگبری- محسن محمد حسين: اربيل/ ١٧٨-١٩٧، ٢٣٥-٢٣٨.
٥٥- أبن المستوفي: تاريخ أربل، ١٢٩/١، ١٩٦/٢، ابن الشعار: عقود الجمان، ١/ ٨ ب، ابن خلكان: ن.م، ع، ٣٩٧، ابن الفوطي: تلخيص مجمع الأداب دمشق، ١٩٦٧، ٨٧٩/٤، محسن محمد حسين: ن.م/ ٢٥٢-٢٥٣.
٥٦- وداد قزاز: المنارة المظفرية في اربيل- تاريخها ووصفها- مجلة سومر، ج١، ٢، مج ١٦، ١٩٦٠/ ١٢٧، طه باقر، فؤاد سفر: المرشد الى مواطن الأثار والحضارة/ ٦، محسن محمد حسين: ن.م/ ٢٣٢-٢٣٣.
٥٧- سبط الجوزي: ن.م ٨/ ٦٨٢-٦٨٣، عبد القادر طليمات: ن.م/ ٦٣.
٥٨- ابن خلكان: ن.م ٣/ ٢٧٥/٢٧٦.
٥٩- ابن خلكان: ن.م.ص الذهبي: ن.م ٢/ الغساني: ن.م/ ٤٥٢، ابن الحنبلي: ن.م ٥٢/ ١٣٨.
٦٠- مريزن سعيد مريزن: الحياة العلمية في العراق في العصر السلجوقي، مكة المكرمة، ١٩٨٧/ ١٠٧.
٦١- ابن المستوفي: تاريخ اربل ٩٦/١.
٦٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ١. ٢٤٢.
٦٣- ابن الشعار: عقود الجمان، ١٥٧/٥، خطيب العمري: منهل الأولياء ومشرب الأصفياء، ١٠٣/٢.
E.I-art mawl, Leiden, 1936, 751. III.p-240
٦٤- ابن خلكان: وفيات الأعيان ٢٧٣/٣-٢٧٤، القزويني: اثار البلاد واخبار العباد/ ٢٩٠، الذهبي: تاريخ الأسلام، ٢/ ٣٥٩، ابن عذيبة: انسان العيون ٢٢٩.
٦٥- العزاوي: امارة أل بكتكين، ١٣٩/٢٢.
٦٦- الذهبي: العبر في خبر من غبر، ١٢٢/٥.
٦٧- سبط ابن الجوزي: مرأة الزمان، ٥١٦/٨، محسن محمد حسين: أربيل/ ٢٦٠.
٦٨- سبط ابن الجوزي ن.م ٦٨٣/٨.
٦٩- ابن المستوفي: تاريخ أربل، ١٦٢/١، ٢٦٥/٢، ابن الشعار: عقود والجمات، ١٥٦/٥، ابن خلكان: وفيات الأعيان، ١٢٢/٣، محسن محمد حسين: أربيل/ ٢٥٦، د.ناظم رشيد: معالم الحياة العلمية والأدبية في اربيل/ ٦.
٧٠- سبط ابن الجوزي: مراة الزمان، ٦٨٣/٨، ابن الغوطي: الحوادث الجامعة ٤٤-٤٨.
٧١- ابن المستوفي: ن.م ٦٤٢/٢-٦٤٣، ابن الساعي الخازن: الجامع الغوطي ٧٥/٩-٧٦.
٧٢- سبط ابن الجوزي: ن.م ٦٩٩/٨، ابن تغري بردي: ن.م ١٦/٧.
٧٣- ابن العبري: تاريخ مختصر الدول/ ٢٥٩، ابن تغري بردي: ن.م ١٦/٧.
٧٤- ابن الفوطي: الحوادث الجامعة/ ٣٣٧، اليونيني: ذيل مراة الزمان، ١. ٥١، الذهبي: العبر في خبر من غبر، ٥/ ٢٣٦، الكتبي: عيون التاريخ، ٢٠/ ٢٠٣.
٧٥- بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی ئەم ڕێکخستنانەو وەزیفەکانیان بڕوانە: محسن محمد حسين: اربيل/ ٣٠٧-٣٣١، احمد عبدالعزيز: الهذبانيون/ ١٢٧، ١٣٦، ١٤١، ١٤٦.
٧٦- د.حسين أمين: تاريخ العراق في العصر السلجوقي، بغداد، ١٩٦٥/ ١٩٣.
٧٧- ابو يعلي الغراء الحنبلي: الأحكام

السلطانية، القاهرة، ١٩٦٦/ ٢٩.
٧٨- ابن المستوفي: تأريخ أربيل، ٢/٦٤، أبن خلكان: وفيات الأعيان، ١/٤٤١.
٧٩- الياقوت الحموي: معجم الأدباء، بيروت، ١٩٣٨- ١/٥٧.
٨٠- ابن تغري بردي: ن.م/ ٢٢٠.
٨١- محسن محمد حسين: اربيل/ ٣١٠.
٨٢- وفيات الأعيان: ٣/ ٢٩٤.
٨٣- عقود الجمان، ٦/ ١٩أ.
٨٤- ن.م، ٦/ ١٢٣.
٨٥- المنذري التكملة لوفيات النقلة، القاهرة ١٩٧٦، ٦/٣٢٢.
٨٦- مريزي سعيد مريزن عسيري: الحياة العلمية في العراق في العصر السلجوقي ٢٠٦- ٢٠٧.
٨٧- محمد عبدالرحيم غنيمة: تأريخ الجامعات/ ٢٠٥، محمد الحسيني عبدالعزيز: الحياة العلمية في الدولة الأسلامية، الكويت، د.ت/ ٣٥.
٨٨- المنذري، التكملة، ٦/٣٢٢، ابن الخلكان: وفيات الأعيان، ٣/٢٩٤ ابن المستوفي اربيل ووزيرها ومؤرخها واديبها، وتارێکە لەرۆشنبیری نوێ ژ١١١ی سالی ١٩٨٦/ ٦٩ بلاوکراوەتەوە.
٨٩- عباس العزاوي: التعريف بالمؤرخين في عهد المغول والتركمان، بغداد، ١٩٥٧، ٦.
٩٠- بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی گەشت و جۆرەکانی بڕوانە: جعفر حسين صادق: الرحلات العلمية من الأندلس الي المشرق، رسالة ماجستير علي الألة الكاتبة، كلية الأداب، جامعة الموصل/ ١٩٨٥/ ١٤-٢٧.
٩١- د.حسين محمد فهيم: أدب الرحلات، الكويت، ١٩٨٩، ١٩.
٩٢- المقدمة: ٥٤١.
٩٣- محمد عبدالرحيم غنيمة: تأريخ الجامعات/ ٢٠٩-٢١٢.
٩٤- ابن خلدون: ن.م.ص.
٩٥- كريم عجيل: الحياة العلمية في مدينة بلنسية، بيروت ١٩٦٧/ ٤١٨.
٩٦- العزاوي: امارة أل بكتكين، ٢٢/ ١٣٩، هەروەها بڕوانە محسن محمد حسين، أربيل/ ٢٥٥-٢٦٧.
٩٧- ابن خلكان: وفيات الأعيان، ٣/٢٧٢-٢٧٣.
٩٨- ابن خلكان: ن.م ٣/٢٩٤، اليافعي: مراة الجنان وعبرة اليقظان: بيروت ١٩٧٠.
٩٩- ابن الشعار: عقود الجمان، ٦/٢١ب، حاجي خليفة: كشف الظنون عن أساسي الكتب والفنون، استنبول، ١٩٤١، ١، ٥، اسماعيل باشا البغدادي: هدية العارفين، استنبول، ١٩٥٥، ٢.٣، بروكلمان: تاريخ الأدب العربي، القاهرة، ١٩٧٧، ٥/١٧٦.
١٠٠- الزبيدي: تاج العروس، ٤/٢١، د.عبدالله فياض: الأجازات العلمية عند المسلمين، بغداد، ١٦٦٧-٢١.
١٠١- محمد عبدالرحيم غنيمة: تاريخ الجامعات/ ٢١٦-٢٢٠.
١٠٢- محمد حسين عبدالعزيز: الحياة العلمية في الدولة الأسلامية/ ٣٩-٦٥.
١٠٣- محمد عبدالرحيم غنيمة: ن.م ٢٢٢.
١٠٤- د.ناظم رشيد: التعليم في ظل الدولتين الزنكية والأيوبية في الشام، مجلة أدب الرافدين، كلية الأداب، جامعة الموصل، ع١٠ السنة ١٩٧٩/ ٢٨٤.
١٠٥- بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی ئیجازاتە زانستییەکان بڕوانە: د.عبدالله فيرض: ن.م/ ٢٤-٣٣.
١٠٦- ابن المستوفي: تاريخ أربل، ١/ ١٨٥-٢٦٥، هەروەها بڕوانە پاشکۆ ژمارە ١.
١٠٧- ابن المستوفي: ن.م، ١/١٨٤.
١٠٨- المقدمة/ ٢٤١.
١٠٩- تاريخ أربل/ ١/٣٧٨.
١١٠- عقود الجمان، ١/٢١٨-٢١٩.
١١١- ابن المستوفي: ن.م، ١/٣٣٨.
١١٢- ن، م، ١/١٥٥.
١١٣- السنجاري: مەبەست لەژەنگارە، لەشارە ناسراوەکانی هەرێمی جزیرەیە، ياقوت: البلدان: ٣/٢٦٤، بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: موسي مصطفي ابراهيم: سنجار دراسة في تاريخها السياسي والحضاري، نامەی ماجستير، كلية الأداب، جامعة صلاح الدين/ ١٩٨٩/ ١٤ت.
١١٤- ابن المستوفي: تاريخ أربل، ١/١٢١.
١١٥- ن.م، ١/٢٣٢.
١١٧- ابن خلكان: وفيات الأعيان، ٣/٢٩٨، محسن محمد حسين: أربيل/ ٢٧٧.
١١٨- ابن الشعار: عقود الجمان، ٣/٤٨ب-١٤٩.
١١٩- تلخيص مجمع الأداب، ٢:٥/ ٣٣٠.
١٢٠- مەبەستمان لەبەشی دووەمە.
١٢١- بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: تاريخ أربيل/ ١٣٦، ١٥٤، ١٩١، ٢١٨، ٤٤٦، ٢/٧٧٣، هەروەها بڕوانە: المنذري: التكملة وفيات النقلة، ٦/٣٢٢، الذهبي: العبر، ٥/١٥٥، محسن محمد حسين: أربيل/ ٢٨٠.
١٢٢- ابن خلكان: وفيات الأعيان، ٣/٢٧٣، الذهبي: تاريخ الأسلام، ٢/٣٥٨، ابن العماد الحنبلي: شذرات الذهب، ٥/١٣٨. محسن محمد حسين: أربيل/ ١٩٣-١٩٤.
١٢٣- مراة الزمان: ٨/٦٨٣.
١٢٤- ابن المستوفي: تاريخ أربل، ١/١٥٧، د.حسام الدين النقشبندي: خطط أربيل/ ١٤٥.
١٢٥- ابن المستوفي: ه.س.ث، ١/ ٣٨٠-٣٨١.

# رۆشنبیریی سەردەمی ئەتابەگی لە هەولێر

**دکتۆر موحسین محەمەد حوسێن**
**ئەندامی کارای ئەکادیمیای کوردستان**

### ژیانی رۆشنبیری لەسەردەمی ئەتا بەگیدا لە هەولێر

لەراستیدا ئەم لایەنە دامودەزگا رۆشنبیرەی و کەسایەتییە زاناکان، کە بە شاند هاتوون و بنەما زانستییەکان، کە لەم سەردەمدا دەرکەوتوون لەخۆ دەگرێت.

**یەکەم: دامودەزگاکانی خێرکردن:**

زانیاری دیاریکراو دەربارەی دامودەزگاکانی فێرکردن و رۆشنبیری، کە لەو سەردەمەدا لەهەولێر دامەزرابن لەبەردەستدا نییە بە پێچەوانەی زۆر لەو بنکە ئیسلامییە تازانەی، کە لە موسڵ و حەلەب و شوێنی دیکە دامەزراون. هەر چەندە سەرچاوەکان رۆشنایی ناخەنە سەر ئەو بابەتە، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا توانرا هەندێ لایەن لەو دامودەزگایانە بدۆزرێتەوە، شایەنی باسە زانایان بەتایبەت فەقیهەکان و فەرموودەزانەکان خاوەن بەختێکی باش بوونە لە بایەخ پێدان و چاودێریکردنیان لە لایەن مزەفەرەددین گۆکبرییەوە، بەپێی ئەوەی ئیبن خەلەکان باسی لێوە دەکات[1] ئەوەی لە مزەفەرەددین باس دەکرێت بری هەزار دیناری بە ئەبی خەتاب کوڕی حەسەن ناسراو بە رەحییە ئەندەلوسی بلنسی بەخشی لەبەرامبەر ئەوەی کتێبی (التنویر في مولد الرابع المنیر) دانا و دانەیەکی پێشکەش کرد[2]. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو حاکمە هانی رۆشنبیری و زانستی داوە، ئەمەو بەپێی یەکێ لە رۆژهەڵاتناسەکان هەولێر لەسەردەمی گۆگبری وابایەخ بە مەیدانی رۆشنبیری درا، کە هەرگیز پێشتر ئەو شێوەیەی بەخۆوە نەبینیبوو[3]. حەسەن پاشا دەڵێت: مزەفەرەددین گۆگبری یەکێکە لەو گەورە حاکمانەی ناوخۆ کە بایەخی بە دامەزراندنی قوتابخانە داوە و جێ پێی دیارە و ئەسپی خۆی لەو بوارە تاوداوە[4].

بەڵام دامودەزگاکانی کە لەم میرنشینە سەریان هەڵداوە ئەمانەن:

**١- مزگەوتەکان:**

ژمارەی مزگەوتەکان، یاخود ناوەکانیان، یان شوێنەکانیان[5]، کە لە هەولێر دروستکراوە نازانین. بەڵام ئیبن خەلەکان دەڵێت: میر ئەبا مەنسور سەرفتکین جێگری زەینەدین عەلی کوچک ژمارەیەک مزگەوتی دروست کردووە، ئەمەش نەک تەنها لەناو میرنشین، بەڵکو لە دەرەوەو گوندەکانیش[6]. لەگەڵ ئەوە ئەو مێژوونووسە ئاماژەی بە هیچ مزگەوتێک نەداوە، کە لە سەردەمی میرەکانی دیکەی لە دوای سەرفتکین هاتوون، دروستکرابێ، بەتایبەت مزەفەرەددین، کە ئاشکرایە زۆر لە دامودەزگای فێرکردن و خێرخوازی دروست کردوون. لەوانە ئەو منارە جوانەی ناسراوە بە منارەی میر بیرۆکەیەکی باش بەدەستەوە دەدات، کە تا چەند بایەخی بە مزگەوتەکان داوە. چونکە وەک ئاشکرایە لە مێژووی ئیسلامی مزگەوتەکان رۆڵی گرنگیان بینیوە لە بواری فێرکردن جا چ لە پێش دەرکەوتنی دامودەزگای فێرکردنە سەربەخۆکان بێت یاخود لەپێش ئەوە[7]. لە روکنەکان دەبووە بازنەی تەدریس زاناو ئەدیب و نووسەرەکان لێی دادەنیشتن، ژمارەیەک فێرخوازیش لە دەوریان دادەنیشتن[8]. لەمبارەیەوە سیوتی لە

ئیبن مستەوفی دەگوازێتەوە، کە لە مێژوونووسێکی هەولێرە، فەقیە مەحموود کوڕی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی حەسەن خەریز نەحوی ناسراوە بە ئەبی سەنا کوڕی ئەرمەلە هەولێر قورئان و نەحوی دەوتەوەو سوودی بە خەڵەکانێکی گەلێک زۆر گەیاندووە[9]. بەڵام ئیبن سەعید ئەندەلوسی دەڵێت: مزەفەرەددین، شێخ جەعفەر کوڕی هیبەتوڵڵا کەفەر عەزی بە وتارخوێنی مزگەوت دامەزراند[10].

**٢- قوتابخانەکان:**

مزگەوتەکان بەس نەبوون لە بواری فێرکردن بۆ پڕکردنەوەی پێداویستییەکانی کۆمەڵگا، بۆیە لە پاڵ ئەوەوە قوتابخانە سەربەخۆکان پەیدا بوون[11]. ئەو قوتابخانانەی لەو ماوەیەدا لە هەولێر پەیدا بوون ئەمانەن:

**أ- قوتابخانەی عەقیلی:**

بەڵام قوتابخانە لە مێژووی ئیسلامی ئەو شارە کە دەرکەوتبێ قوتابخانەی (ربض) بووە، کە ناسراوە بە قوتابخانەی عەقیلی بە خستنە پاڵ بە فەقیە ئەبی عەباس خدر کوڕی نەسر کوڕی عەقیل کوڕی نەسر عەقیلی کە لە ساڵی ٤٧٨ک/١٠٨٥ز لەهەولێر لە دایک بووەو، ئەو یەکێکە لە گەورە فوقەهایەکانی ئەو شارە، یەکەم کەسە، کە وانەی وتبێتەوە[12]. بەڵام سەرچاوەکان ئاماژەیان بە مێژووی دروستکردنی ئەو قوتابخانەیەو شوێنەکەی نەکردووە[13]. تەنیا ئەوە نەبێ پێ دەچێت لەماوەی پێش ئەتابیگی دروست کرابێ، واتە پاش ئەوەی فەقیە خدر لە بەغدا گەڕاوەتەوە هەولێر. لەم بارەیەوە ئیبن عەساکر کە لەسەردەمی فەقیە خدر ژیاوە دەڵێت: فەقیەی ناوبراو دوای ئەوەی لە بەغدا پێگەیشت گەڕایەوە هەولێر و لەوێ دەستی کرد بە فەتوادان و وانە وتنەوە[14].

**ب- قوتابخانەی قەڵات:**

ئەبو مەشور سەرفتکین، جێگری دامەزرێنەری، میرنشین لەساڵی ٥٣٣ز/١١٣٨ز قوتابخانەیەکی تازە لە قەڵات دروست کرد و ناوی نا قوتابخانەی قەڵات و خدر کوڕی نەسر کوڕی عەقیلی لەوێ دامەزراند بۆ ئەوەی وانەی تێدا بڵێتەوە[15]. ئەم فەقیهە هەر لەسەر فەتوادان و وانە وتنەوە مایەوە تا لەساڵی ٥٦٧ک/١١٧١ز کۆچی دوایی کرد، لەسەر دەستی ئەو زانایە ژمارەیەک قوتابی پێگەیشتن و بوون بە فوقەها لەوانە: ئەبو عەمرو زیائەدین عوسمان کوڕی عیسا کوڕی دەرباسی هەزبانی کتێبی (الاستفحاء لمذاهب الفقهاء)[16] کە لەساڵی (٦٠٢ک/١٢٠٥ز) کۆچی دوایی کردووە. زاناترین کەس بووە بە مەزهەبی شافعی و ئوسوڵی فیقهە[17]. برازاکەی ئەبو قاسم عێزەدین نەسر کوڕی عەقیل کوڕی نەسر، کە لە ساڵی ٦١٩ک/١٢٢٢ز[18] کۆچی دوایی کردووە لەسەر دەستی ئەو لەگەڵ کەسانی تر دەرچوون و پێگەیشتوون.

وا دیارە دامەزراندنی قوتابخانەی قەڵات نەبۆتە هۆی ئەوەی کار لە قوتابخانەی عەقیلی بکات، بەڵکو لە یەک کاتدا لە هەر دوو لادا وانە وتراوەتەوە. ئیبن خەلەکان دەڵێت: فەقیە ئەبو قاسم عێزەدین نەسر، کە پێشتر ناوی هات لە پاش مردنی مامی خدر، سەرپەرشتی کاری وانە وتنەوەی هەر دوو قوتابخانەی گرتۆتە ئەستۆ[19].

وێڕای ئەوەش کەسانی تر لە قوتابخانەی عەقیلی وانەیان وتۆتەوە، لەوانە شەرەفەدین محەمەد کوڕی فەقیە عێزەدین نەسری ناوبراو، پێچەوانەی باوکی دەرسی فەقیهی دەخوێند، پاشان لەو قوتابخانەیە لەوانەبێژی جێی باوکی گرتۆتەوە[20]. هەروەها ئەبو بەرەکات عیلمەدین محەممەد کوڕی عەبدولسەلام کوڕی محەمەد کوڕی عەبدولعەزیز کوڕی هیبەتوڵڵا شەنگالی لەباب و باپیرانییەوە لە شەنگال وتارخوێن بوونە، پەیوەندی بە موزەفەرەدین گۆگبری کردووە، لەو قوتابخانەیە وانەی وتۆتەوە. دوای ئەوەی پەیوەندییەکەی پتەو دەبێت، دەبێت بە یەکێ لە پیاوە بەهێزەکانی گۆگبری و دواتر بە کارێکی تایبەت بۆ بەغدا دەنێرێت. بەماوەیەکی کەم ئەو فەقیهە هەولێر جێ دەهێڵێت و دەچێتە مەلتییە[21] لەوێ کاری قەزایی دەگرێتە دەست تا لە ساڵی ٦١٩ک/ ١١٢٢ز کۆچی دوایی دەکات[22].

**ج- قوتابخانەی موجاهیدی:**

موجاهیدین قایماز جێگری دووەمی میر زەینەدین عەلی کوچک لە میانەی دەسەڵاتەکەی، کە دوانزە ساڵی خایاند.(٥٥٩-٥٧١ک)/(١١٦٤-١١٧٥ز) چەند دامەزراوەیەکی دامەزراند و یەکێک

لەوانە ئەو قوتابخانەیەیە، کە بە ناوی خۆی ناونا، کەچی هیچ شتێک دەربارەی ئەو قوتابخانەیە نازانرێ، تەنیا ئەوە نەبێت ئیبن خەلەکان دەڵێت: موجاهیدودین قایماز ئەو قوتابخانەیە و (خانەقا)یەکی دروست کرد. هەروەها دەڵێت: مامی ئەو مێژوونووسە فەقیە عومەر کوڕی ئیبراهیم کوڕی ئەبی بەکر کوڕی خەلەکان هەولێرییەو لەساڵی ٦٠٩ک/١٢١٢ز کۆچی دوایی کردووە[٢٤].

وا دیارە میر زەینەدین یوسف نیالتکین هیچ قوتابخانەیەکی لە هەولێر دانەمەزراندووە. لەوانەیە ئەو سێ قوتابخانەیە پێش ئەوەی میر زەینەدین جڵەوی دەسەڵات لەهەولێر بگرێتە دەست لە دروست کراوبن.

**د- قوتابخانەی موزەفەریە:**

ئەو قوتابخانەیە خودی میر مزەفەرەدین گۆگبری دروستی کردووە. قوتابخانەیەکی زۆر گەورە بووە، هەردوو مەزهەبی شافیعی و حەنەفی لێ خوێندراوە. نەک تەنیا مەزهەبێک کە پێشتر لە قوتابخانەکان وا باو بووە کەهەر قوتابخانەیەک مەزهەبێکی تێدا بخوێندرێت. فەرمانڕەوای هەولێر بە خودی خۆی سەرپەرشتیاری دەکرد. بەڵکو هەندێ جار لەوێش دەمایەوە. بەتایبەت لەو کاتانەی کە ئاهەنگی ئایینی سازدەدران و خواردن دروست دەکرا[٢٥].

مێژوونووس ئیبن خەلەکان لەساڵی ٦٠٨ک/١١١٢ز[٢٦] لەو قوتابخانەیە لەدایک بووە، چونکە لەو کاتەدا باوکی وانەی تێدا دەوتەوە. باوکی ئیبن خەلدون تا لەساڵی ٦١٠ک/١٢١٣ز گیانی سپارد بەردەوام بوو لەوانە وتنەوە[٢٧]. لەپاش ئەو فەقیهیە ئەحمەد کوڕی کەمالەدین کوڕی مەنعە هەولێری بۆ ماوەی حەوت ساڵ وانەی تیایدا وتەوە تا لەساڵی ٦١٧ک/١٢٢٠ز[٢٨] گوازرایەوە بۆ موسڵ و هەر لەوێش لەساڵی ٦٢٢ک/١٢٢٥ز کۆچی دوایی کرد.

لەزانایانی مەزهەبی حەنەفی، کە لەو قوتابخانەیە وانەیان وتۆتەوە ئەبو محەممەد ئەحمەد کوڕی عومەر کوڕی ئەحمەد کوڕی ئەبی شاکر کخرعزییە، کە لە هەولێر فەقیهی حەنەفی هەڵبژارد. پاشان لەو قوتابخانەیە وانە مەزهەبی حەنەفی دەگوتەوە. تا ساڵی ٦٣٤ک/١٢٣٣ز بەردەوام بوو لە وانە وتنەوە، واتە تا ئەو کاتەی مەگۆلەکان هاتن ئەو قوتابخانەیەیان تاڵانکرد. ئیتر هەولێری جێ هێشتوو چوو لەوڵاتی شام جێگیربوو[٢٩]. قرشی لە ئیبن مستوفی دەگوازێتەوەو دەڵێت: فەقیە حەنەفی، ئەبا مزەفەر محەمەد کوڕی ئەبی قاسم کوڕی ئەبی شوجاع هەمەدانی (کە لە ساڵی ٦١١ک/١٢١٤ز کوژراوە) هاتووە بۆ هەولێر[٣٠]. لەوانەیە مەبەستی هاتنەوەکەی وانە وتنەوە بێ لەو قوتابخانەیە.

هەروەها فوقەهاکانی مەزهەبی حەنەفی دیکەش هاتوون، لەوانە ئەبو جەعفەر محەمەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی محەمەد عەلی کوڕی عەبدولعەزیز رازی. ئەمەو عەبدولقادر قرشی لەئیبن مستەوفی دەگوازێتەوە و دەڵێت: ئەو فەقیهیە بۆ چەند جارێک هاتووە بۆ هەولێر[٣١] و مەزهەبی حەنەفی وانە وتۆتەوە. کتێبی خەرائز و کتێبێکی دیکەی لەسەر فەقیە پۆلێن کرد. کتێبێکیشی داناوە لەسەر (النوری فی مختیر القدوری)[٣٢]. یەکێک لەوانەی سەردانی ئەو قوتابخانەیەی کردووە دایکی موئەیەد زەینەب کچی ئەبی قاسم عەبدولرەحمان کوڕی حەسەن جورجانی نیسابوری سۆفیە کە ناسراوە بە شەعری و لەساڵی (٦١٥ک/١٢١٨ز) کۆچی دوایی کردووە[٣٣]. ئیبن خەلەکان بە زانا ناوی دەبات. لەسەر دەستی ژمارەیەک زانا خوێندوویەتی. بە ناوبانگترین زانایان ئەبو قاسم مەحمود کوڕی عومەر زەمەخشەری بووە کە فەرمانڕەوای (الکشاف في النحو)ە- ئیبن خەلەکان دەڵێت لە منداڵییەوە ئیجازەی لێوەرگرتووە[٣٤]. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە ئەو ئافرەتە زانایە لە قوتابخانەی موزەفەرییە وانەی وتۆتەوە، کە ئیبن خەلەکان تێیدا لە دایک بووە.

**٣- خانەی فەرمووده**

ئەو خانەیە موزەفەرەدین گۆگبری دروستی کردو ناوی نا (خانەی فەرموودەی موزەفەرییە)[٣٦]. بەڵام سەرچاوەکان شتێ دەربارەی شوێنەکەی باس ناکەن. ئیبن خەلەکانیش کە باسی لە تەواوی دامودەزگاکان کردووە، کە فەرمانڕەوای هەولێر دروستی کردوون، هیچ دەربارەی ئەو خانەیە باس ناکات، بەڵام لە بۆنەی تر باس لەبوونی دەکات[٣٧]. سەبارەت بە چالاکییە زانستییەکان

کە پێی هەڵساون لەگەڵ ئەو زانایانەی کە وانەیان تێدا وتۆتەوە، مونزیری و زەهەبی دەڵێن: ئەباخیر بەدەل کوڕی ئەبی مەعمەر کوڕی ئیسماعیل تەبریزی سەرپەرشتی خانەی فەرموودەی موزەفەرییەی گرتە دەست و لەسەر کارەکەی بەردەوام بوو تا لە ساڵی ٦٣٤ ک- ١٢٣٧ز مەگۆلەکان هەولێریان بە تالان برد. شێخی تەبریزی هەولێری جێهێشت و چووە حەلەب ژیانی خۆی لەوێ بەسەر بردتا لە ساڵی ٦٣٦ ک- ١٢٣٩ز کۆچی دوایی کرد(٣٨). ئیبن فوتیش دەڵێت: قیوامەدین ئەبا نەسر یونس کوڕی محەممەد کوڕی عەبدولعەزیز ئەردەبێلی(٣٩)، کە فەقیه بووە هاتۆتە هەولێر تیایدا قورئانی خوێندووە و لە خانەی فەرموودە و لە شێخەکانی گوێبیستی فەرموودە بووە. ئیبن قازی شەهبە لە ئیبن دەبیسی دەگوازێتەوە و دەڵێت: لە هەولێر چاوی کەوتووە بە ئەبا عەبدوڵلا محەممەد کوڕی ئەبی وەفا ئەحمەد کوڕی ئەبی تاهیر عەدی نەحوی موسڵی، کە لەو شارە نیشتەجێ بوو لە خانەی فەرموودەش نەحوی دەخوێند(٤١) لە ساڵی ٦٢٥ک/ ١٢٢٨ ز کاتی ئەو زانایە ئەپیرەدین موفەزەل ئەبهەری سەردانی هەولێری کرد لەو خانەیە دابەزی و لەسەر دەستی ئەو ئیبن خەلەکان خوێندوویەتی(٤٢).

**٤- خانەقایەکان**

کاتی باسمان لەو دامودەزگا خێرخوازی و کۆمەڵایەتییەکان کرد، کە موزەفەرەدین گۆکبری دایمەزراندبوون تیشکمان خستە سەر چوار خانەقا، کە لەو شارە دروست کراون. بەڵام دەربارەی رۆڵ بینینی ئەو خانەقایانە لە فێرکردن زانیاری کەمان لەبەردەستدایە. لەگەڵ ئەوەش ژمارەیەک لە خانەقایەکان بەشێوەیەکی گشتی رۆڵی رۆشنبیری کردنیان بینیوە(٤٣). بە تایبەت لە بواری دیراساتی ئایینی وەک تەفسیر و فەرمووده چونکە پێشتر وەک پەرەستگابوون و چاکەخوازان و سۆفیگەرەکان تێیدا دەمانەوە(٤٤). ئیبن فوتی دەڵێت: قوتبەدین بەدەل کوڕی خەلیل هەولێری سۆفی، کە یەکێک بووە لە شێخەکانی هەولێر، سەرپەرشتی خانەقای جونەیتیەی گرتۆتە ئەستۆ، کە موزەفەرەدین گۆکبری دروستی کردووە(٤٥). بەڵام هیچ کەسێک ئاماژەی بە چالاکی رۆشنبیر نەداوە، کە ئەو خانەقایە یاخود خانەقایەکانی دیکە کە میر موجاهیدودین قایماز لەو کاتەی کە دروستی کردووە دەسەڵاتی هەولێری لە جیاتی زەینەدین عەلی کوچک بەدەست بووە. لەو سەردەم دامودەزگاکانی ئەو میرنیشینە بۆ ماوەیەک گەشەندنێکی بەرچاوی بەخۆوە بینیوە. لەمبارەوە عەبدولڕەزاق حەسەن دەڵێت: هەولێر بووە یانەی یەکترناسین، مەبەستی لەوە قوتابییانی زانست بوو، کە لە رۆژهەڵات و رۆئاوا روویان تێکردووە(٤٦).

لەلایەکی دیکە کێبرکێ هەبووە لە نێوان ئەو زانایانەی هاتوونەتە هەولێر و زاناکانی هەولێر بە مەبەستی بەرزکردنەوەی ئاستی زانستی. لەم بارەوە عەباس عەزاوی دەڵێت:لەسەردەمی مزەفەرەدین گۆکبری لە نێوان وڵاتە ئیسلامییەکان و میرنشینی هەولێر گەیاندنی زانست هەبووە، کە ئەمەش پێگەی میرنشینی بەرز کردۆتەوە و هەر ئەوەش بۆتە هۆی ئەوەی ناوبانگی باش پەیدا بکات(٤٧). لە راستیدا لە رۆژانی ئاهەنگێڕان کە ساڵانە بەبۆنەی لەدایکبوونی پێغەمبەری مەزن محەممەد (د. خ) سازدەکرا، هەولێر دەبووە شوێنی پێکگەیشتن، کە زۆر لە فوقەهایەکان و قورئان خوێنەکان و شاعیرەکان و رابەرەکان و سۆفیگەران کۆدەبوونەوە و باسیان لە کاروبار و بەرەوپێشبردنی فیقه و زانست دەکرد. شاندەکان لەسەرتاسەری جیهان لەم بۆنەیەدا روویان لە هەولێر دەکرد، وەک بەغداد و موسڵ و نەسیبین و وڵاتی عەجەم(٤٨)... شوێنی تر.

هەروەها سەرچاوەکان دەڵێن: زۆر ئەوانەی هاتوونەتە هەولێر، مەبەستیان وانە وتنەوە یان گوێگرتن لە فەرموودە بووە و شوێنکەوتووی ئیمامی شافعیش بوونە، کە لە قوتابخانە نیزامیە(٤٩) جۆربەجۆرەکان فێربوون، بەتایبەت لە بەغدا زانراوە، کە ئەو قوتابخانانە لە بنەڕەتدا بۆ بڵاوکردنەوەی مەزهەبی ئەو ئیمامە (شافعی)(٥٠) دامەزرێنرا. هەر چوار قوتابخانەکانی هەولێریش شافعی بوون، تەنیا قوتابخانەی مزەفەرییە نەبێت، کە هەردوو مەزهەبی شافعی و حەنەفی تێدا دەخوێندران(٥١). هەروەها دەڵێن: ئێمە نازانین ئەوانەی هاتوون بۆ هەولێر ماوەی چەند ماونەتەوە. هەروەها ناشزانین لە بواری زانستەوە

چیان لە پاش خۆیان جێهێشتووە، یاخود هەندێکیان چ کارێکی زانستیان پراکتیزە کردووە، بۆیە هەر ئەوەندە کرا ئاماژە بە ژمارەیەکیان بدرێ و، ژمارەیەکی تر نا.

دووەم: گرنگترین کەسایەتییە زانیستییەکان کە هاتوون بۆ هەولێر

لەسەرەتا باس لە ئەبا خەتتاب عومەر کوڕی حوسێن کوڕی عەلی بلنسی ناسراو بە ئیبن دەحیە دەکەین، کە لە ساڵی ٦٢٤ ک / ١٢٢٧ز، کە لە ئەندەلوسەوە بە خۆی و زانستێکی زۆر گەیشتە هەولێر و، کتێبێکی بەناوی(کتاب التنویر في مولد السراج المنیر) داناو دانەیەکی پێشکەش بە موزوفەرەددین گۆکبری کرد. لەبەر ئەوەی بینی بە تەوقەوە هەڵدەستێ بەئاهەنگێڕان بەبۆنەی لەدایکبوونی پێغەمبەر محەمەد (د.خ) ئاهەنگ دەگێڕێت، بۆیە میری هەولێر لەبەرامبەر کتێبەکەی هەزار دیناری پێبەخشی[52]. ئیبن دەحیە لەساڵی ٦٣٣ک/١٢٣٥ز لە قاهیرە کۆچی دوایی کرد.

هەر لە ئەندەلوس شاعیری جوولەکە بە عارەبکراو یەحیا کوڕی سلێمان کوڕی شاول لەشاری(تلیتلە)وە[53] هاتووە بۆ هەولێر. هەروەها ئەبو بەکر محیەدین محەمەد کوڕی محەمەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی حوسێن کوڕی سوراقەی ئەنساری ئەندەلوسی شائبی، کە یەکێکە لەو ناسراوانەی بە فەرمووددزان ناسراوە. چووەتە وڵاتانی ڕۆژهەڵات و سەردانی بەغدای کردووە و لەگەڵ فەرموودەناسان کۆبۆتەوە، پاشان لەساڵی ٦٢٦ک/١٢٢٩ز هاتووە بۆ هەولێر[54]. پاشان هەولێری جێهێشتووە و چووە بۆ حەلەب. هەر لە ئەندەلوس فەقیهی شافیعی ئەلقاسی، فەتح کوڕی موسا کوڕی حەماد کوڕی عەلی کوڕی ئیبراهیم کوڕی ئیسماعیل ئەمەوی هاتووە بۆ هەولێر. ئوسول زان بووەو شارەزایی لە زانستی نەحو و هۆنراوەزانی و زانستی حیکمەو مەنتیقدا هەبووە.کتێبی(المفیض في النحو)، کە هی ئەبی قەیسی زەمەخشەرییە(هۆنیوەتەوە). ئیبن شەعار لە میانەی سەردانەکەی بۆ هەولێر ئەو فەقیهیەی بینیوە[55]. لەمیسریش شاعیر ئەبو فەتح نەسروڵڵا کوڕی یوسف کەنانی هاتووە بۆ هەولێرو تیایدا ماوەتەوە تا لەساڵی ٦١٧ک/ ١٢٢٠ز کۆچی دوایی کرد(٥٦). هەروەها ئەبو عەبدوڵڵا محەمەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی عومەر ئەنساری ئەسکەندەرانیش لەساڵی ٦٢١ک/١٢٢٤ز هاتووە بۆ هەولێر[57].

لەواسیت، ئەبو مزەفەر جەمالەدین عەبدولرەحمان کوڕی محەمەدی شاعیر ناسراو بە ئیبن بەنینیرە هاتووە بۆ هەولێرو لەساڵی ٦٢٣ک/١٢٢٦ز لە قوتابخانەی مزەفەریە دابەزیوە[58].

لەو ئەدیبانەی کە هاتوونەتە هەولێر و بۆ ماوەیەکی درێژ تیایدا ماونەتەوە، ئەبو بەرەکات کەمالەدین موبارەک کوڕی ئەبی بەکر کوڕی حەمدان ناسراو بە ئیبن شەعار موسڵییە، کە خاوەنی کتێبی (عقود الجمان من شعراء الزمان)ە[59]. ناوبراو لەساڵی ٦٢٥ک/١٢٢٨ز گەیشتۆتە هەولێر و بۆ ماوەی چەند ساڵێک لەو شارە ماوەتەوە. بەڵام نازانرێ کەی هەولێری جێهێشتووە، لەوانەیە لەگەڵ ئیبن مستوفی هەولێریان جێهێشتبێ[60]. لەساڵی ٦٥٤ک/١٢٥٦ز کۆچی دوایی کردووە. گەورە ئەدیبی پایەبەرز ئەبو فەتح زیائەدین نەسروڵڵا کوڕی ئەبی کەرەم محەمەد کوڕی محەمەد کوڕی عەبولکەریم شەیبانی جزری ناسراو بە ئیبن ئەسیر[61] سەردانی هەولێری کردووە، کە دەکاتە برای مێژوونووس عیزەدین عەلی خاوەنی کتێبی (الکامل في التاریخ)ە. ئیبن خەلەکان دەڵێت: ئیبن مستەوفی لە کتێبەکەی (تاریخ اربیل) باسی زیائەدین ئیبن ئەسیری کردووە و رادەگەیەنێت، کە لە ساڵی ٦٢١ک/١٢٢٤ز هاتۆتە هەولێر[62]. ئیبن ئەسیر لە ساڵی ٦٣٧ک/ ١٢٣٩ز لەبەغدا کۆچی دوایی کردووە و لەگۆڕستانی قورەیش، کە کەوتۆتە لای ڕۆژئاوای شار نێژراوە[63]. مێژوونووس ئەبو مزەفەرەددین شەمسەدین یوسف قەزاو عەلی[64] ناسراو بە سەبت ئیبن جەوزی فەرمانڕەوای کتێبی (مرأة الزمان) کە لەساڵی ٦٥٤ک/١٢٥٦ز کۆچی دوای کردووە[65]، لەساڵی ٦٠٠ک/١٢٠٣ز سەردانی هەولێری کردووە. ناوبراو لە کتێبەکەیدا لە ڕووداوەکانی هەولێردا دەڵێت: چوومەتە بەغداو لەوێشەوە بۆ شام. لەیەکەم گەشتیشیدا بۆ شاری داقوق

تێپەڕ بووە و لەوێ لەگەڵ وتارخوێنان كۆبۆتەوە. پاشان داقوقی جێهێشتووە، هاتووە بۆ هەولێر و بۆ ماوەیەك لەوێ ماوەتەوە[٦٦].

ئەبو بەشائیر ئیسحاق كوڕی هیبەتوڵڵا كوڕی سدیق كوڕی مەحموود، قازی شاری خەلات، كە فەقیهیەكی شافعییەو زانایەكی ئوسوڵە، رابەرو شاعیرە، زۆر كتێبی هەیە لەسەر زانستی ئوسول لە هەولێر نیشتەجێ بووە. هەر لەو شارەدا ژیاوە تا لەساڵی ٦١٦ك/ ١٢١٩ز تیایدا مردووە[٦٧].

هەر لەوانەی سەردانی هەولێریان كردووە ئەبو سەنا مەحموود كوڕی حەسەن كوڕی عەلی كوڕی حەسەن نەحوی زەریرە، كە بە (ئیبن ئەرمەلە) ناسراوە، هەر لە لاوێتییەوە قورئانی ئەز بەر كردووە و وانەی وێژەیی لەسەر دەستی سەعید كوڕی دەهاك ئەلموبارەك، كە لەساڵی ٥٦٩ك/١١٧٣ز كۆچی دوایی كردووە خوێندووە. پاشان گوازراوەتەوە بۆ هەولێر لەوێ نیشتەجێ بووە[٦٨]. لەساڵی ٦٠٦ك/١٢٠٩ز هەر لە هەولێر كۆچی دوایی كردووە.

شێخ ئەبو خەیر بەدەل كوڕی ئەبی مەعمەر كوڕی ئیسماعیل تەبریزی، دوای ئەوەی چۆتە نیسابور و عێراق و میسر هاتووە بۆ هەولێر و سەرپەرشتی خانەی فەرمووودەی مزەفەرییەی كردووە و تیایدا ماوەتەوە تا ساڵی ٦٣٤ك/١٢٣٧ز كاتێ مەغۆلەكان ئەو شاردیان بەتاڵان برد،هەولێری جێهێشتووە چوو بۆ حەلەب و هەر لەوێ لەساڵی ٦٣٦ك/١٢٢٩ز كۆچی دوایی كردووە[٦٩].

هەر لە گەورە فەقیە و فەرمووودەزانەكان، شێخ عەبدوللەتیف كوڕی عەبدولقەهار كوڕی عەبدوڵڵا كوڕی محەمەد سەهروەردی، ئامۆزای شێخ عومەر سەهروەردی هاتووە بۆ هەولێر[٧٠]. شێخ عەبدوللەتیف زۆر وڵات و شوێن گەڕاوە تا بۆ دواجار دێتە بەغدا و، ئەویش بەجێ دەهێڵێ و بەرەو هەولێر دێت و تیایدا دەمێنێتەوە تا لە ساڵی ٦١٠ك/١٢١٣ز كۆچی دوایی دەكات. ئیبن مستەوفی باس لە هاتنی دەكات بۆ هەولێر گوێبیستی فەرمووودەكانی بووە[٧٢]. ئیبن رەجەب حەنبەلیش دەڵێت: ئیبن نوقتە لەهەولێر لەشێخ عەبدوللەتیف سەهردوردی گوێبیستی فەرمووودە بووە(٧٣).

لە رابەرانی (واعظ) ی بەغدا كە لە شاری هەولێر جێگیربوون فەقیە شێخ ئەبو مەعالی سەعید كوڕی عەلی كوڕی عومەر كوڕی محەمەد كوڕی عەلی بەغدادییە. شێخ سەعید لە ساڵی ٥٧٠ك/ ١١٧٤ز هاتووە بۆ هەولێر و[٧٤] بڕیاری داوە بەجێی نەهێڵێت و دەستی كردووە بە ئامۆژگاری كردنی خەڵك[٧٥]. ئیبن دەبیثی كە ئەویش سەردانی هەولێری كردووە[٧٦] دەڵێت: لەلای ئەبی مەعالی ساعید لە هەولێر خوێندوومە[٧٧]. ناوبراو لەساڵی ٦٢٥ك/ ١٢٢٨ز پاش ئەوەی بۆ ماوەی (٥٥) ساڵ لە هەولێر مایەوە كۆچی دوایی كرد و لەناو ماڵەكەی خۆشی نێژرا[٧٨].

لەشێخەكانی فەرمووودەناس، كە سەردانی هەولێریان كردبێ، ئەبو جەعفەر محەمەد كوڕی هیبەتوڵڵا كوڕی موكەرەم كوڕی عەبدوڵڵا سۆفییە، كە لە ساڵی ٦٢١ك/١٢٢٥ز كۆچی دوایی كردووە. كە هەر یەك لە ئیبن خەلەكان[٧٩] عەباس مەجدەدین ئەحمەد كوڕی عەلی كوڕی غالب هەولێری نەحوی حەنبەلی[٨٠] باسیان كردووە. هەروەها شێخ ئەبو عەلی حەنبەل كوڕی عەبدوڵڵا كوڕی فەرەج كوڕی سەعادە بەغدادی ڕەسافی هاتووە بۆ هەولێر. ئەبو عەلی بەغدادی بۆ ماوەیەك لەو شارە ماوەتەوە و پاشان گەڕاوەتەوە بۆ بەغدا و لەوێ لەساڵی ٦٠٤ك/١٢٠٧ز كۆچی دوایی كردووە.

هەر لە گەورە فەرمووودەزاناكان ئەبو عەبدوڵڵا زەكیەدین محەمەد كوڕی یوسف كوڕی محەمەد كوڕی ئەبی یوداس ئەشبیلی ناسراو بە بەرزالی[٨١] كە لە ساڵی ٦٣٦ك/١٢٣٨ز كۆچی دوایی كردووە سەردانی هەولێری كردووە. هەروەها ئەبو حەفسی عومەر كوڕی ئەبی بەكر محەمەد كوڕی مەعمەر كوڕی یەحیا كوڕی حەسەن ناسراو بە ئیبن تەبرزد و فەرمووودەزانێكی بەناوبانگی بەغدایە، ئەویش هاتۆتە هەولێر و لە ساڵی ٦٠٧ك/ ١٢١٠ز كۆچی دوایی كردووە. یەكێك لەوانەی كە گوێبیستی بووە ئەبو عەبدوڵڵا بەهائەدین محەمەد(باوكی مێژوونووس ئیبن خەلەكانە)[٨٢]. فەقیە و شاعیر ئەبو سەعادات

بەهائەدین ئەسعەد کوڕی یەحیا کوڕی موسا کوڕی مەنسور سەلەمی شەنگالی بۆ چەند جارێک سەردانی ئەو شارەی کردووە و دواجاریش لە سالی ٦٠٤ک/١٢٠٧ز[٨٣] سەردانی هەولێری کردووەو، لەسالی ٦٢٢ک/١٢٢٥ز لە شەنگال کۆچی دوایی کردووە.

لەزانایانی (نەحو) ش، زۆریان سەردانی هەولێریان کردووە، لەوانە ئەبا حەفس مەجدەدین عومەر کوڕی ئەحمەد کوڕی ئەبی بەکر کوڕی ئەحمەد کوڕی مەهران عێراقی زەریر، کە یەکێک لە گەورە زانا داهێنەرەکانی زانستی نەحوە[٨٤]. کە لەسەر دەستی مەکی کوڕی رەیان ماکینی، کە ئەویش هاتووە بۆ هەولێر دەرچووە. لەسالی ٦١٣ک/١٢١٦ز کۆچی دوایی کردووە[٨٥]. هەر لە زانایانی نەحو ئەبو نزار کوڕی ئەبی حەسەن سافی کوڕی عەبدوللا کوڕی نزار کوڕی ئەبی حەسەن نەحوییە، کە نازناوی (ملك النجاة) ی پێبەخشراوە[٨٦]. هاتنی بۆ هەولێر بەماوەیەک بووە پێش مێژووی ئەتابیگی لەو شارە. ناوبراو لەتەمەنی هەشتا سالی، سالی ٥٦٨ک/١١٧٢ز کۆچی دوایی کردووە. یەکێک لەو زانانەحویانەی کەبۆ ماوەیەکی درێژخایەن لەهەولێر ماوەتەوە ئەبو حەسەن فەخرەدین عەلی کوڕی بکمەش کوڕی مزان کوڕی عەبدوللا تورکی بەغدادییە. دەستێکی بالای هەبوو لەوانەوتنەوەی ئەدەب و نەحو. کتێبێکیشی لەسەر هۆنراوەزانی داناوە[٨٧]. هەر لە گەورە زانایانی نەحو ئەبو حەزم سائینەدین مەکی کوڕی رەیان کوڕی شەبیە کوڕی سالح ماکینی موسلی یە[٨٨]، لە ئیبن مستەوفی لە (تاریخ اربیل) باسی دەکات. ئەبو حەزەم تا ساتەکانی ژیانی لەموسل ماوەتەوە و لەسالی ٦٠٣ک/١٢٠٦ز کۆچی دوایی کردووە[٨٩].

**سێیەم: بنەماڵە زانستییەکانی هەولێر لەو ماوەیەدا**

لە دەرئەنجامی ئەوەی کە دامودەزگاکانی فێرکردن هەبوون و ئەو گەورە کەسایەتیانەی ناویان لە پێشەوە هات سەردانی هەلێریان کردبێ، هەڵبەتە زۆر بنەماڵەی زانستی تێدا هەڵکەوتوە، کە زۆر لە رۆڵەو نەوەکانیان بە کەسانی رۆشنبیر ناسراون. وەک بنەماڵەی ئیبن خەلەکان- ئیبن مستەوفی- ئیبن مەنعە- بنەماڵەی شێخ خدر کوڕی نەسیر و....بنەماڵەی دیکە[٩٠].

بۆیە تیشک دەخەینە سەر هەندێ لایەنی رۆشنبیری، کە ئەو شارە تیایدا گوزەر کردووە و گۆڕاوە و بووە بە بنکەیەک لە بنکەکانی رۆشنبیری گرنگی ئەو سەردەمە. ژمارەیەک زانایی لە بوارە جیاجیاکانی مەعریفی وەک: (فەرموودە- فەقیە- تەفسیر- نەحو-شیعر) تیایدا هەڵکەوتووە.

سەرنج دەدەین زانستە گوێزراوەکان (ئاینی- ئەدەبی- زمانەوانی هتد) بەزۆری لەو شارە دیراسەتی لەسەرکراو، لەکاتێکدا دیراسەتی ئەقلی (ژیری) وەک (حیساب- پزیشک- کیمیا....هتد) و هەروەها زانستی گەردوون و فەلسەفە تیایدا نەخوێندراوە و ئەوسا بەلایدا نەچوون. تەنیا لە حالەتی دەگمەن نەبێ، کە هیچ سەرکەوتنێکی لەسەر تۆمارنەکراوە. وادیارە هەولەکان تەمەن کورت بوونە، کە موفەقەدین کوڕی محەمەد کوڕی یوسف کوڕی محەمەد کوڕی قاعید هەولێری کاری تێدا کردووە، لەزانستە سەرەتاییەکانی ئیقلیدس[٩١] و مەجستی[٩٢]، کە ئەو زانستانەیان بەلاوە ناوەو خۆیان بە دیراسەتکردنی ئەدەب و نەحو سەرقال کردووە[٩٣].

سەرنج دەدەین ئەو بە لاوەنانە لەسەر ئەوانەش کتومت. جێبەجێ دەبێت، کە هاتوون بۆ هەولێر، تەنیا کەمێکیان نەبێت، کە کاریان لە مەسەلە زانستییەکان کردووە، لەوانە موهەزەبەدین کوڕی حاجب دیەشقیە[٩٤]. کە وانەی پزیشکی وتۆتەوەو زانستی حسابی زۆر باش زانیوە و ئاشناش بووە بە بابەتی ئەندازە. پاشان هاتووە بۆ هەولێر و لەگەل ئەبی شوجاع فەخرەدین محەمەد کوڕی عەلی کوڕی شوعەیب ناسراو بە ئیبن دەهان حاسب بەغدادی، کە لە سالی ٥٩٠ک/١١٩٤ز[٩٥] کۆچی دوایی کردووە، کە ئەوسا لە هەولێر بووە[٩٦] کۆبۆتەوە و (زیج)[٩٧] پێ بووە، کە ئیبن دەهانی حاسب بەخۆی دروستیکرد بوو. وانەی بە موهەزەبەدین کردووە و بە وردی و بەباشی فێری خوێندنەوەی زیجی کردووە[٩٨]. سەرچاوەکان لەوە زیاتر هیچ چالاکییەکی دیکەیان باس نەکردووە، کە کوڕی دەهانی حاسب لە

هەولێر ئەنجامی دابێ.

هەروەها شێخ ئەبو عومەر ئەسیرەدین موفوزەل کوڕی موفوزەل ئەبهەری لەساڵی ٦٢٥ک/١٢٢٨ز سەردانی هەولێری کردووە. ئەو شێخە لە خانەی مزەفەریە دابەزیوە. ئیبن خەلەکان یەکێکە لە قوتابییەکانی[٩٩].

بەڵام بەناوبانگترین خانەوادەزان، کە لەو میرنشینە دەرکەوتبوون ئەمانەن:

*** بنەماڵەی ئیبن خەلەکان[١٠٠]:**

ئەو بنەماڵەیە ژمارەیەکی زۆر لە فوقەها و قازی و وانەبێژی تیادا هەڵکەوت و زۆربەشیان لەماوەی میرنشینی هەولێر بوون. فەقیە ئەبو عەبدوڵلا محەمەد بەهائەدین کوڕی ئیبراهیم کوڕی ئەبی بەکر کوڕی خەلەکان هەولێرییە[١٠١] کە دەکاتە باوکی مێژوونوسی ناسراو قازی شەمسەدین ئەحمەد فەرمانڕەوای کتێبی (وفیات الاعیان). لەسنوری ساڵی ٥٥٧ک/١١٦٢ز لەشاری هەولێر لەدایک بووە[١٠٢]. تا تەمەنی لاویەتی لەو شارە بووە پاشان بەمەبەستی خوێندن چووە بۆ وڵاتی شام و میسر و حیجاز و عێراق. بۆ دواجار گەڕاوەتەوە هەولێر. پلەو پایەی فەقیە بەهائەدین محەمەد ئیبن خەلەکان لەشار ئەوەندە بەرزبۆتەوە لای مزەفەرەدین گۆکبری ڕێزوپایەی تایبەتی هەبووە و بە وانەبێژ لە قوتابخانەی مزەفەرییە دامەزراندووە. هەر لەسەر ئەو کارە مایەوە تا لە شەعبانی ساڵی ٦١٠ک/١٢١٣ز کۆچی دوایی کرد[١٠٣]. هەر لە ڕۆڵەی ئەم بنەماڵەیە فەقیە نەجمەدین ئەبوحەفس عومەر کوڕی ئیبراهیم کوڕی ئەبی بەکر کوڕی خەلەکان برای فەقیهی ناوبراوە، مامی مێژوونووس ئیبن خەلەکانە. شارەزایی لە مەزهەبی ئیمامی شافیعی هەبووە. چووە بۆ مەککەی پیرۆز. لەسەر دەستی ئەبو فەرەج یەحیا کوڕی مەحموود سەقەفی و عەبدولمونعیم کوڕی عەبدوڵلا کوڕی کولەیب ئیجازەی وەرگرتووە. پاشان بە وانە وتنەوە. هەر لەسەر ئەو کارە مایەوە تا لە ڕەمەزانی ساڵی ٦٠٩ک/١٢١٢ز کۆچی دوایی کرد. بەپێی قسەی مونزیری لە گۆڕستانی گشتی نێژراوە[١٠٥].

بەڵام براکەیان روکنەدین ئەبو یەحیا حوسێن کوڕی ئیبراهیم کوڕی ئەبی بەکر ئیبن خەلەکان. سەفدی[١٠٦] دەڵێت لە هەولێر لە ژمارەیەک قوتابخانە وانەی وتۆتەوە. لە مانگی زیلقەعیدی ساڵی ٦٢٣ک/١٢٢٦ز هەر لەو شارە کۆچی دوایی کردووە.

هەر لە نێو بنەماڵەی خەلەکانییەکان، زەهیرەدین جونەید کوڕی عیسا کوڕی ئیبراهیم کوڕی ئەبی بەکر کوڕی خەلەکان دەرکەوت کە لەساڵی ٥٩٣ک/١١٩٧ز لەهەولێر لەدایک بووە و، یەکێک بووە لە فەرمووده زاناکان و لە ساڵی٦٦٥ک/١٢٦٧ز لە دیمەشق کۆچی دوایی کردووە[١٠٧]. هەروەها قازی ئەبوبەکر شبلی کوڕی جونەید کوڕی ئیبراهیم دەرکەوتووە، کە لەساڵی ٥٧٦ک/١١٨٠ز لەهەولێر لە دایک بووە[١٠٨]. هەر لە بنەماڵی خەلەکانییەکان ئەبو عەبدوڵلا بەهائەدین محەمەد کوڕی محەمەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی ئەبی بەکر کوڕی خەلەکان، برای مێژوونووس شەمسەدین ئەحمەد (ئیبن خەلەکان) پەیدا بوو، کە ئەویش یەکێک بوو لە فەرموودەزاناکان لە ساڵی ٦٠٣ک/١٢٠٦ز لەهەولێر لەدایک بووە[١٠٩].

لە هەمووویان بەناوبانگتر مێژوونووس شەمسەدین ئەحمەد کوڕی محەمەد کوڕی ئیبراهیم خاوەنی کتێبی (وفیات الاعیان وانباء الزمان مما ثبت بالنقل او السماع او اثبته العیان)ە، هەر وەک خودی خۆی بۆ کەمالەدین ئیبن شعار باسی کردووە لە هەولێر لە دایک بووە[١١٠]. وادیارە ئیبن خەلەکان کە شاری هەولێری جێهێشتووە بە ڕەزامەندی مزەفەرەدین گۆکبری بووە.ئیبن خەلەکان لەم بارەیەوە دەڵێت: سوڵتانی وڵاتەکەمان شای پایە بەرز مزەفەرەدین گۆگبری نوسراوێکی بۆ قازی ئەبی مەحاسین یوسف کوڕی شەداد ناردو تیایدا رایسپارد، کە چاودێری ئەو فەقیهیە لاوە بکات. قازیش بەرێزەوە مامەڵەی لەگەڵ کردووە و لە قوتابخانەی خۆی دایمەزراندووە. وادیارە دەرچوونی ئیبن خەلەکان لە هەولێر کۆتایی بە دوو ماهی ئەو بنەماڵە ڕۆشنبیرییە بهێنێت[١١٢].

هەر لە گەورە کەسایەتییە زانایە بەرزەکان، کە لەو سەردەمەدا لە هەولێر بەدەرکەوتبێت ئەبو بەرەکات موبارەک ناسراو بە شەرەفەدین ئیبن مستەوفی هەولێری، لەمانگی شەوالی ساڵی ٥٦٤ک/١١٦٩ز[١١٣]

لە قەلات لە دایک بووە و ئەدیب و مێژوونوسە. لەو شارە پێگەیشتووەو لە قوتابخانەکانی خوێندوویەتی و لە بنەماڵەیەکی رۆشنبیرە. باپیری باوکی بەوە بەناوبانگ بووە، کە کاری وەرگرتن و کۆکردنەوەی ئەو میرنشینەی لەپێش سەردەمی ئەتابیگەکان پێی سپێردراوە. هەروەها مامەکەشی ئەبو حەسەن سەفیەدین عەلی موبارەک، کە کتێبی (نصيحة الملوك) هی ئیمام ئەبی حامید محەمەد غەزالی لەزمانی فارسییەوە وەرگێڕاوە بۆ سەر زمانی عەرەبی[١١٤]، ئەو پۆستە بەویش سپێردرا.

ئەبو بەرەکات موبارەک خاوەنی کەسایەتییەکی رۆشنبیری جۆراوجۆر بووە. بەلام زیاتر بە مێژوونووسی هەولێر ناوبانگی دەرکردووە. کتێبێکی بەناوی (تاريخ اربيل) داناوە و لە سێ بەرگ پێکهاتووە[١١٦]. لەبواری زمانەوانی و ئەدەبیشدا ئەبو بەرەکات کتێبی (النظام في شرح شعر المتنبي وابي تمام) داناوە و لە (١٢) بەرگ پێکهاتووە، هەروەها کتێبی (اثبات المحصل في نسبة ابيات المفصل)[١١٧] لە تویێ دوو بەرگدا داناوە، کە باس لەو دێرە شیعریانە دەکات، کە زەمەخشەری[١١٨] لە کتێبی (المفص في النحو) و، ئیبن مستەوفی لە کتێبی (سحر الصنيمه) کتێبەکەی دیکە بە ناوی (ابا قماش) هێناوە یاتییەوە[١١٩]. وێڕای ئەوە قوتابییەکەی ناوی هەندێ کتێبی دیکەی بردووە، کە ئەبو موبارەک داناوە وەک کتێبی (الممنع والمزمن) و (الخيل) و(جامع الاوراق) و(قناعة الناحر و كفاية المحاضر). هەروەها کتێبی (مشارق الانوار و مطالع العذار)[١٢٠]، وێڕای دیوانێکی شیعری[١٢١]. دەربارەی رۆشنبیری ئەو نووسەرە گەورە ئیبن خەلەکان دەڵێت: شارەزایی لە ژمارەیەک لە زانستەکان هەبووە و زانستی فەرمووده- ناوی راویەکان و سەرجەم ئەو هونەرانەی پەیوەندیدارن بە فەرموودە. لەپاڵ ئەوەش کاراو لێزان بووە لە هونەری ئەدەب و زمانەوانی و هۆنراوەزانی و بەیان و شیعر[١٢٢]. یاقوت حەمەویش کە لە سەردەمی ئەو ژیاوە و سەردانی هەولێری کردووە و لەگەڵی کۆبۆتەوە دەڵێت: بەراستی نووسەرێکی پایەبەرز بووە، خۆشەویستی خەڵکەکەی بووە، خۆش مەشرەف بووە، زۆر لەو زانایانەی هاتوونەتە هەولێر گوێیان بۆ قسەکانی ئەو شلکردووە[١٢٣].

ئیبن مستەوفی پۆستی وەزارەتی هەولێری لەسەردەمی ئەتابیگە پێی سپێردراوە[١٢٤]. بەلام ئارەزووی نەبووە لە دوای مزەفەرەدین گۆگبری کە لە ساڵی ٦٣٠ک/١٢٣٣ز کۆچی دوایی کرد بەردەوام بێ لەسەر کارەکەی و وازی لە ژیانی سیاسی هێنا. کاتێ سوپای موستەنسر لەپاش مردنی مزەفەرەدین دەستی بەسەر هەولێردا گرت و بەغدا داوای لە ئیبن مستەوفی کرد لەسەر پۆستەکەی بەردەوام بێت و ببێتە جێگیری میر شەمسەدین باتکین کوڕی عەبدوڵلا روحی، کە لە بەغداوە نێردرا بوو فەرمانڕەوایی هەولێر بکات. لە بەرامبەر ئەوە مووچەیەکی زۆر باشی پێبدرێ، بەلام ئیبن مستەوفی بەتوندی داواکەی بەغدای رەتکردۆتەوە بەبیانووی ئەوەی بەهۆی پیرییەوە[١٢٥] بۆ ئەو کارە دەست نادات و بۆی وا باشترە لەماڵەکەی بمێنێتەوە، هەروەک ئیبن شەعار دەڵێت.

کاتێ مەگۆلەکان لەساڵی ٦٣٤ک/ ١٢٣٧ز گەمارۆی شاری هەولێریان دا ئیبن مستەوفی لە قەلات لەگەڵ مانگرتووەکان بوو. جا کاتێ ئەو بارگرژییە رەوییەوە، بەدرەدین لوئلوئەی فەرمانڕەوای موسڵ داوایکرد و وشتر و کەروباری بۆ نارد تاوەکو کەلوپەلەکانی بگوازنەوە، ئەوە بوو شاری هەولێری جێهێشتو بەرەو موسڵ کەوتە رێ، بەدرەدین لوئلوئە بەرێزەوە پێشوازی لێکرد و لە خانوویێک، کە تایبەت بۆ ئەوی ئامادە کرد بوو دابیەزاند[١٢٦]. تەواوی ژیانی خۆی لەم شارە بەسەر برد تا لە ساڵی ٦٣٧ک/١٢٣٩ز کۆچی دوایی کردو لە گۆڕستانی سابلە نێژرا[١٢٧].

بنەماڵەی (ئیبن مەنعە)ش یەکێکن لەو بنەماڵانەی بەدەنگوسەدای زانستی فەقیهی و زانستەکانی دیکەو وانەبێژی ناسراون. ئەو بنەماڵەیە نەک تەنیا لە هەولێر یاخود لەموسڵ، بەڵکو لەسەر ئاستی جیهانی ئیسلامی جێ شوێنی خۆیان کردۆتەوە و ناسراون.

یەکەم کەس کەلەو بنەماڵەیە ناوبانگی دەرکردبێت، رەزیەدین یونس کوڕی محەمەد کوردی مەنعە کوڕی سەعد کوڕی عاسم هەولێری

بووە، باوکی هەردوو شێخی گەورە ئەبی حامد عیمادودین محەمەد و ئەبی فەتح کەمالەدین موسایە. رەزیەدین لەشاری هەولێر لە ساڵی ٥٠٨ک/ ١١١٤ز لەدایکبووە، پاشان بە مەبەستی خوێندن هەولێری جێهێشتووە و چۆتە موسڵ و بەغدا. پاشان بۆ وانەبێژی گەڕاوەتەوە هەولێر و لەلایەن جێگری ئەتابیگ زەینەدین عەلی کوچک (دامەزرێنەری ئەتابیگەی هەولێر) پێشوازی گەورەی لێکراوە. رەزیەدین لەسەر کاری وانەبێژی و فەتواو مونازەرە مایەوە تا لەساڵی ٥٧٦ک/ ١١٨٠ز کۆچی دوایی کردووە[١٢٨].

بەڵام کوڕە گەورەی ئەبو حامید، کە لە ساڵی ٥٣٥ک/ ١١٤٠ز لەقەڵاتی هەولێر لەدایک بووە، ناوبانگی نەبوو تا لە هەولێر دەرنەچوو، پاشان لە سەردەمی خۆی بوو بەیەکێ لەگەورە پیاوانی فیقیهناس، ئیبن خەلەکان دەڵێت: ئەبو حامید لە مەزەب و ئوسول ئیمامی سەردەمی خۆی بووە. زۆر کتێبی لەسەر مەزەب داناوە، لەوانە (المحيط في الجمع بين و المذهب و الوسيط)، کتێبی (الوجيز)ی غەزالی شەرح و راڤە کردووە.

بۆ دواجار ئەبو حامید دەگەڕێتەوە هەولێری زێدی خۆی، بەڵام نازانرێ بۆ ماوەی چەند ماوەتەوە و چ کارەی کردووە. ئیبن خەلەکان دەڵێت: ئەو فەقیهە رۆژێکیان ئەو خانووە بچووکەی، کە لە قەڵات تیایدا لە دایک ببوو بەسەرکردەوە و ئەم دێرە شیعرەی وتووە:

**بلاد بهـا نيطت علي تمائمي**
**واول ارض مس جلدي ترابها**[١٢٩]

پاشان گەڕاوەتەوە موسڵ و لەوێ لە ساڵی ٦٠٨ک/ ١٢١١ز کۆچی دوایی کردووە[١٣٠].

بەڵام کوڕی دووەمی ئەبو فەتح کەمالەدین موسا لە هەموویان زیاتر ناوبانگی دەرکرد و بەیەکێ لە گەورە پیاوانی بیرمەند و حیسابزان و گەردوونناس لە مێژووی ئیسلامی دەژمێردرێت. پلەو پایەیەکی زۆر گەورە و بەرزی لە هەولێر هەبووە. هیچ پەیوەندییەکی رۆشنبیری راستەوخۆ لەنێوان ئەو و ئەو شارە نەبووە.چونکە لە ساڵی ٥٥١ک/١١٥٦ز لە موسڵ لە دایک بووە و هەر لەو شارەش لە ساڵی ٦٣٩ک/١٢٤١ز کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی بنەماڵەکەی نێژراوە[١٣١]. ئیبن خەلەکان دەڵێت زانایەکی ئەوەندە پڕ لە زانست بووە کەس وەکو ئەو زاناو شارەزا نەبووە. شارەزای تەواوی لە بیست و چوار زانست و هونەر هەبووە. کاتێ ئیبن خەلەکان لە رێگاوە دەبێت بەرەو حەلەب لە رەمەزانی ساڵی ٦٢٦/ ١٢٢٩ ز چاوی بەو زانا گەورەیە دەکەوێت[١٣٢] ئەو زانا بەرزە لە شاری هەولێر لە قوتابخانەی مزەفەریە دەست بە وانە وتنەوە دەکات و تا ساڵی ٦١٧ک/ ١٢٢٠ ز لە هەولێر خەریکی وانە وتنەوە دەبێت. پاشان دەگوازرێتەوە بۆ موسل، لەوێش سەرقاڵی وانە بێژی دەبێت تا ساڵی ٦٢٢ ک/ ١٢٢٥ ز کۆچی دوایی دەکات. هەروەها ئەبو عەباس خدری کوڕی نەسر کوڕی عەقیل کوڕی نەسر هەولێری، کە فەقیهێکی شافعییە و لە ساڵی ٤٧٨ک/ ١٠٨٥ ز[١٣٣] لە هەولێر لە دایکبووە، یەکێکە لەو کەسایەتییە ناسراوە رۆشنبیرانەی مێژووی ئەو شارەیە. کاتێ تەمەنی دەگاتە لاویەتی دەچێتە بەغداو لەوێ لە لای هەراس[١٣٤] و ئیبن شاش[١٣٥] دەخوێنێت. دواتر دەگەڕێتەوە شوێنی زێدی خۆی و سەرقاڵی وانە بێژی دەبێت. ئەبو مەنسور سرفتکین زەبنی جێگری زەینەدین عەلی کوچک لە ساڵی ٥٥٣ ک/ ١١٣٨ ز قوتابخانەی قەڵاتی بۆ دروست دەکات. ئەبو عەباس خدر یەکەم کەس بووە، کە وانەی لەو قوتابخانەیە وتبێتەوە. وانەی مەزەب و فەرائیزی گوتۆتەوە[١٣٦] کتێبێکی هەیەو تیایدا بیست و شەش وتاری پێغەمبەری مەزن محەمەد (د.خ) کۆکردۆتەوە. بۆ ماوەیەک هەولێری جێهێشتووە، پاشان گەڕاوەتەوە شارەکەی و تیایدا ماوەتەوە تا ساڵی ٥٦٧ ک/ ١١٧١ ز کۆچی دوایی کردووە، لە قوتابخانە کۆنەکەی، کە بە ناوی ئەو ناونرا (قوتابخانەی عەقیلی) نێژراوە[١٣٧]، لە خوارەوەی قەڵات.

کاتێ ئەبو عەباس خدر کۆچی دوایی کردووە، برازاکەی ئەبو قاسم عیزەدین نەسر کوڕی عەقیل کوڕی نەسر، کە لە سەر دەستی مامەکەی پێگەیشتبوو شوێنی ئەوی گرتەوە. عیزەدین نەسر چووە بۆ بەغداد لە قەتابخانەی نیزامی خوێندوویەتی، دواتر گەڕاوەتەوە هەولێر و تیایدا وانەی وتۆتەوە. تا سنووری ساڵی ٦٠٢ک/ ١٢٠٥ز لەسەر ئەم کارە

ماوەتەوە[138]. کاتێ مزەفەرەدین گۆگبری لێی توورە دەبێ و لە هەولێر دەری دەکات، دەچێتە موسڵ و تاکۆچی دوایی دەکات و لەساڵی ٦١٩ک/١٢٢٢ز لەو شارە دەمێنێتەوە[139].

لە فەرموودەزانەکانیش کە لە هەولێر بەناوبانگ بوون، شێخ ئەبو عەباس ئەحمەد کوڕی عوسمان کوڕی ئەبی عەلی کوڕی مەهدی کوردی زرزارییە، کەبەمەبەستی داواکردن و گوێبیستی فەرموودە چەندین شوێن گەڕاوە، لەوانە بەغدا و ئەسفەهان و هەرات[140] و خۆراسان و کرمان[141]. دواتر گەڕاوەتەوە هەولێر و دەستی بەوانە وتنەوەی فەرموودە کردووە، لەساڵی ٥٩١ک/١١٩٥ز کۆچی دوایی کردووە[142]، لە دەرەوەی شار بەلای رۆژهەلاتدا نێژراوە و ئێستا گۆڕستانەکە بە ناوی ئەو ناودەبرێت بە گۆڕستانی (زاهید ئەحمەد زرزاری).

هەر لە فەرموودە زانەکان، ئەبو فەزل ئەلیاس کوڕی جامع کوڕی عەلی هەولێرییە، کە لەساڵی ٥٥١ک/١١٥٦ز لەدایک بووە. لەپاش تەمەنی (٢١) ساڵی هەولێر جێ دەهێڵێ بە مەبەستی گەڕان بە دوای فەرموودەدا و دەچێتە بەغدا[143]. پاش ئەوەی چاوی بەچەندین زانا دەکەوێت و دەبێت بە فەقیهو فەرموودەزانێکی باش و زانیارییەکی تەواو کۆدەکاتەوە[144]، دەگەڕێتەوە هەولێر و دەست بەوانە وتنەوە دەکات و ژمارەیەکی زۆر لە فەرموودە کۆ دەکاتەوە[145]. بەلام وادیارە ئەبو فەزل بایەخی زۆری بەمێژوداوە[146]. ئەبو فەزل ئەلیاس لە ساڵی ٦٠١ک/١٢٠٤ز کۆچی دوایی دەکات و لە دەرەوەی شار لە نزیک گۆڕستانی زاهید ئەحمەد زرزاری دەنێژرێت[147].

لەبواری فیقهو نەحوشدا، ئەبا سەعید محەمەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوڵلا کوڕی ئەحمەد کوڕی جابر گاوانی[148] هەولێری حیللیە. سیوتی لە ئیبن مستەوفی دەگوازێتەوە و دەڵێت: ئەبا سەعید پێشەوا و زانا بووە لە زانستی نەحو و فیقهدا، زۆر کتێبی داناوە[149]. لەوانە (شرح المقاحات)- کتێبی (الذخيرة لاهل البيرة)،(بيان الشرح الكلمات)، (المنتظم في سلوك الادوات)، هەروەها (عيون الشعر) و (الفرق بين الراء والغين)[150].

بۆ ماوەیەکی درێژ خایەن لە هەولێر ماوەتەوە، پاشان جێی هێشتووە و چووەتە وڵاتی فارس. دواتر گەڕاوەتەوە هەولێر و لە ساڵی ٥٦١ ک / ١١٦٥ ز لە خەفتیان کۆچی دوایی کردووە. واتە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی موجاهیدودین قایماز، کە لە هەولێر بووە. پاشان تەرمەکەی گوازراوەتەوە بۆ بوازیج[151] تاوەکو لەوێ بنێژرێ.

شایانی ئاماژە پێکردنە هەر لەو سەردەمەدا ژمارەیەک نووسەر لە هەولێر، کە زۆربەیان لە بواری رۆشنبیری کاریان کردووە گەیشتوونەتە ئاستێکی زۆر بەرز لە بوارە جیا جیاکاندا، بە تایبەت لە بواری شیعردا. بۆیە وا چاکە باس لەوانەش بکرێت.

ئەبو یەحیا حوسامەدین عیسا کوڕی سەنجەر کوڕی بەهرام کوڕی خەرماتکین کوڕی تاشتکین حاجری هەولێری بە یەکێ لە گەورە شاعیرانی هەولێر دادەنرێت، بە تایبەت لە بواری دڵداریدا. ئەو شاعیرە بە نووسینی شیعری مەوال[152] و چوارینە[153] جیا دەکرێتەوە، هەروەک لە دیوانەکەیدا دەردەکەوێت[154].

ئەو شاعیرە دوو دیوانی هەیە یەکێک بە ناوی (مسارح الغزلان الحاجرية)[155] ئەوی تر بە ناوی (نزهة الناظر وشرح الخاطر)[156]. حاجری و ئیبن خەلەکان دۆستایەتی نێوانیان خۆش بووە[157].

حاجری وا ناسراوە کە زۆربەی تێکستە شیعرییەکانی هۆنیوبەتییەوە وەسفی خاڵ دەکات و دەڵێت:

**يابرق هل ربة الخالين ذاكرة**
**بعد العاد لنا عهدا و ميثاقا**
**واوحشتا لديار دون كاظمة**
**كل الفضاء لعين بعدهم ضاقا**
**قالت فتنت بنا وجدا فقلت لها**
**كم قد فتنت رعاك الله رعشاقا**[158]

مزەفەرەدین گۆگبری ئەو شاعیرەی دەستگیرکردووە، بەلام نەزانراوە هۆکارەکەی چی بووە. لەوانەیە هۆکارەکەی بۆ هەندێ لە تێکستە شیعرییەکانی بگەڕێتەوە، کە بەسەر دڵداری (بەبێ پەردە) ی هۆنیوەتەوە، کە پێی ناسراوە[159]و، شەوێ لەشەوان لە ماڵی ئیبن مستەوفی بە ئەزبەرکراوی بۆیان دەخوێندەوە[160] شایەنی باسە مزەفەرەدین گۆگبری لە ژیانی خۆیدا حەزی بە شاعیران نەکردووە[161]. جا پاش ئەوەی دەستگیرکراوە گوازراوەتەوە بۆ

قەڵاتی خەفتیان و هەر لەو زیندانەدا کۆمەڵە تێکستێکی هۆنیوەتەوە و تێیدا باس لە سکاڵاکەی و ئەو نەخۆشیانە دەکات، کە لە زیندان چەشتوویەتی.

پاش ئەوەی ماودیەک لەو زیندانە دەمێنێتەوە، بەپێی فەرمانی گۆگبری دەگوازرێتەوە بۆ قەڵاتی هەولێر و دواتر ئازادی دەکات، پاش ئەوەی شاعیر خۆی دەگۆڕێت و پۆشاکی سۆفیەت لەبەر دەکات[162]. وەک ئەوەی بۆ ئەوە بوو بێت کە فەرمانڕەوای هەولێر لە خۆرازی بکات، چونکە ئەو ئارەزووی بەلای سۆفیگەریتی دابوو[163].

بەڵام دوای ئەوەی فەرمانڕەوای هەولێر کۆچی دوایی دەکات و هەولێر دەچێتە پاڵ بەغدا، حاجری زۆر تەمەن درێژ نابێت، شەوێ لە شەوان بەدەستی کەسێکی نەناسراو بەچەقۆ لێی دەدرێت و لەکاتی سەرەمەرگدا ئەو تێکستە دەخوێنێتەوە و بۆ میر باتیکنی دەنێرێت، کە ئەوسا لە جیاتی خەلیفە حکومڕانی ئەو میرنشینەی دەکرد:

**اشكوك يامالك البسيطة حاله**
**لم تبق رعبا في عضوا ساكنا**
**ان تستبح ابلي لقيطة معشر**
**ممن اومل غير شك مازنا[164]**
**ومن العجائب كيف يمشي[165] خائف**
**من كان من حرم الخلافة امنا[166]**

ئەم رووداوە لە مانگی شەوالی ساڵی ٦٣٢ک/١٢٣٥ز روویداوەو، حاجریش لە گۆڕستانی مەیدان[167] نێژراوە، کە ئەوسا تەمەنی لە (٥٠) ساڵی تێپەڕ نەدەکرد[168]. حاجری بە نەژاد خەڵکی هەولێرەو هەر لەوێش گەورەبووە و پێگەیشتووە[169].

لەبواری بیرۆکە (ئەدەب و زانست)، کە لە هەولێر ناسراون، ئەبو عەبدوڵڵا موەفەقەدین محەمەد کوڕی یوسف کوڕی محەمەد کوڕی قائد هەولێرییە، کە شاعیر و نەحو زان و وەرزشوان بووە، مێژوونووسەکان بەیەکێ لە زمانزان و گەورە شاعیر ناوی دەبەن، خەڵکی فێری هۆنراوەزانی قافیە کردووە. دەستێکی باڵای هەبووە لە رەخنەی شیعری[170]. دیوانە شیعرێک و ریسالەیەکی هەیە لە ئەدەب[171]. وێڕای ئەوە لە زانستەکانی دیکەش کاری کردووە، وەک ئیقلیدس[172] مەجستی[173].

موەفەقەدین بۆ ماودیەک بەمەبەستی خوێندنی نەحو لەسەر دەستی کەسێکی نابینا کە پێی دەوترا (رافع) چۆتە شارەزوور[174]. پاشان چۆتە دیمەشق و دواتر هاتووە بۆ بەغدا هەر بە مەبەستی خوێندن. موەفەقەدین محەمەد لە وڵاتی بەحرەین لەدایک بووە کاتێ باوکی لەو وڵاتە نیشتەجێ بووە[175]، پاشان خانەوادەکەی گوازراوەتەوە بۆ هەولێر[176] لە.شیعرەکانی کە ستایشی میر زدینەدین یوسف نیالتکینی فەرمانڕەوای هەولێر دەکات، دەڵێت:

**رب دار بالفضا[177] طال بلادها**
**عكف الركب عليها فبكاها**
**درست الا بقايا اسطر**
**سمح الدهر بها ثم محاها**
**كان لي فيها زمان وانقضى**
**فسقي الله زماني وسقاها**
**كنت مشغوفا بكم اذ كنتم**
**شجرا لايبلغ الطير ذراها**

تا دەگاتە ئەوەی دەڵێت:

**ان زي نالدين اولاني يدا**
**لم تدع لي رغبة فيما سواها[178]**

موەفەقەدین بە نەخۆشی سیل لەساڵی ٥٨٥ک/١١٨٩ز لەهەولێر کۆچی دوایی دەکات و لە گۆڕستانی خانەوادەکەی، کە کەوتۆتە بەرامبەر (بەست)[179] دەنێژرێت.

هەر لە شاعیرانی هەولێر ئەبو عز شەمسەدین یوسف کوڕی نەفیس کوڕی ئەبی فەزل کوڕی سەعد کوڕی ئەبی فەزل کوڕی ئەبی تاهیر کوڕی ئەبی بەعلی، کە بە (شەیتانی شام) ناسراوە. لەساڵی ٥٨٦ک/١١٩٠ز لە هەولێر لەدایک بووە هەر لەوێش پێگەیشتووە، وەک شاعیرێکی بە توانا لە هۆنینەوەی شعیر ناوبانگی دەرکردووە[180].

ئەبو عز هەولێری جێهێشتووە و بەشارەکاندا گەڕاوە و ستایشی شاو میرەکانی کردووە و پاداشت و خەڵاتی باشی دەست کەوتووە. پاشان لە موسڵ سەقامگیر دەبێت، لەوێش ناوبانگێکی باش دەردەکات. لەو شیعرانەی، کە لەسەر خەمر و دڵداری هۆنیوەتەوە دەڵێت[181]:

**ورب حانة خمار حلفت بها**
**الا عكفت على جام ولا كاس**
**حتي يقوم لنا ساق لواحظة**
**مرضي وفي خده شطر من الاسى.**

شاعیر (ئەبو عز) لە ساڵی ٦٣٨ک/ ١٢٤٠ز لە موسڵ کۆچی دوایی دەکات و هەر لەوێش دەنێژرێت[183].

جێگەی ئاماژەیە لەو سەردەمەدا

ژمارەیەک شاعیر لە نەسرانییەکان لە هەولێر هەڵکەوتن و بەشێوە زمانی ناوخۆیی خۆیان کە سریالی بوو شیعرەکانیان دەهۆنییەوە و دەنووسی. شتێکی ئاشکرایە ئەو شارە کەوتۆتە ناوچەیەک کە مەسیحییەکانیش ژیانی تێدا دەگوزەرێن جا چ لە ناوچە دەشتاییەکان بێت یاخود لە ناوچە شاخاوییەکان. سەرنج دەدەین مەسیحیەکانی ناوچەی هەولێر لە پێنج چاخی یەکەم لە مێژووی ئیسلامداو بە شێوەیەکی گشتی لەو ماوەیەدا رۆڵی خۆیان وەک پێویست نەبینیوە. بەڵام لە سەرەتای دشەسەندنی ئەو شارە نەسرانییەکان[١٨٤] شانبەشانی کوردەکان کە وەک بەشێک دانیشتوانی هەولێر پێک دەهێنن[١٨٥] لە لایەن هەندێ شایەدە نەسرانییەکانی هەولێر بزاوتێکی ئەدەبی بەرچاو دەرکەوت بۆیە ناوی هەندێ لەو شاعیر و نووسەرانە دێنین وەک:

شاعیر ئارامی، گیورگیس وەردا هەولێری. دەربارەی مێژووی لە دایک بوون یا مردنی هیچ شتێ نازانرێ، بەڵام واپێدەچێ لە کۆتاییەکانی سەدەی شانزەهەمی کۆچی (دوانزەی زایینی) لە هەولێر لە دایک بووبێ (١٨٦١) هەروەک لە چوارینەکانی دەردەکەوێت کە باس لەو رووداوانە دەکات، کە لەنێوان ٦١٢ و ٦٢٢ک/ ١٢٢٤-١٢٢٥ز روویداون. هەر لە تێکستە شیعرییەکانیدا باس لە هەڵمەتەکانی مەگۆن دەکات بۆ وڵاتی جەزیرە و عێراق وەک شایەت عەیانێک[١٨٧].

شاعیر گیورگیس دیوانێی گەوردی شیعری هەیە[١٨٨] و ژمارەیەک بابەتی تیایدا وروژاندووە وەک رووداوی ساڵی ٦٣٤ک/ ١٢٣٧ز کە مەگۆلەکان گەمارۆی هەولێریاندا، هەروەها باس لەو کارە بەربەریانە دەکات کە سەربازەکان لە ماوەی ئەو گەمارۆیەدا بەسەر شارەکەیان هێنا[١٨٩] لە لایەکی دیکە دیوانەکەی پڕە لە رەوانبێژی و وشە رەنگینی کە ئەمەش وای کردووە ببێتە سەرچاوەیەکی باشی بۆ دەوڵەمەندکردنی زمانی ئارامی[١٩٠]. زۆرترین وشەش کە بەکاری هێناین لە شیعرەکانی زاراوەی یۆنانی بوونە کە لەو ماوەدا بەکاری هێنانی ئەو شێوە زاراوانە لە نێوان نووسەراندا باوبووە[١٩١]. وێرای ئەوە شاعیر گیورگیس کتێبی گەورەی هەیە بە ناوی (حتە النعیم) کە تیایدا خوێندنەوەی کتێبی (ئینجیل)[١٩٢]ی راڤەکردووە.

شاعیرێکی دیکەی نەسرانی، خەمیس ئیبن قەردامییە (ناسراوە بە خامیس قەردای) و قوتابی شاعیر گیورگیس وەردا هەولێری بووە[١٩٣]. ئەو شاعیرەش ساڵی لەدایکبوون و مردنی نەزانراوە، بەڵام واپێدەچێ لەنیوەی دووەمی سەدەی حەوتی کۆچی (سیانزەی زایینی[١٩٤]) ناوبانگی دەرکردبێ. شایانی ئاماژە پێکردنە وشە (قەدراحی) بە مانای (ئاسینگەر)[١٩٥] دێت. ئەو شاعیرە لە بنەماڵەیەکی رۆشنبیرە و ئەدەبی ئارامی لە شیعرەکانی رەنگ دەداتەوە[١٩٦].

شاعیر دیوانێکی گەورەی هەیە و تەواوی مەبەستە شیعرییەکانی تیایدا لەخۆ گرتووە[١٩٧]. دانەی دەستنووسی ئەو دیوانە بەسەر کتێبخانەکانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا دابەش کراوە[١٩٨].

**سەرچاوەکان:**

١- ابن خلكان ٣ / ٢٧٦.
٢- ن. م ٣ / ١٢٢.
٣- م. سترك، دائرة المعارف الاسلامية ط ١٩٥٩ مطبعة الشعب، مادة اربيل
٤- د. حسن الباشا، الفنون الاسلامية ٣ / ١٠٥٩.
٥- جگە لە مزگەوت نەبێت کە لە دەوری منارەی مزەفەریە دروست کراوە.
٦- ابن خلكان ٢ / ١٢.
7-The encyclop. Of islam, art. Masjid. 1936. V,111.
٨- د محمد اسعد طلس: التربية و القليم في الاسلام، ص ١١٥- د. احمد شلبي، تاريخ التربية الاسلامية ص١٧٦.
و السيوطي، بقية الوعاة ٢ / ٢٧٧
١٠- ابو الحسن ابن سعيد، الغصون اليانعة في شعراء المائة السابعة ص ٧٨
11-The encyclyo elslam. Art masjid. 1936. V,111.
١٢- ابن خلكان ن ٢ / ١٠- الصفدي، مخطوط الوافي بالوفيات ٨ / ١٨.
١٣- دکتۆر ناجی مەعروف دەڵێت: ئەو قوتابخانەیە کەوتۆتە لای چەپی خوارەووی شار. بڕوانە کتێبەکەی (علماء النظاميات و مدارس المشرق الاسلامي).
١٤- ابن عساكر في (تهذيب ابن عساكر) ج٥ ص ١١٦
١٥- ابن خلكان ٢ / ١٠ ط١٩٤٨
١٦- ئەو کتێبە شەرحی کتێبی (المهنب)، کە لەسەر فیقهی ئیمامی شافیعیەو هی ئیمام ئیسحاق ئیبراهیم کوڕی

محەمەد شیرازییە، کە لە ساڵی ٤٧٦ ک / ١٠٨٣ ز کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: حاجي خليفة، كشف الظنون، ٢ / ١٩١٢- اسماعيل البغدادي، هدية العارفين، ١ / ٦٥٤
١٧- ابن خلكان ٢ (٤٠٧ ط١٩٤٨)- السبكي، طبقات الشافعية، ط المنيبة ١٤٣/٥- الاسنوي، طبقات الشافعية ١ / ١٢٧- ابن قاضي شهبة مخطوط (طبقات- الشافعية) ورقة (٢٠ أ)-السيوطي: حسن المحاضرة ١ / ٤٠٨
١٨- ابن خلكان ٢ / ١٢- الاسنوي ١ / ١٢١.
١٩- فەقیە خدر لە قوتابخانەکەی لە خوارووی قەڵات نێژراوە، واتە بەشێک لە قوتابخانەیە گۆڕاوە و بوویتە قەبر لە ژێر گومەزەکەیدا و خەڵک زیارەتی دەکەن. ئیبن خەلەکانیش زۆر سەردانی کردووە (وفيات الاعيان ٢ / ١١.
٢٠- ابن شعار- مخطوط (عقود الجمان) ١٤٣٦- ابن خلكان، وفيات الاعيان ٢ / ١١.
٢١- مەلتیە- شارۆچکەیەکی بەناو بانگە لە وڵاتی رۆم- معجم البلدان ١٩٢/٥.
٢٢- ابن الفوطي، مجمع الاداب، ق١ ج ٤ ص ٦٢٢- ٦٢٣.
٢٣- ابن خلكان ٣ / ٢٤٦.
٢٤- المنذري، التكملة ٤/ ٣٥- الاسنوي، طبقات الشافعية ١ / ٤٩٥.
٢٥- ابن خلكان ٣ / ٢٧٣ ط ١٩٤٨.
٢٦- ف. م ٢ / ٩٢ ژیاننامەی زەینەب دایکی موئەییەد ئەلشعری.
٢٧-المنذري، التكملة لوفيات التقلة ٤ / ٨٠.- ابن خلكان ١/ ٩٠.- الاسنوي، طبقات الشافعية ١ /٤٩٦.
٢٨- وفيات الاعيان ١ / ٩٠.
٢٩- ابن الشعار، مخطوط (عقود الجمان) ط. ترجمة احمد بن عمر بن احمد الكفر عزي.
٣٠- القرش، المنضي المصري في (الجواهر المضية في طبقات الحنفية) ٢ / ١١٢- وللفقية ابي المظفر ترجمة في المنذري، التكملة ٤/ ١٤١.
٣١- القرش، الجواهر المضية في طبقات الحنفية ٢ / ٥.
٣٢- ن. ص. ق زين الدين بن. قاسم قطلوبغا (تاج التراجم في طبقات الحنفية) ص ٥٩.
٣٣- ابن خلكان ٢ / ٩٢.
٣٤- کاتێ ئوم موئەییەد سەردانی هەولێری کرد ئیبن خەلەکان دوو ساڵان بووە. هەروەک دکتۆرئەحمەد شلبی لە کتێبەکەیدا (تاريخ التربية الاسلامية) ط٢ ص ٢٨٨ ئاماژەی بۆ کردووە.
٣٥- ابن خلكان ن. ص. ولام مؤيد، في: المنذري، التكملة ٤ / ٣٦٦- ٣٦٧ وله منها اجازة- الذهبي، البصرة ٥ / ٥٦- الصفدي مخطوط الوافي ١٠٦/٨.
٣٦- ابن الشعار، عقود الجمان، ج١٠ ورقة (٨٠).
٣٧- ابن خلكان ٤ / ٣٩٧.
٣٨- المنذري، التكملة، ط ب لرونيو، جلد ٨ ص ٢٦٠٦- ٢٦٠٩- الذهبي، العبر ٥ /١٤٩..
٣٩- ئەردەبیل- شارێکی گەورە و بەناوبانگی ئازربایجانە- ياقوت الحموي، معجم البلدان ١ / ١٤٥
٤٠- ابن الفوطي، مجمع الاداب ج٤، ق٤ ص ٨٧٩.
٤١- ابن قاضي شهبة، مخطوط (طبقات النحاة و اللغويين) ق ١، ورقة ١٢١.
٤٢- ابن خلكان ٤ / ٣٩٧.
٤٣- بڕوانە رۆڵی فێرکردن کە خانەقایەکان لە ئیسلام بینیویتیان. دکتۆر محەمەد ئەسعەد تەلس لە کتێبەکەیدا (التربية والتعليم في الاسلام) بە ناونیشانی (دەزگاکانی دیکەی فێرکردن) ل ١١٠- ١١٢.
٤٤- ئیبن خەلەف تەبریزی خانەقا بەوە دەناسێت، کە سۆفیگەران و شێخەکان بەندایەتیان تیادا کردووە و کاتەکانی خۆیان تیایدا بەسەر دەبرد. بڕوانە: (برهان قاطع) ل ٤١٦- وتاج العروس ٦ / ٣٤٠.
٤٥- ابن الفوطي، تلخيص مجمع الاداب أ- ب- ج٤، ق ٤ ص ٦٢٣.
٤٦- عبدالرزاق المعان، نظرة عابرة في شمال العراق ص٥٨.
٤٧- عباس العزاوي، مقال (أل بكتكين، امارة اربيل في عهدهم) المنشور في جملة (المجمع العلمي العربي) دمشق مجلة ٢٢ ص ١٣٩.
٤٨- ابن خلكان ٣ / ٢٧٢.
٤٩- بڕوانە: السبكي (طبقات الشافعية الكبري) گ ١٩٦٦، ٤ / ٣١٣- ٣١٤
٥٠- ابن الجوزي، المنظم ٩ / ٦٦.
The En Cyclop. Of islam, v. iii. Cl. R. 1936, p.350
٥١- ابن خلكان ٣ / ٢٧٢.
٥٢- ابن خلكان ١٢٢/٣- بڕوانە عن وردة اربيل: ن. م ٢٧٥/٣- واليونيني: ديل مرأة الزمان ٢ /٤٢٢- والمكي الفاسي، العقد الثمين ٧/ ١٠٥- وابن عزيبة ٣٠٢- الذهبي، تذكرة الحفاظ ص ١٤٢٠- السيوطي، حسن المحاضرة ط١٩٦٧، ٣٥٥/١.
٥٣- ابن الشعار، مخطوط (عقود الجمان) ج٩، ترجمة يحي بن سليمان بن شا وول.
٥٤- اليونيني، ذيل مرأة الزمان ٣٠٥/٢- الصفدي، الوافي ط٢ ١٩٦٢، ١ / ٢٠٨.
٥٥- ابن الشعار، مخطوط (عقود الجمان) ٥ / ٢٥٥-٢٥٦.
٥٦- ن. م، ج٩، سيرة نصرالله بن يوسف.
٥٧-ن. م، ج٧ سيرة محمد بن علي بن عبدالله بن عمر.
٥٨- ابن خلكان ١ / ٢١٥ ط١٩٦٨.

٥٩- بڕوانە عباس العزاوي، التعريف بالمؤرخين: ٧٥.
٦٠- اليونيني، ذيل مرأة الزمان، ١ / ٣٣- وانظر الغساني، العسجد المسبوك، بالنيو، ٥٢٨- ٥٢٩
ئیبن فوتی لە (تلخيص مجمع الاداب) ج٤ ق٣ ل ٥٧٣ دەڵێت: ئیبن شعار کتێبێکی تری هەیە بە ناوی (تحفة الكبراء) و هەروەها ناویشی دەبردرێت بە (تحفة الوزراء) بڕوانە: ن. م. ص١٠- بەڵام یونینی ناوی کتێبێکی تریئیبن شعار دێنێت بە ناوی (قلائد النوايد) بڕوانە (ذيل مرأة الزمان ١ /٣٣٤.
٦١- زیانەدین نەسرەڵڵا وێڕای ئەوەی زۆر شیعری ئەز بەر بووە، زۆر کتێبی داناوە، وەک (الوشي المرقوم في حل المنظوم)، (المثل السائر في ادب الكاتب و الشاعر)، (المعاني المخترعة في صناعة الانشاء)، (الجامع الكبير في صناعة المنظوم من الكلام المنثور) لەگەل ژمارەیەک نامە.. بڕوانە کتێبی (رسائل ابن الاثير) تحقيق انيس المقدسي.
٦٢- ابن خلكان ٥ / ٣٢
٦٣- ابي فتح ضياء الدين نصرالله ترجمة في: ابن الشعار، عقود الجمان ج٩ سيرة نصرالله بن ابي الكرم المنذري، التكلمة، بالرونيو ٨ / ١٦٤٣- الصابوني، تكلمة اكمال الاكمال ص ٤- ٥.
٦٤- قەزئوغلی، وشەیەکی تورکییە واتە کوڕی کچ (نەوە)
٦٥- ابن خلكان ٣ / ١٤٣ ط بيروت- وله ترجمة في (تاج التراجم في طبقات الحنفية) ص ٨٣
٦٦- وەرگێڕدراوی ئەم زانانەمان دەست ناکەوێ.
٦٧- اليونيني، ذيل مرأة الزمان ٢ / ٤٠١
٦٨- ابن الساعي، الجامع المنتصر ٩/ ٢٩٣- ٢٩٤
٦٩- المنذري: التكملة بالرونية ٨ / ٢٦٠٨- ٢٦٠٩- وله ترجمة في: الذهبي، العبر ٥ / ١٤٩ وفي (تذكرة الحفاظ) يذكر سنة وفاته بروانه: ص ١٤٢٩- و مثله يفعل ابن تعري بردي في (النجوم الزاهرة) ٦ / ٢٣٤ وله ترجمة ايضا في (شذرات الذهب ٥ / ١٨٠
٧٠- شێخ عومەر سەهرەوردی هاتووە بۆ هەولێر و لە دیوانی خەلیفی دانیشتنێکی گرێداوە و ئامۆژگاری خەلکی کردووە، لەوکاتەدا ئیبن خەلەکان بچووک بووە. (وفيات الاعيان ٣/٤٤٦ ط١٩٧٢- و انظر القزويني، البلاد ص٤٩٣ لە ساڵی ٦٣٢ ک / ١٢٣٥ کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی (شێخ عومەر) نێژراوە، کە ئێستا بەو ناوە لە بەغدا ناسراوە.
٧١- المنذري، التكملة ٤ / ٦٦- ٦٧ و ٧ / ١٣٩٢ بالرونيو، السبكي، طبقات الشافعية الكبري ط١٩٧١ ج٨ ص٣١٢. وعن ورودة لاربيل انظر ابن الرجب في كتاب (الذيل علي طبقات المنابلة) ج٢ ص١٨٢
٧٢- ابن خلكان ن. م. ص. و انظر ما كتبة بشار عواد معروف في هامش كتاب المنزري، التكملة ٤ / ٦٦-٦٧ لە کتێبی (التقييد)ی وەرگرتووە. ، لابن نقطة ورقة ١٦٤.
٧٣- ابن رجب، الذيل علي طبقات المنابلة ٢ / ١٨٢- و انظر ابن العماد في شذرات الذهب ٥ / ١٣٣- و لابن نقطة ترجمة في المنذري، التكملة بالرونيو ب / ١٣٩٢- الذهبي، العبر ٥ / ١١٧- و تذكرة الخطاظ ٤ / ١٤١٢- ١٤١٤- الصفدي، الوافي ٣ / ٢٦٧- ٢٦٨
٧٤- کاتێ هاتە هەولێر موجاهیددین قایماز حاکمی هەولێر بوو، بەڵام دواتر کە هەولێری جێهێشت و گەڕایەوە موسل زینەدین یوسف نیالتکین لە شوێنی قایماز حاکم بوو، لە دوای ئەویش مزدەفەرەددین گۆکبری.
٧٥- المنذري، التكملة، بالرونيو ٧/ ١٣٠٨
٧٦-ابن خلكان / ٤ /٢٨ ط ١٩٤٨- الذهبي، تذكرة الحفاظ ٤ / ١٤١٦
٧٧- الذهبي، المختصر المحتاج ٢ / ١١٤
٧٨- المنذري ٧ / ١٣٠٧- الذهبي ن. م. ص
٧٩- ابن خلكان ٢/ ٣٩٢- الذهبي، المختصر المحتاج ١/ ١٥٨
٨٠- ابن الرجب، الذيل علي طبقات المنابلة ط١٩٥٢، ٢ / ٢٦٨- ابن العماد، شذرات الذهب ٥ / ٢٨٨ (ئەبو عەباس مەجدەددین لە ساڵی ٦٥٧ ک / ١٢٥٩ ز، کۆچی دوایی کردووە.)
٨١- دراونەپاڵ هۆزی بەرزا لە، کە هۆزێکە لە بەربەر- بڕوانە: الذهبي، العبر ٥ / ١٥١.
٨٢- المنذري، التكملة ٤ / ٨١
٨٣- ابن الشعار، عقود ١ / ٢٥٤- ؛ انظر ابن خلكان ط١٩٦٨ بيروت ٢١٤/١.
٨٤- السيوطي، بقية الوعاة، ٢ / ٢١٦ لە ئیبن مستەوفی گواستۆتەوە.
٨٥- السيوطي ن. م ٢ / ٢١٦
٨٦- ابن خلكان، وقيات الاعيان ٢ / ٩٣ طبيروت، لە ئیبن مستەوفی گواستۆتەوە.
٨٧- انظر ترجمة تاج الدين الكندي في السيوطي، بقية الوعاة ١ / ٥٧٠- ٥٧٣
٨٨- ماکسین؛ شارۆچکەیەکە و کەوتۆتە سەر رووباری خابوور- ابن خلكان ٤ / ٣٦٧- ياقوت، معجم البلدان ٥ / ٤٣
٨٩- ابن الاثير، الكامل ١٢ / ٢٥٨- ابن خلكان ٤ / ٣٦٧- السيوطي ٢/ ٢٦٩.
٩٠- المنذري، التكملة لوفيات النقلة،

بالرونیو، ج٨ ورقة ١٦٢٨

٩١- ئیقلیدس وشتیەکی یۆنانییە و بە عارەبی کراوە بە (کلید) یان (ئیکلیدس) هاتووە، واتە (کلیل)- بڕوانە: تاج العروس ٢ / ٤٧٢- بەڵام حاجی خەلیفە دەڵێت: ئەو وشە ئاوێتەیەو لە (ئیقلی) واتە (کلیل) و (دس) واتە (ڕێژە) پێکهاتووە. واتە کلیلی ئەندازە. بڕوانە (کشف الظنون) ١ / ١٣٧

٩٢- مەجەستی / زانستی گەردوونە یان لێکۆڵینەوەیە لەسەر کۆمەڵەی خۆر بڕوانە: ص ١٦٤٨- ساحیبی (کشف الظنون ٢ / ١٥٩٤) دەڵێت: ئەوە مانای (زانستی دەستە (شێوەیە)، کە لە ڕیساکان دەگەڕێت بۆ ئەوەی بگەنە سەلماندنی ڕەوشەکانی گەردوون و زەوی بە بەلگەی تیر و تەسەلی.

٩٣- السیوطي، بقیة الوعاة ١ / ٢٨٦

٩٤- ئەبی ئەسیبعە دەڵێت: موهەزەبەدین یەکێک بوو لە خزمەتکارانی سەلاحەدین ئەیوبی و لای مایەوە تا لە ساڵی ٥٨٩ ک / ١١٩٣ ز کۆچی دوایی کرد. پاشان چۆتە (حەما) و نزیکەی دوو ساڵ لەوێ ماوەتەوە، هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە، واتە لە ساڵی ٥٩١ ک / مردووە، (عیون الانباء) ٣ / ٢٩٩

٩٥- ئەبو شامە دەڵێت: لە ساڵی ٥٩٢ مردووە. بڕوانە (ذیل الروضتین) ص٩- و ئیبن تغزی بە ووردی مردنی بە دووجار باسکردووە، جارێکیان لە ساڵی ٥٩٠ ک (النجوم الزاهرة ١ / ١٣٦) جارێکی دیکە لە ساڵی ٥٩٢ ک ن. م ٦ / ١٣٩

٩٦- ابن ابي اصیبعة ٣ / ٢٩٨

٩٧- زیج: ئامێرێک بووە بەکار هێنراوە بۆ حیسابکردنی تایبەت بە سووڕانەوەی هەسارەکان لە خولگەی ساڵێکدا. بڕوانە: پەراوێزی کتێبی عیمادودین ئەسفەهانی (جریدة القصر وجریدة العصر) القسم العراقي- ج٢، تحقیق محمد بهجت الاثري، مطبعة المجمع العلمي العراقي ١٩٦٤ ص٣١٤

٩٨- ابن ابي اصبعة ٣ / ٢٩٨

٩٩- ن. م. ص

١٠٠- خەلەکان ناوی باپیرە گەورەی ئەو بنەماڵە هەولێرییە یە، هەروەک زۆرینەی مێژوونووسەکان لەسەر ئەوە کۆکن، کە خەلەکان باپیرەی چوارەمی (ئیبن خەلەکانە) بڕوانە پێشەکی (وفیات الاعیان) ج٨ ١٩٧١ ج٧ ص١٧

گوندی (خەلەکان) ماوەی چەند ساڵێکە چووەتە سەر ناحیەی سەر بە قەزای ڕانیە لە پارێزگای سلێمانی. بڕوانە وتاری (د. ناجی عەباس) کە بە زمانی کوردی لە گۆڤاری (گەلاوێژ) ٢-١ ساڵی سێیەم ١٩٤٢ ل ١٣ بلاوکراوەتەوە، ئاماژە بە شوێنی ئەو گوندە دەدات. پەراوێزی (٥) و (٦)

١٠١- جیاوازی لەسەر بنەچەی ئەو بنەماڵەیە هەیە، بەلام وا دیارە لە بنەچەدا کوردن- بڕوانە: ابن الشعار: مخطوط (عقود الجمان) ج١ ترجمە احمد بن عبدالرحمن.... ابن خلکان ابن عم المؤرخ- و ابن الصابوني (تکملة اکمال الاکمل) ص٢٣١

١٠٢- المنذري، التکملة ٤/ ٨٠- ٨١- الاسنوي، طبقات الشافعیة ٤٩٦/١

١٠٣- ن. م. ص.: ٨٠- الاسنوي، طبقات الشافعیة ١/ ٤٩٦

١٠٤- المنذري، التکملة ٤ / ٣٥

١٠٥- ن. م.ص. وللفقیة ترجمة في: السبکي، طبقات الشافعیة الکبري، ط المسینیة ٥ / ١٣٠- الاسنوي، طبقات الشافعیة ١ / ٤٩٥

١٠٦- الصفدي ن. م. و.

١٠٧- الیونیني: ذیل مرأة الزمان ٢/ ٣٦٥- احمد بن محمد عبدالرحمان الحسیني، مخطوط (صلة التکملة لوفیات النقلة).

١٠٨- ابن الصابوني، تکملة اکمال الاکمل، ص٢٣١- ٢٣٢ السبکي، طبقات الشافعیة الکبري، ط المسنیة ٥ / ٥٧- الحسیني، مخطوط صلة الحسني، مجلة ٢ ورقة ١١٦

١٠٩- الصفدي، الوافي بالوفیات ط١٩٦٢، ج١ ص٢٠٣- ٢٠٤- جورجی زەیدان دەڵێت: کتێبێک لە کتێبخانەی (ئیکسفۆرد) هەیە و ناوی (التاریخ الاکبر فی طبقات العلماء و اخبارهم)ە دەدرێتە پال (بەهائەدین محەمەد کوڕی خەلەکان، کە لە ساڵی ٦٨٣ ک مردووە) بڕوانە کتێبی (تاریخ اداب اللغة العربیة)، ج ٣ ص١٧٤

١١٠- ابن الشعار، عقود الجمان ج١، ترجمة احمد بن محمد بن ابراهیم ابن خلکان.

١١١- گەر یەکێ لە براکانی هاوڕێیەتی کردبێ، ئەوا لەوانەیە بەهائەدین محەمەدی ناوبراو بوو بێ.

١١٢- حەلەبی جێهێشتووە و دواتر چۆوەتە قاهیرە، واتە لە کۆتایی ساڵی ٦٣٥ ک/ ١٢٣٨ز (وفیات الاعیان) ٩٧/٦ ئەو شار و ئەم شاری کردووە تا لە دیمەشق لە کۆتایی ساڵی ٦٨١ک / ١٢٨١ ز کۆچی دوایی دەکات. زۆر لە مێژوونووسەکان باسیان لە ژیاننامەی کردووە، هەندێک لەوانە: الصدي، الوافي بالوفیات ٣٠٨/٧- الیافعي، مرأة الجنان ٤/ ١٩٣-١٩٧- النعیمي الدارس في التاریخ المدارس ١٩١/١- ١٩٣.

١١٣- المنذري، التکملة، بالرونیو ٨ / ١٦٢٨- ابن خلکان ٣ / ٢٩٨- ابن ابي عذیبة، انسان الصیون ص٣٠٩- السوطي، بقیة الوعاة ٢ / ٢٧٢

١١٤- ابن خلکان ٣ / ٢٩٨

١١٥- بڕوانە (الوافي بالوفیات) ١ / ٢٨٦- کشف الظنون في اساس الکتب و الفنون، مجلة ٢ ص١٩٢٣- حاجي خلیفة.

١١٦- ابن خلکان ٣ / ٢٩٤- السیوطي، بقیة الوعاة ٢ / ٢٧٢- گاش کبری زادة، مفتاح السعادة ١ /

٢٦٩- ابن العماد الحنبلي، شذرات الذهب ٥ / ١٨٧- الخوا نساري، روضات النبات ٦٥٧
١١٧- قەتلویغا دەڵێت: حەسەن کوڕی محەمەد کوڕی حەسەن کوڕی حەیدەر، کە لە ساڵی ٦٥٠ ک / ١٢٥٠ ز لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە، کتێبێکی هەیە بە ناوی (شرح البيات مفضل) بڕوانە (تاج التراجم في طبقات الحنفية) ص٢٤
١١٨- الزفخشري، صاحب كتب (الكشاف) في التغير و (الحاجات المأسائل) و (الفائق) في الحديث و (اساس البلاغة) و (المفصل في النحو). وفيات الاعيان ٤/ ٢٥٤ ط١٩٤٨
١١٩- ابن خلكان ٣ / ٢٩٤- اليافي، مرأة الجنان ٤ / ٩٥- ٩٦- ابن ابي عذيبة، انسان الصيون ٣١٠- السيوطي، بقية الوعاة ٢ / ٢٧٢- ابن العماد، شذرات الذهب ٥ / ١٨٧ الخوانساري، روضات النبات ص ٦٥٧.
١٢٠- ابن الشعار، عقود الجمان، ج٦ ترجمة ابي البركات المبارك.
١٢١- المنذري، التكملة، بالرونيو ٨ / ١٦٢٨- ابن خلكان، ٣ / ٢٩٤ ط١٩٤٨، الذهبي، العبر ٥ / ١٥٦- ابن ابي عذيبة، انسان الصيون ٣١٠
١٢٢- ن. م. ص
١٢٣- ياقوت الحموي، معجم البلدان ١ / ١٣٨
١٢٤- بڕوانە بابەتی وەزارەت
١٢٥- ابن الشعار، عقود الجمان ج١ ترجمة ابي البركات المبارك.
١٢٦- ن. م.
١٢٧- ابن خلكا ن٣ / ٢٩٨ ط١٩٤٨
١٢٨- ابن خلكان ٦ / ٣٥٢- الاسنوي- طبقات الشافعية ٢ / ٥٦٩
١٢٩- ئەو دێرە شیعرە هی شاعیر روقاع کوڕی قەیس ئەسەدییە بڕوانە: ابن منظور (لسان العرب) ٧ / ٤١٨

١٣٠- ن. م. ص. ولهذا الفقية ترجمة في كثير من الكتبي منها: سبط ابن الجوزي، مرأة الزمان ٨ /٥٥٨- ٥٥٩- المنذري، التكملة ٣ / ٣٦٨ ابو شامة، ذيل الروضتين ص٨٠- الذهبي، العبر ٥ / ٢٨- والمختصر، المحتاج اليه ١ / ١٦٢ ابن الوردي، تاريخ ابن الوردي ٢ / ١٨٧- الصفدي ٥ / ٢٩٢- ابن قاضي شهبة، مخطوط (طبقات الشافعية) ورقة ٢١- ٢٢
١٣١- ابن خلكان ٤ / ٤٠١
١٣٢- ابن خلكان ٤ / ٣٩٧
١٣٣- ابن عساكر، التاريخ الكبير (تهذيب ابن عساكر) ٥ / ١٦٦- ابن خلكان، ٢ / ١١ ط١٩٤٨
١٣٤- ابن خلكان ٢ / ٤٤٨ ط١٩٤٨
١٣٥- ن. م. ٣ / ٣٥٦
١٣٦- ابن عساكر، ن. م. ص- ابن خلكا ن: ن. ص
١٣٧- ابن خلكان ٢ /١١- و لهذا الفقية ترجمة في: السبكي، طبقات الشافعية ٤ / ٢١٨- الاسنوي، طبقات الشافعية ١ / ١١٨- الصفدي، مخطوط الوافي بالوفيات ٨ / ١٨- ابن كثير، البداية و النهاية ١٢ / ٢٨٧
١٣٨- بەم شێوەیە ئیبن خەلەکان باسی کردووە. بڕوانە: وفيات الاعيان ٢/ ١١ ط ١٩٤٨- بەڵام ناسنەوی دەڵێت: تا پاش ساڵی ٦٠٠ ک / ١٢٠٣ ز هەر لەسەر کاری موفتیایەتی و وانە بێژی لە هەولێر مایەوە، بڕوانە طبقات الشافعيه ١/ ١٢١
١٣٩- هەمان سەرچاوەکانی پێشوو.. وله ترجمة في السبكي، طبقات الشافعية الكبري ٥ / ١٦٣- ابن العماد، شذرات الذهب ٥ / ٨٦
١٤٠- ابن البرشي الواسطي (ت ٦٣٧ ه / ١٢٣٩ م) مخطوط (التاريخ المذيل به علي تاريخ بغداد لابي سعد السمعاني) نسخة مصورة بالفوتستات مجلد ٢ ورقة ٦٠- المنذري، التكملة ١ / ٤٢٦
١٤١- ابن البريشي: ن. م. ص
١٤٢- هەمان سەرچاوە و لاپەڕەکانی پێشوو.
١٤٣- ن. م ٢ / ورقة ١٢٧- ابن الشعار، عقود الجمان، ترجمة الياس بن جامع ج ١ لە ئیبن مستەوفی وەرگرتووە.
١٤٤- ابن البريشي، تاريخ المذيل: ن. و
١٤٥- ن. م. ص- ابن الساعي، الجامع المختصر ٩ / ١٦٥- ابن الشعار، عقود الجمان ج ١ ترجمة الياس بن جامع المنذري، التكملة ٣ / ٩٥- الذهبي، المختصر المحتاج ١ / ٢٦٠- الاسنوي، طبقات الشافعية ١ / ١٢٦
١٤٦- ابن كثير ن. م. ص
١٤٧- ابن البريشي، التاريخ المذيل: ن. ح- ابن الشعار، عقود الجمان: ن. ح
١٤٨- پەیوەندی بە بنەماڵەی (گاوانی) کوردییەوە هەیە. بڕوانە وتاری دکتۆر مستەفا جەواد، کە لەژێر ناونیشانی (جاوان الفيلية الكردية) لە گۆڤاری (المجمع العلمي العراقي) مجلد ٤ ج١- ١٩٥٦ ل ٨٤- ١٢١ بڵاوکراوەتەوە.
١٤٩- السيوطي، بقية الوعاة ١ / ١٨٢
١٥٠- الصفدي، الوافي ٤ / ١٥٥- الاسنوي، طبقات الشافعية ١ / ٣٦٧ الخوا نساري روضات المنبات ٥٠٤
١٥١- السيوطي: ن. ص- بەوازیخ / شارۆچکەیەکە لە نزیک تكريت- ياقوت الحموي، معجم البلدان
١٥٢- شێوە ئاوازێکە
١٥٣- بڕیتییە لە دێری شیعر لەبەر ئەوەی بە فارسی پێی دەوترێت (دوبی). بڕوانە (تاريخ الادب في ايران من الفردوسي الى الشيرازي) ض٤٨- هەروەها بڕوانە: عیززەدین ئەمین (نظرية الفن المتجدد) ص ١١
١٥٤- ئیبن خەلەکان دەڵێت: ئەو دیوانە،

دیوانه شیعرێکی بەناوبانگه و کەوتۆتە دوست زۆرینەی خەڵک (وفیات الاعیان) ٣ / ١٧٠- بروانە (النجوم الزاهرة ٦ / ٢٩٠- لە کتێبخانەی مۆزەخانەی عێراقی لە بەغدا دانەیەک لە دیوانی بچووکی ئەو شاعیرە هەیە کە بەرواری چاپی لەسەر دیاری نەکراوە و هاو کات هەموو تێکستە شیعریەکانیشی تیایا نیە.- جورجی زەیدان دەڵێت دیوانی حاجری لە میسر لە ساڵی ١٣٠٥ ک چاپکراوە. بروانە: (تاریخ اداب اللغة العربیة) ٣ / ٢٥- هەروەها بروانە: القیس سلیمان صائغ (تاریخ الوصل ٢ / ١٠٧- ئیسماعیل بەغدادیش ئەو دیوانەی بە (بلبل الغرام الكاشف عن لثام الانسجام) ناو بردووە، بروانە: (هدية العارفين) ١ / ٨٠٩

١٥٥- جورجی زەیدان لە (تاریخ اداب اللغه العربیه ٣ / ٢٥) دا دەڵێت: ئەو دیوانە دەستنووسە و لە کتێبخانەی هندی لە لەندەنە. هەروەها بروانە: القس سلیمان صائغ في (تاریخ الموصل ٢ / ١٠٧- وخیر الدین الترکلي، الاعلام (قاموس التراجم ط ٢ ص٢٨٧

١٥٦- دەستنووسە هەروەک زەرگەلی دەڵێت لە (الاعلام ن. ص..

١٥٧- ابن خلكان ٣ / ١٦٩

١٥٨- ديوان الحاجري ص٢٢ و انظر عن الابيات التي نظمها في الحال: بهاءالدين علي ابو الحسن الاربيلي، رسالة الطيف، ص ٦٦

١٥٩- جرجي زيدان، تاريخ اداب اللغة العربية ٣ / ٢٥

١٦٠- اليونيني، ذيل مرأة الزمان ١ / ١١٣

١٦١- ابن خلكان ٣ / ٢٧٦

١٦٢- ن. م. ص.

١٦٣- ن. م. ٣ / ٢٧٦

١٦٤- ناماژە بەو دێرە شیعرە دەدات:

لو كنت من مازن لم تستبح ابلي اللقيطة من ذهل بن شيبان

١٦٥- كيف لمبي في ط ١٩٧٠ من وفيات الاعيان.

١٦٦- ابن خلكان ٣ / ١٧١- و في عقود (الجمان) بعض الاختلاف بذكر ابن الشعار هذا البيت كلاتي:

**يا للعجائب كيف يصبح خائفا**
**من كان في حرم الخلاقة قاطنا**

١٦٧- لەوانەیە مەبەست لەو گۆرستانە، ئەو گۆرستانە بێت کە کەوتۆتە پشت یانەی فەرمانبەران. ئیبن خەلەکان دەڵێت مەیدان لەلای خانەقا و نزیکبوو لە دەرگای قەلات بروانە: (وفيات الاعيان ٣ / ٢٧٤

١٦٨- ابن خلكان ٣ / ١٧١- عەبدوللا جبوری لە ساڵی مردنی حاجری ٦٣٤ ک- هەڵەی کردووە بروانە (رسالة الطبق) ج ١ ص٦٦ الهامش

١٦٩- ابن خلكان ٣ / ١٧٢

١٧٠- ابن خلكان ٤ / ١٠٢- ابو الغداء، المختصر ٣ / ٧٧- السيوطي، بقية الوعاة ١ / ٢٨٦

١٧١- ابن خلكان ن. ص

١٧٢- ١٧٣ / دەربارەی (ئیکیدس) و (مجستي) بروانە پەراوێزی پێشوو ٩١-٩٢

١٧٤- ن. م. ص

١٧٥- ابن خلكان ٤ / ١٠٣- ابو الغداء، المختصر ٣ / ٧٧- السيوطي ن. م. ص ابن قاضي شهبة، مخطوط (طبقات النحاة واللغوين) ورقة ١٣٣

١٧٦- ابن خلكان و السيوطي ن. ص.

١٧٧- (رب الدار بالشما) في ابي الغداء: المختصر ٣ / ٧٧

١٧٨- ابن خلكان ن. م. ص. ابو الغداء: ن. ص

١٧٩- ابن خلكان ٤ / ١٠٤- ولموقف الدين محمد وەرگێرانی هەروەها لە: الصفدي ٥ / ٢٥١- بن ابي عذيبة، انسان الصيون ٢٢٣-٢٢٦، ابن العماد، الحنيلي، شذرات الذهب ٤ / ٢٨٤

١٨٠- ابن الشعار، عقود الجمان ١٠ / ٢٦٤ أ

١٨١- ن. م. ورقة ٢٦٥

١٨٢- ابن خلكان ٣ / ٢٩٨

١٨٣- ن. م. ٢٦٤- ابن خلكان ن. ص.

١٨٤- توما اسقف المرح كتاب (الرؤساء) ص ١١٠ هامش ٢

١٨٥- م. سترك، دائرة المعارف الاسلامية ط١٩٣٣، ١ / ٥٧٤- ئیبن حەوقەل لە درێژەی قسەکانیدا لەسەر شاری کەفەر عەزی کە ناوچەیەکە لە هەولێر دەڵێت: ئەو ناوچەیە ئەسرانییەکانی تیایدا نیشتەجێ بوون، لە دەوروبەرەکەشی حاڵتشین کورد بوون- بروانە (صورة الارض) ص١٩٦

١٨٦- القس سليمان صائغ، حقال (كيوركيس ورد الاربيل، شاعير العذاء) في جملة (النجم) الوصية، العدد ٩ لسنة ١٩٣٧ ص٣٢١- ونفس الكتاب في كتابة (تاريخ الموصل ٢ / ١١١

١٨٧- مجلة النجم ن. م

١٨٨- لەو دیوانەش ژمارەیەک دەستنوس لە کتێبخانەکانی زۆژهەلات و رۆژئاوا هەن. بروانە (القس سليمان صائغ) في (تاريخ الموصل) ن. م- ورفائيل بابو اسحاق، تاريخ نصاري العراق ص٩٤.

١٨٩- بابو اسحاق ن. م. ص

١٩٠- مجلة النجم ص ٣٢١

١٩١- القس، تاريخ الموصل ن. م

١٩٢- بطرس النصري- ذخيرة الاذهان ٢ / ٢٣

١٩٣- القس ن،م،ص.

١٩٤- ن،م،ص- رفائيل ابو اسحق ص ٩٤.

١٩٥- القس ن،م،ص ١١١-١١٢.

١٩٦- ن،م،ص ١١٢.

١٩٧- بطرس النصري ن،م،ص.

١٩٨- هەمان سەرچاوە و لاپەرەکانی پێشوو.

# دامەزراوە فێرکارییەکانی هەولێر
## (سەدەی شەشەم تا نیوەی سەدەی حەوتەمی کۆچی)

**دکتۆر ئومێد ئیبراهیم جۆزەلی**
**کۆلیژی ئاداب - زانکۆی سەلاحەددین**

**پێشەکی**

گەشەسەندنی بواری زانستی لەهەولێر بەتایبەتی لەسەدەی شەشەم تا نیوەی سەدەی حەوتەمی کۆچی، بووە هۆی پەیدابوونی چەند دامەزراوێکی فێرکردن لەو ناوچەیەدا، کە رۆڵێکی بەرچاویان هەبووە لە بڵاوکردنەوەی زانیاری و رۆشنبیری وپێگەیاندنی چەند زانایێکی بەتوانا.

ئەم دامەزراوانەش دوو جۆر بوون: ئەوەی کەدەوڵەت، واتە میرەکان دروستیان کردبوو بۆ ئەوەی ببێتە شوێنی چالاکیی زانستی کەتیایدا فێرکردن بەخۆرایی بوو. جۆرەکەی تریش بریتی بوو لەوەی کەدەوڵەت واتە میرەکان دەستیان لەدامەزراندنیدا نەبوو، بەڵام لەچاودێری ئەو میرانە بێ بەش نەکرابوو. بۆیە لەپاڵ دامەزراوەکانی جۆری یەکەم ئەوانیش رۆڵێکی ئەوتۆیان بینی لەبەرزکردنەوەی ئاستی رۆشنبیری و زانستی لەم ناوچەیەدا.

تائێستا لەبارەی ئەم دامەزراوانەی هەولێر زۆر نووسراون بەتایبەتی لەبواری پلان و سیماکانی، بەڵام ئێمە لێرەدا گرنگی بەبایەخی زانستی ئەم دامەزراوانە دەدەین. بەتایبەتی لەو ماوەیەی کەلێکۆڵینەوەکەمان پێوەندی پێیەوە هەیە.

**یەکەم: مەکاتیب**

مەکاتیب[1] کۆی (مەکتەب)ە.بە واتای ئەو شوێنانە دێ، کەمنداڵان تێیدا فێری خوێندەواری دەبن[2]، مەکاتیب کۆنترین شوێنی فێرکردنە لەجیهانی ئیسلامی و ناوەکەشی لەفێرکردنی نووسینەوە هاتووە[3].

مەکاتب لەسەردەمی پێغەمبەر (د.خ) و یاران و خەلیفەکانی راشدین هاتە کایەوە[4]. لەشەڕی بەدر، پێغەمبەر (د.خ) داوای لەدیلەکان کرد هەر یەکەیان دە منداڵ فێرە خوێندەواری بکەن، لەبەرامبەر ئەمەدا خۆیان دەکڕنەوەو ئازاد دەکرێن[5].

ئەرکی مەکاتیب دانانی بنەمایێکە بۆ رۆشنبیری قوتابی لەسەرەتای ژیانیدا جگە لەفێربوونی خەت و نووسین، سەرەتا کورتە سوورەتیان لەقورئان بەرێگای تەلقین لەبەر دەکرد[6]. هەندێک لەمەکاتیبەکان قوتابییەکانیانی فێری زمان و حیسابیش دەکرد[7].

شوێنی مەکتەبیش یا ماڵی مامۆستا بوو یان بەخەرجی ئەو خانوویێک بەکرێ دەگیرا، بەڵام لەدواییدا بوو بە بەشێک لەمزگەوت[8].

هەر چەندە مەکاتیب یەکێک بوو لەو قۆناغانەی دەبوایە قوتابی لەسەرەتای ژیانیدا بیبرێت، بەڵام

سەرچاوەکان زانیارییەکی ئەوتۆمان لەبارەی رۆڵی مەکاتیبەکانی هەولێر پێنادەن، "ئیبن شەعار" موسڵی دەڵێت زانا، "سولەیمان کوڕی موزەفەر کوڕی موسا کوڕی مەنسوور ئەبو رەبیع هەولێری" لەهەولێر مامۆستا بووە. ساڵی(٥٦٦ک-١١٧٠ز) لەقەڵا هاتۆتە دنیاوە. قوتابخانەیەکی کردۆتەوەو. منداڵانی فێرکردووە. پیاوێکی دیندارو بەهەیبەت بووەو دەستی شیعر دانانیشی هەبووەو زۆر حەزی لەفێرکردن بووە. دوای ئەوەی پارەو پوولی کۆکردەوە، وازی لەفێرکردن هێناو رووی لەبازرگانی کرد. چەندان قوتابی لەموسڵ و هەولێر لەسەر دەستی ئەم مامۆستایە فێربوون یەکێک لەوانە ئیبن بەرەکات کەمالەدین موبارەک کوڕی ئەبو بەکر کوڕی حەمدان، کەناسراوە بەئیبن شەعار موسڵی ئەدیب و شاعیرو خاوەنی کتێبی "عقود الجمان في شعراء الزمان"ە، لەم بارەیەوە وتوویەتی "لەسەر دەستی مامۆستا فێری خەت بووم، ئەو هەقی باوکایەتی بەسەرمەوە هەیە[٩]. ئەمە بایەخی گرنگی هەیەو بەدیار دەخات هەولێر مەکاتیبی تێدا بووە، بەڵام ژمارەو شوێنەکانیان نازانین

مزگەوت لەسەرەتاوە دەورێکی گەورەی لەدروستبوونی رۆشنبیری و عەقڵیەتی قوتابیدا هەبووە، بەتایبەتی لەمیرنشینی هەولێردا، ئەمەش ئەوە دیار دەخات ناوچەکە کەتائیبی تێدا بووەو یەکەمین دامەزراوی فێرکردن بووە چ لەلایەن موسوڵمانان و چ لەلایەن فەلەکان[١٠] وەکو کەتائیبی حەدیاب.

**دووەم: مزگەوتەکان**

مزگەوت شوێنی سوژدە بردن[١١] و ماڵی ئامۆژگاری و رێنمایی و شوێنی پەرەستن و بەجێهێنانی سرووتی ئاینییە[١٢]. لەسەردەمی پێغەمبەرەوە (د.خ) مزگەوتەکان دامەزراوەی فێرکردن بوون[١٣]، موسوڵمانەکان لەهەر شارێکی ئیسلامی بیریان لە دروستکردنی مزگەوتێک دەکردەوە، ئەمەش گەورەیی ئەرکی مزگەوت لەوڵاتانی ئیسلامی و هەولێر بەڕوونی دیار دەخات[١٤].

گرنگی مزگەوت هەر لەوەدا نەبووە کەشوێنی پەرەستن و نوێژکردن بووە بەڵکو دادگایێک بووە بۆ هەق پرسینەوەو مەیدانی کۆبوونەوەو پێشوازی کردنی رێبواران و میوانان[١٥].

مزگەوت دەورێکی گەورەی لەبڵاوبوونەوەی زانست و زانیاری گێڕاوە، گۆشەکانی لەچەند هەڵقەیەک پێکهاتبوون مامۆستا لەیەکێک لەگۆشەگان دادەنیشت و قوتابیان بەدەوریدا هەڵقەیان دەبەست و هەر هەڵقەیەک جۆرە زانیارییەکیان دەخوێند[١٦] مزگەوتەکان دەوری فێرکردنیان گێڕا تا قوتابخانە سەربەخۆیەکان بەمەبەستی فێرکردن بەجۆرێکی بنەڕەتی هاتنە کایەوە[١٧].

بەهۆی فراوان بوونی رووبەری هەولێر چەندان مزگەوتی تێدا کرایەوە لەمانە:

**١- مزگەوتی قەڵا:**

یاقوت ئەلحەمەوی کاتێک باسی قەڵا دەکات ئاماژە بەوە دەکات، کەمزگەوتێکی تێدایەو نوێژی تیا دەکرێت[١٨]، ئیبنولمستەوفیش لەچەند بابەتێک باسی کردووەو بەمزگەوتی قەڵا ناوی دێنێت[١٩].

ئەو زانیاریانەی بەردەستمان بایی ئەوە ناکەن بزانین کێ و لەچ کاتێک ئەو مزگەوتە دروست کراوە، بەڵام دەتوانین بڵێین کۆنترین مزگەوتی هەولێرە، ئەمیش بە بەڵگەی ئەوەی قەڵا کۆنترین شوێنی خەڵکی هەولێر بووەو بارەگای رەسمی میر بووە[٢٠].

مزگەوتی قەڵا لەبواری بزووتنەوەی زانیاری و فێرکردندا لەنێوان خەڵک دەوری بینیوە، ئەوانەی، کە مشایەخ و دەرس بێژبوون لەو مزگەوتەدا: قازی بیلال کوڕی رەمەزان کوڕی بیلال کوڕی مەلا کوڕی حەسەن، کە لەدەوروبەری هەولێر بووەو زۆر دیندار بووەو کۆڕو مونازەرەی زانستی ساز داوە، کە ئیبن مستەوفی تیایدا ئامادە بووە وەکو خۆی باسی دەکات[٢١].

یەکێکی دیکە لەوانەبێژەکانی ئەو مزگەوتە ئیمام ئەبو موزەفەر موبارەک کوڕی زاهیر کوڕی موبارەک خوزاعی بەغدایی بووە، لەساڵی ٦٠٠ی کۆچی هاتۆتە دنیاوەو لە ١٢٠٣زایینی کۆچی دوایی کردووە، لەمنداڵییەوە لەهەولێر گیرساوەتەوە، فەقیهێکی شافعی و سۆفی بووە، لەمزگەوتی قەڵا قورئانی پیرۆزی وتۆتەوە[٢٢].

ئیبن مستەوفی باسی ئیمامی زاهیر ئەبو حەسەن عەلی کوڕی عومەر کوڕی محەمەد دەکات کە مشایەخ و وانەبێژی مزگەوتی قەڵا بووە، بەڵام

باسی دەورو رۆڵی لەبواری فێرکردن ناکات[٢٣].

وەکو دیارە زۆربەی زانستەکانی سەردەمەکەی لەو مزگەوتەدا خوێندراون، بەتایبەتی زانستی شەریعەت جگە لەزانستی زمان و ئەدەب بەشێوەیەکی سنووردار، مزگەوت لەزۆربەی کاتان، بەتایبەتی رۆژانی هەینی شوێنی خوتبەدان بووە[٢٤].

یەکێک لەخوتبە خوێنەکانی ئەو مزگەوتە ئەبو عومەر عوسمان کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی موحەمەد کوڕی موحەمەد عەلی کوڕی غەیاس ئەربللی بووە، ساڵی ٦٠٨ی کۆچی هاتۆتە دنیاوەو لە ١٢١١ی ز مردووە، شێخێکی خاوەن رەوشت و مەجلیس خۆش و حەز لەئەدەب و شیعر بووە[٢٥].

خوتبە خوێنەکان لەبواری رێنمایی و فێرکردن و ئەدەب دا رۆڵی دیاریان هەبووە. یەکێکی دیکە لەخوتبە خوێنانی ئەو مزگەوتە ئەبو عەبدوڵڵا کوڕی ئیبراهیم کوڕی ئەبی حەسەن عەلی کوڕی محەمەد کوڕی عەلی کوڕی غەیاسە کە لەدەوروبەری سەدەی حەوتی کۆچی (سێزدەی زایینی)دا شارەزا بووەو دەستی شیعریشی هەبووە[٢٦].

## ٢- مزگەوتی پەرگە (المسجد الجامع بالربض)

ئەو مزگەوتە لەپەرگەی شار دروستکراوە کە شوێنەکەی ئێستا منارەی موزەفەریەیە، ئەو مزگەوتە بەدوو قۆناغ دروست کراوە، منارەکەی لەلایەن میر موزەفەرەددین گۆکبوری دروست کراوە، بەڵام مزگەوتەکە پێش سوڵتان موزەفەر دروست کراوە[٢٧].

منارەکە لەسەر شێوەی ئەمەوی دروست کراوە، تا لەگەڵ جۆری بیناسازی مزگەوتەکە بگونجێت[٢٨]، بناغەی مزگەوتێکی کۆنتر لەمنارەکە دۆزرایەوە، کە ئەوە دەسەلمێنێ لەچەرخی ئەمەوی یا عەباسی دروست کراوە[٢٩] و تا ماوەیەکی درەنگیش پاشماوەی مزگەوتەکە هەر مابوو[٣٠].

رایەکی دیکە هەیە دەڵێت ئەو مزگەوتە کۆنە مزگەوتەکەی زەینولعابدین عەلی کچک دامەزرێنەری میرنشینی ئەربلی ئەتابەکیە، کە لەساڵی ٥٦٤ی کۆچی هاتۆتە دنیاوەو لە ١١٦٨ی ز مردووە[٣١].

مشایەخ و وانەبێژی ئەو مزگەوتە جۆرەها زانیاریان وتۆتەوە، زانا ئەبا عەبدوڵڵا محەمەد کوڕی حەسان کوڕی ئەحمەد کوڕی ئەبی قاسم واسیتی کە ساڵی ٥٩٦ک هاتۆتە دنیاوەو لە ١١٩٩ز مردووە یەکێک بووە لەو زانایانە[٣٢] لەو مزگەوتەدا تەنیا تاکە زانیارییەک نەخوێندراوە، شێخ ئەبو سەنا مەحمود کوڕی حوسێن کوڕی عەلی کوڕی حەسەن نەحوی کە بەکوڕی بێوەژن ناسراوەو لەساڵی ٦٠٦ک-١٢٠٩ز مردووە لەموسڵەوە هاتۆتە هەولێرو قورئان و نەحوی فێرە خەڵک کردووە[٣٣].

لەو مزگەوتەدا خوتبە خوێنەکان بەتایبەت لەبواری فێرکردندا دەورێکی گەورەیان هەبووە، لەهەرە دیارەکانیان قازی ئەبو مەحمود کوڕی هەیبەتوڵڵا کەفیەرعەزی بووە[٣٤].

ساڵی(٦٠٤ک- ١٢٠٧ز)، ئەو زاتە لەلایەن سوڵتان موزەفەر کراوە بەخوتبە خوێن، فەقیهێکی شافعی بووەو لەزانستەکانی قورئان و نەحوو ئەندازەو حیساب و زانستی کۆن و نوێ، شارەزا بووە[٣٥].

هەر لەخوتبە خوێنەکانی ئەو مزگەوتە قاسم کوڕی عەبدولسەلام کوڕی موحەمەد کوڕی عەبدولعەزیز ژەنگاری بووە، ساڵی ٦٠٥ک-١٢٠٨ی ز مردووەو لەبنەماڵەیەک بووە زۆربەیان خوتبە خوێن بوون[٣٦].

لەمەوە بۆمان بەدیار دەکەوێت مزگەوتی پەرگە دەورێکی گەورەی لەژیاندنەوەی جۆرەها زانست و ئەومیرنشینەدا هەبووە، ئیبن مستەوفی دەگێڕێتەوە، کەوا باوکی گومبەزێکی گەورەی نزیک کۆنە مزگەوت دروستکردووەو تیایدا لەگەڵ زانایان کۆبۆتەوەو لەگەڵ خۆیدا بردوویەتی بۆ کۆڕەکان[٣٧].

## ٣- مزگەوتی ناولەپ ( پەنجە عەلی- (مسجد الكف)

قەزوینی باسی ئەم مزگەوتەی کردووەو گوتوویەتی: مزگەوتێکی تێدایە ناوی مزگەوتی ناو لەپە، بەردێکی تێدایە پاشماوەی ناو لەپی مرۆڤێکی بەسەرەوەدیە[٣٨].

لەبارەی دروستکەری ئەو مزگەوتە سەرچاوەکان زانیارییەکی ئەوتۆمان پێنادەن، بەڵام بۆی هەیە لەلایەن ئەبو مەنسور سەرفەتکین کوڕی عەبدوڵڵا زەینییەوە کەجێگری زەینەدین عەلی

کچک بووە دروست کرابێت(٣٩).

لەبەر کۆنی تائێستا هیچ پاشماوەیەکی مزگەوتەکە نەماوە، لەسەرەوەی ڕا پارچە بەردێک هەبووە کەنەخشەی ناولەپێکی بەسەرەوە بووەو ئێستا پێی دەڵێن مەرقەدی کەف عەلی "پەنجە عەلی" کەدەکەوێتە خوارووی ڕۆژهەڵاتی قەڵا لەنزیک دەرگای سەرەکی(٤٠).

ئەو مەرقەدە گۆڕی شێخ عەبدولقادر ئەمیری کوڕی بەختیار کوڕی ئەلخەل کوڕی داود کوڕی عەبدوڵڵا ئەبو محەمەد قوتبەدین ئەشتەهیەی تێدایە(٤١).

سالی (٥٨٤ک- ١١٨٨ز) لەهەولێر هاتۆتە دنیاوە، شێخێکی ئەدیب و، حەزی لەزانست بووەو تا مردووە لە(٦٢١ک- ١٢٢٤ز) مەشایخی ئەو مزگەوتەی بەئەستۆوە بووە(٤٢)، پێدەچێت ئەو مزگەوتە لەناوەڕاستی گۆڕستانەکەوە بووبێت واتە گۆڕستانی ناو لەپ(٤٣).

یەکێکی دیکە لەوانەی لەو مزگەوتە وانە بێژبوون شێخ ئەبو زەیدی خۆراسانی سۆفی بووە، زاتێکی چاکەکارو زاهید بووە، لەسنووری ٦٠٠ک- ١٢٠٣ی ز لەشام مردووە، ئەو زاتە لەشام ماوەی حوکمڕانی مەحمود زەنگی بینیوە(٤٤).

یەکێکی دیکە لەو مزگەوتانەی، کە ڕۆڵی لەبووژانەوەو پەرەسەندنی زانیاری و پەروەردە لەهەولێردا بینیوە مزگەوتی دەرزیجانی بووە، کە بەناوی عومەر کوڕی ئەبو بەکر دەرزیجانی ناو دێرکراوە(٤٥). کە لەسنووری سەدەی شەشی کۆچی- دوازدەی زاینییدا مردووەو زاتێکی حەنبەلی مەزهەب و زانا بووەو تاکۆچی دوایی کاروباری مزگەوتەکەی بەڕێوە بردووە(٤٦). مزگەوتێکی دیکە مزگەوتی خەراتین بوو کە کەوتبووە نزیکی بازاڕی خەراتان، یەکێک لەدیارترین ئەو زاتانەی مەشیەخەتی ئەو مزگەوتەیان بەئەستۆوە بووە ئەبولهیجا عەلی کوڕی ئەحمەد کوڕی ئەبی نەسر هاشمی عەباسی بەغدادی بوو، کە بەئیبن خەلیفان ناسراوە، پیاوێکی زانا بووەو سالی ٦١٠ک- ١٢١٣ی.ز لەبەغدا مردووە(٤٧).

مزگەوتی کەفیرعەزەش لەلایەن غەزەنفەر کوڕی ناسرولدەولە دروست کراوە وەکو لەسەر دیوارەکەی نووسراوە(٤٨). لەو زانایانەی مەشیەخەتی ئەو مزگەوتەیان بەئەستۆوە گرتووە ئیبراهیم کوڕی عەلی کوڕی مەحموود کوڕی هیبەتوڵڵا کوڕی ئەحمەد کوڕی یوسف کوڕی ئەبی تالیب کوڕی عەبدولڕەحمان کوڕی عەلی کوڕی ئەبو ئیسحاق کفر عەزەی ئەربلی بووەو لەخانەوادەیەکی ناسراوی شارەزا لەفیقهو ئەدەب و شیعر بووە، سالی (٦٢٠ک- ١٢٢٣ی.ز)مردووە(٤٩).

هەروەها عومەر کوڕی عەلی کوڕی محەمەد ئیبنو موزەفەر یەحیا کوڕی محەمەد ئەبو لفەزل شەیبانی سەرپەرشتیاری مزگەوتەکەی کردووە(٥٠).

هەر لەو مزگەوتانەی کە دەکەونە دەوروبەری کارەکانی ئەربل، مزگەوتی پیاسیدایە، کە گوندێک بووە لەخوارووی هەولێر(٥١) دەڵێن ئەو مزگەوتە ئەبی مەسنوور سەرفتکین کوڕی عەبدوڵڵا زەینی "ت ٥٥٩ک/ ١١٤٣ز" جێگری زەینەدین عەلی کچک لەهەولێر دروستی کردووە، لەو زانایانەی کە لەم مزگەوتەشدا ماونەتەوە وەکو ئیبن مستەوفی بۆمان دەگێڕێتەوە کاتێک سەردانی مزگەوتەکەی کردووەو لەسەر دیوارەکەی نووسراوە "ئەبو عەبدوڵڵا محەمەد کوڕی ئەبی عەبدوڵڵا بەرازیجی لە ٣ی ذی القعدەی ٥٧٦ هاتووە"(٥٢). جگە لەمەش زانا کومی نەردومی کە بەئەسڵ مەغریبی بووە ناوی لەسەر دیوارەکە نووسراوەو ماوەیەک لەمزگەوتەکەدا ماوەتەوە(٥٣).

لەئەمیر ئەبو مەنسوور سەرفتکین دەگێڕنەوە، کە لەهەولێرو گوندەکانی مزگەوتی زۆر دروست کردووە(٥٤).

بەتایبەتی لەگوندی سەوامیع(٥٥) و لەو زانایانەی کە سەردانی سەرفتکینیان کردووەو لەو مزگەوتەدا ماونەتەوە جەعفەر کوڕی تاهیر کوڕی ئەعەز کوڕی مەعەز کوڕی عەزیز ئیبنولموعتەز کوڕی قائیم کوڕی متەوکیل بووە لەنیوەی جەمادو لئولای سالی ٥٤٣ک(٥٦).

مەرقەدی زانا شاهجانی لەو مزگەوتەدا بووە، کە لەدەوروبەری سەدەی شەشەمی کۆچی- دوازدەی میلادی مردووە، ئەو زانایە لەهۆزی شاهجانی کوردییە، کە لەهەولێرو دەوروبەری جێنشین بوون، زاتێکی چاکەخواز بوو، ڕوو بەکەرامات ناسراوەو تامردنی مەشیەخەتی مزگەوتەکەی کردووە(٥٧).

**سێیەم: قوتابخانەکان**

لەهەولێر چەند قوتابخانە پەیدا بوون کە لەبلاوبوونەوەی زانیاری و فێرکردن لەنێوان رۆڵەکانی ئەو میرنشینەدا دەوریان بینیوەو گەشەیان بەبزاڤی زانیاری داوە.

لەو قوتابخانانە زاناکان کاروباری دەرس وتنەوەیان بەئەستۆوە دەگرت و ئازووقەیان بۆ قوتابیان و مامۆستایان تەرخان دەکرد، دوای تەواوکردنی خوێندن ئیجازەیان وەردەگرت، کە دەکاتە بەرامبەر بروانامەی دەرچوونی ئەمڕۆ[58].

سەرەتا قوتابخانەکان سەر بەمزگەوتەکان بوون، بەڵام دوای قەرەباڵغ بوونی مزگەوتەکان و فراوان بوونی هەلقەکانی خوێندن، کە کاریان لەسرووتە ئایینیەکان دەکرد، قوتابخانە لەمزگەوت جیا بکرێتەوەو ببێتە دامەزراوێکی سەربەخۆ[59].

دروستکردنی قوتابخانەکان ئەنجامی رەنگدانەوەی خواست و پێداویستییە کۆمەڵایەتی و عەقڵی و ئایینیەکانی کۆمەڵگای ئیسلامی بوو[60].

دروستکردنی قوتابخانەکان رۆڵی مزگەوتەکانیان کەم نەکردەوە، بەڵکو بەیەکەوە لەفێرکردنی زانیارییە هەمەجۆرەکان دەوریان بینی، بەڵام بە بەراوردکردنی قوتابخانە لەگەڵ مزگەوت، قوتابخانە چەند نیشانەیەکی جیاکەرەوەی هەبوو، لەقوتابخانەدا مامۆستا دادەمەزران کە بەپلەی یەکەم زانا بوون و لەلایەن دامەزراوو سەرپەرشتیاری قوتابخانەکانەوە دەستنیشان دەکران و بەگوێرەی پرۆگرامێکی دیاریکراو دەرسیان دەوتەوە، هەر لەقوتابخانەکان هۆڵی تایبەت بەدەرس وتنەوەو جێگەو رێگای نزیک لەقوتابخانە تەرخان دەکران بۆ ئەو مامۆستاو قوتابیانەی غەریبە بوون، هەروەها ژمارەی ئەو قوتابیانەش دیاری دەکران، کە لەقوتابخانە دەوامیان دەکرد[61]. وای لێهات قوتابخانە بووە شوێنێکی نیزامی و مامۆستاو قوتابی و لایەنە پەیوەندیدارو پسپۆرەکان سەرپەرشتیان دەکردو بەشێوەیەکی رێکوپێک دەرسی تێدا دەوتراوە[62].

لەقوتابخانەدا بۆ هەرشتێک مامۆستایەکی تایبەت و هۆڵێکی تایبەت تەرخان کرابوو، نەدەکرا لەیەک کاتداو لەیەک هۆڵدا هەموو زانستەکان بەیەکەوە بخوێندرێن، هەر لەقوتابخانەکاندا پایەی موعید[63] هاتە کایەوە، ئەمەش ئاستی بالایی و بەرزی رێگای دەرس وتنەوە پیشان دەدات.

نیزامولمولک[64] وەزیری سوڵتان مەلیکشای سەلجووقی، یەکەم کەس نەبوو قوتابخانەی دروست کرد، بەڵکو لەپێش ئەویش دروست کرابوون، بەڵام لەسەردەمی ئەودا قوتابخانەیەکی زۆر دروست کراو زۆربەی میرو سوڵتانەکان[65] لەدروستکردنی قوتابخانەدا چاویان لەو کرد[66].

هەولێر لەبزاڤی رۆشنبیریدا لەجیهانی ئیسلامی دانەبڕا بوو، بەتایبەتی لەرووی زانست و فێربوون و.... چەندان قوتابخانەی تێدابوو:

**١- قوتابخانەی قەڵا:**

بەناوی قوتابخانەی عوقەیلیەش ناسرابوو، نیسبەتەن بۆ ئەبو عەباس نەسر کوڕی عوقەیلی هەولێری "ت ٥٦٧ک- ١١٧١ز"[67]. کەئەبو مەنسور سەرفتکین کوڕی عەبدوڵلا زەینی "٥٩٩ک- ١٢٠٢ز" جێگری زەینەلعابدین عەلی کۆچک دامەزرێنەری میرنشینی هەولێر ئەتابەکی لە "٥٣٢ک- ١١٣٨ز" لەقەڵا بۆی دروستکردو ئەبو عەباس خزر کوڕی عوقەیلی کردە مامۆستا[68]، ئەو زاتە پیاوێکی چاکەکارو زاهیدو[69] شارەزای مەزاهیب و فەرائیزو خیلاف بوو[70] و بۆ زانست هەردەم لەگەڕاندا بوو[71]، چەندان زاناو فوقەها لەسەر دەستی ئەو زاتە[72] پەروەردە بوون، لەوانە ئەبو عومەر زیائەدین عوسمان کوڕی عیسا کوڕی دەرباس هۆزبانی مارانی "ت ٦٠٢ک- ١٢٠٥ز" خاوەنی کتێبی "الأستقصاء لمذاهب الفقها"[73]، هەروەها ئەبو عەباس ئەحمەد کوڕی موحەمەد کوڕی خەلیل کوڕی بەشیر هۆزبانی بەئەسڵ هەولێری لەدەوروبەری سەدەی حەوتی کۆچی- سێزدەی زاییندا مردووە، هەروەها برازایەکی خۆی کەناوی عیزەدین ئەبو قاسم خوزرەین نەسر کوڕی[74] عوقەیلی هەولێری بوو (ت ٦١٩ک- ١٢٢٢ز) لەدوای مردنی مامی لەقوتابخانەی قەڵاو پەرگەی شار دەستی بە دەرس وتنەوە کردو بووە زانایێکی گەورە لەفیقهی شافیعی[75] و چەندان کەسی لەسەر دەست پەروەردە بوو لەوانە ئەبو

محەمەد عەبدولرەحمان کوڕی مەحموود کوڕی عەلی کوڕی ئیبراهیم هەولێری کە لەساڵی( ٥٩٣ک- ١١٩٦ز) کۆچی دوایی کردووە[٧٦].

هەروەها ئەبو محەمەد جەعفەر کوڕی محەمەد کوڕی جەعفەر کوڕی ئەحمەد کوڕی محەمەد کوڕی عەبدولعەزیز عەباسی بەغدادی "ت ٥٩٨-١٢٠١ز"[٧٧] و ئەبو عەباس ئەحمەد کوڕی شوجاع هەولێری "ت ٦٢٩ک- ١٣٢٤ز"[٧٨] بەڵام لە هەموو ئەو زانایانە دیارتر فەقیە شەرەفەدین محەمەدی کوڕی بوو، کە لەجیاتی باوکی دەرسی فیقهی وتۆتەوەو ساڵی "٦٧٣ک- ١٢٣٥ز" لەدیمەشق مردووە[٧٩].

لەو قوتابخانەیەدا هەر بەتەنیا زانایانی هەولێر دەرسیان نەدەوتەوە، بەڵکو زانایانی بیانیشی تێدا بوو لەمانە ئەبو بەکر محەمەد کوڕی عەبدوڵلا کوڕی ئەبو بەکر مەهانی "ت ٦٢٧ک- ١٢٢٩ز" کەخەڵکی ماهان بوو لەوڵاتی رۆژهەڵات و فەقیهی شافیعی مەزەب بوو، ماوەیەک لە قوتابخانەی قەڵا دەرسی وتەوە[٨٠].

لێرەدا رۆڵی ئەم قوتابخانەیەمان لەبواری فێرکردن و خوێندنی زانیارییە هەمەجۆرەکانی بۆ بەدیار دەکەوێت بەتایبەتی فیقە[٨١] جگە لەخوێندنی ئەدەب، خوتبە خوێن ئەبو بەرەکات عەلەمەدین محەمەد کوڕی عەبدولسەلام کوڕی محەمەد کوڕی عەبدولعەزیز هیبەتوڵلا ژەنگاری شارەزای زانستی خیلاف و ئەدەب بوو بەخوتبە خوێن ناوبانگی دەرکردبوو[٨٢] ئەو زانایە لەسوڵتان موزەفەرەدین کۆکبەری زۆر نزیک بوو تا کار گەیشتە ئەو رادەیەی وەکو نوێنەری خۆی رەوانەی بەغدای بکات، ئەو زانایە دوای ئەوەی هەولێری جێهێشت لەمەڵتیە[٨٣] گیرسایەوە تا لە "٦١١ک- ١٢٢٢ز" کۆچی دوایی کرد[٨٤].

**٢- قوتابخانەی لاپەڕ:**

قوتابخانەی خزر کوڕی عوقەیلیشیان پێ وتووە نیسبەتەن بۆ فەقیە ئەبولعەباس خزر عوقەیلی هەولێری "٥٦٧ک- ١١٧٢ز"[٨٥] کە دوای ئەوەی لەبەغدا گەڕایەوە دروستی کردو جگە لەقوتابخانەی قەڵا لێرەش دەرسی دەوتەوە[٨٦].

دوای خۆی برازایەکی عیزەدین ئەبولقاسم دەستی بەدەرس وتنەوە کردووە، کەفەقێیەکی شافیعی مەزەب بوو[٨٧]. کەواتە قوتابخانەی قەڵاو لاپەڕ لەیەک کاتدا دەرسیان تێدا وتراوەتەوەو ئەوەی ئەم قوتابخانەیە جیادەکاتەوە زانا عومەر کوڕی بەشیر کوڕی محەمەد کوڕی خەلیل هەولێری، کە لەساڵی( ٥٧٥ک- ١١٨١ز) مردووەو فەقیهێکی شافیعی مەزەب و زانای زیجاد بووە لەو قوتابخانەیەدا موعید بووە وەکو ئیبن مستەوفی ئاماژەی بۆ کردووە[٨٨].

هەر بەتەنیا زانایەکانی هەولێر لەو قوتابخانەیەدا دەرسیان نەوتۆتەوە، بەڵکو لەشوێنانی دیکەوە زانای بۆ هاتووەو تیایدا ماونەتەوە، ئەبو عەباس ئەحمەد کوڕی نوری مەرندی[٨٩] کە لەسەدەی شەشی کۆچی- دوازدەی زاینیدا مردووە لاوێکی مستەوسیف و کۆک بووەو لەو قوتابخانەیەدا دەرسی وتۆتەوە[٩٠].

هەروەها زانا ئەبوبەکر محەمەد کوڕی عەبدوڵلا کوڕی ئەبو بەکر مەهانی "ت ٦٢٧ک- ١٢٢٩ز" فەقیهی شافیعی لەچەند قوتابخانەیەکی هەولێردا دەرسی وتۆتەوە لەوانە قوتابخانەی لاپەڕ[٩١].

**٣- قوتابخانەی موجاهیدیە:**

ئەو قوتابخانەیە لەلایەن موجاهیدەدین قایماز دووەم جێگری میر زەینەدین عەلی کچک(٩٢) لەهەولێر کە لەساڵی (٥٥٩ک- ١١٦٣ز تا ٥٧١ک- ١١٧٥ز) حوکمی کردووەو پێش ئەوەی بچێتە[٩٣] موسڵ دروستی کردووەو ئیبن خەڵەکان ئاماژەی بەمە کردووە[٩٤].

لەدیارترین ئەو زانایانەی کە لەم قوتابخانەیەدا دەرسیان وتۆتەوە ئەبو جەعفەر عومەر کوڕی ئیبراهیم کوڕی ئەبوبەکر ئیبن خەڵەکانی هەولێری بووە، کە نازناوی نەجمەدین بوو، فەقیهێکی شافیعی بوو و ساڵی ٦٠٩ک- ١٢١٢ز[٩٥]کۆچی دوایی کرد، لەم قوتابخانەیەدا دەرسەکان بەتەنها فیقەو مەزهەبی شافیعی نەبوون، بەڵکو زانیاری نوێش دەخوێندرا.

سەرەرای ئەمەش میر موجاهیدەدین قایماز فیقە لەسەر

مەزەبی ئیمام ئەبی حەنیفە فێر بوو[96]. بۆیە پێدەچێت جگە لەزانستەکانی نویێ ئەدەب، شان بەشانی فیقە لەسەر مەزەبی ئیمامی شافیعی ئەویتریشی خوێندبێت[97].

یەکێکی دیکە لەمامۆستایەکانی ئەو قوتابخانەیە ئەبا فەوارس کوڕی عەبدوللەتیف قەزوێنی بوو، لەساڵی ٥٩٤ک-١١٩٧ز هاتۆتە هەولێرو زانایەکی فیقهی و شاعیرو ئەدیب بوو، سەرەتا بوو بەشێخی- دار الحدیث- و دوایی کرا بەمامۆستای قوتابخانەی موجاهدیە تا لە ٦٠٩ک- ١٢١٢ز کۆچی دوایی کرد[98].

هەر لەشێخەکانی ئەو قوتابخانەیە زانا ئەبوبەکر محەمەد کوڕی ئەبی حامید سۆفی ئەسفەهانییە[99] لەزانایانی حەدیس و تەسەوف بوو، لەمانگی ڕەمەزانی ساڵی ٦٢٣ک هاتۆتە قوتابخانەی موجاهدیە.

**٤- قوتابخانەی موزەفەریە:**

ئەم قوتابخانەیە لەلایەن میر موزەفەرەدین "ت ٦٣٠ک- ١٢٣٢ز" دروست کراوە[100]، قوتابخانەیەکی گەورەی هەولێر بوودو لەسەر هەردوو مەزەبی شافیعی و حەنەفی دەرسی تێدا خوێندراوە، میر فەقیهەکانی هەردوو مەزەبی ڕاسپاردووە تادەرس بڵێنەوەو خۆی سەرپەرشتی کردوون و لە بۆنە ئاینییەکان بەتایبەتی جەژنی لەدایکبوونی پێغەمبەر "د.خ" بەشداری کردووە[101]. ئیبن مستەوفی ئەو قوتابخانەیەی بەقوتابخانەی "قوڕ" یان "فەقیر"[102] ناوبردووە، وێدەچێت قوتابخانەکە لەقوڕ بۆ فەقیر دروست کرابێت. ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەلفەقیر ئەبی سەعید میری هەولێر کە لەشوێنێکی دیکە بەقوتابخانەی موزەفەربە ناوی هاتووە[103].

هەروەها پێدەچێت قوتابخانەی لاپەڕ لەماوەیەکی درەنگدا بەم قوتابخانەیەوە لکێندرابێت و بوو بن بەیەک قوتابخانە[104]. لە بەناوبانگترین زاناکانی ئەو قوتابخانەیە ئەبو عەبدوڵلا محەمەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی ئەبی بەکر کوڕی خەلەکانی هەولێری بوو، لەبنەماڵەیەکی فیقهی و سەر بەمەزەبی ئیمامی شافیعی بوو تامردنی لە ٦١٠ک- ١٢١٣ز لەو قوتابخانەیە دەرسی وتۆتەوە[105].

دوای ئەو ئەبولفەزل ئەحمەد کوڕی کەمالەدین کوڕی مینعە هەولێری فەقیهی شافیعی لەساڵانی ٦١٠ک-١٢١٣ز تا ٦١٧ک-١٢٢٠ز دەرسی وتۆتەوەو دوایی بەمتوەلی چووەتە موسڵ و هەر لەوێ لەساڵی ٦٢٢ک-١٢٢٥ز کۆچی دوایی کردووە[106].

شەمسەدین ئەبولعەباس خەلەکانی هەولێری "ت ٦٨١ک-١٢٨٢ز" لەسەر دەستی ئەودا فیقهی خوێندوەو وەکو خۆی دەڵێت گوێم لەکەس نەبووە وەکو ئەو دەرس بڵێتەوە[107] پێویستە ئاماژەش بەوە بکەین ئەو مێژوونووسە کاتێک باوکی لەقوتابخانەی موزەفەریە دەیخوێند لە ٦٠٨ک-١٢١١ز لەدایک بووە[108].

هەروەها خاتوو دایکی موئەیەد زەینەب کچی ئەبی قاسم نەیساپووری سۆفی ناسراو بەشیعری "ت ٦١٥ک- ١٢١٨ز" کاتێک سەردانی هەولێری کردووە لەم قوتابخانەیەدا خوێندوویەتی[109].

جێگەی باسە ئەم قوتابخانەیە بایەخی بەزانستی شەرعی بەتایبەتی تەسەوف داوە، لەشێخە موتەسەویفەکانی ئەم قوتابخانەیە ئەبو سەعید عەبدولغەفار کوڕی محەمەد کوڕی عەبدولواحید کوڕی عەلی کوڕی موبارەک بوو، کە لە ٦١٥ک-١٢١٨ز کۆچی دوایی کردووە، ئیبن مستەوفی بەشێخی چاکەکار ناوی بردووە[110].

هەروەها لەشێخە شافیعی مەزەبەکانی ئەو قوتابخانەیە قازی ئەبو بەکر محەمەد کوڕی عەبدوڵلا کوڕی ئەبی بەکر مەهانی بوو "ت ٦٢٧ک- ١٢٢٩ز"[111]. هەروەها پێویستە ئاماژەش بەئەبا عەبدوڵلا حوسێن کوڕی ئیبراهیم کوڕی ئەبی بەکر خەلەکانی هەولێری "٦٢٣ک-١٢٢٦ز" بدەین، کە فەقیهێکی شافیعی مەزەب و حەدیس زان بوو لەچەند قوتابخانەیەکی هەولێر دەرسی وتۆتەوە، بەڵام سەرچاوەکان باسی قوتابخانەکان ناکەن[112].

شێخەکانی مەزهەبی حەنەفی بەشێکی زۆری دەرسیان لەم قوتابخانەیەدا بەرکەوتووە، ئەبا موزەفەر موحەمەد کوڕی ئەبی قاسم کوڕی ئەبی شوجاع هەمەدانی، کە لەساڵی ٦١١ک- ١٣١٤ز کوژراوەو هەروەها شێخ ئەبا جەعفەر محەمەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی محەمەد عەلی

کوڕی عەبدولعەزیز رازی، کە لە ٦١٥ک- ١٢١٨ز کۆچی دوایی کردووە، هاتوونەتە هەولێرو لەم قوتابخانەیە دەرسیان وتۆتەوە[١١٣].

هەروەها ئەبا محەمەد ئەحمەد کوڕی عومەر کوڕی ئەبی بەکر شاکر کفر عەزی لەشێخە دیارەکانی ئەم قوتابخانەیە بووەو فەقیهێکی حەنەفی بووە، کاتێک مەغۆلەکان لە ٦٣٤ک-١٢٣٦ز هەولێریان داگیرکرد لەگەڵ کۆمەڵێک زانا، شارەکەیان جێهێشت و ساڵی ٦٣٧ک-١٢٣٩ز لەشام کۆچی دوایی کرد[١١٤].

**چوارەم: ماڵی حەدیس**

ماڵی حەدیس لەو دامەزراوانەیە کە لەفێرکردن و بڵاوکردنەوەی زانیاری لەهەولێردا دەوری خۆی بینیوە، مەبەستی سەرەکی ماڵی حەدیس خوێندنی حەدیسەکانی پێغەمبەر (د.خ) و چۆنیەتی گێڕانەوەیان و هەروەها زانینی ئەو چیرۆک و هەواڵانەی کە پەیوەندیان بەپێغەمبەر (د.خ) هەبووە[١١٥].

ئەو کەسەی ماڵی حەدیسی بەڕێوە دەبرد پێیان دەوت شێخی حەدیس[١١٦].

بەزۆری ماڵی حەدیس شوێنەکەی سەربەخۆ بوو، وەکو ماڵی حەدیس لەهەولێر، کە سوڵتان موزەفەرەدین دروستی کرد، هەروەها ماڵی حەدیسی موهاجیریەو موزەفەریە لەموسڵ[١١٧].

لەماڵی حەدیسدا قوتابیان ژووریان بۆ تەرخان کرابوو، جگە لەشێخەکان، یان ماڵی حەدیس لەمزگەوتێکی گەورەیان لەلایەکی قوتابخانەی بۆ تەرخان دەکرا[١١٨].

نوردەدین مەحموود عیمادەدین زەنگی "ت ٥٦٩ک- ١١٧٣ز" یەکەم کەس بووە لەمێژووی ئیسلامدا لەشاری موسڵ ماڵی حەدیسی دروستکردووەو دوای ئەویش لەهەولێر سوڵتان موزەفەرەدین دروستی کردووە[١١٩].

ماڵی حەدیسی موزەفەریە لەهەولێر ساڵی-٥٩٤ک-١١٩٧ز دروستکراوە و زانا ئەبولفەوارس کوڕی عەبدوللەتیف قەزوینی ساڵی ٦٠٩-١٢١٢ز بووەتە شێخی ئەو ماڵەو یەکەم کەس بووە دەرسی تێدا وتۆتەوە، پیاوەکی زاناو مەزەب زان بووە، لەئاهەنگی کردنەوەی ئەم ماڵەدا سوڵتان موزەفەرەدین زاناو مێژوونووسانی وەک وەزیر شەرەفەدین ئەبو بەرەکات موبارەک کوڕی مستەوفی هەولێری "ت ٦٣٧ک-١٢٣٩ز" تێیدا ئامادە بوون وەکو خۆی گێڕایەتیەوە[١٢٠][١٢١].

وەکو دیار دەکەوێت سوڵتان موزەفەر راوێژی بەئیبن مستەوفی کردووەو هەر بەقسەی ئەو بۆ مەشیەخەتی ماڵی حەدیس ئەبا عەلی حەنبەل کوڕی عەبدوڵلا کوڕی فەرج بەغدادی ساڵی "١٢٠٧"[١٢٢] لەبەغداوە هێنراوەتە هەولێر، شێخێکی خێرخوازی حەنبەلی بوو و لەحەدیس زۆر شارەزا بوو، ئەو زاتە بەیاوەری شێخ عومەر کوڕی موحەمەد کوڕی موعەمەر کوڕی تەبرز بەغدادی "١٢١٠" لەساڵی ١٢٠٥[١٢٣] هاتۆتە هەولێرو لەماڵی حەدیسی موزەفەریە دابەزیوە، زانایەکی بەناوبانگی زانستی حەدیس بووە، لەهەولێر خەڵکێکی زۆری بەدەوره کۆبۆتەوە وەکو ئیبن مستەوفی باسی دەکات[١٢٤].

ئەم دوو شێخە دەورێکی باڵایان لەبووژاندنەوەی زانستی حەدیس لەمیرنشینی هەولێردا هەبووەو چەندان زانایان لەسەر دەستی پەروەردە بوون.

هەر لەمشایەخەکانی ئەو ماڵە ئەبوخەیر کوڕی ئەبی موعەمەر کوڕی ئیسماعیل کوڕی ئەبی نەسر محەمەد کوڕی موعەمەر تەبریزی[١٢٥] بوو کە لەساڵی ٦٣٦ک- ١٢٣٨ز مردووە، زانایەکی ناوداری حەدیس بووەو لەلایەن سوڵتان موزەفەرەوە کراوە بەمشایەخی ئەو ماڵە[١٢٦].

بەم جۆرە ئەو قوتابخانانە بوونە دامەزراوی گرنگ بۆ بڵاوکردنەوەی زانست و زانیاری و بەتەنهاش هەر زانستی حەدیسی تیادا نەدەخوێندرا، بەڵکو جۆرەها زانستی تیادا دەخوێندرا، ئیبن مستەوفی لەزۆر بابەتان باسی ئەو زانایانە دەکات، کە لەو قوتابخانەیە دابەزیون بۆ بەدەست هێنانی زانست یادەرسیان وتۆتەوە[١٢٧].

ئەو ماڵانە گەشەیان سەند تا بوونە پەناگەی ئەو فوقەهاو زانایانەی کە روویان لەهەولێر دەکرد، جگە لەبەجێهێنانی ئەرکی وەعزو رێنمایی[١٢٨].

لەو زانستانەی کە لەو ماڵانەدا دەخوێندران زانستی قورئان و نەحوو

بوو. موحەمەد کوڕی ئەبی وەفا ئەحمەد کوڕی ئەبی تاهیرو ئەبو عەبدوللا موسلّی ناسراو بە ئیبن قەبیزی "ت ٦٣٦ک- ١٢٣٣ز" لەزانایانی قورئان و نەحوو بوون و لەو ماڵەدا دەرسی حەدیسیان وتۆتەوە جگە لەقورئانی پیرۆز[١٢٩].

یەکێک لەو زانا هەرە دیارانەی کە لەو ماڵەدا دەرسیان وتۆتەوە- ئیبن خەلەکان باسی دەکات- شێخ ئەبو عومەر ئەسیرەدین موفەزەل ئەبهەری خاوەنی تەعلیقە بوو و لە "خیلاف و زیج"[١٣٠] زۆر زانا بوو. ساڵی ٦٢٥ک- ١٢٢٧ز هاتۆتە هەولێرو چەند قوتابییەکی لەسەر دەست پەروەردە بووە لەمانە مێژوونووسی بەناوبانگ شەمسەدین ئەبو عەباس کوڕی خەلەکانی هەولێری ١٢٨١[١٣١].

**پێنجەم: رابیتەو خانەقاکان**

**ریبات: لەئەسڵدا بەوە دەوترێ کە ولاخی بەرزەی پێ دەبەستنەوە، هەروەها بەو کەلوپەلانە وتراوە کەلەکاتی جیهاد لەپێناوی خوادا موسوڵمانان بەکاریان هێناوە[١٣٢].**

هەروەها لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە "واعدو لهم ما استطعتم من قوة ومن رباط الخيل ترهبون به عدو الله وعدوكم"[١٣٣].

رابیتە: لەدواییدا زیاتر بەپەناگەی سەربازان و کۆگای چەکی سەربازان دەوترا تا دژی دوژمن خۆیان تێدا حەشار بدەن، کە لەچەندان ژوورو قوللەی ئاگادار کردنەوەو شووورەی تر پێکهاتبوو[١٣٤]، بەڵام لەدواییدا بەتەکیەو خانەقاکانیش دەوترا رابیتە بەتایبەتی لەسەردەمی ئەمەوییەکان بەشێوەیەکی تایبەتی دروست دەکرا[١٣٥]. خانەقاکانیش لەدەوروبەری ساڵی ٤٠٠ی کۆچی پەیدا بوون، مەبەست لەخانەقا ئەو ماڵەیە کەسۆفییەکان عیبادەتی تێدا دەکەن و لەخودا دەپاڕێنەوە[١٣٦].

رابیتە هەر تەنها شوێنی عیبادەت و زوهد نەبوو، بەڵکو شوێنی رۆشنبیری و کۆڕگێڕان و خوێندنەوە بوو[١٣٧] جگە لەدیراسەت و بلاوکردنەوەی زانیاری لەنێوان خەڵک، بووە شوێنی حەوانەوەی ئەو زانایانەی لەدەرەوە دەهاتن و ئینجا ئەوانەی نەخۆشی درێژخایەنیان هەبوو لە رووی کۆمەلایەتیەوە پەنایان بۆ ئەم شوێنە بردووە و دەورێکی بالای بینیوەو بزووتنەوەی زانستی گەشە پێداوە[١٣٨]. لەهەولێردا چەندان رابیتەو خانەقا هەبوون کەهەریەکەیان دەوری بالایان هەبووە لەبواری زانیاریدا:

١- خانەقای موجاهیدیە

موجاهیدەدین قایماز کوڕی عەبدوللا زەینی جێگری زەینەدین عەلی کچک "ت ٥٩٥ک- ١١٩٨ز" ئەو خانەقایەی دروستکردووە هەروەکو ئیبن مستەوفی باسیکردووە[١٣٩]. موجاهیدەدین لەکاتی فەرمانڕەوایی هەولێر "٥٥٩ک- ٥٧١ز" و پێش ئەوەی بچێتە موسڵ چەند دامەزراوێکی دروستکردووە هەروەکو ئیبن خەلەکان ئاماژەی بەچەند قوتابخانەو خانەقایەک کردووە[١٤٠].

وەکو زانراوە ئەو میرە حەنبەلی بووە[١٤١] بۆیە زۆربەی حەنبەلییەکان روویان لەو خانەقایە کردووە، لەمانە شێخ ئەبو جەعفەر کوڕی واسیق شەریف عەباس، کە ئیبن مستەوفی باسیدەکات، بێ ئەوەی زانیاری زیاتر بلێت، ئەو شێخە خانەقاکەی بەڕێوەبردووەو لەسەر مەزهەبەکەی زۆر توند بووە[١٤٢].

وەکو دیارە دیراسەت لەو خانەقایەدا لەسەر یەک تاکە زانست نەبووە بەو بەڵگەیەی ئەبی حەسەن کوڕی ئەبی عەبدوللا ناسراو بەدینی مەخزومی و دوایی بە تەبەری[١٤٣] "ت ٥٩٥ک- ١١٩٨ز" لەچاکەکارەکان بووەو لەزانستی حەدیس شارەزابووەو لەو خانەقایە دەرسی وتۆتەوە[١٤٤].

سۆفییەکان لەخانەقا کۆدەبوونەوە، ئەبوفیدا ئیسماعیل کوڕی محەمەد کوڕی مەوهوب کوڕی محەمەد سۆفی جەزری، کە لە ١٢٠٢ کۆچی کردووە لەو خانەقایە دابەزیوە، ئیبن مستەوفی لەم بارەیەوە وتوویەتی شێخێکی گەورە لەمانگی سەفەری ساڵی ٥٥٩ لەریباتی موجاهیدی میوان بووە(١٤٥).

**٢- رابیتەی زاهید**

ئەو ریباتە کەوتبووە نزیک مەیدانی بەرامبەر دەروازەی سەرەکی خواروو کە بەدامێنی شارەوە دەیڕوانی، ئیبن مستەوفی ئاماژەی بەمە داوەو وتوویەتی ئەو ریباتە کەوتۆتە ژێر قەلاوە[١٤٦].

لەدیارترین ئەوانەی کەمشایەخ و

وانەبێژییان لەوێدا کردووە ئەبو محەمەد عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی بەرەکات کوڕی موحەمەد کوڕی ئەحمەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی کندر حلی بووە، کە بەئیبن موشتەری بەغدادی ناسراوە، فەقیهێکی شافیعی مەزەب بووەو لەو خانەقایەدا قورئانی پیرۆزو زانستی فیقەو حەدیسی خوێندووەو خەڵکی هەولێر هاوکاریان کردووە کردووە، لەمانە مێژوونووس شەرەفەدین ئەبو بەرەکات موبارەک کوڕی مستەوفی وەکو خۆی باسی کردووە[١٤٧].

**٣- ڕابیتەی جەنینەو سۆفیە**

لەو دامەزراوانەی کە سوڵتان موزەفەرەدین "ت ٦٣٠ک- ١٢٣٢ز" دروستی کردوون خانەقاکان بوون، ئیبن خەلەکان دەڵێت سوڵتان چوار خانەقای بۆ دەردەدارو کوێران دروست کردووەو ڕۆژانە هەموو شتێکی بۆ دەستەبەر کردوون[١٤٨].

لەبارەی دەوری خانەقاکان بەتایبەتی لەلایەنی زانستی و ڕۆشنبیری هیچی وامان لەبەردەستدا نییە، بەڵام دیارە ئەو خانەقایانە بۆ کارگوزاری کۆمەلایەتی و چاودێری هەژاران و پەککەوتان بووە تا لەسوالکردن و پەرتەوازەیی دووریان بخاتەوە، سوڵتان سەردانی ئەو خانەقایانەی دەکردو خەرجی و خواردن و جل و بەرگی بۆ دەستەبەر دەکردن[١٤٩].

لایەنێکی دیکەی دینداری سوڵتان موزەفەر ئەوە بوو، کە لەژیانی زاهیدو سۆفیان زۆر نزیک بوو، تاوای لێهات دوو خانەقای بۆ دروست کردن کە لەوانی تر جودا بوو، بوو بەکۆڕی زاناو سۆفیان و شوێنی وەعزو ڕێنمایی و بلاوبوونەوەی زانیاری[١٥٠]، جگە لەمەش لەرۆژانی جەژنی لەدایکبوونی پێغەمبەر (د.خ) میوانێکی زۆر ڕوویان لەهەولێر دەکردو سوڵتان موزەفەر لەو دوو خانەقایە پێشوازی لێ دەکردن و هەموو یارمەتی و پێداویستییەکی بۆ دەستەبەر دەکردن[١٥١].

ڕۆڵی ئەم دوو خانەقایە لەرووی زانستییەوە:

**أ- خانەقای سۆفیە:**

ئیبن مستەوفی ناوی ئەم خانەقایەی هێناوەو دەڵێت: کەوتۆتە نزیک دەرگای شادی (باب الفرح)[١٥٢]. ئیبن خەلەکانیش دەڵێت: خانەقای دراوسێی[١٥٣] مەیدان، کەواتە هەر ئەو خانەقایەیە کە کەوتبووە دامێنی دەروازەی سەرەکی قەلا[١٥٤]. لەرۆژانی جەژنی لەدایکبوونی پێغەمبەر د.خ سوڵتانس موزەفەر لەو خانەقایە ئامادە دەبوو و جگە لەمیرو پیاو ماقوول و میوانان کە بەپلەی یەکەم زاناکان بوون و سەرەڕای ئامادەبوونی زانایانی هەولێر لەفوقەهاو سۆفی و خوتبە خوێن و مەولود خوێن، تەنانەت گۆیندەو دەنگ خۆشەکانیش[١٥٥]. یەکەم کەس کە بوو بەمشایەخی ئەو خانەقایە، ئەبو حەسەن عەلی کوڕی ئیسماعیل کوڕی موسلیم کوڕی سلێمان هەولێری لەدایک بووی بەغدا بوو "ت ٦١٨ک- ١٢٢١ز" بەئەبی حەسەن بەغدادی ناسرابوو، سۆفییەکی چاکەکارو خێرەومەندو زانای حەدیس بوو، ئەو زانایە تاتێکچوونی خانەقاکەو گواستنەوەیان بۆ ڕیباتی جەنینە لەکاری خۆی بەردەوام بوو و تا لەهەولێر کۆچی دوایی کردو لەگۆڕستانی ناو لەپ نێژرا[١٥٦].

**ب- ڕابیتەی جەنینە:**

دوای نەمانی خانەقای سۆفیە ئەو ڕابیتەیە لەلایەن سوڵتان[١٥٧] موزەفەرەوە دروست کراو لەبواری بزاڤی زانیاریدا چەند چالاکییەکی نواند، لەشێخەکانی ئەو ڕیباتە قوتبەدین بەدەل کوڕی خەلیل ئەربلی بوو کەسەر بەشێخە ماقوولەکانی هەولێر بوو[١٥٨] هەروەها ئەبو عەبدوڵلا موحەمەد کوڕی ئەبی قاسم کوڕی محەمەد کوڕی سەعد ئەمەوی[١٥٩]، کە بەرەشیدی دیمەشقی ناسرابوو "ت ٦١٧ک- ١٢٢٠ز" سەر بەئەهلی تەسەوف بوو و جگە لەوەش حەنبەلی مەزهەب و زانای نەحووش بوو[١٦٠].

لەم ڕیباتەدا هەر بەتەنیا تەسەوف نەدەخوێندرا، بەڵکو فیقەو حەدیس و زانستی ئەدەبیش دەخوێندران، هەروەکو ئیبن مستەوفی ناوی زاناکانی ئەو ڕیباتە دەبات، کە لەوێ خوێندوویانە[١٦١].

**پ- ڕابیتەی مەنزەرە[١٦٢]:**

ئەم ڕیباتەش شان بەشانی دامەزراوەکانی دیکەی فێرکردن لەهەولێر ڕۆڵی خۆی لەبلاوکردنەوەی زانست و فێرکردن بینیوە، ئەبو حەسەن عەلی کوڕی ئەبی تالیب سابیت کوڕی تالیب بەغدادی ناسراو بەئیبن تالەبانی "ت ٦٢٨ک-

١٢٣٠ز" ساڵی ٦١٤ك- ١٢١٧ز هاتۆتە هەولێرو ئەم ریباتە، زۆرجار سوڵتان موزەفەر لەم ریباتە گوێی لەوەعز گرتووە، ئەو زاتە لەزانستی حەدیس زۆر شارەزا بووەو ئیبن مستەوفی لەم بارەیەوە وتوویەتی:

"سمع الحديث وحدث باربل"[١٦٣].

هەروەها زانا ئەبو نەسر محەمەد كوڕی عومەر كوڕی ئەبی ئەلفتوح كوڕی ئەبی موزەفەر كوڕی ئەبی غەنائیم ناسراو بەئەبی ئەلمەرە، كە خەڵكی بەغدا بوو و ساڵی ٦٢٠ك- ١٢٢٣ز كۆچی دوایی كردووە لەم خانەقایە دابەزیوەو بووەتە مشایەخی و دەرسی وتۆتەوە، ئیبن مستەوفی لەم بارەوە وتوویەتی:

"كان يدعي معرفة كل فن، ولاتصدق دعواة، كان يميل الى القول بالخيوم والعمل بالاصطرلاب، ويمنع الوقوف"[١٦٤].

**شەشەم: گۆشەكان**

"زاویە" لەكاری "نزوي- ينزوي" وەرگیراوە، واتە گرتنی گۆشەیەك لەگۆشەكانی مزگەوت بۆ خەلوەو خواپەرستی یان گۆشەیەك لەگۆشەكانی ریبات یان قوتابخانە[١٦٦].

واتە لەشكلی مزگەوت یا نوێژگە بەبینایەیەكی سەربەخۆ، كە نوێژو عیبادەتی تێدا دەكراو شان بەشانی ئەمەش شوێنی دیراسەت و هەڵقە زانستییەكان بوو بەتایبەتی ئاییینیەكان لەلایەن مشایەخە سۆفییەكانەوە بەڕێوە دەبران:

گەلێك جار هەندێك جۆرە بەگۆشەكانەوە دەلكێندران بەتایبەتی لەشارۆچكەو گوندەكان بۆ میوانان و ئەوانەی لەخوێندن دادەبڕان[١٦٨]. گۆشەكان بەناوی دامەزرێنەرەكانیان یان متەوەلییەكانیان یاخود سەرپەرشتیكارەكانیان ناودێر دەكران، گۆشەكان دەورێكی باڵایان لەبڵاوبوونەوەی رۆشنبیری و زانیاریدا بینی لەمانە: [١٦٩].

**١- گۆشەی شێخ محەمەد كوڕی محەمەد كوڕی حوسێن كوردی. (گۆشەی غەریبان)**

ئەو گۆشەیە لەلایەن سوڵتان موزەفەرەوە بۆ شێخی ناوبراو دروست كراوە، بۆ ئەوانەی كە هاتنە هەولێر بۆ فێربوونی زانیاری، كەوتبووە تەنیشت منارەوە[١٧٠].

ئەو گۆشەیە لەلایەنی زانستییەوە رۆڵی بەرچاوی بینیوەو لەناودارترین ئەو زانایانەی دەرسیان تیادا وتۆتەوە ئەبو ئیسحاق كوڕی محەمەد كوڕی موئەیەد كوڕی عەلی میسر هەمەدانی " ١٢٢٦" بوو، ساڵی ٦١٣ك- ١٢١٦ز هاتۆتە هەولێرو ئەهلی ئایین و فیقەو ئوسول بوو[١٧١] هەروەها ساڵی ٦٢٥ك- ١٢٢٧ز ئەبولقاسم كوڕی رەواحە سەقلی[١٧٢] "ت ٦٤٦ك- ١٢٤٨ز"[١٧٣] هاتۆتە هەولێرو فەقیهێكی شافیعی مەزهەبی و سەر بەبنەماڵەیەكی زانیاری بوو، لەچەند شوێنی جیا جیای هەولێردا دەرسی وتۆتەوە[١٧٤].

**٢- گۆشەی بستی**

ئەم گۆشەیە نیسبەتە بۆ ئەبی عەبدوڵلا موحەمەد كوڕی ئیبراهیم كوڕی ئەحمەد بستی "ت ٥٨٤ك- ١١٨ز" كەخەڵكی بست بووە[١٧٥]. زاتێكی سۆفی و دیندارو خوتبە خوێن و حەدیس زان و بەتەقواو رووخۆش بووە[١٧٦].

لەم گۆشەیەدا هەر بەتەنیا زانستە ئاییینیەكان نەدەخوێندران، بەڵكو زانستی زمان و ئادابیش خوێندراوە، ئەبو عەباس ئەحمەد كوڕی شوجاع متعەی هەولێری "٦٢١ك-١٢٢٤ز" كە فەقیهێكی شافیعی مەزهەب و زانای نەحوو دەستی شیعریشی هەبووە، ماوەیەكی زۆر لەو گۆشەیەدا ماوەتەوەو وەكو ئیبن مستەوفی باسی نەكردوون[١٧٧].

**٣- گۆشەی ئیسحاق كوڕی ئیبراهیم**

ئەم گۆشەیە نیسبەتە بۆ ئیسحاق كوڕی ئیبراهیم كوڕی محەمەد كوڕی عەلی عەبدوڵلا ئەبوو محەمەد خوزاعی هەولێری (٣٦٤-١٢٣٦)، شێخێكی متەسەویف و لەئەدەب و شیعر زانا بوو[١٧٨].

ئەم گۆشەیە لەرووی زانیارییەوە دەوری بەرچاوی هەبوو، چەندان زاناو مشایەخ روویان تێكردووە، لەمانە عەلی كوڕی ئەبی حەسەن كوڕی خەلیفە كوڕی محەمەد كوڕی عەبدوڵلا كوڕی سالم كوڕی ئەبی بەكر كەتانی ناسراو بەعەلی قەرشی "ت ٦٢٢ك- ١٢٢٥ز" خەڵكی گوندەكانی دووجەیل بوو،[١٧٩] مشایەخێكی چاكە كارو حەزی لەگەڕان بووەو چەند جارێك هاتۆتە هەولێرو لەگەڵ ئیبن مستەوفی كۆبۆتەوە، هەروەها سوڵتان موزەفەر

سەردانی کردووەو ڕێزی لێناوە[180].

جگەی لەو گۆشانەی باسمان کردن چەندان گۆشەی دیکە هەبوون و سوڵتان موزەفەر سەردانی کردوون، بەڵام وەکو ئەوانی دیکە ئیبن مستەوفی باسیانی نەکردووە[181].

**حەوتەم: نەخۆشخانە (بیمارستان)** [182].

دروستکردنی نەخۆشخانەکان لەمەسائیلە دنیاییە رووتەکان بووەو بەتەنیاش بۆ چارەسەری نەخۆشان نەبووە، بەڵکو دامەزراوێکی زانستی بووەو شوێنی فێربوونی پزیشکی بووە[184].

لەبارەی دەرمان و پزیشکی دەرسی تێدا وتراوەتەوە[185] و قوتابیان لەسەر دەستی شارەزایان فێرە ئەو پیشەیە بووینەو هۆڵی تایبەتی و پڕ لەکتێبیان بۆ تەرخان کراوە، کە پەیوەندی بەپزیشکییەوە هەبووە جگە لە[186] دەرمانخانەکان کە پسپۆڕی تایبەت بەرێوەی بردوون و سەرۆکێکیان هەبووە سەرپەرشتی کردوون، کە ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی لەبارەی دەرمان شارەزایی پەیدا بکەن[187].

هەولێر نەخۆشخانەیەکی تێدابوو، کە سوڵتان موزەفەر دروستی کردبوو[188]. ئیبراهیم کوڕی ئیسماعیل کوڕی موحەممەد غازی کوڕی عوبەیدوڵلا ناسراو بەکوڕی نەقیب "ت ٦٢٢م- ١٢٥٢ز" لەو نەخۆشخانەیەدا پزیشکی چاو بووە، جگە لەوەی دەستی هۆنینەوەی شیعری هەبووەو لەمەحشەری شاعیراندا ئامادە دەبوو[189].

هەروەها زانا یوسف کوڕی جامیع کوڕی ئەحمەد کوڕی محەمەد کوڕی حوسێن کوڕی محەمەد هەولێری "ت ٦١٥ک-١٢١٨ز" سەرپەرشتی کۆگای دەرمانی کردووە لەو نەخۆشخانەیەداو یەکێک بووە لەزانایەکانی هەولێرو لەپزیشکیدا شارەزا بووە[190].

جێگەی باسە ئەو نەخۆشخانەیە گۆڕستانێکی تایبەت بەخۆی هەبووە[191].

**هەشتەم: کڵێساو دێرەکان[192].**

جگە لەئەرکە ئایینیەکان کڵێساو دێرەکان لەبلاوکردنەوەی زانیاری و فێرکردن دەوری خۆیان بینیوەو بوونەتە شوێنی کۆبوونەوەی قوتابیان بۆ تەواوکردنی خوێندن هەر لەکۆنەوە[193] هەردوو ناوچەی عەزەو کەفر عەزی جگە لەوەی بارەگای قەشەکان بووە کڵێساو دێریشی زۆر تێدا بووەو بنکەی قوتابخانەکان بوونەو زۆر قوتابی لەوێ خوێندنیان تەواو کردووە[194].

حەزە شارۆچکەیەکی بچووکی نزیک هەولێر بوو[195]، دەڵێن ئەردەشێری کوڕی بابەک دروستی کردووە[196] واتە مێژووی دروستکردنی دەگەڕێتەوە سەردەمی ساسانییەکان، ئیبن حوقەیل دەڵێت سەر بەموسڵ بووەو کورد لەدەوروبەریدا دانیشتوون[197] و بەحەدیاب ناوی بردووە[198]، بەڵام حەدیاب لەحزە فراوانتر بوو[199] و حزەش لەکۆنەوە بارەگای ئوسقوفیە بووە[200]، ئەو هەرێمە لەبزاقی زانیاریدا رۆڵی بینیوەو قەشەو رەبەنەکانی حەزیان لەزانست و فێربوون و خوێندن بوو[201]، بەڵام کفر عزە گوندێکی نزیکی هەولێر بووەو پێدەچێت مەرکەزی هەرێمی حزە بووبێت[202] و هەروەها حزەو کفر عزی لەشوێنی گوندی سۆربەش عەزیزی ئێستادا بوونە، کە ١٦کم لەخوارووی رۆژئاوای هەولێرە[203].

ئەو دوو ناوچەیە جگە لەرۆشنبیری و زانیارییەکان ئەرکی ئایینیشیان بەجێهێناوە تا مەغۆلەکان لەسەدەی حەوتەمی کۆچی- سێزدەی زایین هەولێریان داگیرکردو بەم جۆرە کڵێساکانیش لەرووخان و سووتان رزگاریان نەبوو[204]. جگە لەکڵێساکان چەندان دێرو سەوامیع لەهەولێرو[205] دەوروبەریدا هەبوون، کە بەناوبانگترینیان دێری ئەنجا بوو لەنێوان هەولێرو موسڵ[206].

هەروەها ئیبن مستەوفیش ناوی گوندێک بەسوامع ناو دەبات[207].

دێرەکان پڕبوون لەکتێبی ئایینی و ئەدەبی و زانستی و تۆژەرەوان بۆ ئەنجامدانی تۆژینەوە روویان تێدەکرد، جگە لەمەش چەندان میوانخانەو شوێنی حەوانەوەی تێدابوو[208].

**سەرچاوەکان:**

١- ابن منظور: لسان العرب/ بیروت ١٩٦٨ ص٦٩٩.
٢- احمد امین: ضحی الاسلام/ القاهرة، د.ت، ٣/ ٥٠.
٣- محمد الحسیني عبدالعزیز: الحیاة

العلمية في الدولة الاسلامية/ ٣٢.
٤- سعيد الديوەجي: التربية والتعليم في الاسلام، الموصل، ١٩٨٢/ ١٦. بدري محمد فهد: تاريخ الفكر والعلوم العربية، بغداد، ١٩٨٨/ ١٩٢.
٥- ابن سعد: الطبقات الكبري، بيروت ١٩٥٧/ ٢٢.
٦- ابن سعد: الطبقات الكبري، بيروت ١٩٧٥/ ٢/ ٢٢.
٧- احمد امين: ظهور الاسلام، بيروت ١٩٦٩/ ٢/ ٢٢٣/ احمد احمد بدوي: الحياة العقلية في عصر الحروب الصليبية بمصر والشام، القاهرة، د.ت/ ٨٦.
٧- احمد امين: ضحي الاسلام، ٢/ ٥٠، ٦٦.
٨- سعيد الديوەجي: ن.م/ ٢٤.
٩- ابن الشعار: عقود الجمان، ٣/ ٤٨ ت ١٤٩.
١٠- بابو اسحق: مدارس العراق قبل الاسلام/ بغداد، ١٩٥٥. ٤١-٥٠. بۆ زیاتر زانیاری بروانە فؤاد جميل: حدياب وأربيللا وعشتار اربيللا/ مجلة سومر ج١، ٢ سنة ١٩٦٩/ ٢١٩-٢٥٦.
١١- المقريزي: الخطط المقريزية- بيروت ١٩٥٩- ٢٥٢/ ٢٢٤ ابن منظور: لسنان العرب/ ٢٠٤، حسن عبدالوهاب- تأريخ المساجد الأثرية- القاهرة ١٩١٩٤. ١/ ١١.
١٢- محمد عبدالرحيم غنيمة، تأريخ الجامعات ٢٧/ . أحمد أحمد بدوي الحياة العلمية في عصر الحروب الصليبية/ ٢٠. أحمد شلبي: تأريخ التربية الأسلامية، القاهرة/ ١٩٧٣/ ١٠٢، شاخت وبزروث: تراث الاسلام، الكويت ١٩٨٨، ٢٦٥.
١٣- أحمد حقي الحلمي: التربية والتعليم في الحضارة العربية الأسلامية، مجلة الدراسات العربية والأسلامية، ١٩٨٢/ ١٨٨.
١٤- محمد عبدالرحيم غنيمة، م/ ٣/ ٣٣، احمد شلبي: ن.م ٨٥-٨٦.
١٥- أدم متن: الحضارة الأسلامية في القرن الرابع الهجري أو عصر النهضة في الأسلام، بيروت ١٩٦٧، ١٢٢،١٢٤، حسن ابراهيم حسن: تاريخ الأسلام ٤/ ٣٣٦، سعد موسي وسعيد اسماعيل: تاريخ التربية والتعليم، القاهرة، /١١٤ ١٩٧٤.
١٦- بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی هەڵقەو دەوری لەبواری فێرکردن و دەرس وتنەوە بروانە عبدالعزيز حميد صالح: حلقات التدريس و دورها في مجال التعليم، مجلة كلية الأداب، جامعة بغداد ٢٥٤، لسنة، ١٩٨٨.
١٧- حسين أمين: المساجد الأسلامية وأثرها في نشر التعليم.
١٨- البلدان/ أربيل: ٤٢، ٨٦، ١١٢، ٢٥١، ٢٥٢، ٣٣٨.
٢٠- لەشوێنێکی تر لێی دەدوێین.
٢١- ابن المستوفي: هەمان سەرچاوە ١/ ٨٦.
٢٢- ابن المستوفي هـ.س.
٢٣- ابن المستوفي هـ.س.
٢٤- أحمد بدوي/ الحياة الأدبية في عصر الحروب الصليبية/ القاهرة ١٩٥٤، ٣٨٠.
٢٥- ابن المستوفي: تاريخ أربل ١/ ١٥١.
٢٦- ابن المستوفي د.س ١/ ٢٥١ (دوای چەند سەدەیەک بنەماڵەی مەلافەندی کەبنەماڵەیەکی زانیارن دەستیان بەچاککردنەوەی مزگەوتەکە کردو ئێستاش بەناوی ئەوانەوە دەناسرێت و کەوتۆتە ناوەڕاستی قەڵا، بروانە زبیر بلال اسماعيل: علماء ومدارس أربيل- ١٩٨٤/ ٢٧.
٢٧- المنشيء البغدادي: رحلة المنشيء البغدادي- بغداد ١٩٤٧/ ٧٧/ وداد القزاز: منارة المظفرية أربيل/ ١٢٧.
٢٨- سعيد الديوەجي: جوامع الموصل في مختلف العصور/ بغداد/ ١٩٦٣/ ١٤- ٤٤.
٢٩- كامل حسين/ التنقيب حول المأذنة المظفرية في أربيل/ ٢٠٦-٢٠٧/ محسن محمد حسين: أربيل/ ٢٢٢-٢٢٣.
٣٠- كارستن نيبور: رحلة نيبور الي العراق/ كلوديس ريج/ رحلة ريج الي العراق/ ٢٤٤.
٣١- بۆ زانیاری بروانە د. حسام الدين النقشبندي- خطط أربيل/ ١٤٠-١٤١.
٣٢- ابن المستوفي: تأريخ أربل/ ١/ ٢٧٠/ ٢/ ٥٧٥.
٣٣- ابن الساعي الخازن: الجامع المختصر، ٩/ ٢٩٣-٢٩٤، السيوطي: تقيد الوعاه، ٢/ ٢٧٦-٢٧٧، محسن محمد حسين أربيل/ ٢٦١.
٣٤- كفرعزي: نیسبەتەن بۆ کفرعزا کەگوندێکی نێوان هەولێرو زێی خواروو بووە، ياقوت الحموي: البلدان، ٤/ ٤٧٠.
٣٥- ابن سعيد الأندلسي: الغصون اليانعة في محاسن شعراء المائة السابعة/ ١٩٦٧.
٣٦- ابن المستوفي د.س.
٣٧- ابن المستوفي د.س ١١٢٨-١١٧٠، ٤، ٣، ٣٦٧.
٣٨- آثار البلاد وأخبار العباد/ ٢٩٠، كي لسترنج، بلدان الخلافة الشرقية/ ١٢٠.
٣٩- ابن المستوفي د.س. ١/ ٢٦٤، ابن خلكان وفيات الاعيان/ ٢/ ١٢.
٤٠- بۆ زیاتر زانیاری بروانە محسن محمد حسين، أربيل/ ٢٢٣-٢٢٤، د.حسام الدين النقشبندي: خطط أربيل ١٤٢.

٤١- الأشنهی: نیسبەتەن بۆ شارۆچكەی ئەشنە لەدەوروبەری ئازربێجان/ یاقوت الحموی/ البلدان/ ٢٠.
٤٢- ابن الشعار: عقود الجمان، ١٩/٤.
٤٣- ابن المستوفي، تأريخ أربل/ ٢١٣/١، د.حسام الدين النقشبندي: خطط أربيل/ ١٤٦.
٤٤- ابن المستوفي: د-س، ٢٦٤-٢٦٥، ٣/ ٤٤٦-٤٤٧.
٤٥- درزيجان: نيسبەتەن بۆ گوندی درزیجان كەگوندێكە لەبەغداو كەوتۆتە لای رۆژئاوای دیجلە.
٤٦- ابن المستوفي د-س، ١/ ٢٦٧، د.حسام الدين النقشبندي: د.س/ ١٤٢.
٤٧- ابن المستوفي: د.س، ١/ ١٧٠.
٤٨- زانیارییەكی ئەوتۆمان لەبارەی ئەو كەسە نییە، بەلام لێكۆلەری كتێبی ابن المستوفي دەلێت ئەبو تەغلوب غەزنفەر كوڕی ناسر دەولەیە.
٤٩- ابن المستوفي د.س، ٩/١، ابن الشعار: عقود الجمان/ ١٣٠.
٥٠- ابن المستوفي د.س/ ٩١/١، ابن المستوفي ٢١٥/٥.
٥١- ابن المستوفي د.س/ ٦٦٩/٢.
٥٢- هەمان سەرچاوە.
بەوازیجی: نیسبەتەن بۆ گوندی بەوازیج نزیک تكریت، كەزێی خواروو لەوێ دەرژێتە دجلەوە/ یاقوت الحموي: البلدان ٥٠٣/١.
٥٣- ابن المستوفي: د.س /١/ ٤٦٠.
٥٤- ابن خلكان: وفيات الأعيان، ١٢/٢.
٥٥- الصوامع: سەیری سەرچاوەكانمان كردو نیبن مستەوفی لە "تأريخ أربيل"دا دەلێت گوندێكی نەسرانی سەر بەهەولێرە، صوامع بەشێكی بنەرەتی دێرەو تایبەتە بەرەبەنان و نابێت میوان تیایدا بمێننەوە.
٥٦- تأريخ اربل، ٢٩٩/١-٣٠٠.
٥٧- هەمان سەرچاوە، ١، ٢٦٣، ٤٤٤/٢.
٥٨- أحمد أحمد بدوي: الحياة العقلية في عصر الحروب الصليبية/ ٣٠، د.رشيد الجميلي: دولة الأتابكة في الموصل بعد عمادالدين الزنكي، بيروت/ ١٩٧٥/ ٢٠٣.
٥٩- طاهر مظفر العميد: دور المدارس الأثرية في التعليم في العصر العباسي/ مجلة كلية الاداب، ٢٧، ١٩٧٩/ ١١٧.
٦٠- هاينز هالم: اصول المدرسة في الاسلام: مجلة الفكر العربي عدد ٢٠ سنة ١٩٨١/ ١٧.
٦١- أحمد شلبي: تأريخ التربية الاسلامية/ ٩٦، محمد مفيد الياسين: الحياة الفكرية في العراق/ ٢١٦.
٦٢- عبدالجبار حامد: الحياة العلمية في الموصل في عصر الأتابكة/ ٢١٢.
٦٣- موعید: دوودم پلەی پاش مودەریسە، ئەوەی لەدەمی ئوستادو شێخی دەبیستێ بۆ قوتابیانی دەگێرێتەوەو مەسەلە ئالۆزەكانیان بۆ روون دەكاتەوە.
٦٤- نظام الملك: أبو علي الحسن بن علي بن اسحق بن العباس الطومي، "٤٨٥ك- ١٠٩٢ز" زاناو فەقیهێكی دیندار بووە، لای زاناو سۆفییەكان خۆشەویست بووەو چەندان قوتابخانەی دروست كردووە.
أبو الشامة: الروضتين ٦٢/١، السيوطي: حسن المعاصرة في تاريخ مصر القاهرة، د.م، ١٩٦٨، ٢٥٥/ تامارا رايس/ السلاجقة/ ١٤٥-١٤٧.
٦٥- محمد فرحات: المدرسة الأسلامية خارج المساجد- مجلة الفكر العربي/ ٢٠/ ١٩٨١/ ٤١٥-٤٢١.
٦٦- السبكي: طبقات الشافعية الكبرى، بيروت، ١٩٠٦، ١٧٣ د.حسين أمين تأريخ العراق في عصر السلجوقي/ ٢٢٤، جرجي زيدان/ التأريخ الأسلامي، القاهرة، ١٩٦٨، ٢٢٣/٣-٢٢٤، سعيد الديوةجي/ التربية والتعليم في الأسلام/ ٧٤.
٦٧- ابن المستوفي ن.م، ٥٦٧/٢، ابن خلكان وفيات الأعيان/ ٢/ ١٠، محسن محمد حسين أربيل/ ٢٤٨.
٦٨- ابن المستوفي ن.م /٥٦٧/٢.
٦٩- الفرائض: سەیری "المقدمە"ی ابن خلدون ل ٤٨٤-٤٨٥ بكە.
٧٠- جیاوازی (الخلاف) یەكێكە لەو زانستانەی لە بەلگەی شەرعی هەلدەهێنجرێن- ئەو كەسەی زانیارییەكی تەواوی لەمەڕ ئەو بنەمایانە هەیە، كەرێساكان لێیەوە هەلدەهێنجرێن و موجتەهید پێویستی پێیەتی. ئەمەش زانستێكی بەسوودەو لەئیمام و بەلگەكانیان و مەبەستی پێ دەهێنرێتەوە. ئیبن خەلدون.
سەرچاوەی پێشوو/ ٤٥٦-٤٥٧.
٧١- ابن خلكان: وفيات الأعيان ١٠/٢.
٧٢- جۆرە وێكچوونێک لەو قوتابیانە هەیە، كە لەسەر دەستی ئەبو عەباس خچر كوڕی نەسر كوڕی عوقەیل و عیزەدینی برازایدا هەیە، هەردووكیان لەو قوتابخانەی قەلا لاپەڕ دەرسیان وتۆتەوە.
٧٣- ابن خلكان: هـ.س ٢/ ١١/١٠، ابن الصابوني: تكملة الكمال في الانساب والاسماء والالقاب، بيروت، ١٩٨٦/ ٢٢٥/ محمد امين زكي: مشاهير الكرد/ ٢/ ٦٠، محسن محمد حسين: اربيل/ ٢٤٦.
٧٤- ابن المستوفي: تاريخ اربل، ٣٧٣/٣٧٤.
٧٥- ابن المستوفي: تاريخ اربل ٧٨/٢، ابن خلكان: د.س ١٢/١١/٢.
السبكي: د.س ١٦٣/٥، الاسنوي: طبقات الشافعية، بغداد، ١٩٧٠/ ابن العماد الحنبلي: شذرات الذهب

٨٦/٥.
٧٦- ابن المستوفي: ن.م/ ٢٦٥.
٧٧- هەمان سەرچاوە، ١/ ٨٠.
٧٨- هەمان سەرچاوە، ١/٢٣٢.
٧٩- ابن الشعار: عقود الجمان، ١٤٣/٦ب.
٨٠- ابن المستوفي: د.س، ١/١٥٩.
٨١- د.ناجي معروف: تاريخ علماء المستنصرية، القاهرة، ١٩٧٦. ٢٨/١.
٨٢- ابن المستوفي: تاريخ اربل، ١٧٥/٢، ابن الشعار: عقود الجمان، ٩٩/٦ب ابن الفوطي: تلخص مجمع الاداب في معجم الالقاب، ٤:١/ ٦٢٢، د.ناجي معروف: علماء النظاميات ومدارس المشرق الاسلامي/ بغداد/ ١٩٧٣/ ١٨٩.
٨٣- مەلتیە: لەشارە ئیسلامییە بەناوبانگەکانی ولآتی رۆمە، یاقوت الحموي: البلدان، ١٩٢/٥.
٨٤- ابن المستوفي: هەمان سەرچاوەی پێشوو ١٥٩/١، ٣٦٦، ابن خلكان: وفيات الاعيان ٢/ ١٠/ ١١، د.حسام الدين النقشبندي: خطط اربيل/ ١٤٩.
٨٥- ابن المستوفي: د.س/ ابن خلكان- وفيات الأعيان ٢/ ١٠-١١.
٨٦- العزاوي: امارة ال بكتكين، ٢٢-١٤٣، محسن محمد حسين: د.س/ ٢٤٧.
٨٧- المنذري: د.س ٥/ ١٨٠، ابن خلكان: د.س.، ٢/١١-١٢.
٨٨- تاريخ اربل، ١/٣٦٧-٣٦٨.
٨٩- المرندي: مەرەند یەکێکە لەشارەکانی ئازربێجان.
٩٠- ابن المستوفي: د.س ١/٢٦٦.
٩١- د.س ١/١٥٨-١٥٩.
٩٢- محسن محمد حسين: اربيل/ ٢٤٩، د.حسام الدين النقشبندي: خطط اربيل/ ١٩٠.
٩٣- د.ناجي معروف/ علماء النظاميات ومدارس المشرق الاسلامي/ ١٩٠.
٩٤- وفيات الأعيان: ٣/ ٢٤٦.
٩٥- ابن المستوفي: هـ.س/ ١/٢٨٣، المنذري: التكملة لوفيات النقلة، النجف، ١٩٧١، ٤. ٢٥، السبكي: طبقات الشافعية الكبري ٥/ ١٣٠.
٩٦- ابن الاكبر: الباهر/ ١٩٣، ابو نامة: الروضتين ١:١/ ٦٩٤، ابن كثير البداية والنهاية، ١٣، ٢١، الغساني: المجسد المسبوك/ ٢٥٢.
٩٧- القزويني: شارێکی بەناوبانگە نزیک رەی، ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٢٤٢/٤.
٩٨- ابن المستوفي: تاريخ اربل، ١/٣٢٨-٣٢٩.
٩٩- الاصيهاني: نیسبەتەن بۆ ئەسیهان کەشارێکی ولآتی رۆژهەلآت بوودو ناسراوە، ياقوت الحموي: د.س ٢٠٦/١.
١٠٠- ابن المستوفي: د.س/ ١٩١-١٩٢.
١٠١- ابن خلكان: وفيات الاعيان ٢٧٣/٣، محسن محمد حسين- اربيل ٢٥٠-٢٥١.
١٠٢- تاريخ اربل ١/٣٢٨.
١٠٤- العزاوي: اماره ال بكتكين، ٣٤٢/٢٢.
١٠٥- المنذري: التكملة لوفيات النقلة، ٤/ ٨٠، ابن خلكان: وفيات الاعيان، ١/ ٩٠، الاسنوي: طبقات الشافعية، ٤٩٦/١، محسن محمد حسين: اربيل/ ٢٧١.
١٠٦- ابن خلكان: د.س.
١٠٧- د.س.
١٠٨- د.س، ٩٢/٢.
١٠٩- د.س.
١١٠- تاريخ اربل، ٢٢٨/١.
١١١- د.س، ١٥٩/١.
١١٢- د.س، ١/٢٣٢، المنذري: التكملة لوفيات النقلة، ٢٨٧/٥، الصفري: الوافي بالوفيات، ١٩٧٩. ٣١٧/١٢، الاسنوي: طبقات الشافعية، ٤٩٥/١.
١١٣- محسن محمد حسين: اربيل/ ٢٥١- ٢٥٢.
١١٤- ابن الشعار: عقود الجمان، ١٨/١ب-١٩.
١١٥- حاجي خلفة: كشف الظنون ٦٣٥/١.
١١٦- سعيد الديوەجی: التربية والتعليم في الاسلام/ ٦٧.
١١٧- د.ناجي معروف: تأريخ علماء المستنصرية، ١/ ٣٠.
١١٨- سعيد الديوەجی- د.س ٦٧-٦٨.
١١٩- التميمي: الدارس في تاريخ المدارس- دمشق ١٩٤٨، سعيد الديوەجی: هـ.س، د.حسام الدين النقشبندي: خطط اربيل ١٤٧-١٤٨.
١٢٠- ابن المستوفي: تأريخ أربل/ ٢٣٨-٢٣٩.
١٢١- د.س، ١٥٩/١، ٣٢٩.
١٢٢- د.س ١/ ١٦٢-١٦٣.
١٢٣- الدارقزي: نیسبەتەن بۆ دارقز کەگەڕەکێکی گەورەی بەغدایە، ياقوت الحموي: معجم البلدان: ٤٢٢/٢، ابن عبدالحق: مراصد الاطلاع ٥٠١/٢.
١٢٤- ابن المستوفي: د.س، ١٥٩/١، محسن محمد حسين: اربيل/ ٢٦٤-٢٦٥.
١٢٥- التبريزي: نیسبەتەن بۆ تەوریز بەناوبانگترین شاری ئازربێجان کەشوورەی پتەوی لەگەچ دروستکراوی تێدایە، ياقوت الحموي: د.س، ١٣/٢.
١٢٦- ابن المستوفي: د.س، ١٤٤/١، محسن محمد حسين: د.س/ ٢٥٣. ٢٦١.
١٢٧- تأريخ أربل، ١٢٩/١، ١٣٨، ١٦٤، ١٧٢، ١٧٥، ١٨٧، ٢٣٥،

٢٣٦، ٢٧٩، ٢٨٠، ٣٠٠، ٣١١، ٣١٢، ٣٥٠، ٣٦٣، ٤٠٥، ٤١٠، ٤١٧، ٤٣٥، ٤٥٠.
١٢٨- د.حسام الدين النقشبندي: خطط أربيل/ ١٤٧-١٤٨.
١٢٩- القفطي: انباء الرواة علي انباء النحاة، القاهرة، ١٩٥٥، ٣/٧٧، الذهبي: المختصر المحتاج، بغداد، ١٩٥١، ١، ١٦٩، ابن القاضي: طبقات النحاة واللغويين، السجق، ١٩٧٤/ ٢٧٣، محسن محمد حسين.
١٣٠- الزيح: لقێكی زانستی هەیئەیە بریتییە لەپیاساكانی حسێب و جوولانەوەی هەسارەكان و لەئەستێرە روانین. ابن خلكان: المقدمة/ ٤٧٩.
١٣١- وفيات الأعيان: ٤/٣٧٩.
١٣٢- ابن منظور: لسان العرب، ٢٠٧/٧.
١٣٣- سورة الأنفال، الاية ٥٩.
134- EI, VOII, III, P, 1150 -1175.
١٣٥- بدوي محمد فهد: تأريخ الفكر والعلوم العربية/ ١٣٠.
١٣٦- المقريزي: خطط المقريزية، ٣: ٣٣٣/٣، السيوطي: حسن المحاضرة، ٢٥٦/٢، أدم فتر: الحضارة الأسلامية في القرن الرابع الهجري ٢/ ٣٠.
١٣٧- مصطفى جواد: الربط البغدادية وأثرها على الثقافة الأسلامية، مجلة سومر مجلد ١٠، ج٢، لسنة ١٩٥٤ ٢٢٤/٣.
١٣٨- محمد أسعد: التربية والتعليم في الأسلام، بيروت ١٩٥٧/ ١١٠-١١٢، محمد مفيد الياسين: الحياة الفكرية في العراق ٢١١/ ٢١٣/ د.حسام الدين النقشبندي: خطط اربيل/ ١٤٢-١٤٣.
١٣٩- تأريخ اربل، ١/١٩١، د.حسام الدين النقشبندي: خطط اربيل/ ١٤٣-١٤٤.
١٤٠- وفيات الأعيان، ٣/٢٤٦.
١٤١- ابن الأثير: الباهر/ ١٩٣.
١٤٢- ابن المستوفي: د.س، ١/٩٤.
١٤٣- الطبري: نیسبەتەن بۆ تەبەرستان كەویلایەتێكی فراوانە، ابن الاثیر: اللباب في تهذيب الأنسان، ٢/ ٢٧٤، ياقوت الحموي: البلدان، ١٣/٤.
١٤٤- ابن المستوفي: د.س، ١٩١/١.
١٤٥- تأريخ أربل: ١٦٩/١.
١٤٦- هەمان سەرچاوە، ٢٣٩/١، د.حسام الدين النقشبندي: خطط اربل/ ١٤٤.
١٤٧- ابن المستوفي: د.س.
١٤٨- وفيات الأعيان: ٢٧٢/٣.
١٤٩- د.س، الغساني: المسجد المسبوك: ٤٥٣. محسن محمد حسين- ٢٣٦-٢٣٧.
١٥٠- سبط بن الجوزي: مراة الزمان، ٦٨١/٨، ابن خلكان: هـ.س، القزويني: اثار البلاد وخراب العباد/ ٢٩٠.
١٥١- ابن خلكان: د.س ٢٧٣/٣، الذهبي: د.س.
١٥٢- تأريخ أربل ٢١٤/١٠.
١٥٣- وفيات الأعيان: ٢٧٤/٣.
١٥٤- بۆ زیاتر زانیاری بروانە: محسن محمد حسين: أربيل/ ٢٢٢، د.حسام الدين النقشبندي: خطط أربيل/ ١٤٣.
١٥٥- ابن الشعار: عقود الجمان، ٥،١٥٦ب.
١٥٦- ابن المستوفي: تأريخ أربل، ٢١٣/١-٢١٤. ابن الحديثي: ذيل تأريخ مدينة السلام، بغداد، ١٩٧٤، ١٧٢/١، المنذري: التكملة لوفيات النقلة، ٥/ ٥٨-٥٩.
١٥٧- ابن المستوفي: د.س، ١/ ٢١٤.
١٥٨- ابن القوطي: تلخيص مجمع الأداب في معجم الألقاب. ٤/ ٤/ ٦٢٣، محسن محمد حسين: أربيل/ ٢٥٤.
١٥٩- الأمدي: نیسبەتەن بۆ نامەد گەورەترین شاری دیاربەكرە، ياقوت الحموي: البلدان، ٥٦/١.
١٦٠- ابن المستوفي: د.س، ١/ ٢٨٥-٢٣٨٦.
١٦١- ابن المستوفي: د.س، ١/ ٢٥٩، ٢٦٠، ٢٦١، ٢٦٩، ٢٩٩، ٣١٦، ٣١٧، ٣٥٠، ٣٨٧.
١٦٢- المنظرة: لەوشەی "المنظارة" و "المناقشة" وەرگیراوە واتە بیروڕا گۆڕینەوە لەبارەی بابەتێک لەنێوان دوولا. نجيب أسكندر: معجم المعاني للمترادف والمتوارد والنقيض من اسماء وأفعال و أدوات وتعابير، بغداد، ١، ١٩، ٢٦٠.
١٦٣- ابن المستوفي: تأريخ اربل ١/ ٢٤٢-٢٤٣.
١٦٤- د.س، ٣٠٧/١-٣٠٨.
١٦٥- حسن ابراهيم حسن: تأريخ الاسلام، ٤/ ٤٢٣.
١٦٦- د.حسام الدين النقشبندي: خطط اربيل/ ١٤٤.
١٦٧- محمد سعيد الياس: الحياة الفكرية في العراق/ ٣٢/ ٧٢.
١٦٨- حسن ابراهيم حسن: تاريخ الاسلام، ٤٢٣/٤.
١٦٩- ابن المستوفي: تاريخ اربل، ٨١٢/٢.
١٧٠- هەمان سەرچاوە، ٣٥٧/١-٤١٢. بەنسیبەت ئەم گۆشەیەوە د.محسن محمد حسين لەو بڕوایەدایە، كە شێخ موحەمەد كوڕی محەمەد كوڕی حوسێن كریدی هەر ئەو نیمام موحەمەدی كەمەزارەكەی چەند هەنگاوێک لەمنارەوە دووردو ساڵانی ١١٦٨-١١٨٧ز ژیاوە بوودو گۆشەكەش پاش ساڵی ٥٦٣ك- ١١٦٨ز دروستكراوە.
١٧١- ابن المستوفي: د.س، ١، ٣٥٧.
١٧٢- الصقلي: نیسبەتەن بۆ سقلیەی

بەرامبەر ئەفریقیا کە شێوەکەی سێگۆشەیە، یاقوت الحموی: البلدان، ٤١٦/٣.
١٧٣- ابن المستوفي: د.س ٤١٢/١.
١٧٤- ابن الشعار: عقود الجمان، ١٥٨/٣، الصفري: الوافي بالوفيات: ١٤٤/١٧، الذهبي: العبر في الخبر ١٨٨/٥، شذرات الذهب ٥/ ٢٣٤.
١٧٥- بست: شارێکی نێوان سجستان و غەزنین و هرات بووە، پڕ لەرووبارو بێستانە. یاقوت الحموی: البلدان/ ٤٢٤.
١٧٦- ابن المستوفي: تاريخ اربل، ١٦٢/١، ابن الحديثي: ذيل تاريخ مدينة السلام ١٣/ ١٦٤، الذهبي: مختصر المحتاج، ٢٤٧/٢-٢٤٨.
١٧٧- ابن المستوفي: د.س، ٢٣٢/١.
١٧٨- ابن المستوفي د.س، ١/ ٣١٧، ٥٢٥/٢، ابن الشعار: عقود الجمان: ١٢٤٦.
١٧٩- الدجيل: لێرەدا مەبەستی رووبارێکە لەدجلە دەردەچێت بەرامبەر شاری قادسیەو رووبەرێکی زۆر زەوی ئاو دەدات و دیسان دەرژێتەوە دجلەوەو بەتاهیریە یا کەندری تاهیر ناسراوە. یاقوت الحموی: هـ.س، ٥٢٤/٢.
١٨٠- ابن المستوفي: د.س ٢١٦/١-٢١٧.
١٨١- ابن المستوفي: هـ.س، ٥٥/١/ ١٥٢، ١٧٩ بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی گۆشەکانی دیکەی هەولێر بروانە د.حسام الدين النقشبندی: خطط اربيل/ ١٤٤.
١٨٢- مارستان: وشەیەکی فارسییەو بەمانای نەخۆشخانە دێت.
١٨٣- ئادەم قز: الحضارة الاسلامية في القرن الرابع الهجرة، ٢٠٥/٢.
١٨٤- احمد عيسي: م/٣.
١٨٥- جرجي زيدان: تاريخ التمدن الاسلامي، ٢١١/٣.
١٨٦- توماس ارنولد: تراث الاسلام، بيروت ١٩٧٢/ ٤٨١.
١٨٧- احمد عيسي بط: د.س/ ١٩٣، خاشع المعاضيدي: دراسات في تاريخ الحضارة الاسلامية، بغداد، ١٩٨٠/ ٢٦٧.
١٨٨- ابن خلكان: وفيات الاعيان، ٣/ ٢٧٢، الغساني: المسجد المسبوك: ٤٥٣، ابن ابي عذيبة: انسان العيون/ ٢٩٧، ابن العماد الحنبلي شذرات الذهب ١٣٨/٥.
١٨٩- ابن الشعار: عقود الجمان، ٦/١ اب- ١٧أ.
١٩٠- د.س، ١٧٣/١ب.
١٩١- ابن المستوفي: تاريخ اربل/ ٢٤١، ٢٤٥، د.حسام الدين النقشبندي: خطط اربيل/ ١٤٧.
١٩٢- الاديرة: وەکو قەڵا پتەوو دروستکراوەو ناوەوەی پڕە لەباخچەو زیاتر لەلووتکەی شاخان دوور لەئاوەدانی دروستکراوە الشابنتي: الديارات، ٣١، ياقوت الحموي: البلدان، ٢. ٤٩٥، ابن عبدالحق: مراصد الاطلاع ٢/ ٥٤٩، بابو اسحق: تاريخ نصاري العراق، بغداد ١٩٤٨/ ٢٣.
١٩٣- الشابنيت: د.س بابو اسحق/ ١٣، ٢١.
١٩٤- بابو اسحق: مدارس العراق قبل الاسلام/ ١١٤-١١٥، زبير بلال اسماعيل: اربيل في ادوارها التاريخية ١١٨-١١٩.
١٩٥- ياقوت الحموي: البلدان، ٢/ ٢٥٩، ابن عبدالحق: مراصد الاطلاع ١/ ٤٠٠ فيصل السامر: الدولة الحمدانية في الموصل وحلب، بغداد، ١٩٧٠. ١٥٥/١.
١٩٦-السمعاني: الانساب ١٣٤/٤، ابن الاثير: اللباب في تهذيب الانساب: ٣٦٤/١.
١٩٧- صورة الارض/ ١٩٥-١٩٦.
١٩٨- القس بولص شيخو: تاريخ الكنيسة الكلدانية: مخطوطة في مكتب الدراسات العليا- كلية الاداب، جامعة بغداد رقم "١٣٨٠" ٧٠٤.
١٩٩- سترك: دائرة المعارف الاسلامية "مادة اربيل"، ٩٩/٢.
٢٠٠- ميشار زخا: تاريخ كنيسة اربيل وابرشيقها في القرن السادس، مخطوطة مكتبة الدراسات العليا، كلية الاداب، جامعة بغداد، رقم (٧١) ٨٤.
٢٠١- ياقوت الحموي: هـ.س ٤/ ٤٧٠، ابن المستوفي: تاريخ اربل، ١٠٣/٢٢، ابن عبدالحق: مراصد الاطلاع، القاهرة، ١٩٥٥. ١١٧١/٣.
٢٠٢- الازدي: تاريخ الموصل، القاهرة، ١٩٦٧/ ٤٢٢، ابن حوقل: هـ.س ١٩٦/. احمد عبدالعزيز: الهذبانيون/ ٣٦.
٢٠٣- محسن محمد حسين: اربيل/ ٣٢٥، نقلا عن اب توما اسقف المرجي في كتاب الروسا، ٣/ ١٢٦.
٢٠٤- سترك: دائرة المعارف الاسلامية (مادة اربل) ١٩/٢.
٢٠٥- المقدسي: احسن التقاسيم في معرفة الاقاليم ١٩٠٦/ ١٤٦.
٢٠٦- تاريخ اربل، ١/ ٢٦٣. ٢٣٠.
٢٠٧- الشابنتي: الديارات ٣١- ٣٢.
پێویستە ئاماژە بەوە بدەین گوندێکی نەسرانی، کە ناوی عەنکاوە بووە ابن قوگی بەعنکا ناوی دەبات ٤-٥کم لەهەولێر دوورە کلدان تێیدا نیشتەجێن و ئێستا کراوەتە ناحیەو چەندان کڵێساو شوێنی پیرۆزی تێدایە.
٢٠٨- سترك: دائرة المعارف الاسلامية: مادة اربل ٢/ ٢٠

# هێڵکاری هەولێر لەکتێبی ئیبن مستەوفیدا (تاریخ اربل)

دکتور حیسامەدین نەقشبەندی
زانکۆی سلێمانی

**دەستپێک:**

پێگەی هەولێـر پێگەیەکی ناوازە بووە، شـوێنی بەیەکگەیشـتنی کاروانچییەکان بووە، بەتایبەتی ئەو دوو رێگایەی لەباکوورو رۆژهەڵاتەوە بۆی دەهاتن، کـە لەئازربایجـانەوە دەستی پێدەکردو رێگا لێژا و بەرز و نزمی ناوچە شاخاوییەکانیان دەبڕی. یەکـێکیـان بە رەواندوز و باکـووری رۆژهەڵات دا تێـدەپەڕی، ئەوی تر بە کـوێیە لەرۆژهەڵاتدا[١]. هەروەها بازاڕێکی گـەورە لەدەوروبەریەتی. بەهەرێمـێکی بەپیت و دەوڵەمـەند دادەنرێت. بریتییە لەبانێکی راست و بەرز و نزمی تێـدا نییـە. باشی پێگەکـەشی بەهۆی قـەڵاتی هەولێرەوەیە و، شارەکەی پاراستووە، بەوەی بەردەوام ژیانی تێدا بووە و بە درێژایی چاخەکان تا ئەمڕۆکەش ناوە کۆنەکەی هەر ماوەتەوە[٢].

لە هەولێـر لەبارەی سـەردەمی ئیسلام هیچ شتێک دەرنەکەوتووە. (تەبەری)ش لەمێـژووە گـەورەکەی هیچ شـتـێکی لەم بارەوە باس نەکردووە، هەروەها وڵاتناسە عەرەبە سەرەتاییەکانیش باسیان نەکردووە. تەنیا "ئیبن خوردادبە" (ت ٢٨٠ک/ ٨٩٧ز) و قودامەی کوڕی جەعفەر (ت ٣٢٠ک/ ٩٣٢ز) نەبێ[٣]. کـە باسکردنەکـەی لە ئیبن خـوردادبە کـێـڕاوەتەوە، بەو گـوزارشـتـەی تەسـجوجـەیەکـەو سـەربە کـوردی (حـولوان) بووە[٤]. واتە ئەوکـات ناحـیـەیەکی بچـووک بووە و کاروبارەکەی سنووردار بووە. لە پاش ئەوەش ناوەکەی هەر نەهاتووەو پشت گوێیان خستـووە. ئەمەش دەلالەت لەوە دەکات تا نیوەی یەکەمی سەدەی پێنجـەمی کـۆچی شـارەکـە بە ونی مـاوەتەوە. جـا کـاتێ مـیـرنشـینی هەزبانییەکان هاتە کایەوە و هەولێری کردە بنکەی خۆی، کە تا پاش ساڵی (٥٢٠ک/ ١١٢٦ز) بـەردەوام بـوو. پاش ئەوە رۆڵی هەولێـر بەرز بۆوە و زێدەبوو. بـەتایبـەت دوای ئەوەی زەینەدین عـەلی کوچک بن بەکـتەکین لەدەسـتـپـێکی سـاڵی (٥٦٣ک/ ١١٦٧ز) دەوڵـەتێکی دامـەزراند و هەولێـری کـردە شـاری خـۆی، بەڵام لەسەردەمی میر موزەفەرەدین گوگبری کە لەساڵی (٦٣٠ک) کـۆچی دوایی کـردووە و (زاوای سـەلاحـەدینی ئەیوبی) بووە لەلووتکەی گەشەسەندن دا بـووە. بـە رادەیـەکـی زۆر بـەرچاو بەرفـــراوان بـووە- ئـەو دەوڵـەتـە بچکۆڵەیە کە لەبراکەی میر زەینەدین لەسـاڵی (٥٨٦ک/ ١١٩٠ز) بـۆی مـایەوە. ئـەمـەو ئەو لوتکەی گـەشـەسـەندنە لەکـۆتایی سـەدەی شـەشـەم و نیـوەی یەکـەمی سـەدەی حەوتەمی کۆچیدا بووە[٥].

پێویستە لێرەدا بەر لەوەی باس لەهێـڵکاری شـاری هەولێـر بکەم، ئاماژە بەوە بدەم، کە هاوڕێم دکتـۆر موحسین محەمەد حوسێن بەشێکی پڕ بەهای لەسـەر هێـڵکاری شـارەکـە لەنامـەی مـاسـتەرەکەیدا نووسیـوە و تێـیدا باس لەقـەڵات و گـومبـەتی موزەفەرییە و دامودەزگاکانی ئایینی

و زانستی دەکات، وەک مزگەوت و خانەقا و خانەی حەدیس و قوتابخانەکان. دکتۆر موحسین لەساڵی ١٩٧٤ کۆتایی بەنامەی ماستەرەکەی هێناوە و لەساڵی ١٩٧٦ بەچاپی گەیاندووە. جا بەر لەوەی بەشی دووەمی مێژووی هەولێری "ئیبن مستەوفی" بێتە ئاواز، دکتۆر سامی بن سەید خەماس سەققار لێکۆڵینەوەی لەسەر هەمان بەش کردبوو، بە هەر دوو بەشەکەیەوەو لەساڵی ١٩٨٠ بلاوی کردبوونەوە[٧]. بەڵام دکتۆر موحسین لەکاتی نووسینی نامەکەیدا چاوی بەو لێکۆڵینەوەیە کە نەکەوتبوو لەسەر کتێبی ئیبن مستەوفی کرابوو، بۆیە بەشێوەیەکی سەرەکی و بنەمایی پشتم بەهێناوەی هێلکاری هەولێر بەستبوو، کە لەو کتێبەدا هەیە. بەشێوەیەکی لاوەکیش بەسەر سەرچاوەکانی دیکەدا. بەتایبەت وەک "وفیات الاعیان"ی ئیبن خەلەکان. بەو واتایە ئەم لێکۆڵینەوەیەم دەبێتە دەرک پێکردن و تەواوکردنی لێکۆڵینەوەکەی دکتۆر موحسین بەبێ ئەوەی پێ بنێتە وردەکارییەکان، کە تێیدا هاتووە[٨].

**١- قەلات:** قەلاتی هەولێر کەوتۆتە سەر گردێکی پان و بەرین، بەرزییەکەی لەسەر رووی شار (٢٦) مەترە، رووبەرەکەی بەنزیکەی (١١٠) هەزار مەتری چوارگۆشە خەملێندراوە[٩]. یاقوتی حەمەوی دەڵێت، هاوشێوەی قەلاتی حەلەبە. بەڵام لەوە تێگەیشتووە و گوتوویەتی: "قەلاتی هەولێر گەورەترو بەرفراوانترە لەقەلاتی حەلەب"[١٠]. وا دیارە شاری هەولێر لەسەرەتادا و بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ تەنیا هەر قەلات بووە. لەسەردەمی یاقوتدا کە لەساڵی (٦٢٦ک/ ١١٢٩ز مردووە) بووە بەشارێکی تەواو. خانوو و بازاڕی لێ بووە، دەوروبەرەکەشی بەخەندەکێکی قووڵ و بەهێز و پاڵپشت کرابوو[١١]. بەڵام یاقوت ئەوەی باس نەکردووە، لەبەرچی قەلات قایم بووە، بەڵکو تەنیا باسی خەندەکەکەی کردووە. دەشێ بڵێین بۆیە بە هاوشێوەی قەلاتی حەلەبی داناوە، چونکە قایمییەکەی بۆ ئەو دەرگا و تاوەر و دیوارە کونکونە گەڕاندۆتەوە، کە لەدەوری قەلات بەلووسی دروست کرابوو (لەسەر برشتی قەلاتی حەلەبدا)، بۆ ئەوەی هێرشبەرەکان گەر توانیشیان لەخەندەکە قووڵەکە بپەڕنەوە[١٢]، لەبەر بەرزی نەتوانن هێرش بکەن.

قەلات چەند دەرگەیەکی هەبووە. دەرگای سەرەکی -لەباشوور- کە تائێستاش بەسەر مەیداندا دەڕوانێ، قەلات لەقەیسەری جیا دەکاتەوە، کە میر موزەفەرەددین گوگبری دروستی کردبوو. مەیدان لەسەردەمی ئەودا بەپێی گوتەی ئیبن خەلەکان زۆر گەورە و بەرفراوان بووە[١٣]. بەڵام دەرگای دووەم - لەدەرگای یەکەم گەورەتر بووە - کەوتبووە بەرامبەر دەرگای سەرەکی باشوور کە رووەکەی لەگوندی عەنکاوەیە. خاوەنی کتێبی (الحوادث الجامعە) لەسەدەی حەوتەمی کۆچیدا ناوی نابوو (دەرگای عەمکا). بە گەورەترین دەرگای داناوە[١٤]. بەم شێوەیە بۆمان دەردەکەوێت کە قەلات زێتر لەدوو دەرگای هەبووە، بەڵام کەمتر گرنگی و بایەخیان پێدراوە، بارەگای فەرمی میر موزەفەرەددین لەقەلات بووە. خاوەنی کتێبی رووداوە کۆکراوەکان دەڵێت:"خانەی میرنشینیەکەی لەوێ بووە"[١٥]. لەنزیک دەرگای سەرەکی (باشووری) قەلات، ئێستاش ئەو گەڕەکە، هەر کەوتۆتە لای ئەو دەرگایە و بەگەڕەکی (سەرای) ناسراوە. جا گەر بێتو بارەگای فەرمی میر لەقەلات بێت، ئەوا دەبێت میوانخانەکانیشی تێدا بێت. لەم بارەیەوە ئیبن مستەوفی دەڵێت دیوانی تێدا بووە[١٦]. بەڵام دیاری نەکردووە. لەگەڵ ئەوەشدا نموونەی دانیشتنی ئیبن تەیمییە دێنێتەوە[١٧]، کە موزەفەرەددین گوگبری لە دانیشتنەکەی ئامادە بووە، کە یەکێک بووە لە دواوێنە سەرەکییەکان لەدەوڵەتی ئەتابکەدا کە، زانا و فەقیهەکان تێیدا ئامادە دەبوون و بایەخیان بەنووسین دەدا. لەوانەیە دیوانی پەیام و دارشتن بووبێ، یان پێی وترابێ دیوانی نووسینگەکان، کە ئەرکەکەی زۆر ترسناک بووە لەنووسین و پێداچوونەوەی پەیامەکان و فەرمانە فەرمییەکان، کە لەدیوانی میردا وەڵام دەدرانەوە. بۆیە دارێژکار یاخود نووسەری دیوان یەکێک بوون لەوانەی لەلایەن خاوەنی دیوان متمانەیان پێکراوە. هەڵبەتە ئەوانەش لەو زاناو فەقیهانەی کە بالادەست بوونلەنووسراوە فەرمییەکاندا. بۆیە ئیبن مستەوفیش کە خاوەنی کتێبی مێژووی هەولێرە،

یەکێک بووە لەرێبەرانی ئەم دیوانە[18]. هەر بۆیە ئامادەبوونی ئیبن تەیمیە، کە زانایەکی پایە بەرز بووە، دانیشتنی لەگەڵ گێڕدراوە، ئەمەش کارێکەو ئەگەری دروستی هەیە. چونکە شیاو نییە لە دیوانی (بالا) بۆ نموونە لەگەڵی دابنیشێت، کە کارەکەی سەرپەرشتیکردنی سەر داهاتەکانی زەوی و نرخاندنی دەسکەوتەکان بووە[19]. یان دیوانی (آهراء) کە بریتی بووە لە "کۆگایەکی پڕ لە دەغڵ ودان (غلات) هەر کارێک روویدابایە خەرجییەکەی لەوێوە بووە".[20] ئەم دوو دیوانە لەرۆژانی موزەفەرەدین گوگبری هەبوون، وێڕای میوانخانەی پەیام و دارشتن. شیاوی باسە بارەگای دیوانی بالا لەقەلات بووە[21].

لە قەلات مزگەوتێک هەبووە و پێی وتراوە مزگەوتی قەلات[22]. بوونی مزگەوتەکە کارێکی سروشتی بووە مادامەکی بارەگای فەرمی میری تێدا بووبێ. جگە لەوە، شتی دیکەشی لێ بووە، وەک بەندیخانە، بەندیخانەی قەلات کە لەسەردەمی ئیبن مستەوفیدا پێی وتراوە (بەندیخانەی حەلەبی)[23]، بەلام باسی نەکردووە، بۆچی ئەو ناوەی لێنراوە. وادیارە هەندێ لەدامودەزگا فەرمییەکان لەوانە خانەی میرنشین گوازراوەتەوە بۆ خوارێ و بە (خانەی دەسەلاتدار) ناونراوە. ئەبو فیدا کە لەساڵی (732ک مردووە) دەڵێت: یەکێ لەو دوو رێگایەی بۆ شارەکە دەهاتن، بەخانەی دەسەلاتدار تێپەڕ دەبوو[24]. ئەو گوێزرانەوەیە لەکۆتایی سەردەمی موزەفەرەدین روویدا، کە مردنەکەی لەساڵی (630ک/1233ز) بووە لە ماڵەکەی خوارەوە بووە. پاشان تەرمەکەی گوێزراوەتەوە بۆ قەلاتی هەولێر و بەشێوەیەکی کاتی لەوێ نێژراوە[25].

باشە لێرەوە باسی ئەوە بکەین، چونکە لەوانەیە قەلات توونێلی نهێنی تێدا بووبێت و لەکاتی پێویستی کۆمەکیدا لەماوەی ئابلۆقە یان هەلاتن لە قەلات بەکارهێنرابێت[26].

بەر لەوەی کۆتایی بەهێلکاری قەلات بێنین، پێویستە باس لەو بیرە زارفراوانە و قووڵییەکەی بکەین (قووڵییەکەی بە بەرزی قەلاتە، واتە نزیکەی 26 مەتر)، کە ئاوی دەگەیاندە گەرماوی قەلات کە کەوتۆتە ناوەڕاستی قەلات. وامەزندە دەکرێت ئاوی بیرەکە لەرێگای (کارێز)ەوە دەگەیشت، کە پێیەوە بەسترابێوە. چونکە گەروا نەبوایە ئەوا دەبوا بیرەکە زۆر لەوە قووڵتر کرابایە تا دەگەیشتە ئاستی ئاوی ژێر زەوی، کە لەدەوری قەلات بووە.

**2- نیشتەجێبوون"الربع":** کاتێ قەلات چڕی دانیشتوانی تێکەوت، هەندێکیان گوێزرانەوە بۆ بەشی خوارەوەی شار. وادیارە کەوتبووە بەرامبەر دەرگای سەرەکی قەلات بەلای باشووردا، کە لەرۆژئاوای قەلات درێژ دەبۆوە تا دەگەیشتە بەشی رۆژهەلاتی. ئەو گوێزرانەوەیەش لەسەردەمی میر زەینەدین عەلی کوچک، کە لەساڵی (56ک/1167ز)مردووە یان پێش ئەو روویداوە. لەهەندێ سەرچاوە هاتووە، ئەو میرە لەدەوروبەری مزگەوتێکی کۆن لەناو شار نێژراوە[27]. دکتۆر موحسین محەمەد حوسێن، بەلگە دێنێتەوە لەسەر بەرفراوانبوونی خوارەوەی قەلا بەلای باشوور و باشووری رۆژئاوادا. لەوانە منارەی موزەفەرییە بەشێک بووە لەمزگەوت، کە تائێستاش بەرزە و کەوتۆتە باشووری رۆژئاوای شاری هەولێر. هەڵبەتە مزگەوت دەبوا، کەوتبوایە ناوەڕاستی بەشێک لە ئاوەدانی خەڵکەکە[28].

میر موزەفەرەدین شاری بەرفراوان کرد، سەرەڕای ئەوەی ژمارەیەک شوێنی دووبارە نۆژەن کردەوە و بازاڕ و قەیسەرییەکەشی دروست کرد، تا وای لێهات لەسەردەمی یاقوتی حەمەویدا، کە لە (ساڵی 626ک/1229ز) مردووە، (بوو بەشارێکی گەورە و بەرفراوان)[29].

### هێلکاری شار لەسەردەمی موزەفەرەدین گوگبریدا:

#### یەکەم: دیواری شارو دەرگاکانی و خەندەکەکەی

یاقوت حەمەوی کە وەسفی دیواری شاری هەولێر دەکات، بۆمان دەردەکەوێت، کە بە هەرچوار دەوری قەلات نەسووڕاوەتەوە، بەڵکو تەنیا دەوری نیوەی قەلای داوە و هاوکات باسی کردووە کە "لەنیوەی قەلات دەپچڕا" (30). دیوارەکە تەنیا لەدەوری ئەو ناوچانە بووە کەدانیشتوانی لێبووە. بەڵگە بە ئیبن مستەوفی دێنینەوە، کە وەسفی

بێ دابڕان و كە دەڵێم بێ دابڕان، گرنگی مێژوویی خۆی هەیە لە گەشەپێدانی زانست، لە هەمان كاتیشدا بە دۆكیومێنتانەی لەژێر دەستمدایە دوای سوڵتان موزەفەرەددینی گۆگبری كە زاوای سەلاحەددین ئەیوبیە ئەو كات هەولێر وەك سەردەمی هارونە رەشید وابووە بۆ خوێندن و زانایانی بەرز روویان تێ كردووەو وەك ئیبن خەلەكان ئیبن ئەلمستەوفی ئەم رووناكییەی هەر وەك مەولودی پێغەمبەر لەم شارە هەر ماوە، تایبەتمەندی خۆی لەمزگەوتی قەلا بەسەدان ساڵ بە بەردەوامی زیاتر لە سەد فەقێی تێدا خوێندنی ئایینیان تەواوە كردووە، هەر مەلایەك هەتا ئیجازەی زانستی لە شارەكەی خۆشی وەرگرتبێ دەهاتە هەولێر دەماوە تا ئیجازەكەی لە مەدرەسەی مەلاگچكەی هەولێر وەربگرێ، ئەو زانایەی كە دەرچووی مزگەوتی قەلا با لە هەموو گوندوو شار پێش ئەوانەی دی بوون بۆ جێنشین بوون، بۆیە یەك لە نامەكانی كاك ئەحمەدی شێخ داوادەكا لە حاجی عومەر ئەفەندی، كە یەك لە فەقێكانی رۆژهەلاتی كوردستانی خەڵكی شاری (بانە)یەو لە بنەماڵەی خانەدانی ئەو شارەن، لە قوتابخانەی مزگەوتی قەلا وەربگیرێ، ئەو زاتە سەید حوسێن، كە خەڵكی بانە گەر مەبەستی بوایە لە سلێمانی دەمایەوە، بەلام لە بەر ئەوەی ناوبانگی مامۆستایانی ئاینی مزگەوتی قەلای هەولێر دەنگی دابوۆوە لە كوردستان و موسل وبەغداد، روویان تێ دەكرد دەتوانم بڵێم نامەكانی كاك ئەحمەدی شێخ نیشاندەدەن، كە مزگەوتی گەورەی قەلای هەولێر رۆڵی مزگەوتی ئەزهەری قاهیرەی دیوە لە كوردستان، ئەوەش ئاشكرا دەبێ زیاتر لە ناوەكانی زانایانی ئاینی سەردەمی حاجی عومەر ئەفەندی ومەلا ئەئەفەندی، كە نزیكەی زیاتر لە سەد زانایی بەرزی لێدەرچووە.

مۆڵەتی زانستی پێشكەش بەهەزاران لە قوتابیانكراوە، لەنێوانیشیاندا چەندین ئەدیبی ناودار و نزیكەی پێنج سەدەی بەر لە ئەمڕۆش ناوی مزگەوت و قوتابخانەكە بەناوی بنەماڵەیەكی زانستخواز بەسترایەوە، كە خزمەتی رۆشنبیران لە كوردستان بۆ چەندین نەوە كردووە، گرنگی قوتابخانەی قەلا و رۆڵی لە كوردستاندا و بەكۆمەڵ هاتنی قوتابیان لەشارەكانی كوردستان، بۆ مسۆگەر وەرگرتنیان و راسپاردنییشان لە لایەن زانایانی ناوچەی خۆیان هێناوە.

### گیروگرفتی قوتابخانەی مزگەوتی گەورەی سلێمانی

هەرچەندە لە مزگەوتی گەورەدا لە سلێمانی قوتابخانەی خۆی هەبوو، بەلام ئەو قوتابخانەیە هەندێ جار دەبووژایەوە هەندێ جاریش قوتابی تێدا كەم دەبۆوە بەهۆی ئەو بەربەرەكانێیەی كەلەنێوان میرەكانی باباندا هەبوو دەربارەی دەسەلات و زۆرجاریش ولاتەكەیان تووشی وێرانكاری و سووتان و تالان كردن و میرنشینی بابان یەكلانەبوویتەوە لە لایەنگیری كردنی فارس و عوسمانییەكاندا تەنگ و چەڵەمەیەكی زۆری دروست كرد لەناوچەكەدا، تا عوسمانییەكان دەسەلاتی میرنشینەكەیان لاواز كرد پاشانیش لەناو بردرا، ئەمەش لەدەوری ساڵی ١٨٥٠ز بوو. لەوانەشە كە ئەو بارودۆخە خراپە كە بەسەر ناوچەكەدا هات وای لەزانا شێخ مەعروفی نۆدەهی كرد بێت، كە نامەیەك بۆ والی بنووسێ كە تێیدا رەوشی قوتابخانەكانی راقە كردووە شێخ مەعرووف نودەهی دەڵێ:

هەر لەو كاتەوەش كە شای عەجەم.. دەستی بەسەر ئەو میرنشینانەدا گرتووە... كاروباری دنیا و ئاینی تێك چوو و گوندەكان چۆل بوون، پاش ئەوەی، كە پێشتر ئاوەدانیش بوون و قوتابخانەكانیان لە خوێندن وەستان و ژمارەیەكی زۆر كەمیش لەدەرچوان مانەوەو لە قوتابخانەكەمان لە (١٠) دە قوتابی كەمتر ماوەتەوەو لەكاتێكدا كە پێشتر زیاتر لە (٧٠) حەفتا قوتابی تێدا بوو... هتد).

### كورتەی ژیانی حاجی عومەر ئەئەفەندی

مەلا عومەر ئەفەندی كوری مەلا ئەبوبەكرە، كە ناسراوە بە مەلا گچكەی هەولێر كوری مەلا عوسمان كوری مەلا ئەبوبەكری دووەم (١٦٥٧-١٧٢٥) كوری مەلا عومەر (١٦٠١-١٦٨٨) كوری مەلا ئەبوبەكری یەكەم (١٥٣٣-١٦٢٠) كوری شێخ شەمسەدین كوری شێخ شەهابەدین كوری مەلا خدر كوری مەلا ئیلیاس-ە.

مەلا ئەبوبەكری مەلا گچكەی هەولێری(١٧٧٨ز-١٨٥٥ز) لە لایەنگرانی تەریقەتی نەقشەبەندی بوو... لەو تەریقەتەشدا كوردەكانی و نەوەكانیشی بەدوای كەوتن... عەباس عەزاوی مێژوونووس لە نووسینەكانی بە خەلیفەكانی مەولانا خالیدی نەقشەبەندی ژماردووە،

دەڵێ: (هەروەها لە هەولێردا شێخی ناسراو بە (مەلای گچکە)ی ئەربیللی هەبوو کە ئەویش خەلیفەی بوو).

وانەوتنەوە و پێشەواو وتارخوێنی و نووسەری لەژیانیدا کۆببوونەوە، بەڵام هیچ تەکییەی نەبوو و موریدەکانیشی تەکییەیان نەبوو و هەردەم پلە و پایە بوونی قوتابخانەی قەڵا و قوتابییانی پاراستووە، هەرچەندە لایەنگیری تەریقەتی نەقشەبەندی بوو، بەڵام پەیوەندیشی لەگەڵ زانایانی تەریقەتی قادری هەبووە، بەجۆرێ کە مۆڵەتی زانستیان لەنێوان خۆیاندا ئاڵوگۆڕ دەکرد و ئیبراهیم فەسیح حەیدەریش بەدرێژی لەکتێبەکەیدا کە بەناونیشانی (ناونیشانی شکۆداریەتی) کە ئاماژەی بۆ کردووە، هەروەها ئاماژەی بە زانایانی پێشووتریش کردووە و ئەو سوودەی کە لە زانستەکانیان بینیویەتی.

مەلای گچکە سێ کوڕی لەپاش بەجێ ماوە، ئەوانیش:

١- مەلا عوسمان (١٢٠٧- ١٢٩٧ک).

٢- حاجی عومەر ئەفەندی (١٢٣٠- ١٣٠٩ک).

٣- شێخ مەلا عەلی موفتی (١٢٣٥- ١٣١٥ک).

مەلا عوسمانیش چەند کوڕێکی لەپاش بەجێما، ئەوانیش: محەمەد موفتی باوکی رەشاد موفتی، شەمسەدین موفتی، نەجمەدین موفتی، رەشید موفتی، فەتاح موفتی، سەعید موفتی، و ئەحمەد عوسمان ئەفەندی باوکی زەید، مەحموود، نەوزاد، فوئاد، غازی، فەیسەل و یوسف یەک کوڕی هەبوو ئیبراهیم و ئەمین کوڕێکی هەبوو مستەفا ئەفەندی ئەفەندی و حەسەن ئەفەندی دوو کوڕی هەبووە- شێخ یونس و تاهیر ئەفەندی و راغب ئەفەندی و ئەوەی کۆتاییش هیچ منداڵێکی نەبووە. مەلا عومەریش تەنها کوڕێکی هەبوو کە مەلا ئەبوبەکری ناسراو بە مەلا ئەفەندی بوو.

شێخ عەلی موفتیش کوڕێکی تاقانەی هەبوو، کە شێخ جەمیل ئەفەندی بوو. شێخ عەلی موفتی پۆستی موفتی هەولێری وەرگرت و موتەسەوفیش بوو هەروەها لە لایەنگرانی تەریقەتی نەقشەبەندی بوو و کتێبی (سراج الطالبین)ی هەیە، کە تێیدا مێژووی ژیان و سەرگوزشتەی شێخ حوسامەدین تەوێڵەیی نەقشەبەندی باس دەکات. هەروەها کتێبی (مەولوودنامەی پێغەمبەر- المولد النبوي) کە بەزمانی کوردی نووسراوە پێش سەدو هەژدە ساڵ، دەستنووسێکیشی بەناونیشانی (کەشکۆڵ) هەیە، کە وەکو

کە جماعتی بە شەو بنیرین حضرت محمد
صلی الله علیه وسلم، بکوژین حضرت جبرائیل
علیه السلام، هاتە خدمت حضرت پیغمبر
صلی الله علیه وسلم، خبر دا کە او شەوە لە
جێگای خۆت مەنوە، تدبیر قریشیان بەتمامی
پێ عرض کرد، کە شەو داهات، او جماعتی
کفار هاتن، لەتاو حضرت پیغمبر صلی الله علیه وسلم
راوەستان، کە بە شەو هجوم بکن حضرت
محمد بکوژین، حضرت صلی الله علیه وسلم بە
حضرت علی امر فرمو لە جێگای خۆی نوانی
عبای سبز مبارکی بە سەر کێشا، فرموی

**مەولودنامە کوردیەکەی حاجی عومەرئەفەندی**

یادگارییەک وایە تێیدا باسی بابەتە جۆراو جۆرەکاندا دەکات و هەروەها باسی کاک ئەحمەدی شێخیش دەکات جەخت دەکاتەوە لەسەر ئامادەبوونی لە کۆڕەکانیدا لە سلێمانی و لەسەر زمانی ئەودا وتەی جۆراو جۆر دەگوازێتەوە و لەنێو کتێبەکانی شێخ عەلی موفتیشەوە دەستنووسی کاک ئەحمەدی شێخ هەیە، کە نزاو پاڕانەوە لەخۆیدا دەگرێ و لە کۆتاییەکەشدا نووسراوە (١٠) (زانا سەید ئەحمەدی نەوەدەهی و قادری عەلەوی بەرزنجی).

لەهۆیەکانی جێگیربوون و بەخشندەیی زانستی کە بنەماڵەی مەلا گچکە پێ ی ناسرابوو بە درێژایی سەدان ساڵ ئەوەبوو، کە هەولێر، قەڵاکەی لەو بەربەرەکانێیە سیاسیە کە میرنشینی بابان و میرنشینی سۆران بەخۆیانەوە دیت لە سلێمانی و هەریر و رەواندوز دوور بوون، بەوجۆرە هەولێر لەسەردەمی عوسمانییەکاندا لە بارێکی جێگیردا مایەوە.

هۆیەكەی تریش ئەوەبوو كوڕەكانی بنەماڵەی مەلا گچكە توانیان سەركەوتنێكی زانستی و ئەدەبی گەورە بەو زیرەكایەتی یە بۆ ماوەییەی، كە لەباوكیانەوە بۆیان مابۆوە بەدەست بهێنن، مەلا ئەبوبەكریش بۆیە بە (مەلا گچكە) ناونرا چونكە توانی مۆڵەتی زانستی پێش ماوەی دیاریكراو بەچەند پێش هاوەڵەكانی بەدەست بهێنێ. جگە لەوەیدەرگای قوتابخانەكەیان، وەكو لانەیەك بۆ قوتابییە هەژارەكان كردەوە و خەرجكردنی ماڵ و سەروەتی خۆیان لەو قوتابخانەیەدا.

شێخ جەمیل ئەفەندی دەرگای خۆی كردبۆوە بۆ یارمەتیدانی زیان پێكەوتوانی جەنگی یەكەمی جیهانی، شێخ جەمیل خوشكی شێخ حوسامەدین تەوێلەیی هێنا و لەپاشانیش كچەكەی پاش ئەوەی، كە خێزانی یەكەمی كۆچی دوایی كرد. لەساڵی ١٣٣٨ ك دوایی كرد.

لەسەر گۆڕی حاجی عومەر ئەفەندی ئەم پارچە شیعرە بە عەرەبی نووسراوە و مێژووی كۆچی دوایی نیشانداوە لە شیعرەكەیدا:

**قبر حوى عمرا بالزهد مشتهر**
**بمثله أبد الأباد نفتخر**
**يامن اراد له تاريخ رحلته**
**فهاك تاريخه اين كنت تفتكر**
**بنقص (...) تمت بشارته**
**مأواك جنة الفردوس ياعمر**

١٣٠٩هـ

**هەندێ لەو زانایانەی كە ئیجازەیان لە حاجی عومەرئەفەندی پێش ١٣٠ ساڵ وەرگرتووە**

بەر لەوەی باسی ئەوانە بكەین ئیجازەیان لە حاجی عومەرەفەندی وەرگرتووە، ئاماژە بەو زانایانە دەكەم كە حاجی عومەر لە ڕۆیشتنی بۆ حەج لە شاری دیمەشق لە گەڵ ئەم زانایانە كۆبوویتەوەو ئیجازەی پێ بەخشیون و لەهەمان كاتیشدا ئیجازەی خوێندنەوەی فەرموودەكانی پێغەمبەر(د.خ) لێ وەر گرتوون و ئەوانیش:

- **زانای دیمەشقی(محەمەد سەلیم كۆزبەری)- موفتی شام**
- **زانا (محەمەد خەلیل قاوقجی) تەرابولسی - موفتی شاری تەرابلس**
- **شێخ (بەكری كوڕی موحەدس حامد عەتار) - موحدسی**

**ولاتی شام**

- **زانا سالح كوڕی عەبدوڵلا شالقی**- لە پیاوە هەرە گەورەكانی زانای شامەو من هەموو ئەو ئیجازە و دەسخەتی گشت ئە زانایانەم لای خۆم پاراستووە لە بواری نووسینی تایبەت لەسەر حاجی عومەر ئەئەفەندی.

لەو زانایانەی كە ئیجازەیان لە حاجی عومەر ئەفەندی وەرگرتووە لەو لێكۆڵینەوەیەی لەو ماوەیە كردوومە، هەروەها بە ڕێگای بەدوا گەڕان لە ئینتەرنێتەوە، كە یارمەتی و هاریكارییەكی باشی كردووم و توانیومە ئەم ناوانە پێش سەد ساڵ ئیجازەیان وەرگرتووە لە مزگەتی قەڵا دەربانبێنم:

- **مەلا ئەحمەدی خەیلانی**
- **مەلا ئیبراهیم دۆغرەمەچی**
- **مەلا محەمەد شەریف ڕەنگەرێژانی**
- **مەلا عەبدولكەریم ڕەنگەرێژانی**
- **مەلامحەمەد ئەفەندی دێرەبروشەیی**
- **مەلا مەحموود عیمادی**
- **مەلا عەبدوڵلا دەشەیی موفتی هەورامان**
- **حاجی مەلا عەبدولقادر ڕەواندزی**
- **شێخ عەلی ئەئەفەندی**

ناوی هەندێ لەو زانایانە، كە ئیجازەیان لە مزگەوتی قەڵای هەولێر وەرگرتووە لەسەر دەستی مەلا ئەفەندی دوایی ك حاجی عومەر ئەفەندی شەش براو دوو ئامۆزا سەر پەرشتی خوێندنیان دەكرد لە مزگەوتی قەڵاجگە لە چەند مامۆستای بەناوبانگ، كە ناویان لەم لیستە هاتووە دوای تەواو كردنیان لە قەڵا ماونەتەوەو هەریەك لە ناومزگەوت حەلقەی دەرسی خۆی هەبووە یان لە حوجرەكان، كە ئەم شێوەیە هەمان شێوە بووە لە مزگەوتی ئەزهەر لە قاهیرە بە ڕێوەدەچوو، ئەوانەی كە ئیجازیان لە مەلا ئەفەندی كوڕی حاجی عومەر ئەفەندی لە مزگەوتی قەڵا وەرگرتووە بە پێی نووسراوی تایبەت بەدەست خەتی خۆی نووسیویەتی هەروەكو مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی لە كتێبەكەی بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی كورد ساڵی ١٩٩٩ لە بەغدا چاپی كردووە لەسەر ئەو دەستنووسەی كە

لە ناوەندی دەستنووسەكانی بەغدا پارێزراوە ناوی ٥٨ مە لا ئەفەندی نووسراوە، مە لا ئەفەندی ئیجازەی بداباپە هەر زانایەک ناوی گشت ئەوانەی دی بۆ دەنووسی لە بروا نامەکەی، بەلام ئەو دەستنووسەی، کە لای من پارێزراوە دەستنووسی مەلا ئەفەندییە تا ک دوایی لای خۆی بووە ناوی گشت پێدراوەکانی:

**- مەلا محەمەدی پەرچەمی ئیجازەی وەرگرتووە قوتابی باوکی بووە ١٣٠٩ک**
**- مەلا یوسف سلیمانی ١٣١٠ک**
**-مەلا حەسەن قەلعە رەسول سیتی ١٣١١ک**
**- مەلا عەبدولفتاح خەتێ ١٣١٢ ک**
**- مەلا عەبدوالعزیزی دەریازی ١٣١٣ ک.**
**- مەلا سەعیدی سقزی ١٣١٣ ک.**
**- مەلا ئەحمەد قوم قەلعەیی ١٣١٣ ک.**
**- مەلا ئیبراهیم بێشەیی ١٣١٣ ک.**
**- مەلا محەمەد سەعید سوهەیلی ١٣١٤ ک.**
**- مەلا شێخ عارفی شنۆیی ١٣١٤ک.**
**- مەلا رەشیدی بۆکانی ١٣١٤ ک.**
**- مەلا عبدالله مەریوانی ١٣١٤ ک.**
**- مە لا سەعیدی نهری ١٣١٦ ک.**
**- مەلا محەمەدی دووشیوانی ١٣١٦ک.**
**- مەلا ئیبراهیم شیولۆکی ١٣١٦ک.**
**- مەلا ئەحمەدی وەرتێ ١٣١٦ ک.**
**- مەلا سید خدر سید کەمال ١٣١٦ک.**
**- مەلا سەید عەبدلسەلام باشوری ١٣١٦ ک.**
**- مەلا محەمەدئەمین سور سەعدی**
**- مەلا تەها شقەلابادی ١٣١٨ک.**
**- مە لا عەبدوڵلا مامەخلی ٣١٨ک.**
**- مەلا تەها گاینجی ١٣١٨ک.**
**- مەلامحەمەد پاراستی ١٣١٨ک.**
**- مەلا حسن رەزائی ١٣١٨ک.**
**- مەلا محەمەد هێلاوەیی ١٣١٩ک.**
**- مەلا ئیسماعیلی قوشتەپەیی ١٣٢٠ک.**
**- مەلا تاهیری کەرکوکی ١٣٢٠ک.**
**- مەلا تاهیر شێخ وەتمان ١٣٢٠ک.**
**- مەلا ئەحمەد ناسوس شنۆیی ١٣٢٣ک.**
**- مەلا محەمەد بادینان ١٣٢٣ک.**
**- مەلا مستەفای کەورکۆسکی ١٣٢٣ک.**
**- مەلا هەبیەتوڵلای عەقراوی ١٣٢٤ک.**
**- مەلا سەعید شنۆیی ١٣٢٤ک.**
**- مەلا عەبدوڵلا موکریانی ١٣٢٥ک.**
**- مەلا عەبدولفەتاح شوانی ١٣٢٧ک.**
**- مەلا عەلی شاوەیس ١٣٢٧ک.**
**- مەلا سنیکۆری ١٣٢٨ک.**

تا ئێرە ٣٧ زانایان زۆربەی ئەوانەن، کە فەقێی حاجی عومەر ئەفەندیش بووینە ئەوەشمان لە بیر نەچێ کە رێژەیەکی زۆر کەم لە فەقێیان توانای تەواوکردنی مەلایەتیان پێکراوە هەندێکیان لە ماوەی سوختە یان "مستعد" بە جێیان هێشتروە یان لە بەر هۆێ کۆمەڵایەتی گەڕاونەتەوە وڵاتی خۆیان.

**یەکگرتنەوەی رێبازەکانی خوێندن**

هەوڵدان بۆ یەکگرتنەوەی رێبازەکانی خوێندن لە کوردستاندا ئەمەش بە ئاشکرا لە نامەکاندا بەدیاردەکەوێ کاتێک کە حاجی مەلا عومەر ئەفەندی داوای دانەیەک لە کتێبی (عەقیدە بچووکەکان و عەقیدە گەورەکان) لە کاک ئەحمەدی شێخ دەکات. ئینجا سوپاس و پێزانینی کاک ئەحمەدی شێخ بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو کتێبانە و دەخوازێ، کە بەعەرەبی و فارسیش بخوێندرێ تاوەکو سوودەکەی بۆ هەموو خەڵک بێت. بەردەوامبوونی زانایانی کورد لە نووسین بەزمانی دیکە جگە لە کوردی لەو سەردەمەدا شتێکی باوبوو.... ئەمەش وای کرد کە ئەدەبی کوردی فەرامۆش و پشتگوێ بخرێ بەهۆی کەمی نووسراوەکان بەکورد.

**شێخ، شووشە خواردن و شمشێر لە خۆدان قەدەغە دەکا**

لەو نامانە و لەشێوازی گفتوگۆکردن تێیاندا پلەو پایەی حاجی مەلا عومەر ئەفەندی لەلای کاک ئەحمەدی شێخ و پلە و پایەی زانستی و ئایینی و کۆمەڵایەتیش لەشاری هەولێردا لەو ماوەیە دەزانین، دەبینین کە لەو نامانەدا داوا

دەکات، کە بەکارهێنانی چەک و شمشێر قەدەغە بکرێ لەلایەن کوڕان لە تەکیەکاندا ئەمەش بنەمایەکە لە بنەماکانی تەریقەتی دەروێشی و پیاوە گەورەکانیان لە نامەکەیدا داوایان لێ دەکات، کە بە ئامۆژگاری و بەهەر ڕێیەکی دیکە بێت و قەدەغە بکرێ. هەروەها کاریگەری فەتوای حاجی عومەر ئەفەندی لە ویژدانی خەڵکی هەولێر و پلە و پایە بەرزەکە و ڕێزیشی لای خەڵکەکە بەدەردەکەوێ.

هەروەها لەو نامانەشەوە بۆمان دەردەکەوێ، کە ئەو زانایانە هەر چەندە پلەیان بەرزتر بوو بێ زیاتر بێ فیزدەبوون، ئەو بێ فیزییەش جۆرێک بوو لە خوداپەرستی و نزیکبوونەوە لە خودای گەورە، دەبینین کە کاک ئەحمەدی شێخ بەو وشانە کۆتایی بەنامەکانی: دێنێ (غەمبار، لە کەمتەرخەمانی ئایین، ئەحمەدی نەودەهی، ناڵە ناڵ کەر) لەنامەیەکی دیکەی کۆتایی بەم وشانە دێنێ: (غەمبار ئەحمەدی موهین)، لەناو مۆرەکەشدا نووسراوە.

**مێژووی نووسینی**
**شەش نامەکەی کاک ئەحمەدی شێخ**

ئێمە ناتوانین مێژووی ئەو نامانە بەتەواوی دیاری بکەین، چونکە مێژووی تێدا تۆمار نەکراوە، بەڵام دەتوانین کە نزیک ببینەوە لە ساڵەکانی نووسینیان، لەنامەی یەکەم و دووەم و سێیەمدا کاک ئەحمەدی شێخ وشەی (حاجی) دەنووسێ، واتە ئەو نامانە پاش گەڕانەوەی حاجی عومەر لە حەجدا نووسراون، ئەوەش لەکتێبی (کەشکۆڵ)ی شێخ عەلی ئەفەندی نووسراوە. لە لاپەڕەی سێیەمدا نووسراوە: (سوپاس بۆ خوای گەورە و دروود و سڵاو بۆ پێغەمبەرەکەی موحەمەد موستەفاو کەسوکار و هاوەڵانی، دواتر... موحەمەد عەلی کە ناسراوە بە (مەلا گچکە) کوڕی عوسمان کوڕی ئەبوبەکر کوڕی عومەر کوڕی ئەبوبەکر کوڕی شێخ شەمسەدین کوڕی شێخ شەهابەدین کوڕی مەلا خدر کوڕی مەلا ئیلیاس، کاتێک کە خوای گەورە بۆ برای گەورە و مامۆستای بەناوبانگم (عومەر ئەفەندی) ی ڕێکخست، کە سەردانی گۆڕی پێغەمبەر لە مێژووی هەزار و دووسەد و نەوەد و هەشت (۱۲۹۸ک) لەدووی مانگی شەعبان لە ڕۆژی پێنجشەمە، لەپاش نیوەڕۆ، لەقەڵای هەولێر لەمزگەوتی گەورەدا مامۆستا و پێشەواو وتار خوێن بوو و فەرمانی پێم کرد، کە لە شوێنی ئەودابم).

بۆمان دەردەکەوێ کە ئەوسێ نامەیە لە پاش ساڵی (۱۲۹۸ک)دا نووسراون و دوونامەکەی تریش پێش ئەو مێژووە نووسراون.... نامەی پێنجەمیش هەر نزیکە لەو مێژووە، چونکە کاک ئەحمەدی شێخ تیایدا ئاماژە بەوە دەکات، کە سەماحەتی مۆڵەتی نووسینی نوشتی ناردبوو بۆ کوڕی حاجی مەلا عومەر، کە ئەویش مەلا ئەبوبەکرە، کە ناسراوە بە (مەلا ئەفەندی)، کە لەساڵی (۱۲۸۰ک) لەدایک بووە و لەکاتی وەرگرتنی ئەو مۆڵەتەش، گەنج بوو، لەوانەیە لەهەمان ساڵدابێ، هەروەکو ئاشکراشە، کە کاک ئەحمەدی شێخ لەساڵی (۱۳۰۵ک)دا ک دوایی کردووە.

حاجی مەلا عومەر ئەفەندی لەقەڵای هەولێردا لەساڵی (۱۲۳۰ک) لەدایک بووەو وەکو باوباپیرانی لە دەوروبەرێکی پڕ لە زانستی ئایینی و هەموو زانستێکی ئایینی پەروەردەکراوە و عەرەبی خوێندووە، لە قوتابخانە ئایینییەکاندا بەگشت قۆناغە ناسراوەکانییەوە لەلایەن باوکییەوە و مۆڵەتی زانستی لەلایەن زانای گەورە مەلا عومەر ئەفەندی خەیلانییەوە وەرگرتووە کە ئەویش لە مۆڵەت پێدراوەکانە لای باوکی و سەفەری کردووە بۆ حیجاز و مۆڵەتی زانستی لە موفتی حیجاز مامۆستا ئەحمەد کوڕی زەینی دەحلان وەرگرتووە، کە خاوەنی کتێبی (فتوحاتی ئایینی پاش فتوحاتی پێغەمبەر)ە، چەندین کەس لەسەر دەستیدا دەرچوون و نووسراوی جۆراو جۆریشی هەیە کە زۆربەیان لەناوچوونە (۱۵) دەروێش بووەو هەموو بنەماکانی ئایین و ڕێبازەکانی پێغەمبەری جێبەجێ دەکرد قوتابخانەکەشی خاوەن چالاکییەکی بەردەوام بوو و ئاهەنگی تایبەت بە مۆڵەت وەرگرتن بەدرێژایی سێ ڕۆژ لەکاتی دەرچوونی هەر قوتابییەک یان کۆمەڵێک لە قوتابیان دەگێڕدرا، لەو ڕۆژەشدا لە قوتابخانە گشت زاناو ناودارەکانی ناوچەکە ئامادە دەبوون، ئەو ئاهەنگانەش بەڕێوەرەسمی تایبەتی بەڕێوە دەچوو. خوالێخۆشبوو لەساڵی (۱۳۰۹ک) ک دوایی دەکات.



*** وەرگێڕدراوی نامەی یەکەم**

نزا دەکەم بۆ جەنابی شێخ حاجی عومەر ئەفەندی، لە پاشان هیوادارم کە لاتان شاراوە نەبێ، کە هەندێ لە پیاوە گەورەکانی لای ئێوە فەرمان دەدەن بەخواردنی بەرد و ئاگر و بە بنەماکانی تەریقەتەکەیان دەیژمێرن. لەسەر ئێوە پێویستە، کە نەهی بکەن لەخراپە چ لەرێگەی ئامۆژگاری و ڕێنماییەوە بێ یان لەرێگەی قەدەغەکردن بێ یان بەهەر ڕێگەیەک بێت کە چارەبکرێ.

**غەمبار لەکەمتەرخەمانی ئایین**
**سەید ئەحمەدی نۆدەهی**
**بەناڵە ناڵ**

*** وەرگێڕدراوی نامەی دووەم:**

نزا دەکەم بۆ ئەو کەسەی کە بوون و تەمەندرێژی گرنگییەکی زۆری هەیە بۆ زانست و ئایینەوە، نزای بۆ دەکەم بۆ درێژ بوونی تەمەنی باشی تەندروستی و بەرزی پلە و پایە و ڕێزی لەدڵی گەورە پیاوان و سەرجەم موسڵمانان، بۆ گەورەم و خۆشەویستم حاجی عومەر ئەفەندی، دواتر... ئاشکرایە کە دەرس وتنەوە شتێکی بەنرخە، ئەگەر ئەو زانستە بدرێتە کەسانێک کە لەبنەماڵەی زانستخواز، ئەوە بەنرختر دەبێت و سوودی



زیاتر دەبێت و زانستەکە بەفیڕۆناچێ، هەڵگری[١٦] ئەم نامەیەش بۆ بەدەستهێنانی زانست تەقدیمیان کردووە، دڵسۆزتان بیری کردەوە[١٧] و ناردیانی بۆ ئێوە و بۆ زانیاریتان ئەوانە خاودن بنەماڵەی ناودارن لە (بانە) و شایەنی سۆز و بەزەیین... ئیتر بەخواتان دەسپێرم.

**نزاکەری غەمبار**
**سەید ئەحمەدی بەناڵە ناڵ**

**وەرگێڕدراوی نووسراوی پەراوێزی نامەی دووەم:**

هەڵگری ڕاسپێردراو سەید حوسێن لە ئێمەیە[١٨] و داواکەری زانستە و ئەو دوو خاسیەتەش وای لێ دەکەن، کە شایەنی ڕێز بێت بەهیوای ئەوەی، کە لەسۆزی خۆتان بێ بەشی نەکەن.

*وەرگێردراوی نامەی سێیەم:

سلاو دەنێرم بۆ خۆشەویستم حاجی عومەر ئەفەندی و نزادەکەم لەخوا کە تەندروستی جەستەت باش بێت و پارێزراو بێت لە ئاژاوەی ئاخیر زەمان، هەڵگری ئەو سکالا نامەیە حاجی عەزیز لەئێمەیە و بەئێمەوە بەندە، هیوادارین بەچاکەی خۆتان و بە بەخشندەیی خۆتان بۆ خۆشەویستان هەوڵبدەن بۆ بەجێ گەیاندنی ئارەزووەکەی و بەمەش پاداشتێکی گەورە وەردەگرن لەخوای گەورە و ڕێز و سوپاسیش لە ئێمەوە.

**نزاکەری غەمبار**

**سەید ئەحمەدی بەناڵە ناڵ**

*وەرگێردراوی نامەی چوارەم:

نزا دەکەم بۆ لەدڵا خۆشەویست و شکۆدار جەنابی مەلا شێخ عومەر ئەفەندی، نزا و بەرەکەت لەتەمەن و باوەڕ و ئاینەوە و بەرەکەت لەماڵ و سامانی دنیا و ڕێزی خەڵک و تەندروستیت، هیوادارم کە ڕەحمەتی پێغەمبەرت (د.خ) لەسەر بێ لە دنیا و لەپاش مردنیشدا[۱۹]، زۆر سوپاس کە هەستای بەنوێ کردنەوەی ئایین تا توانات تێدایە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر گرنگیدانتان و داوا کردنیشتان بۆ وێنەیەک لەکتێبی (عەقیدەی بچووکەکان- العقائد الصغيرة)[۲۰]، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ڕێز و سۆزی ئێوە و گرنگیدانتان، بەمەش منتان بەختەوەر کرد و هیوادارم، کە فەرمان بدەن بە خوێندنەوەی کتێبی (عەقیدە گەورەکان- العقائد الكبيرة)[۲۱] و (کتاب الفکر)[۲۲] وەک تەواوکەرێک.

**نزاکەری غەمبار لە کەمتەرخەمانی ئایین**

**سەید ئەحمەدی موهین**

*وەرگێردراوی نامەی پێنجەم:

دەستی ئازیزم مەلا عومەر ئەفەندی ماچ دەکەم و سلاوی لێ دەکەم و نزای بۆ دەکەم بەدرێژ بوونی تەمەنی و بەرز بوونی پلەو پایەی، دواتر... سوپاست دەکەم بۆ بلاوکردنەوەی کتێبە عەقیدەییەکان و هیوادارم کە بەهەردوو زمانی فارسی و عەرەبی بێت بەمە سوودمەندتر دەبێت و بەگوێرەی فەرمانتان مۆڵەتم بەخشی بە ڕۆڵەکەتان مەلا ئەبوبەکر بۆ نووسینی نووشتە و مۆڵەتە ناوبراوەکەم نارد، کە بەخەتی خۆم نووسیوە و مۆرم کردووە، ئاماژەم بەکتێب و سەرچاوەکان کرد، خۆزگە بەدەستم کەوتبایە دەبوو[۲۳] بە

پارووکی ئامادەکراو، ئەوکاتە پێویستمان بەگەڕانە بۆ کتێبە ناوبراوەکان نەدەما.

**غەمبار**
**ئەحمەدی موهێن**

*** وەرگێڕدراوی نامەی شەشەم.**

بۆ جەنابی زاناو ڕێنیشاندەرو دۆست و خۆشەویستم عومەرە ئەفەندی، دوعای تەمەنێکی پڕ لەئیمان و لەخوای گەورەش داواکارم لە فیتنەو تەنگوچەڵەمەی ئاخیر زەمان بتانپارێزێ. کە ئەمەشیان فەرموودەی پێغەمبەرە، کە ئاماژەی پێدراوە..

دوعای زیاتر لەخواپەرستی و سەرکەوتن و وانە وتنەوەت لە وانەکانی زانستە ئاینییەکان بۆ دەخوازم.

دوای سەلام، بەهیوای گەیشتنتان بە مەرام و لەناخۆشی.

هەڵگری نامە"سەیف فەیزوڵلا"یەکێکە لە خۆشەویست و موریدانی خۆم، ئەوا بەرەو خزمەتی ئێوە هات و بەنیازە بچێتە موسڵ (مەبەستی شاری نەینەوایە) تکا دەکەم بە سەلامەتی و بەبێ زیان بگەیەنرێتە موسڵ.

ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە خودا پاداشتی ئێوە بە چاکەو خێرێکی گەورە بداتەوە.

دوعای خێرتان بۆدەکەم.

**غەمبار لە کەمتەرخەمانی ئایین**
**سەید ئەحمەدی نەودەهی**
**بەناڵە ناڵ**

**ئایا کاک ئەحمەدی شێخ حەجی کردووە؟**

سەرچاوەکان ئامەژە بەوە دەکەن، کە کاک ئەحمەدی شێخیش چۆتە حەج و سێ ساڵ لەوێ ماوەتەوە، بەڵام کاک محەمەد ڕەسول هاوار لە کتێبەکەی شێخ مەحموودی قارەمان بەرگی یەکەم ل ١٣١دەڵێ: (هیچ سەرچاوەیەک باسی ئەو سێ ساڵەی کاک ئەحمەدی نەکردووە، کە ئەو ماوەیە دوورو درێژە لە سلێمانی دوور کەوتبێتەوە) منیش بۆ ئەوە ڕاستییە دەڕۆم، کە کاک ئەحمەدی شێخ ئەو سەفەرەی نەکردووە، ئەگەر وابا، ڕەنگە نازناوی دەبووە

حاجی کاک ئەحمەدی شێخ یان ئیجازەو نامەو باسێک لەم بابەتە دەکرا.

چوونە حەج کارێکی ئاسان نەبوو کاتی خۆی رێگایەکی سەخت و دووروو درێژ بوو شایانی چوون بۆ حەج بوو ئەوکەسەی نازناوی ببێ بە حاجی.

بەرانبەر ئەو راستییەش دەتوانین حاجی عومەر ئەفەندی، کە هاوتەمەنی کاک ئەحمەدی شێخ بووە، کە چوویتە حەج دەیان ئیجازەی بە خشیوە بە زانایانی دیمشق وئەسکەندەرییە وحیجاز وهەمان کاتیش ئیجازەی ئایینی لە زانستی جۆراو جۆر وەر گرتووە، کە ئێستا چەندین لەم دەستخەتانەم لا کۆ کردۆتەوە، کە لەحەج ئەنجامی داون، یەک لەوان ئیجازەنامەی موفتی حیجاز و نەجدە ئەویش ئەحمەدی کوڕی زین ئەلدەحلانە، کە بەناوبانگترین زانای حیجازە گشت سەرچاوەکان لە رێگای ئینتەرنێت ئاماژەی بۆ دەکەن.

**حاجی عومەر ئەفەندی لە حەج کورد دەناسێنێ**

لە دەستخەتی موفتی و زانای حیجاز و وتە بێژی فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ) خوالێخۆشبوو (ئەحمەد کوڕی زین ئەلدەحلان) کە ئیجازەی خوێندنەوەی فەرموودەکانی زنجیرەیی پێغەمبەری (د.خ) پێبەخشیوە دەڵێ:

سوپاس وحەمد بۆ خوا ودروود وسەلام لە سەر پێغەمبەر محەمەد و لەسەر باو باپیرانی ودۆستەکانی، دوایی کە رۆژی دووشەممەی پیرۆز بوو لە رۆژی ٩ مانگی ژی القعدە ساڵی هەزارو دووسەدو نۆهەدو هەشت (١٢٩٨ ک) لە(المسجد الحرام) لە دەرسی تفسیری ئیمام بوخاری زانای موحتەرەم شێخ عومەر کوڕی شێخ ئەبوبەکری کوردی ئەربیلی لای من ئامادە بوو ئەم زاتە لە شاری ئەربیل (هەولێر) هاتبوو بۆ ئەوەی ئەرکی حەج ئەنجام بدا. تا کۆتایی ئیجازەکە کە دەحلان بە خۆی ئیمزای کردووە و مۆری کردووە، حاجی عومەرە ئەفەندی چەند دۆکیۆمێنتی دیکەی وای هەیە، کە لە دیمەشق، قاهیرە لە رێگای حەج وەری گرتوە یان بەخشیوبەتی.

لێرە مەبەستمان ئەوەیە، کە حاجی عومەرە ئەفەندی ئەم ئیجازەی وەرگرتووە دەکاتە (٢) تشرینی یەکەمی ساڵی ١٨٨١ز، پێش ١٢٧ ساڵ هەستی نەتەوایەتی خۆی لە حیجاز دەربڕیوە، ئەو رۆژەی حاجی عومەر ئەفەندی شاری هەولێر بەجێ دێڵێ رۆژی (٢٩) تەمووزی ساڵی ١٨٨١زایینی وەک ئەوەی دوایی باسی لێ دەکرێ، مانای دوای دوو مانگ لە بەرێکەوتنی ئەم ئیجازەیەی وەرگرتووە، ئەوەش ئەوەمان بۆ ساغ دەکاتەوە، کە سەفەری نزیکەی دوو مانگی نەخایاندووە، مانای وایە حاجی عومەر ئەفەندی هەرکە گەیشتۆتە کەعبە لە حجاز بەهرەو لێهاتوویی، زانستی ئایینی لێ بە دیار کەوتووە، نەوەک بە ماوەی هەفتەیەک گەورە زانای حیجاز ئیجازە نابەخشێتە هیچ کەسێک.

لێرە دەمەوێ ئاماژە بە چەند قسەیەکی باوکم بدەم، باوکم دەیگوت: ئەم زمانە تورکییەی لە هەولێر قسەی پێ دەکرێ پاشماوەی دەوڵەتی عوسمانییە، هیچ لاریم نییە لە سەری و قۆریاتی تورکیشم زۆر پێ خۆشە، بەڵام لەهەمان کات دەیگوت: ئەم زمانە نەوەک خەڵک هەڵخەڵەتێنێ رەسەنایەتی نەتەوەیی خۆیان لەبیر بکەن، هەندێ جار دەیگوت: گەر مامی بابم حاجی عومەر، ئەفەندی پێش سەد ساڵ بلێ من کوردم ئەی من چ بڵێم.

**شێخ رەزا و پیرەمێرد**
**ستایشی شێخ و عومەر ئەفەندی دەکەن**

شێخ رەزای تاڵەبانی شاعیرێکی ناودارە و چەندین شیعری نایابی بەزمانی کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی هەیە هەروەها شاعیری گەورەی کورد پیرەمێرد هەمان ستایشی هەیە، شێخ رەزای تالەبانی ستایشی بۆ هەردوو زاناگەورەکەی کورد گوتووە، ئاشانا بوون لەم بوارە چەند دێرێک بە نموونە ئاماژەی بۆ دەکەم:

شێخ رەزا لە ستایشی کاک ئەحمەدی شێخ دەڵێ:

**مەربوتە حەیاتم بە سولەیمانی و خاکی**
**خۆزگەم بەسەگی قاپیەکەی ئەحمەدی کاکی**
**ئەو قیدوەتی ساداتە کە سوککانی سەماوەت**
**شەربانە لەسەر سوجدەی قەبری مەرقەدی پاکی**
**ئەو مەرقەدەی والایە وەک عەرشی موعەلا**
**مەحفوزە بەزوواری مەلک دەوری شوباکی**

هەروەها لە ستایشی حاجی عومەر ئەفەندی نازنازی باوکی مەلا گچکەیە

بە تورکی دەڵێ:

**حزرەتی (حاجی عمر زادە کوچک ملا) کیم**
**مایەکسب غناسایە احسانیدر**
واتە دەڵێ:
**وەک زاتی حاجی عومەر زادەی مەلا گچکەی**
**کە سەرمایەی پیاوەتی و چاکەیە**

هەروەها وتوویەتی:
**سنک تک بریپوک عالم جیهاندە وارمیدر؟ کلا**
**سنا سوڕنەزردن حفیز ئایچون دیرلەر کوچک ملا**

واتا دەڵێ:
ئایا دانایەکی زانا وەکو تۆ هەیە لە جیهاندا؟ نەخێر بۆ ئەوەی لە چاوو نەفەس بتپارێزن پێت دەڵێن مەلای گچکە

هەروا شێخ رەزای تاڵەبانی بیست دێر شیعری تورکی ستایشی مەلا ئەبوبکری کوڕی حاجی عومەر ئەفەندی کردووە، موکەرم تاڵەبانی لە کتێبەکەی شێخ رەزای تالەبانی، کە شیعرەکەشی وەرگێڕاوەتەوە سەر زمانی کوردی، دەڵێ:

**دیمەنی راستی و سافی ئاینەی رووی**
**دەرکەوتنی رۆژ ومانگ لە گیرفانی ئەبوبەکرە**
**خەرقەپۆشان لە خانەی ئیرشادی**
**هەریەکە گەیشتووەتە خواجە فورقاتێک**
**چونکە لە رێک خستنی سوپاس سورەت دوعا گۆیی**
**لای خاوەن گوفتار شەرتی قسە زانییە**
**رەزا دەستی نیازی بۆ دەرگای مەولا بەرز دەکاتەوە**
**بەدوعایەک کە هەر کاتێک دوعا خوێنیەتی**
**میهرو ئیقبالی دنیا بگرێتەوە تا میهر منیر**
**ئەم دەرگا جوانی ئەیوانی فەلەکە**

هەروەها پیرەمێردی شاعیر بەهەمان شت هەردوو بنەماڵەی شێخ ومەلا گچکەی هەولێر بە ستایشێکی زۆر جوان وەسف کردووە، بۆ ئەوەی لە بابەتەکەمان دوور نەکەوینەوە، ناچینە نێو شیعرەکان.بێجگە لەوە چەندین شاعیری دیکە وەک رەمزی مەلا معروف وم.نوری وهیجری دەدە وعەبدولرەحمان بەنا، نیعمەتوڵلا نعمە، بورهان جاهید ستایشیان هەیە.

**نامەکانی شێخ و مەم وزین**
**لە گەشتی ئەوروپا یاوەرم بوون**

کە لە ساڵی ١٩٩٦ کوردستانم بەجێ هێشت خەیاڵم لای ئەو دەستنووسانە بوو، ئەوەک بفەوتێ، هەرچەند خانووەکەم دابووە برادەرێک بۆ چەند مانگێک بیپارێزێ بەڵام پێنج ساڵ زەفتی کرد، کە هاتمەوە یەکسەر بۆ لای چەند دۆکیۆمێنتێ کە لای من نرخی تایبەتی خۆی هەیە یەک لەوانە دەستنووسی مەم وزین و شەش نامەی کاک ئەحمەدی شێخ لەگەڵ خۆم هێنامەوە، چەند ساڵێک لام بوو، لە هۆڵەندا ولە سەفەرم بۆ بە شدار بوون لە چەند چالاکییەکی کوردان یان رۆژنامەنووسی یان لە رێگاو ئەوروپا گەڕانەوەم بۆ کوردستان یاوەرم بوون وخۆشم سەبوریم پێ دەهاتن وسەرنجی چەندین دۆست و برادەری لە لەندەن، پاریس، و بەرلین، فینا، برۆکسل، تورکیا و دیمەشق راکێشا.



پەراوێزەکان:

١- شێخ ڕەزای تاڵەبانی شاعیرێکی ناوداره و چەندین شیعری نایابی هەڵبەستووە بەزمانی کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی. دێری یەکەمی لەستایشی کاک ئەحمەدی شێخ وتووە و دێری دووەمی، کە بەزمانی تورکی نووسیوە لەستایشی کوڕی حاجی مەلا عومەر فەندی نووسیوە کە مەلا ئەفەندیە، واتا (حاجی عومەر زادە)، وشەی (زادە) لێرەدا نازناوە بۆ مەلا فەندی.

٢- سەبغەتوڵلای کوڕی ئیبراهیم حەیدەری، لەماوەران لەدایک بووە لەساڵی (١١١٤ک)، چووە بۆ بەغدا و چەندین زانا لەژێر دەستیدا دەرچوون و خاوەن چەندین نووسراوەو پایەیەکی بەرزی هەبوو لای والی بەغدا، کە ناوی ئەحمەد پاشا بوو،، پاش پێشکەش کردنی خزمەتێکی زۆر بۆ زانست و ئایین لەبەغدا ک دوایی کردووە.

٣- شێخ عەبدوڵلا کوڕی شێخ ئەحمەد کوڕی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی عیزەدین شافعی کوردییە، لەبێتۆشی لەدایک بووە، کە گوندێکە دەکەوێتە باکووری شاری سلێمانی، لەساڵی (١١٤٠ک)، دووجار ک کردووە بۆ (احسار له یەمەن)و هاتۆتەوە بۆ کوردستان و لەساڵی (١١٨٨ک) بەتەواوەتی جێی هێشتووە و لە کۆتاییدا لە (احساء) جێگیر بووە و هەر لە یەمەنیش لەساڵی (١٢٢١ک ک دوایی کردووە)، شاعیرێکی ناودارو زانایەکی زیرەک بوو، لە (احساء) دا مامۆستا و ئیمام بوو و خاوەن پایەیەکی بەرز بوو.

٤- مەلا جەرجیس کوڕی محەمەد ئەربیللی ڕەشادییە، لە هەولێر لەدایک بووە و زانستی ئایینی لەمزگەوتی (العمرية) لە موسل تەواو کردووە و لەوێشدا بووە بەمامۆستا لەساڵی ١٧٧٢ز لەسەردەمی سلێمان پاشا بووە بە وتارخوێن لە مزگەوتی (الوزراء)و مۆڵەتی زانستی بە چەندین زانا بەخشیوە لەوانەش: ( شێخ سەلاحەدین یوسف ئەفەندی مامۆستای زانا محەمەد ئالوسی، لەساڵی ١٧٩٢ز ک دوایی کردووە.

٥- محەمەد فەیزی زەهاوی، لەساڵی (١٢١٧ک) لەسلێمانی لەدایک بووە، باوکی شاعیری عیراقی جەمیل سدقی زەهاویە و (زەهاو)یش قەزایەکە لەئێران نزیک خانەقین، پۆستی موفتی بەغدای وەرگرتووە لەساڵی (١٣٠٦ک) ا ک دوایی کردووە.

٦- مەلا خدر کوڕی ئەحمەد شاوڵییە، ناسراوە بە (نالی)، لەساڵی ١٨٠٠ز لەگوندی خاکوخۆڵ لەشارەزوور لەدایک بووە. ئەدەبی کوردی بە شیعرە نایابەکانی دەوڵەمەند کردووە، سەفەری کردووە بۆ حەج ئینجا بۆ ئیستەمبۆڵ و لەوێدا نیشتەجێ بوو تا لەساڵی ١٨٥٤ زایینی کۆچی دوایی کردووە.

٧- زیائەدین کوڕی خالد کوڕی ئەحمەد کوڕی حوسێن، لەساڵی ١٧٧٩ز لە گوندی قەرەداغ لەسلێمانی لەدایک بووە. پلەیەکی بەرزی بەدەستهێناوە لەزانستە ئایینیەکان و زانستەکانی عەرەبی و بەوانە وتنەوە و کتێب نووسین خەریک بووە، لەساڵی ١٨٠٥ز، سەفەری حەجی کردووە، و هەڵبەستێکی بە فارسی وتووە لەستایشی پێغەمبەر (د.خ) و لەپاش گەڕانەوەی بۆ سلێمانی لەگەڵ (میرزا ڕەحیمەڵلا بێگ) کە ناسراوە بە (محەمەد دەروێش)، کە یەکێک بوو لە خەلیفەکانی

شا عەبدوڵلا دەهلەوی نەقشەبەندی، لە ساڵی ١٨٠٧ز سەفەری هیندستان کردووە، لەهیندستان بۆ ماوەی زیاتر لەساڵێک ماوەتەوە و مۆڵەتی زانستی لەلایەن شێخ دەهلەوی بۆ تەریقەتی نەقشبەندی پێ بەخشراوە و دیوانێکی چاپکراوی هەیە لە ستایشی مامۆستاکەی و لەو دیوانەشدا باسی ئەو سەفەرە درێژ خایەنە دەکات و لەپاش گەڕانەوەش بۆ سلێمانی لەساڵی ١٨١١ دەستی داوەتە بڵاوکردنەوە و نوێ کردنەوەی تەریقەتی نەقشەبەندی لە کوردستان و مورید و خەلیفەکانیشی زیاتر بوون. لەسلێمانیشدا ماوەیەک ماوەتەوە لە پاشان بەرەبەرەکانێ لەنێوان دوو تەریقەتەکەدا بەرپا بووە و سەفەری کردووە بۆ بەغدا و دووبارە هاتۆتەوە سلێمانی و سلێمانی جێهێشتووە و سەفەری کردووە بۆ قودس و لەشام ماوەتەوە تا لەساڵی ١٨٢٠زاینیشدا ک دوایی کردووە لەساڵی ١٨٢٦ز، وتەکییە (خانەقا)ی لە هەر شارێک کە تێیدا ژیاوە کردۆتەوە و بەنوێکەرەوەی تەریقەتی نەقشەبەندی دەژمێردرێ و خەلیفە و موریدەکانی لەسەرجەم شارە ئایینی یەکاندا لە کوردستان بڵاوبوونەوە.

٨- شێخ مەعروفی نۆدەهی ناوی سەید محەمەدە و ناسراوە بە مەعرووف کوڕی سەید مستەفا لە عەشیرەتی بەرزنجیە و کۆتاییان بەزانای ناودار بابا عەلی هەمەدانی دێت، لەساڵی ١٧٥٣ز لەگوندی نودێ لەسلێمانی لەدایک بووە لەسەردەمی سلێمان پاشای گەورە زیرەکێکی بێ وێنە بوو لەزۆربەی زانستە عەرەبییەکاندا وەکو (نحو و صرف و بلاغة، بدیع و معاني) بلیمەت بوو. شیعری سەرسوڕهێنەری هەڵبەستووە، ژمارەی ئەو دێڕە شیعرانەی کە هەلیبەستوون نزیکەی (٦٠٠٠) دێری شیعری بوو جگە لەوانەی کە فەوتاون... پاش زانیاری وەرگرتنی کتێبی نووسیوە و بەمامۆستا لەیەکێک لە قوتابخانەکانی قەڵاچۆلان دامەزراوە و پاش دامەزراندنی شاری سلێمانی لەلایەن ئیبراهیم پاشاوە نەودەهی بەمامۆستا لەمزگەوتی گەورە دامەزراوە و تەریقەتی قادری لە مامی باوکییەوە (شێخ عەلی) وەرگرتووە. نووسراوەکانی زیاتر لە (٥٠) پەنجا نووسراو بوو، و سەماحەتی شێخ محەمەدی خاڵ نووسراوێکی بەنرخی لەژێر ناونیشانی (شێخ مەعروفی نۆدەهی بەرزنجی) نووسیوە و کتێبەکەشی لەساڵی ١٩٦١ ز دا چاپ کردووەو ناوبانگی بەهۆی نووسراوەکانیەوە دەرکردووە، کە لە سەرجەم قوتابخانە ئایینیەکانی کوردستان دەخوێندرا، کتێبەکەش کە بەناونیشانی (ئەحمەدی)یە لە ساڵی ١٧٩٥ز دا نووسیویەتی بۆ کوڕەکەی کاک ئەحمەدی شێخ تا ئەو وشانە لەبەر بکات، کە پێویستی پێ دەبێ لەزمانی عەرەبی و کوردیش ئەویش لەسێ سەد و هەشتا و شەش (٣٨٦) دێردا کۆکراوەتەوە و بەوە. دەست پێ دەکات بە:

(راس) سەرە، (عین) چاوە، (بدن) قالب، (اسم) ناوە، لەساڵی ١٨٣٨ زایینی لەشاری سلێمانی ک دوایی کردووە.

٩- ناوی شێخ محەمەد عەلییە و ناسراوە بە حوسامەدین تەوێڵەیی کوردی و لەساڵی (١٢٧٨ک) بۆ ماوەی زیاتر لەشەست ساڵ رابەری زاناکانی تەریقەتی نەقشەبەندی بووە ئەمەش دوای مردنی باوکی شێخ محەمەد بەهائەدین بووە، چەندەها کتێبی لەسەر نووسراوە، لەوانەش کتێبی: (سراج الطالبین)ی شێخ عەلی ئەفەندی و کتێبی (السعادة الابدیة في الطریقة النقشبندیة)ی سەید ئەحمەد ئەقرەع، کە لەساڵی ١٩٧٦ز دا چاپ کراوە لەشاری تلامنوفیە لە مسر. لە شەوی سێشەممەی ٢٧ی زولحجە لەساڵی ١٣٥٨ ک دوایی کردووە، کە دەکاتە ١٨٤٠ زاینی و لە باخەکۆن نێژراوە.

١٠- ئەو نووسراوانە بەدەستخەتی کاک ئەحمەدی شێخ لە کتێبێکی سەربەخۆدا هەیە، کە بەدەستخەتی شێخ عەلی ئەفەندی نووسراوە و هەروەها چەند هەڵبەستێکی لەخۆگرتووە بەزمانی کوردی، کە تایبەتە بەشاعیرانی کوردستان لەسەدەی نۆزدەهەمدا ' نێویانیشدا شاعیری کورد (نالی) و شێخ رەزاو وەفایی.

١١- بەڕێوەبەرایەتی ئاوەدانکردنەوەی قەڵای هەولێر ماڵی

شێخ جەمیل ئەفەندی، کە یەکێکە لە خانووادە کەلتوورییەکان.

١٢- شاری (بانە) دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی ئێران لەنزیک سنووری عێراقە و نزیکە لەماوەتی سەر بە قەزای چوارتا.

١٣- محەمەدی خاڵ- شێخ مەعروفی نۆدەهی. لاپەڕە ٨٤ بەغدا ١٩٦١ز.

١٤- ئەو خشتەیە کورتەی مۆڵەتەکە لەخۆ دەگرێ، ئینجا لیستێک بەناوی مۆڵەتپێدراوی مەلا ئەفەندی، کە بەدەستخەتی خۆی نووسراون و بەڕیز بەگوێرەی کۆن و نوێیەتی و ڕۆژ و مانگ و ساڵی وەرگرتنی مۆڵەتەکەشی دەگرێتە خۆ.

١٥- زۆربەی نووسراوەکانی ئەم بنەماڵەیە لەکتێبخانەی مەلا ئەفەندی سووتاوە لەساڵی ١٩٥٩دا لە گوندی باداوە ڕوویداوە.

١٦- وا دیارە کە کۆمەڵێ قوتابی بن و لەسەرووی هەمووشیانەوە سەید حوسێن، و کاک ئەحمەدی شێخ لەپەراوێزی نامەکەدا راسپاردەیەکی تایبەتی بۆ نووسیبوو.

١٧- لەپەراوێزی نامەکەدا وشەی (دڵسۆز) نووسرابوو، بەڵام واباشترە کە بنووسین (دڵسۆزتان بیری کردەوە) و مەبەستی خۆیەتی (واتە کاک ئەحمەدی شێخ).

١٨- مەبەس لەوشەی (لە ئێمەیە) واتە (سەید حوسێن) لە باوەڕدارانە.

١٩- لەپەراوێزدا نووسراوە (هەزاران سوپاس- الاف الشکر) لەبەر ئەوەی ئەو دەربڕینە بەکار ناهێندرێ، بۆیە (هەزار سوپاس- الف شکر)م بەکارهێنا.

٢٠- ئەویش کتێبی (الفرائد في نظم العقائد)ە کە تێیدا شێخ مەعروفی نۆدەهی عەقیدەکانی نووسیبووە و سەید ئەحمەد فائز بەرزنجیش ئەو هەڵبەستەی ڕاڤەکردووە.

٢١- ئەمیش چەند کتێبێکە کە (زانستەکانی وتە بەفەلسەفە)ی لەخۆ گرتووە لەوانەیە کتێبەکەش یەکێک بێت لە نووسراوەکانی شێخ مەعروفی نەودەهی کە نەدۆزراونەتەوە لەوانەش (الفریدة في العقیدة).

٢٢- ئەویش کتێبی (عقد الدر نظم نخبة الفکر)ە، شێخ مەعروف نۆدەهی کتێبی (نخبة الفکر في مصطلح اهل الاثر)ی نووسی کە دەگەڕێتەوە بۆ ئیبن حەجەری عەسقەلانی کە پێک هاتووە لەدووسەد دێڕ.

٢٣- ئاماژە بەوکتێب و ناوبراوانە دەکات لە مۆڵەتەکە، ئەمەش پشتی پێ دەبەسترێ بۆ دەرهێنانی نزا پێویستەکان و دەڵێ، کە ئەگەر پێی بکرابا ئەو کتێبانەی دەنارد لەگەڵ مۆڵەتەکەدا بۆ مەلا ئەبوبەکر (مەلا ئەفەندی) تا پێویست نەبێ، کە بگەڕێن بۆ دەستکەوتنی سەرچاوەکان.

**سەرچاوەکان:**

١- محەمەدی خاڵ: شێخ مەعروفی نەودەهی، بەغدا ١٩٦١ز.

٢- مەلا عەبدولکەریم مودەریس: زانایانمان لەخزمەتی زانست و ئایندان لە بەغدا، ١٩٨٣ز.

٣- زوبێر بیلال ئیسماعیل: کەلتووری ڕۆشنبیری لە کوردستان، کاروان، ژمارە (٢) لا ١٠٢-١٠٧.

٤- زوبێر بیلال ئیسماعیل: زانایان و قوتابخانەکانی هەولێر، موصل، ١٩٨٤ز.

٥- محەمەدی خاڵ: بێتۆشی، بەغدا ١٩٥٨ز.

٦- ئەحمەد سەید ئەقرەع: بەختەوەری هەتا هەتایە لەتەریقەتی نەقشەبەندی، مصر ١٩٧٦ز.

٧- دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانی، بەغداد ١٩٤٦ز.

٨- شێخ محەمەد کوڕی عەبدوڵڵای نەقشەبەندی: البهجة السنیة في اداب الطریقة العلیة الخالدیة النقشبندیة- ١٣٠٣ ك.

٩- ئیبراهیم فەسیحی حەیدەری: ناونیشانی سەربەرزی (عنوان المجد)، ١٢٨٦.

١٠- دەستنووسەکانی حاجی عومەر ئەفەندی و مەلا ئەفەندی و رەشاد موفتی.

١١- مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی- مێژووی زانایانی کورد.

١٢ شێخ مەحموودی قارەمان، محەمەد رەسول هاوار.

١٣- اربل في مختلف العصور عباس العزاوي، ٢٠٠١، مراجعة محمد علي قره داغي

١٤- شێخ رەزای تاڵەبانی، موکەرەم تاڵەبانی.



# مزگەوتی حاجی داوود

دکتۆر عەبدوڵڵا حەداد

**١) سەرنجی گشتی:**

لەنیوەی دووەمی سەدەی هەژدەهەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا، شاری هەولێر گۆڕانکارییەکی ئابووری و بازرگانی و کۆمەڵایەتی و ی و زانستی هەست پێکراوی بەخۆیەوە بینی[١]، ژمارەی دانیشتوانی زیادی کرد[٢]، شار سنووری قەڵاتی بەزاندو تا دەهات ئاوەدانی فراوانتر دەبوو، چەند گەڕەکێکی نوێ زیادیان کرد.. لەو رۆژگاردا پێویستییەکی ئەوتۆ بەبازاڕێکی نوێ و بەرفراوان‌دا سەریهەڵدا. کۆمەڵێک فاکتەرو هۆکار ببوونە مایەی ئەو بووژانەوە هەمەچەشنەیە، لەسەرووی هەموویانەوە، سەقامگیربوونی ئارامی و دوور کەوتنەوەی شار لەمەترسی شاڵاوو داگیرکردن و تاڵان و سووتان[٣] بەرزبوونەوەی ئاستی دارایی خەڵکی ناوچەکە. لەدەوروبەری ساڵی (١٢١٢ک-١٧٩٧ز) مزگەوتی حاجی داوود لەباشووری شار، لەپاڵ چەندین دامەزراوی بازرگانیدا کرایەوە. گرنگییەتی ئەو مەقامە پیرۆزە لەوەدا بوو، کە کەوتبووە ناو جەرگەی (ناوەندی بازرگانی) کۆنی هەولێرو گەورەترین مزگەوتی شاریش بوو، بۆیە لەلایەن خەڵکی شارو میوانەکانییەوە بەمزگەوتی گەورە (جامعی کبیر)[٤] ناسرا بوو. لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا بە (مزگەوتی گەورەی بازاڕ) ناوبانگی دەرکرد. بۆیە لەسەر دەرگای باکووری مزگەوتەکەدا بەعەرەبی ئەم روقعەیەی خوارەوە نووسراوە: (جامع الحاج داوود، جامع السوق الكبير). بێگومان سیفەتی (الكبير: گەورە) تایبەتیە بەمزگەوتە کە لەم دەساڵەی دواییدا، هەندێ کەس بە هەڵە وا چۆتە دڵیانەوە کە گوایا سیفەتی

(الكبير) بۆ بازاڕ دەگەڕێتەوە.
سیفەتی یا ئاوەڵناوی (گەورە= الكبير) سیفەتی مزگەوتەکەیە، وەکو ئەوەی بڵێی (جامع القلعة الكبير) یا (جامع كويسنجق الكبير) یا (جامع السليمانية الكبير)... هتد. ئەگەرچی زاراوەی (بازاڕ) لەتەک زاراوەی (بازێڕ)دا رەگوڕیشەیەکی مێژوویی قووڵیان هەیە[٥]. بەڵام هیچ کاتێک زاراوەی (بازاڕی گەورە) بەم شێوەی ئێستای نە بەکارهاتووەو نەبیستراوە، بۆیە پێویستە لەمەودوا چیدی زاراوەی (بازاڕی گەورە) بەکار نەهێندرێ.

ئەمە لەلایەک، لەلایەکی دیکەوە، لەم چەند ساڵانەی دواییدا، بەشێوەیەکی پڕ لەهەڵەی مەنتیقی و لۆژیکی، باس لەهەندێ شوێنەواری گرنگ و مێژوویی ئەم شارە دێرینەی کوردستان دەکرێ.. سەرچاوەی رەسەن و بەڵگەنامەی متمانە پێکراو لەقسەی بێ بنەماو سەرچاوەی متمانە پێنەکراو لێک ناکرێنەوە.

دیارە کەسانی شارەزاو بەویژدان بەهیچ کلۆجێک بەقسەی هەڵبەستراوو نازانستی بڕواناکەن.

بەش بەحاڵی خۆمان و بەو پێیەی مزگەوتی حاجی داوود، یەکێکە لەمزگەوتە هەرە کۆنەکانی شاری هەولێرو، راستەوخۆ بەخانەوادەی ئێمەوە بەندە.. هەروا لەسەر داواکاری چەند برادەرێکی روناکبیرو قەدرزاندا، بەپێویستمانزانی ئەم کورتە باسەی بۆ تەرخان بکەین. خوازیارین ئەم هەنگاوە بەخزمەتێکی بچووک قبووڵ بکرێ و پسپۆڕو شارەزایانی بوارەکانی مێژووی کۆمەڵایەتی و زانستی و ئایینی سوودی لێ ببینن.

**ب) بنیاتنەری (مزگەوتی حاجی داوود) و رۆڵی لەئاوەدانکردنەوەدا:**

هەروەکو پێشتر گوترا، لەدەوروبەری ساڵی (١٢١٢ک/١٧٩٧ز) خوالێخۆشبوو (حاجی داوودی کوڕی حاجی ئەحمەدی کوڕی سلێمان ئاغای کوڕی محەممەد بارام ئاغای جنداری چیمەنی هەولێری زادە)[٦] کەیەکێ بووە لەدیارترین پیاوماقوولانی هەولێرو دەوروبەری مزگەوتەکەی بنیاتناوە.

(حاجی داوود) خاوەنی چوار کاروانی بازرگانی بووە، ئیلتیزامی چەند گوندێکی (لەوانە گوندی چیمەن و دەوروبەری) پێ سپێردرابوو. مرۆڤێکی خێرخوازو خواناس و راستگۆو رەوشت بەرز بووە. بەنازناوی (مەلا داوود) بانگ کراوە. بەڵام دوای ئەوەی چەند جارێک چووە بۆ حەج، نازناوی (حاجی) بەناوییەوە لکاوە. هێشتا لەتافی لاویدا بووە، بۆ یەکەمین جار بەیاوەری خوالێخۆشبوو (حاجی ئەحمەدی) باوکیدا فەریزەی حەجی بەجێ گەیاندووە. گەلێ شارو شارۆچکەی بینیوە.. مزگەوت و مەدرەسەو کاروانسەراو بازاڕەکانی شارە گەورەکانی ئەو رۆژگارە سەرنجیان راکێشاوە، بیرۆکەی دروستکردنی مزگەوتێکی گەورەو ناوچەیەکی بازرگانی هاوچەرخ لەمێشکیدا چەکەرەی کردووە.

**ج) مزگەوت و دەوروبەری**

لەنیوەی دووەمی سەدەی هەژدەهەمدا، شوێنی (مزگەوتی حاجی داوود) و دەوروبەرەکەی چۆڵایی بووە. پانتایی بازاڕی کۆنی هەولێر، نیو بەقەد پانتاییەکەی ئەمڕۆی بووە. قەیسەری و[٧] خەپەنگ و چیمەنتۆو شێلمان نەبووە[٨] بازاڕ بریتی بووە لەکۆمەڵێک دوکان و هەندێ خان و حەسارو یەک دوو مزگەوتی بچووک، کە قوڕو خشت (کەرپووچ) و کاریتەو ئاڵدار لەبنیاتیاندا بەکارهێنرابوو. (حاجی داوود) ئەو ناوچەیەی تاسەری بەست بەپارە دەکرێ. ئینجا بەراوێژکاری وەستاو پسپۆڕان نەخشەو پلانێکی ورد بۆ ئاوەدانکردنەوەی شوێنەکە بەم شێوەیەی خوارەوە دادەڕێژێ:

١- دروستکردنی بازنەیەک (دەورەیەک) دوکان، کەپاشان تایبەتی بوو بەعەتارو چەخماخچییەکان.
٢- دروستکردنی مزگەوتێکی گەورە.
٣- دروستکردنی دوو قاوەخانە.
٤- دروستکردنی نانەواخانەیەک.
٥- دروستکردنی حەسارێکی گەورە، کە بەشێکی کەوتبووە لای قیبلەی مزگەوت (شەقامی ئاشتی ئێستا) و هەموو (بازاڕی سیروانی) ئێستای گرتبۆوە[٩].
٦- لەتەنیشت حەساردا، خانوویەک (کاروانسەرایەک) کە

هاوسنووری حەسارەکە بووە. ئەوساکە شەقامی ئاشتی نەبووە، لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا بە (خانووی ئێلەکچییەکان) مەشهوور بووە[10].

٧- ئەوبەری دەرگای باشوور (قەیسەری ئێستا) بریتی بوو لەگۆڕەپانێکی گەورەو کۆمەڵێک چارداغ کە گومرگی لێبوو[11].

٨- لەلای دەستەچەپی گومرگیشدا کەئێستا (شوێنی پرێمزچییەکان)ە ریزێک دوکان دروست دەکرێ، کە بە بازاڕی پالآنچییەکان (کورتاندرووەکان) دەناسرایەوە[12].

لێرەدا پرسیارێک سەرهەڵدەداتەوە، ئەویش ئەوەیە ئایا لەبەرچی (حاجی داوود) بیری لەدروستکردنی حەمامێک (گەرماوێک) نەکردۆتەوە؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکرێ، کە لەگەڕەکی خانەقا (نزیکی باغی شارو لەشوێنی باتیمانی (عیمارەی حاجی یەحیا)، دوو حەمام هەبووە، یەکیان (حەمامی گەورە) و ئەوی دیکەیان (حەمامی گچکە) کە لەساڵی (١٢٠١ک/١٧٨٦ز)دا دروست کرابوون. کەواتە ئەوساکە پێویستییەکی ئەوتۆ لەئارادا نەبووە حەمامێکی دیکە دروست بکرێ، چونکە ئەو دوو حەمامە لەمزگەوت و حەسارو خانووەکانەوە زۆر نزیک بوون.

**د- وەسفی مزگەوتەکە**

بەپێی نەخشەی رەسمی، پانتایی مزگەوتی حاجی داوود (١٧٢٠) مەتری چوارگۆشەیە. لەو رۆژگارەدا، بۆ شارێکی بچووکی وەکو هەولێر، گەورەترین مزگەوت بووە. مزگەوتەکە لەم بەشانەی خوارەوە پێکهاتبوو:

١- حەرەمی نوێژ (حرم الصلاة): پانتاییەکەی نزیکەی (٦٠٠) مەتری چوارگۆشەیی بووە، لەکاتی دروستکردندا سەرەکەی بە[10] گومبەز داپۆشرابوو، دیوارەکانی نزیکەی دوو مەتر ئەستوور بوون، کۆڵەگەو تاقەکانی بەشێوەیەکی ئەندازیاری زۆر رێکوپێک دروست کرابوون، بۆ دابینکردنی رووناکی و تیشکی رۆژیش، لەبەشی خوارەوەی دیواری پێشەوەدا چەندین پەنجەرەی گەورە هەبووە، لەبەشی سەرەوەی هەر چوار لاشدا چەندین پەنجەرەی بچووک.

لەحەرەمدا دوو میحراب و[13] مینبەرێکی بڵند بەرچاو دەکەوت، وتاربێژ لەمیحرابی سەرەکییەوە بەهۆی پەیژەیەکی لەناو دیوار دروستکراودا بەسەر مینبەر کەوتووە. لەبەرامبەری مینبەردا مەحفەلێکی تایبەتی بۆ قورئان خوێن و بانگدەرو یارمەتیدەری وتاربێژ تەرخان کرا بوو. بێجگە لەدەرگای سەرەکی حەرەم، لەم بەرو ئەوبەری دەرگای سەرەکیدا دوو سێ دەرگای بچووکتر هەبوون.

٢- بەر لەوەی بچیتە ناو حەرەم، رەواقێکی (واتە بەرهەیوانێکی) زۆر جوان هەبووە، پانییەکەی نزیکەی (٨) هەشت مەتر بووە، درێژییەکەشی بەقەد درێژی حەرەم بووە، پێشەوەی بریتی بووە لەچەندین تاق، بەڵام سەرەکەی بەکاریتەو ئاڵدارو حەسیر داپۆشرا بوو، ئینجا سواغ در بوو. ساڵی ١٩٦٠دا حاجی محەمەد رووخاندی و بەکۆنکرێتی موسەلەح سەرەکەی داپۆشی، لای دەستە چەپیش واتە (حوجرەی ئیمامی ئێستا) بریتی بووە لەگۆڕستانێکی تایبەتی بەخانەوادەی (حاجی داوود). لەساڵی ١٩٤٠دا خوالێخۆشبوو حاجی محەمەد ئەو گۆڕستانەی تەخت کردو حوجرەی ئیمامی لەسەردا بنیات نا.

٣- حەوشی مزگەوت (صحن الجامع): لەو حەوشەوە دەچوونە ناو حەرەم، لای دەستە چەپی (حوجرەی حافزەکانی ئێستا) هۆڵێکی گەورە وەکو حەرەمێکی بچووک هەبووە. لەلای دەستە راستیشدا تەختەبەندێکی گەورە بۆ نوێژی هاوینان هەبووە حەوزێکی خنجیلانە بۆ دەستنوێژ هەڵگرتن لەناوەڕاستیدا بووە (لەجێگەی هۆڵی بۆنەیییەکان)ی ئێستادا، لەدوو لای تەختەبەندەکەدا کۆمەڵێک حوجرەی رێکوپێک هەبووە، یەکێکیان بۆ وتاربێژو ئیمام، یەک دوو حوجرە بۆ مامۆستایان، سێ چوار حوجرەش بۆ فەقێ و غەریبان. بێجگە لەکۆگاو حوجرەی خزمەتگوزارو پاسەوانەکان.

٤- لەلای باشووردا دوو دەرگای هەبووە، یەکێکیان بۆ هاتووچۆی نوێژکەران، ئەوی دیکەیان کە کەوتبووە لای دەستە راستی بەشی خوارەوەی منارە، تایبەتی بووە بۆ بارگیری ناعوردەوان[14]. چونکە

مزگەوت بۆ دابینکردنی (ئاو) ناعورێکی تایبەتی هەبووە، ئەو بارگیرە نزیکەی بیست مەترێک لەو دەرگایە چۆتە دەرەوە تا ئاودەر چووە. ئینجا دووبارەو چەند بارە گەڕاوەتەوە.

٥- لای دەستەچەپی حەرەم تایبەتی بووە بۆ پێش ئاوو تەهارەت و، ئاودەستخانە. شیاوی ئاماژە پێدانە، لوێنیێکی واتە (زێرابێکی) تایبەتی بەخشت دروستکراو بەناو حەساری (حاجی داوود) و گەڕەکی سەعدوناوەی ئێستادا تێدەپەڕی تا دەگەیشتە بەستی هەولێر. دیارە ئەو ناوە-لەو کاتەدا- چۆلایی بووەو هێشتا دەستی ئاوەدانی نەگەیشتبووێ[١٥].

٦- منارەی مزگەوت: بێجگە لەمزگەوتی حاجی داوودو منارەکەی سولتان موزەفەر (منارەی چۆلی) لەو قۆناغەدا هیچ مزگەوتێکی خاوەن منارە لەشاری هەولێردا نەبووە، منارەی مزگەوتی حاجی داوود کە منارەیەکی سپی و بازنەیی خنجیلانە بووە، لەشوێنی ئێستای منارەکەیدا بوو[١٦]. دیارە ئەو کاتە منارەو گومبەزەکانی ئەو مزگەوتە پیرۆزە (لەخوارەوەی شاری هەولێر)دا بەرزترین ساختمانی شار بووە. لەدەوروبەری شار، یا لەقەلاتەوە سەیرت بکردایە، دیمەنێکی جوانی بەشارەکە دەبەخشی. چونکە نەبینایەی بەرزو نەعیمارەو نەهیچ قەیسەرییەک لەشاردا نەبووە تا دیمەنی قەلات و دیمەنی مزگەوتی حاجی داوود بشارێتەوە، ئەم دیاردەیە سەرنجی گەڕۆکە بیانییەکانی بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە، کە لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا بەهەولێردا تێپەڕیون چەندین تێبینیان تۆمار کردووە[١٧].

### ه) ئەرکەکانی مزگەوت و هەندێ تێبینی دیکە

مزگەوتی حاجی داوود لەبەر شوێنی ستراتیژییەکەی، لەزووەوە ببوو بەمەڵبەندێکی ئایینی و زانستی و کۆمەڵایەتی یەکجار گرنگی شاری هەولێر، سەرەڕای ئەوەی پێنج فەرزە نوێژو وتاری هەینی و دوو نوێژی جەژنەکانی تێدا ئەنجامدەدرا، کەش و هەوایەکی لەباریش ڕەخسابوو بۆ خوێندن و بۆ سازدانی ئاهەنگی مەولوودی پێغەمبەر (د.خ). هەروا باشترین شوێنیش بووە بۆ پرسەو سەرەخۆشی. لەهەندێ بۆنەو موناسەبەشدا خەڵکی تێدا کۆبوونەتەوە (بۆ چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتییەکانیان، یا بۆ ئەنجامدانی کاری خێر، هەر لەسەردەمی (حاجی داوود)دا خوالێخۆشبوو (حاجی مەلا هیدایەتی) کوڕی، سەرجەم کاروباری بازرگانی و ئیداری مزگەوتی باوکی لەئەستۆ بووە هەتا پێی کراوە یارمەتی هەژارو لێقەوماوو غەریب و زاناو فەقێیانی داوەو پێداویستییەکانی دابین کردوون، لەسەردەمی حاجی مەلا هیدایەتدا لەسەر ڕێنمایی و وەسیەتی باوکی) بەپێی یاسای نوێی دەوڵەت (وەقفنامەی مزگەوتی حاجی داوود) تۆمار کراوە، بەم پێیە لایەنی سەرپەرشتکاری (جهة التولية) وەکو مەرجێکی سەرەکی بەلێوەشاوەترین کوڕو نەوەزاکانی تایبەتی بووە[١٨]. چونکە ئاشکرایە (وەقف) جۆرێکە لەجۆرەکانی سەدەقە، واتە (فرض) نییە، پێویستە موڵکی وەقفکراو هی خودی واقیف بێ، بۆیە مەرجەکانی واقیف وەکو یاسا وایە (شرط الواقف كنص الشارع)[١٩]. لەبەر ئەم هۆکارە، هەر جۆرە پێشێلکارییەک بۆ مەرجەکانی واقیف (خاوەن موڵک)، بەگەورەترین گوناه لەقەڵەم دەدرێ، لەهەمان کاتدا وەقفەکە پووچەڵ دەکاتەوە. ئەم خاڵەش بۆتە مایەی ئەوەی یاساناس و گەورە زانایانی موسڵمان ڕێزێکی زۆر لەمەرجەکانی واقیف بگرن، نەیەڵن بەهیچ شێوەیەک دەستدرێژی لەسەر بکرێ.

لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا، (أبو الثناء شهاب الدين الالوسي) لەکتێبی (نشوة المدام في العود الى مدينة السلام)[٢٠] بەو پەڕی ڕێزو حورمەتەوە باسی (حاجی مەلا داوودی کردووە، پێدەچێ ئەو کاتە حاجی داوود لەتەمەنی (٩٠) نەوەد ساڵیدا بووبێ.

### و) هەندێ ڕوونکردنەوە

حاجی مەلا هیدایەتی کوڕی حاجی مەلا داوود، لەدەوروبەری ساڵی (١٢٩٧ک-١٨٧٩ز) لەتەمەنی (٨٠) ساڵیدا، لەڕێگەی حەجی شەریف لەناو پاپۆڕدا کۆچی دوایی دەکا. یەکێ لەکوڕەکانی لەو

گەشتەدا لەگەڵیدا بووە، بەدڵشکاوی دەگەڕێتەوە.

حاجی مەلا هیدایەتی کوڕی حاجی داوود چوار کوڕی هەبووە بەم ناوانە: داوود ئەفەندی، سلێمان ئەفەندی، حاجی سەلیم، مەلا ئەحمەد.

**ز) تەولیەی داوود ئەفەندی کوڕی حاجی هیدایەت کوڕی حاجی داوود:**

ئەم زاتە زانایەکی ناوداری سەردەمی خۆی بووە، بەپێی دابونەریتی سەردەمەکەی بەنازناوی (داوود فەهمی ئەفەندی) ناسراوە. لەبەر لێوەشاوەیی لەچەند شوێنێکی کوردستاندا پۆستی قازیایەتی وەردەگرێ. لەساڵانی (١٢٣٩-١٢٩٥) کۆچی (١٨٧٥-١٨٧٨) زایینی، لەسنجەقی سلێمانیدا قازی بووە[٢١]. لەوێ ئامینەخانی کچی شێخ عەبدوڵلای کوڕی شێخ ئەحمەدی نەقشبەندی هەولێری دەهێنێ[٢٢]، لەم ژنەی دوو کوڕی بووە، حەمدی ئەفەندی و محەمەد ئەمین ئەفەندی.

لەساڵی (١٢٩٨ک-١٨٨٠ز) دوای وەفاتی حاجی مەلا هیدایەت و بەپێی فەرمانێکی رەسمی ئەمانەتی تەولیەی وەقفی مزگەوتی حاجی داوودی باپیری پێدەسپێردرێ[٢٣] تا ساڵی ١٣٠١ک-١٨٨٣ز لەهەولێر خەریکی رێکخستنی کاروباری مزگەوت و خێزانەکەیان دەبێ. ئینجا دەوڵەت داوای لێدەکات لەچەند شوێنێکی کوردستانی باکووردا پۆستی قازیەتی (کە ئەوساکە پێی دەگوترا نائیب) وەربگرێ. ناو بەناو سەر لەهەولێر دەدا، لەو ماوەیەی کەخەریکی فەرمانی قازیەتی بووە، بەپێی ئامۆژگاری خۆی، براکانی کاروباری مزگەوتیان بەڕێوە بردووە. لەساڵی (١٣٠٨ک-١٨٩٠ز) نائیبی (قازی) باژێری (خیزان) بووە لەویلایەتی (بتلیس)، دوای ساڵێک قازی (ئایواجاق) بووە لەسنجەقی دەرسیم. لەساڵی ١٣١٨ک رۆمی (١٣٢٠ک-١٩٠٢ز)دا کەقازی بووە لەباژێری (کەبان) لەویلایەتی (معمورە العزیز) لەکوردستانی باکووردا کۆچی دوایی دەکات و هەر لەوێش تەرمەکەی بەخاک دەسپێردرێ[٢٤] دوو کوڕەکەی دەگەڕێنەوە بۆ هەولێر، بەداخەوە محەمەد ئەمین لەساڵی ١٩٠٤ و حەمدی لەساڵی ١٩٠٥ کۆچی دوایی دەکەن، تەرمیان لەگۆڕستانی مزگەوتی حاجی داوود بەخاک دەسپێردرێ.

ئەوەی راستی بێ، تێپەڕبوونی پتر لە (دووسەد) ساڵ بەسەر بنیاتنانی مزگەوتی حاجی داوود و ئاوەدانکردنەوەی دەوروبەرەکەی، یەکێک بوو لەو هۆکارانەی، کە کۆمەڵێک گرفت و ئیشکالیەتی زانستی لەبەردەم تۆژینەوەدا قووت کردەوە. بەپشت بەستن بە بەڵگەنامەو دۆکیمێنتی رەسمی و سەرچاوەی زارەکی و زیارەتی مەیدانی، توانیمان بەسەر بەشێکی ئیشکالییەتەکاندا زاڵ بین و، چەندین گیروگرفت خاوکەینەوە. لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە دان بەوەدابنێین کە لەناوچوون و فەوتانی چەندین بەڵگەنامەی گرنگ- لەلایەکەوەو، کەمتەرخەمی و بایەخ نەدانی نەوەکانی پێشوو بەتۆمارکردنی مێژووی شارستانییەتی شارەکەیان لەلایەکی ترەوە- بۆتە مایەی ئەوەی هەست بەهەندێ بۆشایی بکرێ، زۆر لایەنی بابەتەکەمان بۆ چارەسەر نەکرێ، بەتایبەتی لەبواری دەستنیشانکردنی رۆڵی چەندین زاناو گەورەپیاو کە خزمەتی ئەو مزگەوتەو خەڵکی شاریان کردووە.

ئامادەکەری ئەم باسە، لەپاڵ پسپۆڕی خۆیدا لەبواری ئەدەب و مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا، پتر لە (٣٠) ساڵە، بەڵگەنامەو زانیاری سەبارەت بەمێژوو و کەلەپووری شاری هەولێر کۆدەکاتەوە، لەمبارەیەوە، بێجگە لەئەرشیفی تایبەتی خانەوادەکەیان و خوێندنەوەی دەیان سەرچاوەی کۆن و دەگمەن کە لەکتێبخانەی گشتی کەرکوک و کتێبخانەکانی: مۆزەخانەی (موسڵ) و (بەغدا) و (سلێمانی)دا پارێزراون، هەروا بێجگە لەخوێندنەوەی ئەو سەرچاوانەی لەکتێبخانەکانی زانکۆی سۆربۆن و شاری پاریس و مۆزەخانەی لەندەندا پارێزراون، بەوردی زۆربەی "سجلاتی" کۆنی دادگای هەولێری پشکنیوە کەتا ناوەڕاستی هەشتاکانی سەدەی بیستەم پارێزراو بوون وێڕای ئەوەش، سوودێکی زۆری لەپیاوە بەساڵاچووە

راستگۆیەکان بینیوە، کە بەر لەساڵی (١٩٨٠) لەمەقامی باوکی، یا لەدیوەخانەکانی پیاو ماقووڵانی شاردا بەخزمەتیان گەیشتبوو، یانیش بەشێوەیەکی تایبەتی پەیوەندیانی پێکردبوو.. (لەپەراوێزەکانی (بەشی یەکەمی) ئەم باسە ئاماژە بەناوی هەندێ لەو زاتانە کرابوو).

ئەم زەمینەیە، پتر دەرفەتی بۆ رەخساندین، بەشێوەیەکی بابەتیانە، لەمێژووی (مزگەوتی حاجی داوود) بکۆڵینەوە. لەم بەشەی باسەکەماندا، هەوڵ دەدەین بەئەندازەی توانا تیشک بخەینە سەر هەندێ لایەنی تری مێژووی ئەم مزگەوتەو باسی گرنگترین گۆڕانکارییەکانی بکەین، هەروا باسی ئەو کەسانەش بکەین کەخزمەتیان کردووە. خوازیارین ئەم تەقەلا بچووکە (بەهەردوو بەشەکەیەوە) بەخزمەتێکی بچووک بۆ مێژووی شارستانییەتی شاری هەولێری خۆشەویست قبووڵ بکرێ و، ببێ بەکەرەسەو سەرچاوەیەکی سوود بەخش بۆ ئەوەی پسپۆڕو تۆژینەران کەڵکی لێ وەرگرن.

**أ) گۆڕانکاری و نۆژەنکردنەوە**

لەم سی ساڵەی دواییدا، رواڵەت و دیمەنی گەڕەک و ناوچە کۆنەکانی شاری هەولێر، گۆڕانکارییەکی هەست پێکراویان بەخۆوە بینیوە، کە بەرهەمی ئەو گۆڕانکاری و وەرچەرخانە ئابووری و کۆمەڵایەتی و پیشەسازییانەیە کەسوونەتی پێشکەوتن سەپاندوونی..

لەسەدەکانی هەژدەهەم و نۆزدەهەم و چارەکی یەکەمی سەدەی بیستەمدا، کەرەستەکانی بواری بیناسازی بەپلەی یەکەم بریتی بوون لە: خشت، کەرپووچ و قوڕو دارو ئاڵدارو کاریتەو گەچ..هتد ئەو کەرەستانەش لەئاست دیاردەکانی سروشت: (گەرماو سەرماو بەفرو باران و لافاوو بوومەلەرزەو سووتان و کرم و مۆرانەو رتووبەت....هتد) توانای بەرگری کردنیان هەتا بڵێی لاوازبوو.. تەمەنیان کورت بوو. لەبەر ئەم هۆکارە، پێویست بوو بەردەوام بایەخ بەهەموو بیناکان بدرێ و بەردەوام نۆژەن بکرێنەوە، یا ناو بەناو سەر لەنوێ بنیات بنرێنەوە.

ئەگەرچی، بینایەی مزگەوتی حاجی داوود، لەچاو زۆربەی هەرە زۆری بیناکانی بەشی خوارەوەی شاری هەولێر بینایەکی پتەو و قایم بوو، دیوارەکانی بەرین و بەهێز بوون، باشترین کەرەستەی بیناکاری تیادا بەکار هاتبوو، بەڵام بەتێپەڕبوونی زەمەن، درزی تێدەکەوت و پێویستی بەچاودێری دەبوو...

حاجی مەولا هیدایەتی کوڕی حاجی داوود، کەگوتمان هەر لەسەردەمی باوکییەوە کاروباری مزگەوتی هەڵدەسووڕاند (تا ساڵی وەفاتی ١٨٧٩) هەموو پێداویستییەکانی مزگەوتی دابین دەکرد، ئەگەر کەلێنێک بکەوتبایەتە حوجرەیەک، یا شوێنێکی مزگەوت، دەمو دەست چارەی دەکردو پڕی دەکردەوە. بێجگە لەوە، نانەواخانەکەی (کە کەوتبووە لای دەستە چەپی دەرگای بەرامبەر قەیسەری کەئێستا شوێنی بەرێز یاسین پاشاو حاجی نامیقە) رۆژانە نانی بەسەر فەقیرو هەژاراندا دابەش دەکرد!

لەدێرەکانی داهاتوودا، هەوڵ دەدەین باسی گرنگترین گۆڕانکاری و نۆژەنکردنەوە بکەین:

١- بەپێی ئاگاداری ئێمە، لەساڵی (١٨٩٥)دا، دوکانەکانی دەوروبەری مزگەوتی حاجی داوود دەسووتێن(٢) ئەم سووتانە کار دەکاتە سەر هەندێ لایەنی مزگەوتەکە. ئەو کاتە بەهەشتی (قازی داوود ئەفەندی کوڕی حاجی مەلا هیدایەتی حاجی داوود زادە) متەوەلی بووە، بەخۆی و براکانی، دەمودەست ئاسەواری ئەو رووداوە لەناو دەبەن و مزگەوت و دەوروبەرەکەی نۆژەن دەکەنەوە، ئەو نۆژەنکردنەوەیە بەهیچ کلۆجێک کار ناکاتە سەر نەخشەی بنەڕەتی و مەرافیقی مزگەوتەکەیان.

٢- لەماوەی جەنگی یەکەمی جیهانیدا (١٩١٤-١٩١٨) لەهەموو رووییەکەوە بارودۆخی شاری هەولێر دەشڵەژێ، لەشکری شپرزەو لاوازی دەوڵەتی عوسمانی، حەرەمی مزگەوت و چەند حوجرەیەکی دەکەن بەمۆڵگە، وەکو نەخۆشخانەیەک بەکاری دەهێنن.. لەسەرماو سۆڵی سەختی زستاندا، دەرگاو پەنجەرەو کاریتەو ئاڵدارەکانی مزگەوت، وەکو سووتەمەنی بۆ خۆ گەرمکردنەوە بەکاردەهێنن، خوالێخۆشبوو (مەلا

ئەحمەدی کوڕی حاجی مەلا هیدایەتی حاجی داوود زادە) کە ئەوساکە متەوەلی بووە، چەند جارێک لەو ڕۆژگارە شوومەدا، مزگەوتەکە نۆژەن دەکاتەوە، بەلام بێ سوودبووە، چونکە هەمدیسان ئەفسەرو سەربازەکان، ڕەفتارەکانیان دووبارەو سێ بارە دەکەنەوە، لەسالانی (١٩١٧-١٩١٨) بارودۆخی ولات لەجاران خراتر دەبێ، قات و قڕی و گرانیش بالی ڕەشی بەسەر پاکی ولاتدا دەکێشێ، ئەو خالەش دەبێتە هۆی ڕمانی بەشێکی زۆری مزگەوتەکە، تەنانەت (حەرەمی نوێژ) وەکو کەلاوەی لێدێت[٣] وتار رادەوەستێ. تاکە هۆلێک بەلای دەرگا (لەشوێنی حوجرەکانی نابینایانی ئێستاکەدا) دەمێنێتەوە، کە پیرو پەککەوتەکان پێنج فەرزە نوێژی تیادا ئەنجام دەدەن[٤].

پاش راوەستانی جەنگ و کشانەوەی لەشکری عوسمانی- لەپایزی سالی ١٩١٨دا- متەوەلی: مەلا ئەحمەدی حاجی مەلا هیدایەت بەهیمەت و کۆششی وەستا دەست رەنگینەکانی شارو بەهاوکاری خاوەن پیشەو پیاو ماقوول و مەلاو فەقێ و فەرمانبەرو پاکی هاوولاتییان، سەرلەنوێ و لەماوەیەکی زۆرکەمدا مزگەوتی (حاجی داوود) بنیات دەکەنەوە، ئەمجارەیان لەباتی (دە) گومبەز، ١٤ (چواردە) گومبەز لەسەربانی حەرەمی نوێژدا دروست دەکرێ، لەناوەڕاستی گومبەزەکانیشدا منارەیەک لەباتی منارەی پێشوو هەلدەچنرێ[٥].

شایانی ئاماژە پێدانە، لەو هەلمەتەدا، هەمان کەرەستەکانی بینا کۆنەکە بەکار دەهێنرێ، هەروەها دیوارەکان بەهەمان سیستەم و قەوارەی جارانی بنیات دەنرێت، تەنیا دوو گۆڕانکاری روو دەدەن، یەکەمیان: منارەی گومبەزەکان زیاد دەبن، دووەم: شوێنی منارەکە دەگوێزرێتەوە بۆ سەربان و ناو گومبەزەکان[٦].. ئەم خالەش هەلەیەکی ئەندازیاری بوو، چونکە قورساییەکی زۆری خستبووە سەربانی مزگەوت کە دەبووە مایەی ڕمانی. پاشان هەر وەکو دەبینین خوالێخۆشبوو متەوەلی (حاجی محەمەد کوڕی مەلا ئەحمەد) ئەو هەلەیەی راست کردەوە[٧].

**ب) قۆناغێکی نوێ:**

١- دوای وەفاتی مەلا ئەحمەدی حاجی داوود زادە لەسالی (١٩٣٣) جیهەتی تەولیە ئاراستەی (حاجی محەمەدی کوڕی مەلا ئەحمەد) کرا، بەم جۆرە قۆناغێکی نوێ لەمێژووی مزگەوتی (حاجی داوود)دا دەستی پێکرد. لە سالی (١٣٥٩ک/ ١٩٤٠ز) خوالێخۆشبوو (متەوەلی: حاجی محەمەد) لەسەر ئەرکی خۆی مزگەوتی باپیری بەتەرزێکی جوان نۆژەن دەکاتەوە، هەموو کەموکوڕییەکانی چارەسەر دەکات. لەدێڕەکانی داهاتوودا بەکورتی باسیان دەکەین:

- رووخاندنی منارەکەی ناو گومبەزەکان کە مەترسییەکی زۆری هەبوو، دروستکردنەوەی منارەیەکی نوێ لەشوێنی ئەسلیی خۆیدا-کە لەسەردەمی حاجی داووددا دروست کرابوو- ئێستاش مێژووی بنیاتنانی منارە نوێیەکە، لەسەریدا تۆمارکراوە (١٣٥٩)ک کەدەکاتە (١٩٤٠)ز.
- دروستکردنی حەوزێکی جوان لەسەر (تەختەبەند) لەحەوشی مزگەوت.
- پڕکردنەوەی هەموو درزو کەلێنەکانی گومبەز و تاقەکانی (حەرەمی نوێژ) و سپیکارییەکی گشتی.
- کێشانی تۆڕی ئاو بۆ حەوزو ئاودەستخانەکان بەتەرزێکی هاوچەرخانەو دابینکردنی کارەبا.
- ڕێکخستنی شوێنی دەسنوێژ شووشتن و دروستکردنی چەندین ئاودەسخانەی نوێ.
- بایەخدان بەزێراب و ئاوەڕۆ.

لابردنی گۆڕستانی تایبەتی خانەوادەکەیان (خانەوادەی حاجی داوود)[٨] و دروستکردنی حوجرەی (ئیمام و وتار بێژ) لەشوێنیدا.

دروستکردنی چەند حوجرەیەک بۆ مامۆستاو فەقێ و قورئان خوێن و خزمەتچی و پاسەوان و هەژارو لێ قەوماوان.

- تەرخانکردنی حوجرەیەکی تایبەتی بۆ نابیناو منالان و دامەزراندنی مامۆستای تایبەتی بۆ دەرس وتنەوە[٩]، لەو ساکەوە ئەو مزگەوتە بۆتە بارەگاو شوێنی کۆبوونەوەی سەرجەم نابیناو حافزەکان، هەموو حافزو قورئان

خوێنەکانی شاری هەولێرو دەوروبەری دەرچووی ئەو قوتابخانەیەن، چونکە لەو قۆناغـەدا، لایەنێکی بەرپرس نەبوو چاودێری ئەو توێژە لێقەوماوە بکات. بەهەشتی (حاجی محەمەد مەلا ئەحمەدی حاجی داوود زادە) بایەخێکی تایبەتی بەقورئان خوێن و موجەوییدو دەنگخۆش و بەهرەدارەکانی دەدا، یەکجار پەرۆشی خزمەتی مزگەوتەکەی بوو[10].

٢- لەساڵی (١٩٥٢)دا، بۆ یەکەمین جار لەمێژووی مزگەوتەکانی شاری هەولێر ئامێری بڵندگۆی (مكبرە) لەو مزگەوتەدا بەکار هات، شار ئەوساکە وەکو ئێستاکە قەرەباڵغ و گەورە نەبوو، لەگوندەکانی دەوروبەری هەولێریش گوێیان لەدەنگی بانگدەرو قورئان خوێن و سەلاکێشەکان دەبوو.

٣- لەساڵی (١٩٦٢)دا سەر لەنوێ خوالێخۆشبوو (حاجی محەمەد) مزگەوتەکەی نۆژەنکردەوە، بەر هەیوانە کۆنەکەی رووخاندو بەر هەیوانێکی تازەی بەچیمەنتۆو کۆنکرێتی موسەلەح دروستکردەوە، حەوزێکی گەورەی لەژێر منارەکەدا دروست کـرد لەپاڵ چەندین ئاودەستخانەی نوێی، کەموکورییەکانی گومبەزەکانی نەهێشتەوە، هەمدیسان بایەخی بەشوێنی دەستنوێژ هەڵگرتن دا.. هتد.

٤- لەساڵی (١٩٨٣)، لەسەردەمی تەولیەی کوڕەکانی خوالێخۆشبوو (حاجی محەمەد مەلا ئەحمەد) هۆڵێکی گەورەی موناسەبات دروست کرا، کەپێشتر لەلایەن حاجی محەمەدەوە نەخشەی بۆ دانرابوو و کۆڵەگەکانی دانرابوون.

٥- لەساڵی (١٩٩٥) لەلایەن متەوەلییەوە منارەی مزگەوت نۆژەن کرایەوە، هەروا بەشێکی زۆری کەموکورییەکانی حەرەم و سەربان و گومبەزەکان چارەسەرکران، لەساڵی (١٩٩٩)شدا دیوانی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران راستەوخۆ سەرپەرشتی نۆژەنکردنەوە و کەرەستە بۆ هێنانی کرد، لەوانە بەکارهێنانی بەردی حەلان.

**ج) متەوەلییەکانی وەقفی مزگەوتی حاجی داوود:**

١- لەبەشی یەکەمی ئەم باسەدا، ئاماژە بەوەدرا کە خوالێخۆشبوو (حاجی مەلا هیدایەتی کوڕی حاجی داوود) هەر لەسەردەمی باوکییەوە کاروباری مزگەوتەکەی بەڕێوەدەبرد، پاشان بەپێی سیستەمی ئیدارەی نوێی دەوڵەت (لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا) وەقف و مەرجەکانی (واقف) تۆمار کرایەوە بەو پێیە ئاراستەکردنی (جیهەتی) تەولییە تایبەتی بوو بەنەوەو نەوەزاکانی واقیف.

٢- لەساڵی (١٢٩٨هـ/ ١٨٨٠ز) بەپێی حوجەی تەولییەی ژمارە (٦٦) لە ١٠ی موحەڕەمی / ١٢٩٨ (کۆچی) جیهەتی تەولییە بەخوالێخۆشبوو قازی (داوود ئەفەندی کوڕی حاجی مەلا هیدایەت کوڕی حاجی داوود) ئاراستەکرا[11]. تا وەفاتی لەساڵی (١٩٠٢) ئەو ئەمانەتەی گرتە ئەستۆ، ئینجا بۆ ماوەیەکی کەم، کوڕەکەی خوالێخۆشبوو (حەمدی ئەفەندی) تا وەفاتی لەساڵی (١٩٠٥)دا بوو بەمتەوەلی.

٣- لەساڵی ١٩٠٦ز بەپێی حوجەی تەولییەی ژمارە (١٥١) لە ١٢/ رەبیعولئاخر/ ١٣٢٥ (کۆچی) مەلا ئەحمەدی کوڕی حاجی مەلا هیدایەتی کوڕی حاجی داوود ئاراستە کرا. تا وەفاتی لەساڵی ١٩٣٣ ئەو ئەرکەی لەئەستۆدا گرتبوو.

٤- لەساڵی (١٣٥٣ک/١٩٣٥ز) بەپێی فەرمانی شاهانە (ارادة ملكية)ی ژمارە (١٠٧) لەرۆژی ٢٧/ ژی الحجە/ ١٣٥٣ (کۆچی) بەرانبەر (١/ نیسانی/ ١٩٣٥)(١٢) و بەپێی فەرمانی وزاری ژمارە (٣٧) لە ٢٨/ نیسانی/ ١٩٣٥(١٣) جیهەتی تەولییە ئاراستەی خوالێخۆشبوو (حاجی محەمەد مەلا ئەحمەد حاجی مەلا هیدایەت حاجی داوود) کرا. تا رۆژی وەفاتی لە (١٥/سەفەر/ ١٣٩٩ک/ ١٤/١/١٩٧٩) زۆر بەرێکوپێکی ئەو ئەمانەتەی ئەنجام دا.

٥- دوای وەفاتی حاجی محەمەدی مەلا ئەحمەد (لەساڵی ١٩٧٩)، بەپێی بڕیارێکی دادگای شەرعییە لەساڵی ١٩٨٠ و فەرمانێکی وەزاری وەزارەتی و ئەوقاف و کاروباری ئایینی لەساڵی ١٩٨١ جیهەتی تەولییەی وەقفی

(حاجی داوود) ئاراستەی هەردوو بەڕێزان: (حاجی نورەدین) و (د.عەبدوڵڵا)، کوڕانی خوالێخۆشبوو حاجی محەمەدی مەلا ئەحمەدی حاجی داوود زادە کرا. ئەوەبوو لەساڵی (١٩٩٣) بەڕێز حاجی نورەدین داوای (إعفای) کرد، لەو ساکەوە (د.عەبدوڵڵا حاجی محەمەد حاجی داوود زادە) ئەرکی تەولیە بەڕێوە دەبات.

**د) ناوی ئیمام و تاریبێژ:**

مایەی داخە، ناوی زۆربەی هەرە زۆری ئیمام و وتاربێژەکانی مزگەوتی حاجی داوود لەسەدەی نۆزدەهەمدا بەئێمە نەگەیشتووە، لەدێرەکانی داهاتوودا بەگوێرەی توانا ناوی ئیمام و وتاربێژەکان تۆمار دەکەین:

١- لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا (مەلا سلێمان کوڕی مەلا فەتاح (فتح الله زادە) ئیمام و وتاربێژی مزگەوتی حاجی داوود بووە[14] ئەم زاتە کەحوجرەو فەقێشی هەبووە، باوکی زانای ناودارو ڕێبەرو بڵاوکەرەوەی تەریقەتی نەقشبەندی لەمیسر (الشیخ محمد أمین الكردي الشافعي النقشبندي الاربلي) (١٨٣٠-١٩١٣)یە، پێدەچێ (مەلا سلێمان) زانایەکی ناوداری سەردەمەکەی بووبێ، لەسەر تەریقەتی قادریش بووە، مێژووی هاتنە دنیاو وەفاتی نەزانراوە.

٢- بەپێی ئیعلامی ژمارە (٨٤) کە لەڕۆژی ٢٦/ شەعبان/ ١٣٢٤/ (١٩٠٥) زایینی لەدادگای شەرعییەی هەولێر دەرچووە، ئیمام و وتاربێژی مزگەوتی خوالێخۆشبوو حاجی داوود (کە یەکێکە لە أصحاب الخیرات) وەفاتی کردووە، خوالێخۆشبوو مەلا محەمەد ئەفەندی حاجی حەوێزی مامە، دوای سەلماندنی لێوەشاوەیی خۆی لەبەردەم (ئەنجومەنی شەرعیە)دا کراوە بەئیمام و خەتیبی مزگەوتی حاجی داوود.

٣- دوای ئەوەی مەلا محەمەدی حاجی حەوێزی مامە لەدەوروبەری ساڵی (١٩١١) هەولێری بەجێ هێشتووە، پۆستی (مفتی ئالا) و (قازیەتی) لەچەند شوێنێکی کوردستاندا وەرگرتووە، پاشان تا وەفاتی لەساڵی (١٩٣٤) لەئەستەمبوڵ گیرساوەتەوە (مەلا محەمەدی ئاڵتی برماق/ شەش پل) بۆتە وتاربێژی مزگەوتی حاجی داوود. لەو بەینەدا مەلا عەلی ئەفەندی حاجی حەوێزی مامە (١٥) بۆ ماوەیەک ئیمامەتی کردووە. ئینجا (مەلا سالح دەروێش ئەحمەد) ئیمامەتی کردووە.

٤- لەدەوروبەری جەنگی یەکەمی جیهانی (١٩١٤-١٩١٨) مەلا مستەفا (باپیری موحسین حوسێن کارەباچی) ئیمامەتی کردووە. لەساڵی (١٩١٧) وتار لەو مزگەوتە وەستێنرا.

٥- دوا بەدوا (مەلا جبرائیلی گەلیاوەیی) باوکی مەلا نوردین، تا دەوروبەری ساڵی (١٩٣٠) ئیمامەتی کردووە.

٦- لە ساڵی (١٩٢٥) بەفەرمانی مەلیک فەیسەڵی یەکەم وتار گەڕاوەتەوە بۆ مزگەوت، پێدەچێ مەلا جبرائیل گەلیاوەیی ئەو ئەرکەی ئەنجامدابێ.

٧- لەساڵی (١٩٣٠)ەوە مەلا عەبدوڵڵای شەنەغە کوڕی مەلا ئیسماعیل کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی مەلا عوسمان سێکانیانی(١٦)، هەم ئیمام و هەم وتاربێژ بووە. لەساڵی (١٩٣٥) بەشێوەیەکی ڕەسمی جیهەتی ئیمامەت و وتاری ئاراستەکراوە. تا وەفاتی لەساڵی (١٩٦٩)دا بەوپەڕی لێوەشاوەییەوە ئەو ئەرکەی جێبەجێ کرد.

٨- دوای وەفاتی خوالێخۆشبوو (مەلا عەبدوڵڵای شەنەغە) لەساڵی ١٩٦٩، بۆ ماوەیەک خوالێخۆشبوو (مەلا عەبدولڕەحمانی هەمزەکۆر) بەئیمام و خەتیب دامەزراوە.

٩- لەساڵی (١٩٧١) تا (١٩٨٣) خوالێخۆشبوو (مەلا محەمەدی هەرتەلی) بووە بە ئیمام و وتاربێژی مزگەوتەکە.

١٠- لەنێوان ساڵانی (١٩٨٣-١٩٨٥) خوالێخۆشبوو مەلا محەمەد عەلی عەلیاوەیی بەئیمام و وتاربێژ دامەزراوە.

١١- لەساڵی (١٩٨٥)ەوە تا ساڵی (١٩٩٠) مامۆستا مەلا ئیبراهیم بالیسانی بەسیفەتی (ئیمام و وتاربێژ) لەمزەوتی (حاجی داوود) دامەزراوە.

١٢- لەو ساکەوە مامۆستا مەلا عەبدولقادر عەبدوڵڵا ئەحمەدو مامۆستا مەلا مستەفاو مەلا تاریق

سلێمان ئیمامی مزگەوتن، لەساڵی ١٩٩٥ بۆ ماوەی نزیکەی ساڵێک مامۆستا حوسام مەلا جەوودەت وتاربێژ بووە.

**هـ) ناوی هەندێ قورئان خوێن و مامۆستاو بانگدەرو فەقێ:**

١- مەلا سلێمان فەتاح (فەتحوڵلا زادە)، دەرسی وتۆتەوە.

٢- سەید داوود ئەفەندی کوڕی حاجی مەلا هیدایەتی حاجی داوود زادە (دەرسی وتۆتەوە).

٣- ماوەیەک (دەوروبەری ساڵی ١٣٠٠ھ/١٨٨٢) بەر لە نۆژەن بوونەوەی مزگەوتەکەی جەنابی شێخ ئەبووبەکری نەقشبەندی (هەرشەمی) لەمزگەوتی (حاجی داوود) دانیشتوون. لەگەڵ ئەم زاتانەدا بۆ ماوەیەکی کەم حەلقەی زیکری نەقشبەندیان لە (حەرەمی) مزگەوت گێڕاوە.

- مەلا محەمەدی هەولێری.
- داوود ئەفەندی حاجی مەلا هیدایەت حاجی داوود زادەو هی تر.

٤- مەلا محەمەد حلمی ئەفەندی کوڕی حاجی حەویزی مامە.

٥- مەلا عەلی نیازی ئەفەندی کوڕی حاجی حەویزی مامە.

٦- مەلا عەزیزی دەریازی.

٧- مەلا ساڵح دەروێش ئەحمەد.

٨- مەلا مستەفا (باپیری موحسین حوسێن کارەباچی).

٩- مەلا ئیبراهیمی مۆرهەڵکەن.

١٠- مەلا جبرائیل گەلیاوەیی.

١١- مەلا حوسێن سەعدی فەیزوڵلا (فانی)، لەوێ خوێندوویەتی.

١٢-مەلا عەبدوڵلا جبرائیل (بەر لەمەلا سەعید ئۆتراقچی حافظ، دەرسی بە نابیناو منالانی دەگوتەوە).

١٣- مەلا هیدایەتی حاجی سەلیم حاجی مەلا هیدایەتی حاجی داوود زادە (ناوداره: مەلا کوێرە) (١٨٩٢-١٩٦٢) قورئانی خوێندۆتەوە، ناو بەناو لەسەر منارەدا سەلای کێشاوە.

١٤- مەلا سەعیدی ئۆتراقچی (حافز). قورئان خوێن و مامۆستای نابیناو منداڵان بووە.

١٥- حاجی مەلا عەزیز عەتار (باوکی بەڕێزان: عەدنان و نیعمەت). ڕۆژانی هەینی قورئانی دەخوێندەوە.

١٦- مەلا مەسعود (بێبەش) کوڕی مەلا عەبدوڵلای شەنەغە: موجەویدێکی کەم وێنە بوو. دەنگی زۆر خۆش بوو مامۆستای مەقام و ستایشی پێغەمبەر بوو. شاعیرێکی بەسەلیقە بوو. جوجرەیەکی تایبەتی لەمزگەوتی حاجی داووددا هەبوو. پاشان لەمزگەوتی (خەلیفە خالید) بەئیمام و قورئان خوێن دامەزرا. لەساڵی ١٩٩٨ لەتەمەنی (٦٨) ساڵیدا کۆچی دوایی کرد، مامۆستای ئەدیب کاک (مەحموود زامدار)ی براشی، بەردەوام لەخزمەتی باوکیدا ئامادە دەبوو.

١٧- بەڕێز (یونس خەتاب ئەربیلی): قورئان خوێن.

١٨- مەلا هاشمی کوڕی عەبدوڵلا (حافز): قوتابی مەلا سەعیدی حافز بوو. یەکێکە لەقورئان خوێنە دیارەکان، ئێستا مامۆستای قورئان و تەجوییدە. هەروا مەلا کەمال عەبدولواحید (حافز).

١٩- مەلا نجات عوسمان یابە. ئێستا بانگدەرو قورئان خوێنە لەو مزگەوتە.

٢٠- مەلا فوئاد عوسمان یابە.

٢١- مەلا عەبدوڵلا (مەلا هیندۆ) ماوەیەک قورئان خوێن بوو.

٢٢- مەلا عزەدین ئیسماعیل مەحموود.

٢٣- مەلا عومەر.

٢٤- سەید غانم کوڕی سەید محێدین نعێمی.

٢٥- ئەم زاتانەش کەئێستا مەلاو موجەویدن پەیوەندی بەتینیان بەو مزگەوتەو و قوتابخانەکەی هەبوو:

- مامۆستا مەلا جەرجیس حاجی ئیبراهیم.
- مامۆستا سەید زەکی.
- مامۆستا مەلا فوئاد حاجی نادر.
- مامۆستا مەلا ئەنوەر.

٢٦- ئەو زاتانەی خوارەوەش لەو مزگەوتەدا خوێندوویانە یا دەرسیان وتۆتەوە یان بانگیان داوە:

- مەلا جەوودەت (حافز).
- مەلا فائیق حافز.
- مەلا عەبدوڵلا حافز.
- مەلا غەریب حافز.
- مەلا بەدرخان حافز.
- مەلا ئیبراهیم حافز.

- مەلا نازم حافز.
- مەلا حسێن.

٢٧- مامۆستای تەجویدو قورئان خوێن مامۆستا خەلیل سلێمان سۆفی حەسەن (عصافی) کەقورئان خوێن و مامۆستای تەجوییدە، لەساڵی (١٩٩٣)ەوە قورئان خوێنە، مامۆستای تەجوییدیشە لەهەمان مزگەوتدا.

* * *

**پەراوێزەکانی بەشی دووەم**

١- لەگرانی گەورە (١٨٨٠) کە بەگرانی (برسیمە) بەناوبانگە، بەشەوو بەرۆژ نانەواخانەکە کاریکردووە، نانی بەسەر هەموو ئەو کەسانەدا دابەش کردبووە، کە روویان لەهەولێر کردبوو. (لەبیرەوەرییەکانی خوالێخۆشبووان: حاجی دەروێش یەحیا، حاجی محەمەدی مەلا ئەحمەد، حاجی ئیبراهیم داوود).

٢- خوالێخۆشبوو حاجی دەروێش یەحیا عەبدولرەحمان فەرمووی کە ئەو (مێرد منداڵ)بوو لەگەڵ چەند کەسێکی دیکەدا هەواڵی سووتانی دوکانەکانی گەیاندە خوالێخۆشبوو مەلا ئەحمەدی حاجی مەلا هیدایەت و براکەی، ئەوانیش گوتبوویان: سوپاس بۆ خودا، کە دوکانەکانی ئێمە ئاگریان تێبەر بووە نەک هی هەژارو فەقیران.

٣- بیرەوەرییەکانی خوالێخۆشبووان: ناسیح حەیدەری، حاجی محەمەدی مەلا ئەحمەد، دەروێش یەحیا، ئەحمەد عومەر تالیب"مەرال"، حاجی مەلا عەبدولجەبار عەباس ئاسنگەر، مەلا نورەدین کوڕی مەلا جبرائیل گەلیاوەیی و هی تر.

٤-٥- سەرچاوەی پێشوو.

٦- بیرەوەرییەکانی خوالێخۆشبووان: حاجی محەمەدی مەلا ئەحمەد، دەروێش یەحیا.

٧- بیرەوەرییەکانی: حاجی محەمەدی مەلا ئەحمەدی حاجی داوود زادە.

٨- خوالێخۆشبوو حاجی محەمەدی مەلا ئەحمەد فەرموویەتی: هەستم کرد کەتادێ گۆڕستانەکە گەورەتر دەبێ، بۆیە لەساڵی (١٩٣٣) کەمەلا ئەحمەدی حاجی مەلا هیدایەتی باوکم کۆچی دوایی کرد، رازی نەبووم لەگۆڕستانی مزگەوتەکەماندا تەرمەکەی بەخاک بسپێردرێ، لەقەبرستانی گەورە ناشتمان. پێشتریش (١٩٢٢) کە مەلا سالحی برام کۆچی دوایی کرد، رازی نەبووین لەگۆڕستانی مزگەوتدا تەرمەکەی بەخاک بسپێردرێ، بۆیە لەساڵی(١٩٤٠) بە یەکجارەکی گۆڕستانەکەم تەخت کرد و حوجرەی (ئیمام)م لەشوێنیدا بنیات نا.

**سەرنج:**

زۆرجار بیر لەو قسەیەی حاجی محەمەد دەکەمەوە، چونکە بۆخۆشی بەر لەوەفاتی بەماوەیەکی زۆرکەم، لەچێورم (ئاغەلی) خانەوادەکەیان لەقەبرستانی گەورەدا شوێنێکی دیاریکردو گوتی: کە مردم لێرەدا تەرمەکەم بەخاک بسپێرن. ئەوەی زۆر سەیرە لەم چەند ساڵانەی دواییدا، خەڵکانێک بەهەر شێوەیەک بێ مزگەوتێک دروست دەکەن، جێگەیەکی تایبەتیش بۆ گۆڕستان تەرخان دەکەن..

٩- خوالێخۆشبوو مەلا عەبدوڵڵا جبریل (جبرائیل) ئەو کاتە مامۆستای ئەو قوتابخانەیە بوو. پاشان (١٩٥٣) خوالێخۆشبوو مەلا سەعیدی ئۆتراقچی (حافز) بوو بەمامۆستای ئەو قوتابخانەیە.

١٠- لەچلەی ماتەمینی خوالێخۆشبوو حاجی محەمەدی مەلا ئەحمەد (کە لەمزگەوتی حاجی داوود) لە ٢٤ی مانگی شوباتی ساڵی ١٩٧٩ سازکرا، تیایدا سەرجەم حافزو قورئان خوێنەکان ئامادە بوون، نوێنەری حافزەکان لەوتەیەکیدا، زۆر بەوردی لەرۆڵی خوالێخۆشبوو بۆ خزمەتی نابینایان دوا. لەهەمان ئاهەنگدا زانای گەورە خوالێخۆشبوو: رەشاد موفتی وتارێکی بەنرخی خوێندەوە. ئەویش ئاماژەی بەسیفاتە جوانەکانی خوالێخۆشبوو (حاجی محەمەد)دا.

١١- لە حوجەی تەولیەی ژمارە (٦٦) لە (١٠/ موحەرەمی / ١٢٩٥ (کۆچی)- (١٨٨٠ز)یش تەئکید لەسەر ئەوە کراوە کە ئاراستەکردنی (جیهەتی تەولیە) تایبەتییە بەکوڕو کوڕەزاکانی واقیف (توجبە جهە التولیە مشروط علي أرشد واصلح أولاد واحفاد الواقف)، هەمان نوختە لەحوجەی تەولیەی ژمارە (١٥١) لە ٢٦/ رەبیعول

ئاخر/ ١٣٢٥ (کۆچی) ئاماژەی بۆ دراوە، کە تایبەتیە بەتەولیەی خوالێخۆشبوو (مەلا ئەحمەدی کوڕی حاجی مەلا هیدایەتی کوڕی حاجی داوود).

١٢- ئەمەی خوارەوە دەقی فەرمانی شاهانەکەیە کە لەسەردەمی (مەلیک غازی) دەرچووە:

رقم ١٠٧

أصدار إرادتي الملكية، بناء على ماعرضه رئيس الوزراء يتوجه جهة التوليه على وقف جامع الحاج داود في أربيل الى الملا محمد بن الملا أحمد. علي رئيس الوزراء تنفيذ هذه الاراده.

كتب ببغداد في اليوم سابع والعشرين من شهر ذي الحجة سنة ١٣٥٣ و اليوم الاول شهر نيسان سنة ١٩٣٥.

**غازي ختم**
**ياسين الهاشمي**
**رئيس الوزراء**

١٣- ئەمەش دەقی فەرمانی وەزارییەکەیە:

الحكومة العراقية
وزارة الاوقاف
وثيقة خاصة بالجهات
عدد الوثيقة ٣٧
عدد الجلد ٧
حاصب الجهة/ الملا أحمد بن الحاج ملا هيدايت
سبب انفصاله
وفاته
الموجه اليه
الملا محمد بن الملا أحمد

إن جهه التولية علي وقف الحاج داود في أربيل قد توجهت الى الملا محمد بن الملا أحمد بناء علي تحقق أهليته لى المجلس العلمي في كويسنجق علي ماجاء في قراره المؤرخ ب "شباط ١٩٣٥ المقترن بتصديق مجلس الشوري بتاريخ ٢٦ اذار ١٩٣٥ ولدى العرض إقترن التوجيه بالادارة الملكية المطاعة الصادرة في ١ نيسان ١٩٣٥. واشعار ثم تحرير هذه الوثيقة في ٢٨ نيسان ١٩٣٥.

١٤- ئەو زانیارییە لەخوالێخۆشبوو (حاجی مەلا عەبدولجەباری کوڕی وەستا عەباسی کوڕی حاجی هێدۆش (هیدایەت) ئاسنگەر کوڕی حاجی یونس کوڕی ئەحمەد بەگی سۆرانی) وەرگیراوە.

ئەو زاتە کەکوڕی خاڵی رەحمەتی حاجی محەمەدی مەلا ئەحمەد بوو، کۆمەڵێک دەسنووسی شێخ محەمەد ئەمین کوردی نەقشبەندی ئەربیلی لابوو، شارەزاییەکی یەکجار زۆری لەمێژووی شاری هەولێرو زانستەکانی ئایینیدا هەبوو. لەساڵی ١٩٠٤ لەقەڵات چاوی بەژیان هەڵهێنابوو، لەساڵی ١٩٨٢ هەر لەقەڵات کۆچی دوایی کرد.

١٥- سەبارەت بە (مەلا عەلی ئەفەندی حاجی حەوێزی مامە پیرس)ەوە، بڕوانە: د. عەبدوڵلا حەداد: مەلا عەلی ئەفەندی و کۆمەڵەی تەعالی کوردستان، گۆڤاری (هەولێر) ژمارە (٦) بەهاری (٢٠٠٠)، ل(١٢٣-١٢٦).

لەوتارەکەدا هاتبوو کەمەلا عەلی لەدەوروبەری ساڵی (١٨٨٠) لەدایک بووە، ئەوەی راستی بێ لەساڵی (١٢٩٠ك/ ١٨٧٣ز) لەشاری هەولێر چاوی بەژیان هەڵهێناوە. برا گەورەکەشی مەلا محەمەد حیلمی ئەفەندی حاجی حەوێز، لەدەوروبەری ساڵی (١٨٧٠) لەدایک بووە.

١٦- سەبارەت بەناوی باوباپیرانی مامۆستای خوالێخۆشبوو (مەلا عەبدوڵلای شەنەغە) سوودم لەهاوڕێی خۆشەویستم ئەدیب و نووسەر کاک (مەحموود زامدار)ی کوڕی مەلا عەبدوڵلا بینیوە. شایانی باسە مەلا عەبدوڵلا لەساڵی (١٨٨٨) لەدایک ببوو، مرۆڤێکی بەڕێزو بەحورمەت بوو. ریشێکی سپی نوورانی هەبوو. لەمەلا ئەفەندی ئیجازەی عیلمی وەرگرتبوو. خەڵک زۆر خۆشیان دەویست، بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیان روویان تێدەکرد. بێجگە لەئیمامەتی و وتاربێژی، هەموو شەوانی مانگی مەولوود (رەبیعول ئەوەل) مەولوود نامەی پێغەمبەری (د.خ) دەخوێندەوە. ماڵی لەگەڕەکی (سەعدووناوە) بوو. پێشنوێژی هەر پێنج فەرزی دەکرد. بەیانیان ئەگەر بانگدەر (مۆذن) نەهاتبا، بۆخۆی تەسبیحاتی دەکردو بانگی دەدا. بۆ ماوەی چل ساڵ رۆژێک لەبەجێ گەیاندنی ئەرکەکانی دوانەکەوت.

مامۆستا مەلا عەبدوڵلای

شەنەغە لەگەڵ حاجی محەمەدی مەتەوەلی وەکو برابوون.. مایەوە ئەوەش بڵێم: ئەگەر حافزەکان، یا مامۆستاکانیان هەڵەیەکیان بکردایە، یا وشەیەکیان بەهەڵە بدرکاندبایە، مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا رووی تێدەکردن و هەڵەکانیانی بۆ راست دەکردنەوە.

**پەراوێزەکان:**

١- بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە د.عبدالله حداد، مدخل لدراسة تطور مدينة اربيل للفترة (١٧٧٠-١٨٢٠). مجلة (كاروان- الاكاديمي) العدد (١) (شتاء ١٩٩٧) اربيل ١٩٩٧، ص١٠٦- ١٣٥.

٢- لەکتێبی (مێژووی کوردستان) کە لەلایەن قەشەی دۆمەنیکانی (کامشانیل)ەوە لەساڵی ١٨١٨لەناپۆلی (ئیتاڵیا) لەچاپ دراوە، ژمارەی دانیشتوانی هەولێر بە (٢٠٠٠٠) بیست هەزار کەس مەزندە کراوە.

ئەم کتێبە لەلایەن کوردناسی فەرەنسی (تۆماسبوا Thomas-Bios)ەوە کراوە بەفەرەنسی، بەئامێری دەست لەچاپ دراوە، بەڵام بڵاونەکراوەتەوە (بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو ل (١٢١-١٢٢)، ل(١٣٠- ١٣١).

٣- دوای هێرشەکەی نادرشای ئەفشار (١٧٤٣)، هەولێر دووچاری هیچ هێرشێکی دەرەکی نەبوو، هەندێ ململانێی ناوخۆیی لەنێوان میرنشینەکانی (بابان) و (سۆران) و (والی) بەغدادا روویدەدا. ئەو ململانێیانە بەهیچ کلۆجێک نەدەبوونە مایەی وێرانکارییەکی سەرتاسەری، رەنگدانەوەشی بەسەر بزووتنەوەی ئابووری و بازرگانی و کشتوکاڵ و عیمرانیدا سنووردار بووە.

٤- بەپێی بەڵگەنامەیەک بەناونیشانی (تذكره ريف) کە لەمانگی (جمادی الاول ١٢٩٥ک- مایسی ١٢٩٤ رۆمی- ١٨٧٨ز) نووسراوە خەتمی (والی بەغدای) لەسەرەو تایبەتە بەمامی باوکم، لەخانەی ناونیشان و ئەدرێسدا نووسراوە (جامعی کبیری شهران) واتە مزگەوتی گەورەی شاری هەولێر.

٥- نەوشیروانی بەغدایی لەسەرەتای سەدەی سێزدەیەمی زایینی (لەسەردەمی ئەتابەگییەکان)، لەشیعرێکدا، کە تیایدا زەمی هەولێرو هەولێرییەکانی کردووە وشەی بازاڕی بەم شێوەیە بەکارهێناوە:

وفي (البازار) قوم اذا عاينتهم عاينت أهل البلا

من كل كردي ومن كل عراقي نفاه الغلا.

(بڕوانە: د.عەبدوڵڵا محەمەد حەداد هەولێر لەدوو قەسیدەی نەوشیروانی بەغدایدا گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ). ژمارە (١٣٠) ساڵی ١٩٩٣، ل٣٤-٤٠.

سەبارەت بە بەکارهێنانی وشەی (باژێرِیش) بەڵگە زۆرە بۆ وێنە حەیرانە ناودارەکەی کوردەواری.

(هەولێر هەولێرەسەری قەڵاتە.. بنی باژێرە) بەڵگەیەکی بەهێزە.

٦- بەهەشتی حاجی محەمەدی مەلا ئەحمەدی حاجی مەلا هیدایەتی حاجی داوود زادە (ناسراو بەحاجی مامەند) (١٨٩٨-١٩٧٩) ناوی پتر لە (١٤) پشتی دەزانی. سەبارەت بەهەمان بابەت بەهەشتی ناسیح حەیدەری زانیارییەکی یەکجار زۆری هەبوو، چونکە دواتر گوندی (چیمەن) کەوتبووە بەردەستی حەیدەرییان. هەروا بڕوانە:

(ناسح حەیدەری: دیوانی حەیدەری. (ئامادەکردنی شێروان حەیدەری). هەولێر (١٤٢٠ک- ٢٠٠٠ز)، ل٢٥٤ (بنەماڵەی سلێمان ئەفەندی) ئەم سلێمان ئەفەندییە کوری حاجی مەلا هیدایەتی کوری حاجی داوودە.

٧ و ٨- قەیسەرییەکانی هەولێر کە تائەمرۆ ماونەتەوە، لەنێوان ساڵانی (١٩٠٩-١٩١٢) بنیاتنراون. بەکارهێنانی خەپەنگ و شێلمان و چیمەنتۆش دوای ساڵی ١٩٢٨ لەبازاڕدا بەکارهێندراون، حاجی محەمەد مەلا ئەحمەد ئەم کەرەستە تازانەی لەپاڵ بۆری و تۆری ئاوی هاوچەرخ هێناویە بۆ هەولێرو کۆیە.

٩- لەسەرەتای پەنجاکانی سەدەی بیستەمدا (شەقامی ئاشتی) دروست بوو، حەسارو خانەکەی بەدوو بەش دابەش کردو گەلێ خانووبەرەی گەرەکی تەعجیل بەر شەقام کەوتن، بەم پێیە دیواری مزگەوت لەلای قیبلەوە روانییە ئەو شەقامە. حەسارەکە لەساڵی (١٩٢٨) لەدادگا لەرێگای (إزالة الشيوع) فرۆشرابوو.

١٠- چونکە لای دەرگای

خانووەكە، پیاوێك ئێلەگی دروست كردووە. بەڵام لەهەموو بەڵگەنامە رەسمییەكانی پێش ساڵی (١٣٢٦ك-١٩٠٨ز) هەر بەناوی (خانووی حاجی داوود) تۆماركرابوو.

١١- لەبواری وەسفی ئەو ناوچەیەدا، بێجگە لەهەندێ بەڵگەنامەی رەسمی و بیرەوەرییەكانی (حاجی محەمەدی) باوكم، سوودێكی زۆرم لەچەند پیاوێكی بەساڵاچووودا بینیوە، كە لەباوكیشم بەتەمەنتر بوون، لەوانە:

أ- خوالێخۆشبوو (دەروێش) یەحیا عەبدولرەحمان كە لەساڵی (١٨٨٠) لەگەرەكی تەعجیل لەدایك ببوو، لەساڵی ١٩٨٩ كۆچی دوایی كرد.

ب- خوالێخۆشبوو حاجی رەمەزان كە دوكانی لەبەردەركی قەیسەری بەرامبەر مزگەوت بوو لەسەرەتای هەشتاكانی سەدەی پێشوو لەتەمەنی (١٠٠) ساڵیدا كۆچی دوایی كرد.

ج- خوالێخۆشبوو (مام) ئەحمەد وەحید نانەوا، (١٨٨٥-١٩٨٥).

د- خوالێخۆشبوو حاجی ئیبراهیم داوود چەلەبی چیچۆ لەساڵی (١٨٨٥) لەدایك ببوو، سەرەتای هەشتاكانی سەدەی پێشوو كۆچی دوایی كرد.

هـ- خوالێخۆشبوو ئەحمەد عومەر تالیب (١٩٠٠-١٩٩١). ئەم زاتە بە (ئەحمەد مەرال) ناسرابوو.

و- خوالێخۆشبوو مەلا حوسێن سەعدی فەیزوڵڵا (فانی) (١٨٨٣-١٩٨٣).

ز- خوالێخۆشبووە حاجی مەلا عەبدولجەباری كوڕی وەستا عەباسی كوڕی حاجی هێدۆشی ئاسنگەر (١٩٠٤-١٩٨٢).

١٢- بەپێی بەڵگەنامەیەك لەساڵی(١٣٢٢ك-١٩٠٤) نووسراوە، كە نزیكەی دە كەس ئیمزایان لەسەر كردووە، پێدەچێ لەسەر ئەو دوكانانە خوالێخۆشبوو حەمدی كوڕی داوود ئەفەندی كوڕی حاجی مەلا هیدایەت كوڕی حاجی داوود مشتومڕی بووبێ لەگەڵ مامی حاجی سەلیمدا.

١٣- بوونی دوو میحراب لەناو حەرەمی هەندێ لەمزگەوتە كۆنەكاندا، نیشانەی ئەوەیە، هەندێ جار دوو ئیمام پێش نوێژیان كردووە، یەكیان (شافعی) بووە، ئەوی دیكەیان (حەنەفی) ئەم دیاردەیە لەمزگەوتی قەڵاتیشدا هەبووە.

١٤- ئەو ناعورە تا سەرەتای سەدەی بیستەم مابۆوە. دوای گرتنی سەرەكەشی بەردەوام داتەپیوە. لەساڵی ١٣٥٩ك-١٩٤٠ز خوالێخۆشبوو متەوەلی حاجی محەمەدی مەلا ئەحمەد بەشێوەیەكی مەحكەم قەپاتی دەكاو حەوزێكی جوانی لەشوێنیدا دروست دەكات.

١٥- متەوەلی حاجی محەمەد فەرمووی، لەساڵی (١٩٤٠)دا زۆر هەوڵمدا زێرابەكە بدۆزمەوەو نۆژەنی بكەمەوە، بەڵام پێدەچێ لەبەر ئاوەدانبوونەوەی گەڕەكی سەعدوناوە، شوێنەواری بزر بووبێ.

١٦- لەساڵی (١٩١٩-١٩٢٠) دوای نۆژەنكردنەوەی مزگەوت، شوێنی منارەیان گۆڕیبوو، لەناو گومبەزەكاندا منارەیەكیان دروست كردبوو، لەساڵی (١٩٤٠) حاجی محەمەد ئەو منارەیەی لابردو لەشوێنی ئەسڵیدا منارەیەكی نوێی دروست كردووە.

١٧- بۆ وێنە بڕوانە (جیمس بگنگهام: رحلتي الي العراق سنة ١٨٢٦ الجزء الاول) مطبعة أسعد، بغداد، ١٩٦٨، ص١٢٦ (ترجمة سليم طه التكريتي).

١٨- لەبەڵگەنامەی تەولیەی (حجة التولية)ی ژمارە (٦٦) لە ١٠ی محرم الحرام ساڵی ١٢٨٩ك-١٨٨٠ز هەروا لەبەڵگەنامەی تەولیەی مارە (١٥١) لە ٢٦ی ربيع الاخر ساڵی ١٣٢٥ك-١٩٠٦ز و هەموو بەڵگەنامەكانی دیكەی بڕیارەكانی دادگای شەرعیەدا ئاماژە بەوە دراوە، كە ئاراستەكردنی جیهەتی تەولیە بەپێی مەرجی واقیف تایبەتییە بەلێوەشاوەترین كوڕو كوڕەزاكانی واقیف (توجيه جهة التولية مشروط علي ارشد واصلح أولاد، وأحفاد الواقف).

١٩- چونكە مرۆڤ سەربەستە لەچۆنیەتی تەسەروفكردن بەموڵك و ماڵی خۆی، بەو مەرجەی پێچەوانەی شەرع نەبێ.

٢٠- ئەلئالوسی دەڵێ: (وارسل لدعوتنا علي نحو فرسخ ذا الخلق المحمود، المتذرع بسابغات الفضائل الملا داوود، وكنا وعدناه بالحلول عنده والنزول يوم واجهناه أثناء ذهابنا الي اسلامبول) بڕوانە: ابو الثناء شهاب الدين آلوسي زاده: نشوة المدام في العود الي مدينة السلام، مطبعة الولاية- بغداد ٢٧ جمادي الآخرة، ١٢٣٩، ص٩٩.

٢١- خوالێخۆشبوو سلێمان

ئەفەندی کوڕی حاجی مەلا هیدایەت کوڕی حاجی داوود ئەگەرچی بەسلێمان ئاغاش ناسرابوو، بەڵام لەبەر ئەوەی خوێندەوارێکی شارەزاو لێهاتوو بووە، بەنازناوی (سلێمان ئەفەندی) شۆرەتی دەرکردووە، بەقسەی بەهەشتی ناسیح حەیدەری (کە لەئیبراهیم حەقی ئەفەندی شێخ الاسلامی خاڵی بیستبوو) پیاوێکی پلەداری کۆمەڵایەتی بووە. پێدەچێ سلێمان ئەفەندی ئەندامی ئەنجوومەنی شارەوانی هەولێر بووبێ، تێلیگرافخانە و بانکی کشتوکاڵی لەهەولێر بنیاتناوە، ژنەکەی ناوی (نائیلەخانی کچی یەعقوب ئاغای) موتەسەریفی پێشووی هەولێر بووە. لەدەوروبەری ساڵی ١٨٩٥ کە (موستەنتیق) بووە لەشاری رواندز، فەرمانی یەزدانی بەجێ گەیاندووە. هەر لەوێ تەرمەکەی بەخاک سپێردراوە.

٢٢- شێخ ئەحمەدی هەولێری یەکێکە لەخەلیفە هەرە نزیکەکانی مەولانا خالیدی نەقشبەندی (١٧٧٧-١٨٢٨)، شێخ عەبدوڵڵای کوڕی خاوەنی مزگەوتی (شێخ عەولای هەولێرییە) لەگەڕەکی دەرگەزێن لەشاری سلێمانی بەمزگەوتی دوو دەرگاش ناسراوە، شێخ عەبدوڵڵا باوکی ئەحمەد موختاری قازییە.

٢٣- بڕوانە: سالنامەی ویلایەتی بەغدای ساڵی ١٢٩٤ک-١٨٧٧ز و سالنامەی دەوڵەتی عەلیەی عوسمانی ساڵی (١٢٩٥ک-١٨٧٨ز). هەروا بیرەوەرییەکانی خوالێخۆشبوو حاجی محەمەد برازای داوود ئەفەندی.

٢٤- بەڵگەنامەی تەولیەی دادگای شەرعیەی هەولێر ژمارە ٦٦ لە ١٠ی محرم الحرام- ١٢٩٨ک.

٢٥- قەسامی شەرعی (داوود ئەفەندی کوڕی حاجی هیدایەتی کوڕی حاجی داوود هەولێری زادە). (لەساڵی ١٢١٨ک- رۆمی- ١٣٢٠ک- قەمەری) لەقەزای (کبان) لەویلایەتی (معمورە العزیز) دەرچووە. بێجگە لەو سەرچاوەو بەڵگەنامانە دەربارەی (مزگەوتی حاجی داوود)، بەپێویستی دەزانم ئاماژە بۆ هەندێ نووسینی دیکە بدەم کەچەند زاتێک لەسەریان نووسیوە:

١- لە ١٩٨٦/١/٦ رۆژنامەنووس کاک تاریق ئیبراهیم شەریف لەرۆژنامەی (الاتحاد)ی ژووری بازرگانی بەغدادییدا بەناونیشانی (رحلة في رحاب جامع السوق الکبیر في اربیل). وتارێکی سوود بەخشی بڵاوکردۆتەوە.

٢- نووسەرێکی دیکە بەناوی شێرزاد شێخ محەمەد زنجیرەیەک وتاری لەیەکێ لەبڵاوکراوەکاندا بڵاوکردۆتەوە.

٣- کاک عومەر شێخ لەتیف بەرزنجی لەکتێبی (گەشتێک بەناو مزگەوت و تەکیەکانی شاری هەولێر) کە لەساڵی ٢٠٠١دا وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی بڵاوی کردۆتەوە، چەند لاپەڕەیەکی بۆ مێژووی ئەو مزگەوتە تەرخان کردووە، ئەو بەرهەمەی کاک عومەر بەرزنجی کەرکوکی ئەگەرچی کۆمەڵێک سەرنج و تێبینی هەڵدەگرێ، بەڵام مایەی سوپاسی هەموانە. چونکە خزمەتێکی زۆری هەولێری کردووە.

٢٦- لەساڵی ١٩٥٤ کە مەلیک فەیسەڵی دووەم سەردانی هەولێری کرد، نوێژی لەو مزگەوتە کرد، خوالێخۆشبوو حاجی محەمەد بەو بۆنەیە تاجێکی گەورەو جوانی لای نەجارە دەسرەنگینەکانی هەولێر دروست کرد.

٢٧- لەساڵی ١٩٥٦ چەند زانایەکی ئایینی بۆ کۆکردنەوەی کۆمەک و یارمەتی بۆ شۆڕشی جەزائیر هاتنە هەولێرو لەو مزگەوتەدا وتاریان خوێندەوەو کارەکانیان ئەنجام داوە زانای ناودار محەمەد مەحموود سەواف سەر دەستەیان بووە.

٢٨- دوای شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨، عەقید روکن عەبدولسەلام عارف هاتە هەولێر، نوێژی نیوەڕۆی لەمزگەوتی (حاجی داوود)دا کرد. بەو بۆنەیەوە خوالێخۆشبوو (رەشاد موفتی) وتارێکی پێشکەش کرد.

٢٩- عەقید عەلائەدین مەحموود کە دوای شۆڕشی چواردەی تەمووز بوو بەموتەسەریفی هەولێر، نوێژی جومعەی لەوێ ئەنجام دەدا.

٣٠- لەکۆتایی پەنجاکان و سەرەتای شەستەکاندا کەمزگەوتی گەورەی (قەڵات) و مزگەوتی (خانەقا) نۆژەنکرانەوە، بارەگای باریتۆ تەبەروعات لەمزگەوتی (حاجی داوود) بوو.

٣١- لەساڵانی (١٩٦٧-١٩٧٠) فەقێ و قوتابیانی (مەعهەدی ئیسلامی) کە مەلا ساڵحی کۆزەپانکە سەرپەرشتی دەکردن لەو مزگەوتە دەیانخوێند.



# مزگەوتی شێخی چۆلی

سیپان نانەکەلی

هەولێــر... قــەڵاو منارەی، مزگەوت و شوێنە پیرۆزەکانی، بە یەکەوە لە مـێـژوودا جـوانن، ئەو شوێنانەی هەردەم ناویان لە گوێی خەڵکی ئەم شاردا دەزرنگێتەوە، تا ئێستــاش بە درێژایی تەمـەنی خــۆیان هەر بە شکۆمـــەندی مـــاونەتەوە، زۆریان پارێزراون و زۆربشـیـــان ســەر لە نوێ نۆژەن دەکــرێنەوە، بۆ ئەوەی لە لەناو چوون بپـــارێزرێن، چونکە ئەو شوێنانە مێژووی ئەو شارە دێرینە پیـــشـــان دەدەن، بۆیە دەبێ پارێزگـاری لە مـێـژووش بکرێت.

مزگەوتی شێخی چۆلی بە یەکێک لە شــــوێـنـەوارە هەرە دیـار و نـاســـراوەکـــانی ئـەم شــــارە دەژمـێـردرێت، سـەردەمـانێکی زوو ئەو مزگەوتە دروستکراوە و بووەتە مزگەوتێکی هەرە دیار لە مێژووی هەولێـــردا، لەوانەیە زۆر هەبن تا ئێستا پەیان بە ناوی مزگەوتەکە و مـــێـــژووی ئەو شـــوێنە پیـــرۆزە نەبردبێ، بەڵام گـەلێـک سـەرچاوە هەن بە تێـر و تەسـەلی مـێـژووی شێـخی چۆلی باس دەکەن و وەکـو بەڵگەیەکی مێژوویی تۆمار کراون، دەکـــرێ زۆربەمـــان ســـوود لەو ســـەرچاوانە وەربگرین بۆ ئاشنا بوون بە مـێـژووی ئەو مـزگـەوتە و زۆر شـــوێنەواری دێرینی دیکەی کۆنە هەولێر.

**زەوییەکە بەر لە دروستکردنی مزگەوتەکە**

بە قـــەی (مـوعـتـەسـەم عوزێری)، کە دەکاتە کوڕی خەلیفە (زیا نەقـشـەبەندی)، کـە باوکی بۆی گـێـڕاوەتەوە: ئەو زەوییەی ساڵانێکی زوو بەر لە ئێستـا ئەو مزگەوتەی لەسەر دروست کراوە، زەوی (حاجی ڕەشید ئاغا) بووە، کـە موریدی شـێـخی چۆلی بووە،

حاجی ڕەشید بە مەبەستی دروستکردنی مزگەوتێک لەو شوێنەدا ئەو پارچە زەوییەی بە دیاری و بە خۆڕایی بە شێخی چۆلی بەخشیوە، دوای دروستکردنی ئەو مزگەوتەش شوێنێکی دیکەی پیرۆز لەو شارە بۆ خوداپەرستی و خەتمی تەریقەتی نەقشبەندی، بۆتە خانەقای موسڵمانان، خەتمی تەریقەتی نەقشەبەندی، لەلایەن شێخەوە کراوە لەگەڵ شێخ مەلا ڕەسووڵ ئەفەندی قەلات، پاشان ئەلیاسە فەندی باوکی مەلا تەهای شێخی چۆلی.

### یەکەمین مەلا و ئیمام و خەتیبی مزگەوتەکە

هەر بە پێی قسەی موعتەسەم: مەلا حەمەددەمین یەکەمین مەلا و ئیمام و خەتیبی ئەو مزگەوتە بووە، پاشان مەلا عەبدوڵڵای باوکی مەلا عەلی خۆی بوو بە ئیمام و خەتیبی مزگەوتی شێخی چۆلی، ئێستا مەلا عیماد مەلا فایزی برازای مەلا عەلی، ئیمام و خەتیبی مزگەوتی شێخی چۆلییە، مزگەوتەکە خانەقای نەقشەبەندیان بووە، ئێستا خەلیفە (زیا نەقشەبەندی) سەرخەتم و تەهلیلەی نەقشەبەندییە لەو مزگەوتەدا و باوباپیرانیشی هەر موریدی شێخی چۆلین.

### مزگەوتی شێخی چۆلی کەی نۆژەن کرایەوە؟

دوای تێپەڕبوونی سالانێک بەسەر دروستکردنی شێخی چۆلی یاخود (شێخ محەمەد عوسمانی نەقشەبەندی) کە لە (١٣٠٨) کۆچیدا وەفاتی کردوە، بەر لەوەی کۆچی دوایی بکات، جارێک مزگەوتەکەی نۆژەن کردۆتەوە، لە دواجاریش حاجی جەمالی مەلا تەها جگە لە نۆژەنکردنەوەی مزگەوتەکە، هەندێ هەیوانی تازە و حەوزێکی کۆنکریتی بۆ دەستنوێژ شووشتن و بیرێکی تازەی بۆ دروست کرد، چونکە لە سەردەمی شێخی چۆلیدا بیرێک لە حەوشەی مزگەوتەکە لێدرا بوو، بەڵام بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار ئەو بیرە وشکی کرد، بۆیە ناچار ئەو بیرەیان داپۆشی، مزگەوتەکە هۆڵێکی پرسە و مەولودخوێندنەوە و هۆڵێکی نان خواردنی هەژارانیشی هەیە، لەگەڵ دەرگەیەک، کە دەچێتە نێو گۆڕستانی شێخی چۆلی، کە زەوییەکەی هەر هی ڕەشید ئاغایە، لەگەڵ دوو دەرگەی دیکە بۆ نێو مزگەوتەکە، بە پێی زانیاریش ئەو مزگەوتە زیاتر لە پێنج جار نۆژەن کراوەتەوە.

### کتێبخانەیەکی گەورە لە مزگەوتەکەدا

جگە لە هەموو ئەوەی باسمان کرد، مزگەوتەکە کتێبخانەیەکی گەورەی ئایینی دەگرێتە خۆی، لەگەڵ کتێبخانەییێکی مەلا عەلی کە هەر سەر بە شێخی چۆلییە، ئەو کتێبانەش بە درێژایی مێژووی مزگەوتەکە پارێزراوە و کتێبی بە نرخی ئایینی جۆرا و جۆری تێدایە.

### هۆڵێکی تایبەت بۆ نان خواردنی هەژاران

وەک موعتەسەم باسی کرد: لەوەتەی ئەو مزگەوتە هەیە، مانگی ڕەمەزانی پیرۆزی هەموو ساڵێک لەو هۆڵەی، کە تایبەت بۆ نان خواردنی هەژاران دروست کراوە، خوانی ڕۆژوو شکاندن بۆ زیاتر لە (٤٠) هەژار و دەست کورتی ئەو شارە سازدەکرا، ئەگەر ڕەمەزانیش نەبێ، ئەوە هەموو نیوەڕۆیەک خوانێک بۆ زیاتر لە (٤٠) هەژار و نەدار سازدەکرا.

### نەوەی شێخی چۆلی

مستەفا تاقە کوڕی شێخی چۆلی بووە، کە بەر لە شێخ لە هەرەتی لاویدا کۆچی دوایی کردووە، گۆڕی کوڕەکەش هەر لەتەک گۆڕی باوکیەتی، کە لەنێو مەرقەدێک لەنێو مزگەوتەکەدایە، ماڵی شێخ خۆشی لەتەک مزگەوتەکەدایە.

### دار زەیتوونێکی مێژوویی لە مزگەوتەکەدا

دار زەیتوونێک لەنێو حەوشی مزگەوتەکەدایە. شێخی چۆلی بەدەستی خۆی چەقاندوویەتی و تەمەنی ئەو دار زەیتوونەش زیاتر لە سەدەیەک دەبێت و بۆتە دار زەیتوونێکی مێژوویی لە نێو مزگەوتەکە.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری (بارش) ژمارە (١٢) وەرگیراوە.



# مزگەوت و خانەقای شێخی چۆلی

شوان سەرابی

مزگەوت و تەکییە و خانەقای شێخی چۆلی، بە یەکێک لە بنکە رۆشنبیری و کلتووری نەتەوەکەمان دەژمێردرێ و کەلەپوورێکی گەورە و لەبن نەهاتوومان بۆ ماودتەوە، بە مەبەستی پتر ئاشنا بوون و تیشک خستنە سەر ئەم شوێنە پیرۆزە بە پێویستمان زانی لە نزیکەوە مزگەوتی ناوبراو بەسەر بکەینەوە.

مزگەوت و تەکیە و خانەقای شێخی چۆلی، دەکەوێتە گەڕەکی عارەبان لە هەولێر، لە سالّی (١٨٨٣) لە لایەن (شێخ محەمەد)ی چۆلی و خەلیفە و موریدەکانی دروست کراوە. مزگەوتی ناوبراو سەرەتا لە قوڕ و کەرپووچ دروستکرابوو، لە سالّی (١٩٧٤) بە باشترین شێوە چاک کرایەوە، بە شێوەیەک هەموو کون و قوژبنێکی لە خاک و خۆڵ پاک کرایەوە و دیوارەکان بە گەچ و بەردی حەلآن هەلّنرایەوە و بانی سەب کراو سەرزەویش کاشی و پەنجەرەکانیش ئەلەمنیۆم...هتد.

مزگەوتەکە لە تەنیشت هۆلّی تازەیە، کە بۆ بۆنە ئایینییەکانە و کارێزێکی ئاوی شیرینی تێدایە، هەر لە رۆژگاری شێخی چۆلییەوە تا ئەمڕۆکەش ئاوەدانە، کاتی خۆی بە دەولکی ئاویان لێ هەلّدەهێنجا، ئێستا بە پەمپێک و لە کاتی بێ ئاویدا خەلّک لە گەڕەکە دوورەکانی دەوروبەری هەولێردوە دەهاتن ئاویان لێدەبرد هەروەها مامۆستا مەلا عیمادەددین پێش نوێژ و وتارخوێنی مزگەوت ئاماژەی بۆ کرد.و گوتی: ئێستا لە دوا شێوەیە کە بەرچاوە، بە دەرگایەکی گەورە دەڕۆینە ژوورێ، دوو ژوور لە بەراییدایە، یەکیان کۆگایە، کەل و پەلی مزگەوتی لێ هەلّدەگیرێ، ئەوەی دیکە ژووری بەڕێوەبەری (متەوەلی) مزگەوتە، بەرامبەر هۆلّی بۆنەکانە. هەولێرییەکان و دەوروبەری هەولێرێ تازیانەی لێدادەنێن، لەبەر ئەوەی مزگەوتەکە ناسراو و بەرچاوە. حەوشەیەکی بەرینی هەیە، کە جێگای ئاپۆرەیەکی زۆری لێ دەبێتەوە، هاوکات لە دەرەوە شوێنی

وەستانی ئۆتۆمبێلێکی زۆری هەیە. لەناو حەوشەشدا پیرەبنە دار زەیتوونێکی گەورە بەرچاو دەکەوێ، دەڵێن: شێخی چۆلی بۆ خۆی ئەو زەیتوونەی چەقاندووە. شوێنی دەست نوێژ و... لە دەرەوەی مزگەوتدایە، دەرگایەک، بە ناوەوەی گڕێ دەدا. لەسەرەوەتردا ژووری ئیمام و وتار خوێنە، ئەم ژوورە پەرتووکخانەیەکی گەورەشی تێیدایە، کە هی بنەماڵەی مەلا (عەلی) کوڕی مەلا (عەبدولڵلا)یە، جگە لەم کتێبخانەیەش کتێبخانەیەکی دیکە هەیە، بێگومان ئەمەی دووەم دەگەڕێتەوە بۆ رۆژگاری شێخی چۆلی، کە نزیکەی (٥٠ - ٦٠) کتێبی تێدایە، کە لە کتێبی دەستنووس و چاپکراو پێک دێت، بەڵام کتێبەکان زۆر کۆن و پەرپووت دیارن و لەو ژوورەدا پارێزراون، کە شێخ (مستەفا)ی کوڕی شێخی چۆلی لە کاتی خۆیدا لێی دادەنیشت. بابەتی کتێبەکانیش لە فەرمووده و فیقە و تەفسیر و تەسەوف،... دا بەرجەستە دەبن. لە ژووری شێخ (مستەفا) هاتینە دەرێ، خۆمان لەبەر دەرگای گۆڕستانی شێخی چۆلی دۆزییەوە و تەماشامان کرد.

گۆڕستانی شێخی چۆلی پارچە زەوییەکە، هەنووکە چ شوێنی لێ نەماوە، بەر لە چاکردنەوەی ئەم دواییەی مزگەوتەکە، شوێنی هاوینانیشی هەبوو، بۆ نوێژێ، هۆڵێکی دیکەی مزگەوتەکە، کە لە دەرگای دووەم دەڕۆیتە ژوورەوە دەکەویتە لای دەستە چەپ، ئەم هۆڵە بۆ نان خواردن دروستکراوە، ئەمیش دوو ژووری لە تەنیشتە پری کەل و پەل و شتە... پێش ئەوەی بچینە ناو مەرقەدی شێخ محەمەدی چۆلی، هەیوانێکی لە پێشەوەیە نوێژیشی لێ دەکرێ.

شێخی چۆلی لە رۆژی هەینی، رێکەوتی (١١)ی تەمموزی (١٨٩١) کۆچی دوایی کردووە و هەر لەو ژوورە نێژراوە، کە لە کاتی ژیانیدا تێیدا دادەنیشت.

کە شێخ (مستەفا) تاقە کوڕی شێخی چۆلی ئەمری خودای دەکات، لە تەک باوکی دەینێژن و بەو جۆرە گۆڕی کوڕ و باوک هەردووکیان لەژێر قەفەسێکدان. سێ گۆڕەکەی بەرپێیان، دووانیان خاتوو زولێخا و خوشکیەتی، گۆڕەکەی دیکەی رۆژهەڵاتی شێخ (مستەفا)ش (رەشید ئاغا)ی کوڕی (وەیس ئاغا)یە، کە لە ساڵی (١٩٣٩) کۆچی دوایی کردووە و لەوێ نێژراوە. بەڵام لە رۆژئاوای ئەم قەبرانە و لە هەمان حوجرەدا سێ گۆڕی دیکە هەیە، یەکیان برا گەورەی رەشید ئاغایە، کە ناوی خدر ئاغایە، ئەوەی دیکە برای ناوەنجی عەلی ئاغایە و سێیەمین گۆڕی حاجی ئەلیاس ئەفەندییە، کە دووەم خەلیفەی شێخی چۆلییە.

* گومەتی ناو حەرەمی مزگەوتیش لەسەر چوار دینگەی گەورە راوەستاوە و بە گەورەترین گومبەت دەژمێردرێ لە شاری هەولێر، هەر لەناو حەرەمی مزگەوتێ هەیوانێکی دیکەش هەیە، کە جێی مینبەر و میحفەلیشی هەیە و شوێنی سڕەی نوێژکەرێکی لێ دەبێتەوە. لەو کاتەدا پەڕۆکی سپیمان بەرچاو کەوت، روومان لە مامۆستا عیمادەدین کرد و لێمان پرسی: ئەم پەڕۆ سپییە چییە؟

- خەلیفە و موریدەکانی شێخی چۆلین، ختم و وێردەکان جێبەجێ دەکەن. بۆیە حەرەمی شێخی چۆلی پێ دەگوترێ، چونکە کاتی خۆی ماڵی شێخی تێیدا بووە. حەرەمی شێخی چۆلی لە چەند ژوورێک و هەیوانێکی گەورە پێک دێ، کە بە نەخش و نیگارێکی جوان رازاوەتەوە، ئێستاش هەر ئاوەدانە و چێشتی لێ چا دەکرێ و ئێواران بە هەژارانی ئەم شارە دێرینەی دەدەن...!

### شێخی چۆلی و مزگەوتی شێخی چۆلی

سەبارەت بە جێنشین بوونی شێخی چۆلی، لە مزگەوتی ناوبراو مەلا (عیمادەدین) گوتی: دوای ئەوەی شێخ محەمەدی چۆلی لەگەڵ برادەرەکانی شێخ ئەبو بەکرئەفەندی و شێخ ئەحمەدی سورچی لە گەشتی تەریقەت وەرگرتنیان گەڕانەوە. شێخی چۆلی لە رۆژئاوا دانیشت، مزگەوت و مەرقەدی پیرۆزیشی هەر لێرەیە، شێخ ئەبو بەکرئەفەندی لە رۆژهەڵات، کە ئەویش مزگەوتی شێخ (مستەفا)ی ئەمرۆیە و ئێستاش نەوەیان هەر ماوە، کە شێخ (فایق)ە، پاش ماوەیەک وەستان، دواتر مەلا (عیمادەدین) گوتی: بێگومان ئەوەی من بزانم، پێش ئەوەی ئەم مزگەوتە دروست بکرێ، شێخی چۆلی لە مزگەوتێکی بچووک بوو، کە دەکاتە باپیری مامۆستا سلێمانی دێرە بروشەی. ئیدی کە شێخی چۆلی رۆیشت بۆ بەدەستهێنانی تەریقەت، کە گەڕاوە لەو ناوچەیە دانیشت کە کاتی خۆی چۆلی بوو، دواتر بە یارمەتی خەلیفە و موریدەکانی ئەم مزگەوتەی دروستکرد و دادەنیشت، کە ئێستاش مزگەوتەکە ماوە و ئاوەدانە...!

### ژیان و خوێندن و تەریقەتی شێخی چۆلی

- مامۆستا (عیمادەدین) سەبارەت بەو چەندەی سەرەوە دەڵێ: شێخ محەمەد کوڕی مستەفا کوڕی حاجی عومەری هەولێرییە و لە مەزهەبدا شافیعی بووە و سۆفیاتی کردووە و عوسمانیشی پێ دەڵێن، شێخی چۆلی خەڵکی هەولێر بووە و لە گەڕەکی (تەکیە) لە قەڵاتی هەولێر لە ساڵی (١٨١٧) لە دایک بووە، باوکیشی کە شێخ مستەفایە لەسەر دەستی مەولانا (خالید)ی نەقشەبەندی تەریقەتی وەرگرتووە.

- سەبارەت بە خوێندن: شێخی چۆلی بۆ خۆی سەرەتا خوێندەوارییەکی ئەوهای نەبووە، فەقێش بووە لەلای مەلا محەمەدی دیرە بروشەی و کتێبی دەستنووس و چاپکراویشی هەبووە، فرە خوێندەواریش بووە. هەروەها شێخی چۆلی برایەکی بە ناوی (ئەحمەد) هەبووە. ئەحمەد، ئەفسەر بووە لە سوپای عوسمانی. ئەو چووە بۆ ناو ئەنابەکیان، بەڵام شێخ محەمەدی چۆلی تەرقەتی لە شێخ عوسمانی گەورە وەرگرتووە. شێخ عوسمانیش خەلیفەی مەولانا (خالید)ی شەهرەزوورییە و مەرقەدی پیرۆزی ئێستا لە (سوریا)یەو لەوێش تەریقەتی بلاوکردۆتەوە، شێخی چۆلیش لێرە لە هەولێر هەمان تەریقەتی بلاوکردۆتەوە.

### خێزانەکانی شێخی چۆلی

مەلا عیمادەدین گوتی: شێخی چۆلی لە ژیانیدا سێ ژنی هێناوە بەڵام هەموویان مردوون ومنداڵی لە پاش بەجێ نەماوە.

* خێزانی یەکەمی ناوی عائیشەی کچی سۆفی بوو، سێ منداڵی لێ هەبووە. ئەوانیش هەمووی مردوون و لەتەک یەک شاردراونەتەوە، ئێستا وا پێشان دەدا گۆڕانێکی گەورەیان هەبێ، کچێکیشی لێبووە بە ناوی خاتوون لە کاتی ژیانی باوکیدا شووی کردووە، بەڵام دواتر لە مێردەکەی جیا بۆتەوە و لەلای باوکی ماوەتەوە و ساڵێک پێش شێخی چۆلی باوکی کۆچی دوایی کردووە و لەلای برا بچووکەکانی نێژراوە. عائیشەش بەر لە شێخی چۆلی لە ساڵی (١٣٠٧)ی کۆچی، کۆچی دوایی کردووە.

* خێزانی دووەمی ناوی زولێخای کچی محەمەدی کوڕی خدر بووە، خوشکی کوێخا عەلی کە بە عەلۆ ناسراوە، باوکی موریدی شێخ بووە، لە گاینج لە ناوچەی بەرانەتی ژیاوە، دواتر هاتۆتە ئاغوڵان، ئینجا لەوێندەر سەرپەرشتی ناوچەی ئاغوڵانی کردووە. زولێخا کوڕێکی ناو (مستەفا)ی بووە، پاش باوکی بە ساڵێک لە موریدەکانی، کە ناوی حاجی عەبدولفەتاح بووە، لە خانەوادەی دۆغرەمەچیان بووە، ئەویش لە ساڵی (١٩٦٣) کۆچی دوایی کردووە.

### شێخی چۆلی و بەخششەکانی

- مەلا (عیمادەدین) سەبارە ت بە ئیش و کارە پڕ بە خششەکانی شێخ محەمەدی چۆلی گوتی: شێخی چۆلی دەستی کەسی نەدەگێڕاوە، ئەگەر دوو لیرەی هەبایە، یەکێک داوای ئەم دوو لیرەی کردبایە ئەوا پێی دەبەخشی. دەگێڕنەوە دەڵێن: زۆرجار موریدەکان گازاندە و گلەییان لێدەکرد، کە ڕۆژێک دادێ پێویستیان بە خەڵکی دەبێت، بەڵام شێخی چۆلی دەیگوت: «مەترسن خودامان هەیە و خودا بۆ مزگەوتێی دەنێرێ»، شێخی چۆلی ئەوها بوو، ئەم مزگەوتەش هەتا ئێستاش خێر و بەرەکەتی هەر هەبووە، چونکە شوێنێکی پیرۆز و گەورەیە، خودا پەرستییەکی بێ هاوتای تێیدا کراوە، کاتی خۆی لێرە سێ ژەمە نان بە هەژاران دەدرا و بە شەوێ دەمانەوە، وەک کاروان سەرا وابوو، خەڵک تیایدا پشووی ئۆخەی دەخواردەوە و هەموو کارەکانیان بۆ جێبەجێ دەکرا، نەخۆش هاتبایە بە ساغ و سەلامەتی دەچۆوە....

بۆیە ئێستاش پاش ئەوەی کە نەسلی شێخی چۆلیش نەماوە، هێشتا هەر خەڵکانێک هەن خۆیان بە نەوەی مەعنەوی شێخی چۆلی دادەنێن، بە خۆشەویستییەوە خزمەتی شێخی چۆلی و میوانی لێقەوماوەکانی شێخی چۆلی دەکەن.

### موریدەکان

مەلا (عیمادەدین) گوتی: مەلا (یونس ئیسماعیل) خەڵکی تەلەعفەر بوو، لە هەولێر گیرساوەتەوە و دانیشتووە و شێخی چۆلی ژنی بۆ هێناوە. بە یەکێک لە موریدەکانی گوتووە، کچی خۆت بدە بە مەلا (یونس) و ناوبراو لە ساڵی (١٩١٢) کۆچی دوایی کردووە.

* خەلیفە سەلمان، یان مەلا سەلمانیشی پێ دەوترێ، زۆر لەگەڵ شێخی چۆلی هەستاوە و دانیشتووە، لە ساڵی (١٩٠٤) کۆچی دوایی کردووە.

* خەلیفە حاجی (ئەلیاس ئەفەندی) باش کاتب بووە لە هەولێر، لە ساڵی (١٩٣٧) کۆچی دوایی کردووە. * خەلیفە (کوردە) لە

مەخموور دانیشتووە، ئەویش لە ساڵی (١٩١٨) کۆچی دوایی کردووە.

* خەلیفە (ڕۆستەم)، ئەویش لە ساڵی (١٩٧٢) کۆچی دوایی کردووە.

* خەلیفە خەدیجە ناسراو بە (خەجۆ)، کچی خوشکی شێخی چۆلی بووە، خێزانی مەلا کەریمی....

* هەروەها خەلیفە (عەلی)یش مووریدی وی بووە و مووریدی دیکەشی هەبووە، ئێستا لە ژیاندا ماون.

* خەلیفە مەلا (زیاد) خەلیفەی تەریقەتە و سەر حەلەقەیە و سەرپەرشتی خەلیفایەتی دەکا، ئەگەر ئەو لێرە نەبێ حاجی (فەهمی) برای لەجێی دادەنیشێ.

### تەریقەت و ئیرشاد

- مەلا (یونس ئیبراهیم خدر)، کە پتر لە (٣٢) ساڵە لە ختم و ویردەکان ئامادە بوونی هەیە. سەبارەت بە تەریقەت و ئیرشادی نەقشبەندی شارەزاترە، بۆیە کە قسە هاتە سەر ئەم باسە گوتی: تەریقەتی نەقشبەندی هەتا ئێستاش لێرە پەیڕەو دەکرێ، وەک ختم و زیکر و تەهلیلە...تاد، بەڵام وەکو جاران نییە، چونکە خەڵک پتر بە دوای ژیانەوە وێڵن، لەگەڵ ئەمەشدا ئەم ڕێبازە هەر ماوە و زیندووە، سەبارەت بە چۆنیەتی ئەنجامدانی ختم کردن گوتی: سەر حەلقەمان هەیە و حاجی خەلیفە (زیاد)یان فەهمی برای لەگەڵمان دادەنیشێ. بەرد هەیە، ئەو بەردانەش لەناو توورەکەیەکی قایشدانە، بەسەر ئامادەبووان دابەش دەکرێن، ئینجا (١٠) کەس بێ، (١٥) کەس بێ، (١٠٠) کەس بێ، کۆی گشتی بەردەکان (١٠٠)ە، واتە ختم و ویردەکان سەتن. ئینجا هەر وەکو ئاماژەم بۆ کرد سەر حەلقەمان هەیە و حەلقە دەبەستین. سەرەتا بە تۆبە و ئیستغفار دەست پێدەکەن، ئینجا (فاتیحە)ی پیرۆز پێشکەش دەکرێ و سڵاواتیش لەسەر دیداری پێغەمبەر (د. خ)... پێنج جاران دەڵێین (لا حول ولا قوة الا بالله) پاشان (صلى الله على سيدنا النبي محمد وآله وسلم) و سەر حەلقە بەردەکان کۆ دەکاتەوە و دواتر لە فەخری عالەمەوە دەست پێ دەکا و ناوی ئەبو بەکری سەدیق و سەلمانی فارسی و دێتە سەر ناوی مەشاییخەکان، یەک یەک ناویان دەهێنێ، بۆ نموونە: (شاهی نەقشبەند، دانەری تەریقەتی نەقشبەندی و ئەوجا حەزرەتی غەوسی گەیلانی و شێخی تەوێڵە و کوڕەکانی و پاشان شێخی چۆلی و جا ختم و ویردەکان تەواو دەبێ. سەبارەت بە زیکر و تەهلیلەش لە ڕۆژی دووشەممان و پێنج شەممان پەیڕەو دەکرێ. لە کۆتاییشدا مەلا یونس گوتی: هەر شێخێکی نەقشبەندی، نازناوێکی هەیە، شێخی چۆلی نازناوی (ثهنائەدین)ە، ئەبو بەکرە فەندی (غەیاثەدین)ە.

### سەرنج

لەبەر ئەوەی مزگەوتێکی فراوان و ئاوەدان و جگە لە ڕۆژی چوارشەممان کە خەڵکێکی زۆر لە شاری هەولێر و دەرەوە سەردانی دەکەن، جاری وا هەیە یەک دوو پرسەشی لێیە و زوو زووش لەلایەن وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئایینی حکومەتی هەرێمی کوردستان بەسەر دەکرێتەوە و کەموکوڕییەکان چاک دەکرێ و پیاو چاکانی شاری هەولێریش ئاوڕی لێ دەدەنەوە و کەمترین پێویستی هەبێ جێبەجێ دەکەن.

(مەلا عیمادەدین کوڕی مەلا فائیز کوڕی مەلا عەبدوڵڵا مودەریسە، لە ساڵی (١٩٦٤)، لە گەڕەکی کۆنی عارەبان لەدایک بووە، بە فەقێیەتی خوێندوویەتی، کۆلێژی شەریعەی تەواو کردووە و بەکالۆریۆسی بەدەست هێناوە، لە ساڵی (١٩٩٤) بە ڕەسمی لە مزگەوتی شێخی چۆلی، بە ئیمام و خەتیب دامەزراوە و ئەندامی ئەنجوومەنی زانایانە لە وەزارەتی ئەوقافدا، پێشی ئەم باوک و باپیریشی مەلا بوون، لە مزگەوتی شێخی چۆلی، بنەماڵەکەیان پەیوەندییەکی پتەویان هەیە بەو شوێنە پیرۆزە، ئێستاش هەر بەردەوامن، مامۆستا مەلا عیمادەدین سەرپەرشتی کاروباری ئایینی دەکات، بەڵام (حەمە شەریف) پاش ئەوەی کە حاجی کوڕی مەلا تەها کۆچی دوایی کرد بووەتە متەولی مزگەوتی شێخی چۆلی، ئێستا ئەویش ئیش و کار و پێویستی مزگەوت بەڕێوە دەبات.

### تێبینی

بۆ ئەنجامدانی ئەم گەشتە سوودیشم لە کتێبی (الشيخ چۆلی)ی مامۆستا (زوبێر بیلال)ی مێژوونووس وەرگرتووە.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر، ژمارە (٢)ی ساڵی ٢٠٠٠ وەرگیراوە.



# مزگەوت و نوێژگەکانی هەولێر

فاتیح یاسین مودەریس

**سەرەتا:**

مێژووی شوێنە پیرۆزەکان کەلەپووری کورد دەردەخات. سەرکردەو لێهاتوانی کورد لەمزگەوتەکان فێری خوێندن و نووسین و خەمخواردنی ئەرکی نەتەوایەتی بوون، بەگشتی مزگەوت، قوتابخانەیەکی ئایینی و کوردایەتی بووە.

لەم مزگەوتانەدا چەندین زانای لێهاتووی لێ پەیدا بووە، کە هەمیشە خەمخۆری ئایینی خواو بەرگریکردن بوون لە نەتەوەکەیان.

خودای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

(وان المساجد لله، فلا تدعوا مع الله احدا)

ناودارانی وەک (سولتان موزەفەرو ئیبن خەلەکان و ئیبن مستەوفی و ئیبن سەلاح و ئیبن نەجائی هەولێری و ئیبراهیم عاسمی حەیدەری و شێخی چۆلی و شێخ ئەبو بەکری نەقشبەندی و شێخ محیەدینی شێخ سالحی قولەو حاجی داودو مەلا هیدایەتوللا و مەلافەندی و شێخ عەبدولکەریمی دارەخورماو دەیان کەلە پیاوی لەو جۆرە بووە کە هەموویان پەروەردەی تەکیەو خاناقا و حوجرەی مزگەوتەکانی شاری هەولێر بوون.

ئێمە لەدووبەشدا مزگەوتەکانی شاری هەولێر دەخەینە روو، بەشی یەکەم، بە پێی رێکەوتی دروستبوونیان بە سێ دەستە دابەشمان کردوون:

یەکەم: ئەو مزگەوتانەی لەپێش سەدەی بیستەم دروست کراون.

دووەم: ئەو مزگەوتانەی لەنیوەی

یەکەمی سەدەی بیستەم دروست کراون.

سێیەم: ئەو مزگەوتانەی لەنیوەی دووەمی سەدەی بیستەم دروست کراون.

و بەشی دووەم، تایبەتە بە نوێژگەکان (جێ نوێژەکان)

**دەستەی یەکەم: ئەو مزگەوتانەی لەپێش سەدەی بیستەم دروست کراون:**

١- مزگەوتی گەورەی سەر قەلا

ئەم مزگەوتە کەوتۆتە بەشی لای خۆرهەلاتی سەر قەلا. کۆنترین مزگەوتی هەولێرە. سەرەتای بنیاتنانی نەزاندراوە، بەلام دەلێن دەگەڕێتەوە بۆ سالی (١١٣٢)ی کۆچی. هەر لەکۆنەوە بەمزگەوتێکی ناودارو خاوەن رۆل ناسراوە، کەم کەس هەیە لەزانایان ناوبانگی نەبیستبێ، سەدان مەلاو زانای پێگەیاندووە.

٢- مزگەوتی ناو دارتاشەکان

ئەم مزگەوتە کەوتۆتە ناو جەرگەی بازاڕی شاری هەولێر. بۆ یەکەم جار لەسالی ١٧٦٨ لەسەر ئەرکی حاجی (عەبدوللەتیف) ناوێک دروست کراوە. ئەم مزگەوتە لەسێ نهۆم پێک هاتووە.

٣- مزگەوتی گەورەی ناو بازاڕ (حاجی داود)

ئەم مزگەوتە کەوتۆتە ناوەڕاستی بازاڕ نزیک قەیسەری بەرگ درووەکان. لەسالی ١٧٩٠ دەست بەدروستکردنی کراوە. ئەم مزگەوتە لەسەر ئەرکی (خوالێخۆشبوو حاجی داود حاجی ئەحمەد کوڕی سلێمان ئاغای شافیعی چیمەنی) دروست کراوە.

٤- مزگەوتی خانەقای گەورە

ئەم مزگەوتە کەوتۆتە دامێنی لای قیبلەی قەلا. لەناوەڕاستی بازاڕی دەلالخانەیە، سەرەتای دروستکردنی دەگەڕێتەوە بۆ سالی ١٨٠٥. ئەم مزگەوتە بەفەرمانی مەولانا خالیدو هەول و تەقەلای خوالێخۆشبوو مەلا هیدایەتوللا دروست کرا.

٥- مزگەوتی ئالتی بەرماغ

ئەم مزگەوتە لەناوەڕاستی بازاڕە، نزیک پەنیرو هەنگوین فرۆشەکان. سەرەتای دروستکردنی دەگەڕێتەوە بۆ سالی (١٨٠٠).

٦- مزگەوتی شێخ عەبدوللا قوتب (شێخەللا)

ئەم مزگەوتە کەوتۆتە لای خۆرهەلاتی قەلای هەولێر، ناوەڕاستی بازاڕی بازرگانی ئەو سەردەمە. تەنانەت بازاڕەکەش ناوی بازاڕی شێخەللای.گرتۆتە خۆ. دامەزراندنی بۆ (٤٠٠) سال لەمەوبەر دەگەڕێتەوە.

٧- مزگەوت و خانەقای شێخ مستەفای نەقشبەندی

ئەم مزگەوتە (٥٠٠م) لەقەلا دوورە. رووبەری مزگەوتەکە (١٠٠٠م) ە.

٨- مزگەوتی دێرە بروشە

ئەم مزگەوتە کەوتۆتە گەڕەکی عارەبان. سەرەتای دروستکردنی دەگەڕێتەوە بۆ سالی ١٨٤٦.

٩- مزگەوتی پاشا

کەوتۆتە ناو گەڕەکی عارەبان. سەرەتای دامەزراندنی دەگەڕێتەوە بۆ سالی ١٨٨٢. سەید مەحمودی سەید محەمەد سەید ئەحمەدی روفاعی دروستی کردووە.

١٠- مزگەوتە شێخی چۆلی

کەوتۆتە ناو گەڕەکی تەعجیل. سەرەتای دروستبوونی دەگەڕێتەوە بۆ سالی ١٨٨١.

١١- مزگەوتی حاجی عەبدولقادر محەمەد دەباغ

کەوتۆتە دامێن قەلا. سەرەتای درووستبوونی دەگەڕێتەوە بۆ سالی ١٨٩٠ لەسەر ئەرکی خوالێخۆشبوو حاجی عەبدولقادر محەمەد دەباغ دروست کراوە.

**دەستەی دووەم: ئەو مزگەوتانەی کە لەنیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم دروست کراون**

١٢- مزگەوتی گەورەی باداوە

بەکۆنترین مزگەوت دادەنرێت، لەناوەڕاستی باداوە لەسالی (١٩٠٥) دروست کراوە.

١٣- مزگەوتی مەلا نەبی

کەوتۆتە گەڕەکی تەعجیل. سەرەتای دامەزراندنی دەگەڕێتەوە بۆ سالی (١٩٠٦).

١٤- مزگەوتی موفتی

کەوتۆتە گەڕەکی تەعجیل. سەرەتای دروستبوونی دەگەڕێتەوە بۆ سالانی دەیەکانی سەدەی بیست.

١٥- مزگەوتی مەلا عابید

کەوتۆتە گەڕەکی تەعجیل. سەرەتای دروستبوونی دەگەڕێتەوە بۆ سالی (١٩١٢) پێش جەنگی

یەکەمی جیهانی.

١٦- مزگەوتی شێخانی (مەلا ئیبراهیم دۆغرەمەچی)

کەوتۆتە سەر قەلا. سەردتای دامەزراندنی دەگەڕێتەوە بۆ سالّی (١٩١٢) سەردەمی عوسمانلی.

١٧- مزگەوتی بێرکۆت

کەوتۆتە گەڕەکی بێرکۆت، لەسەر ڕێگای شەقلاوە. سەردتای دروستبوونی دەگەڕێتەوە بۆ سالّی (١٩١٣) سەردەمی حوکمی عوسمانلی.

١٨- مزگەوتی سلێمان مەولود (خەلیفە سمایل)

کەوتۆتە ناوجەرگەی گەڕەکی خانەقا. لەسالّی (١٩٢٥) لەسەر ئەرکی خوالێخۆشبوو حاجی ئیسماعیل دارتاش دروست کراوە.

١٩- مزگەوتی حاجی مەولود فەتاح (شێخە ڕەشکە)

کەوتۆتە بازاڕی مەزاتخانەی ئێستاکە-کۆنە فرۆش- پێشی دەوترێ مزگەوتی قازی. لەسالّی ١٩١٠ لەسەر ئەرکی خوالێخۆشبوو حاجی مەولود دروست کراوە.

٢٠- مزگەوتی شێخ نوردەدین

کەوتۆتە گەڕەکی تەعجیل لەسالّی (١٩٣٠) لەسەر ئەرکی یەکێ لەخەلیفەکانی شێخ نوردەدین بریفکانی دروست کراوە وخۆی ئەو ناوەی لێناوە.

٢١- مزگەوتی سەیداوەی کۆن

کەوتۆتە ناوەڕاستی گەڕەکی سەیداوە. مزگەوتی (سلێمان)یشی پێدەوترێ. لەسالّی (١٩٣٥) دروست کراوە.

٢٢- مزگەوتی شێخ مەلا ڕەشیدی کۆن

کەووۆتە گەڕەکی ئیبن مستەوفی. لەسالّی ١٩٣٥ لەسەر ئەرکی عەبدولفەتاح حاجی عەبدولقادر دەباغ دروست کراوە.

٢٣- مزگەوتی حاجی مەجید قەردار

کەوتۆتە گەڕەکی تەیراوە. لەسالّی ١٩٣٨ لەسەر ئەرکی خوالێخۆشبوو حاجی مەجید محەمەد عەبدوللا دروست کرا، کە بەحاجی مەجید قەردار بەناوبانگ بوو.

٢٤- مزگەوتی حاجی سالّح دەباغ

کەوتۆتە گەڕەکی عارەبان. مزگەوتی قیبلە خوارو قیبلە ڕاستیشی پێ دەلّێن. لەسالّی ١٩٣٩ لەسەر ئەرکی حاجی سالّح دەباغ دروست کرا.

٢٥- مزگەوتی خەلیفە خالید

کەوتۆتە گەڕەکی سەعداوە. لەسالّی ١٩٤٨ دروست کراوە.

٢٦- مزگەوتی فاتیمە خان

کەوتۆتە سنووری گەڕەکی ئیبن مستەوفی. لەسالّی ١٩٤٧ز لەسەر ئەرکی فاتیمە خانی کچی حوسێن دروست کرا.

٢٧- مزگەوتی حاجی نوردەدین موختار

کەوتۆتە بەرامبەر گۆڕەپانی کۆتری سەلام. لەسالّی ١٩٤٩-١٩٥١ دەست بەدەست دروست کراوە.

**دەستەی سێیەم: ئەو مزگەوتانەی لەنیوەی دووەمی سەدەی بیستەم دروست کراون**

٢٨- مزگەوتی حاجی مەحمود عەلاف

کەوتۆتە تەنیشت دیوانی پارێزگای هەولێر. لەسالّی ١٩٥٢ لەسەر ئەرکی خوالێخۆشبوو حاجی مەحمود عەللاف دروست کراوە.

٢٩- مزگەوتی شێخ عومەری بالیسانی

کەوتۆتە گەڕەکی سێتاقان. لەسالّی ١٩٥٢ز لەسەر بڕیاری شێخ عومەری شێخ تەهای بالیسانی دەست بەدروست کردنی کرا.

٣٠- مزگەوتی حاجی ئیبراهیم سەعید

کەوتۆتە پشت گومرگی کۆن و لەسالّی ١٩٥٢ز لەسەر بڕیاری حاجی ئیبراهیم سەعید سەعدوللا دروست کرا.

٣١- مزگەوتی حاجی قادر قەرەنی (باریکە)

کەوتۆتە گەڕەکی تەیراوە. حاجی قادر باریکە لەسالّی ١٩٥٣ز دروستی کرد.

٣٢- مزگەوتی حاجی عەبدوللا قوربانی

کەوتۆتە گەڕەکی سەیداوە لەسالّی ١٩٥٤ز حاجی عەبدوللا قوربانی و ژمارەیەک خێرخواز دروستیان کردووە.

٣٣- مزگەوتی شێخ محەمەد بالیسانی

کەوتۆتە گەڕەکی تەیراوە. لەسالّی ١٩٥٥ لەسەر بڕیاری شێخ محەمەد شێخ تەهای بالیسانی دەست بەدروست کردنی کراو خێرخوازان

دەوریان لەدروست کردنی بینیوە.

٣٤- مزگەوتی سەید غەریب سەید فەرەج بەرزنجی

کەوتۆتە گەڕەکی سێتاقان. لەساڵی ١٩٥٧ لەلایەن سەید غەریب سەید فەرەج بەرزنجی دروست کراوە.

٣٥- مزگەوتی مەلا عەبدوڵلا هەمزە

کەوتۆتە گەڕەکی سەیداوە. بڕیاری دروست کردنی لەساڵی ١٩٥٧ لەلایەن خزم و کەسی مامۆستا مەلا عەبدوڵلا هەمزە بڕیاری دروست کردنی دراوە.

٣٦- مزگەوتی خورشید عالیم

کەوتۆتە گەڕەکی زانیاری. لەلایەن حاکم حەیدەر ئاغا لەساڵی ١٩٥٨ دروست کراوە.

٣٧- مزگەوتی حاجی سلێمانی قەساب

کەوتۆتە گەڕەکی ڕووناکی-موفتی. لەساڵی ١٩٥٩ لەلایەن دانیشتوانی ئەو گەڕەکە دروست کراوە.

٣٨- مزگەوتی سدیق

لەسنووری گەڕەکی کورانی عەنکاوەیە. لەساڵی ١٩٦٠ لەلایەن خەڵکی ئەو گەڕەکە دروست کراوە.

٣٩- مزگەوتی حاجی تەها قەساب

کەوتۆتە پشت ئوتێلی زەیتوونە. لەساڵی ١٣٨١ک-١٩٦٠ لەسەر ئەرکی حاجی تەهای قەساب دەست بەدروستکردنی کراوە.

٤٠- مزگەوتی سدیقە خاتوون

کەوتۆتە گەڕەکی عارەبان. لەساڵی ١٩٦٠ لەسەر ئەرکی خاتوو سدیقە مەلا ساڵح دەباغ دەست بەدروستکردنی کراوە.

٤١- مزگەوتی حاجی عەبدوڵلا حەمامچی

کەوتۆتە گەڕەکی تەیراوە. لەساڵی ١٩٦٠ز لەسەر ئەرکی حاجی عەبدوڵلا دەست بەدروستکردنی کراوە.

٤٢- مزگەوتی خەلیفە مەلا ئەحمەد

کەوتۆتە گەڕەکی سێتاقان. لەساڵی ١٩٦٠ دروست کراوە.

٤٣- مزگەوتی کوێتی

کەوتۆتە سەر شەقامی ٣٠ مەتری. لەساڵی ١٩٦٠ز لەسەر ئەرکی حاجی عوسمان دەست بەدروستکردنی کرا.

٤٤- مزگەوتی مەلا بەکری قەلاسنج

کەوتۆتە گەڕەکی سێتاقانی سەروو. لەساڵی ١٩٦١ خەڵکی ئەو گەڕەکە پارەیان کۆکردەوەو دروستیانکرد.

٤٥- مزگەوتی حاجی موراد

کەوتۆتە گەڕەکی سێتاقان، سەر شەقامی ٦٠ مەتری، لەساڵی ١٩٦١ لەسەر ئەرکی حاجی موراد پیرۆ دەست بەدروست کردنی کرا.

٤٦- مزگەوتی حاجی حەسەن بەزاز

کەوتۆتە گەڕەکی عارەبان. لەساڵی ١٩٦١ لەسەر ئەرکی خوالێخۆشبوو حاجی حەسەن هیدایەت بەزاز، کە ناسراوە بەحاجی حەسەن دروست کرا.

٤٧- مزگەوتی شێخ مەلا ڕەشیدی نوێ

کەوتۆتە گەڕەکی تەیراوە، نێوان هەردوو شەقامی (٣٠-٦٠) مەتری. لەساڵی ١٩٦١ لەسەر خواستی خوالێخۆشبوو شێخ مەلا ڕەشید دروست کرا.

٤٨- مزگەوتی ئیسکان

کەوتۆتە نزیک شوقەکانی ئیسکان. هەروەها پێی دەگوترێ مزگەوتی حاجی قەرۆ مزگەوتی محەمەدیە. لەساڵی ١٩٦٢ز لەلایەن خوالێخۆشبوو حاجی محەمەد قاسم توتنچی دروست کرا.

٤٩- مزگەوتی گەورەی ئازادی جووت منارە

کەوتۆتە نزیک بنکەی کارەبای شار لەگەڕەکی ئازادی لەساڵی ١٩٦٢ز دروست کراوە.

٥٠- مزگەوتی مەلا نوری کووران

کەوتۆتە نزیک ئەلبان و شەقامی ٦٠ مەتری. لەساڵی ١٩٦٢ز دروست کراوە.

٥١- مزگەوتی مام حەسەن عەلی قەساب

کەوتۆتە گەڕەکی سێتاقان. لەساڵی ١٩٦٢ز لەلایەن حاجی حەسەن دروست کراوە.

٥٢- مزگەوتی سەید نوری بەستەپیازە

کەوتۆتە گەڕەکی بەستەپیازە (خانزاد). لەساڵی ١٩٦٢ لەسەر ئەرکی مامۆستا مەلا سەید نوری سەید عەبدولرەحمان سەید حوسێن نەعیمی دەست بەدروست کردنی کرا.

٥٣- مزگەوتی مەلا زاهیری کووران

کەوتۆتە گەڕەکی کووران. لەساڵی ١٩٦٣ خەڵکی ئەو کۆڵانانە پارەیان کۆکردۆتەوە و مامۆستا مەلا مەعروف حەمەد ئەمین سەرپەرشتی دروست کردووە.

٥٤- مزگەوتی مەلا رەشیدی کووران

کەوتۆتە گەڕەکی کووران. کاتی خۆی لەساڵی ١٩٦٣ز دانیشتوانی ئەو گەڕەکە بەپارە، یان بەنیازی مزگەوت دروستکردن کۆ کردۆتەوە و مامۆستا مەلا رەشیدی کۆزەپانکە سەرپەرشتی دروستکردنی کردووە.

٥٥- مزگەوتی خۆشناو

کەوتۆتە پشت باخچەی گشتی خانزاد. لەساڵی ١٩٦٣ دروست کراوە.

٥٦- مزگەوتی حاجی بەکر زێڕینگەر

کەوتۆتە گەڕەکی سەیداوە. لەساڵی ١٩٦٤ لەسەر ئەرکی حاجی بەکر سەلیم حەماوی دروست کراوە.

٥٧- مزگەوتی حاجی رەمەزان حوسێن بەزاز

کەوتۆتە پشت گومرگی کۆن- سێتاقان- لەساڵی ١٩٦٥ز لەسەر ئەرکی خوالێخۆشبوو حاجی رەمەزان حوسێن بەزاز دروست کراوە.

٥٨- مزگەوتی شێخ مستەفای باقلان

لەگەڕەکی سەیداوە نزیک شەقامی ٦٠ مەترییە. لەساڵی ١٩٦٥ز شێخ مستەفای باقلان دروستی کردووە.

٥٩- مزگەوتی حاجی حوسێن ئیسماعیل

کەوتۆتە سەر شەقامی ٣٠ مەتری نزیک منارەی مۆزەفەریە. لەساڵی ١٩٦٥ز خوالێخۆشبوو حاجی حوسێن ئیسماعیل ئەرکی دروست کردنی گرتۆتە ئەستۆ.

٦٠- مزگەوتی سەید قادر

کەوتۆتە گەڕەکی بەستەپیازە خانزاد، لەسەر ئەرکی سەید قادر سەید مەجیدو خێرخوازانی ئەو گەڕەکە لەساڵی ١٩٦٦ دروست کرا.

٦١- مزگەوتی سپی

کەوتۆتە سەر شەقامی ٦٠ مەتری نزیک بازاڕی سورچیان. لەساڵی ١٩٦٧ لەسەر ئەرکی عەبدولقادر عەبدولکەریم شنۆیی دەست بەدروست کردنی کرا.

٦٢- مزگەوتی شێخ مەعروف

کەوتۆتە تەنیشت گۆڕستانی شێخ مەعروف لەگەڕەکی باداوە. لەبەر ئەوە پێی دەگوترێ مزگەوتی شێخ مەعروف، بەڵام بەرەسمی ناوی سەعد بن ئەبی وەقاسە. لەساڵی ١٩٦٨ دروست کراوە.

٦٣- مزگەوتی حاجی مەلا مەحمود

کەوتۆتە سەر شەقامی ٣٠ مەتری. لەساڵی ١٩٦٨ مامۆستا مەلا مەحمود مەلا تاهیر دێرەبروشە ئەرکی دروست کردنی گرتە ئەستۆ.

٦٤- مزگەوتی شێخ کاکە

کەوتۆتە گەڕەکی ئازادی. لەساڵی ١٩٦٨ لەسەر بڕیاری شێخ کاکە دەست بەدروست کردنی کرا.

٦٥- مزگەوتی عوسمانی کوڕی عەفان (مەلا تەلعەت)

کەوتۆتە گەڕەکی مەنتکاوە لەساڵی ١٩٧٠ دروست کراوە.

٦٦- مزگەوتی حاجی بەهجەت (شۆڕشی نوێ)

کەوتۆتە گەڕەکی شۆڕش لەساڵی ١٩٧٠ دروست کراوە.

٦٧- مزگەوتی رەشاد نەجاڕ

کەوتۆتە نزیک پردی گەڕەکی سەیداوە. لە ١٩٧١/١٢/١ لەسەر ئەرکی بەڕێزان رەشاد خورشید نەجاڕ و یاسین خورشید نەجاڕ دروست کراوە.

٦٨-مزگەوتی سەید تەها گەردی

کەوتۆتە سەر شەقامی ٦٠ مەتری. لەساڵی ١٩٧٢ دروست کراوە.

٦٩- مزگەوتی زەکیەخان

لەسەر شەقامی ٦٠ مەتری، نزیک چوار ڕیانی فرانسۆ میترانە. لەساڵی ١٩٧٢ زەکیە شێخ محەمەد و حەیدەر ئاغای کوڕی ئەرکی دروست کردنیان گرتۆتە ئەستۆ.

٧٠- مزگەوتی سەید قاسم خەیات

لەسەر شەقامی ٦٠ مەتری نزیک نەخۆشخانەی ئیمرجنسی لەساڵی ١٩٧٢ لەسەر ئەرکی خوالێخۆشبوو سەید قاسم سەید عەبدوڵلای خەیات دروست کراوە.

٧١- مزگەوتی حاجی حوسێن قەساب

کەوتۆتە گەڕەکی عارەبانی نوێ. لەساڵی ١٩٧٣ حاجی حوسێن زراری دروستی کردووە.

٧٢- مزگەوتی حاجی عەزیز ئیبراهیم

کەوتۆتە ناوەڕاستی گەڕەکی

گلکەند. لەساڵی ١٩٧٣ لەسەر ئەرکی خوالێخۆشبوو حاجی عەزیز ئیبراهیم دروست کرا.

٧٣- مزگەوتی حاجی عەزیز پیرداود

کەوتۆتە ڕێگای مەخمور، سەر شەقامی سەرەکی کوران لەساڵی ١٩٧٣ حاجی عەزیز خدر پیرداود دروستی کردووە.

٧٤- مزگەوتی زانیاری

کەوتۆتە گەڕەکی زانیاری بەرامبەر خانووەکانی مەحەتە. لەساڵی ١٩٧٤ دروست کراوە و مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا فەرهادی بەکۆمەک کۆکردنەوەو یارمەتی خەڵک سەرپەرشتی دروستکردنی کردووە.

٧٥- مزگەوتی عەلائەدین سوجادی (زەرد)

ئەم مزگەوتە کەوتۆتە گەڕەکی شۆڕش نزیک کۆمپانیای گشتی سەفین بۆ گواستنەوە، لە سەر ڕێگای شەقڵاوە. لەساڵی ١٩٧٤ ئەرکی دروست کردنی کەوتە سەر خوالێخۆشبوو حاجی عەبدوڵڵا حەمامچی.

٧٦- مزگەوتی حاجی سەلیم باداوە

کەوتۆتە گەڕەکی باداوە سەر ڕێگای بنەسڵاوە. حاجی سەلیم مەولود سلێمان، کە خەڵکی گوندی باداوەیە لەساڵی ١٩٧٦ دروستی کردووە.

٧٧- مزگەوتی سەید حوسێن بەرزنجی

کەوتۆتە گەڕەکی ئازادی و بەرامبەر چاپخانەی پەروەردەی هەولێر. لەساڵی ١٩٧٦ سەید حوسێن سەید ئیسماعیل بەرزنجی دروستیکردووە.

٧٨- مزگەوتی گەڕەکی ماجیداوە

کەوتۆتە گەڕەکی ماجیداوە سەر ڕێگای مەخمور نزیک ناوچەی پیشەسازی باشوور. پاش پارە کۆکردنەوە لەخەڵکی ئەو گەڕەکەو خێرخوازان و خواناسان حاجی محەمەد زرار یوسف لەڕۆژی ١٩٧٧/١٠/١ سەرپەرشتی دروستکردنی کرد.

٧٩- مزگەوتی حاجی عەلی سۆرانی

کەوتۆتە گەڕەکی کوران- ڕزگاری سەر ڕێگای مەخمور لەساڵی ١٩٧٧ ئەرکی دروست کردنی کەوتە ئەستۆی حاجی عەلی سۆرانی

٨٠- مزگەوتی حاجی زاهیر بندیان

لەگەڕەکی ئازادییە و سەرەتا لەساڵی ١٩٧٧ لەسەر دەستی حاجی زاهیر حاجی باول بندیان دروست کرا.

٨١- مزگەوتی ئیسماعیل مەنتکاوە

لەگەڕەکی مەنتکاوەیە. پشت بنکەی پۆلیسی فریاکەوتن. لەساڵی ١٩٧٨ دانیشتوانی گەڕەکەکە بەسەرپەرشتی مامۆستا سەید محەمەد سەید ئیسماعیل پیر خدری دروستیان کرد.

٨٢- مزگەوتی خالیدی کوری ولید

لەخانووەکانی دەواجنە پشت وەزارەتی کاروباری پێشمەرگە لەساڵی ١٩٧٨ بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەلەوەری ناوچەی باکوور دروستی کردووە.

٨٣- مزگەوتی حاجی بەدریە

کەوتۆتە چوار ڕێیانی کوردستان، کووران- نەورۆز. سەرەتا لەساڵی ١٩٧٨ لەسەر ئەرکی بەدریە عەبدولڕەحمان شیشاو جەماس (گامێشەوان) دەست بەدروست کردنی کرا.

٨٤- مزگەوتی پیربال ئاغا

لەگەڕەکی سەلاحەدینە سەر ڕێگای کۆنی بەحرکە نزیک مزگەوتی سەنیەخان. لەساڵی ١٩٧٨ دروست کرا.

٨٥- مزگەوتی حاجی عەلی مەولود

کەوتۆتە گەڕەکی سێتاقانی سەروو، پشت نەخۆشخانەی ڕەسولی تایبەت سەر ڕێگای کۆیە، لەساڵی ١٩٧٨ دروست کراوە.

٨٦- مزگەوتی حاجی عادل حەماوی

لەگەڕەکی مەنتکاوەیەو سەرەتا بەشێوەیەکی سەرەکی لە ١٩٧٩/٨/١ حاجی عادل محەمەد سەلیم حەماوی دروستی کرد.

٨٧- مزگەوتی خانووەکانی کارگەی جگەرە

کەوتۆتە ناو گەڕەکی کرێکارانی کارگەی جگەرەی هەولێر سەر ڕێگای شەقڵاوە. لەساڵی ١٩٧٩ لەسەر ئەرکی ئەو کارگەیە دروست کراوە.

٨٨- مزگەوتی مەلا حەسەن (ئەبو عەلی)

لەگەڕەکی سورچییانەو لەلایەن

دانیشتوانی ئەو گەڕەکە لەساڵی ١٩٧٩دا دروست کرا

٨٩- مزگەوتی حاجی سەنیەخان

لەگەڕەکی سورچیانە سەر ڕێگای کۆنی بەحرکە. لەساڵی ١٩٧٩ لەسەر ئەرکی خوالێخۆشبوو خاتوو سەنیە کەخێزانی حاجی عەبدوڵڵا حەمامچی بوو دروست کرا.

٩٠- مزگەوتی حاجی فەهیمە

لەگەڕەکی کورانە و لەساڵی ١٩٧٩ لەسەر ئەرکی حاجی فەهیمە شێخ عەلی شێخ حەسەن، کە نەوەی شێخ جامی عەلیاوەییە دروست کرا.

٩١- مزگەوتی حاجی محەمەد کەریم خەندە

کەوتۆتە یەکێ لەکۆڵانەکانی تەیراوە نزیک شەقامی ٦٠ مەتری. لەسەر ئەرکی حاجی محەمەد، کە خەڵکی گوندی بەرحوشترە لەبەرانەتی لەساڵی ١٩٨٠ دروست کرا.

٩٢- مزگەوتی شێخ سانی

کەوتۆتە نزیک خانووەکانی کارگەی مافوور لەساڵی ١٩٨٠-١٩٨٣ ئەرکی دروستکردنی کەوتە ئەستۆی کاک شێخ سانی شێخ محەمەد نەقشبەندی.

٩٣- مزگەوتی شێخ سەدرە

لەگەڕەکی شەهیدانی سێتاقانە لەساڵی ١٩٨٠-١٩٨٣ دروست کرا.

٩٤- مزگەوتی گۆڕستانی شارەوانی باشوور

کەوتۆتە ناو گۆڕستانی شارەوانی باشوور - کارگەی قیر) سەر ڕێگای قەتەوی، لەساڵی ١٩٨٠ لەگەڵ دامەزراندنی ئەو گۆڕستانە دروست کرا.

٩٥- مزگەوتی گۆڕستانی شارەوانی باکوور

کەوتۆتە سەر شەقامی ١٠٠ مەتری بەرامبەر گرتووخانەی مێرد منداڵان (نەوجەوانان). لەساڵی ١٩٨٠ لەگەڵ دامەزراندنی ئەو گۆڕستانە دروست کرا.

٩٦- مزگەوتی شێخ حەسەن خەیلانی بەرزنجی

کەوتۆتە نزیک شەقامی ١٠٠ مەتری لەگەڕەکی باداوە. سەرەتای دروستکردنی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٨٠ لەسەر بڕیاری شێخ حەسەن شێخ محەمەد ئەمین خەیلانی دروست کرا.

٩٧- مزگەوتی حاجی باقی (دار سەلام)

لەگەڕەکی باداوەیەو کەوتۆتە ڕۆژهەڵاتی ١٠٠ مەتری. لە ١/١/ ١٩٨٠ لەسەر ئەرکی حاجی باقی قاسم ئیبراهیم دروست کرا.

٩٨- مزگەوتی پیرێژن

کەوتۆتە گەڕەکی موفتی. لەساڵی ١٩٨٠ لەسەر ئەرکی فاتیمەخان دروست کرا. لەبەر ئەوەی زانیاری تەواو لەسەر ئەو فاتیمەخانە دەست نەکەوتووە. تەنیا ئەوە نەبێت کە لەکاتی دروستکردنی بەساڵاچوو بووە. بۆیە پێی وتراوە مزگەوتی پیرێژن.

٩٩- مزگەوتی شەهید ڕەحمان جوامێر

کەوتۆتە ناوەڕاستی گەڕەکی کوردستان. لە ١/٤/١٩٨١ لەسەر ئەرکی حاجی جوامێر گەرە شێخانی دروست کرا.

١٠٠- مزگەوتی شەهید فەتاح عەلی

لەگەڕەکی کوردستانەو حاجی عەلی تاهیر یەعقوبی لە ٢٣/٢/١٩٨١ ئەرکی دروستکردنی گرتە ئەستۆ.

١٠١- مزگەوتی عەبدولڕەحمان کوڕی عەوف

لەگەڕەکی کوردستانە نزیک سنووری گەڕەکی کرێکاران. لەسەر ئەرکی ئەوقافی هەولێر لەساڵی ١٩٨١ دروست کرا.

١٠٢- مزگەوتی حاجی جەواد

لەگەڕەکی کرێکارانە بەرامبەر خانووەکانی کرێکارانی کارگەی رستن و چنین لەباکوورەوە. حاجی جەواد پیرداود مەعروف لەساڵی ١٩٨١ لەسەر ئەرکی خۆی دروستی کرد.

١٠٣- مزگەوتی بوخاری

کەوتۆتە گەڕەکی بەهار لەساڵی ١٩٨١ لەسەر ئەرکی حاجی قادر خدرو بەسەرپەرشتی حاجی محەمەدی برای و هاوکارانی گەڕەک دروست کراوە.

١٠٣- مزگەوتی ڕەشاد موفتی (بەکر)

کەوتۆتە سەر ڕێگای کەرکوک نزیک سەرۆکایەتی زانکۆی سەلاحەدین، لەساڵی ١٩٨١ لەسەر ئەرکی میری دروست کرا.

١٠٥- مزگەوتی سەلاحەدین

کەوتۆتە گەڕەکی مامۆستایان بەرامبەر گۆڕستانی شێخ مەعروف. لەساڵی ١٩٨١ بەڕێوەبەرایەتی

ئەوقافی هەولێر ئەرکی دروست کردنی گرتە ئەستۆ.

١٠٦- مزگەوتی حاجی تۆفیق

کەوتۆتە گەڕەکی سێتاقانی سەروو پشت نەخۆشخانەی رەسولی تایبەت، نزیک ڕێگای کۆیە. لە ١٩٨١/٦/١٦ حاجی تۆفیق ئەحمەد مستەفا ئەرکەکەی گرتۆتە ئەستۆ.

١٠٧- مزگەوتی شەهید سەباح

کەوتۆتە گەڕەکی شۆڕش خۆرئاوای ڕێگای شەقلاوە. لەساڵی ١٩٨١ لەسەر ئەرکی کەسوکاری شەهید سەباح سۆفی خدر قازی دروست کرا.

١٠٨- مزگەوتی شەهید حوسێن مەحمود جۆلا

کەوتۆتە گەڕەکی شەهیدانی بەلاشاوای سەر ڕێگای مەخمور، بەرامبەر کارگەی رستن و چنین. لەساڵی ١٩٨٢ لەسەر ئەرکی حاجی مەحمود جۆلا دروست کرا.

١٠٩- مزگەوتی شەهید عەبدلواحید محەمەد شێخە

کەوتۆتە گەڕەکی ٩٢ نزیک شوقەکان، تەنیشت کۆلێژی پۆلیسی هەرێمی کوردستان، لەساڵی ١٩٨٢ لەسەر ئەرکی کەسوکاری شەهیدی ناوبراو دروست کرا.

١١٠- مزگەوتی مام ئەسعەد

لەگەڕەکی باداوەیە نزیک شەقامی ١٠٠ مەتری، لەساڵی ١٩٨٢ بەکاری هەرەوەزی لەلایەن دانیشتوانی گەڕەکەکە دروست کراوە.

١١١- مزگەوتی شەهید حەسەن

لەگەڕەکی سێتاقانی سەروو نزیک نەخۆشخانەی رزگاری، لەساڵی ١٩٨٢ لەلایەن کەسوکاری شەهید دروست کراوە.

١١٢- مزگەوتی شەهید ئیسماعیل

کەوتۆتە گەڕەکی سێتاقانی سەروو لای خۆرئاوای نەخۆشخانەی رزگاری، لەساڵی ١٩٨٢ لەلایەن کەسوکاری شەهید دروست کراوە.

١١٣- مزگەوتی شێخ محیەدین شێخ ساڵح بەرزنجی

کەوتۆتە سەر شەقامی سەرەکی گەڕەکی برایەتی، شەقامی نێوان کارگەی مافوورو سەمونخانەی ساوا. لەساڵی ١٩٨٢ لەسەر بڕیاری شێخ محیەدین دەست بەدروست کردنی کرا.

١١٤- مزگەوتی عومەر بن خەتاب

لەگەڕەکی ڕاپەڕینە، لەساڵی ١٩٨٢ لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی ئەوقافی هەولێر دروست کرا.

١١٥- مزگەوتی شەهید ئیبراهیم ئیسماعیل

لەگەڕەکی ڕاپەڕینە نزیک شەقامی ١٠٠ مەتری. لەساڵی ١٩٨٢ لەلایەن کەسوکاری شەهید دروست کرا.

١١٦- مزگەوتی حاجی تەها سلێمان ناوخۆش

لەگەڕەکی سوورچیانە. پاش کۆچکردنی حاجی تەها لەساڵی ١٩٨٢ لەلایەن حاجی قادری برای و برازاکانی و کوڕەکانی حاجی تەها دەست کرا بەدروستکردنی.

١١٧- مزگەوتی شەهیدەین

لەگەڕەکی نەورۆزە سەر شەقامی سەرەکی ئەو ڕێگایە، لەساڵی ١٩٨٢ لەلایەن کەسوکاری دوو شەهید دروست کراوە.

١١٨- مزگەوتی شەهید محەمەد عەزیز

لەگەڕەکی کوردستانە، لەساڵی ١٩٨٢-١٩٨٣ ئەرکی دروست کردنی کەوتە سەر شانی کەسوکاری شەهید.

١١٩- مزگەوتی گەڕەکی نەسیج

کەوتۆتە ناوەڕاستی گەڕەکی کۆمپانیای گشتی رستن و چنین، نزیک ڕێگای مەخمور. لەساڵی ١٩٨٣ لەسەر ئەرکی بەڕێوەبەرایەتی ئەوقافی هەولێر دروست کراوە.

١٢٠- مزگەوتی نەعێمی

کەوتۆتە گەڕەکی شەهیدانی کوران. لە٨/١١/١٩٨٣ لەلایەن سەید حوسێن نەعێمی دروست کرا.

١٢١- مزگەوتی حاجی یەحیا

کەوتۆتە گەڕەکی مەهاباد نێوان چاپخانەی زانکۆو شەقامی ١٠٠ مەتری. لە ١٢/٤/١٩٨٣ خوالێخۆشبوو حاجی یەحیا حاجی قاسم لەسەر ئەرکی خۆی دروستی کرد.

١٢٢- مزگەوتی حاجی سدیق شەربەت فرۆش (راستی)

کەوتۆتە نێوان گەڕەکی باداوەو گلکەند. لەساڵی ١٩٨٣ ئەرکی دروست کردنی کەوتە ئەستۆی حاجی سدیق عەلی سەعید.

١٢٣- مزگەوتی شێخ نەسرەدین
لەگەڕەکی گلکەندەو لەساڵی ١٩٨٣ شێخ نەسرەدین شێخ بابە عەلی شێخ مستەفا ئەرکی دروست کردنی گرتە ئەستۆ، هەرچەندە دەیان کەسی خێرخواز یارمەتی داوە.

١٢٤- مزگەوتی شەهید یاسین
کەوتۆتە گەڕەکی سێتاقانی سەروو، نزیک نەخۆشخانەی رزگاری. لەساڵی ١٩٨٣ لەلایەن کەسوکاری شەهید دروست کرا.

١٢٥- مزگەوتی گوڵستان
لەگەڕەکی برایەتی سەر شەقامی تەنیشت هۆڵی زەرد. لەساڵی ١٩٨٣ دروست کراوە.

١٢٦- مزگەوتی شەهید نەجمەدین نادر
لەگەڕەکی زانایانی گەڕەکی شۆڕشە، لە ساڵی ١٩٨٢ لەلایەن کەسوکاری شەهید دروست کرا.

١٢٧- مزگەوتی ئەتراف (بەلاشاوە)
کەوتۆتە گەڕەکی بەلاشاوەی کورانی عەنکاوە. لەساڵی ١٩٨٣ لەلایەن خەڵکی گەڕەک دروست کرا.

١٢٨- مزگەوتی سەلام
کەوتۆتە گەڕەکی بەلاشاوە لەساڵی ١٩٨٤ حاجی تالیب حاجی سەلام، پاش ئەوەی باوکی کۆچی دوایی کرد بڕیاریدا مزگەوتێک بەناوی ئەووەوە دروست بکات.

١٢٩- مزگەوتی حاجی سەعید مەلا سمایل
لەگەڕەکی کوردستانە نزیک بازاڕگای شارەوانی. لەساڵی ١٩٨٤ حاجی سەعیدی مەلا سمایل لەسەر ئەرکی خۆی دروستی کرد.

١٣٠- مزگەوتی فورقان
کەوتۆتە گەڕەکی عەدالە، بەرامبەر کۆمپانیای گشتی شیش و دار، سەر ڕێگای کۆنی قوشتەپە. لەساڵی ١٩٨٤ لەسەر ئەرکی حاجی جیهاد بەکر ئیسماعیل دروست کرا.

١٣١- مزگەوتی حاجی تەها
کەوتۆتە گەڕەکی باداوە، نزیک دوو ڕیانی ٣٠ مەتری بنەسڵاوە، لەساڵی ١٩٨٤ لەسەر ئەرکی خوالێخۆشبوو حاجی تەها عەزیز خۆشناو دروست کرا.

١٣٢- مزگەوتی شەهید خەتاب
کەوتۆتە گەڕەکی باداوە، لەساڵی ١٩٨٤ لەسەر ئەرکی کەسوکاری شەهید دروست کرا.

١٣٣- مزگەوتی بەدر
لەگەڕەکی باداوەیەو لەساڵی ١٩٨٤ دروست کرا.

١٣٤- مزگەوتی حاجی قەرەنی
لەگەڕەکی گلکەندەو لەساڵی ١٩٨٤- ١٩٨٥ لەسەر ئەرکی حاجی قەرەنی حاجی تاهیر عەلی بەزاز دروست کرا.

١٣٥- مزگەوتی مەلا عومەر نوری زادە
لە گەڕەکی سێتاقانی سەرووە. لەساڵی ١٩٨٤ لەلایەن دانیشتوانی ئەو گەڕەکە دروست کرا.

١٣٦- مزگەوتی حاجی ئەحمەد نەقشبەندی
لەگەڕەکی برایەتییە، لەساڵی ١٩٨٤ لەسەر ئەرکی حاجی ئەحمەد مەلا عەبدوڵلا نەقشبەندی، کە لەعەشیرەتی هەرشەمییە دروست کرا.

١٣٧- مزگەوتی کاوانی
کەوتۆتە گەڕەکی بەستەپیازە (خانزاد) لەساڵی ١٩٨٤ لەسەر ئەرکی حاجی جەمیل مستەفا کاوانی دەست بەدروستکردنی کرا.

١٣٨- مزگەوتی حاجی عەبدولواحید
کەوتۆتە ناوچەی پیشەسازی باکوور، لەساڵی ١٩٨٤ لەسەر ئەرکی حاجی عەبدولواحید حاجی حەسەن دەست بەدروستکردنی کرا.

١٣٩- مزگەوتی حاجی هاشم عەتار
کەوتۆتە سەر شەقامی سەرەکی گەڕەکی سورچیان. لەساڵی ١٩٨٤ حاجی هاشم سۆفی حەمەشین دروستی کردووە.

١٤٠- مزگەوتی زەکیە فەتاح
لەگەڕەکی کورانی عەنکاوەیە. لەساڵی ١٩٨٤ دروست کراوە.

١٤١- مزگەوتی شەهید عەبدولقادر (پیرێژن)
کەوتۆتە سنووری خۆرئاوای گەڕەکی نەورۆز لەساڵی ١٩٨٥ لەلایەن کەسوکاری شەهید دروست کرا.

١٤٢- مزگەوتی حاجی لائیقە زونون
لەگەڕەکی کوردستانەو لەساڵی ١٩٨٥ لەسەر ئەرکی حاجی لائیقە زنون عەزیز دروست کرا.

١٤٣- مزگەوتی مامۆستا مەلا

محەمەدی جەدیدەلەک
کەوتۆتە کۆتایی شاری هەولێر لەئاستی گەڕەکی کرێکاران، لەساڵی ١٩٨٥ دروست کراوە.
١٤٤- مزگەوتی شەهیدەینی کووران
کەوتۆتە گەڕەکی کووران، لەساڵی ١٩٨٥ لەسەر ئەرکی کەسوکاری دوو شەهید دروست کراوە.
١٤٥- مزگەوتی ئیسماعیل یەعقوبی
کەوتۆتە گەڕەکی زانیاری لەسەر شەقامی مەخموور. لەساڵی ١٩٨٥ لەسەر ئەرکی ئیسماعیل ئەحمەد عەلی یەعقوبی دەست بەدروستکردنی کرا.
١٤٦- مزگەوتی (ئیخوان) حاجی سەلام
کەوتۆتە گەڕەکی کۆماری. لەساڵی ١٩٨٥ لەلایەن کوڕەکانی مامۆستای خوالێخۆشبوو مەلا حەسەنی تیماری دروست کرا.
١٤٧- مزگەوتی گەڕەکی رووناکی (خڕ)
کەوتۆتە ناوەڕاستی گەڕەکی رووناکی. لەساڵی ١٩٨٥ دروست کرا.
١٤٨- مزگەوتی ماجیدی
کەوتۆتە گەڕەکی ئەندازیاران. لەساڵی ١٩٨٥ مامۆستای خوالێخۆشبوو، عەبدولقادر ئیسماعیل عەلی ماجیدی دروستی کردووە.
١٤٩- مزگەوتی حاجی خدر بابە
لەگەڕەکی راپەڕینە، لەساڵی ١٩٨٥ لەسەر ئەرکی کوڕەکانی خوالێخۆشبوو دروست کرا.
١٥٠- مزگەوت و تەکیەی شێخ قادر بەرزنجی
کەوتۆتە گەڕەکی کووران رزگاری، لەساڵی ١٩٨٦ دانیشتوانی گەڕەک و خێرخوازان دروستیانکرد.
١٥١- مزگەوتی حاجی حەیدەر
کەوتۆتە گەڕەکی ئازادی، لەساڵی ١٩٨٦ لەلایەن دانیشتوانی گەڕەک دروست کرا.
١٥٢- مزگەوتی حاجی مستەفا عوسمان
کەوتۆتە گەڕەکی سێتاقانی سەروو، لەساڵی ١٩٨٦ حاجی مستەفا حاجی عوسمان خۆی و کوڕەکانی ئەرکی دروستکردنیان گرتە ئەستۆ.
١٥٣- مزگەوتی ئەبوبەکری سدیق
لەگەڕەکی کوێستانە، لەساڵی ١٩٨٦ لەسەر ئەرکی حاجی رەسول عەبدولرەحمان دروست کراوە.
١٥٤- مزگەوتی قادر بلە
لەسەر شەقامی ٦٠ مەتری، لەساڵی ١٩٨٧ لەسەر ئەرکی حاجی قادر ئەحمەد دروست کرا.
١٥٥- مزگەوتی شێخ ئەحمەد خەیلانی
لەگەڕەکی شۆڕش بەرامبەر دۆلاراوایە، لەساڵی ١٩٩٠ تەواو بووەو ئەرکی دروستکردنی کەوتە سەر ئەستۆی شێخ ئەحمەد شێخ محەمەد ئەمین خەیلانی بەرزنجی.
١٥٦- مزگەوتی شوهەدا
کەوتۆتە گەڕەکی موفتی، لەساڵی ١٩٨٧ ئەرکی دروستکردنی کەوتە ئەستۆی حاجی خەلیل شاکر دارفرۆش.
١٥٧- مزگەوتی حاجی عەبدەی بەقال
کەوتۆتە گەڕەکی ئازادی، لەساڵی ١٩٨٧ ئەرکی دروستکردنی کەوتە ئەستۆی حاجی عەبدولڕەزاق ئەحمەد حەسەن و هاشمی برای.
١٥٨- مزگەوتی بیلال حەبەشی
کەوتۆتە گەڕەکی بەلاشاوەی باداوە. لەساڵی ١٩٨٧ لەلایەن دانیشتوانی ئەم گەڕەکە دروست کرا.
١٥٩- مزگەوتی شیفا
کەوتۆتە ناو نەخۆشخانەی کۆماری فێرکردن، لەساڵی ١٩٧٨ لەسەر ئەرکی ئەوقافی هەولێر دروستکرا.
١٦٠- مزگەوتی رەفاعی
کەوتۆتە گەڕەکی رەنگین، لەساڵی ١٩٨٧ لەلایەن سێ هاوولاتی شاری کەرکوک دروست کرا.
١٦١- مزگەوتی شەهید مولازم ئازاد
کەوتۆتە گەڕەکی شوورتاوا. لەساڵی ١٩٨٩ سەرەتا حاجی حەماغا سەرپەرشتی دروستکردنی کردووە.
١٦٢- مزگەوتی عەلی بن ئەبی تالیب (شێخ محیەدین بەرزنجی)
لەگەڕەکی شوورتاوایە، لەساڵی ١٩٨٨ بەهەوڵ و تەقەلالای شێخ محیەدین و دانیشتوانی گەڕەک و خێرخوازان دروست کرا.
١٦٣- مزگەوتی حاجی ئەحمەد

یەعقوبی
لەگەڕەکی کووران کۆلانی گەنم فرۆشان. لەساڵی ١٩٨٨ ئەرکی دروستکردنی حاجی ئەحمەد محەمەد عەلی یەعقوبی گرتیە ئەستۆ.
١٦٤- مزگەوتی شافیعی
لەگەڕەکی زانیارییە لەساڵی ١٩٨٨ لەلایەن سێ هاوولاتی دروست کراوە.
١٦٥- مزگەوتی سەید یوسف نعێمی
لەگەڕەکی ٩٩یەو لەساڵی ١٩٨٩ سەید یوسف سەید عەبدوڵڵا نعێمی دروستی کردووە.
١٦٦- مزگەوتی شەهید عەبدولخالیق سەید حوسێن
لەگەڕەکی نەورۆزە، لەساڵی ١٩٨٩ ئەرکی دروستکردنی کەوتە ئەستۆی کەسوکاری شەهید.
١٦٧- مزگەوتی عوسمان بن عەفان (مەلا مەحمود فەقێ)
لەگەڕەکی عارەبانی نوێ، لەساڵی ١٩٨٩ ئەرکی دروستکردنی کەوتە ئەستۆی حاجی عەلی بەکر سەعدوڵلای بەرگدروو.
١٦٨- مزگەوتی ئیبراهیم گەردی
کەوتۆتە گەڕەکی برایەتی، لەساڵی ١٩٨٩ ئەرکی دروستکردنی کەوتە ئەستۆی حاجی ئیبراهیم حەمەد مەولود گەردی.
١٦٩- مزگەوتی محەمەد ساڵح ئەحمەد زراری
لەگەڕەکی سوورچیانە. لەساڵی ١٩٩٠ حاجی محەمەد ساڵح ئەحمەد زراری ئەرکی دروستکردنی گرتە ئەستۆ.
١٧٠- مزگەوتی سەید عەزیز بەرزنجی
لەگەڕەکی خانەقا (بیرێژیان)ەو لەساڵی ١٩٨٩ دروست کرا.
١٧١- مزگەوتی سەلاحەدین ئەیوبی
لەگەڕەکی سەلاحەدین، لەساڵی ١٩٨٩ سەرەتا کەسوکاری شەهید کەمال عەزیز محەمەد سلێمان کە بەڕەگەز ڕەوەند بوون دروست کرا.
١٧٢- مزگەوتی حاجی جەمال بەزاز
لەگەڕەکی موفتییە، لەساڵی ١٩٩٢ ئەرکی دروستکردنی حاجی جەمال عەبدوڵلا عەزیز بە ئەستۆی خۆی گرت.
١٧٣- مزگەوتی سەلاحەدین ئەیوبی (گەڕەکی زانکۆ)
کەوتۆتە ناو شورەی خانووەکانی زانکۆ (مامۆستایان)، لەساڵی ١٩٩٣ دروست کرا.
١٧٤- مزگەوتی حاجی عەبدوڵلا سەعاتچی.
کەوتۆتە گەڕەکی تەیراوە، لەساڵی ١٩٩٤ حاجی عەبدوڵلا ساڵح ئەحمەد سەعاتچی لەسەر ئەرکی خۆی دروستیکرد.
١٧٥- مزگەوتی ئیعجاز
لەگەڕەکی ١١٤یە لەساڵی ١٩٩٦ دروست کراوە.
١٧٦- مزگەوتی حاجی خالید
لەگەڕەکی شۆڕتاوایە.
١٧٧-مزگەوتی ڕەحمە
لەگەڕەکی (٩٤)ە، لەساڵی ١٩٩٦ ڕابیتەی ئیغاسەی ئیسلامی دروستی کرد.
١٧٨-مزگەوتی ئەخەوەین (دووبرا)
لەگەڕەکی ڕووناکی نزیک ئامادەیی بازرگانی کچان، لەساڵی ١٩٩٦ دروست کرا.
١٧٩-مزگەوتی فەتحی بێکەس
لەگەڕەکی سەیداوەیە، لەساڵی ١٩٩٧ بەبڕیاری فەتحی مارف ئەحمەد بێکەس دەست بەدروستکردنی کرا.
١٨٠- مزگەوتی مەلا سمایل نانەکەلی
لەگەڕەکی حەی زراعەیەو لەساڵی ١٩٩٧ بڕیاری دروستکردنی لەلایەن مەلا عومەر مەلا سمایل نانەکەلی دەرکرا.
١٨١- مزگەوتی شێخ عوبێدوڵلای باقلان
لەگەڕەکی برایەتییەو لەساڵی ١٩٩٧ دروست کرا.
١٨٢- مزگەوتی حاجی عەزیز خەرابەدراو
کەوتۆتە سەر شەقامی ٦٠ مەتری، لەساڵی ١٩٩٨ ئەرکی دروستکردنی کەوتە ئەستۆی حاجی ئەبوبەکر حاجی عەزیز ئەحمەد خەرابەدراو.
١٨٣- مزگەوتی مەلا عەلی سەعید
کەوتۆتە گەڕەکی شۆرتاوە، لەساڵی ١٩٩٨ دروست کرا.
١٨٤- مزگەوتی حاجی حەمەد عەبدوڵلا (حەمەدە گەورە)

کەوتۆتە کۆڵانەکانی گەڕەکی کوران. لەساڵی ١٩٩٨ دروست کرا.

١٨٥- مزگەوتی عومەری خدری پاشا

لەگەڕەکی عەدالەی تازەیە، لەساڵی ١٩٩٥ دروست کراو ئەرکی دروستکردنی کەوتە ئەستۆی عەبدولقادری خدری پاشاو سافیە خان خدری پاشا.

١٨٦- مزگەوتی جەعفەر عەبدولقادر حامید بەگ

کەوتۆتە گەڕەکی برایەتی، لەساڵی ١٩٩٧ ئەرکی دروستکردنی کەوتە ئەستۆی جەعفەر عەبدولقادر حامید.

١٨٧- مزگەوتی ئەبو عومەر ئەلفاروق

کەوتۆتە گەڕەکی ١٥٩ی گوڵان، لەساڵی ١٩٩٨ دروست کرا.

١٨٨- مزگەوتی سەواف

کەوتۆتە گەڕەکی تەعجیل لەساڵی ١٩٩٤ دەست بەدروستکردنی کرا.

١٨٩- مزگەوتی سەفاو مەروا

کەوتۆتە نێوان گەڕەکی کوردستان- نەورۆز لەساڵی ١٩٩٩ ئەرکی دروستکردنی حاجی عەزیز مەولود جەرجیس گرتیە ئەستۆی خۆی گرت.

١٩٠- مزگەوتی شەهید خدر سوارە

کەوتۆتە سەر ڕێگای مەخمور. لەساڵی ١٩٩٩ لەسەر ئەرکی خانەوادەی شەهید بەبڕیاری خاتوو ئەسمەری خێزانی دروست کرا.

١٩١- مزگەوتی هەدیە سەلیم

کەوتۆتە گەڕەکی ئازادی، لەساڵی ١٩٩٩ لەسەر ئەرکی هەدیە سەلیم قادر، کەخەڵکی ناحیەی دیبەگەیە دروست کرا.

١٩٢- مزگەوتی جەلیل خەیات

کەوتۆتە سەر شەقامی ٦٠ مەتری، لەساڵی ١٩٩٧ ئەرکی دروستکردنی جەلیل خەیات لە ئەستۆی خۆی گرت.

١٩٣- مزگەوتی ٩ شەهید

لەگەڕەکی ئازادییە لەساڵی ١٩٩٩ لەلایەن کەسوکاری شەهیدان دروست کرا.

١٩٤- مزگەوتی خوالێخۆشبوو (جەلال خەلیل مەلا کەریم)

لەگەڕەکی برایەتی (ئەفسەران) لەساڵی ١٩٨٦ دروست کرا.

١٩٥- مزگەوتی محەمەد فەوزی

لەگەڕەکی کوێستانەو سەرەتای دروستکردنی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٨٢.

١٩٦- مزگەوتی حاجی یونس

کەوتۆتە گەڕەکی شۆڕش، لەساڵی ١٩٨٩-١٩٩٠ دروست کرا.

١٩٧- مزگەوتی خەدیجە کوبرا

کەوتۆتە سەر شەقامی ١٠٠ مەتری. سەرەتای دەست پێکردنی هاوولاتییەکی عەرەب، کەخەڵکی ولاتی (قەتەر)ە بەناوی عەبدوڵلا عەبدولغەنی لەساڵی ١٩٩٨ ئەرکی دروستکردنی لە ئەستۆی خۆی گرت.

١٩٨- مزگەوتی ڕۆستەم ڕەسول

کەوتۆتە نێوان گەڕەکی کوێستان- مەلایان لەساڵی ١٩٩٩ لەلایەن کەسوکاری خوالێخۆشبوو ڕۆستەم ڕەسول ئەرکی دروستکردنیان لە ئەستۆ گرت.

١٩٩- مزگەوتی عەتیەخان

لەگەڕەکی ١٥٩ی گوڵانە، لەساڵی ١٩٩٧ حاجی ئەحمەد سادق حەمەد ئەمین دروستی کرد.

٢٠٠- مزگەوتی سەحابە

کەوتۆتە گەڕەکی ئاری. لەساڵی ١٩٩٩ ئەرکی دروستکردنی کەوتە ئەستۆی مامۆستا مەلا عەبدولکەریم عەبدولواحید دارەخورماو چەند خێرخوازێک.

٢٠١- مزگەوتی شەهیدەدین قادری

کەوتۆتە گەڕەکی ڕاپەڕین. لەساڵی ٢٠٠٠ لەسەر ئەرکی حاجی قادر حەمەد خدر دروست کرا.

٢٠٢- مزگەوتی حاجی محەمەد ئەمین محەمەدو حاجی محەمەد ئەیوب

کەوتۆتە سەر شەقامی ٦٠ مەتری. لەساڵی ١٩٩٩ ئەرکی دروستکردنی دوو ئافرەت خاتوو سەنیە عومەر ڕۆستەم و خاتوو ناهیدە سەلیم سدیق لەئەستۆیان گرت.

٢٠٣- مزگەوتی جادر

کەوتۆتە گەڕەکی خانەقا لەساڵی ٢٠٠٠ لەسەر ئەرکی حاجی جادر نادر قادر حەمەد مەولان دروست کرا.

**بەشی دووەم**

نوێژگە(جێ نوێژە)کان: ئەمانە تەنیا بۆ مەبەستی نوێژکردن و ئەرکە

ئاینییەکانی تر بەکار هاتوون، حوجرە یان مەدرەسەی خوێندنیان تێدا نەبووە.

١- مزگەوتی سەربازگە

ئەم مزگەوتە تەنها شوێن هەوارەکەی ماوە. کەوتۆتە ناو سەربازگەی کۆنی هەولێر. سەرەتای دروستکردنی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٨٢ز.

٢- مزگەوتی (موسعەب بن عەمیر)

ئەم مزگەوتە کەوتۆتە ناو نەقلیاتی باکوور (موسڵ). لەساڵی ١٩٨٤ لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی ئەوقافی هەولێر دروست کرا.

٣- مزگەوتی حاجی مامەند قادر

ئەم مزگەوتە کەوتۆتە ناو فیتەرەکان (ناوچەی پیشەسازی خۆرهەلات). لەساڵی ١٩٩٦ لەسەر ئەرکی وەستا زیاد حاجی مامەند دەست بەدروستکردنی کرا.

٤- مزگەوتی (النور)

ئەم مزگەوتە کەوتۆتە ناو فیتەرەکان (ناوچەی پیشەسازی خۆرهەلات) لەساڵی ١٩٩٦ لەسەر ئەرکی وەستا موئەییەد جەلال عەلی دروست کرا.

٥- مزگەوتی وەستا تەحسین حەداد

ئەم مزگەوتە کەوتۆتە ناوچەی پیشەسازی خۆرئاوا، ناو ئاسنگەرەکان. لەساڵی ١٩٩٦ لەسەر ئەرکی وەستا تەحسین یاسین وەیسی دروست کرا.

٦- مزگەوتی (رەحمە)

ئەم مزگەوتە کەوتۆتە ناو فیتەرەکان، ناوچەی پیشەسازی خۆرهەلات. لەساڵی ١٩٩٨ لەسەر ئەرکی وەستایان نەجمەدین و وەلی کوڕانی حاجی عەلی گەردی دروست کرا.

٧- مزگەوتی (رەیان)

کەوتۆتە ناو فیتەرەکانی ناوچەی پیشەسازی خۆرهەلات، لەساڵی ١٩٩٨ بەکاری هەرەوەزی دەست بەکاری دروستکردنی کرا.

٨- مزگەوتی سەید حەیدەر بەرزنجی

کەوتۆتە ناوچەی پیشەسازی خۆرئاوا سەر ڕێگای مەخمور نزیک کارگەکانی بلۆک، لەساڵی ١٩٩٨ لەسەر ئەرکی وەستا حەیدەر سەید عەبدوڵلا سەید تەها بەرزنجی دروست کرا.

٩- مزگەوتی وەستا عوسمان عەوێنەیی

ئەم مزگەوتە کەوتۆتە ناوچەی پیشەسازی خۆرئاوا ناو فیتەرەکانی بەشی (تەراکتۆرو دەڕاسە). لەساڵی ١٩٩٩ لەسەر ئەرکی وەستا عوسمان عەبدوڵلا عەوێنەیی دەست بەدروستکردنی کرا.

١٠- مزگەوتی مەولانا

ئەم مزگەوتە کەوتۆتە ناو فیتەرەکانی ناوچەی پیشەسازی خۆرهەلات، لەساڵی ١٩٩٩ لەسەر ئەرکی وەستا عاسم عەزیز عومەر دروست کرا.

١١- مزگەوتی مەعاز بن جەبەل

ئەم مزگەوتە کەوتۆتە ناوچەی پیشەسازی خۆرهەلات ناو فیتەرەکان. لەساڵی ١٩٩٩ لەسەر ئەرکی کوڕەکانی حاجی عەبدوڵلا بەکر خۆشناو دەست بەدروستکردنی کرا.

١٢- مزگەوتی حاجی ساڵح حەداد (ئاسنگەر)

ئەم مزگەوتە کەوتۆتە ناوچەی پیشەسازی خۆرئاوا ناو ئاسنگەرەکان. لەساڵی ١٩٩٩ لەسەر ئەرکی وەستا ئەنودر حاجی ساڵح حەداد دەست بەدروستکردنی کرا.

١٣- مزگەوتی وەستا عەبدوڵلا

ئەم مزگەوتە نزیکی مزگەوتی سەید حەیدەرە. سەرەتای دروستکردنی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٩٩.

١٤- مزگەوتی ئەلکەف

ئەم مزگەوتە تاڕادەیەک شوێن هەواری نەماوە. کاتی خۆی لەلای چەپی دەرگای دیوی قیبلەی قەلا بووە. ساڵی دروستبوونی دەگەڕێتەوە بۆ پێش ساڵی ١٠٠٨.

سەرچاوە:

گەشتێک بەناو مزگەوت و تەکیەکانی شاری هەولێر، ن- عومەر شێخ لەتیف بەرزنجی- لەبلاوکراوەکانی وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئایینی ژمارە (١) ل٥-٣٥٦).



# مزگەوتی خانەقای خالیدی لە هەولێر

مزگەوتی خانەقا، یەکێکە لە مزگەوتانە کۆنانەی شاری هەولێر، کە لە سەردەمی مەولانا خالیدی نەقشبەندی لە ژێر قەلات لە شوێنێکی چۆل دروست کراوە، لەبەرئەوەی مەولانا خالید سەرپەرشتی دروستکردنی تەکیە و مزگەوتی خانەقای کردووە، بۆیە سەرەتا بە تەکیەی خالیدی و پاشان بە مزگەوتی خانەقای خالیدی ناوی دەرکردووە، ئەمڕۆکەش کەوتۆتە ناو بازاڕی دەلالخانەوە.

مزگەوتی خانەقا لە پاڵ ئەوەی، کە نوێژی تێدا دەکرا، خەلوەت و زیکریشی تێدا بەڕێوەدەچوو.

کاتێک مەولانا خالید لە بیارەوە دێتە هەولێر سەیر دەکات، شوێنکەوتوانی تەریقەتی نەقشبەندی بە ڕابەری هیدایەتوڵڵا خانوویەکی گچکەیان دروست کردووە و، زیکرو خەڵوەتی تێدا دەکەن، ئینجا مەولانا خالید بڕیاری دروستکردنی تەکیەیەکی لە سەر حیسابی خۆی لەم شوێنە دا، خۆی لە سەر قەلات مایەوە تا تەکیەکە تەواو بوو و، (هیدایەتوڵڵا) ی کردە سەرپەرشتکاری ئەم تەکیەیە، کە ئەمەش بۆ ساڵی (١٢٢٠) ی کۆچی دەگەڕێتەوە.

شێخ هیدایەتوڵڵا ساڵانێکی زۆر خزمەتی تەریقەتی نەقشبەندی لە هەولێر دەکات، لە تەمەنی پیری لە خزمەتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی کۆچی دوایی دەکات و، هەر لەوێش دەینێژن.

شێخ هیدایەتوڵڵا بە هۆی ئەوەی شارەزاییەکی باشی لە زانستەکانی دین هەبوو، راستەوخۆش تەریقەتی نەقشبەندی لە مەولانا خالید وەرگرتبوو، بە مەلا هیدایەتوڵڵا ناسرا، بەڵام شێخەکانی دیکەی هەولێر تەریقەتیان لە خەلیفەکانی مەولانا خالید وەرگرت.

### تەکیەی کۆنی خانەقا

مزگەوتی خانەقای خالیدی کەوتۆتە ناوەڕاستی شاری هەولێر، وابیستراوە کەوا تەکیەی کۆنی خانەقا بەم شێوەیە بووە: تەکیەی کۆنی سێ دەرگای هەبووە، دوانیان ڕوویان لە ڕۆژئاوا بووە، یەکێکیان لە شوێن دەرگای ئاسنی ئێستە

بووە، بەڵام ئەوەی دیکەیان لە جێگای ئاودەستەکانی ئێستای مزگەوت بووە، دەرگای سێیەم لە دیواری باکووری حەوشەکە بووە، خوالێخۆشبوو شێخ محەمەدی مەزهەری نەقشبەندی لەم دەرگایەوە سەردانی ماڵی خۆی لە گەڕەکی کۆنی خانەقا دەکرد. لەوبەری شەقامەکە بەرانبەر دەرگای گەورەی مزگەوت دوو حەمام هەبووە، یەکێکیان گەورە ئەوەی دیکەیان بچووک بووە، لە تەنیشت دەرگای رۆژئاواوە چایخانەی حاجی لەتیفی هەبووە.

### حەوشی تەکیە

حەوشی تەکیە فراوان بووە، زەوییەکەی بە کەرپووچی چوارگۆشەیی گەورە داپۆشراوە.

لە سەر عادەتی مزگەوتە کۆنەکانی شاری هەولێر لەو سەردەمە، لە لای رۆژئاوای حەوشی تەکیەوە، ژوورێک هەبووە، یەکێکیان بۆ دانیشتنی شێخ شەریفی سدیقی (شێخی تەکیەی شێخ زادە لە قەڵای هەولێر).

شێخ شەریف لەم ژوورە دەرمانی جۆراوجۆری ئامادە دەکرد و چارە سەری چەند جۆرە نەخۆشییەکی دەکرد، لەوانە نەخۆشییەکانی کولبوونی چاو، سک ئێشە، سکچوون، دەرمانی کرم، سووتان، خورشت و چەند نەخۆشییەکی دیکە. دانیشتوانی شار سەردانیان دەکرد، هەروەها دەستێکی باڵای لە دروستکردنی بۆنی گوڵاو هەبوو. لە ژووری دووەم جێگای دانیشتنی، مەلاحەکیم بوو، بەڵام ژووی سێیەم رایەخ و پێداویستییەکانی تەکیەی تیادا دەپارێزرا.

لە لای رۆژهەڵاتی تەکیەوە چەند ژوورێکی دیکە هەبووە، ژووری یەکەم جێی دانیشتنی شێخ محەمەد مەزهەر بوو، ژووری دیکە جێی سەید فەتاحی کڵاوقوچ بوو (ئەم پیاوە کڵاوێکی درێژی لە سەر دەکرد)، ژووری سێیەم جێی دانیشتنی مەلا سەبری بووە، بەڵام ژووری چوارەم لە شێوەی خانوویەکی بچووکدا بووە، جێی خزمەتکاری تەکیە بوو، کە مام ئیساعیل و دوای وی سۆفی مەحموودی کوڕی بوو لە سەر ژوورەکانی رۆژئاوای حەوشی تەکیە نهۆمێکی دیکە هەبووە، لەم ژوورانە پێک هاتبوو.

ژووری یەکەم نەختێک فراوان بوو، دیوەخانەی شێخ محەمەد مەزهەر بووە، تێیدا پێشوازی لە میوانانی خۆی دەکرد، پاش ئەم ژوورە سالۆنێک دەهات پاشان ژووی خزمەتکاری تەکیە، ئەوەی شایانی باسە جەنابی شێخ محەمەد مەزهەر پێشوازی لە پیاوماقوڵانی شاری هەولێر لە زانایان و شێخ و لێپرسراوەکان دەکرد، لە هەمان کات گیروگرفتی خەڵکیان تیادا چارەسەر دەکردو، لە لایەکی باکووری حەوشی تەکیە حەوزێکی کراوە هەبووە، ئاوی کارێزی موفتاحی تێدەکرد. ئاوی کارێزی موفتاحیش یەکەم جار لە کۆشکی عەتائوڵاغا ئاغا تێپەڕدەبوو، لەوێوە رووی دەکردە مزگەوتی شێخەڵلا.

لە مزگەوتی خانەقا دەردەچوو دەهاتە جۆت حەمام. ئینجا حەوزی تەکیەی خانەقا، لە خانەقا دەردەچوو دەچووە ناو بازاڕ، لە ساڵی (١٣٥٩ک) لە جێگای ئەم حەوزە حەوزێکی بازنەیی داخراو دروست کرا، لە دەوراو پشتی ژمارەیەکی زۆر بەلوعە هەبووە بۆ دەست نوێژ گرتن.

### حەرەمی تەکیە

بە درێژایی دیواری باکووری حەرەم هەیوانێکی فراوان هەبووە، سەربانی لە کاریتە و شەقڵەدار دروست کرابوو، بەڵام حەرەم دوو دەرگای گەورەی هەبووە، سەربانی حەرەم لە شەش گومبەت لە گێچ و کەرپووچ دروست کرابوو، ئەم گومبەتانە لە سەر چەندستوونێک و کەوانەیەک وەستابوون. میحراب و حەرەم لە گێچ دروست کرابوون، کۆنە تەکیەی خانەقا منارەی نەبووە، منارەی تەکیە لە ساڵی ١٩٦١ دا دروست کراوە.

### تەکیەی خانەقای پاش کۆچی دوایی شێخ هیدایەتوڵلا

دوای ئەوەی شێخ هیدایەتوڵلا لە شاری بەغدا کۆچی دوایی کرد، کوڕە گەورەکەی شێخ محەمەد سەعیدی نەقشبەندی ئیجازەی تەریقەتی لە باوکی خۆی وەرگرتبوو، شێخ محەمەد سەعید هەر لە منداڵییەوە خراوەتە بەر خوێندن و قورئانی پیرۆزی لە لای باوکی خۆی تەواوکردووە، زانیارییەکانی ئایینی فێربووە. شێخ محەمەد سەعیدی نەقشبەندی لێپرسراوێتی تەکیە و رێبازی نەقشبەندی خستۆتە ئەستۆی خۆی، شێخ سەعیدیش زانایەکی زۆر گەورە بووە، هەڵگری ئاڵای راستگۆیی و باوەڕ بووە، سەرپەشتی خەتمی تەریقەتی نەقشبەندی لە

تەکیەی خانەقا کردووە. ئەویش لە یەکی مەحرەمی ساڵی ١٣٠٠ گیانی پاکی بە خاک سپاردووەو، لە گۆڕستانی گەورەی شاری هەولێردا نێژراوە.

شێخ محەمەد سەعید پاش کۆچی دوایی نەوەیەکی زۆری لە کوڕو کچ جێهێشتووە بۆیە بە گوێرەی (الحجج الوقفية) ئەمانەتی تەریقەت و لێپرسراوێتی تەکیە درایەوە شێخ عەبدولڕەحمان نەقشبەندی کوڕە گەورەکەی. شێخ عەبدولڕەحمانیش شێخێکی لێهاتوو بووە.

ڕۆڵێکی گەورەی لە بڵاوکردنەوەی ڕێبازی نەقشبەندی لە شاری هەولێر هەبووە، ئەویش لە ساڵی ١٣٣٣ ک ماڵئاوایی لە دنیا کردووە.

جەنابی شێخ عەبدولڕەحمان داوای لە مریدو دەروێشەکان دەکرد، کە وا هەمیشە بیر لە نهێنییەکانی خۆیەتی ڕاستەقینەکانی ژیان بکەنەوە، پاش کۆچی دوایی شێخ عەبدولڕەحمان نەقشبەندی ئەمانەتی تەریقەت و بەڕێوەبردنی تەکیە دراوە بە تاقە کوڕەکەی، کە شێخ یەحیای نەقشبەندی بووە، شێخ یەحیا لە سەر ڕێبازی باوک و باپیرانی ڕۆییوە و بەوەفاداری خزمەتی تەکیەی باوک و باپیرانی خۆی کردووە، شێخ یەحیا زانایەکی ناودارو بە ناوبانگ بوو، لە ساڵی ١٩٢٥ گیانی پاکی خۆی بەم خاکە سپارد، ئینجا محەمەد مەزهەری کوڕی گەورەی لە جێی باوکی دانیشت و ئەرکی ئیرشاد و کاروباری لێپرسراوێتی تەکیە کەوتۆتە ئەستۆ.

شێخ محەمەد مەزهەریش زانایەکی مەزن و میهرەبان بووە، تاقە زانای سەردەمی خۆی بووە، هەمیشە خەریکی ئامۆژگاری و ڕێنمایی موسڵمانان بووە، هەروەها خەڵکی بانگ دەکرد بۆ دەستگرتن بە کتێبی خودا (قورئان) ئامۆژگاری دەروێشەکانی خۆی دەکرد، کەوا ئەم قورئانە ڕەوانە کراوە تەنها بۆ عیبادەت و بەرەکەت وەرگرتن نییە، بەڵکو هاتۆتە خوار بۆ ڕێکخستنی ژیانی موسڵمانان، داوا لە موسڵمانان دەکات بۆ بیرکردنەوە لە نهێنییەکانی زات و ژیان.

محەمەد مەزهەر ئاڵای ڕێبازی نەقشبەندی هەڵگرت و داوای لە موسڵمانان کرد، کە ئاشتی و تەبایی لە نێوانیاندا بەرقەرار بێت.

شێخ محەمەد مەزهەر لە (٢)ی شوباتی ساڵی ١٩٥٠ ماڵئاوایی لە دنیا کرد، لە کاتی ناشتنی خەڵکێکی زۆری ئەم شارە ئامادە بوون، بچووک و گەورە ژن و پیاو بۆی غەمبار بوون، چونکە خاوەن زانستێکی زۆر بوو، لە ژیاندا یاسای شەریعەتی ئیسلامی بە ڕێکوپێکی جێبەجێ دەکرد، لە کاتێکدا، کە پرسیاری ئایینی ئاراستەی دەکرا بە پێی یاسا و شەرع وەڵامی دەداوە، واتە شەرعی پیرۆزی بە هیچ شێوەیەک فەرامۆش نەدەکرد.



### شێخ محەمەد سائیبی
### کوڕی شێخ محەمەد مەزهەری نەقشبەندی

جەنابی محەمەد سائیبی نەقشبەندی لە ساڵی ١٩٣٥ ز لە گەڕەکی خانەقا لە شاری هەولێر لە دایک بووە، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی لە شاری هەولێر تەواو کردووە، دەرچووی کۆلیژی مافی زانکۆی بەغدایە، ماوەیەکی زۆر پارێزەری کردووە، دوای وەفاتی شێخ محەمەد مەزهەر ئەمانەتی ڕێبازی نەقشبەندی و لێپرسراوێتی کاروباری مزگەوتی خانەقای پێ سپێردراوە. لە ساڵی (١٩٦٣) دا بۆجاری یەکەم نوێژی هەینی لە خانەقا ئەنجام دراوە، بۆیە ناوی تەکیەی خانەقای خالیدی گۆڕاوە بۆ مزگەوتی خانەقای خالیدی، ئەویش لە سەردەمی متەوەلی ئێستای مزگەوت شێخ محەمەد سائیبی نەقشبەندی بووە. شێخ محەمەد مەزهەری نەقشبەندی دوو کوڕی لە دوای خۆی جێ هێشتووە، گەورەکەیان لێپرسراوێتی مزگەوتی خستۆتە ئەستۆی خۆی، بەڵام بچووکەکەیان، کە ناوی شێخ محەمەد نەجاتە ڕووی کردۆتە

خوێندن و دەرچووی كۆلیژی ئەندازیارییە لە هەمان كات ئەمانەتی پاراستووە، بەشداری خەتم و وەعز و ئامۆژگارییەكانی تەكیەی كردووە، برا گەورەكەی جەنابی شێخ محەمەد سائیب بەردەوامە لە سەرپەرشتی كردنی مزگەوت و، بە ڕێكوپێكی بەڕێوەی دەبات. دوای ڕاپەڕینە مێژوویییەكەی بەهاری ساڵی ١٩٩١ شێخ محەمەد سائیب هەموو كاتی خۆی بۆ خزمەتكردنی تەكیە و خانەقای باوك و باپیرانی تەرخان كردووە، جێگەیەكی تایبەتی بۆ خۆی تەرخان كردووە، بۆ پێشوازی كردن لە زانایان و پیاو ماقوولان و چین و توێژەكانی خەڵك. شارەزاییەكی باشی لە زمانی عەرەبی و شەرع و فەرموودە و زانستەكانی دیكە هەیە.

هەروەها شارەزاییەكی باشی بێجگە لە كوردی، زمانی عەرەبی و توركی و فارسی بە خوێندن و ە نووسینەوە هەیە.

**دوا ئاوەدانكردنەوەی خانەقا**

مزگەوتی خانەقا كەوتۆتە ناو جەرگەی شاری هەولێر، دەوروپشتی خانەقا مەڵبەندێكی بازرگانی گرنگە ڕووبەری ئەم مزگەوتە ئێستا كە (٣٤، ١٢١٨) مەتر دووجا یە، لە سەردەمی موتەوەلی ئێستای خانەقا (شێخ محەمەد سائیب) دووبارە بنیات و ئاوەدان كراوەتەوە، ئەویش لە ساڵی (١٩٦١ز)، لە سەر نەخشەیەكی نوێ و هاوچەرخ دەرگای سەرەكی لە ئاسن لە جێگای دەرگای كۆنی مزگەوتەكە دروست كراوە رووی بەرەو ڕۆژئاوایە.

بە درێژایی دیواری باكووری حەرەم هەیوانێك دروست كراوە پانیەكەی (٤) مەترە، حەرەم دوو دەرگەی هەیە لە داری ساج دروست كراون، ڕووبەری حەرەم (٣٠٠م ٢) یە گونبەتی حەرەم لە سەر چوار ستوونی كۆنكریت وەستاوە، میحرابیش لە گێچ دروست كراوە.

مینەری حەرەم ئەویش لە گێچ دروست كراوە، وتارخوێن ڕۆژانی هەینی بە چەند پایەیەك دەچێتە سەر مینبەر بۆ خوێندنەوەی وتاری هەینی، پاش ئەم ئاوەدانكردنەوەیە لە حەوشی مزگەوت لە ڕۆژهەڵاتی حەوشە چەند ژوورێك هەیە، ژووری یەكەم گۆڕستانی تایبەتی شێخەكانی تەكیەیە، ژووری دووەم دیوەخانەی شێخە و لە تەنیشت ئەم ژوورە ژوورێكی بچووك هەیە، بۆ ئامادەكردنی چاو قاوە بۆ میوانانی شێخ، بەڵام ژووری چوارەم نووسینگەی تایبەتیی شێخ محەمەد سائیبە، لە دیواری باكووری حەوشی مزگەوت جێی تایبەتی دەست نوێژ گرتنە، لە گۆشەی باشووری ڕۆژئاوای حەوشەشی نزیك دەرگای سەرەكیی مزگەوت منارەیەك لە كەرپووچ دروست كراوە، بەرزییەكەی ٣٧ مەترە و لە ساڵی ١٩٦١ دا بینا كراوە، لە سەر ئەم منارەیە دوو باڵندەی (حاجی لەق لەق) هەر ساڵێك چوار هێلكەیان دادەنا و لە كۆتایی وەرزی پاییز كۆچیان دەكرد، لە سەرەتای وەرزی بەهار دیسان ڕوویان دەكردەوە هەولێر.

**ئیمامەكانی مزگەوتی خانەقا**

یەكەم ئیمامی (پێش نوێژی خانەقا شێخ هیدایەتوڵلا) بوو، پاش ئەوەی كۆچی دوایی كرد، شێخ محەمەد سەعیدی نەقشبەندی كوڕی بوو بە ئیمامی خانەقا، كە ئەویش كۆچی دوایی كرد شێخ عەبدولڕەحمانی نەقشبەندی كوڕی كاری ئیمامەتی خستە سەرشانی خۆی، دوای وی شێخ یەحیا بوو بە ئیمام، دوای وەفاتی شێخ یەحیاش شێخ محەمەد مەزهەری نەقشبەندی كوڕی بوو بە پێش نوێژی مزگەوت، خوالێخۆشبوو شێخ محەمەد مەزهەر ئیمام و مودەرسێكی زۆر كامل بوو، واعیزێكی بە توانا بوو. دوای كۆچی دوایی شێخ محەمەد مەزهەر، یەكێك لە قوتابییەكانی شێخ بوو بە ئیمامی خانەقا، ئەویش ناوی مەلا عەبدولقادر بووە. ئەویش زانایەكی گەورە و پیاوێكی خواناسەو تا ئێستە ماوە خودا تەمەنی درێژ بكات و بیپارێزێت. دوای مەلا عەبدولقادر چەند پێش نوێژێكی دیكە پێش نوێژیان لە خانەقا كرد، لەوانە مەلا سەعیدی ئەلمانی، ئەویش زانایەكی گەورە بوو پاش ئەوەی كۆچی دوایی كرد، خوالێخۆشبوو مەلا شەریف ئەحمەد بوو بە ئیمامی خانەقا، هەر لە سەردەمی ئەم زانایە نوێژی هەینی لە مزگەوتی خانەقا ئەنجام دراوە، مەلا شەریفیش یەكەمین وتارخوێنی مزگەوت بوو، مەلا شەریف زانستی ئایینی لە لای حەزرەتی شێخ مستەفای كوڕی شێخ ئەبوبەكری نەقشبەندی تەواو كردبوو.

ماوەیەكی زۆر خزمەتی مزگەوتی خانەقای كرد، تا ماڵئاوایی لە دنیا كرد پاش كۆچی دوایی كردنی ئەم زانایە مەلا سەعید بوو بە ئیمام ئینجا مەلا مستەفا.

## مەلا محەممەدی کوڕی مەلا عومەر

بەڕێز مامۆستا مەلا محەممەدی کوڕی مەلا عومەر لە ساڵی ١٩٢٨، لە گوندی دووسەرە لە شاری کەرکووک لەدایکبووە. هەر لە منداڵییەوە لە لای باوکی خۆی زانستەکانی ئایینی خوێندووە، پاش تەواوکردنی زانیارییەکانی شەرعی، ئیجازەی زانستی ئایینی لە باوکی خۆی وەرگرتووە، لە ساڵی ١٩٦٤ دا بووە بە پێش نوێژی مزگەوتی گوندی زەرتک، هەر لە هەمان ساڵ گواسترایەوە شاری کەرکوک ئینجا لە مزگەوتی پاسەوان زادە زیاتر لە ٢٠ ساڵ ئیمامەتی کردووە، هەمان کات وتار خوێن و مودەرسی مزگەوتەکە بووە دوایی گواستراوەتە مزگەوتی ئیمام قاسم. لەوێش بۆ مزگەوتی مەلا حەسون و شەش ساڵ لەم مزگەوتە ماوەتەوە، لەو کاتەی کەوا بارودۆخی شاری کەرکووک ئەوەندە ئارام نەبووە، بۆیە داوای لە بەڕێوەبەرایەتی ئەوقافی کەرکوک کردووە بۆ خانەنشینی، بەڵام داواکەی قەبوڵ نەکراوە، پاشان بە یارمەتی چەند برادەرێکی هاوشانی گواستراوەتەوە شاری هەولێر، لە ڕێکەوتی (٧/ ١٠/ ١٩٩٨) و تا ئێستا ئیمام و وتارخوێنی مزگەوتی خانەقایە و، لە زانا ناودارەکانی شاری هەولێر دەژمێردرێ.

## موئەزینەکان (بانگدەر)ەکانی خانەقا

بە درێژایی ئاوەدانکردنەوەی ئەم مەڵبەندە ئایینییە ژمارەیەکی زۆر لە موئەزین (بانگدەر) لەم خانەقایە بانگیان داوە و، لە ڕۆژان و شەوانی هەینی سەڵەوات و قورئانیان تیادا خوێندووە، بەڵام ناودارترین بانگدەری ئەم خانەقایە خوالێخۆشبوو مەلا محەممەدی حافز بووە، ئەویش لە چلەکان تا هەفتایەکان لەم خانەقایە بانگدەر بوو، شەوانی هەینی سەڵەواتی دەخوێندو، پێش نوێژی هەینیش قورئانی دەخوێند، لە هەفتایەکان کۆچی دوایی کرد، ئینجا مام یونس لە خانەقا بانگی دەدا و لە شەوانی هەینیش جەلال چەقماقچی سەڵەواتی دەخوێند، پاشان مەلا غازی بوو بە بانگدەری مزگەوت. مەلا غازی دەنگێکی زۆر خۆشی هەبووو ڕۆژانی هەینی پێش وتاری هەینی قورئانی دەخوێند، بەڵام ئەویش کاتی خۆی لە سەر مەحفەلی مزگەوت دڵی لە لێدان کەوت و کۆچی دوایی کرد. هەروەها



لە کۆنەوە چەند پیاوێکی عەبدال و شێت هەبوون شەوان لە خانەقا دەنووستن: لەوانە پیاوێکی حافز هەبوو ناوی کەسک و سوور بوو، هەروەها یووسفە شێت، قاسمە شێت، پیرداوەد شێت، دێوانە حەمەش سەردەمێک لە خانەقا دەنووست پێش ئەوەی ڕوویکاتە مزگەوتی شێخی چۆلی.

## بنەماڵەی نەقشبەندییەکانی خانەقای هەولێر

١- هیدایەتوڵڵا ئەربیلی کوڕی ئیسماعیل: خەلیفەی مەولانا خالیدی نەقشبەندییە، لە مەلایەکانی گەورە و پایە بەرز.

(یضعی حەیدەری) لە کتێبەکەی خۆی (الجد الخالد) دا دەڵێ:

زانایەکی پایەبەرز و مورشیدێکی کامیل بووە، لە ژێر دەستی مەولانا خالیدی نەقشبەندی پەروەردە کراوە و، لە پاشا ئیجازەی ئیرشادی پێ داوە..

پاشا محەممەد ڕواندزی، کە هاتبوو هەولێری ڕزگار کردبوو، بە خزمەتی شێخ هیدایەتوڵڵا گەیشت بوو، بۆی دەرکەوت کە ئەم زاتە مەلایەکی زۆر پایە بڵندە. شێخ هیدایەتوڵڵا دەستی لە سەر ئیرشاد لا برد، دەستی دایە عیلم و دەرسگوتنەوە لە مەدرەسەکان، لە شاری بەغدا کۆچی دوایی کردووە، لە ساڵی ١٢٥٢ ک ١٨٣٧ ز هەروەکو لە کتێبەکەی (عباس العزاوي) دا دەستنیشان کراوە، کە لە ژێر ناوی (خلفاء مولانا خالد) لە گۆڤاری (المجمع الكردي (٢- ٢) ١٩٧٤ ص ٢٠٠.

لە مزگەوتی (العدلیة الکبیر) نێژراوە.. خانەقای

هەولێر لە ساڵی ١٢٣٠ ک ئاوا کراوە، لەوکاتی کە مەولانا خالیدی نەقشبەندی تەشریفی هاتۆتە هەولێر لە ساڵی ١٩٥٢ ز فراوانتر کراوە. لە ساڵی ١٣٨١ ک- ١٩٦١ ز دووبارە نوێکراودتەوە منارەیەکیشی بۆ دروست کراوە و دەکەوێتە ژێر قەڵاتی هەولێر لە لای باشوورەوە.

٢- شێخ سەعیدی کوڕی شێخ هیدایەتوڵلا لە جێی باوکی دانیشتووە، ئەویش مەلایەکی گەورە بووە، ئەم زاتە کوڕی پووری شێخ محەمەد مستەفایە، کە بە شێخی چۆلی مەشهوورە، لە مزگەوتی خۆی، کە دەکەوێتە رۆژئاوای هەولێر لە ساڵی ١٣٠٨ ک-١٨٩١نێژراوە. شێخی چۆلی شێخ سەعید- کوڕی پووری خۆی لە سەر گوندی (سیراوە) ی داناوە بۆ چاودێری کردنی ماڵ و موڵکی خۆی و ئەویش لە شاری هەولێر کۆچی کردووە.

٣- شێخ عەبدولڕەحمانی کوڕی شێخ سەعید: لە جێی باوکی دانیشتووە بۆ ئیرشاد، ئەویش مەلایەکی زۆر زانا بووە، مەدرەسەی هەبووە زۆر فەقێی راگرتوون. لە سەردەمی شێخ (ئەبو بەکری نەقشبەندی هەرشەمی) ژیاوە، کە لە ١٣٢٩ ی کۆچی وەفاتی کردووە، واتا شێخ ئەبو بەکر شێخ عەبدولڕەحمان لە هەولێر وەفاتی کردووە لە خانەقا نێژراوە...

٤- شێخ ئەمینی کوڕی شێخ محەمەد سەعید: چەند کتێبێکی خوێندووە، لە پاشا بووە بە سەرۆکی مەحکەمەی جەزا لە شاری کەربەلا لە دەورووبەری- (متصرفی کربلاء رۆمی پاشا) لە ساڵی (١٢٩٤ ک- ١٨٧٧ز) لە پاشا بوو بە حاکمی (کەرکووک) یەک لە هاوڕێکانی شاعیری بەرزی کورد شێخ رەزای تاڵەبانی بووە، خۆشی هەر شاعیر بووە، شیعرەکانی زۆربەی زۆری بە تورکی و کەمێکیش بە فارسی بووە، لە شام وەفاتی کردووە.

٥- شێخ ئەسعەدی کوڕی شێخ محەمەد سەعید: لە ساڵی (١٢٦٤ ک- ١٨٤٨ز) لە شاری هەولێر لە دایک بووە. بە خوێندنی عیلمی مەلایەتی و سۆفیگەری (تصوف) کاتی خۆی رابواردووە، دەستی داوەتە ئیرشاد و دەرس گوتنەوە لە مزگەوتی خۆی، کە لە تەنیشت خانەقا دایە.

لە پاشا چووەتە ئەستەنبوول لەوێ تەکیە و زاویەکی بۆ خۆی دامەزراندووە. چەند کتێبێکی داناوە لە ژێر ناوی (کنز العرفان في أحاديث نبي الرحمن) بریتییە لە (١٠٠١) فەرموودەی پێغەمبەر...

حوکمی خنکاندنی بۆ دەرچووەو خۆی و کوڕەکەی بە ناوی (عەلی) رۆژێک پێشتر لە ١١ی مانگی رەمەزانی ساڵی (١٣٤٩ ک/ ١٩٣١ز) لە بەندیخانە وەفاتی کردووە.، بەڵام (عەلی) کوڕی پاش مردنی باوکی بە رۆژێک لە سێدارە دراوە. شێخ (عەلی) سێ کوڕی لە پاش بەجێماون (ضياء الدين، سەعید، مەسعوود) شێخ ئەسعەد کوڕێکی دیشی هەبووە بە ناوی (محەمەد).

٦- شێخ محەمەد ئەفەندی کوڕی شێخ ئەسعەد: لە جێی باوکی دانیشتووە لە مزگەوتەکەی خۆیان لە تەنیشت خانەقا. مەلایەکی پایە بەرز بووە، زاتێکی پڕ ویقار و بە هەیبەت بووە، بۆ ماوەیەکی زۆر بووە بە قازی (دادوەر- حاکم) هەولێر هەر لە ساڵی ١٩٣٩ ز هەتا وەفات کردنی لە هەولێر، لە چواری مانگی شەوالی (١٣٧٠ / ٨ی تەموزی ١٩٥١ز) لە مزگەوتی خانەقا نێژراوە.

٧- شێخ سابیری کوی شێخ شاکری کوڕی شێخ محەمەد سەعید: لە هەولێر لە دایک بووە، ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە. بووەتە قازی (دادوەر) لە شاری کۆیە، لە پاشان چووەتە ئەستەمبووڵ حقووقی تەواو کردووە، هەر لەوێوە لە پاش چەند کارێکی میری گەیشتۆتە پایەی (سەرۆکایەتی مەحکەمەی تەمییز لە ئەستەمبووڵ)، هەر لەوێش وەفاتی کردووە...

٨- شێخ یەحیای کوڕی شێخ عەبدولڕەحمان: لە جێی باوکی دانیشتووە، لە خانەقا لە ساڵی ١٣٤٤ ک لە شاری هەولێر وەفاتی کردووە لە تەنیشت باوکی خۆی لە خانەقا نێژراوە.

٩- شێخ مەزهەری کوڕی شێخ یەحیا: لە جێی باوکی دانیشتووە، لە (١٣٦٩ک/ (٢) ی شوباتی ١٩٥٠ز) لە هەولێر وەفاتی کردووە، ئەویش لە تەنیشت باوکی لە خانەقا نێژراوە، لە تەمەنی پەنجا ساڵی بووە، کە وەفاتی کردووە.

١٠- شێخ جەلالی کوڕی شێخ جەمیلی شێخ شاکر: لە ساڵی ١٩١٠ ز لە هەولێر لە دایک بووە، لە لای مەلا مستەفای کوڕی حوسێن لە خانەقا خوێندوویەتی، لە پاشا چووەتە قوتابخانەکانی میری (سەرەتایی و ناوەندی و تا

چواری ئامادەیی) خوێندووە. بووەتە کار بە دەست لە ئینحیساری توتن بە پلەی (ملاحظ) لە هەولێر و لە رەواندوز، لە پاشا بووەتە (مودیری مەصلەحەی نەقلی روکاب) بۆ ماوەی چەند ساڵێک، لە پاشان سالی ١٩٧٧- ١٩٨٠ بووەتە ئەندام لە ئەنجوومەنی کاروباری پاێزگای هەولێر) پاش ئەوەی، کە خانەنشین کراوە (مثنوی جلال الدین) ی رۆمی بە شیعر وەرگێراوەتە سەر کوردی.

**چەند راستیەک لەم باسەدا**

١- خانەقا: (خانەگاه)، واتە شوێنی خەڵوەت و نوێژو خانەی خوداپەرستی، بەڵام ئەم جۆرە خانەقایانە (اطعام الطعام) یان تێدا دەکرد، بۆ ئەو دەروێش و سوفیانەی، کە لە چەند ژوورێکی تایبەتی لەم مزگەوتە و خانەقایانەدا دەحەسانەوە.

٢- سالی هیجری، واتە کۆچی ١٢٤٢ رێکەوتی ١٨٢٧ ی زایینییە.

٣- لە باسەکەدا ناوی (شێخ ئەسعەد ئەفەندی نەقشبەندی) فەرامۆش کراوە، ئەوانەش خێزانێکی زۆرن، شێخ محەمەد ئەفەندی نەقشبەندی بۆ ماوەیەکی زۆر قازیی شاری هەولێر بووە، کە دەکاتە کوڕی شێخ ئەسعەد ئەو زاتەی، کە لە ئەستەمبوڵ فەرمانی خنکاندنی بۆ دەرچووبوو، هەر لە بەندیخانە شەوێک بەر لە خنکاندنی گیانی سپاردبوو لەبەرئەوەی ئەمری خنکاندنی بۆ دەرچوو، چونکە نارەزایی خۆی دەرکردبوو بەرامبەر سەرکوتکردنی شۆڕشگێڕەکانی کورد لە تورکیا، لەبەرئەوەی کەمالییەکان کوردەکانیان ئازاردەدا نەیاندەهێشت داوای کەمترین مافی رەوای کوردایەتی خۆیان بکەن، لە ئەنجامدا بەشێکی زۆر لەو شۆڕشگێڕانە کوژران و، بەشێکیشیان دەربەدەری ولاتان کران، لە شۆڕشە مەزنەکەی (شێخ سەعیدی پیران) ی نەمر سالی ١٩٢٥، چونکە شۆڕشەکە دژی زوڵم و زۆرداریی فەرمانڕەوایانی تورکیای ئەو سەردەمە بوو، کە پشتیان لە ئایینپەروەری کردبوو.

٤- ریشەی بنەماڵەی شێخ هیدایەتوڵلای نەقشبەندی دەوروبەری سالی (١٢٠٠) ی کۆچی پیاوێکی هیندی بە ناوی شا ئیسماعیل هیندی لە چوونی بۆ حەج بە هەولێردا تێدەپەڕێت، لە گەڕانەوەی لە حەج دێتەوە هەولێر و ناگەڕێتەوە بۆ هیندستان، دوای ئەوە شێخ هیدایەتوڵلا تەریقەت وەردەگرێت و، سەرپەرشتی تەکیەی خانەقا دەکات، حکومەتی عوسمانیش زۆر گرنگی بە بنەماڵەی شێخ هیدایەتوڵلا دەدات و، گوندێکی زۆریان لە دەوروبەری هەولێر دەداتێ، لەوانە گوندی سیراوە و پیرزین.

ئەم بنەماڵەیەش بە درێژایی ژیانیان خزمەتی هەژارانیان کردووە و نانیان داوەتە خەڵک. (محەمەد سائیب) دەڵێت: جاران رۆژانە خەڵکێکی زۆر لەم تەکیەیە نانی دەخوارد و تا ئەمڕۆش سالانە هەر سی رۆژی رەمەزان خەڵکێکی زۆر نانی لێ دەخوات.

ئەم بنەماڵەیە لە شاری هەولێر دەوروبەری (٥٠) ماڵ دەبن، ژمارەیەکیشیان لە ئەنقەرە و ئەستەمبوڵ و حەما و دیمەشق نیشتەجێن، کاری بەرزیشیان لە میری وەرگرتووە.

**ئەمەش سەر چەلەی ئەم بنەماڵەیە**

شێخ محەمەد سائیب کوڕی شێخ محەمەد مەزهەر کوڕی شێخ یەحیا کوڕی شێخ عەبدولڕەحمان کوڕی شێخ محەمەد سەعید کوڕی مەلا هیدایەتوڵلا کوڕی شێخ عەبدولکەریم کوڕی شێخ عەبد موفتی کوڕی شێخ ئیسماعیل هیندی.

محەمەد سائیب لە سالی (١٩٣٩) لە شاری هەولێر لە دایک بووە و، لە سالی (١٩٦٠) کۆلیژی یاسای لە بەغدا تەواو کردووە، دوای ئەوەی موزەفەری باوکی لە سالی (١٩٥٠) کۆچی دوایی دەکات، خۆی سەرپەرشتی کاروباری مزگەوتەکە دەگرێتە دەست، یان هەر لە منداڵییەوە ئارەزووی خوێندنەوەی جۆرەها کتێبی هەبووە، ئەمڕۆکەش دوو کتێبخانەی هەیە، یەک لە مزگەوت و یەک لە ماڵەوە، کە جۆرەها کتێب و دەستنووسیان تیایە بە زمانەکانی عەرەبی، تورکی و فارسی، کتێبەکانیش بریتین لە کتێبی ئایینی، مێژوویی و ئەدەبیات.

هەر لە سەرەتای پەنجاکانەوە شیعری بە کوردی نووسیوە و چەند بابەتێکیشی لە گۆڤاری گەلاوێژ بلاوکردۆتەوە و پێنج خشتەکی بۆ چەند شیعرێکی شاعیرەکان داناوە لەوانە: (١٥) پێنج خشتەکی لە سەر شیعری (کانی) داناوە:

**من کە شێری سەرزەمینم، ناشکێنم شەوکەتم**
**نامەوێ مولکی جیهان، شەخسێکی خاوەن عیففەتم**
**من بەری کارم دەخۆم تا ماوە تۆزێ قووەتم**
**سەر فرۆ ناکەم بۆ عالەم چونکە عالی هیممەتم**

*****

**گیانە زۆر کەس بۆ زیادی مالی بێ هۆشە ئەدا**
**زۆر کەسی ئاسوودە ئەژێن لای نییە فیز و هەوا**
**نامەوێ نانی بە میننەت گەرچی رووتم، بێ نەوا**
**نابمە سائیل لە عالەم سائیلە عالەم لە خوا**
**عیززەتی نەفسم هەیە نالێمە حاتەم قیللەتم**

*****

**نامەوێ زێتر لە خۆم ئیتر دەرۆزە بۆ چ بکەم**
**تێ دەکۆشم بۆ ژیانی بێ مەراق و دەرد و غەم**
**نامەوێ ئانێک لەوانەی هەیتیان پوول و درەم**
**من کە رازی بووم بەکەم نابم لە شاهەنشاهی کەم**
**گەر نەکەم شەکوایی حالم کێ دەزانێ زللەتم**

*****

**با نەبم خاوەن ئوتومبیل و قەسر پێویست نییە**
**سیم و زەڕ گەرچم نەبێ ئەمما دڵم موستەغنییە**
**تۆزە چشتێکم هەبێ من قانیعم لام کافییە**
**خۆ ئەویشم گەر نەبێتن بەسییە نەفسم عالیە**
**شاهیدە ئاسارەکەم مەعلوم ئەکا ماهییەتم**

*****

**هەر کەسێکم تێ بگا من چی دەڵێم، چەند ماهیرە**
**هەر لە سەر رووی زەمینی مەعلووم و بەرز و زاهیرە**
**هۆشمەندە و گەورەیە ویجدانی راست و تاهیرە!**
**کەس و نا ئەهل و ناقص هەر نەزان چاترە**
**کامل و دانا لە گوفتارم دەزانی قیمەتم**

*****

**بانگ بکەین تێکڕا بە جارێ هەر بژی شەخسی بە خێر**
**چونکە ناکەس تۆ دەزانی هیچ لە دنیا نابێ تێر**
**داییمە ئازاد دەبێ مەعلوومە لێمان فەرخەشێر**
**زاهیرم هەر مەردی مەیدانم وەکو شێری دلێر**
**گوێت لە بەیتم بێ ئەکا ئیسپاتی نوتق و قووەتم**

*****

**پەندەکانم وەرگرن ئەی کوردی هوشیارو عەزیم**
**لا بدەن بەرگی جەهالەت قەت نەبن ئێوە لەئیم**
**(سائیب) م مەشهورم ئەمڕۆ من بە (شیوا) زۆر سەخیم**
**عاریفی عەسرم ئەدیبم حوڕ و سەربەست و فەهیم**
**بێ موحابا شاعیرم مەشهورە (کانی) شوهرەتم!**

(پێنج خشتەکی دوودمی)

**ئەم پەرچەمە لادە لە سەر ئەم روومەتە لاچێ**
**مالّ و سەرو روحم کەمە بۆ قیمەتی ماچێ**
**تابان و جوانی بەخودا کەسی بە تۆ ناچێ**
**هەر وەختێ کە دەچووی دەبێ ئەم عالەمە لاچێ**
**ئەم وێنەیە شیرینە هەتاکەی بە هەبا چێ**

پەراوێزەکان

خانەقا لە خانەگا هاتووە واتە خانوو یا جێگای خلودت و خوا پەرستن زۆر جاریش بە ناوی تەکیەی خالیدی ناسراوە، کە هەمان واتا ددگەیەنێت، کاکەییەکانیش بە شوێنی خەلودت دەڵێن جەمگا.

* محەمەد سائیب دەڵێت مزگەوتی خانەقا هەر لە کۆنەوە بە داهاتی گوندەکانمان بەڕێوەمان بردووە، جارانیش حکومەتی عوسمانی باج و سەرانەی لە سەر مولکی ئەوکەسانە دانەدەنا، کە خزمەتی دینیان دەکرد، مولکی ئێمەش باجی لە سەر لا چووبوو، ئەمڕۆش ئەم مزگەوتە بە پارەی داهاتی دوکانەکان بەڕێوە دەچێت، کە موچەی مەلا و یاریدەدەری مەلا و موئەزین و پاسەوانێک و (٣) خزمەتچی دەدات. هەروەها لەم داهاتە خزمەتی میوانانی پێدەکرێت، سەرەڕای پڕکردنەوەی کەم و کورتییەکانی مزگەوتەکە. جارانیش ئەحمەد چەڵەبی دوکێل سەهۆڵی بۆ هەموو مزگەوتەکانی هەولێر بە خۆڕایی دابین دەکرد: یەکێک لەم مزگەوتانە مزگەوتی خانەقا بوو. سەهۆڵەکەیان دەخستە ناو چەند کوپەیەکەوە. مزگەوتەکەی تەنیشت مزگەوتی خانەقا کە ناوی مزگەوتی (حاجی مەولود)ە ئەمەشیان مزگەوتی هەمان بنەماڵەیە، ئەم هەردوو مزگەوتەش لە حکومەت بە (وقف ملحق خیری) نووسراوە، واتە حکومەت هیچ یارمەتیەکیان نادات، بەڵام مزگەوتی (وقف مضبوط) حکومەت سەرپەرشتی دەکات لە موچەو چاککردنەوە و بەڕێوە بردن.

* هەروەها محەممەد سائیب دەڵێت: تا ساڵی (١٩٥٠) خەڵوەت بەردەوام لەم مزگەوتە دەکرا، بەڵام دوای ئەوەی باوکم کۆچی دوایی کرد جار جارە خەڵوەت دەکرا، بەتایبەتی کە ڕەشاد موفتی دەهات بۆ خەڵوەت. جارێک پاشای گەورە دێتە هەولێر و فەرمان دەدات هەموو ئەو کەسانەی کە سەرپەرشتی خانەقاکان دەکەن بێنە قشرەی، بەڵام شێخ هیدایەت نەچووە و خەبەری ڕەوان کردووە، کە لە بەر وانە گوتنەوە بواری نییە بچێتە لای پاشای گەورە، پاشاش دەڵێ مادام بە کاری تەدریس خەریکە لێی گەڕێن.

پەرتووکخانەی مزگەوتی خانەقا: ئەم پەرتووکخانەیە سەرەتا شێخ هیدایەتوڵڵا دروستی کردووە و بە درێژایی ماوەی دوای خۆی تا دەگاتە ئەمڕۆ کتێبەکانی زیاد کراوە سەرەڕای ژمارەیەک لە دەستنووس.

کتێبەکانیش ئەم جۆرانە دەگرێتەوە:

١- تفسیر القران
٢- فقە
٣- حدیث
٤- علم المنطق و علم الکلام
٥- کتێبی جۆرا وجۆری زمان و ئەدەب و مێژوویی، کتێبەکانیش زۆربەی بە زمانی عەرەبیە، بەڵام بە زمانی تورکی و فارسیشی تێدایە.

* مەولانا خالیدی نەقشبەندی لە هەر کوێیەک شوێنکەوتووی تەریقەتی هەبوایە خانەقایەکی لێ دروست دەکرد. بە زۆری (کورد)یش دەچوونە سەر تەریقەتەکەی، بۆ نموونە خانەقای لەم شارانە دروست کردووە: هەولێر، سلێمانی، کەرکوک، بەغداد، دیمەشق.
* تەریقەتی قادری خەڵوەت و زیکری تەنها بە دڵ و بە زمانە.
* دوای ئەوەی مزگەوت و تەکیەی خالیدی دروست کرا، ماڵی هیدایەتوڵڵا لە سەر قەڵاتێ هاتەخوارێ و لە پشت مزگەوتی خانەقا خانوویان دروست کرد، پاشان ئەم ناوە بوو بە گەڕەک، ماڵی هیدایەتوڵڵا سەری کۆڵانێیان گرتبوو هەتا کەس بەو کۆڵانە هاتووچۆنەکات. ئەم جۆرە کۆڵانە داخراوەش جاران لە زۆر شوێنی شاری هەولێر هەبووە.

* وەستا تۆفیق دوا جار مزگەوتی خانەقای چاک کردۆتەوە و، ناوەکەشی لە سەر منارە نووسراوە.

**مەلای خانەقا**

ناوی تەواوی مەلاکانی مزگەوتی خانەقا: مەلا محەمەد کوڕی مەلا عومەر کوڕی مەلا حوسێن کوڕیی کارەسولە و لە هۆزی سنجاوییە. لە قوشتەپە لە دایک بووە و باوکی مەلا بووە و شارەزایی باشی لە زمانی فارسی هەبووە، باپیریشی بازرگانی تووتن بووە، لە کوردستانەوە تووتنی بۆ حەلەب بردووە.

مەلا عومەری باوکی لە گوندی دووسەرە و گردەمەلا مەلایەتی کردووە. پاشان دەچێتە (حەساری گەورە) ی نزیک کەرکووک مەلایەتی دەکات.

مەلا محەمەدیش لە ساڵی (١٩٥٦) ئیجازەی مەلایەتی لای باوکی وەردەگرێت و پاشان لە گوندی (تۆمار) ی ناوچەی شوان دەبێتە مەلا، پاشان دەچێتە کەرکوک و (٢٠) ساڵیش لە وێ دەبێتە مەلا و لە ساڵی (١٩٨٨) یش ماڵی دێنێتەوە هەولێر و لە مزگەوتی خانەقای خالیدی دەبێتە مەلا و تاکو ئەمڕۆش بەردەوامە، مەلا محەمەد هەستێکی نەتەوایەتی بەرزی هەیەو کتێبخانەیەکی گەورەشی هەیە.

* مامۆستا مەلا محەمەد کوڕی مەلا عومەر دەڵێت: من لە ساڵی ١٩٥٢ چوومە شاری دیمەشق، چاوم بە تەکیە و مزگەوتی نەقشبەندی کەوت، کوردی دەوروبەری ئەم تەکیەیە هەموویان لە سەر تەریقەتی نەقشبەندی بوون.
* بۆ نووسینی ئەم بابەتە دیمانە لە گەڵ بەڕێز محەمەد سائیب و مەلا محەمەد کوڕی مەلا عومەر سازدراوە.
* دیوانی کانی/ کۆکردنەوەی موەفەق ئەکرەم کانی پێشەکی و لێکدانەوەی کەریم شارەزا ١٩٨٠

لە گۆڤاری (هەتاو) ژمارە (٤٩) ی ساڵی (٢) ڕێکەوتی ١- ١١ / ١٩٥٥، لە لاپەرە (٧- ٨)ەوە وەرگیراوە.

* گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر/ ژمارە (٥) / تەمووزی ساڵی (٢٠٠١) وەرگیراوە.



# مزگەوت و تەکیە و خانەقا

شوان عومەر

لێکۆڵینەوە و گەڕان بەدوای بنکەکانی رۆشنبیری و کلتووری نەتەوەکەمان، بە تایبەتی کەلەپووری سۆفیگەری و فێرگە ئایینییەکان، کەوا کوانووی رۆشنبیری بوون و بنەمای پەروەردە و بنچینەی بەها کۆمەڵایەتییەکانن، ئەم کەلەپوورەیە بەردەوامی و مانەوە بە ناسنامەی نەتەوەیی دەبەخشن و ئەوە دوای ئەوە لە رێگای ئەم کەلەپوورەوە دەگوازرێتەوە.

بایەخدان بەم کەلەپوورە، بایەخدانە بە رۆشنبیری و ئاکار و بنچینەکانی بەها مەزنەکانی نەتەوەکەمان و پێشچار خستنی تایبەتمەندی نەتەوەییمانە.

لە چوارچێوەی ئەم بیروبۆچوونە لە دەرگای ئەم بابەتە دەدەین، کە بەسەر کردنەوەی کوانووی زانست و ئەدەب و ئاکار و خودا پەرستییە، بایەخدان بەم پیرە نوورانیانە، کەوا وەک چرا دەسووتان و رووناکیان بەدەوروبەر دەبەخشییەوە، بایەخدانە بەو ئەستێرانەی رێگا نیشاندەرن لە رێگای زانین و عیرفان و نەجات.

### تەکییە و مزگەوتی شێخ محێدین

تەکیە و مزگەوتی (شێخ محێدین)، دەکەوێتە ناوەندی گەڕەکی کۆنی عارەبان لە شاری هەولێر، سەرەتای دامەزراندنی بۆ ساڵی (١٨٩٢) دەگەڕێتەوە و لەلایەن (شێخ ساڵح) دروست کراوە و لە چوار بەش پێک دێت، مزگەوت و تەکییە و مەرقەد و دیوی تەکیەی ئافرەتانیش، کە کاتی خۆی (مریەم خان) خێزانی (شێخ ساڵح) بەڕێوەی دەبرد، بەڵام ئەم دیوە ئێستا لە تەکییەی شێخ محێدین دابڕاوە و ماڵی (خەلیفە یونسی) تێیدایە، ئەم تەکیە نزیکەی (١٠٨) ساڵ خزمەتی کردووە لە رووی کۆمەڵایەتی و ئایینییەوە و بە ناوەندێکی مێژوویی فۆلکلۆری هەولێریش دەژمێردرێ، بەپێی بارودۆخی رۆژگار چەند جارێکیش گۆڕانکاری بەسەرداهاتووە.

بەڕێز (شێخ ئەحمەد) کوڕی (شێخ محێدین شێخ ساڵح)، کە لە نزیکەوە و لەناو تەکییە چاومان پێی کەوت گوتی: کاتی خۆی دەرگای حەوشە تاق تاق بوو، وەکو دەرگای حەوشەی تەکیەی مریەم خان.

کە لە دەرەوە دەڕۆیتە ناو تەکیەوە، دەکەوێتە دەستە چەپ و تەنیشت مزگەوت، گۆڕەپانێکی گەورە بەرچاو دەکەوێ، لە دەستە راستەوە جێی دەستنوێژ و ئینجا

هەندێک دار و باری کۆن لای چەپی ئاوەدان کردۆتەوە، هەر چەندە پێشتر ئەو شوێنە باخچە و سەکۆ بوو، ئێستا جێی دەستنوێژهەڵگرتنە، بۆیە دارەکانمان هەر لە شوێنی خۆیاندا هێشتۆتەوە، بەڵام باخچەکە نەماوە، ئینجا بە تەنیشتییەوە ژووری مامۆستا (یونس)ە، کە تێیدا دەخوێنێتەوە و ئیش و کاری خێری وەک چارەسەرکردنی گیروگرفتی نێوان موسڵمانان و نوێژی جەنازە و ژن مارەکردن و بۆنە ئاینییەکان لەوێ لەو ژوورە ئەنجامدەدا....

ژوورەکەی دیکەی تەنیشتی کۆگایە بۆ دانانی کەلوپەلی مزگەوت بەکاردێ...مەرقەدەکەش لە سەرووی هەر سەرووەوە گۆڕی خوالێخۆشبوو (شێخ ساڵح)ە، کە لە ساڵی (١٩١٦) کۆچی دوایی کردووە و تەنیشتی (شێخ محێدین)ە کە لە ساڵی (١٩٨١) کۆچی دوایی کردووە و باوکمە، تەنیشتی (شێخ محەمەد نووری)یە مامە، کە لە ساڵی (١٩٦٧) کۆچی دوایی کردووە، ئینجا لە پێشیان خوالێخۆشبوو (مریەم خان)ە داپیرمە و لە ساڵی (١٩٥٠) کۆچی دوایی کردووە لە تەنیشت دایکم (فەتحیە خان)ە، ئەویش لە ساڵی (١٩٦٠) کۆچی دوایی کردووە.

تەنیشت مەرقەدەکە قاوەخانەیە و جێگایەکی بچووکە چایە و قاوەی بۆ میوانان لێ دروست دەکرێ. دەرۆی دەبێتە هەیوانێکی گەورە، کە دەچێتە ژوورەوە هۆڵی نوێژکردن گەورەیە و نزیکەی (١٠٠) مەتری چوارگۆشە دەبێ و بناغەکەی (٢) مەتر پانە، ناو بناغەکە (خەڵوەت)خانەیە، ئەو کەسانەی دەیانەوێ خەڵوەت بکێشن (٤٠) رۆژ لەوێ دەمێننەوە، جگە لەنان و قەسپ خواردن و بۆ پێویستی دەرەوە، دێنە دەرەوە، دەنا هەر لە ژوورەوە دەمێننەوە، لە سەرەوەش جێگای وتارخوێن و پێش نوێژە، تەنیشت مزگەوتیش تەکیەیە و کتێبخانەش هەر لەوێیە، جێی نانخواردن و پشوودان و وێردەکانە.... کتێبخانەکەش لەگەڵ یەکەم نۆژەنکردنەوەدا لەسەر ئەم شێوە لەلایەن هونەرمەندێکی فەلەوە (مەسیحی) دروست کراوە، بەڵام ئێستا ناوی ئەو هونەرمەندەم لەبیر نەماوە، تەنیشت تەکیەکەش، کە ئێستا لێی دابڕاوە خانوو و کۆشکی مریەم خان بوو، کە کردبوویە تەکیەی ژنان، ئەم شوێنە هەرچەند دەرگاکەی کە لە تەنیشت مزگەوتە دەستکاری نەکراوە، بەڵام ئەویش گۆڕانکاری بەسەرداهاتووە، کە چووین تەماشامان کرد و وێنەمان گرت شوێنی قاڵدرمەیەکی لێ بەجێماوە، بەڵام لەسەر بان بچڕاوە و ئێستاش خانووەکە هەر ماوە...

**شێخ ساڵح و**
**تەکیەی شێخ محێدین...**

هەروەها (شێخ ئەحمەد) گوتی: (شێخ ساڵح)ی باپیرم پێش ئەوەی ئەو تەکیە دروست بکا، لە گوندی (پیرداود) تەکیە و مزگەوتی هەبوو، تا ئێستاش شوێنەوارەکەی لە گردی پیرداودی هەرماوە، بەڵام لەپاشان، کە پێویستی کرد و خەڵک زۆر داوای لێکرد... لەبەر ئەوەی بە تایبەتی هەولێرییەکان بە پێی وڵاخی دەرۆیشتن سەردانیان دەکرد، بۆیە داوایان لێکرد و گوتیان: دەبێ لە هەولێریش جێگایەک دروست بکەی بۆ ئێمە ئاسانتر و خۆشترە، ئینجا پێش ئەوەی شێخ ساڵح بێتە هەولێر، لە کەندێناوەئیرشادی کردووە. دروستکردنی تەکیەی (شێخ محێدین) هاوکات بووە لەگەڵ مزگەوتی (شێخی چۆلی). شێخی چۆلی خوالێی رازی بێ خۆی باسی کردووە بۆ هێندێ کەس و گوتوویەتی: (ئەمشەو خەونێکم دیوە، لەم نزیکانە نورێک لەم دەورووپشتە پەیدا بووە، لە پاشان (شێخ ساڵح) هاتووە، ئەم تەکیە و مزگەوتەی دروست کردووە بەناوی (شێخ محێدین)ی باوکمی کردووە.

**ژیان و خوێندن و**
**تەریقەتی شێخ ساڵح**

هەروا (شێخ ئەحمەد) دەڵێ: لە ساڵی (١٩١٦) (شێخ ساڵح) کە لە تەمەنێکی (٧٠- ٨٠) ساڵیدا بووە کۆچی دوایی کردووە و دەکرێ بە نزیکی مێژووی لەدایکبوونی بۆ دانرێ و بۆ خۆشی لە بنەماڵەی شێخان بووە (قەرە حەسەن) و موعجیبی کاکە (ئەحمەدی شێخ) بووە و زۆر کەیفی بەو هاتووە، بۆیە چۆتە لای ئەو بۆ خوێندن و ئەویش زۆر زۆر خۆشی ویستووە، هەتا (مریەم خانی) خوشکەزای خۆی داوەتێ، ئینجا تەکلیفی لێکردووە، کە بچێ لە ناوچەی هەولێر بەناوی ئەو ئیرشاد بکا و تەکیە و مزگەوتی دانێ، کەواتە زۆربەی ئەو شێخانەی هەولێر و دهۆک بەرزنجین و لەوێ راهاتوون و بە تەکلیفی (کاکە حەمەدی شێخ) هاتوونەتە ئەو ناوە و (شێخ ساڵح)ی باپیرشم یەکێک لەوانە بووە و بۆتە بەشێک لە هەولێر و هەر لە هەولێریش لە ساڵی ناوبراودا کۆچی دوایی کردووە و لە تەکیەی خۆی نێژراوە، دەروێش و

خەلیفەکانی نەماون، بەڵام کوڕی دەروێش و خەلیفەکان (مەلا یونس) و (خەلیفە عزەدین) و (شێخ محەمەد) خەلیفە (ئالتی بەرماق) ماون، واتە زۆر کەمیان ماون، تەریقەتی بە هەموو کەسێکیش نەداوە.

**شێخ محێدین و بەخشەکانی**

(شێخ ئەحمەد) هەر لە قسەکانی بەردەوام بوو، کە قسە هاتە سەر باوکی گوتی: زۆرجار خەڵک هاتوون و بە باوکی رەحمەتیمیان دەگوت: دوعایەکمان بۆ بخوێنە، ئیتر ئەو دەیگوت برۆ دوو رکات نوێژ بکە و بۆ خۆت دوعایەک بخوێنە، هەتا رکی دەبۆوە خەڵک دەستی ماچ کا، بەڵام ئەوەی زۆری لێکردبا ئەوا دوعای لەسەر دەخوێند و قسەی خۆشی لەگەڵدا دەکرد.

*** پەیوەندی تەکیە و شۆڕشەکانی کورد چۆن دەبینی؟**

- لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا رووسەکان هاتن ئێرە داگیر بکەن... شێخ و ئاغا و میرەکان و زۆربەی خەڵکی ناوچەکە چوون شەڕی رووس بکەن. (شێخ سالح) و دەوروبەر و موریدەکانیشی بۆ هەمان مەبەست چوون، لەو شەڕەدا گیراوە و هی ئەو زەمانە هەرماومانە.

باب و باپیرم خزمەتیان لەگەڵ (شێخ مەحموود)ی مەلیک هەیە، شێخ مەحموود هەر ئیش و کارێکی لە هەولێر و دەوروبەری هەبایە، ئەوا باوکم جێبەجێی دەکرد، ئەگەر سەردانی ئێرەشی کردبا، ئەوا لەلای باوکم دەمایەوە، (شێخ سەعید) یش و (شێخ مەحموودی حەفید) بەهەمان شێوە، لەلایەکی دیکەش هەستم دەکرد حەزی لەوە بوو کورد ببێتە شتێک و کیانێکی هەبێ، لەبەر ئەوەی ئەوەندە رێزی هەبوو لەناو شۆڕش زۆرجار ئەفسەر و سەربازی وا دەگیران کەسوکاریان دەهاتن لێرە تەکلیفیان لێدەکرد و ئەویش هەوڵی بۆ دەدان بەربدرێ یان ئەزیەت نەدرێ، هەروەها پاڵپشتێک و هێزێک بووە بۆ هەولێرییەکان و هەر گیروگرفتێکی رووبەرووبۆتەوە لێرە رێگاچارەی بۆ دۆزراوەتەوە، ئەو بێجگە لە ئاشکردنەوە و کێشەی خێزانی و خێڵەکی لێرە چارەسەرکراوە... سەرەڕای ئەوانەش کاتی خۆی کە لافاو هەستاوە، داوای لە هەموو خەڵکی شار و بەتایبەتی دوکاندارەکان کردووە دەست لە ئیشوکاریان هەڵگرن و برۆن گوش پڕ خۆڵ بکەن و بەری ئاوێ بگرن، ئەوە یەک لەو کارانەی نەیانهێشت بازاڕ ئاو بیگرێتەوە... ئاو هەتا سەیداوە و سێتاقان هاتبوو، دواتر پێشیان لێگرت.

هەروەها لە ساڵی گرانی چەندان فرنی داناوە و بە خۆڕایی نانی هەژار و نەدارانی داوە، تەنیا بە دەوڵەمەندانی بە پارە دەدا و جگە لەم تەکیە مزگەوتێکی لە گەڕەکی برایەتی کردووە و هەر بەناوی (شێخ محێدین)ە، هەروەها بە کۆمەکی ئەو لەگەڵ دەوڵەمەندەکانی هەولێر مزگەوتێکی دیکەیان لەسەر رێگای هەولێر عەنکاوە دروست کردووە.

دەگێڕنەوە دەڵێن: (کاتی خۆی موتەسەریفی هەولێر داوای لە باوکم کردووە، کە ئامێری تیشکی (ئیشاعە) بکڕێ، چونکە نەخۆشی (سیل) لە هەولێر هەیە، ئەویش هەرچی داهاتی فرنییەکان هەیە، دابووی و جیهازەکەیان بۆ خەستەخانەی هەولێر کڕیبوو، هەروەک دەزانن هەولێر میوانخانە و چێشتخانەی نەبوو، هەر کەسێک رووی لە هەولێر کردبا لەو تەکیانە دەمایەوە، کاتی خۆی لەبەر هەندێ بارودۆخی نالەبار تەکیەکەمان ببووە بنکەیەکی پۆلیسی بە توانا و بەرەنگاری ئەو کەسانە دەبووەوە، کە لە دژی ئاینی پیرۆزی ئیسلام دەوەستان و هەتا باوکم بنکەیەکی ئاینی و کۆمەڵایەتی هەبووە، بۆیە کە شتێکی وا دەبوو خەڵکەکە داوایان لێدەکرد ئەو شتێک بکا، ئەویش لەبەر ئەم مەسەلەیە تووشی هەندێ گرفت بوو.

ئەمەو شێخ ئەحمەد هەر لەبەر رۆشنایی کتێبخانەکەدا گوتی: ئەم کتێبانەی کە دەیبینی لەراستیدا زۆر کۆنن و بەنرخیشن، بەڵام زۆربەیان تورکین، هی رۆژگاری عوسمانین، لەبەر ئەوە ئەم مزگەوتەی ئێمە لە جەنگی یەکەمی جیهانی لە ساڵی ١٩١٤- ١٩١٨ لەبەر ئەوەی جێیەکی فراوان بوو، ناو شار بوو، ئێرە کرایە خەستەخانەی عوسمانییەکان، بریندار و شتیان لێ تیمار دەکرد، ئەوجا ئەوان لەوکاتیدا ئەم کتێبانەیان لەگەڵ خۆیاندا هێنا، کتێبەکانیش هەندێک قاموسی ئەعلامی تورکی هەندەک کتێبی نایاب و دانسقەن، تورکی و عەرەبین و تەنانەت بە عەرەبییەکی سەیر نووسراون، هێشتا بەو جۆرە ئاشنایەتیان لەگەڵدا پەیدا نەکراوە، خودا حەزکا بایەخێکی باشیان پێدەدەین گەر کەسێکی وا هەبێ لێی تێبگا و بەسەریان بکاتەوە.

**تەریقەت و ئیرشاد**

هەروەها سەبارەت بە تەریقەت و

ئیرشاد گوتی: هەروەکو سەرەتا ئاماژەم بۆکرد، باوکی رەحمەتیم هەڵسوکەوتی جۆرێک بوو لەگەڵ موریدەکانی خۆی، حەزی لە مەراسیمی دەست ماچکردن و دوعاخوێندن نەدەکرد، ئێمەش هەر لەسەر رێگا و تەریقەتی ئەودا دەڕۆین و لە پاشانیش بە حوکمی وەزیفە، کە دنیا وا گۆڕاوە، ئێمە تەریقەت و ئەو شتانەمان نییە، بەراستی دابونەریتی خۆمان پاراستووە و سەبارەت بە زیکر و وێردەکان بەردەوام دووشەممان و هەینیان پەیڕەومان دەکرد، بەڵام لەبەر هەندێ بارودۆخی تایبەتی، کە هاتە پێش، کە نەدەکرا ئەو جۆرە کۆبوونەوانە بکرێ یاخود ئەو کەسانەش بەو جۆرە، کە بتەوێ وەکو جاران بێن و کە شتێکیش بە خۆویستی نەکرا بە زۆر دروستی نەکەی....

ئەو تەکیەیە تەنیا هەر تەکیەیەکی ئایینی نەبووە، بەڵکو کەسێتی کۆمەڵایەتی و گیروگرفتی هەولێرییەکانی لێ چارەسەرکراوە.

**کەرستەکانی تەکیە**

بەڕێز یونس مەحموود محەممەد کە لە ساڵی ١٩٢٩ لە هەولێر لە دایک بووە و لە ساڵی ١٩٤٤ قوتابخانەی تەواو کردووە و لە پۆلی شەشەمی سەرەتاییەوە هاتوچۆی تەکیەی کردووە و ئێستا هەر خەلیفە و مەلایە لەوێ و سەبارەت بە کەرستەکانی تەکیە گوتی:

* **ئاڵا:** ئەوە ئاڵای پێغەمبەر (د.خ)ە و هەموو شێخێک، کە مورشیدی تەریقەت بێ، دەبێ ئاڵایەکی هەبێ و ئاڵای تەریقەتی پێدەڵێن.

* **شمشێر:** جارجارە لە کاتی زیکر و وێردەکاندا بەکاردێ، کاتی خۆی چەکێکی سەرەکی شەڕکردن بوو لەبەرامبەر دوژمنانی ئیسلامدا.

* **کەشکۆڵ:** لە گوێزی هیندی دروست دەکرێ و زۆر بە دیقەت و بە هوردەکاری دەریان هێناوە و دەروێش خواردن و کەلوپەلی خۆی لەناودا دەنێ و بە شانی خۆیدا دەدا.

* **تەپڵ:** ئەوەش لە کاتی زیکر کردندا لێدەدرێ.

* **کوتکی (٣) کوچکە:** زەرگەکەی سێ سەرە و ریفاعیشی پێدەڵێن، لە کاتی زیکر و تەهلیلە کردندا بەو کوتکە لە زەرگوکە دەدەن لەلای چەپی، دواتر دەربدێنن و شوێنی برینەکە پاش دەست پێداهێنان بە بەرەکەتی شێخ و مشایەخان چاک دەبێتەوە.

* **دەفە:** کەرەستەی زیکرە کە زیکر دەکرێ لێدەدرێ، کە دەفەکە بە چ نەغمەیێ لێدرا دەروێشەکان لەسەر ئەو نەغمەیە زیکر و تەهلیلە دەکەن.

* **بوق:** ئەو بوقە ئەگەر شێخ چووە ئیرشاد، دەروێشەکان کە خافل بوون دەستنوێژیان شووشت یان خواردنیان خوارد شێخ دیهەوێ حەرەکەت بکا چاوەش هەیە بوقەکەی لێدەدا، ئیدی کۆدەبنەوە.

* **دار خلوەت:** لە کاتی خلوەت و بیرکردنەوە و خواپەرستیدا لەژێر نێوچاوان دادەنرێ هەتا ئەگەر خەلوەتکێش ماندووش بوو خەوی لێنەکەوێ و خۆی پێڕابگیرێ.

* **مەنتەشا:** ڕەدگی دارە، لەبن عەردی بە ئەندازەیێ بە جۆرێک دەردێ (محەمەد) نووسراوە، زۆر بە دیقەت دەریان هێناوە و ئەوەش بە هەمان شێوە خەلیفە بە مەنتەشایان کە بە تەبەرزین لە پێش دەروێشەکان دەڕوا لە کاتی تۆبەدان یان لە کاتی گەشتوگوزاردا.

* **تەبەرزین**

خەلیفە ئەو تەبەرزینەی لەپێش ئاڵای هەڵدەگرێ و دەڕوا و دەڵێ:

**حەی ئەڵڵا حەی حەی**

**حەی ئەڵڵا حەی حەی**

جاروباریش ئەگەر لە چۆلی بەتەنیا بوو، ئەوا خۆی پێ لە دوژمن و دڕندە دەپارێزێ و لە ئاسن و داری دروست کراوە.

**ئەحمەد شێخ محێدین شێخ سالح لە چەند دێڕێکدا...**

لە ساڵی (١٩٥١) لە شاری هەولێر لە دایک بووە، دەرچووی (کۆلیجی یاسا و کۆلیجی پۆلیس)ە و سێ کوڕ و دوو کچی هەیە، سەبارەت بە ڕۆڵی لە خزمەتکردنی تەکیەدا گوتی: من لە منداڵییەوە لەو تەکیەدا گەورە بووم و تاکو ئەمڕۆکە هەر خزمەتی ئەم تەکیەم کردووە و ئەوەش شانازییە بۆ من، کە ئەم شوێنە لەسەر ئەرکی تایبەتی خۆمان بەڕێوەچووە و ماوە، هەر لە کۆنەوە داب و نەریتێک هەبوو باوکم شتی بۆ نەهاتووە ئەگەر هاتباش دەیگەڕاندەوە و قەبوولی نەکردووە، سەبارەت بە پیشەی پلەی سەربازی گوتی: هەرچەندە من ئێستا بە پلەی عەمید راوێژکارم لە وەزارەتی ناوخۆ و بەرپرسیتیم زۆر دیوە، بەڵام خزمەتکردنی تەکیە بەلامەوە شتێکی سەرەکییە و من بە (شێخ ئەحمەد)ە وە ناسراوم بە نازناوێکی دیکەوە نەناسراوم...!

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری (ئاسۆی فۆلکلۆر) ژمارە (١)ی ساڵی ٢٠٠٠ وەرگیراوە.



# تەکیەو خانەقاکانی شاری هەولێر

فاتیح یاسین مودەریس

**سەرەتا**

سۆفیگەری ( تصوف) لەمێژووی هزری ئیسلامیدا لقێکە لەلقەکانی فەلسەفەی ئایینی، تەریقەتێکی زاهیدانەیە لە سەر بنەماکانی شەرع و پاکی دەروون و تەرکی دونیا و شتە پەیوەندیدارەکان بە دونیاوە دامەزراوە و لە بارەی پەیوەندی مرۆڤ و خوا و چۆنێتی گەیشتن بە حەق دەدوێ. لە کۆتایی سەدەی یەکەمی کۆچییەوە لە وڵاتانی ئیسلامی سەری هەڵداوە. ئەم ئەو کەسەی ئەم رێبازە دەگرێتە بەر، جلکی زبری پەشمین (صوف) لەبەر دەکا وپشتی لە دونیا کردووە و بووەتە رێبوار (سالک)ی رێگار هەق و بە "سۆفی" ناسراوە.

هەندێ گێڕانەوەی دیکەش هەن ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کە (التصوف) لەپاکی دڵ و دەروونەوە وەرگیراوە، هەندێک راوو بۆچوونی لاواز هەیە، کە سۆفیگەر دەگەڕێنێتەوە بۆ ڕیزی یەکەم لەئیمانداران (اصحاب صفه)، یاخود بۆ (صفه)ی مزگەوتی پێغەمبەر (د.خ)، دەگەڕێتەوە، چونکە شوێنی هەژاران و بێ نەوایان بوو.

سۆفییەکان بە چەندین ناوی وەک(سالیکان)، (خەڵوەت نشینان/ گۆشەگیران)یش ناوبراون.

یەکێ لە باسە گرنگەکانی (سەیر و سلوک)ی

سۆفیانە، ئەو پلەو پایە(مەقام)انەیە کە سۆفی و عارف لە رێبازی گەیشتن بە حەق و ناسینی حەقدا دەبێ بیانبڕێ و بیانپێوێ."بەکورتی مەقام دەبێ بەدەست بێت و رێبواری تەریقەت (سالیک) دەبێ بە گۆشەگیری و کۆششی دەروونی و پارێزکردن لە دنیا و خۆشییەکانی بەدەستی بێنێ و تێیاندا بمێنێتەوە و ئەگەر مەرجەکانی بەجێ هێنا بچێتە پلەیەکی دیکەوە".ئەم مەقاماتە کە "ئەبوونەسری سەڕاج "لە کتێبی (اللمع)دا ئاماژەی پێکردووە حەوت ماقامن و بریتین لە:

١- پەشیمانی(تۆبە): تۆبە لە سۆفیگەریدا لە سەر دەستی شێخ یان پیری تەریقەت دەکرێ لە رێگەی راهێنانی ئەو و ملکەچیبوون بەرامبەر بە فەرمانەکانیەوە.
٢- پارێزکاری (وەرع): پارێزکردن لە گومان و دڕدۆنگی و لە هەموو ئەو شتانەی لادانی شەرع یان (شوبهەت) وزیانی دەروونی و نەفسی تێدابێ.
٣- خۆپاراستن (زوهد): خۆپاراستن و گۆشەگیری لە دونیایە (پشتکردن لە هەموو حەز و مەیلێکی دونیایی).
٤- فەقر (نیازمەندی): فەقر لە روانگەی سۆفییەکانەوە، بە واتای پێویستی یان نیازمەندی بە خوایە و بێنیازییە لە غەیری ئەو.
٥- سەبر: نیشانەی ئیمان ومانەوەی سۆفییە لە سەر باوەڕەکەی.
٦- بەتەمابوون (توکل): دڵنیابوونە لە خوا و ناهومێبوونە لە غەیری ئەو.
٧- رەزامەندی (رضا): رزا، بەرهەمی دڵۆڤانی و مەحەبەتە، پارێز کردنیشە لە ئێرەیی (حەسودی). واتە، سۆفی بەوەی هەیە رازییە و بە وەی پێی دراوە قانیعە.

لەلایەکی دیکە رێبازێکی هزری و فەلسەفیی پێشکەوتوو و قوولیش هەیە، نەک بە شێوازی فەیلەسووفان، بەڵکو لە سۆفیگەری نزیکە و لەویش جیاوازە. واتە رێبازێکی هزری و فەلسەفییە بۆ ناسینی خواوراستییەکانی دونیا وخیلقەت و دەرخستنی رەمز و رازەکانی لە رێگەی کەشف و شهودەوە.

بەگشتی "عیرفان وسۆفیگەری"، گرووپێکی پابەندو پێکەوە بەستراوی کۆمەڵایەتین و زنجیرەیەک بیرو باوەڕ و داب و نەریتی تایبەت و پۆشاک و هەندێ جار شێوەو روخسارو ریش هێشتنەوە و ئادابی نیشتەجێ بوون لەخانەقاو تەکیە لە خەڵکی تریان جیا دەکاتەوە. (لە کتێبی: "مبانی عرفان وتصوف" وەرگیراوە) بەڵام عارف مەقامی لە سۆفی باڵاترە و هەموو عارفێک سۆفییە، بەڵام هەموو سۆفییەک عارف (خواناس) نییە.

**(رەحیم سورخی)**

*

کۆمەڵگەی کوردیشمان وەکو کۆمەڵگەیەکی موسڵمان لە رێبازی عارفان و سۆفیان بێبەش نەبووە. تەریقەتەکانی سۆفیگەریێ لەپاڵ گەشەپێدانی لایەنی خواناسی و ئایین پەروەری لە کوردستان، خۆشیان بۆ خوا ناسین هەوڵیان داوە و بۆ بەئەنجام گەیاندنی ئەو ئەرکانە، چەندین موریدو سۆفی و شوێن کەوتووشیان هەیە.

وێڕای ئەوە، بۆ کۆکردنەوەی ئەو موریدو سۆفیانە لەشوێنێک، بەمەبەستی خواپەرستی و خۆ پەروەردە کردنێکی دەروونی بۆ ناسینی خوا، چەندین تەکیەو خانەقایان لەکوردستان دروست کردووە کە شاری هەولێریش دەگرێتەوە.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا ناوی چەندین تەکیەو خانەقا دەخرێتە روو، کەتێیاندا (٥) فەرزە بەکۆمەڵ نوێژکردن و سەردان و هاتووچۆی دەروێشان و ئەنجامدانی خەتمی قورئانی پیرۆزو زیکرو، ئاهەنگێران لەشەوە پیرۆزەکانی ساڵداو وتارو ئامۆژگاری کردنی خەڵک و پەیوەندییان لەگەڵ تەکیەو خانەقایانی تری ئەو شارە ئەنجام دەدرێ. ئەوەی لێرەدا پێویستە بگوترێت، ئەوەیە کە وا دیارە بەزۆری لەتەکیەو خانەقاکانی شاری هەولێردا بەپێی رێبازی تەریقەتی قادری ئیرشادی خەڵک کراوە.

ئەم لێکۆڵینەوە بۆ دووبەش دابەشکراوە: (تەکیەکان، خانەقاکان).

### بەشی یەکەم: تەکیەکانی شاری هەولێر:

### ١- تەکیەی قادری

ئەم تەکیەیە کەوتۆتە گەڕەکی زانیاری لە پشت بنکەی تەندروستی ئازادی. سەرەتای دروستکردنی دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی سەدەی نۆزدە (١٨٩٠)ز. لەم تەکیەیە رێنمایی موریدەکان لەسەر رێبازی قادری پەیڕەو دەکرێت. تا

ئێـــسـتـاشی لەگـەڵ دابێت هەر ئاوەدانەو هەندێ چالاکی تایبەتی خۆی هەیەو جەماوەرێکی زۆر هاتووچۆی دەکەن.

**٢- مزگەوت و تەکیەی شێخ محیێدین شێخ محەمەد ساڵح قولەیی بەرزنجی**

ئەم تەکیەیە کەوتۆتە گەڕەکی عارەبان نزیک مزگەوتی دێرە بروشە. سەرەتای دروستکردنی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٣٢٢ک-١٨٩٢ز) لەسـەر ڕێبـازی قـادری ڕێنمـایی خەڵک دەکەن. کاتی خۆی لەسەر بڕیاری شێخ محەمەد ساڵح شێخ محەمەد بەرزنجی قولەیی دروست کراوە. هەندێ لەچالاکییەکانی ئەم تەکیەیە:

ا- پێنج فەرزە بەکۆمەڵ نوێژکردن.
ب- سەردان و هاتووچۆی دەروێش و موریدەکان.
پ- ئەنجامدانی خەتم و زیکر.
ت- ئاهەنگ گێڕان لەشەوە پیرۆزەکانی ساڵ.

**٣- تەکیەی خەلیفە مەجید**

ئەم تەکیەیە کەوتۆتە گەڕەکی عارەبان لەیەکێ لەکۆڵانە تەسکەکانی مزگەوتی شێخی چۆلییە. سەرەتای دروستکردنی بۆ کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم دەگەڕێتەوە. کاتی خۆی خوالێخۆشبوو خەلیفە ئەحمەد دروستیکرد. خەلیفە مەجید کوڕی خەلیفە ئەحمەد کوڕی خەلیفە حەسەن رەسوڵ روفاعییە. ئەم تەکیەیە کاتی خۆی لەهەموو بۆنە پیرۆزەکان دەوری خۆی دەنواند.

**٤- مزگەوت و تەکیەی شێخ عەبدولکەریم شێخ مستەفای دارەخورما بەرزنجی**

ئەم تەکیەیە کەوتۆتە گەڕەکی خانەقا نزیک مزگەوت و خانەقای شێخ مستەفای نەقشبەندی. لەساڵی ١٩٣٠ لەسەر بڕیاری ئەم زاتە دەست بەدروستکردنی کراوە. دەروێش و موریدو خێرخوازەکانی رۆڵی گرینگیان لەدروستکردنی بینیوە.

لەم تەکیەیە لەسەر ڕێبازی قادری ڕێنمایی خەڵکی دەکەن.

**٥- روفاعی- ئەبو عیلمەین**

ئەم تەکیەیە کەوتۆتە گەڕەکی تەعجیل بەرامبەر گۆڕەپانی کۆتری سەلام. سەرەتای دروستکردنی لەساڵی ١٩٤٢ لەسەر دەستی شێخ خەلیفە تەها سەید حەسەن بووە.

**٦- مزگەوت و تەکیەی کاکی هیران**

ئەم تەکیەیە کەوتۆتە گەڕەکی تەیراوە نزیک شەقامی (٣٠) مەتری. لەساڵی ١٩٥٠ لەلایەن خوالێخۆشبوو شێخ عەلی شێخ مستەفا شێخ عەبدوڵڵا هیرانی دروست کراوە. ئەم تەکیەیە لەسەر ڕێبازی قادری ڕێنمایی خەڵک دەکات. هەندێ چالاکی سەرەکی لێ ئەنجام دەدرێ، وەک:

١- نوێژکردنی فەرزەکان بەکۆمەڵ.
٢- ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی شەوە پیرۆزەکانی ساڵ.
٣- وتارو ئامۆژگاریکردنی خەڵک.

**٧- تەکیەی شێخ عارف بەرزنجی**

ئەم تەکیەیە کەوتۆتە گەڕەکی عارەبان، نزیک داوێنی قەڵا کۆڵانەکانی بەرامبەر (باتا)، نزیک مزگەوتی پاشا. سەرەتای دروستکردنی بۆ سەرەتای سەدەی بیستەم دەگەڕێتەوە، لەسەر بڕیاری خوالێخۆشبوو شێخ عارف شێخ محەمەد شێخ عوسمان دەست بەدروستکردنی کراوە. لەو کاتەوە ئەم تەکیەیە لەسەر ڕێبازی قادری ڕێنمایی خەڵکی دەکات.

**چالاکییەکانی ئەم تەکیەیە:**

ا- وتارو ئامۆژگاریکردنی خەڵک لەسەر ڕێبازی قادری.
ب- زیندووکردنەوەی شەوە پیرۆزەکان.
پ- سەردانی کردنی دۆستانیان.
ت- پەیوەندی لەگەڵ تەکیەکانی تری ئەم شارە.
ج- نوێژو زیکرو خەتمەو مەولود خوێندنەوە.

**٨- تەکیەی شێخ محەمەد محەمەد ئەمین خەیلانی**

ئەم تەکیەیە کەوتۆتە گەڕەکی خانزاد (بەستە پیازە). سەرەتای دروست کردنی بۆ ساڵی ١٩٦٣ دەگەڕێتەوە، لەسەر بڕیاری شێخ محەمەد و یارمەتیدانی خێرخوازان ئەم تەکیەیە هاتە کایەوە. لەسەر ڕێبازی قادری ڕێنمایی خەڵک دەکەن.

**چالاکییەکانی**

ا- نوێژو زیکرو حەلقەی خەتمی شەوان بە بەردەوام.
ب- وتارو ئامۆژگاری و ڕێگەپێشاندان و تەراویح لەمانگی رەمەزان.
پ- ئاهەنگ گێڕان لەشەوە پیرۆزەکانی ساڵ.

**٩- تەکیەی شێخ کاکە**

ئەم تەکیەیە کەوتۆتە گەڕەکی ئازادی. نزیک وەزارەتی ناوخۆی هەرێمی کوردستان. سەرەتای دروستکردنی دەگەڕێتەوە بۆ سالّی ١٩٦٨. بەبڕیاری شێخ کاکە شێخ عەبدولکەریم دارەخورما دروستکراوە. شێخ کاکە ناوی خۆی "شێخ مستەفا"یە بەلاّم لەبەر خۆشەویستی لەمندالّییەوە هەر بە"کاکە" بانگیان کردووە، بۆیە بۆتە "شێخ کاکە".

ئەم تەکیەیە خاوەن دەروێش و موریدو دۆستە. لەسەر رێبازی تەریقەتی قادری رێنمایی خەڵک دەکات.

**١٠- تەکیەی شێخ جەعفەر بەرزنجی**

ئەم تەکیەیە کەوتۆتە ناو خانووەکانی مەحەتە نزیک باخچەی گشتی گلکەند بەرامبەر گۆڕستانی شێخ محەمەد خۆراسانی. سەرەتای دروستکردنی بۆ سالّی ١٩٧٦ دەگەڕێتەوە،کاتی خۆی لەسەر بڕیاری خوالێخۆشبوو شێخ محێدین شێخ عەبدولکەریم شێخ ئەحمەد شێخ عەبدولکەریم قوتب، شێخ حەسەن گلەزەردە، کە لەسەیدەکانی بەرزنجەیە و باوکی شێخ جەعفەرە، دروست کراوە. لەسەر رێبازی قادری ئیرشادی خەڵکیان کردووە.

**١١- مزگەوت و تەکیەی سەید مەحمود**

ئەم تەکیەیە کەوتۆتە گەڕەکی موفتی نزیک خانەقای شێخ عەبدوڵلای خەلان. لەسالّی ١٩٧٦ لەلایەن سەید مەحمود قادری دروستکراوە. خێرخوازانیش رۆڵیان لەدروستکردنی هەبووە. ئەم تەکیەیە تارادەیەک نواندنی کارو چالاکییەکانی سست بووەو راوەستاوە لەچاو جاران.

**١٢- تەکیەی شێخ عوبێدی نعێمی**

ئەم تەکیەیە کەوتۆتە گەڕەکی کوران، لەکۆڵانێک بەرامبەر مزگەوتی حاجی عەزیز. سەرەتا لەسالّی ١٩٧٧ خوالێخۆشبوو شێخ عوبێد شێخ محەمەد نعێمی بەیارمەتی موریدو دەروێش و خێرخوازان بڕیاری دروستکردنی دا.

شێوەی تەریقەت لەم تەکیەیە بەم شێوەیە بووە:

ا- بەخشینی تەریقەتی قادری.

ب- بەخشینی تەریقەتی روفاعی.

ت- بەخشینی تەریقەتی کەسنەزانی.

**١٣- تەکیەی شێخ ئەحمەد شێخ محەمەد ئەمین خەیلانی بەرزنجی**

ئەم تەکیەیە کەوتۆتە گەڕەکی شۆڕش، نزیک مزگەوتی عەلائەدین سوجادی و مزگەوتی شێخ ئەحمەدی خەیلانیی بەرزنجی. لەسالّی ١٩٧٨ لەسەر بڕیاری شێخ ئەحمەد دەست بەدروستکردنی کراوە.

ئەم تەکیەیە وەکو تەکیەکانی دیکەی ناو شار، چالاکی دەنوێنێ و لەسەر تەریقەتی قادری ئامۆژگاری و رێنمایی خەڵک دەکات.

**١٤- مزگەوت و تەکیەی قادری**

ئەم تەکیەیە کەوتۆتە گەڕەکی ٩٢ نزیک قەریەی زانکۆ. لەسالّی ١٩٧٩ لەسەر ئەرکی کاک شێخ جەواد شێخ جەلال شێخ نەجمەدین بەرزنجی دەست بەدروستکردنی کراوە. لەسەر رێبازی قادری ئیرشادی خەڵک دەکات. دەروێش و موریدو دۆستەکانی تەکیە چالاکیەکان بەشێوەیەکی گشتی ئەنجام دەدەن.

**١٥- مزگەوت و تەکیەی شێخ مارف (الا الله)ی بەرزنجی**

ئەم تەکیەیە کەوتۆتە سەر شەقامی ١٠٠ مەتری لەگەڕەکی باداوە نزیک رێگای بنەسلاوە. لەسالّی ١٩٨٠ لەسەر ئەرکی شێخ (مارف الا الله) کە ناوی شێخ عومەر شێخ تاهیر شێخ عەبدوڵلا شێخ محەمەد نەقشبەندی بەرزنجییە، کە بەرەگەز لەسەیدەکانی بەرزنجەن دروست کراوە. بەلاّم بەشێخ مارف ناوبانگی دەرکردووە. (ئیللا الله) ناوی گوندێکە سەر بەشارۆچکەی کۆیەیە.

تائێستاشی لەگەڵدا بێت موریدو دەروێش و دۆستی ئەو بنەماڵەیە هاتوچۆی تەکیە دەکەن.

**١٦- مزگەوت و تەکیەی شێخ حەسەن خەیلانی بەرزنجی**

ئەم تەکیەیە کەوتۆتە گەڕەکی باداوە، نزیک نزگەوتی حاجی باقی، لەسالّی ١٩٨٠ لەسەر بڕیاری شێخ حەسەن شێخ محەمەد ئەمین خەیلانی بەرزنجی دەست بەدروستکردنی کراوە.

ئەم تەکیەیە خاوەن موریدو دەروێشە. وەکو پێویست بەئەرکی خۆی هەستاوە لەیادکردنەوەی بۆنە ئایینیەکان و زیکرو نوێژدا.

**١٧- مزگەوت و تەكیەی شێخ محەمەد شێخ سەلام**

ئەم تەكیـەیە كـەوتۆتە گـەڕەكی سـەلاحـەدین نـزیك زراریەكـان. لەسـاڵی ١٩٨٠ دروست كـراوە. لەسـەر تەریقەتی قادری ڕێنمایی خەڵك دەكات. خاوەن دۆست و موریدو دەروێشی زۆرە.

**١٨- تەكیەی شێخ محیدین**

ئەم تەكیـەیە كـەوتۆتە گـەڕەكی تەیراوە. نێـوان هەردوو شەقامی (٦٠-٣٠) مەتری كۆڵانەكانی بەرامبەر مزگەوتی حەیدەر ئاغـا. لەسـاڵی ١٩٨٣ سـەید مـحـێـدین سـەید عـەبدولجەبار سـەید ئیبـراهیم روفـاعی دروسـتی كـردووە. بەشێك لەنواندنی چالاكییەكانی ئەو تەكیەیە:

ا- وتارو ئامۆژگاری و زیكرو تەهلیلەو خەتمە.

ب- ئاهەنگ گێران بەبۆنە پیرۆزەكانی ساڵ.

پ- كردنەوەی خولی فێركردنی قورئانی پیرۆز بۆ ژن و پیاو.

ت- بەخـشـینی تەریقـەتی روفـاعی و ڕێنمـاییكردن لەسەری.

ج- سەردانی موریدو دۆست و دەروێشەكانیان.

**١٩- تەكیەی شێخ جەلال بەرزنجی**

ئەم تەكیەیە كەوتۆتە گەڕەكی تەعجیـل، نزیك مزگەوتی موفـتی. لەساڵی ١٩٨٥ لەسەر بڕیاری سەید جەلال سەید نەجـمـەدین بەرزنجی و یارمـەتیـدانی خـێـرخـوازان دروست كـراوە. شـایانی ئامـاژە پێكردنە كـاتی خـۆی ئەم تەكـیـەیە لەسەر خواستی شێخ ئیبراهیم قادر كەرەم دروستكراوە. لەسەر ڕێبازی قادری ئیرشادو ڕێنمایی خەڵكی دەكەن.

**٢٠- مزگەوت و تەكیەی شێخ عەبدولخالق تەلەعفەری**

ئەم تەكیـەیە كەوتۆتە گـەڕەكی راپەڕین نێوان مزگـەوتی عومەر بن خەتاب و تەكیەی مەلا عیرفان. لەساڵی ١٩٧٨ لەسـەر بڕیاری شـێخ عـەبدولخالق شـێخ عـەبدولكەریم مـەلا خدرو یارمەتیدانی خێرخوازان دروست كراوە.

ئەم تەكیـەیە لەسـەر ڕێبـازی قـادری ڕێنمـایی خـەڵك دەكات.

**بەشێك لەچالاكییەكانی:**

ا- نوێژكردن.

ب- بەستنی كۆڕو زیكرو قیامی شەوانی هەینی.

پ- وتارو ئامـۆژگـاری و تەسـبـیـحـات بەتایبـەتی لەمانگی ڕەمەزان.

ت- ئاهەنگ گـێـران بەبۆنە ئاینیـیـەكـان (شـەوی لەدایكبوونی پێغەمبەر "د.خ"، شەوی لەیلەتولقەدر، شـەوی ئیـسـراو مـیـعـراج) لەهەمـان كـاتدا بەیەكێ لەتەكیە پوختەكانی شاری هەولێر لەقەڵەم دەدرێت.

**٢١- تەكیەی سەید قادری نۆغەرانی بەرزنجی**

ئەم تەكـیەیە كـەوتۆتە گەڕەكی نەورۆز نزیك مزگـەوتی شـەهـیـد عـەبدولخـالیق سـەید حوسـێن، بەرامبـەر ڕێگای موسڵ. لەسـاڵی ١٩٩١ لەسـەر بڕیاری سـەید قـادر سـەید ئەحـمـەد سـەید قـادر بەرزنجی دەست بەدروسـتكردنی كـراو خێـرخوازان و دەروێش و موریدەكـانیش دەسـتێكی باڵایان هەبووە لەتەواوكـردنی تەكـیـەكـە. موریدو دەروێشـەكـانی لێكۆدەبنەوە. لەسـەر ڕێبـازی قـادری ئیـرشـادو ڕێنمـایی خەڵك دەكات. نوێژو زیكرو ئامۆژگاری و ڕێنمایی موریدو دەروێش و خەڵكی تێیدا دەكرێت.

**٢٢- مزگەوت و تەكیەی مەلا عیرفان**

ئەم تەكـیـەیە كـەوتۆتە گـەڕەكی راپەڕین نـزیك تەكـیـەی شـێخ عـەبدولخـالیق شـێخ عـەبدولكەریمی تەلەعـفـەری. لەسـاڵی ١٩٩٦ لەلایەن مـەلا عـیـرفـان و خـێـرخـوازان و دەروێش و موریدی ئەو تەكیەیە دەست بەدروستكردنی كرا.

مـەلا عـیـرفـان كـوڕی مـەلا عـەبدولڕەحـمـان كـوڕی مـەلا ڕەسـول ئەفـەندی گـراوە. ئەم تەكـیـەیە لەسـەر شـێـوەی نوێ دروست كراوە. بەشێك لەچالاكییەكانی ئەم تەكیەیە:

ا- خەتمەی ڕۆژانی هەینی.

ب- زیكرو تەهلیلەی پاش نوێژی عیشا.

پ- ئاهەنگ گێران لەبۆنە پیرۆزەكان.

ت- وەعزو ئیرشادو تەراویح لەمانگی ڕەمەزان.

ج- دوعا نووسین بۆ نەخۆش.

چ- نوێژكردن.

ئەم تەكـیـەیە لەسـەر تەریقـەتی قـادری ڕێنمـایی خـەڵك دەكات، كەكـاتی خۆی مۆڵەتیان لەسەید عـەلی سـەید جەواد سـەید ڕەشـیـد وەرگـرتووە. ئەم تەكـیـەیە خـاوەن دەروێش و موریدێكی زۆرە.

**٢٣- تەكیەی كاك مەلای مشار**

ئەم تەكـیـەیە كـەوتۆتە گـەڕەكی كـوران. كـۆڵانەكـانی بەرامبـەر مزگـەوتی حـاجی عـەزیز پیرداود، نزیك ڕێگای

مەخمور. لەساڵی ١٩٩٧ کە هاوکاتە لەگەڵ یادی لەدایکبوونی پێغەمبەر(د.خ)،( ١٢ی رەبیعی یەکەم ١٤١٨ک) دەست بەدروستکردنی کرا، ئەم تەکیەیە لەسەر بڕیاری کاک عەبدولکەریم کوڕی گەورەی کاک مەلای مشار دروست کرا. دۆستەکانیشیان دەستێکی باڵایان هەبووە لەتەواوکردنی. خوالێخۆشبوو مەلای مشار ناوی تەواوی (شێخ یوسف شێخ سلێمان شێخ عەبدوڵلا) بوو. ئەم بنەماڵەیە لەسەر رێبازی قادری رێنمایی خەڵک دەکەن.

**بەشێک لەچالاکییەکانی ئەم تەکیەیە:**

ا- زیکرو ئیرشادی خەڵکیان کردووە، بەڵام زەرگ لێدانیان نییە.
ب- موریدەکان زۆر بەگەرمی هاتوچۆی دەکەن.
پ- ئاهەنگ گێڕان لەبۆنە پیرۆزەکان.
ت- ئاشتکردنەوەو ناوبژیکردنی خەڵک.
ج- وتارو رێگە پیشاندان و مەولود خوێندنەوە.
چ- خەڵکێکی زۆر هاموشۆی تەکیە دەکات.

**٢٤- تەکیەی شێخ ئەحمەدی زیخان**

ئەم تەکیەیە کەوتۆتە گەڕەکی برایەتی، پشت مزگەوتی شێخ محیدین شێخ سالح بەرزنجی. سەرەتای دروستکردنی بۆ سەرەتای سەدەی بیستەم دەگەڕێتەوە. خوالێخۆشبوو شێخ مەلا حەمەد ئەمین شێخ مەلا یاسینی زیخان دروستیکرد.

ئەم تەکیەیە رۆڵی بەرچاوو دیاری لەئیرشادو رێنماییکردنی خەڵک هەیە.

**٢٥- تەکیەی شێخ نورەدین بەرزنجی**

ئەم تەکیەیە کەوتۆتە گەڕەکی نەوروز. بۆ یەکەم جار لەساڵی ١٩٩٤ دامەزراوە. ئەم تەکیەیە رێبازی (مەرسی) پیادە دەکات. ئەم رێبازە نەقادرییە نە نەقشبەندی، بەڵکو رێبازێکە لەباپیرە گەورەیەوە (شێخ حەسەن گڵەزەردە) دەست بەدەست ماوەتەوە.

**لەچالاکییەکانی ئەم تەکیەیە:**

ا- زیکرو تەهلیلەی شەوانی هەینی و شەوە پیرۆزەکان.
ب- بەسەرکردنەوەی موریدو دەروێشەکان.
پ- وەعزو ئیرشادو رێباز بەخشین بەوانەی مەبەستیانە.
ت- دوعاگۆیی بۆ نەخۆش و خەڵکی.

**بەشی دووەم: (خانەقاکانی شاری هەولێر)**

**١- خانەقای شێخ رەشیدی لۆلان**

ئەم خانەقایە کەوتۆتە گەڕەکی ئازادی نزیک مزگەوتی (خورشید عالم). شێخ رەشید لەسەر تەریقەتی نەقشبەندییەو وەرگرتنی تەریقەتی دەگەڕێتەوە بۆ پێش سەدەی بیستەم.

**٢- خانەقای شێخ سەید عەبدولقادری حوسێنی نەقشبەندی خەلان.**

ئەم خانەقایە کەوتۆتە گەڕەکی موفتی نزیک مزگەوتی حاجی جەمال بەزاز بەرامبەر خانەقای شێخ سەید عەبدوڵلای خەلانی برای. سەرەتای دروستکردنی لەشاری هەولێر بۆ سەرەتای ساڵانی شەستەکان دەگەڕێتەوە. ئەم بنەماڵەیە بڵاوکردنەوەی رێبازی نەقشبەندی ئاوات و ئامانجیان بووە. ئەم خانەقایە رۆژانە سەدان کەس رووی تێدەکات و سەردانی ئەو بنەماڵەیە دەکەن.

**٣- خانەقای شێخ عەبدوڵلای خەلان**

ئەم خانەقایە کەوتۆتە گەڕەکی موفتی نزیک مزگەوتی حاجی جەمال بەزاز، لەساڵی ١٩٨٦ لەسەر بڕیاری شێخ عەبدوڵلای شێخ عەلائەدین زینوێ دروست کراوە.

بەشێوەیەکی گشتی ئەم خانەقایە رۆڵی دیارو بەرچاوی لەناو دۆستان و موریدەکانی هەیە.

**هەندێک لەچالاکییەکانی ئەم خانەقایە:**

ا- زیکرو تەهلیلە، شەوانی دووشەممە و پێنج شەممە.
ب- یادکردنەوەی یادەو بۆنە پیرۆزەکانی ساڵ.
پ- نوێژو تەراویح و وتاری شەوانی مانگی رەمەزان.
ت- نووسینەوەی دوعا بۆ نەخۆش.
ج- سەردانی نەخۆش و موریدە پەککەوتووەکانی خانەقا.

**سەرچاوەکان:**

١- گەشتێک بەناو مزگەوت و تەکیەکانی شاری هەولێر، عومەر شێخ لەتیف بەرزنجی- لەبڵاوکراوەکانی وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئاینی حکومەتی هەرێمی کوردستان ل٢٥٧- ٢٠٠٤.
٢- گۆڤاری خۆری ئیسلام ژمارە (٢٨) ساڵی حەوتەم- جەمادی یەکەم ١٤٢٦ک ل٥٤. عیرفان و تەسەوف ، مورتەزا موتەههەری. و: کەریم سۆفی.



# چۆنیەتی دروستکردنی قەیسەریی هەولێر

یوسف نانەکەلی

(دەباغەکان) لە بنەماڵە کۆن و بەرەچەڵەکەکانی شاری هەولێرن، کە شوێنێکی دیار و بەرچاویان هەبووە لە مێژووی نوێی ئەو شارەدا، دکتۆر عەبدولڕەزاق دەباغ، کە یەکێکە لە وەچەی ئەو بنەماڵەیە، دەربارەی دەباغەکان دەڵێت: جاران بە (دەباغەکان)یان دەگوت (چەلەبی)، ئەو چەلەبییانە وەک باپیرە گەورەمان گێڕاویەتییەوە لە تومە و بالیسانەوە هاتوونەتە هەولێر. ٣٠٠ ساڵ بەر لە ئەمڕۆ باپیرە گەورەمان کە ناوی (پیرەبەگ) بووە، هاتووە لە هەولێر نیشتەجێ بووە.

بەڵام بۆ وشەی (دەباغ) دەڵێن، کاتی خۆی بنەماڵەکەی ئێمە کارگەیەکی پێستەیان لە نزیکی شێخی چۆلی ئێستاکەدا هەبوو، لەو کارگەیەدا بازرگانی خوری و پێستەیان دەکرد، زۆر پێستە و سوفی کوردستانیان لە خەڵکی ئەو دەڤەرە دەکڕی و دەیانبردە بەسرە و ئەوروپا، بۆیە بە (دەباغ) ناوزەد کران.

هەر د.عەبدولڕەزاق دەگێڕێتەوە، دەڵێت: بەر لە بەرپابوونی جەنگی یەکەمی جیهانی، لە سەردەمی عوسمانیدا، کاتآ مامەکانم (حاجی ساڵح) و (حاجی مەحموود) دەچنە حەجآ لە ڕێگادا بە شاری دیمەشقی سوریادا

دەگەڕێنەوە بازاڕی (حەمیدیە) دەبینن، کە بازاڕێکی بازرگانی ڕێکوپێک بووە لەسەر شێوەی خانی جزیری دروست کرابوون، زۆر بەو بازاڕە سەرسام دەبن، بۆیە کە دەگەڕێنەوە هەولێر بازاڕی قەیسەری لەسەر هەمان شێوازی بازاڕی حەمیدیەی سوری دروست دەکەن، ئەو بازاڕە سەروبانێکی تۆکمە و پتەوی هەبووە، گەلێک بە سوود بووە بۆ پاراستنی ئەو دوکانانە لە باو بۆران و باران و سەرما و گەرما، هەتا ئێستاکەش ئەو بازاڕە قەیسەرییانە لە هەولێر هەر ماون، کە وێڕای ئەوەی سەنتەرێکی بازرگانییە، لە هەمان کاتیشدا شوێنەوارێکی بە پێز و مێژوویی ئەو شارەشە.

**ئێمە کارەبامان هێنایە هەولێر**

بێجگە لەو بازاڕە، بنەماڵەکەی ئێمە بایەخێکی زۆریان بە لایەنی ئایینی و لایەنی بازرگانی و پیشەسازی ئەو شارە داوە، بۆ نموونە باپیرم مزگەوتی (حاجی قادر)ی دروستکردووە، کە کەوتۆتە دەروازەی بازاڕی شار، مامم (حاجی سالح) مزگەوتی (قیبلە خوار)ی دروستکردووە، هەروەها (فەتاح چەلەبی) مامیشم مزگەوتێکی لە گەڕەکی تەیراوە دروستکردووە.

(ئەحمەد چەلەبی)یش یەکێکە لە پیاوە ناودارەکانی شاری هەولێر ئامۆزامە، یەکەم کەس بووە کە ساڵی ۱۹۳۱ کارەبای هێناوەتە هەولێر و یەکەم کەسیش بووە، کە ئاشی ئاگری بۆ لێکردنی باراش لە هەولێر دامەزراندووە، بە تێکڕایی ئەو بنەماڵەیە خاوەن زەوی و زارێکی زۆری کشتوکاڵی بوون، لە هەمان کاتیشدا عەقڵییەتێکی بازرگانی باشیان هەبووە، لایەنی ئایینیش لایەنێکی گرنگی بایەخ پێدانی ئەوان بووە، بۆیە بە باوکمیان دەگوت مەلا شەهاب.

باوکم کە تەمەنی لە نەوەد ساڵی تێپەڕاندووە، هەموو تەمەنی لە شاری هەولێر بەسەر بردووە، هەرسێ زمانی تورکی و کوردی و فارسی بەباشی دەزانی. شەش برای هەبووە: برای گەورەی (حاجی شەریف) بوو، کە بە پیاوێکی ئایینپەروەر و چاکەخواز ناسرابوو، ئەوانی دیکە زۆربەیان خوودوی خۆیان دابووە سەر بازرگانی و کاسبی.

**کورد و تورکمان یەک پارچە بوون**

*** پەیوەندی ئەوسای کورد و تورکمان چۆن بوو؟**

- لەبەر ئەوەی کورد و تورکمان، تەمەنیان لە یەک پارچەی جوگرافی بەسەربردووە، ئاوێتەی یەکتر بوون، لە خۆشی و ناخۆشیدا، بەدرێژایی مێژوویەکی دوورودرێژ هاوشان بوون، بۆیە هەمیشە برا و دۆست و خۆشەویستی یەکتر بوون، بەڵگەش بۆ ئەوە زۆربەی هەرە زۆری تورکمانەکان تەنیا کەمێکیان نەبێت، ئەوانی دیکە هەموو کوردی دەزانن، وەک کوردەکانیش زۆربەیان تورکی دەزانن.

من بەبیرم دێ خوالێخۆشبوو (عەونی یوسف) لە سەردەمی ئێمەدا هوشیارییەکی زۆری لە



نێـــوانماندا بڵاودەکــــردەوە بۆ بڵاوکردنەوەی زمانی کوردی لەنێو تورکمانەکاندا، هەرچەندە ئەو لە ماڵی خۆیدا بە تورکی قسەی دەکرد.

لە سەردەمی پاشایەتیدا لە چلەکان (عەونی یوسف) کاتێ کە قوتابی سانەوی بوو لەسەر ئەو پرسانە دەستگیرکرا، بەڵام قوتابییە هەڤاڵەکانی خۆنیشاندانێکیان سازدا و داوای ئەوەیان کرد، یا ئەوانیش دەستگیر بکرێن، یان ئەو ئازاد بکرێت.

بە کورتی پەیوەندی کۆمەڵایەتی لەنێوان کورد و تورکماندا پەیوەندییەکی تۆکمەدار و پتەو بووە، بەتێکڕایی خزمی یەکتر بوون و یەک دابونەریت و واقیعیان هەبووە، بۆیە بە درێژایی مێژوو درزێک نەکەوتۆتە نێوان ئەو پەیوەندییە.

*** ئەگەر بکرێت کورتەیەک لە لاپەڕەی ژیانی خۆتمان بۆ باس بکەیت؟**

- من (عەبدولڕەزاق شەهابەدین عەبدولقادر دەباغ)م، لە ١٩٣٢/١١/١ لە هەولێر لەدایک بووم، باوکم سێ ژنی هێناوە، یەکەمیان بە جحێڵی ماڵئاوایی لە دنیادا کردووە، دووەمیان بەس یەک کچی هەبووە، کە ئەویش دایکی شەهید مەئمون دەباغ و خوالێخۆشبوو عەبدولباقی بووە، سێیەمیان دایکی منە، کە سێ کوڕی هەبوود: گەورەکەیان، (محەمەد شەهاب دەباغ)ە، کە ماوەیەک سەرۆکی شارەوانی هەولێر بووە، ئێستا پارێزەرە.

دووەمیان، عەبدولقادرە، کە بە منداڵی وەفاتی کردووە، سێیەمیان من بووم، بێجگە لە ئێمە باوکم لەو ژنە چوار کچیشی بووە کە شوکر بۆ خوا هەموویان ماون.

*** لە سەردەمی منداڵیتدا هەولێرت چۆن دەبینی؟**

- هەولێری منداڵی من بریتی بوو لە قەڵات و خانەقا و تەعجیل و گەڕەکی عەرەبان، گەڕەکی تەیراوەش تازە دوو سێ خانووی لێ دروستکرابوو.

ئەو کاتەی من چوومە قوتابخانە، سێ قوتابخانەی سەرەتایی هەبوو: ئەربیل ئوولا، ئەربیل (ثانیة)، ئەربیل (ثالثة)، من لە ئەربیل (ثانیة) دەمخوێند.

هەولێر ساڵی ١٩٥٠ لە پەنجا هەزار کەس کەمتر بوو کەس منداڵی خۆی نەدەنارده قوتابخانە، لەبەر هەژاری و نەداری و لاوازی باری ئابووری، لە هەموو هەولێریش تەنیا سانەوییەک و یەک قوتابخانەی کچان هەبوو.

*** لە کەیەوە دەستت بە خوێندنەوە کرد؟**

- من لە قۆناغی سەرەتاییدا خوێندنەوەم هەبوو، زۆر گۆڤاری میسری منداڵانم دەخوێندەوە، لەوانەش گۆڤاری (طالب) لە میسر دەردەچوو، کە گەیشتمە قۆناغی دواناوەندی هوشیاریم زۆرتر بوو، خەونم بەوە دەبینی، کە ڕۆژێک لە ڕۆژان ببمە دکتۆر چونکە ئەوکاتە خەڵکی زۆر بە بەرزی دەیانڕوانییە پلە و پایەی دکتۆر، ئەوەبوو دوای تەواوکردنی خوێندنی دواناوەندی چوومە کۆلیژی پزیشکی بەغدا و ساڵی ١٩٥٦، کۆلیژم تەواوکرد و بووم بە دکتۆر، ئینجا ساڵی ١٩٥٧ بووم بە ئەفسەری (احتیاط)، ساڵی ١٩٥٩یش دوای ڕووداوەکانی کەرکووک، هەتا ساڵی ١٩٦١ هەر لەوێ مامەوە، دواتر هاتمە هەولێر و ساڵی ١٩٦٢ هەلێکم بۆ ڕەخسا لەسەر مەسرەفی خۆم چوومە ئینگلتەرا و لەوێ سێ ساڵ مامەوە، ماوەیەکیش لە برستیل لە (کینت) کاری دکتۆریم کردووە، ئیدی دوای ئەوە گەڕامەوە هەولێر.

*** ئەگەر بەبیرتان بێت یەکەم پۆستی دکتۆرەکانی هەولێر کێ بوون؟**

- یەکەم دکتۆری هەولێری (ئیحسان دۆغرەمەچی) کوڕی عەلی پاشای دۆغرەمەچی، کە لە تورکیا دەرچوو بوو، پاشان چووە ئەمریکا و پسپۆڕی لە نەخۆشی منداڵان هەبوو، هەر ئەویش زانکۆی (حاجی تەپە)ی لە تورکیا دروستکرد.



# تەمەنی قەیسەریی هەولێر (١٥٦) ساڵە

**بۆتان جەلال**

ناکرێ باس لە مێژووی شاری هەولێر بکرێت و ئاماژە بە قەڵا و منارە و قەیسەرییەکەی نەدرێت، (قەیسەری) هەولێر وەک زۆربەی ژێدەرە مێژوویییەکان روونیان کردۆتەوە، دروستکردنی بۆ (١٥٦) ساڵ بەر لەئەمرۆ دەگەڕێتەوە، جاران بەر لەدروستکردنی ئەو قەیسەرییە، بازاڕی ئەو شارە بریتی بووە لە چەند دوکانێکی لەقوڕو کاریتە دروستکراوی پەرش و بڵاو، دواتر قەیسەری لەلایەن (حاجی قادر حاجی مەحموود ئەحمەد چەلەبی)یەوە، کە بە (دەباغ) ناسراون بنیادنراوە.

حاجی قادر یەکێک بووە لە پیاوماقووڵان و خانەدان و دەست ڕۆیشتووانی شاری هەولێر، کاتێ بڕیاری دامەزراندنی قەیسەری دەدات، چەند وەستایەکی زانا لە بەغدا و موسڵ و هەولێر کۆدەکاتەوە و لە موسڵ کەرستەی بیناکەی بە تایبەتیش بەردی مەڕمەڕ دەهێنێت، قەیسەری هەولێر لەدوو بەش پێکهاتووە و بە (٦) ساڵ تەواو بووە، بەشی یەکەم کە پێی دەگوترێت (قەیسەری گەورە)، ئەوی دیکەشیان پێی دەڵێن (قەیسەری بچووک). هەر یەک لەو دوو قەیسەرییانە لە سێ نهۆم پێکهاتوون، نهۆمی یەکەم (ژێر زەمین)ە، نهۆمی دووەم دوکان و نهۆمی سێیەمیش کۆشک بووە، جاران ئەو قەیسەرییانە وەک بازاڕێکی گەورەی کەلوپەل دروستکردن و فرۆشتن و مەڵبەندێکی بازرگانی سەرەکی شاری هەولێر بووە، خەڵکی هەولێر و دەوروبەری و شارەکانی دیکەی کوردستان و عێراق ڕوویان تێکردووە و مامەڵەی بازرگانییان تێیدا کردووە، خەڵکەکەی ئەو کاتی کۆنە هەولێر لەدوو جۆر پێکهاتبوون، هەندێ خاوەن دوکان و بازرگانەکان جوولەکە بوون، جۆرەکەی دیکەیان موسڵمان بوون، پەیوەندی نێوانیان زۆر خۆش بووە، پێکەوە مامەڵەی بازرگانییان ئەنجام داوەو ژیانی تەبایییان گوزەراندووە، وەک کە باسیشی لێ دەکرێ ئەو دوو قەیسەرییانە چەند دەرگایەکی سەرەکییان هەبووە، بازاڕی قەیسەری گەورە (٧) دەرکەی هەیە، قەیسەری بچووکیش (٩) دەرکەی هەیە، ئەو کات بەیانیان لەگەڵ ڕۆژهەڵات پاسەوانەکان ئەو دەرگایانەیان دەخستە سەرپشت و دوای عەسریش دادەخران، دەبوایە چۆڵ بکرێن.

بازاڕی قەیسەری هەولێر هاوتەریب لەگەڵ مێژووی ئەو

شارە، پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و بازرگانی بەخۆیەوە بینیوە، تا ئەمڕۆکەشی لەگەڵدابێت شوێنێکی گرنگی بازرگانی هەولێرە، سەبارەت بە دیدو بۆچوونی ئەو هاوولاتیانەی، کە ساڵانێکی زۆرە لەو بازاڕەدا کاسبی دەکەن و ژیان دەبەنە سەر، هەندێک چاوپێکەوتنمان لەگەڵیاندا سازداوە بۆ ئەوەی زیاتر وەک شاهیدێکی زیندووی مێژوویی ئەو قەیسەرییانە تۆمار بکرێن.

سەرەتا (مستەفا محەمەد قادر)، کە نزیکەی (٧٠) ساڵە لە دوکانەکەی خۆیدا لە قەیسەری خەریکی دارتاشییە، قسەی بۆ کردین و گوتی: باپیرە گەورەم، کە ناوی (یونس مەکینەچی خەیات) بوو بۆی دەگێڕاینەوە و دەیوت: جاران خەڵکی هەولێر هەمووی لە قەڵات دادەنیشتن، کە بۆ ئیش و کارێک دەهاتنە خوارێ بە پێش دوکانەکەی من دەچوونە قەیسەری، کە ڕێگاکەی بەردڕێژ بوو، لەوێ پێداویستییەکانی خۆیان دەکڕی، هەموو لەدەوروبەری هەولێر و جێگای دووریش دەهاتنە هەولێرێ و لەو قەیسەرییە شەکرو چاو قوماش و جغاردو نەوت و گۆشت و پێداویستی کشتوکاڵیان دەکڕی و ئێوارێ دەگەڕانەوە، ئەگەر فریای گەڕانەوەش نەکەوتبانایە ئەوە لەنهۆمی سێیەمی قەیسەری کۆشک و خان بوو، لەوێ لەجیاتی ئوتێل شەویان دەبردە سەرو بەیانی لەگەڵ ڕۆژهەڵات بەڕێ دەکەوتن.

کاک مستەفا لەدرێژەی قسەکانیدا دەڵێ: من بەر لە (٦٠) ساڵ لەو دوکانە کەلوپەلی کشتوکاڵیم دروست دەکرد، وەک: (جەنجەڕ، شەغرە، هەوجاڕ، داس)، هەندێ جار دەچووینە چیا لەناوچەی دۆڵی بالیسان و دۆڵی خانەقا دارگوێزمان دەبڕییەوە و کەرت کەرتمان دەکرد و بەوڵاخ دەمانگواستەوە هەولێر، لێرە سەندووق و کەنتۆر و کورسی و دەرگاو پەنجەرەمان لێی دروست دەکرد، جارانیش لە هەولێر چەند کەسێکی بازرگانی دەوڵەمەند هەبوون دەستیان بەسەر بازاڕدا گرتبوو، لەوانەش: (نەسیم سامۆن ردێن سۆر) و (عەزرا). ئەوانە جوولەکە بوون، هەروەها (حاجی قەرۆک)یش موسڵمان بوو. ئەوانە بازرگانییان لەگەڵ شارەکان و هەتا وڵاتانی دەرەوەی کوردستانیش دەکرد. باری کۆمەڵایەتی جارانی قەیسەری زۆر بەهێز بوو، خەڵکەکە ڕێزی یەکتریان دەگرت، وەفا هەبوو، کەس فێڵی لەوی تری نەدەکرد، یەکێک لێی بقەومابایە بە هەموویان دەستی یارمەتیان بۆی درێژ دەکرد..

لەناو بەرگ دوورەکانی قەیسەری (باوکی هۆگر)، کە (٤٤) ساڵی ڕەبەقە لەو قەیسەرییەدا ئەوکارە دەکات، بۆمان دواو وتی: کاتی خۆی خەڵکی هەولێر کە پێویستییان بە هەر جل و بەرگێک بوایە دەهاتنە ناو بەرگ دوورەکانی قەیسەری جل و بەرگیان دەکڕی، بەتایبەتیش کورتەکی لۆکە، سوخمەی لۆکە، شەرواڵی دزەییاتی، مرادخانی، مامەش، ساڵحەفەندی، دیموکراتی، باری قەیسەری بێگومان وەکو ئێستاکە نەبوو، خەڵکی لەجیاتی کارەبا فانۆسیان بەکاردەهێنا، خەیاتەکان مەکینەی پێیان هەبوو. لەبیرمە ساڵی ١٩٦٥ لەو دوکانەدا کرێی یەک ساڵی دوکانەکەم (١٢) دینار بوو، لە زەمانی عەبدولکەریم قاسمدا بووە (٦) دینارو لەسەردەمی عەبدولسەلام عارفیش کرێی ساڵانەمان بووە چوار دینارو نیو. بەرگ درووە کۆنەکانی پێش من یان ئەوانەی لەگەڵ من دەستیان بە خەیاتی کردووە لەو قەیسەرییەدا کە ناویانم لەبیر مابێت، ئەوانە بوون: (زیاد مەعروف، نەشئەت حاجی نورەدین، ڕەئوف حاجی شەریف، ڕەئوف موحسین وەلی، مەلا سابیر خەیات، حەمە سوڵتان، سۆفی بەکر، حاجی سەلیم، محەمەد شێخۆ، زەکی خەیات، نورەدین خەیات، جەلیل خەیات، وەستا غولام، کە پیاوێکی عەجەم بوو).

هەر لەمیانی گەشتەکەماندا بەنێو قەیسەری ڕوومان کردە چایخانەکەی مام خەلیل، کە پێی دەگوترێ چایخانەی قەسابان، (مام خەلیل ساڵح حەوێز جامباز) وەک خۆی وتی: (٥٣) ساڵە لەو تاکە چایخانەیەی قەیسەری چا دەفرۆشم، پێش منیش وەستا یونس چایچی ئەو چایخانەیەی بەر لە (٩٠) ساڵ بەڕێوە بردووە، جاران قەسابەکان لێرە دادەنیشتن، چای بە قەندیان دەخواردەوە، لەبیرمە چا بە (٦) فلس بوو، کە باسیش هاتە سەر ساڵی دروستکرنی قەیسەری، مام خەلیل زۆر بەدڵنیاییەوە دووپاتی ڕاستگۆیی مێژووی دروستکردنی قەیسەری کردەوە و گوتی: بەڵێ (١٥٦) ساڵە ئەو قەیسەرییە لەلایەن حاجی قادر چەلەبی دروستکراوە، چونکە مێژووی دروستکردنی لەسەر دیوارێک نووسرابوو، بەڵام لەکاتی نۆژەنکردنەوەیدا دیوارەکەیان ڕووخاند، بەڵام مێژووەکەی لەلای خۆم نووسیومەتەوە، ئێستاش کاک فەرید چەلەبی، کە کوڕی عەبدولخالق چەلەبییە، خاوەن موڵکی ئەو قەیسەرییەیە، هەروەها وتی خاوەن قەیسەرییەکە لەبەر پاراستنی کلتووری ئەو بازاڕە حەزی نەکردووە بازاڕەکە دەستکاری بکات یان بڕووخێنێت و لەشوێنیدا بازاڕی دیکە دروست بکاتەوە، چونکە لایان وایە شاری هەولێر بە کلتوورە ڕەسەنەکەیەوە جوانە و نرخی تایبەتی خۆی هەیە.

*** ئەم بابەتە لە گۆڤاری (بارش). ژمارە (٧) بڵاوکراوەتەوە.**



# بازاڕی قەیسەریی شاری هەولێر

ئاراس ئیسماعیل خدر

سەرەڕای ئەمەی کە مێژوو و شوێنەوارەکان دیاردەی رووکاری شارستانی هەموو نەتەوەیەک دیاردەکات. شارو شارۆچکەکانی کوردستان زەمینەیەکی دەوڵەمەندی ناسنامەی میللەتەکەمانە لەرووی پاشماوە شوێنەوارییەکانی کە تائێستا بە زیندوویی مابێتەوە. کاتێک جوگرافی زانی گەورە (یاقووتی حەمەوی)[1] جۆرە بەراوردێکی لە نێوان جوگرافیای هەولێرو ناوچەی حەلەب لە سوریای کردووە، شاری هەولێر بە باشتر دەزانێت لە رووی جوگرافیایی بازرگانی ناوچەکە دا. چونکە (یاقووتی حەمەوی) ماوەیەکی باش تەمەنی لە حەلەب بەسەر بردووە. دووجاریش سەردانی شاری هەولێری کردووە، کە جارێکیان لە ساڵی (٦١٣ ک / ١٢١٦ ز) بووە، کە لە حەلەبەوە هاتووە بۆ موسل و بۆ هەولێر، دواتر بەرەو خوراسان و خواردزم. جاری دووەمیش لە سالی (٦١٧ ک / ١٢٢٠ ز)، سەردانی ناوچەکە دەکات. مێژوو نووسی هەولێر (ئیبن ئەشعری شاگردی) باسی کردووە، کە(ئیبنی خەلەکان)ی مێژوو نووس، "بازرگانی هەولێری بە ئابووری هەموو حکومەتێکی دەسەڵاتداری داناوە".

بەڵام سەبارەت بە بازرگانی شاری هەولێر قەڵای هەولێر و بازاڕەکەی وەکو خۆی ماوەتەوە، گۆڕانکاریشی بەسەر دانەهاتووە. لە سەردەمەکانی کۆن گۆڕان لە دام و دەزگا ئیدارییەکانیش دروست نەبووە. ئەگەر ئەم هۆکارە نەبووایە ئەوا خانووەکانیش و شوێنەکەشی گۆڕانی بەسەر دا دەهات[2]. چونکە لەسەر رێڕەوەکەیان دەریاچەیەک دروست نەبووە، هەروەها چیاکانی کوردستان دەوری نەداوە، بەڵکو زۆر

دوور بووە. ئەم شـــوێنەش لەبەر ستـراتیـژی ناوچەکە ناو و نازناوی قەڵای هەولێر هەروەکو خۆی ماوەتەوە کە بەدرێژایی رۆژگار مێژووی گرنگی خـۆی هەبووە. شـاری هەولێـر لەسـەردەمی ئەتابەکـدا[٣] شـارێکی تەواو پڕ لە دوکـــان و بـازاڕێکی قەرەباڵغی ئەم سەردەمە بووە، خانووە کـەلەپووری و شـوێنەوارەکـانی ئەم شـارە گەلێک پاشـماوەی مـاوەتەوە، کـە گـرنگتـرینیـان قـەڵای هەولێـر و مـزگـەوتی گـەورەی بازاڕو بازاڕی قەیسـەری و خانووە کەلەپوورییەکانی ســەعــدووناوە و خــانەقــا و تەعـجـیـلن[٤]. هەروەها یەکـەم قـوتابخـانەی زانسـتی لە هەولێـر بووە[٥]. چونکە شـوێنێکی گـرنگی دەسەڵاتدارەکانی ئەو سەردەمە بووە. ئەم شـارە کۆنە لەگـەڵ دروسـتـبوونی پلانی شـارو دانیـشــتـوانەکـەی لە ماوەی دەسەڵاتی هەر فەرمانڕەوایەک سیمایەکی کۆنی شارستانی هەبووە. ئەمـەش بریتین لە پاشـمـاوەکـانی کــۆشک و تەلار و شـــوێنەوار ئاینیـــیەکـان. ئەمـەش وەکـو دیکۆمێنتێک دیارە لە شاری هەولێر کـە مـێـژووی شـارسـتـانی کـۆنی پێوەدیارە[٦].

بازاڕی قـەیســەری نموونەیەکی گرنگ و زیندووی کۆنی ئەم سەردەمە بووە کە تائێسـتـا کاری سەربەخۆیی هاوڵاتیـانی تێـدا ئەنجـام دەدرێت. بڕوانە وێنەی ژمــارە (١)، چونکە یەکــێکە لە دیکۆمـــێنتـــە شـارسـتـانییـەکانی شاری هەولێر، قـەیسـەری گـەورە لە شـاری قـەڵا و منارە تایبەتمەندییەکی بازرگانی خۆی



وێنەی ژمارە (١): بازاڕی قەیسەری لە ساڵی ٢٠٠٧، کە تائێستا کاری بازرگانی هاوڵاتیان تێیدا بەردەوامە.

هەبووە لە سـەردەمی مـزەفـەرەدین گــۆگـــبـــری[١] و ســـەردەمی عوسمانییەکان. بازاڕی قەیسەری لە کۆنەوە تائێستا بە یەکێک لە بنەما بازرگـانیـــیەکـان و ئاڵوگـۆڕکـاری کەلوپەل دەناسرێت. کە مێژوو شایەت حـــاڵی ئەم بازاڕەیە. ئەم بازاڕە لە ناوجەرگەی شاری هەولێردا شوێنێکی ســتـــراتیـژی تایبـەتی خـۆی هەیە، چونکە لە ناوەندی شـارێکی تەمـەن ٧٠٠٠ سـاڵ لەمـەوبەرە[٢] کـە کـۆمـەڵێک لە دەسـەڵاتدارانی وەک سـومـەرییـەکـان و بابلیـیـەکـان و ئاشـــوورییـــەکـــان تا دەگـــاتە فـەرمـانڕەوایی عـوسـمـانییـەکـان پاشـمـاوەی شـوێنەوارەکـان لە شـاری هەولێـر مـاوەتەوە، بەڵام سـەبارەت بەجـوگـرافیـای ناوچەکە دەکـەوێتە باشـووری پارێزگـای دهۆک و بەشی باکـوری شـاری کـەرکـوک و بەشی رۆژهەڵاتی شاری موسڵ[٣].

## پارێزگای هەولێر لەماوەی ساڵانی (١٩٧٥-١٩٨٨)

ناوچەیەکی چوار وەرزی تەواوی هەیە، بە پێی ئەندازەی فـــەلەک

**نەخشەی ژمارە (١)**



**سەرچاوە: ئامادەکراوە بە پشت بەستن بە:-**
**١- ئەمین قادر مینە، ئەمنی ستراتیجی عیراق و سێکوچکەی بەعسیان، تەرحیل- تەعریب، نەخشەکانی ژمارە (١٣ و ١٦ و ١٨).**
**٢- خلیل اسماعیل محمد، مؤشرات سیاسة التعریب والتهجیر في اقلیم کوردستان العراق، خارطة رقم (٥)، ص٢٧**

ناسی. هەروەها ناوچەیەکی کشتوکاڵی زۆری تێدا دەکرێت: هەموو بەروهەمەکانی هەر لەم بازارە دەفرۆشرا. ئەم بازارە بە یەکێک لە تەلاری بازرگانی سێ نهۆمی کەلتووری سەدەی هەژدەهەم و نۆزدەهەم دەژمێردرێت. کە ئەمەش بۆ پێشکەوتنی لایەنی بازرگانی، هەر لە کۆنەوە تاوەکو ئەمڕۆ دەستێکی باڵای هەبووە. ئەم بازارە لە هەموو سەردەمێک ستانداردێکی تایبەتی خۆی هەبووە، لە سەردەمی عوسمانییەکان زۆر گرنگیشیان نەداوە بە بازاڕی قەیسەری. ئەمەش چونکە بۆ ئەوان شوێنێکی ستراتیژی دەسەڵاتی نەبووە. بەڵام زۆربەی بازرگانەکان شوێنێکی تایبەتییان هەبووە سەبارەت بە شوێنی پشوودان لە دەوروبەری قەیسەری کە پێیدەوترا خان (یان دیوەخان) ئەم دیوەخانەی کە هەبووە بەرامبەری مزگەتی قەیسەری ئێستای بووە. کە دەکاتە شوێنی ئێستا بازاڕی سیروان[1]. کە هەموو کاروانچییان لەم شوێنە پشوویان دەدا تا ساڵانی ١٩٥٠-١٩٥١ پاشماوەی ئەم دیوەخانە هەر مابوو.

**بازاڕی قەیسەری:** بازاڕی قەیسەری تاکە بازاڕیکی کۆنی شاری هەولێر بووە. وشەی قەیسەری کە بۆ ئەم بازارە بەکارهاتووە. ناوی قەیسەری بۆ کۆمەڵێک بازاڕی کۆنی شارو دێهاتی تری جیهانی بەکارهاتووە. ناوی قەیسەری لە ناوە راستییەکەیەوە بریتییە لە بازاری کۆنی قەیسەری رۆم لە ئەستانبوڵ. کە ئەم وشەیە دەگەڕێتەوە بۆ ئیمپراتۆر قەیسەر، کە لە شاری قوستەنتەنیە فەمانڕەوایی کردووە. ئەم بازارە ئێستاش پاشماوەکەی ماوەتەوە کە پێی دەڵێن (قپاتلی چارشو)[2]. دواتر عەرەبەکان ئەم وشەیان بەکارهێناوە بۆ بازاڕەکانی خۆیان کە وەکو بازاڕێکی داخراو وابوون. هەروەها یۆنانییەکان ئەم وشەیان بەکارهێناوە بۆ بازاڕەکانی خۆیان کە پێشتر لە هەردووک نەتەوەکەی ترە وا پێشتر ئاماژەمان پێکردووە. هەر بۆیە ئەم ناوە تا ئێستاش بە قەیسەری ناودەبرێت لە شاری هەولێر. قەیسەری لە هەموو وڵاتانی دونیا ئەگەر هەبێت، لە بازاڕێکی داخراو پێک دێت کە بە چەند دووکانێکی دالانێکی درێژ هەیە لە سەر شێوازی کۆلانێکی تەسک لەسەر یەک شێوازی بیناسازی بنیاتنراوە[3]، بڕوانە وێنەی ژمارە (٢)، نەخش و نیگارەکانی بیناسازی قەیسەری لە یەک دەچن وە



**وێنەی ژمارە (٢):**
**بازاڕی قەیسەری لە رووی بیناسازییەوە**

هەروەها لە سەر یەک شێواز و یەک بنەمای کەرەستەی بیناسازی دروست کراون. پێکهاتەی ئەم بازارە بریتییە لە خشت و گڵ و گەچ. لە ناوەڕاستی هەندێک لە بازاڕەکانی قەیسەری لە وڵاتانی عەرەبی گۆڕەپانێکی گەورەی هەیە. ئەمەش بۆ داگرتنی کەلوپەلی بازرگانی و ئاڵوگۆڕکردن بەکارهاتووە. لەم گۆڕەپانە عەمبار دەکرێت. وەلە هەندێک بازاڕی قەیسەری شێوازی جیاوازی هەیە کە بریتین لە ژمارەیەک ژووری بچووک کە بەکارهاتووە بۆ پشوودانی بازرگانەکان یان خاوەن کاڵاکان لەو سەردەمە.

ئەم شێوازەی بیناسازی بازاڕی قەیسەری لە وڵاتانی تری دونیا دەبینرێت. وەک بازاڕی قاهیرە و و بازاڕی حەمیدییە لە دیمەشق یان بازاڕی کۆنی شام. هەروەها بازاڕی قەیسەری لاسایی بیناسازی بازاڕی موسل و بازاڕی شام کراودتەوە[4]. بازاڕەکانی قەیسەری کە ناوێکی گەورەی سەردەمییانە بووە. بۆپیاوانی دەوڵەمەند و خاوەن بازرگانی گەورە بەکارهاتوود لەگەڵ ئەمەش کە بازاڕێک قەیسەری بووبێت، بازاڕێک بە تەنیشتییەوە بووە کە پێی دەوترا قەیسەری بچووک، کە هاوڵاتییان و دانیشتوانە هەژارەکان کەڵکیان لێ وەردەگرت. قەیسەری گەورەی هەولێر لە ساڵی ١٨٢٠ - ١٨٣٠ زاینی لە لایەن بەڕێزان حاجی قادر دەباغ و حاجی حەوێز مامە پیرس دروست کراوە[5]. چونکە کە هەردوو بەڕێزان سەردانی ماڵی خوای گەورەیان کردووە بۆ ئەنجامدانی

فەریزەی حەج لە گەڕانەوەیان بە وڵاتی شامدا گەڕانەوە و سەردانی بازاڕی حەمیدییەیان کردووە. بۆیە هەمان بیرۆکەی دروستکردنیان خستەبەر بۆ دروستکردنی هەردوو بازاڕەکە، لە نزیک ئەم بازاڕە بازاڕێکی تر هەبووە کە پاشماوەی شوێنەوارەکەی نەماوە، لە ساڵی ۱۲۵۰ زاینی لەلایەن مزەفەری گوگبری دروست کرابوو. بەڵام ئەم بازاڕەی کە ئێستا دەبینرێت، بازاڕی سەردەمی عوسمانییەکان بووە،

قەیسەری هەولێر پێک دێت لە دوو بازاڕی گەورەی کۆنی شوێنەواری کە یەکێکیان ناسراوە بە قەیسەری گەروە یان گومرگی کۆن واتە هەموو کەلوپەلەکان دەهێنرایە ئەم شوێنە، ئەم بازاڕە هەر لە کۆنەوە وەکو شوێنێکی بازرگانی و گومرگ کردنی کەلوپەلەکان دەستنیشان کراوە. هەر بۆیە "حاجی قادر" کە دەکاتە باپیرەی (ئەسعەد چەلەبی) لە ساڵی ۱۸۷۱ زاینی دامەزرێنەری ئەم بازاڕە بووە، سەرپەرشتی ئەم بازاڕەی کردووە. کە دواتر لەلایەن موسەوییەکان نۆژەن کرایەوە، واتە لەلایەن جووەکان لەساڵی (۱۹۰۹ - ۱۹۱۱) نوێ کرایەوە. هەر بۆیە پێیدەڵێن بازاڕی جوولەکان.

بەڵام ئێستا جارێکی دیکە بازاڕی قەیسەری دووچاری وێرانبوون هاتوودتەوە و بازاڕی دووەم (قەیسەری بچووک کە لە سەر شێوازی قەیسەری گەورە دروست کراوە و دامەزرێنەری ئەم بازاڕە،حاجی حەوێزی کوڕی مامە پیرس بووە[١]. ئەم بازاڕە تەواوکەری



**وێنەی ژمارە (٣):**
**یەکێک لە دەرگاکانی قەیسەری گەورە لە شاری هەولێر**

بازاڕی قەیسەری گەورە بۆ فرۆشتنی کەلوپەلەکان بە خەڵکانی هەژار بووە..

بازاڕی قەیسەری پێک هاتووە لە بازاڕێکی داخراو: چوار دەرگای سەرەکی هەیە کە شێوازی دەرگاکان



**وێنەی ژمارە (٤):**
**یەکێک لە کۆڵانە سەرەکییەکانی بازاڕی قەیسەری شاری هەولێر**

بریتین لە پێوانەی ٤،٨٠ مەتر بەرزە و ١،٢٠ مەتر پانی دەرگایی سەرەکییە[٢].

بڕوانە وێنەی ژمارە (٣).

ئەم دەرگایانە لە ماددەی دار دروست کراوە، رووپۆشی دەرگاکان بە ماددەی ئاسن و بزماری ئاسنینی داپۆشراوە، کە ئەمەش جۆرێکە لە نەخش و نیگاری بیناسازی دەرگاو پەنجەرەکانی بازاڕی قەیسەری. ئەم دەرگایە بەشی سەرەوەی لەسەر شێوازی عەقدێکی شێوە قووچەکی و هێلکەیی دروست کراوە کە لە هەموو پاشماوە شوێنەوارییە ئایینییەکان بوونیان هەیە[٣]. ئەم شێوازە زیاتر لە سەردەمی عەباسییەکان باو بووە. پێکهاتەی ئەم دەرگایە دوو راگری بەردینی لە لای راست و چەپی دەرگاکە دەبینرێت کە لە ماددەی مەڕمەڕ دروستکراوە. کە ئەمەش کە لە دەوروبەری شاری هەولێر هاتووە بۆ لایەنی بیناسازی دەرگاکە و راگیرکردنی، کە بریتییە لە دارێکی درێژ، سەرێکی کە پێی دەڵێن بەشی سەرەکی دەرگاکە کە بەشی خوارەوەی وەکو نووکێکی تیژ دەچەقێنرایە ناو بەردێکی کونکراو بۆ زیاتر کردنەوە و جوولانی دەرگاکە، لە دەرگای سەرەکی دەڕۆینە ناو بازاڕەکە کە مەمەڕێکی راست و کۆڵانێکی رێک کە کۆمەڵێک

دوکان لە خۆ دەگرێت، کە لە سەر یەک شێواز بە کار هاتووە و دروست کراوە بڕوانە وێنەی ژمارە (٤).

بەڵام سەبارەت بە پێکهاتەی بازاڕەکە لە سێ نهۆمی کەلتووری پێک دێت. کە نهۆمی یەکەم،

سەرداب (ژێر زەمین)ە، و نهۆمی دووەم دوكانەكانە، بەڵام نهۆمی سێیەم، شوێنی داگرتن و عەمبارکردنی کەلوپەلەکانی ئەم بازارەیە. چونكە ئەم بازارە وەكو كۆگایەک بەكارهاتووە لەم سەردەمەدا[٤]. هەروەها لە سەقفی بازارەكە دیارە كە سەقفێكی نیوە بازنەیی داخراوی درێژە. بڕوانە وێنەی ژمارە (٥).

بەڵام لە هەندێک شوێن پاشماوەی نەماوە دارماوە. لە ئەیوانی ئەم مەمەرە دەبینرێت چەندین كونی شێوە چوارگۆشە و لاكێشە هەیە كە ئەمەش بۆ رووناكی بەكارهاتووە، و هەندێک كونی شێوە لولەكی هەیە كە شوێنی ئەم دارانە بووە وا بۆ ساتری یان بەلەكۆنی ناوەكی بەكارهاتووە. بەڵام بە پێكهاتەی بیناسازییەكەی لە ماددەی گڵ و گەچ و خشتی سوور، كە لە ناوەخۆی شاری هەولێر پێی دەوترێت كەرپووچ. هەردوكانێک لە ماددەی كەرپووچ دروست كراوە. شێوەی دوكانەكان بە پێی شوێنی بازارەكە دەگۆڕێت، كە هەندێكیان چوار گۆشەن و هەندێكیان لاكێشەن، بەڵام سەیری ناواخنی هەر دوكانێک دەكەین رووبەرێكی بچووكی هەیە، كە ئەمەش بەشێوەی تاک بۆ فرۆشتنی كەلوپەلی نموونەیی بەكار هاتووە. بەڵام بەكۆمەڵ لە ناو كۆگایەكە دەهێنرایە دەرەوە، دەدرا بە كڕیارەكان. ئەم بازارە لە سەدەی هەژدەهەم و نۆزدەهەم باو بووە كاری مامەڵەگەری تێدا كراوە. بەڵام دیواری دوكانەكان كە پێوانەكەی



وێنەی ژمارە (٥):
یەكێک لە ئەیوانی كۆڵانە سەرەكییەكانی بازاڕی قەیسەری شاری هەولێر

٨٠ - ٩٠ سەنتیمەتر بوو لە بەشی سەرەوە دەرگای دووكانەكان حەلقەیەكی بازنەیی هەیە كە ئەمیش بۆ راگرتنی ئەم دەرگایە بووە، بۆ دووكانەكان ئەو سێ بەشەی كە دەرگای دووكانەكانی داخستووە بریتی بووە لە بەشی یەكەم كە خواردوویە دەبوو بە مێزی بەردەمی



وێنەی ژمارە (٦):
یەكێک لە پێكهاتەی دوكانەكانی بازاڕی قەیسەری شاری هەولێر

دوكانەكە، بەڵام بەشی دووەم كە ناوەڕاستی دەرگا دارەكەیە دەچووە سەرەوە دەبوو بە ساتری دووكانەكە[١]، واتە سێبەری دووكانەكە. بەڵام سەبارەت بە عەقدی دووكانەكە هەموویان لەسەر یەک شێواز بوون. لە ناواخنی دووكانەكە گومبەتێک هەبووە كە نیوە بازنەیی بووە ئەمەش جۆرێكە لە هونەری بیناسازی ئەم سەردەمە كە لەسەردەمی ئەمەوییەكان و عەباسییەكان بە شێوازێكی جوانتر بەكارهاتووە[٢] ئەم عەقدەی دووكانەكانی پێک هێناوە لە ماددەی مەرمەڕ دروست كراوە كە لە شاری موسل هێنراوە بۆ بنیاتنانی قەیسەری كە تائێستا بەردی حەللان لە موسل زۆر باوە و بەكاردێت كە ئەمەش یەكێک بووە لە توخمە سەرەكییەكانی بیناسازی سەردەمی ئیسلام هەر وەكو لە دەرگا و میحراب و كۆڵانەكانی بازاڕی قەیسەری دەبینرێت بڕوانە وێنەی ژمارە (٦)، بەڵام بە زەوی ناو كۆڵانەكانی بازاڕی قەیسەری، بەخشتی سوور فەرش كرابوو كە ئێستا بە مادەی موزائیک رووپۆش كراوە. بەڵام نهۆمی سێیەم لەگەڵ هەر ریزە دووكانێک رێگایەک هەبووە، دەڕۆیشتە بەشی سەرەوە كە نهۆمی سێیەمە. پێكهاتەی نهۆمی سێیەم بریتییە لە كۆمەڵێک ژووری شێوە چوار گۆشە و لاكێشە كە ئەمانە وەكو كۆگاو شوێنی پشوودانی بازرگانان بەكارهاتووە. پەنجەرەكانی ئەم ژوورانە لە سەر شێوەی سیب تراب دروست كراوە كە بە ماددەی دار داخراوە وە هەروەها لە بەشی دەرەوەی

پەنجەرەكان بە ماددەی ئاسن رووپۆش كراوە كە لە سەر شێوەی شەبەكەیەكی ئاسنی دروست كـــراوە كـــە هەندێكیـــشیـــان نەخش كـراوە و هەندێكیـان بێ نەخـشن، ئەندازەی بیناسازییە[1].

بڕوانە وێنەی ژمارە (٧)

لـە بـەشی دەرەوەی دەبـینـرێت كـۆمـەڵێك "تاق"ی شـێـوە نیـوە بازنەیی دەبینرێت لە ناوەڕاستی نهۆمی سێیەم لە بەشی دەرەوەدا هەر وەكو دیارە. لەم نهۆمەدا تارمەیەكی لە دار دروسـتكراو هەیە كـە وەكـو بەلەكۆن بۆ ئەم سەردەمە بەكارهاتووە. سـیـاجـێكی لە دار دروسـتكراو و نەخشێنراوە[1]. جوانكارییـەكـانی بازاڕی قەیسـەری لە رادە بەدەر بووە، بەڵام بۆ سـەردەمـانی ئێسـتا هیچ بایەخێكی نییە. لەبەر ئەوەی وێرانی و رووخـانی بە خـۆیەوە بینیـوە. بۆ چارەسـەری ئەم كـێـشـەیە لەلایەن كـۆمـەڵێك لێـژنەی بیـانی شوێنەوارەكان، پلانی نۆژەنكردنەوەی بۆ داڕێژراوە، بەڵام تا ئێستا كارەكان ئەنجام نەدراوە.

**پەراوێزەكان:**

(١) ياقـوت الحـموي: شـهـاب الدين ابي عبدالله بن ياقوت بن عبدالله الحموي الرومي: ت٦٢٦هـ - /١٢٢٨م، معجم البلدان، مجلد الاول، ط٢، بيروت، ١٩٩٥، ص ٤٣٨.

(٢) البـاحث: زيارة مـيـدانيـة ومـقـارنة بالاقـوال السـابقـة حول سـوق اربيل (قيصری هەولێر).

(٣) د.محسن: محمد حسين: اربيل في عهد الاتابكي، مطبعة، اسعد، بغداد،



**وێنەی ژمارە (٧): یەكێك لە پێكهاتەی پەنجەرە و تاقەكانی بازاڕی قەیسەری شاری هەولێر.**

١٩٦٥. ص١١٤.

(٤) دراسـة البـاحث حـول الاثار المجـاورة البـاقيـة لحد الان، المصادف ٢٣/١٢/ ٢٠٠٧.

(٥) د.محسن، نفس المصدر، ص ١١٤.

(٦) اسماعيل حجارة: التنقيب في قالينج اغـا (اربيـل) الموسم الرابع. ١٩٧٠، مجلد السـومر، عدد ٢٩، ص ١-٢، مديريـة الاثار العامة، بغداد، ١٩٧٣، ص ١٢- . ٣٤.

(١) د محسن: نفس المصدر، ص ١١٢.

(٢) زوبيـر بـلال اسـمـاعـيـل، اربيـل في ادوارها التـاريخـيـة، مطبعـة النعـمـان، النجف الاشـرف، ١٩٧١، ص ٦١-٦٢.

(٣) حسب الخارطة اربيل شكل رقم (١)،

(١) البـاحث ولقـاء مع أهل السـوق. المصادف، ٣٤ /١٢ / ٢٠٠٧.

(٢) هذه الكلمة ماخوذة من المصطلحات اللغوية التـركيـة، لقاء مع الاستـاذ المساعد، د.عبدالله حداد، من جامعة صـلاح الدين، المصـادف ٢٣/ ١٢ / ٢٠٠٧.

(٣) حسن، زكي محمد، فنون الاسلام، القاهرة، ١٩٤٨، ص ٥٤.

(٤) زيارة البـاحث: الى سوق الحـمـيـدية بسـوريا، المصـادف: ٥/ ٨/ ٢٠٠٦. مع وفد قسم الاثار.

(٥) (١) لقـاء مع د. عـبـدالله حـداد، المصادف /٢٣/١٢/٢٠٠٧.

(١) لقـاء مع الكاسب، حـاجي خليـل هو يعمل في هذا السوق من سنة ١٩٣٤، حتى الان.

(٢) الجمعة، احمد قـاسم الجمعة: عناصر الميـزات المعـمـارية في المدرسـة المسـتنصـرية، المراحل التـاريخـيـة للمـدرسـة المسـتنصـرية، محـمـد المشهداني، اسامة ناصر النقشبندي، ١٩٨٦٧، بغداد، ص ٤٢.

(٣) رجب: غـزي: العـمـارة العـربيـة في العصر الاسلامي في العراق، بغداد، ١٩٨٩، ص ٢١٠ -٢١٦.

(٤) الباحث: اخذت المعلومات من اهالي السوق.

(١) دراسـة ميـدانيـة / حول الموضـوع بقلم الباحث:

(٢) الاعظمي: خـالـد خليـل: المراحل التـاريخـيـة للمـدرسـة المسـتنصـرية، محـمـد جاسم، اسـامـة النقشـبندي نفس المصدر، ص ١٩.

(١) الاعظمي، خـالد خليـل، الزخـارف الجـدارية في اثار بغـداد، بغـداد، ١٩٨٠، ص٧٣.

(١) الحداد: مـحـمـد حـمـزة اسـمـاعـيـل، موسوعة العمارة الاسلامية في مصر من الفتح العثماني حتى عهد محمد علي، مطبـعـة القـاهرة. ١٩٩٨، ص١٥٩.

**وێنەكان : توێژەر: ئاراس اسماعیل خدر**



# قەیسەریی هەولێر و پیشەی دەستکردی فۆلکلۆری

محەمەد سەعید کوردە

مرۆڤی کورد هەمیشە دەست رەنگین بووە و لە پێناو پەیداکردنی ژیانی رۆژانەی خۆی پەنای بردۆتە بەر گەلێک کار و پیشەی دەستکرد، کە دوێنێ و ئەمرۆ وەک کەلەپوورێکی زیندوو بۆ ئێمە ماوەتەوە.

ئەو پیشە فۆلکلۆرییەی، کە سالانێکی زۆرە لە بازاڕی قەیسەری هەولێریش دەکرێ چۆنیەتی دروستکردن و داتاشینی لانک و فەرشە و تیرۆک و ناوبرێشکی نان کردن و دەسکە چەقۆ و رەوڕەوەی منداڵان و... تاد.

بێگومان ئەوانەی ئەو پیشەیان لە کۆندا دەکرد، ئێستا هیچ کامێکیان لە ژیاندا نەماون، وەک: مام یاسین نەجاڕ و رەشاد نەجاڕ و مام مەعروف و مام تەها، بەڵام ئێستا کوڕ و نەوەکانیان ئەو پیشەیان پاراستووە و نەمرییان پێ بەخشیوە، بۆیە ئەگەر بەو بازاڕەدا گوزەر بکەی هەست دەکەی مامەڵەی کڕین و فرۆشتنێکی بەگوڕی تێدا دەکرێت و ئێستا خەڵکانێکی زۆر بە دوای ئەو کەرەستە فۆلکلۆرییانەدا دەگەڕێن بە مەبەستی سوود وەرگرتن و جوانکردنی ماڵەکانیان.

### سوود بینین لە داری ئەسپیندار و بی و گوێز

بە مەبەستی رۆشنایی خستنەسەر ئەو پیشە دێرینەی، کە لە زووەوە لەو پیرە هەولێرەدا دەکرێ بە پرسیاران رووبەڕووی مام (عوسمان سالح شێخۆ) بووینەوە، کە هەر لە منداڵییەوە بەو کار و پیشەوە خەریکە و ئەو لە بەرایی قسەکانیدا پێی گوتین:

میللەتی کورد لە مێژساڵە بەو جۆرە پیشە فۆلکلۆرییانەوە خەریکە، سەبارەت بە خودی خۆشم هەر لە تەمەنی (١٥) ساڵییەوە بەو کار و پیشەوە خەریکم و کاتی خۆی جەنجەڕ و هەوجاڕی جووتکردنمان لە دار دروست دەکرد، ئەو دارانەی کە ئێمەش بۆ ئەو کارانە بە کارمان دەهێنا، بە زۆری داری ئەسپینداری شەقڵاوە بوون، جگە لەوەش سوودێکی زۆرمان لە داری بی و گوێز وەردەگرت، چونکە ئەوانە باشترین جۆری دارن و بۆ ئەو پیشەیەی ئێمە گونجاوە، ئەوەی پێویستە بگوترێ ئەو کارانەی ئێمە هەموو بە دەستی بوو، تا سەردەتای حەفتاکان و بە

دیارکەوتنی ئامێری کارەبایی دارتاشی، ئەوساکە هەردوو بەڕێزان مام یاسین نەجار و قادری حاجی مەمەد دوو مەکینەی زۆرباشی دارتاشییان لە شاری بەغداوە هێنایە هەولێر، ئەوەش کارئاسانییەکی یەکجار زۆری لە ئیش و کارەکانی ئێمەدا کرد و تا ئەمڕۆکەش ئێمە سوودی لێ دەبینین.



### نرخی کەرستە فۆلکلۆرییەکان لە نێوان دوێنێ و ئەمڕۆدا

وەک ئاشکرایە نرخ لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی دیکە جیاوازییەکی زۆری بەخۆیەوە بینیوە، سەبارەت بە نرخەکانی ئەوساکە مام عوسمان پێی گوتین: ئێمە ئەوساکە جەنجەرمان بە (١٢ - ١٣) دینار دروست دەکرد، هەروەها لانکی منداڵی ساوامان بە (١٢) درهەم دروست دەکرد، بەڵام ئێستا لانکی وا هەیە نرخەکەی لە نێوان (٢٥ - ٣٠) هەزار دینارە، نرخەکانی دیکەش بە هەمان شێوە.

### دروستکردنی تەشی و تیرۆگ و ناوبرێشک پیشەی دۆمەکانە

لە لایەکی دیکەوەش مام قاسم وەسمان سەعید کە خۆشناوی گوندی ناودارۆکانە گوتی: لە وەتەی من بە بیرم دێ کاری دروستکردن و تاشینی تەشی و تیرۆگ و هێرەگ و بێژینگ و رەورەوە و فاقی چۆلەکە و ئەوانی دیکە کار و پیشەی کۆن و هەرە لە مێژینەی دۆمەکانە، ئەوانە گوند بە گوند و ماڵ بە ماڵ دەگەڕان و ئەو کەرستەیان بە خەڵکان دەفرۆشتەوە، بە ڕاستی کەرستەکانیان هێندە جوان و بەرچاو بوو بە دەست خۆت نەبوو دەبوایە چەند دانەیەکیان لێ بکڕی، ئێستا زۆربەی زۆری ماڵان بەو دیمەن و کەرستە جوان و فۆلکلۆرییانە رازاوەتەوە.

### ئەو کەرستانەی بازاڕیان باشە

حاجی محەمەدیش گوتی ئەمڕۆ کڕیارەکانی ئەو بازارە بە زۆری لانکی منداڵی ساوا و فەرش و تیرۆگ و ناوبرێشک و قالبی کولیچە دروستکردن دەکرن، چونکە ئەوانە لە هەموو کات و سات و سەردەمێکەوە کڕیاری خۆیان هەیە بە پێی ئەوەی حاجەتێکی سەردەمانەیە و هەموو ماڵێک پێویستی پێی هەیە.

### کەرستەی فۆلکلۆری کوردی بە دیاری بۆ هەندەران

زۆرجار دەگوترێ هەر میللەتێک بە کەلەپوور و فۆلکلۆرەکەیەوە دەناسرێت، دیارە فۆلکلۆری کوردیش لە ناوەوە و دەرەوە جەماوەری خۆی هەیە، بۆیە دەبینین زۆرجار ئەوانەی لە هەندەران دەگەڕێنەوە کوردستان، هەموو جارێک چەندین کەرستەی فۆلکلۆری وەک مەلاکی دار و تاسی دار و هەندێک کەرستەی دیکەی لە دار و هەندێک کەرستەی دیکەی لە دار دروستکراو بە دیاری لەگەڵ خۆیاندا دەبەنەوە ئەوێ، وەک کەرستەیەکی فۆلکلۆری نایاب دەیکەن بە دیاری خۆشەویستان.

هەر لەو رووەوەش کوردەکانی دەرەوەی وڵات زۆرجار چەندین کەرستەی فۆلکلۆری لە دار دروستکراویان لەگەڵ خۆیاندا بردۆتەوە، لەوێدا لە پێشانگایەکی فۆلکلۆریدا وەک کەلەپوورێکی بەرزی میللەتەکەمان خستوویانەڕوو، بەو کارەش رووی گەشی میللەتەکەمانیان بە هەموو دنیا ناساندووە. دیارە فۆلکلۆری کوردیش تایبەتمەندی خۆی هەیەو لەناو هەموو میللەتاندا دیارەو دەناسرێتەوە، ئەمەش نیشانەی زیندوویەتی میللەتی ئێمەیە، کە لەگەڵ ئەم هەموو جینۆساید و قڕکردن و لەناوبردنەدا ئەنجام دراوە، بەڵام لەگەڵ ئەمەش میللەتەکەمان خۆی راگرتووە و لە داب و نەریت و کەلەپووری خۆی دانەبڕاوە.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر، ژمارە (١١)ی، ٢٠٠٥ بڵاوبۆتەوە.



# گەرماوەکانی هەولێر

ئەبو مستەفا

گەرماوەکانی هەولێر دیاردەی بیناسازی گرنگن لە بازاڕە کۆنەکاندا. هەردەم نزیک بە مزگەوت و بازاڕ و قەیسەرییەکان بووە، لە هیچ نووسراوێکدا دیارنییە، کە لە هەولێر لە مێژووی کۆندا ئەم گەرماوانە هەبن، یاخود لەسەردەمی ئەتابەکیدا، دروستبوونی ئەو گەرماوانە بۆ دوا سەردەمی عوسمانییەکان دەگەڕێتەوە، بوونی ئەم گەرماوانە، لە شارەکاندا دیاردەیەکی شارستانییە و پەیوەستە بە خاوێنی مرۆڤ و بڕواداری، گەرماوەکان لە بیناسازییە ناودارەکانی هەولێرن، لەم سەردەمەدا نەکراوە، بەڵکو کۆنە و لە هەولێر و شارەکانی دیکەشدا دروست کراون.

هەولێریش شوێنێکی بازرگانی گرنگ بووە و وەک وێستگەیەک بووە بۆ کاروانە بازرگانییەکان، لەنێو گەرماوەکاندا بەهرەی زانستی و توانای پیشەیی و هونەری دەردەکەون، کە باری تەندروستی و خاوێنی و جوانی و زەوق لەبەرچاو دەگرن.

ئەمەش دەبێتە هۆی ڕاکێشانی کڕیار و خەڵک، ئەمە جگە لە ڕکابەری و بایەخدان بە گەرماوەکان، دابینکردنی هۆیەکانی حەسانەوە و تاوەکو، مرۆڤ تێیدا بەختەوەر بێت، لەنێو ئەم گەرماوانە زۆر وێنە و نیگاری پاڵەوان و ئافرەتان و هێڵکاری و نەخشاندن هەڵدەواسران، بەپێی ڕای مێژوونووسان زۆر نەخشەسازی لەسەردەمی سەدەکانی ناوەڕاست دروست کراون، وێنەکان لە ڕەنگی شین و سوور و زەرد و سپی و سەوز دروست دەکران دڵ و چاویان دەگەشاندەوە، بۆ ئەوە بوو ئەوانەی لە گەرماوەکەدابن لە رووی دەروونییەوە بەختەوەربن، کە زۆر جار ئەم وێنانە دابونەریت و کلتووری ڕۆژهەڵاتی لەبەرچاو دەگرت، بۆیە گەرماوەکانی دوای ئەوانە لە زۆر لە جوانکاری و تابلۆ و نەخشەسازی خاڵی ببوو، لێرەدا زۆر تیشک ناخەینە سەر لایەنی کلتووری گەرماوەکان و باسکردنی ئەو پێداویستیانەی کە پیاوان و ئافرەتان لە گەرماوەکاندا بەکاریان دێنا یان قسە لەسەر کرێکاری گەرماوەکان بکەین، کە

هەندێکیان (ناتر) بوون، ئەوانی دیکە شۆڕەر بوون، یان قسە لەسەر (خەڵوەی گەرماو) ناکەین، کە بەر لە ژیانی هاوسەری پیاو یان ئافرەت خۆی لە گەرماوەکان تازە دەکردەوە. بەڵکو ئێمە دەمانەوێ باس لەلایەنی نەخشەسازی و بیناسازی گەرماوەکان بکەین، لە چ مادەیەک دروست دەکران؟ سەرچاوەی ئاوی لە کوێوە بوو؟ چۆن گەرم دەکرا؟ چۆن ئاوەکان دابەش دەکرانە نێو گەرماوەکان؟.

لەسەردەمی عوسمانییەکاندا وا دیارە لە ماڵەکاندا گەرماوی تایبەتی نەبووە، ئەگەر هەشبووبێ، ئەوا بچووک بووە. لە هەندێک لە ماڵەکاندا شوێنێکی بچووک هەبووە، کەوتۆتە سووچێکەوە، کە لە شوێنێکی بچووک پێکهاتووە، بەرزایی یەک مەتر بووە. ئاوەکەی دەچووە دەرەوەی ماڵەکە، وا دیارە لەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە گەرماوی ماڵەکان پەیدابوون، وەک ئەوەی لە هەندێک لە ماڵە کۆنەکانی قەڵای هەولێردا دەبینرێت.

## لایەنی بیناسازی گەرماوەکانی هەولێر

گەرماوەکانی هەولێر لە سێ یان چوار هۆڵی سەرەکی پێکهاتووە:

١- هۆڵی جل لەبەر کردنەوە کە هۆڵێکی بازنەیی بوو، لە ناوەوەدا سەکۆیەکی بازنەیی هەبووە، دیوارێک دەوری داوە، کە لە زەوی هۆڵەکە گەورەتر بووە بە درێژی نیو مەتر بە مەرمەڕ رووپۆش کراوە، دیواری ناوەوەی هۆڵەکە بە مەرمەڕ داپۆشراوە، هۆڵەکە سەرەکەی بە گومەزەیەکی گەورە داپۆشراوە، بۆ چوونە ناو هۆڵی گەرماوەکە لە رێگەی دەرگای چاوەڕوانکردن و لە پێناو پارێزگاری کردن لە خۆشۆرەکان و ئەوانەی سەردانی گەرماوەکە دەکەن، تا بارانیان بەرنەکەوێت یاخود، تیشکی گەرمی هەتاو، دەستەواژەی (حەمام ویلدی) وەک ئاگادارکردنەوەیەک بوو بۆ چوونە نێو گەرماوەکانی هەولێر، سەبارەت بە ئافرەتان، لە گەرماوی قەڵای هەولێردا، کە کۆنترین گەرماوەکانی شاری هەولێرە هۆڵێک هەیە بە ناوی (جل لەبەرکردنەوە)، دواتر هۆڵی ساردی یەکەم دێت لەناو گەرماوەکەدا، کە هۆڵی هاوینەیە، واتە هۆڵی یەکەم بۆ وەرزی هاوین بوو، هۆڵی دووەمیش بۆ وەرزی زستان بوو، ئەمەش بۆ لەبەرچاوگرتنی تەندروستی و حەسانەوەی ئەوانە بوو، کە لەو گەرماوانە خۆیان دەشوشت.

٢- هۆڵی ناوەڕاست یان هۆڵی گەرم، ئەوە لەدوای هۆڵی ساردەوە دێت، کەوتۆتە نێوان هۆڵی سارد و واتا ناوەوە و لەلای هۆڵی ناوەڕاستەوە، سەکۆیەکی بەرز هەبوو لەنێوان هەردوو هۆڵەکەدا بوو، هۆڵی دیکەی پێکدەهێنا، پێی دەوترا (ئۆرتە سفرە)، مەبەست لەوەدا، کە خۆشۆرەکان لەکاتی گەرمایی زۆر و هەناسە تەنگ بوون روویان تێدەکرد تاوەکو هێور ببنەوە، هۆڵی ناوەڕاست بچووکتر بوو لە هۆڵی گەرم و هۆڵی سارد.

٣- هۆڵی گەرم، ئەم هۆڵە شێوەیەکی بازنەیی هەبوو گومەزەیەکی گەورەی هەبوو، لە چەندین ژوور پێکدەهات واتا شوێنی خۆشۆرین، لەنێو هەریەک لەو ژوورانەدا لە سووچێکدا دوو حەوز یان سێ حەوزی بچووکی تێدابوو ناوی (جورم) بوو، لەنێو ئەم جورمانەدا بۆری ئاوی تێدابوو، ئاوی سارد و ئاوی گەرمیان لێدەهات، سەر گومەزەی هۆڵەکەش چەند پەنجەرەیەکی بۆ هەوا گۆڕین تێدابوو. دەرگایەکی بچووک هەبوو، بە دوو سێ پەیژە بۆی دەچووی، کە بەرەو تانکی ئاو کۆکردنەوە دەچوو، ئەم تانکییە ئاوە گەرمە، بە (قەزان - قەدەر) ناسرابوو، کە ئاوی بەسەر ژوورەکاندا دابەش دەکرد، شێوەی ئەم تانکییە ئاوە لاکێشەیی بوو، دیواری ئەم هۆڵە بە مەرمەڕ داپۆشرابوو، زەوییەکەشی بەم جۆرە بەردە داپۆشرابوو، سەکۆیەکی بازنەیی تێدابوو، لە ناوەڕاستی هۆڵەکەدا، نیو مەتر بەرز دەبوو، پێی دەوترا (ژووری زاوا) وادیارە (ناتر)ی گەرماو خزمەتی تازە هاوسەرانی، لەسەر ئەم سەکۆیە بەردینەدا دەکرد.

سەرچاوەکانی ئاوی گەرماو: بیرێکی قووڵ کە بە (ناعور) ناسرابوو، بە خشت داپۆشرابوو، سەرچاوەی ئاوی گەرماوی قەڵای هەولێر بوو، گەرماوی حاجی عەبدولقادر دەباغ لەژێر قەڵادا،

ئەسپ یاخود هێستر بەکاردەهات بۆ دەرهێنانی ئاو بەدەفرێکی مەعدەنی گەورە، کە دەخرایە نێو جۆگەیەک کە دەچووە نێو تانکی ئاوی گەرماوەکە، چاوی وڵاخەکە بە پەڕۆیەک دەبەسترا، تاوەکو تووشی سەرسووڕان نەبێت، چونکە بە درێژایی ڕۆژ ئاوی رادەکێشا کاری دەکرد. زۆر پاشماوەی ئاژەڵەکان وشک دەکرانەوە بۆ سووتاندن و گەرمکردنی گەرماوەکە بەکاردەهات، ئەو شوێنەی ئاگری گەرمکردنی گەرماوی تێدابوو، پێی دەوترا (کوڵخان)، تا ئاوی گەرماوەکە گەرم بکات، پاشان بوو بە نەوتی رەش بۆ گەرمکردنی گەرماو، گەرماوەکانی بازاڕی هەولێر لە ساڵانی پەنجاکانی سەدەی رابردوو رووخێنران، گەرماوی حاجی عەبدولقادر تاوەکو ساڵی ۱۹۸۲ مابوو. ئێستا لە گەرماوەکانی هەولێر تەنها، گەرماوی قەڵا ماوەتەوە.

### گەرماوەکانی سەردەمی عوسمانی

بەشی دووەم: پسپۆرێکی بەریتانی کە لە پایزی ساڵی ۱۸۲۰ سەردانی هەولێری کردووە دەڵێت: لە هەولێردا یەک گەرماو هەبووە، کە مەبەستی گەرماوی قەڵای هەولێرە، دوای ئەوە بە (٤٠) ساڵ (مەحموود شەهابەدین ئالوسی) دەڵێت: کە نووسەری کتێبی (روح المعاني)، دەڵێت: سەردانی هەولێری کردووە، بۆ چەند ڕۆژێک میوانی شێخ (محەمەد سەعید نەقشبەندی) دەبێت لە گەشتی گەڕانەوەی لە



ئەستەمبوڵەوە، لە کتێبی (نشوة المدام في العودة إلى مدينة السلام) دەڵێ: سەردانی گەرماوی هەولێری کردووە، کە مەبەستی گەرماوی گەورەی نزیک گەڕەکی خانەقا بووە، چەندین گەرماو لە هەولێردا هەبووە، لەوانە:

**١- گەرماوی قەڵا:** لە کۆنترین گەرماوەکانی شاری هەولێرە، مێژووی دروستکردنی دەگەڕێتەوە بۆ، نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەهەم. لەسەر دەستی (عەبدوڵا ئاغا ئیسماعیل ئیبراهیم) یەکێک لە ناودارەکانی شاری هەولێر بووە و شاعیرێکی ناوداریش بووە، گەرماوی قەڵا پانتاییەکی گەورەی هەیە، گەرماوێکی نموونەیی بووە، لە رووی پێکهاتەی بیناسازی و ئەندازەییەوە، سەرجەم بیناسازی گەرماوەکە لە بەردی مەرمەڕ دروستکراوە، بەدرێژایی رۆژگار لەم گەرماوەدا

چەندین (حەمامچی) تیایدا کاریان کردووە، لەوانە (بەکر فەتاح حەمامچی)، لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا ئەم گەرماوە موڵکی عەبدولڕەحمان داود ئاغا قەساب بووە، پاشان بووە موڵکی بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەوار و نوێکاری و تازەکردنەوەی تێدا کرا، ماوەیەکیش ناوەندی رۆشنبیری سەردەم لەوێدا بوو.

**٢- گەرماوی گەورە و گەرماوی بچووک:** ئەم دوو گەرماوە شوێنیان لە نزیک گەڕەکی خانەقا بوو، کە لەدوای ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم دروست کرابوون، لە کۆتایی پەنجاکانی سەدەی بیستەمدا رووخێنران.

هەرسێ هۆڵەکەی سێ گەرماوەکە گومەزیان هەبوو، دیوار و زەمین و ناوەوەی گەرماوەکان بەردی مەرمەڕ بوون، کە لە شاری موسڵەوە

هێنرابوون، ئەم گەرماوانە خاوەنداریەتی بۆ بنەماڵەی (رەشید ئاغا وەیسی ئاغا) دەگەڕایەوە، باس لەوە دەکرێت کە کاریزی (شێخ ئەحمەد) (موفتاح) کە مزگەوتی شێخەڵلای ئاو دەدا و هەروەها ئاوی بە گەڕەکی خانەقاش دەدا، هەردوو گەرماوەکەشی ئاودەدا بەر لەوەی بە ژێرخانی (حاجی ئەحمەد ئاغا عوزێری)دا بڕوات تا دەگەیشتە مزگەوتی (ئاڵتی بەرماغ) پاشان دەچووە ناو ئەو حەوزەی، کە ئەوکات شاردوانی هەولێر بونیادی نابوو، تاوەکو خەڵک و ئاوفرۆشەکان ئاوی لێ وەرگرن، شوێنی ئەم حەوزە ئێستا باڵەخانەی (محەمەد سەعید جامبازە)، بەکاربەری گەرماوی گەورە (عەلی موختار) دوای مردنی ئەم دوو گەرماوەی بۆ زاواکانی خۆی جێهێشت (حاجی دەروێش و فەقێ محەمەد ئەمین).

**٣- گەرماوی حاجی عەبدولقادر دەباغ:** ئەم گەرماوە دەکەوێتە ژێر قەڵا لە پانیژەی سەرەکی نزیک بوو، لە رۆژئاوای ئەو مزگەوتە بوو، کە بەناوی دامەزرێنەری گەرماو ناونرابوو لە ساڵی ١٩٠٠دا، واتا بەر لە دروستکردنی مزگەوتەکە کە دروستکردنی ئەم مزگەوتە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٠٢ ئەم گەرماوە دیوار و زەوییەکەی و شوێنی دانیشتن و خۆشۆرینی، لە بەردی مەڕمەڕ دروستکرابوو، گەرماوێکی تەواو بوو لە رووی بیناسازی و لە سێ هۆڵ پێکهاتبوو، بیرێکی تێدابوو (ناعور) هاوشێوەی بیری گەرماوی قەڵا بوو.

ئەوەی مایەی تێڕوانینە شوێنەکەی بەپێی شەقامەکەی کە تیایدا بوو نزم بوو، کە لێیەوە پەیژەی سەرەکی قەڵا دەستپێدەکات، گەرماوەکە سێ دەرگای دەرەکی هەبوو دەرگایەک رووی لە بازاڕ بوو نزیک شوێنی (گەنم و جۆ فرۆشەکان) دەرگاکەی دیکەی رووی لە مزگەوت بوو، دەرگای سێیەمی بە پانیژە بۆی دەچووی پاشان بە رووی شەقامی تەک قەڵادا دەکرایەوە، لەلای باشوورەوە، بەناوبانگترین بەکاربەرانی ئەم گەرماوانە (حاجی عەبدوڵڵا حاجی عوسمان عەلی) بوو، کە گەرماوی ئەتڵەسی بۆ خۆی دروستکرد، لە گەڕەکی عارەبانی تازە و گەرماوی سیروانی لە گەڕەکی تەیراوە دروست کرد. گەرماوی حاجی عەبدولقادر لە ساڵی ١٩٨٢دا رووخێنرا، پاشان لەسەر بەشێکدا باڵاخانەیەکی بازرگانی بەناوی (حاجی یەحیا حاجی سەعید خدر) دروستکرا.

**٤- گەرماوی عەلی ئاغا:** کەوتۆتە ژێر قەڵاوە، لە گەڕەکی خانەقایە و نزیکە لە دەرگای رۆژهەڵاتی قەڵا، لەسەردەستی (عەلی پاشا دۆغرەمەچی) لەکاتی جەنگی یەکەمی جیهانی دروستکراوە، تا ئێستاش ماوە، بەڵام لە بارێکی بیناسازی ناڵەباردایە. ئەم گەرماوە بازنەییە و هۆڵی ساردی تێدا بە گومەزەیەکی گەورە داپۆشراوە، لەنێو هۆڵەکە لە ناوەوەدا، ژووری بچووکی تێدایە هەموو گومەزەی هەیە. لە هۆڵی ساردا واتا (هۆڵی جل داکەندن) دەتوانرێ بچیتە نێو هۆڵی ناوەڕاست (ئۆرتە سفرە) کە بە گومەزە داپۆشراوە پاشان هۆڵی گەرم دێت، چەندین ژووری تێدایە بۆ خۆشوشتن. ئەم هۆڵەی گەرماوە لەم ساڵانەی دواییدا خەریک بوو دابڕمێ، بۆ ئەم مەبەستە دینگە و شێلمانی ئاسن دانراوە تاوەکو گومەزەکە و سەری گەرماوەکە نەکەوێت، ئەم گەرماوە حاڵی حازر زۆر باری ناڵەبارە و بەرەو رووخان دەچێت، لەم چەند ساڵەی دواییدا ببووە گازینۆ و پاشان کرایە کۆگای پەینی کیمیاوی.

**٥- گەرماوی مۆدە:** ئەم گەرماوە دەکەوێتە رۆژهەڵاتی گەرماوی (١١)ی ئادار لە نزیک مزگەوتی شێخی چۆڵی، ئەم گەرماوە موڵکداریەتی رەشید ئاغا بوو لە ساڵی ١٩٢٧-١٩٢٨ دروستکراوە، ئەم گەرماوە بە (گەرماوی مۆدە) ناونرابوو، لەسەر شێوەی گەرماوەکانی ئەستەنبوڵ دروستکرابوو، (عەتەوڵڵا ئاغا کوڕی رەشید ئاغا) نەخشەسازی ئەم گەرماوەی لە تورکیاوە هێناوەتە هەولێر، هۆڵی ساردی گەرماوەکە بە ئاسن داپۆشرابوو. (شێلمان)، بەڵام هۆڵی گەرمی گەرماوەکە گومەزیان هەبوو، لە هۆڵی ساردا چەند شوێنێکی جل گۆڕینی تێدایە، لەم گەرماوەدا بەردی مەڕمەڕ بەکارهاتووە

لە دیوار و زەمینە و ژوورەکانیدا، گەرماوی مۆدە گەورە بووە، بەشێک لە گەرماوەکە بەر شەقامی شێخی چۆلی کەوتووە، ئەم شەقامە لە سالانی پەنجاکان دروستکرابوو، شارەوانی هەولێر ئەم شەقامەی فراوان کرد پاشان گەرماوەکە لەناوچوو، پاشان گەرماوی (١١)ی ئادار دروست کرا، گەرماوی (مۆدە) خاوەنەکەی (حاجی عەبدوڵلا حاجی عوسمان) بوو. هیچ گۆڕانکارییەکی بیناسازی لە گەرماوەکانی هەولێردا نەبووە، واتە گەرماوە تازەکانی هەولێر ئێستاش لە سێ هۆڵ پێکهاتووە، وەک گەرماوە کۆنەکان، سەری گەرماوەکە بە چەمەنتۆ بووە بە بۆیە و چەمەنتۆ سواغ دراوە، سەر ژوورەکانی چەماوە نییە، بەڵکو راستە و راستە، لەم گەرماوە تازانەی ئێستای هەولێر:

**١- گەرماوی ئەتڵەس:** دەکەوێتە گەڕەکی عارەبانی تازە لەلایەن (حاجی عەبدوڵلا حاجی عوسمان)، لە سالی ١٩٥٧دا دروستکراوە لەم سالانەی دواییدا بووە کۆگای هەلگرتنی کەلوپەلی خۆراک.

**٢- گەرماوی (العصري):** دەکەوێتە گەڕەکی کۆنی عارەبان، لەلایەن (حاجی خەلیل لوتفی) لە سالی ١٩٥٨ دروستکراوە، لە رووی بیناسازییەوە، ئەمە یەکێکە لە گەرماوە هاوچەرخەکان، لە شەقامی موزەفەرییەش نزیکە.

**٣- گەرماوی سەلاحەدین:** دەکەوێتە شێخەڵلا لە گەڕەکی خانەقا، هەردوو برا یاسین و رەشاد نەجار بونیادیاننـاوە، لەسەرەتای سالانی شەستەکاندا.

**٤- گەرماوی (١١)ی ئادار:** دەکەوێتە شەقامی شێخی چۆلی لە گەڕەکی تەعجیل، لەلایەن (حاجی یوسف تەها خەیات) دروستکراوە، لە شوێنی گەرماوی مۆدە بووە یاخود لەو نزیکە.

**٥- گەرماوی سیروان:** دەکەوێتە شەقامی (بێش بەرماق) لە گەڕەکی ئیبن مستەوفی لەلایەن (حاجی عەبدوڵلا حاجی عوسمان) لە سالانی شەستەکاندا دروستکراوە.

**٦- گەرماوی خۆشناو:** دەکەوێتە نزیک گۆڕستانی (بێش بەرماق) لەلایەن (موحسین حەمامچی) لە سالانی شەستەکاندا دروستکراوە.

**٧- گەرماوی سەرچنار:** دەکەوێتە شەقامی تەیراوەی کۆن، نزیک بالاخانەی دەزگەی سەربازی کۆن، لەلایەن (حاجی ئەکرەم حاجی ئەحمەد سیتەرەچی) لە حەفتاکاندا دروستکراوە.

**٨- گەرماوی کانی:** لە شەقامی سەرەکی تەیراوەیە لە گەراجی باکوور نزیکە لەلایەن (زێوەر شەریف) لە سالانی حەفتاکاندا دروستکراوە، خاوەنی ئێستای (حەیدەر مەعروف ئیسماعیل)ە.

**٩- گەرماوی موختار:** دەکەوێتە گەڕەکی تەیراوە لە نزیک گەرماوی (کانی)، لەلایەن (جەلال عەبدۆک)ەوە لە حەفتاکاندا دروستکراوە.

**١٠- گەرماوی کوردستان:** دەکەوێتە گەڕەکی سێتاقان، لەلایەن خوالێخۆشبوو (عەبدولقادر جێمسی) دروستکراوە.

**١١- گەرماوی ئیسکان:** دەکەوێتە شەقامی سەرەکی گەڕەکی ئیسکان، لەلایەن ئەندازیار (عەبدوڵلا حەسەن خەفاف) لە سالانی حەفتاکاندا دروستکراوە.

**١٢- گەرماوی هەولێر:** دەکەوێتە نزیک رێگای موسلی کۆن لە سایلۆ نزیکە لەلایەن (خەتاب کەریم) لە سالی ١٩٧٥دا دروستکراوە.

**١٣- گەرماوی شیفاء:** دەکەوێتە ژێر قەلای هەولێر لە نزیک سینەمای سیروان، لەلایەن (حاجی یوسف حاجی عوسمان) لە سالانی حەفتاکاندا دروستکراوە.

**١٤- گەرماوی ئەحمەد چەلەبی:** دەکەوێتە گەڕەکی سەعدووناوە، لە نزیک وێستگەی کۆنی شەمەندەفەری هەولێر، ماوەیەک خاوەنەکەی (حاجی یوسف حاجی عوسمان) بوو.

**١٥- گەرماوی نەورۆز:** دەکەوێتە گەڕەکی نزیک ئیبن مستەوفی (تەیراوە) لە ناوچەیەکدایە بە (گەڕەکی قەرەج) ناسراوە، لە سالی ١٩٨١دا لەلایەن (عەبدولقادر حاجی محەمەد) دروستکراوە.

**١٦- گەرماوی نەسر:** دەکەوێتە شەقامی بالاخانەی تەجنیدی سەربازی لە نزیک گەڕەکی خانەقایە، نزیکە لە قایمقامیەتی هەولێر لەلایەن (حاجی سەدیق محەمەد ئەمین) دروستکراوە.



# گەرماوە کلتوورییەکانی کوردستان و هەولێر لە کۆتایی سەدەی ١٨-١٩ز

**دکتۆر نەرمین عەلی محەمەد ئەمین**
**کۆلیژی ئاداب - زانکۆی سەلاحەددین**

گەرماوە کلتوورییەکانی کوردستان ژمارەیان و نەوعیەتیان باشە لە شارەکانی هەولێر، کەرکووک، سلێمانی و ناوچەکانی تر. لایەنی بیناسازی و پلان و شێوازی بیناسازییان وەک بەشێک لە بیناسازی خزمەتگوزارییەکان کە هەیە لەگەڵ شەڕی جەمی عێراقدا دادەنرێ. ئەم شێوازانە بەردەوامی شێوازە کۆنەکانی پێش سەدەیەک یان زیاتر کە باو بوود لە ناوچەکە و تا ئێستا ماوەتەوە.

گەرماو شوێنێکی تایبەت بووە بۆ خۆ شووشتن یان بسمیل کردن و خۆ حازرکردن بۆ ئاهەنگ و زەماوەند و خەنەکردن و شووکردن تایبەت بووە بۆ پیاو و ئافرەت.

لەبەرئەوەی گەرماو لە زۆربەی ماڵەکان نەبووە، یان بە شێوەیەکی کەم کە هەموو مەرجەکانی گەرماوی بازاڕی تێدابێ "حەمامی شار" جێگای گەرماوی تایبەتی ماڵەوەی گرتۆتەوە، ئاوی گەرمی تێدابووە و جێگاو ئیشکەرەکانی گەرماو کە خزمەتی ئەوانەیان کردووە کە خۆیان شوشتووە. بێجگە لەوە گەرماو شوێنی کۆبوونەوە و باس و هەواڵ گۆڕینەوە و پەیوەندیکردن و گواستنەوەی هەواڵ و دەنگ و باس و بەسەربردنی کاتی خۆش بووە بۆ لەش پاک و خاوێنی.

زۆربەی ئەو گەرماوانەی کە لە ناوچە کوردییەکان هەیە لەیەک دەچن لە لایەنی بیناسازی و شێوازیان و شێوەی هۆڵەکانیان، کە زۆربەیان لە هۆڵی هەشت لایی دروست کراون و شێوەی حەوزەکان و پەنجەرەو گومبەت و کەرەستەی دروستکردنیان دەگەڕێنەوە هەمان سەردەم. بۆ نموونە

گەرماوی قەلای هەولێر لە هەندێ گەرماوی ناوچەی شاری موسڵ دەچێت، چونکە هەولێر نزیک بووە لە موسڵ، هەروەها گەرماوەکانی ناوچەی سلێمانی نزیکن لە گەرماوەکانی سنەو کوردستانی ئێران، لەیەک چوونی ژینگەو زەوق و گۆڕینەوە و وەستاو و کرێکار و شارەزاکان باو بووە لەو سەردەمە.

بەڕێوەبردنی گەرماو پێویستی بەرێکخستن و ئامادەکردن و دابینکردنی کەرەستەی سووتان "دار" و ئاوە. ئەم میکانیزمە دەبوا هەبووایە، چونکە بۆ بەڕێوەبردنی گەرماو پێویست بوو.

ئەو گەشتە مەیدانییەی کە لە هەرسێ شاری "هەولێر، کەرکووک، سلێمانی" کردمان لێکۆڵینەوەیەکی سەرەتایی بووە بۆ زانین و بینینی ئەو گەرماوانە و شێوازی بیناسازییان و مێژووەکانیان بۆ ئەوەی لەناو پرۆگرامێکی گەورە لەسەر گەرماوەکانی رۆژهەلات لە لایەن ifpo کە پەیمانگای فەرەنسی لە رۆژهەلات سەرپەرشتی دەکات لە عەمان، ئەو زانیارییانە شایەنی پەرەسەندن و لێکۆڵینەوە و چارەسەرکردنی هەر مەوقیعێک بوو بەپێی پێویست وەک بیناو مێژوو لە ناوچەیەک دووچاری تێکدان و شەڕ بووە، کە ئەم شوێنەوارانە پێویستییان بە پاراستن و چاککردنەوە هەیە و پێویستییان بە پاراستن لە تێکدان و لەناوچوون هەیە. هەندێ سیمای تایبەتی و لێکچووی ئەم گەرماوانەم بۆ دەرکەوت بەو شێوەیەی خواردوە:

١- هەولێر:



گەرماوی قەلای هەولێر مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی سەدەی ١٨ی زایینی و بەڕێوەبەرایەتی شوێنەوار تەملیکی کردووە و ئێستا بەکار نایەت. بریتییە لە دوو هۆڵی پێکەوە گرێدراو بەرێگەی ملحقی سانەوی و شێوەی لاکێشە. لەسەری گومبەتێکی شێوە بازنەیی دروست کراوە کە لەساڵی ١٩٨٠ نۆژەن کراوەتەوە، لە لایەن ژن و پیاوانەوە بەکارهاتووە.

گەرماوی عەلی ئاغا: لە گەڕەکی خانەقایە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی سەدەی ١٨ و بریتییە لە دوو هۆڵی هەشت لایی کە بە گومبەتێکی شێوە بازنەیی داپۆشراوە و ئەمڕۆ نەماوە، بەڵکو وەک دوکانی مافوور فرۆشتن بەکاردێت. هی ماڵی عەلی ئاغا و نەوەکانییەتی.

٢- کەرکووک:

گەرماوی دەدە حەمدی لە گەڕەکی "موسەڵلا"یە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی ١٨ز، لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری کەرکووک تەملیک کراوە. ئەمڕۆ کەلاوەیە و وەک شوێنی حەوانەوەی مانگاو ئەسپ بەکاردێ، وەک ئاخوڕ. لایەنی بیناسازی گرنگە چاک بکرێتەوە و بایەخی پێ بدرێ.

گەرماوی عەبدولباقی: لەگەڕەکی قەلایە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٢٠، "تەملیک شخصی" بەشێکی بۆ ئافرەتان بەکار دەهات و بەشێکی بۆ پیاو، کە پێکهاتبوو لە دوو هۆڵی هەشت لایی بە گومبەتی شێوە بازنەیی داپۆشرابوو.

گەرماوی شەباب: لە گەڕەکی قەلایە، مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ١٩٦٠ز، "تملیک شخصی" ئەم دوو گەرماوە پێکدەچن لە لایەنی تەختیت و شێوازی بیناسازی.

٣- سلێمانی:

حەمامی سووردت: لە گەڕەکی ئاسنگەرانە، مێژووەکەی دەگەڕێتەوە

بۆ سەرەتای دروستکردنی شاری سلێمانی لە لایەن بابانەکان. مولکیەتەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ بنەماڵەی کەریم عەلەکە، ئەم گەرماوە تەنها لەلایەن پیاوانەوە بەکاردەهات، یەکێکە لە گەرماوە گرنگەکانی سلێمانی، گەرماوەکە لە لایەنی بیناسازی و گەورەیی بە گەورەیی دەژمێردرێت.

حەمامی موفتی: لە گەڕەکی سابونکەرانە، مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی سەدەی "١٩ز"، گەرماوەکە لە لایەن ئافرەتانەوە بەکاردێ، ئەوەی سەرنجڕاکێش بێت کولخانەکەی "الموقد" ئاگردانەکەی کە لە شێوازی بیناسازییەکەی شێوەی عەقری مدبب بەکارهاتووە و لە کەرپووچ دروستکراوە. "مولکیەتی شەخسییە".

حەمامی شێخ مارف: شوێنەکەی کەوتۆتە ناو بازاڕ لای مامەر فرۆشەکان، تەنها پیاوان بەکاری دێن "ملکیەتی شخصیە". شێوازی گەرماوەکە پێکهاتووە لە هۆڵێکی هەشت لایی کە بە گومبەت داپۆشراوە.

حەمام سلێمانی و سەیوان: مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی ١٩ی ز، تەنها بۆ پیاوان بەکاردێت و شوێنەکەی لەناو بازاڕە "ملکیەتی شخصیە" لە لایەنی بیناسازی و شێوازی هۆڵەکان ئەم دوو گەرماوە لە یەک دەچن.

**التخطیط- پلان:**

بەشێکی زۆری ئەم گەرماوانە لە دوو بەش پێکهاتووە لەگەڵ پاشکۆکانی: ژوور، قاعە و هۆڵی سانەوی، قاعەی یەکەم ناسراوە بە "المنزع یان المشلح" یان "القاعە البرانی" شوێنی داکەندنی جلوبەرگە. لە وەرزی هاوین بەکاردێت "قاعەیەکی ساردە" لە ناوەڕاستی نافورەی ئاو هەیە.

قاعەی دووەم: قاعەی خۆشووشتن "الجواین" یان "الداخلی"یە، ئەمەش لە زستانان بۆ خۆشووشتن بەکاردێت، چونکە ئاگردانەکەی تێدایە.

ئەم قاعانە شێوەی هەشت لایان هەیە، زۆربەیان لە ناوەڕاستی نافوورەی ئاو هەیە "قاعەی یەکەم" و بە گومبەت داپۆشراوە لە ناو دیواری گومبەتەکە پەنجەرەی شێوە بازنەیی بچووک هەیە بە شووشەی رەنگاوڕەنگ داپۆشراوە کە پێی دەڵێن "القمریە" ئەمەش لەوەوە هاتووە کە مانگ سەرچاوەی رووناکی بووە لە کاتی بەدردا، بۆیە بەم شێوە پەنجەرانەیان گوتووە قمریە.

ئاگردان یان الموقد- السخان کە بەکارهاتووە بۆ گەرمکردنی ئاو یان بەشێوەیەکی سەربەخۆ بووە وەک حەمامی موفتی لە سلێمانی، کە لە تەنیشتی بووە یان بەشێک بووە لە پشتی گەرماوەکان یان لە تەنیشتی دروست کراوە بەپێی سیستەمێکی تایبەت کە لە ژێرەوە گەرماوەکە گەرم بکات و ئاوی گەرم لەڕێگای بۆڕی مخاز "انابیب الفخاریة" کە بەکاردەهات، لەبەرئەوە لەو بۆڕیانە ئاوەکە درەنگ سارد دەبووەوە، کە لە قوڕ دروست کرابوو وەک لە گەرماوی دەدە حمامی بەکار هاتبوو. ئەم گەرماوانە یەک دەرگای چوونە ژوورەوەی سەرەکییان هەیە.

**لایەنی بیناسازی:**

ئەو عەناصرە بیناسازییەی کە بەکارهاتووە لەم گەرماوانەدا بریتییە لە عقد کەواتە شێوەی "عقد مدبب" ناڵەی ئەسپ، شێوەی نیمچە بازنەی عامود و توسی بەکارهاتووە بەشێوازی جیا و قەبارەی جیاواز



لەسەر بنکەی چوارگۆشە و لاکێشە و ئەستوور. زۆربەی "سقف"ەکانی ئەم گەرماوانە "قبو- voute" شێوەی لانکی داپۆشراوە. ئەو کەرستە بیناسازییەی کە لە گەرماوەکە بەکارهاتووە ئەوە لە ناوچەکە هەبووە وەک بەرد، گەچ، کەرپووچ لەگەڵ بەکارهێنانی مادەی قیر بۆ عزل کردنی دڵۆپە و سەرما.

**زەخرەف و دیکۆر:**

بەشێکی زۆر لەو گەرماوانە تووشی تێکدان هاتوون، ئەوە عەناصر و زەخرەف و نەخش و دیکۆر و وێنە کە تێیدا هەبووە لە ئەنجامی چاککردنەوەیەکی کوێرانە بەبێ "میتۆد- اسلوب علمي" داپۆشینی بە گەچ یان بە رەنگ و تێکدانی شێوازی دیکۆرەکەی. نموونەی گەرماوی "سوورەت" کە ناوەکەی لەوە هاتووە کە وێنە و رەسمی تێدابووە و شێوەی ئەندازیاری ئاژەڵی و رووەکی لەگەڵ بورجەکان "الابراج الفلكية"ی تێدا بووە و ئێستا هیچی تێدا نەماوە.

لە گەرماوی قەڵای هەولێر لەسەر مەدخەلە رەئیسییەکەی هەندێ عەناصری زەخرەفی ئەندازیاری شێوە ئەستێرەی هەشت لایی "معين" شێوەی رووەکی، گوزە و گەڵاو شێوەی لاکێشە و سێتی لای هەیە لەناوەوە ئیتارێکی هەندسی مزدوج. بە شێوەیەکی گشتی ئەم گەرماوانە هەژارن لە لایەنی زەخرەفە و دیکۆر.

**کەلوپەل و ئامێری بەکارهاتوو لە گەرماو:**

زۆربەی ئەو ئامێرانەی بەکارهاتوون لەلایەن ئەوانەی خۆیان شوشتووە بە تایبەتی ئافرەتان بریتی بووە لە "تاسی حەمام" کە شێوەیەکی هێلکەیی یان بازنەیی هەبووە، لە دوو بەش پێکهاتووە تێیدا سابوون و لیفکەیان داناوە و قەپات کراوە.

ئەم تاسانە هەندێکیان لە "نحاس" یان مس دروست کراوە و تێیدا زەخرەفەی شێوە سادە هەبووە وەک گەڵاو گوڵ یان شێوەی ئەندازەیی.

ئافرەتان مقەس و شانەی دار یان بەردیان بەکارهێناوە بۆ خۆشوشتن.

**کرێکارانی گەرماوەکان:**

حەمامچی: ئەو کەسە هەڵدەستێ بە کۆکردنەوە "الميارز- الميرز" یان خاولی پەشتەماڵ کۆ دەکاتەوە، کە خوارەوەی ناوک دادەپۆشێ.

ساقی: ئاوگێڕ لە گەرماو.

القيم: ئەو کەسە پیسی خڕ دەکردەوە لە گەرماو، هەندێ جار هەڵدەستا بە کاری "العقاد" ئاگری گەرماوەکە دادەگیرسێنێ.

البلان یان الحلاق: بە تایبەتی لە گەرماوی پیاوان هەبووە، کە ئامێرێکی بەکاردەهێنا "مووس بووە لەناو دەسکی دار" لەگەڵ بەردە مووس تیژکەرەکە.

دەلاک: ئەو کەسە پشتی ئەوانەی دەشووشت کە خۆیان دەشووشت، شوێنێکی تایبەت هەبوو وەک سەکۆیەک لەسەری دادەنیشتن بۆ خۆشوشتن. لە گەرماوی ژنان و پیاوان ئەو "تاتر یان دەلاک"ە هەبووە.

**سەردەم و مێژووەکەی:**

بەداخەوە لەبەر نەبوونی سەرچاوە و بەڵگەی نووسراو دەربارەی ئەم گەرماوانە یان ئەوەتە ئەو وەستاو کرێکارانەی کە دروستیان کردووە زۆر زانیاری تەواومان نییە، کە تێیدا ساڵی دروستکردنی ئەو گەرماوانە دەستنیشان بکات، ئەوەی لەسەر زاران و لەناو خەڵک هەیە یان گێڕدراوەتەوە، ئەوە بەس نییە بەڵکو پێویستە لە تۆماری تاپۆ و بەڵەدیە و بەڵگەکان لە "مەحکەمە" دیاری بکرێت و مێژووەکەیان تۆمار بکرێت بە شێوەیەکی راست.

**ئەنجام و پێشبینی:**

* کردنی "مسح میداني" توتیقی مێژووی بۆ هەریەک لەم گەرماوانە لێکۆڵینەوەی هەموو یەکەی بیناسازی و تەختیتی تێدایە.

* پاراستنی ئەم بینایە لای "بەڕێوەبەرایەتی شوێنەوار" لەگەڵ وەزارەتی گەشتوگوزار و شوێنەوار وەک بەشێک لە گەنجینەی بیناسازی ناوچە کوردییەکان لە لەناوچوون، چونکە ئەوانە بەهۆی تازەکردنەوە کوێرانە تێکدەدرێ بۆ دروستکردنی بازاڕ و دوکانی تازە لە جێگایان.

* ئەو گەرماوانەی لە ناوچەی سلێمانی هەیە شێوازێکی تایبەتییان هەیە لە داپۆشینی گومبەتەکان ئەویش بە بەکارهێنانی قوڕ و خۆڵ و کا، کە جیاوازی هەیە لەگەڵ ناوچەکانی تر، کە ئەمە تایبەتە بە ناوچە ساردەکان، چونکە ئاستی گەرماوەکان لە ١.٥م نزمترە لە ئاستی شەقامی ئێستا.



# گەرماوی قەڵاتی هەولێر

لیۆن بەرخۆ

قاسم ئاغای ناوداری شاری هەولێر لە سەدەی هەژدەم، هەرگیز بە خەیاڵیدا نەدەهات، کە ئەو گەرماوەی لەسەر گردێکی بەرفراوان و گەورەی ناو جەرگەی شاری هەولێر دروستکرد، رۆژێ لە رۆژان ببێتە شوێنەوارێکی گەشتیاری هەردەم پڕ جموجۆڵ[1].

گەرماوەکەی قەڵاتی هەولێر- گەرماوی گشتی- دووبارە بە شێوەیەکی رێکوپێک بینا رێژ کراوەتەوە، فرنی گەرماوەکەی بۆ گەرمکردنی ئاو و ژووری هەڵم بەکاردەهات. لە کۆندا، گەرمکردنی ئاو بە هەڵمکردنی ژووری هەڵم لە رێگای سووتاندنی زبڵ و زاڵ و قۆمەتە دارێکەوە ئەنجامدەدرا، بەڵام ئێستا هیچ دوکەڵ و زبڵ و زاڵێ بەرچاو ناکەوێ. ئێستا هەریەک لە ژوورەکانیْ زۆر رووناک و خاوێن خۆیان دەنوێنن، بە جۆرێک بابای گەشتیار زۆر بە ئاسانی و ئاسوودەیی دەتوانێ بەناو ئەو شوێنەی، کە بە یەکێک لە شوێنە دێرینەکان دادەنرێ، هاتوچۆ بکات. شایانی باسە، ئەو شوێنانە لە رابردووی دێریندا، ناوەندی کۆبوونەوەی کۆمەڵایەتییەکانی شاری هەولێر بوون.

بیناڕێژی و رێکخستنەوەی گەرماوەکەی قاسم ئاغا بە بەشێکی سەرەکی ئەو پرۆژە فراوانە دادەنرێ، کە بەشی شوێنەوار لە جموجۆڵی بەردەوامدایە بۆ نوێکردنەوەی خانووبەرە رووخاوەکانی کۆنە قەڵاتی هەولێر. قەڵاتی هەولێر شایەن بە ئاوڕ لێدانەوەیە، چونکە ئەو قەڵاتە بە کۆنترین ناوەند دادەنرێ لە جیهاندا، کە تاکو ئەمڕۆ ژینگەی شارستانی و ئاوەدانی تێدا بەردەوام بێت.

تا ئەو دواییە گرنگی گەرماوی گشتی- وەک ئەوەکەی قەڵاتی هەولێرێ- لە شارە گەورەکاندا ئەرکێکی پشتگوێ خراو بوو، چونکە خەڵک دەرکیان بە گرنگی گەرماو نەدەکرد. لە کۆندا، دروستکردنی گەرماوی گشتی کارێکی کۆمەکی-

بە کۆمەڵ- بووە. هەموو توێژەکانی کۆمەڵ بەشداری بیناکردنی گەرماوی گشتییان دەکرد، رەش و رووتی کۆمەڵ لەلایەک و خواپێداو و خێرخوازانی نێو زەنگینەکانی کۆمەڵیش پارەیەکی زۆریان خەرج دەکرد بۆ بیناڕێژی و رازاندنەوەی گەرماوەکە.

گەرماوی تایبەتی مالآن تا رادەیەک دەوری خۆی بینیوە لە کەمکردنەوەی رۆڵی گەرماوی گشتی لە رابردوودا، بەلآم لە عێراقی کۆندا، دیمەنی جوانی بیناسازی خانووەکان و رۆڵی کۆمەلآیەتی گەرماوە گشتییەکان- وەک ناوەندێکی کۆمەلآیەتی- دیوەخان- رۆحی وەبەر گەرماوی گشتی ناوەتەوە، بەواتای بە حوکمی ئەوەی گەرماوی گشتی هەر بۆ خۆشوشتن نەبووە، بەڵکو وەک کۆڕ و دیوەخانێکیش بووە، هەر بۆیە لە عێراقی کۆندا، گەرماوی گشتی دەوری خۆی هەر هەبووە و شوێنێکی بەرهەمهێن بووە لە رووی کۆمەلآیەتییەوە.

مێژووی سەرهەڵدانی گەرماوی گشتی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی بوونی رۆمانەکان لە سوریا و فەلەستین، هەر بۆیە تاکو رۆمانەکان بیرۆکەی گەرماوی گشتییان بۆ سوریا و فەلەستین نەهێنا، گەرماوی گشتی لە ناوچەکەدا بوونی نەبووە.

سەبارەت بە عەرەبان، لە سەدەی حەوتەمی زایینی کۆمەڵی عەرەبی پێشکەوتوو بیناڕێژی گەرماوی گشتییان بە کارێکی پەسەند و پێویست زانی، بۆیە هەرزوو خوویان دایە دروستکردنی گەرماوی گشتی لە ناوچەکانیاندا، لەپاشان، بیرۆکەی دروستکردنی گەرماوی گشتی لەنێو عەرەبان بوو بە ئەرکێکی پەسند و شایەن.

سەبارەت بە کوردان، ئەگەر بە وردی لە نەخشەی گەرماوی قاسم ئاغای هەولێری بڕوانین، ئەوا دەبینین گەرماوەکەی قاسم ئاغا لەو گەرماوە گشتییانەی شاری بەغدایێ دەچێ، کە تاکو رۆژگاری ئەمڕۆش ماون و جێگەی پەسەند و هاتوچۆی نەوە کۆنەکانی شاری بەغدایێن. مێژووی دروستکردنی گەرماوەکەی قاسم ئاغا دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٧٧٥[٢]. گەرماوەکە دوو ژووری جل گۆڕینی تێدایە[٣]. هەریەکە درێژکۆڵە و چەماوەیی هەڵکەوتووە و دیوارەکانیان چەند چەنگاڵێکیان پێوەدن بۆ هەڵواسینی جلوبەرگی نەفەرەکان. هەرچی ژووری هەڵمە[٤]. ئەوا شێوە گومبەتییە و زەوییەکەشی رەنگ قەرمیدییە.

لە پاشان چەند کونێک لە بنمیچی ژوورەکەدا هەن و ئەو کونانە وەک کلاوڕۆژنەیەک ژوورەکە بە رووناکی دەنوێنن. دەفرەکانی ئاویش، ئاویان لە حەوزێکی گەورە بۆ دێت، هەریەکەشیان بەلوعەیەکی ئاوی سارد و یەکی ئاوی گەرماوی لە شوێنی گونجاوی خۆیدا - لەسەر دەفرەکە - هەیە. سەرچاوەی سەرەکی ئاو بۆ گەرماوەکە لە بیرێکی قووڵی دوو سەد پێیی (٦٠ مەتر)ەوە دەهات[٥]، بەلآم بەداخەوە ئەمڕۆکە بیرەکە وشکی کردووە یان رێکتر بڵێین بیرەکە پڕ بۆتەوە!.

کاک کەریم فەتحی، بەرپرسی تیمی بووژاندنەوەی قەلآ، دەڵێ: ئەو ئاوەی لە بیرەکەوە هەڵدەقوڵا بەشی پێویستی گەرماو و هەروەها بەشی بەشێکی زۆری خەڵکی قەلآتیشی دەکرد، بەلآم مخابن بیرەکە بە زبڵ و زاڵ پڕ بۆتەوە.

شێوازی گەرمکردن و کوڵاندنی ئاوی گەرماوەکە زۆر سەیر و سەرنجڕاکێش بووە، بە جۆرێک سەرنجی زانا نوێیەکانی شوێنەواری راکێشاوە.

رێگای گەرمکردن و کوڵاندنی ئاوی گەرماوەکە بەم شێوەیە بووە: بۆ گەرمکردن و کوڵاندنی ئاوی گەرماو هەرچی زبڵ و زاڵی قەلآت هەبوو لە زبڵدانێک کۆ دەکرایەوە، لە پاشان هەر هەمووی بۆ ئەو کوانەوە (کورخانە) دەگواسترایەوە، کە یەکسەر لەژێر تانکی ئاوی گەرم دروست کرابوو. ئەو تانکییە چەند بۆرییەکی بۆ ژووری هەڵم لێ راکشا بوو. بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی دروست ئاوی گەرم بگەیەنەتە دەفرەکان. هەر کە ئەو هەموو زبڵە گڕی تێبەردەدرا و دەبووە خۆراکی ئاگرەکە، ئەوا ئەو رۆژە لە دەرەوە و ناوەوەی گەرماوەکە دەبووە رۆژێکی خۆش، چونکە لەو رۆژەدا میوانان، گەشتیاران هەتا دانیشتوانی قەلآتێ گەرماوێکی خۆشیان دەکرد.

پێکهاتەی ئێستای گەرماوەکە هەندێ گۆڕانکاری تێداکراوە، بە جۆرێک لە پرۆژەی بووژاندنەوەدا گڵۆپی کارەبایی و چەند کەلوپەلێکی

تری بیناسازی هاوچەرخ بە شێوەیەکی گونجاو و پێویست بەکارهێنراون و هەروەها چەند گۆڕانێکی کەمیش لە پێکهاتەی بیناسازی گەرماوەکە ئەنجام دراوە. هەر گەشتیارێک، دیدەنیارێک، میوانێک بەو زانیارییەی هەیەتی لەبارەی ئەرکی گەرماوە گشتییەکانەوە زۆر بە ئاسانی دەشێ هەموو بەکارهێنانەکانی بەشی بیناکە دیاری بکات.

هەر کە دیدەنیار لە قاپی گەرماوەکە دەچێتە ژوورەوە حەوشەیەکی بچووکی بەرچاو دەکەوێ[٦] لە پاشان بەبن سەردەرگەیەکی مەرمەڕی[٧] بەرەو ژوورەکانی جل گۆڕین، خۆگۆڕین دەچێت: لەو ژوورانەدا نەفەرەکان جلەکانیان دادەکەنن و بەو چەنگالانەوەی دەکەن، کە بە دیوارەکاندا قایم کراون. لەپاش جل داکەندن بۆ خۆشوشتن هەریەکە خاولی لە کەمەری خۆی دەئالێنێت، پێلاوی سەندەلی لەپێ دەکا و بەرەو ژووری هەڵمی شێوی گومبەتی و رەنگ قەرمیدی دەخشێت، لە ژووری هەڵمدا نەفەرەکان بە ئارەزووی خۆیان لەسەر لەوحێکی مەرمەڕی[٨] رادەکشێن و بانگی پشت شۆر دەکەن، بۆ ئەوەی بە سابوون و لیفکە بیانشۆن.

نەفەرەکان کاتی دیارکراویان بۆ دانەنراوە، بەڵکو مانەوەیان لە ژوورەوە پەیوەست بووە بە رادەی خۆ راگرتنیان لەو ژوورە گەرم و شێدارەدا، هەر کە نەفەرەکان لە خۆشوشتن دەبوونەوە لە ژووری خۆگۆڕین چایەکی بە تام و ئاوی پرتەقالیان دەخواردەوە. لە پاشان ئەو جەربەزەییە بە خواردنێکی چڕ و پڕ و تایبەت کۆتایی پێدەهات، کە هەولێرییان پێی دەڵێن سەروپێ!.

**پەراوێزەکان:**

١- رۆژی نەورۆزی ١٩٩٩ سەردانی ئەو گەرماوەم کرد، مام رەفعەت شاکر محەمەد فەرمانبەر لەم گەرماوە پێی وتم: ئەو گەرماوە لەلایەن ئەحمەد ئاغا دروست کراوە نەک قاسم ئاغا، قاسم ئاغا کاتی خۆی ئەو گەرماوەی بەکرێ گرتووە. لەپاش ئەویش عەبدولڕەحمان ئاغا بەکریی گرتووە.

٢- لەوانەیە ئەو مێژووە، مێژووی دروستکردنی گەرماوەکە نەبێ، بەڵکو مێژووی بەکرێ گرتنی گەرماوەکە بێ لەلایەن قاسم ئاغا، هەندێ مەزندە دەکەن، کە ئەو گەرماوە لە نێوان سالانی ١٧٢٥-١٧٣٠ دروست کرابێ.

٣- ژووری یەکەم بۆ هاوینان بووە، هەرچی ژووری دووەمە، کە نەختێ بچووکترە بۆ زستانان بووە.

٤- ئەوەش دوو ژوورە، یەکێکی گەورە، کە پێنج شوێنی نیمچە ژووری تێدایە، هەرچی هی دووەمە بچووکترە و بە قەد گەورەکە گەرم نییە.

٥- لە ژێر بیرەکەدا کارێزێک هەبووە، کە سەرچاوەکەی لە بەستی بەستۆڕەوە دەهات و لەلای کۆنە خانووی ئەحمەد چەلەبی دەردەچوو. لە پاشان ئەو ئاوە بەهۆی سێ وڵاغەوە لە بیرەکە دەردەهێنرا دەگەیاندرا دەفرە گەورەکەی ناو گەرماوەکە.

٦- شوێنەوار لە وەزارەتی رۆشنبیری جارێکی دیکە دەستی کردووە بە نۆژەنکردنەوەی گەرماوەکە، بە جۆرێک ئێستا ئامادەیە جارێکی دیکە ببێتەوە ناوەندێکی کۆمەڵایەتی، بریار وایە لە ٢٤/ ئاداری ١٩٩٩دوە ببێ بە پێشانگای فۆلکلۆری.

٧- ئێستا گەرماوەکە حەوشەیەکی گەورەی بۆ کراوە.

٨- ئەو دەرگا سەر مەرمەڕییە، وێنەی چەند ئەستێرە و سێگۆشەیەکی لێ نەخشکراوە، بە جۆرێک ئێستا مزگەوتێک لە نزیک گەرماوەکە هەیە، مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سالی ٢٢ کۆچی. دەڵێن ئەو مزگەوتە لە کۆندا کلێسای جوولەکەکانی قەڵاتێ بووە.

٩- دەڵێن ئەو بەردە گەورەیە جاران لەلایەن ئەو کەسانەی، کە تازە بەزاوا دەبوون بەکار دەهات.

ژێدەر:

**July, The Baghdad Observer, 15,1990,P.6.**

وەرگێرانی: سەلام ناوخۆش، مامۆستای یاریدەدەر - زانکۆی دهۆک

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری (شانەدەر) ژمارە (١١)ی ئایاری سالی ٢٠٠٠ وەرگیراوە.



# خان و حەسار لە هەولێر

پیرداود مەخمووری

گەڕان و سۆراغکردنی بابەتی فۆلکلۆری و کلتووری شتێکی ئاسان نییە، کە مرۆڤ بتوانێت بچێتە هەموو کەلێن و قوژبنێکی و تاووتوێی بکات و چاک و خراپی لێکدی هاوێر بکات ئەم کارە هەوڵ و ماندووبوونێکی زۆری دەوێ زانا و وەستای چاک و کارامەی گەرەکە، ئەو بابەتانەی کە تاکو ئێستا تۆمار نەکراون و لێکۆڵینەوە و تۆژینەوەی خەستیان لەسەر نەکراوە، پێویستە هەوڵ و کۆششیان بۆ بدرێت لە پێناو زیندووکردنەوەی کلتووری میللەتەکەمان کە چەند عەیامێکە لەسەر یەک کەڵەکە بووە.

ئەگەر چی پەندی کوردی هەر هەموو نەخش و نیگارێکە هەریەکێکی دانە گەوهەرێکە، وەلێ من لەگەڵ هەموویان نیم، بۆ نموونە کورد دەڵێ: (لە دوو چووان مەچوو)[1] من ئەوەی کە چووە بە سەرچاوە و رەسەنایەتی خۆمی دەزانم، بۆچی خەم لەو هەموو کەلەپوور و نەخشە دێرینانەی باپیران نەخۆم، بەڵێ من لە دوو چووان دەچم و رۆژێ دادێ لە باشەکەی سوود دەبینم.

بۆچی ئێمە کە شتێک لە دەست دەدەین و دەیمرێنین ئەو کاتە فرمێسکی بۆ دەرێژین، ئەو قسانەمان بۆ ئەوە نییە خوانەخواستە لەگەڵ نوێخوازیدا نەبین و رەفزی بکەین، نەخێر هەموو شتێکی تازە و نوێخواز جوان و بە سوودە، بەڵام ئەو جوانییە نابێت لەسەر حیسابی ڕەدکردنەوەی فۆلکلۆر بێ، بە دەستی خۆمان ماڵی خۆمان کاول بکەین و ئاگر لە جۆخین و ردوسەی رەسەنایەتیمان بەردەین و خۆمان لەسەر ساجی عەلی دانێین، ئەو کورتە پێشەکییەمان بۆ ئەوەیە، کە نەوەی دادێ شتێک سەبارەت بە باپیرانمان بزانن، راستە هەولێر کۆنترین پێگەی مرۆڤایەتییە لەسەر رووی زەوی بە پێی ئەو بەڵگەنامە کۆن و نووسراو و شوێنەوارە دێرینانەی کە تێیدا دۆزراونەتەوە[2].

ئەگەر بەراوردێکی ئەو هەموو نووسینانەی کە سەبارەت بە هەولێرێکی تەمەن پێنج هەزار ساڵە نووسراون بکەین، هیچی بۆ نەکراوە، چونکە هەویری هەولێر ئاوی زۆر لەوە پتر هەڵدەگرێت، ئەو قەڵایە کە چەندەها جار تووشی ساردی و گەرمی هاتووە، سەرباری ئەو هەموو کێشمە کێش و بینەوبەردەیەی داگیرکەران و چاوچنۆکان کێ دەزانێ هەولێر لە تەمەنیدا چەند جاران رووخاوە و چاک کراوەتەوە و دیمەنی بیناسازی گۆڕاوە و تازە کراوەتەوە.

نامانەوێ لەوە پتر درێژە بە باسی هەولێر و جوگرافیای هەولێر بدەین و شوێنەوارەکانی پێناسە بکەین، ئەوەی ئێمە لێرەدا دەمانەوێ پتر باسی لێوە بکەین و پەردەی لەسەر هەڵماڵین هەندێ لایەنی باری ژیانی خەڵکی هەولێر و دەوروبەرێتی و لە ماوەیەکی کورتی ژیانی هەولێرییان بدوێین و سەربردەیان شارەزا بین، چەند لایەنێک لە داب و نەریتی

کۆنی هەولێر و دوکان و قەیسەری و خان و لۆقنتە و گەرماوەکانی هەولێر باس بکەین.

هەولێر سەردەمانێک لە چەند گەڕەکێکی وەک: (تەعجیل، قەیسەری، سەعدووناوە، عەرەب، جوولەکان، شێخەڵلا، خانەقا)[3]، هەر گەڕەکێک تایبەتمەندێتی خۆی هەبووە، ئەگەر چی (قەیسەر) گەڕەک نەبووە پتر وەک شوێنێکی بازرگانی دەناسرا و کڕین و فرۆشتن و مامەڵەت و سەودای لێدەکرا لەگەڵ چەند پیشەگەرێیکی دەستی.

دیارە هەولێر ناوچەیەکی دەشتایی پان و بەرینی هەیە و پانتاییەکی زۆری لێ دەکرێ بە کشتوکاڵ، هەر بۆیەش لە پێناو ساغکردنەوە و ئاڵوگۆڕکردنی بەرهەم و بەروبوومی کشتوکاڵی پێویستی بە بازاڕێکی ئەوتۆ هەبووە، کە لە هەموو لایەک رووی تێ کراوە، لادێیی و کرمانجەکانی دەشت و ناوچە شاخاوییەکان هاتوون شتومەکی خۆیان تێدا فرۆشتووە و سەودایان پێ کردووە، لە هەولێر بازرگان و خەڵکی کڕیار و فرۆشیار بەیەک دەگەیشتن، هەر ئەمەش بوو وای کردووە کە لە هەولێر چەند شوێنێک پەیدا بێ، ئەم جۆرە مامەڵەت و سەودایەی لێ بکرێ، سەرباری چوونی شوێنی حەوانەوە و خزمەتکردن وەک: (خان، چایخانە، کەبابخانە، سەروپێخانە... هتد)[4] ئەمانە هەمووی لە لایەک وەک بازرگانی ناوخۆ لە لایەکی دیکەوە، هەولێر وەک کاروان سەرایەک لە نێوان شارە گەورەکان و رێگای نێوان ئەو وڵاتانەی، کە دەوری کوردستانیان داوە و هەموو لە هەولێر بازرگانی و کەلوپەلی هێناویان ساغ دەکردەوە، بە تایبەتی رێگای نێوان (موسڵ و کەرکووک و سلێمانی و مەهاباد و دیاربەکر و قامشلییەوە)[5]، ئەگەرچی ئەو چەند ساڵە و سەردەمەی کە لە دووتوێی بابەتەکەماندا هاتووە، کورد دوور و نزیک کەوتۆتە بەر تەوژمی ئەو تەکنەلۆژیایەی جیهانی، بەڵام زیرەکانە توانیویەتی بە پێی تێگەیشتنی خۆی و ئەو تەکنەلۆژیایەی، کە زانیویەتی مامەڵەت بکات.لەبەر نەبوونی سەرچاوەی باوەڕپێکراوی دروست پتر پشتمان بەستووە و راستەوخۆ لەسەر زارەکی گواستراونەتەوە و نووسراون[6]. ئەو شوێن و جێگایانەی کە لە باسەکەماندا هاتوون و باسیان لێوە دەکەین بەشی زۆریان فەوتاون، بەڵام وەک جوگرافیا شوێنەکانیان دیاری دەخەین، لەسەر شوێنەوارناس و فۆلکلۆریستان پێویستە گەڕانێکی خێرای بۆ بکەن و ئەتنوگرافیای هەولێر زیندوو بکەنەوە، یا ئەو کەلاوە کۆنانەی ماون بەدەردی فەوتاوەکان نەچن، لە پێش هەمووشیان منارەی چۆلی و تاق و حەسار و گۆڕستانەکان.

## خان لە رووی زمانەوە

خان پاشگرێکە دەچێتە دواوەی ناوێک یان شوێنێک یان وشەیەک، دەیکاتە ناوی (لێکدراو) مانای دەگۆڕێت و وەک ئاوەڵناوی شوێن بەکاردێت، وەک: (دیوەخانە، قاوەخانە، چایخانە، میوانخانە، سەرتاشخانە، قوتابخانە...هتد) لێرەدا (خان) بە واتای شوێن یان جێگە دێت، (شوێنی قاوە خواردنەوە، یان شوێنی کەباب خواردن...).

ئەگەر خان چووە پاڵ ناوی ئافرەتێکەوە وەک (ئاواز، حەپسە، خانزاد، سینەم) لێرەدا خان دەبێ بە سیفە بۆ ئافرەتەکە و بەواتای بەڕێز و خاتوون دێ، (ئاواز خان، حەپسە خان، خانزاد خان، سینەم خان...)، هەروەها خان زۆر واتای دیکەی هەیە، وەک: (نازناوە) بۆ ئافرەت (خانێ). لە قەب و شۆڕەتە (بەدرخانییەکان).

(سەرخان و ژێرخان لە بواری رامیاری)،[7] خاوەن دەسەڵات و سەروەت، یان بەواتای تەبەق لەسەر تەبەق، کە پارچە شتێک دەنەخشێت پێی دەگوترێ خانە خانە، ئەو نەخشەی لە لوولەی تفەنگەوە هەیە پێی دەگوترێ (خانە)، ناوی خانوو هەر لە خانەوە هاتووە، کە شوێن دەگەیەنێ.

## خان و خانچییەتی

ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە (خان) ئەو شوێنە دەگرێتەوە، کە جاران وەک کۆگشتێک جێگای (حەوانەوە و مامڵەت و سەوداکردن و کۆگا و خواردنگە و مەیدانی بازرگانی بووە)[8].

خانچی... سیفەتێکە دەدرێتە پاڵ ئەو کەسەی کە کاروباری خان بەڕێوە دەبات و ساخبێری دەکات، مەرج نییە هەموو خاوەن خانێک (خانچی) بێ، یان ئەو کۆمەڵە کەسەی کە لە خاندا کار دەکەن، خانچی بن.خانی وا هەبووە چەند پیشەگەرێکی دەستی تێدابووە،

وەک: (سەفارچی، کەبابخانە، نالبەندی، خەڵووزفرۆش، جامبازی، دەلالی، چایەچێتی...)[9].

**خان و حەسار**

خان و حەسار لە دروستبوون و پێکهاتە زۆر لێکدی نزیکن و بریتییە لە چەند ژوورێک و حەوش و بەرێکی گەورە، بەلام هەموو حەسارێک خان نەبووە، چونکە تایبەت بووە بە نیشتەجێی خەڵک و خێزان. هەرچی (خان)ە، وەک شوێنی بازرگانی بووە، جاران چەند حەسارێکی گەورە و بەناوبانگ لە هەولێر هەبووە لە هەموویان گەورەتر حەساری مالّی (حەسەنە سۆری) کە لە سەردەمی کۆن کرابووە (قشلەی سواری) ئێستاش دەرگای هەر ماوە و قەمتەرە و نەخش و گەچکارییەکەی هەر دیارە.

خان دوو جۆری هەبووە، جۆرێک چەند ژوورێکی تێدابووە کە هەر ژوورە و تایبەتمەندی خۆی هەبووە، هەندێک وەکو (ئوتێل) بۆ حەسانەوە و مانەوەی شەو بەکارهاتووە لەگەڵ ئەوەی کە جێگای مامەڵەت و بازرگانیش بووە، جۆرێکی دیکەی (خان) تایبەت بووە بە خانی (ئاژەلان) بە تایبەتی مەڕ و بزن و رەشەوڵاخی لێ رادەگیرا و کڕین و فرۆشتنیشی لێ دەکرا، پاراستن و ساخبێری کردنی مەڕ و مالات لەسەر (خانچی) بووە، ئەو کەسانەی کاریان لەم جۆرە خانانە دەکرد پتر جامبازەکان بوو، بەتایبەتی بنەمالّەی (سەعید جامباز و شێخان جامباز)[10]. هەرچی ئەو جامبازانە بوون بە پارە مامەڵەتیان بە مەڕ و مالات دەکرد، ئەوەی کە دەیفرۆشت دەلال بوو، ئەویش لێزان و کارامە بوو، بازاڕی گەرم دەکرد جاڕی دەدا و کڕیار و فرۆشیاری پێکدێنا.

**خان لە پەندی کوردیدا**

خان وەک کاروان سەرا، هەموو کەس ڕێی تێ دەکەوت، نەخاسمە ئەگەر خەڵکی دەرەوەی شاری هەولێر با، بۆ هەر مەبەستێک بهاتایە هەولێر ئەگەر لە مالّی خزم و ناسیاوێک نەبایە، ئەوا دەبوایە سەر بە خانێک دابگرێ و شەوی لێ بکاتەوە، زۆرجاری وا دەبوو خاوەنی (خان) یاخود خانچی قەرز و قۆڵی لەگەڵ کاروانچییەک کردبا و کابرای کاروانچی لە مامڵەتەکەیدا یاخود لە گفت و قەولی خۆی دوا بکەوتایە و قەرزەکەی نەدابایەوە و دوا کەوتبا، ئەوا کابرای خانچی دڵنیا بوو لەوەی کە دۆستەکەی هەر دەگەڕێتەوە بۆ لای و بێ ئەوەی خۆی بشڵەژێنێ ئەو پەندە کوردییەی دەگوت: (ئەو کاروانچی ئەمن خانچی)[11].

دیسان ئەگەر کەسێک خۆی زۆر بە زانا و بلیمەت بزانیبا و سەری لە زۆر شت دەرچووبا، ئەوا بە جۆرێک خۆی مەدح دەکرد و دەیگوت: (ئەمن لە کاروانچی بوومە خانچی)[12]، کەواتە سەرم لەم بەزم و ڕەزمە دەردەچێ و لێی دەزانم، دیارە (خان) حەوش و بەرێکی گەورە بووە و جێگای هەموو شتێ بۆتەوە، تەنانەت جاری وا هەبووە کاروانچی بەخۆو چەند باری گەورەوە هاژوایتییە بنەبانێ، بۆیەش کورد دەڵێ: (خانە لێخوڕە ژۆرێ) یان (لۆ چما خانە هەرکوتییە ژۆرێ).

زۆرجار کە شتێک زۆر دەبێ و وەک بڵێی شتەکە هەوەنتەیە، هەرچی دێت و هەندێکی لێ دەبا، بۆیە کورد دەڵێ: (چما خانە هەوەنتەیە؟) کە واتە بەلاشە.

هەروەها کورد دەڵێ: (تا خان ئەسازێ لەشکر ئەترازێ)[13]، (یا ئەبێ بە خانی خانان یا بە پووشی بانان).

**خانە بەناوبانگەکانی هەولێر**

ئەو خانانەی کە لە هەولێری جاران هەبوونە و ئێستا نەماون ئەمانەن:

١- (خانی عەلی حاجی ئەحمەد ئاغا) کە شوێنەکەی ئێستا ئەو کۆمەڵە دوکانەیە کە دەکەونە بەرامبەر مزگەوتی (ئالتی بەرماغ) کە بریتی بوو لە چەند ژوورێکی وەک (دوکان) بەکار دەهاتن، بە زۆری پەنیر و ژاژی فرۆشەکانی دەهاتنێ، جێگای حەوانەوەی ڕێبواران بوو، بەتایبەتی ئەوانەی کە فریای گەڕانەوە نەکەوتبوون، کابرایەک سەرپەرشتی ئەو خانەی دەکرد و پێویستییەکانی رادەپەڕاند ناوی محەممەد خانچی بوو، لە هەمان کاتدا نالبەندیشی دەکرد لە خانەکە، حاجی ئەحمەد شەوقی بۆی گێڕامەوە گوتی لەناو خانەکە چایخانەیەک هەبوو خەڵکی زۆر لێ بوو، لەو دەمەیدا بووە غەلبەغەلب کە لە دەرەوە (شەڕە)، خەڵکەکە هەموو پێکەوە لە چایخانەکە دەرچوون، لەگەڵ ئاخیرەمین کەس کە لە چایخانە چووە دەرەوە، کاریتە و شەقڵەی چایخانەکە هەمووی پێکەوە شکان و بانەکەی (ڕما) باش بوو کەس

زەرەری نەهێنا.

٢- خانی سپی، کەس نییە لە بەساڵاچووانی هەولێر ناوی خانی سپی نەبیستبێ و هاموشۆی نەکردبێ، خانێکی گەورەی دوو تەبەق بوو، سەربردەی زۆری هەیە، میری بۆ چەندساڵێک کردی بە (دایەرەی حکومەت)، ئەوەی لەبارەی ئەم خانە دەگێردرێتەوە، ئەوەیە کە گوایە کاریتەکانی لە وڵاتی عەجەم بۆ هاتبوو، هەر لەبەر ئەوەی گەچکارییەکی تەواو کرابوو، سپی کرابوو ناوی خانی سپی وەرگرتبوو، بەم دواییە چەند دوکانێک بوو بۆ خەڵووز فرۆشتن بەکار دەهات، شوێنەکەی ئێستا دەکاتە ئوتێلی (بێخاڵ)، ئیبراهیم داود چیچۆ دەباغی لێ دەکرد.

٣- خانی (حەسەن بەیرەم)، ئەمەش لە خانە بەناوبانگەکانی هەولێر بوو، ئێستا شوێنەکەی دەکەوێتە جێگای نوتێلی مێرگەسوور پشت مزگەوتی خانەقا، یەکەم کەبابخانە لە هەولێر لە تەنیشت ئەم خانە دانرا، لە بەینی هەردوو گەرماوی گەورە و بچووک، ئەویش دەرویش عەلی کە دەکاتە باوکی ئەحمەد شەوقی کەبابچی، مام قوربانی سەرپەرشتی ئەو خانەی دەکرد و خدرۆکە جوو خمچیەتی لێ دەکرد، هەر ئەو جوولەکەیە (بەیتار) بوو لە شکستی دەزانی هەروەها سێ جوولەکەی دی خمچیاتیان لێ دەکرد، ئەوانیش (یۆنە، بەبۆ، ئیسحاق)، بە گشتی ئەم خانە تایبەت بە خمچیەتی بوو.

٤- (خانی قۆجە)، ئەویش نزیک مزگەوتی خانەقا بوو لە تەنیشت حەمامی گچکە، تەنیشت خانی حەسەن بەیرەم، ئەو کەسەی لەم دوو خانە بمابایەوە، لە حەمامی گچکە کە خاوەنەکەی سۆفی حەمەدەمین بوو خۆی دەشووشت.

٥- خانی هێلەگچی، خاوەنەکەی نورەدین ئاغا شێخۆ ئاغا بوو، بە زۆری پێویستییەکانی کوردەواری لە هێلەگ و سەرەند و بێژینگی لێ دەفرۆشرا، شوێنەکەی ئێستا ئەو کۆمەڵە دوکانەیە کە دەکەوێتە بەرامبەر (بازاڕی سیروان). کابرایەک بەناوی خدر خانچی سەرپەرشتی دەکرد.

٦- خانی (عوسمان کەردزی)، شوێنەکەی ئێستا جێگای بانکی رەشیدە. (خدر ناڵبەند) سەرپەرشتی دەکرد.

٧- خانی (حاجی سەعید جامباز)، لە گەرەکی جوولەکان بوو، بە زۆری مامەڵەتی کڕین و فرۆشتنی مەڕ و ماڵاتی لێ دەکرا، خوری فرۆشی و ناڵبەندی لێ دەکرا، زۆر لە خاوەن مەڕەکانی دەشتی هەولێر سەر بەو خانە و ئەو بنەماڵەیە بوون، سمایل خۆشناو جغارە فرۆش سەرپەرشتی دەکرد، سەید محەمەد سەید جاسم بەرامبەری چایخانەی دامەزراند.

٨- خانی (مستۆکنی)، ئێستا شوێنی دەرمانخانەی شیمالە، خەڵوز فرۆشی لێدەکرا، چەند ژوورێکی تایبەت بوو بە (زۆرخانە)، ئەوکاتی پاڵەوان بازییان پێ دەگوت، ئەو کەسانەی لە زۆرخانەکەدا ئیشیان دەکرد پاڵەوان بازییان دەکرد، (ونس شەمۆ، ئەیوب نانەوا)، (پاشا و عەلی) ئیرانی بوون میلیان هەڵدەگرت.

سەرچاوەکان:

١- پەندی کوردی: بەرگی یەکەم (عومەر شێخەڵڵا).
٢- اربیل فی أدوارها التأریخیە (زبیر بلال اسماعیل)، ١٩٧٠.
٣- تأریخ أربل (ابن المستوفی)، ل١٦٧ - ١٤٤.
٤- أربیل فی أدوارها التأریخیە، زبیر بلال اسماعیل، ١٩٧٠.
٥- چەند زاتێکی بە ساڵاچووی هەولێر (سەید ئیسماعیل تەمەنی ٧٥ ساڵە) و (حاجی ئەحمەد شەوقی تەمەنی ٧٠ ساڵە).
٦- هەولێرم وا دیوە - بیستووە، بەرگی دووەم، سەید مەولود بێخاڵی، ١٩٩٨.
٧- گۆڤاری هەولێر، ژمارەی تایبەت بە دامەزراندنی شارەوانی هەولێر.
٨- شێخ چۆلی، زوبێر بلال ئیسماعیل، ١٩٨٨.
٩- چاوپێکەوتنێک لەگەڵ بەڕێز تاریق محەمەد سەعید جامباز.
١٠- هەمان سەرچاوە.
١١- پەندی کوردی، شێخ محەمەدی خاڵ، بەرگی یەکەم.
١٢- پەندی کوردی، عومەر شێخەڵلا، بەرگی دووەم.
١٣- پەندی کوردی، شێخ محەمەدی خاڵ، بەرگی یەکەم.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری هەولێر، ژمارە (٢) ساڵی (١٩٩٩) بڵاوبۆتەوە.

# خانەکانی هەولێر

خان بریتی بووە لە حەسارێکی گەورە لەناو شاردا (واتە بازار)، بۆ وەستان و سانەوەی ولاخەکانی ڕێبواران و ئەوانەی، کە لە گوندەکاندا بەیانیان دەهاتن بۆ شار. جا (دار) ڕەژوو، بەفر، ماست، کەنگر، تۆڵکە، پیفۆک، کاردی، کا، گەنم و جۆ، کاریتە و شەقرە یان دەهێنا، ولاخەکانیان لەم خانانەدا دەبەستەوە و ئالیک و ئاویان دەرخوارد دەدان. خانەکان زۆربەیان دوو نهۆم بوون، گەر ڕێبوارەکان شەو لە هەولێر بمابانەوە لە نهۆمی سەرەوە دەخەوتن و ئەو خانانەی کە لە یادی تەمەندارەکان مابوو ئەمانە بوون:

**ا- خانی سپی:**

ئەم خانە شوێنەکەی تەنیشت باتای ئێستا بووە، دیوارەکەی بە قوڕی سپی سواغ درابوو، بۆیە خانی سپییان پێدەوت، جگە لە ڕێبوارانی دەشتی هەولێر حوشترەوان بە بارە خوێوە لەم خانەدا دادەبەزین، لەبەر ئەوە دەرگای قەنتەرەکەی زۆر بەرز بووە.

**ب- خانی حەسەن بەیرەم:**

ئەم خانە شوێنەکەی جێگای فندق مێرگەسۆری ئێستا بوو، زۆر سەوزە و مێوەی بە بارەوە لەلایەن خۆشناوەکان لێ دەخرا و لە گوندی سووسێی خۆشناوەتی لە هاوینان بەفریان لەناو باری کادا دەهێنا بۆ ماستاو فرۆش و شەربەت فرۆشانی شار بە تایبەتی.

**ج- خانی عوسمان کەردز:**

ئەم خانە شوێنەکەی پشت بانکی رافیدەین سەردکی بووە، بە تایبەتی ڕەژووفرۆشەکان لەوێ باریان دەخست.

**د- خانی سلێمان خدری گێچ فرۆش:**

ئەم خانە شوێنەکەی لە تەنیشت خانی عوسمان کەردز بووە، خەڵکی ناوچەی کەندێناوە بە کەر و بار گەچیان دەهێنا بە تایبەتی بندیانەکان بندیان عەشیرەتێکی دەشتی هەولێرە لە کەندێناوە، بە تایبەتی لەم گوندانە ژیاون، خدرجیجە، ئازیکەند، لاوەر، دێمەکار... و گوندەکانی تر)، گوایە چەند بنەماڵەیەکی دیان (گاور) بووینە لە هەرمۆتەی کۆیە دابەزیون و ئیسلام بووینە.

**هـ- خانی حاجی ئەحمەد:**

ئەم خانە شوێنەکەی نزیک چێشتخانەی (تاجیران)ی ئێستا بووە، گەنم و جۆ و سەوزەی بەهارانی دەهاتێ.

**د- خانی قۆچە:**

ئەم خانە شوێنەکەی بەرامبەر گۆڕەپانی یانەی فەرمانبەرانی کۆنە و پێش دەرگاکەی بەرز بووە. ئەو خانانەی کە باسمان کردن هەندێکیان خاوەنەکانیان بەکرێیان دەدا بەرامبەر بەکرێی مانگانە یاخود ساڵانە یان خاوەنەکانیان خۆیان بەڕێوەیان بردووە.

شارەوانی هەولێریش جاران خانێکی تایبەتی بەکرێ گرتبوو وەک من بۆم ساغ بۆوە لە بەرامبەر بەنزینخانەی بازاڕی ئێستا، کە شارەوانیش لە بەرامبەر باغی شار بووە و نهۆمی خوارەوەی تەرخان کرابوو بۆ ڕاگرتنی گوێدرێژی خاوێنکەرەکانی شارەوانی، ڕەنگە وەک من بۆی دەچم دەبێ شوێنی دووەم پێش شەڕی یەکەمی جیهانی بووبێ و شوێنی یەکەم لە بیستەکان بووبێ.

لە خانەکان زۆرجار خمچی کاریان دەکرد، جلی ئافرەتانیان بە تایبەتی لەخم دەنا و زۆربەی خمچییەکان جوولەکە بوون هەروەها خانەکان چێشتخانەیان لەبەر دەرگەیان لە نزیکییەوە هەبوو.

لە کتێبی هەولێر بە سەرپەرشتی و ڕێکخستنی: تەحسین چیچۆ و شێرزاد قادر وەرگیراوە لاپەڕە١٤٦-١٤٧.



# گەشتێک بەناو هەولێردا

پیرداود مەخموری

بە حوکمی هەڵکەوتەی جیۆپۆلەتیکی هەولێر، چەندین تایبەتمەندی هەیە، کەوا زیاتر لە ناوچەکانی دیکەی کوردستان گرنگی و بایەخی خۆی هەبێت، هەر ئەو حوکمەشە وای کردووە هەولێر لەگەڵ دەوروبەری ئاڵوگۆڕی شارستانییەتی بکات، هەولێر دەکەوێتە سەر ڕێگای کاروان و کۆچ و کۆچباری بازرگانی شار و وڵاتانی دەوروبەر، وەک وێستگەیەکی حەسانەوە و کاروانسەرا دەژمێردرێت.

هەولێر شوێنی بە یەکگەیشتنی هەموو ئەوانە بووە، کە بۆ هەر مەبەستێک بووبێ ڕوویان تێکردووە، چ ئەو کاروان و کاروانچییانەی بازرگانی لە مەهاباد و کرمانشان و ئەو کاروانانەی لە تێکڕای عەجەمستانەوە دەهاتن لەلایەک و، لەلایەکی دیکەش ئەو کاروان و بازرگانانەی، کە لە وڵاتی شام و ماردینەوە بۆ ئەو دەڤەرە دەهاتن.

شوێن و بەرهەمی کشتوکاڵی و کاروانسەرایی هەولێر وایکردووە، کە هەرچی سەودا و مامەڵەت هەیە لێرە ساخبکرێتەوە، ئەمە لەلایەک و بەیەکگەیشتنی شارستانییەتەکان و تێکەڵ بوونی چەندین داب و نەریت و تیتاڵ و زمانی جۆراوجۆر لەو شوێنەدا بووەتە هۆی تێکەڵاو بوون و کارلێکردنی شارستانییەتەکان.

سۆراغکردن و بەدواداگەڕانی تایبەتمەندێتی هەولێر و ئەو هەموو شوێن و خواردن و خواردنەوە و کار و پیشە دەستی و جێگای حەوانەوە و ڕابواردن لە هەولێر بووەتە زەروورەتێکی ئەو سەردەمی هەولێر. ئێمەش لەم بابەتەماندا، کە زۆربەی زانیارییەکانی بڵاوی دەکەینەوە ڕاستەوخۆ و مەیدانی سۆراغکراون، پتریش گرنگی بەو بابەتانە دراوە، کە جاران لە کوردەواریدا باو بوون و ئێستاکە هەندێکیان نەماون و هەندێکیشیان ئەگەر

مابێتیش، ئەوە باس لە ژیانی قۆناغێک لە قۆناغەکانی جارانی هەولێر دەکات، لە بەسەرکردنەوە و تازە کردنەوەی هەندێ کەرەستەی فۆلکلۆریی، ئەرکۆلۆژیای هەولێر لەم چەند نموونانە خۆی دەگرێتەوە.

(حەمام، کەبابخانە و لۆقنتە و سەرویێ خانە، چایخانە و قاوە خواردنەوە، کەنناسی و کارمەندی دەوڵەت و ماڵەگەوران، قەوان و حەیران و سەربردەی حەیران و حەیرانبێژان، کوورە و کوورەچیاتی، ئاسن و ئاسنگەری، جەرە و گۆسکە و کوویە و شەربە و جەلعە و خم و خمچیاتی، زۆرخانە و پاڵەوانانی، ئاو و ئاودێر و میراوی، رەز و باخ و رەزەوانی، تەیر و توال بەخێو کردن و سەربردەی چەندین دەست رەنگینی جارانی هەولێر).

بەو پێیەی کەوا هەولێر کۆنترین مەڵبەندی مرۆڤایەتییە و بەتەمەنترین شارە لە جیهاندا، دەبێ گەلێ بەزم و رەزمی دیتبێ، ئەوەندەی تەقڵ و شەقڵ دیوە بەحسێب نایێ.

پاراستنی کەلەپووری باب و باپیران ئەرکی هەموو مرۆڤێکی هەولێرە، با ئەو رەنجەی باپیران داویانە بەفیڕۆ نەدرێن، ئەو کارێز و بیرە مەزنانەی، کە رۆژێک لە رۆژان بە پەنجە و نینۆک لێدراون بەدەستی ئەنقەست و نەزانی پڕیان نەکەینەوە، پاشان خۆمان لەسەر ساجی عەلی دانیشین.

ئەو بابەتەی ئێمە نووسیومانە هی سەردەمانێکی زۆر لەمێژ نییە، بەڵام ئەمە مێژووە و لاپەڕەیەک تۆمار کردن خزمەتێکە، ئێمەش بە مەبەستی بەسەرکردنەوەی مێژووی رۆژێک لە رۆژان و قۆناغێک لە قۆناغەکانی ساڵانی دوای یەکەم شەڕی جیهانی تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم.

گەلێ جار قسە و باس دێتە گۆڕێ، کە گوایە سۆراغکردن و بەدواداچوونی بابەتی کۆنینە و یارم فۆلکلۆر دەکەوێتە ئەستۆی فۆلکلۆریەروەران، من لەگەڵ ئەوەدام وەک ئەتنۆگرافیا باسیان بکەین، بەڵام پرسیارێک قوت دەبێتەوە و دەڵێ: ئەدی تەوزیف کردنی شوێن و کات و وێنە و داب و نەریت و بەیت و باوی کوردەواری ناکەوێتە ئەستۆی شاعیر و چیرۆکنووسان؟ کێ هەیە لە شاعیران و چیرۆکنووسانی هەولێر حەمامی سێ گومبەتی لە



شیعرەکانیدا بەکارهێنابێ، جگە لە مستەفا کۆری حەیرانبێژ؟ کامە چیرۆکنووس کۆڵانی جوولەکان و لۆقنتە جۆت کەبابی لە چیرۆکەکانی بەکارهێنابێ و ئیلهامی لێ وەرگرتبێ، گەلۆ ئەو بارە گرانە هەر بەتەنها لە ئەستۆی فۆلکلۆریستان و کۆکەرەوانی فۆلکلۆر نییە، ئەو بەسەرکردنەوەی ئێمەش بەشێکە لە ئەتنۆگرافیای پێش سەدەیەکی هەولێر.

### حەمام و حەمامچییەتی

رەنگە حەمامی جاران وەک ئەو حەمامە نەبێ، کە ئێستاکە هەنە، بەکارهێنان و دروستکردنی حەمام بۆ ئەوکاتە دەگەڕێتەوە، کە مرۆڤ نیشتەجێ بووە و لەگەڵ دەوروبەر خۆی راهێناوە، سەربردەی حەمام و حەماچییەتی لە هەولێری جاران بۆ ئەوکاتە دەگەڕێتەوە، کە یەکەم پێگەی مرۆڤی کۆن بووە، دەکارین بڵێین لەگەڵ یەکەم ئاوەدانکردنەوەی قەڵاتی هەولێر، یەکەم حەمامیش دروست کراوە، دوای ئەوەی، کە سەنحاریب ئاوی لە زێی بادینانەوە بۆ راکێشاوە، بەڵام ئێمە مەبەستمان ئەو سەردەمان نییە، چونکە هیچ بەڵگەیەکی باوەڕپێکراومان لەبەر دەست نییە راستی و دروستی ئەوەمان بۆ بسەلمێنێ، کە لەو سەردەمیش ئەو جۆرە حەمامانە هەبوون.

هەروەک لە سەرەتادا ئاماژەمان پێدا، کەوا هەولێر لە چەشنی مەڵبەندێکی بازرگانی و کاروانسەرای بەیەکگەیشتن و لێخوڕینی کاروان و کاروانچیان بووە، هەر

لە مەهاباد و عەجەمستانێ هەتاکو دەگاتە شام.

گەرماوەکانی ئەوکاتی هەولێر لەبەر نەبوونی گاز و نەفت بە زبڵ و کا و کۆت گەرم دەکران، ئەو شوێنەی ئاگری لێدەکرایەوە پێی دەگوترا (کورخان).

زۆربەی ماڵە هەولێرییەکان ئەگەر لە ماڵەوە حەمامی تایبەتی خۆیان نەبێ، ئەوا (سەرشۆرکی) بچووکیان هەبوو، دیارە حەمام تەنها ئەو کەسانە بەکاریان دەهێنا، کە رێبوار و مەئموری دەوڵەت و سەڵتە زەلام بوون، حەمام بەزۆری لە رۆژانی هەینی بەکار هاتووە لەگەڵ ئەو رۆژانەی، کە بووک گواستنەوە هەبووایە.

کورد کە حەمامی هەبێ، دەشبێ لە ئەدەبەکەیدا رەنگی دابێتەوە و رەفتاری لەگەڵدا کردبێ، ئەگەر گەشتێک بەناو ئەدەبی فۆلکلۆری کوردیماندا بکەین دەبینین لەگەڵێ شوێندا ناوی حەمام بەرچاو دەکەوێ.

ئەم چەند پەندە کوردییەش بە نموونەی حەمام گوڵبژێر دەکەین:

* (دەڵێی حەمامی ژنانە) بەو حاڵەتە دەگوترێ کە گەرەلاوژەیەک بێ و کەس لەکەس نەگات و هەر کەسە و باراشی لە ئاشێک لێبکات.
* (پیاوەتی بە ئاوی حەمامێ دەکات) بۆ کەسێک بەکاردێ، کە کارێک ئەنجامبدات بەبێ ئەوەی هیچی خۆی تێ بچێ.
* کورد دەڵێ: (دنیا جامی حەمامە هەر رۆژێک لە دەست یەکێکە) یان دەڵێ (دنیا پەشتەماڵی حەمامە) کەواتە ماڵی دونیا و ئوموری دنیا تا سەر بۆ کەس نییە، چۆن دێتە دەستت ئەوهاش دەروات.
* (حەمام و حوشتریان نەگۆتییە).
* هەر ئەو تاس و حەمامەیە.
* حەمام بە تڕان گەرم نابێ.

یەکێک لە سەربردە کۆنەکانی مەلای مەشهور سەبارەت بە حەمام و حەمامچییانە، جارێکیان مەلا دەگەڵ چەند کەسێکی دۆست و هاوەڵەکانی دەچنە حەمام و رێکدەکەون کە فێڵێک لە مەلا بکەن و بیکەن بەجێی فشقیات و مەزاقی پێ بکەن، هەریەکە و هێلکەیەک لەژێر خۆی دادەنێ و دەڵێن مەلا ئێمە سەرو هێلکەمان کرد، ئەویش دەچێتە سەر بەردی حەمام و وەک کەڵەباب بانگ دەدات، دەڵێ: ئەو هەموو مریشکە پێویستە کەڵەبابێکیان هەبێ.

### دروستکردنی حەمام

هەرچەندە لە دروستکردنی حەمامدا جیاوازییەکی ئەوتۆ نییە، تەنیا ئەوەندە نەبێ، کە هەندێکیان بچووکن و هەندێکیان گەورەن، بەزۆریش حەمام لەم چەند بەشانە پێکدێ.

* **ئاگردان، کورخان:** بەو شوێنەی دەڵێن کە ئاگری لێ دەکرێتەوە لە سەرڕا ئاوی گەرم دەکات.
* **ژووری خۆ گۆڕین:** ئەو ژوورەیە کە جلوبەرگی تێدا دەگۆڕدرێت و دەکەوێتە پێش ژووری حەمام و سەرشۆرک.
* **سەرشۆرک:** ئەو ژوورەیە، کە بەشی سەرەکی حەمامەکەیە، ئەم ژوورە سەری بە گومبەت داگیرایە و لە ژوورەکانی دیکە فراوانتر و رووناکتر دەبوو، لە هەر چوار دەوری بەرد لە چەشنی مەنجەڵ دروست کرابوو، ئاوی تێدا سارد و گەرم دەکرا، لە ناوەڕاستی ژووری حەمام بەردێکی گەورە یان بەرزاییەک هەبوو، کە ئاگری کورخان گەرمی دەکرد، ئەو بەردە پێی دەگوترا (بەردە زاوا). ئەو کەسانەی لە حەمام کۆڵیان دەکرد بەر لە خۆشووشتن چەند ماوەیەک لەسەر ئەو بەردە پاڵیان دەداوە و رادەکشان بۆ ئەوەی لەشیان گەرم دابێ و ماسولکەکانیان خاو بێتەوە و چڵک و قرێژی لەشیان بێتە خوارێ، زۆرجار ئەو کەسانەی پشتیان



ڕەق ببووایە لە حەمامی گەرم چاک دەبوونەوە.

جاران وا باوبوو ئەگەر خەڵکی ئەو دەشتە بهاتبوونایە هەولێر، وەک تقوسێک دوو شت هەبوو دەبووایە ئەنجامیان بدابووایە، یەکێکیان (کەباب خواردن) ئەوی دیکەش (حەمام) بوو، ئەگەر ئەو دوو شتەی نەکردبا ئەوا دەیانگوت هەولێرت نەدیتییە یان (شارت نەکردییە).

* **ناتر، دەڵلاک، دەڵلاق:** ناتر ئەو کەسە بوو، کە خەڵکی دەشووشت، زۆبەشیان لە پشت شێلان و دەمار تەقاندن لێزان بوون، بەزۆریش پشتی بە ساڵاچووەکانیان دەشووشت، بەرامبەر چەند قروشێک، ڕۆژێک لە ڕۆژان ئێستاشی لەگەڵدا بێ (دەڵلاکی) کاسبی و پیشە بووە.

* **پشتەماڵ:** پەشتەماڵ، هەندێ جار (وزرە)شیان پێدەگوت، لە حەمام دوو جۆر پەشتەماڵ هەبوو، جۆرێکیان لە کاتی خۆ شووشتن لە خۆت دەئاڵاند، جۆری دووەمیش بۆ خۆ وشککردنەوە بوو، لە هەموو حەمامەکان بەربەری تایبەتی هەبووە، کە سەر و ریشی حەمامکەرانیان دەتاشی، بەزۆریش (گوێزان) یان بەکاردێنا، ڕۆژی پێش زەماوەندی بووک و زاوا، دەچوون حەمیان دەکرد، ئەو ئافرەتەی لەگەڵ بووکدا بچووبا و بۆ حەمام، پێیان دەگوت"خوشکی بووک" (پێ خەسوو) هەموو مەسرەفی لەسەر بووک دەبوو، ئەو کوڕەی لەگەڵ زاواش بچووبایە حەمام پێیان دەگوت (برا زاوا) ئەویش بەهەمان شێوە لەسەر خەرجی زاوا دەچووە حەمامێ، جاری وا هەبوو چەند کەسێک لەگەڵ زاوا و بووک دەچوونە حەمام.

### حەمامەکانی هەلێر

* **حەمامی گەورە:** شوێنەکەی ئێستا بەرامبەر مزگەوتی خانەقایە، شوێنی بازاڕگای (فەرهاد)، خاوەنەکەی (دەروێش) ناوێک بوو، ئێستا نەماوە، مام وەسمان شاگرد بوو، ئاگری بۆ حەمام خۆش دەکرد، ئەو حەمامە دوو دەڵلاکی لێبوو، مەعرووف و ئەحمەد، یەکێک بەربەری دەکرد ناوی مەجید بوو، لەناو حەمامدا چایە و قاوە و دارچین و شیر دەخورایەوە، خەڵکی وا هەبوو کە لە حەمام دەردەچوو لەسەرویێ خانەی مام عەزیزی کەللە و گیپەی



دەخوارد.

* **حەمامی گچکە:** شوێنەکەی دەکەوتە تەنیشت حەمامی گەورە، بە زبڵ گەرم دەکرا، خاوەنەکەی فەقێ حەمەدەمین بوو، باوکی دکتۆر شیت و یونس خەتات، ساڵی ١٩٨٨ کۆچی دوایی کردووە، مام عوسمان ساخبێری دەکرد، مام ئەحمەد دەڵلاک بوو، پاشان ئەو حەمامە بووە تایبەت بۆ ئافرەتان، (ئامینە پۆلیس) ئامینە جاندار سەرپەرشتی دەکرد، ئافرەتێک کە ناوی خەپۆ بوو سەرشۆر و دەڵلاک بوو.

* **حەمامی حاجی قادری:** ئێستاکە نەماوە، شوێنەکەی جاران لە جێگای باڵەخانەی یەحیا حاجی سەعید بوو، لەلایەن حاجی عەبدوڵلا حاجی عوسمان سەرپەرشتی دەکرا، دوو کەسی عەجەم شاگرد بوون، دەڵلاکییان دەکرد، ئەوانیش ئەسکەندەر و ڕۆستەم بوون، لە سەردەمی مەلیک غازی گیران، گەڕانەوە ئێران.

* **حەمامی عەلیاغەی:** تەحسینی عەلیاغەی خاوەنی بوو، شوێنەکەی بەرامبەر بەنزینخانەی کۆن بوو، خوار دەرگای قەڵات، لە گەڕەکی خانەقا، حاجی عوسمان سەرپەرشتی دەکرد، ئێستا کەلاوەیە و دار و دیوارەکەی ماوە کۆنەفرۆشی تێدا دەکرێ.

* **حەمامی مۆدە:** ئەگەرچی ئەو حەمامە زۆر لەمێژ نییە دروست کراوە، ئێستاکەش هەر ماوە، لە نزیک مزگەوتی شێخی چۆلییە، خەڵکێکی زۆری گەڕەکی عارەبان و سەعدوناوە و تەعجیل هاموشۆیان دەکرد، دواتر ناوەکەی

گۆڕا بۆ حەمامی ١١ی ئادار، جاران نورەدین ئاغا خاوەنی بوو، پاشان موشیر قەساب بووە خاوەنی، ئەو کەسانەی بەزۆری دەهاتنە ئەو حەمامە (قادر فاتەکە، سەعید خلە، مەلا عەلی، مەلا تەها) بوون.

**چایخانە و قاوەخانە**

ئەوەی پتر مەجلیسی دیوەخانان و کۆڕی جوامێران و بەزمی شەوان و حوجرەی فەقێیان و هەرای زەماوەندی گەرم دەکرد (قاوە) بووە.

ئەگەرچی چا و چایخانە و چا خواردنەوە زۆر لە مێژ نییە لەناو کورددا پەیدا بووە، هەروەها لە جیهاندا جۆرە خواردنەوەیەکی تازە بابەتە بە بەراوردکردنی لەگەڵ قاوە خواردنەوەدا.

جاران لە کوردەواریدا لە کۆشک و دیوەخانان قاوە دەخورایەوە، لە پەند و قسەی نەستەقی کوردیماندا باس لە قاوە و قاوەخواردنەوە کراوە، هەرکاتێک ویستبێتیان سەردانی کەسێک بکەن گوتوویانە: (با قاوەکی لای فلان بخۆینەوە)، هەندێ جاریش لەکاتی چارەسەرکردنی کێشەیەک باسی قاوە و قاوەخواردنەوە هاتۆتە گۆڕێ، چەند جوامێرەک کە لە سەروبەری چارەکردنی کێشەیەک دەچن بۆ ماڵی کەسی بە کێشەکە، لەکاتی قاوەخواردنەوە بەخاوەن ماڵیان دەگوت: (قاوەت ناخۆینەوە ئەگەر هەرێمان نەدەنێ، ئەگەر خاوەن ماڵ ڕەزامەندی لەسەر چارەکردنی کێشەکە بدابوایە، ئەوا یەکسەر نەیدەگوت رازیم، بەڵام دەیگوت (قاوەتان بخۆنەوە) ئەوانیش بانگی قاوەچیان دەکرد بۆ ئەوەی قاوەیان بۆ تێبکات.

هەندێ جار قاوەخواردنەوە بۆ دوو کەسی یان دوو بەرەبابی لێکدی زویر دەگوترا (فلان کەس قاوەی فلان ناخواتەوە) یان دەیانگوت: (قاوەی یەکدی ناخۆنەوە).

لە هەولێر گەلێ کەس و بەرەباب لەبەر ئەوەی کاریان قاوەچیاتی بووە، ناوبانگیان پێ دەرکردووە، خدر قاوەچی، عەبدۆ قاوەچی، نادر چایەچی، هۆنراوەی فۆلکلۆری میللی کوردی، زۆرجار باس لە چایە و قاوە دەکات، خدر حەیرانی شایەر دەڵێ:

| | |
|---|---|
| داکی کیژان ئیخبار کرد | ئەمنیان برد لۆ قشڵەیە |
| حاکم لــــۆ حوکمم دەکەی | بێ خەتا و بێ جونحەیە |
| کیـژ ئیـزرابیان لۆ کـردم | ئەمنیان کـرد تەبریەیە |
| تیلاکێ خۆم خـوار دەکرد | هـاتمـــە چایە خانەیە |

هەروەها لە پارچە هۆنراوەیەکی فۆلکلۆری بەم جۆرە باسی چا دەکات:

| | |
|---|---|
| سەرم بـــە ژووری داگرت | داک و کیژ دانیشتینە |
| سەمـــاوەرەکی عەجەم | چایەکیان لۆ من هینە |
| گـۆتێ چـــای ناخـۆمەو | گەردەنت هێـروە بینە |

**چاخانە و قاوەجاغ**

چاخانە بەپێی شوێن و قەڵەباڵغی دروست دەکرا و بەڕێوە دەچوو، گەلێ چایخانەی وا هەبوو پتر لە ١٠٠ کەسی دەگرت و هی واش هەبووە لە چەند کەسێک زیاتر تێنەدەپەڕی، چایخانە بەگشتی لەم چەند بەشە پێکدەهات.

* ژووری چایخانە

* تەخت و کورسی و مێزی گەورە و بچووک

* قاوەجاغ.. ئەو شوێنەیە کە قۆری و سەماوەر و چایەست و پێداویستی چایخانەی تێدابوو، بە زۆری قاوەجاغ بڵندییەکەی بەژنە زەلامێک بوو، لە هەموو چایخانەکان ڕۆژوو بەکاردەهات لەبەرئەوەی ئاگردکەی لەسەرەخۆ بوو چایەکە باش دەکوڵا و دێمی دەدا.

پاش هاتنی ئینگلیز بۆ کوردستان شەکری ورد پەیدا بوو پێی دەگوترا (شەکرە سۆرە) یان (شەکری لەندەنی)، بە



زۆری (قەند) بەکاردەهات، جاران پیاڵە و ژێر پیاڵەی شووشە نەبوو، بەڵکو لە فافۆن دروست دەکرا، ئەو قۆریەی کە چای تێدا لێدەنرا بە زۆری فەخفوری بوو، لەبەرئەوەی فەخفوری بە ئاگری زۆر دەتەقی، بۆیە خەڵووزیان بەکاردەهێنا، ئەگەر فەخفورییەکە بتەقیبایە ئەوا لەلای وەستای تایبەت تۆق دەکرایەوە، بەناوبانگترین وەستای ئەو سەردەم (جەباری مام نادر)ی بوو، لەناو بازاڕی چەخماخسازان لە تێل و سفەیفی باریک تۆقی بۆ دروست دەکرد، سەر قەپاغی قۆرییەکەشی بە داوێکی کشت بە قوڵفی قۆریەکەوە گرێدەدا.

کەللە شەکری ئەوکات کێشەکەی (حۆقە و عورب) بوو کە دەکاتە ۲ کیلۆ و چارەکێک، جاران لە جیاتی وشەی روبع دەیانگوت عورب، بەناوبانگترین کەللە شەکری قەندی ئەو سەردەم قەندی (ئەبو فنجان) بوو.

هەر چایخانە و کڕیار و مەعمیلی تایبەتی خۆی هەبوو، لە ساڵانی (تەمین)، کە دەکاتە ساڵەکانی ۱۹۳۰ بەسەرەوە، چایە بە ۲ فلوس بوو، بۆ خاوەن دوکانەکان و مەعمیلەکانیان ٦ چایە بە ۱۰ فلوس بوو، گەلێ جار مەعمیل و دوکاندارەکان شەکری تایبەتی خۆیان هەبوو، ئیدی چای تاڵیان بانگ دەکرد، بۆیە چای بە ۱ فلوس بۆیان حسێب دەکرا.

### بەناوبانگترین چایخانەکانی هەولێر

* **چایخانەی مام ئەحمەد:** باوکی عەبۆ قاوەچی لەناو قەیسەری، ئەمین شاگرد بوو قاوەشی هەبوو.
* **چایخانەی مام نادر کەکۆ، قادر کەکۆ:** بەرامبەر مزگەوتی خانەقا، ئیسماعیل ئاوچی بوو.
* **چایخانەی مەلا لەتیف:** تەنیشت مزگەوتی خانەقا (ژێر تاق) کەریم مەلا لەتیف سەرپەرشتی دەکرد، (مەعرووف ئاڵتونچی) مەعرووفە کەڕ شاگردی دەکرد، ساڵانە بە شەوانی زستان هەقایەتخوان هەقایەتی لێدەگوت، زۆرترین هەقایەتی ئەو سەردەمی (بەیت و داستانە کوردییەکان و رۆستەم و زۆراب و شیرن و فەرهاد و ناسر و ماڵ ماڵ و لاس و خەزاڵ) دەگوتران.

هەقایەتخوانەکانیش ئەم بەڕێزانە بوون: (مەلا واحید و سەید خەفاف)، لەم چایەخانەیە بۆ یەکەم جار شیر خورایەوە، کوپەی شیر ئەوکاتە بە یەک عانە بوو، کە دەیکرد چوار فلوس.

* **چایەخانەی حاجی شوکر:** لە ژێر باڵەخانەی حاجی یەحیا سەعید بەقاڵ بوو، مشیر چایچی شاگرد بوو، خاوەنەکەی حاجی شوکر راوچی، عوسمان نوری بوون.
* **چایخانەی سەید محەمەد سەید جاسم:** بەرامبەر خانی سەعید جامباز لە کۆشکی داودۆکە جوو بوو، جمۆک و داودۆک و شەمعون کە هەرسێکیان جوولەکە بوون سەرپەرشتییان دەکرد، پاشان چایخانەکەیان گواستەوە بۆ خانی سمایل خۆشناوی جغارە فرۆش، پاشان گەڕایەوە بۆ شوێنەکەی خۆی.
* **چایخانەی شەریف قۆجە:** ناو بازاڕی، بەینی زێڕینگران و کوتاڵ فرۆشان.
* **چایخانەی سەید حەمید:** باوکی سەید سەدرەدین.
* **چایخانەی سەید سەلیم:** ناو بازاڕی، یەکەم چایخانە بوو لە هەولێر کە کوبەی بەقیمەی دەفرۆشت سبەینان، سەید غەریب کوبە فرۆش دروستی دەکرد.
* **چایخانەی عەلی فلەیح،** یەکەم کەس بوو کە قەوانی هێنا.
* **چایخانەی مەحموود چەلەبی:** قەوانی هەبوو.
* **چایخانەی مەچکۆ ئاغەلە:** قەوانی هەبوو.
* **چایخانەی سابیر:** باوکی شێخێل، قەوانی بە هندری هێنا.
* **چایخانەی عوسمان بەرخۆڵە:** ئێستا جێگای حاجی رۆستەم بەقاڵە، گەلێ سەربردەی سەیر لەو چایخانە دەگێڕنەوە.

### تۆمارگا و قەوان و حەیرانبێژان

بۆ پتر جۆشدان و خۆشکردنی کۆڕی شەوانە لە قاوەخانە و چایخانەکانی هەولێر، حەیرانبێژەکانی ئەو سەردەمان لە جیاتی هەموو هۆیەکانی راگەیاندنی ئێستاماندا بوون، هەندێجار لەکاتی حەیران گوتندا خاوەن چایخانە یان

کەسێکی دەست ڕۆیشتوو ئەرکی ماندووبوونی چایخانە و خەرجی دەکەوتە سەر.

کەس نییە لە ساڵانی سییەکانی سەدەی بیستەم حەمەد مەندۆ بە حەیران و لاوکەکانی ریشەی دڵی لە بنڕا دەرنەهێنابێ و هەستی نەهەژاندبێ، یەکەمین کەس کە کۆمپانیای قەوانی هێنا هەولێر (سەید مەحموود) بوو، شوێنەکەی لە ژێر ئوتێلی فەرەح بوو، کە دەکاتە تەنیشت چایخانەی مەچکۆ.

بەناوبانگترین حەیران و لاوکبێژی جاران (عەیز ئاغای قەوان، سەعید ئاغا، کاویس ئاغا)، هەروەها لە حەیرانبێژان: (عەلۆ پاڵانی، حەمەد مەندۆ، حەسەن لاوک)، ئەم زاتانەش زوڕناژەنی بە توانا و وەستای کارامە بوونە لە مەیدانەکە: (مام برایم، مام زەنون، سەیدە کۆرە)، هەروەها نابێ دەوری (عەلی فلەیح) لە هێنانی قەوان بۆ هەولێر لەبیر بکرێ.

### قەوان، سندوق

ئەو ئامێرە دەنگییەیە لە شێوەی سندوقێک دایە بە (هندر) قورمیش دەکرا و کاری دەکرد، هەروەها دەرزیلەیەکی هەبوو دەخرایە سەر (قەوانەکە) لە کاتی ئیشکردندا، هەرکاتێک دەنکەگە پەلت ببوایە ئەوا یان دەرزیلەکەیان دەگۆڕی یاخود تیژیان دەکردەوە، لەلایەکی سندوقەکە بوقیەک هەبوو، کە دەنگەکەی لێدەردەچوو، زۆر قسە و سەربردەی خۆش و سەرسوڕهێنەر هەیە سەبارەت بەقەوان و گۆرانی بێژەکەی، بە زۆریش قەوانەکان (کاسێت) ناوی ئەو کۆمپانیایەی لەسەردابوو، کە گۆرانییەکەی تۆمار کردبوو.

### خم و خمچیاتی

خم رەنگی مۆرە یان شینێکی زۆر تۆخە، بە زۆری ئافرەت جلوبەرگی خۆیان پێ رەنگ دەکردەوە، ئەو رەنگە لە جۆرە گیایەک دەردەهێندرا پێیان دەگوت (هەش)، بە زۆری ئەوانەی خمچی بوون لە هەولێر و دەزگای خمچیاتیان هەبوو جوولەکە بوون.

* یۆنا، بەبۆ، ئیسحاق کوڕی خدرۆکە جوو بوون لە خانی (حەسەن بەیرەم) خمچیاتیان دەکرد.

* دەروێش موسا لە خانی سپی و کەریم شنۆیی لە نزیکماڵی هەمزە عوسمان کەردزیی بوو.

### کوورە و کوورەچییەتی

کاتێ باس دێتە سەر کوورە و کوورەچییەتی دەبێ مرۆڤ لەسەرەخۆ لێبکات، چونکە بە راستی ئەو بابەتە زۆر لەوە پتر هەڵدەگرێ، کە ئێمە بەو سووکە بەسەرکردنەوەیە باسی دەکەین، ئەو بەشەی بابەتەکەمان تەنیا بیبلۆگرافیایەکی کورتکراوەی (کوورە و کوورەچییەکانی هەولێرە).

* (کوورەی ئاسنگەری): کوورەی ئاسنگەری ئەو ئامێر و کەلوپەلانەی کە جاران لە کوردەواریدا بەکار دەهێنران تێیدا دروست دەکرا، کوورەی ئاسنگەری لە جۆری پیشە دەستییەکان دەژمێردرێ، هەر کەلوپەلێکی لە ئاسن دروستکراو، وەک: (هەوجار، گاسن، پیشەقان، لاپووتە، ترپان، شالوک، داس، قەرانگ، داسووک، پێمەرە و خاکەناس، دودە و یان قازمە، دەوە باڵتە،...هتد).

لە هەموو ئەو ئامێرانە گرنگتر (بیور) بوو هیچ ماڵێکی کوردەواری نەبووە (بیور)ی نەبێ، جگە لە دروست کردنی ئەو ئامێرانە لەلای ئاسنگەر چاک دەکرانەوە و تیژ دەکران و کوورەی ئاسنگەری پێویستی بەم کەرەستانە بووە کە بەکارهاتوون.

* **کوورەی ئاگر:** بە خەڵووز گەرم دەکرا و بە هەمبانە دەف دەدرا و سۆر دەکرایەوە.
* **دەسگا:** لە چەشنی (سندان) بوو، لە نزیک کوورە دادەمەزرا.
* **چەکوش، چەکوچ:** بە زۆری دوو چەکوچ بەکار دەهات.
* **گاز:** بۆ گرتنی هەر کەرەستەیەکی دروستکرا و بەکار دەهات.

ئەو بەرێزانەش ئاسنگەر و کوورەچی بەتوانا و لێهاتووی هەولێر بوون: (حاجی تۆفیق حاجی مستەفا، حاجی شێخ یونس مام ئەحمەد).

**کوورەی دروستکردنی جەرە، گۆسکە، کووپە، شەربە**

**ئێستاش ئەو جۆرە کوورانە هەر ماون.**

* جەرە: لە شێوەی دروستکردنی دوو جۆر جەرەمان هەیە.
جەرەی موسڵ/ گەورە و ئەستوور بوو، ئاوی زۆر دەگرت.
جەرەی هەولێری/ بچووک و تەنک بوو، ئاوی زووتر سارد دەکرد.
* شەربە: لە جەرە بچووکترە، بۆ گواستنەوە ساناترە، ملی باریک بوو.
* جەلعە: لە چەشنی شەربە بوو، بەڵام ملی کورتتر بوو لەبنرا ئەستوور بوو.
* کووپە: سێ جۆری هەبوو:

کوپەی بەغدایی/ گەورە و دیوار ئەستوور، لە ژێرەوە فراوان بوو لەسەرووەشدا زارکەکەی تەسک بوو، چوار قولپی هەبوو.

کووپەی موسڵی/ زۆر جاریش پێیان دەگوت کووپەی حەلەبی، لە چەشنی کووپەی هەولێر بوو، دوو قولپی هەبوو.

کووپەی هەولێری/ تەنگ و گچکە بوو.

* گۆسکە: لە کوردەواریدا گۆسکە زۆر بەکار دەهات بۆ هەڵگرتنی هەندێ جۆرە زەخیرەی زستانان، وەک: (پەنیری سوورکراو، قاورمە، رۆنی مەر)، جاروباریش گۆشتی خاوی سوورکراو.

**بەناوبانگترین کوورەچییەکانی هەولێر**

* کوورەی مام سەلیم تۆپاڵ/ شوێنەکەی نزیک مەحەتە بوو، بۆ دروستکردنی کەرپووچ.
* کوورەی مام شەهاب سلێمان کوورەچی/ لە مەحەتەی هەولێری.
* کوورەی مام مەجید و مام حەمید حاجی بەکر/ لە تەعجیل، (جەرەی) هەولێریی دروست دەکرد.
* کوورەی مام شەهاب میکائیل/ بۆ دروستکردنی جەرە و گۆسکە و شەربە، ئێستاش نەوەکان لە نزیک گوندی قەتەوی هەر خەریکی ئەو کارەن.
* کوورەی مام سەرخۆش کورەچی/ لە مەحەتەی بوو، کەرپووچی دروست دەکرد و ئیبراهیم و ئەسوەد کرێکار بوون.
* کوورەی خالیس و کەریم و سەلیم کوورەچی/ لە مەحەتە.
* کوورەی مام جەبار کوورەچی/ باوکی عارف کوورەچی.
* کوورەی حەیدەر جەرجیس/ لە تەعجیل لە نزیک حەساری مەحموود دینگەچی، خوار پردی تەعجیل.
* کوورەی حاجی خورشید/ لە سەعدووناوە، جەرەی دروست دەکرد.



**کۆتر و پەلەوەربازی**

ئەو بەشەش بابەتێکی سەربەخۆیە، بەڵام بۆ وەبیرهێنانەوە تەنیا ناوی ئەو زاتانە دەنووسین، کە خەریکی تەیر و تواڵ بەخێوکردن بوون: (خورشیدی ئەمین ئیتیان کوورەچی، ئەسکەندەر کوورەچی، شێخۆ مچە، مام یاسین شورتە، رەفعەت کارگەچی، مام بەهجەت قۆڵچی، مستەفا دەقاقچی، موحسین میراو، نورەدین شێخۆ ئاغا، زیوەر ئاغا، عوسمان کارگەچی، قوشە حەماڵ (خورشید پردەیی)، سلێمانە شەل).

**زۆرخانە و پاڵەوانبازی**

وەرزش لە هەولێر لەمێژە گرنگی پێدراوە، بۆیە چەند شوێنێک هەبوو پێیان دەگوت زۆرخانە، لە هەولێر دوو شوێنی سەرەکی هەبوو بۆ زۆرخانە و پاڵەوانی، ئەوانیش:
* زۆرخانەی عەلی: لەناو خانی (مستۆکی خەڵووز

فرۆش)، ئێستا شوێنەکەی جێگای دەرمانخانەی شیماله، بە زۆریش ئەو کەسانەی پالەوانبازییان دەکرد و میلیان هەلدەگرت: (ونس شەمۆ، عومەر نانەوا، ئەیوب نانەوا).

* زۆرخانەی فەرمانبەران: ئێستا بالەخانەی حاجی یەحیا سەعیدە، بەرامبەر یانەی فەرمانبەران لە تەنیشت چایخانەی حەسەن ئەمین ئێستیان کووره‌چی، دوو پالەوانی ئێرانی لەوێ بوون: (عەلی، پاشا). ئەوانیش لەسەردەمی مەلیک غازی رەوانەی ئێران کرانەوە.

**لۆقنتە و کەبابخانەکانی هەولێر**

لەو برگەی نووسینەماندا تەنیا ئەو کەسانە بەسەردەکەینەوە، کە کۆنترین کەبابچی و چێشتلێنەری هەولێر بوون:

* کەبابخانەی حەسەن مەمەندی ناو چەخماخسازان: لەم کەبابخانەیەدا خواردن بەم جۆرە بووە: (سێ شیش کەباب + دوو نان + یەک ماستاو) بە ١٠ فلوس بوو، لە سالانی (تەمین).
* کەبابخانەی حاجی عەبدوللا عەبۆ، حاجی شەریف شنۆیی: ئێستا شوێنی پەنیر فرۆشی تەیب سەید شەریفە، بە (جۆت) کەباب دەناسرا.
* کەبابخانەی (خەتابی): لە کۆلانی جوولەکان، نزیک قەسابەکان.
* کەبابخانەی دەرویش عەلی: باوکی حاجی ئەحمەد شەوقی کەبابچی ناو بازاڕ، ئێستا کەبابخانەی یاسین قەرۆیە ناو نەجاران.
* کەبابخانەی خدر کەبابچی: ناو نەجاران.
* کەبابخانەی حاجی محەمەد مەجید: جێگای کەبابخانەی کویسنجق، دەرویش مەلا واحید وەستا بوو.
* کەبابخانەی دەرویش مەلا واحید: چوارریانی بانک لەبن هوتێلی هەندرێن، ئێستا نەماوە.

**پاچە و سەر و پێ**

* خەلیل موسلاوی پاچەچی: ئێستا شوێنی جەمال خەلیلە.
* شاکر عەبدوللا پاچەچی و سابیر عەبدوللا پاچەچی: بەرامبەر قاوەخانەی عەبۆ، نزیک مزگەوتی خانەقای، بەینی هەردوو حەمامی گەورە و گچکە، پاش ئەوانیش نەوەکانیان خوالێخۆشبوو: (بورهان پاچەچی). جەمێکی تەواوی سەروپێ بە ١٠ - ١٥ فلوس بوو.
* یوسف مام عەزیز پاچەچی: ئێستا نەوەکانی بەردەوامن.
* وەستا غەزالی موسلاوی.
* یونس موسلاوی.
* عەمۆ موسلاوی.
* کریکۆ و بەشیر: فەلە بوون نزیک کەبابخانەی شەوقی.
* مەشهەدی: ئێرانی بوو، هەموو جۆرە خواردنێکی هەبوو (یاپراغ و کفتەی عەجەمی) دانا، نەفەری بە ٢٠ فلوس بوو، شوێنەکەی لە بالەخانەی موحسین عەلی ئاغا تەنیشت خانی حاجی ئەحمەد ئاغا بوو.

سەرچاوەکان

١- ئەو سەرچاوانەی سوودیان لێ وەرگیراوە بە زۆری مەیدانی بووە و سوود لە (حاجی مەولود بایز)ی وەرگیراوە، کە خەلکی گوندی دەرماناوەی بناری چیای قەرەچووغە، لە عەشیرەتی بلباسە، تەمەنی (١١٥) سالە، لەدایکبووی سالی (١٨٨٥)ە، ئێستاش لە ژیاندا ماوە و زەینی زۆر روونە و قسەزانێکی زیرەکە.
٢- چەند دانیشتنێک لەگەل سەید ئیسماعیل، تەمەنی ٨٠ سالە و ئێستاش لە ژیاندا ماوە.
٣- دیوانی حەیرانبێژان - ئەحمەد حەیران.
٤- هەولێرم وا دیوە و وا بیستووە - سەید مەولود بێخالی - بەشی دووەم.
٥- گۆڤاری کاروان، ژمارە ٤١، ئەحمەد حەیران.
٦- دانیشتنێک لەگەل مام سەید مەولود بێخالی و تاریق جەمباز لە سالی ١٩٩٨.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری هەولێر، ژمارە (٧) هاوینی (٢٠٠٠) بلاوبۆتەوە.



# قاڕی بازاڕ
# (بازاڕی پیرەژنە کۆنەفرۆشەکان)

مەولود بێخاڵی

هەر شارێکی سەر رووی ئەم زەمینە بگرین، بازاڕی کۆنەفرۆشانی تێدا دەبینین، شاری هەولێریش شارێکە لەم شارە کۆنانەی، کە لە دێر زەمانەوە بازاڕی کۆنەفرۆشانی بەناوی (قاڕی بازاڕ) تێدابووە.

## قاڕی بازاڕ

بە زاراوەی خەڵکی هەولێر مانای - بازاڕی پیرەژنە فرۆشیارە بە تەمەنداچووەکان دەگەیەنێت. هەرچەندە هەولێر تا عەیامێکی دوورودرێژ مەڵبەندی شەڕوشۆڕ و ئاژاوەی رۆژگار بووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سەرجەمسەرێکی گرنگی جۆرەها بازرگانیش بووە.

بۆیە لەگەڵ دامەزراندنی شارەوانییەکەی لە ساڵی (١٨٨٥ز) تا دوا ساڵانی پەنجاکان سێ مەیدانی (گۆڕەپانی) بازرگانی گرنگی تێدابووە، بۆ تێکنەچوون و پاراستنی پاک و خاوێنی و ئاسایشیان، بەپێی باجی دەرامەتی کاسبکارانیان لە ژێر چاودێری شارەوانیدا بوون.

## گۆڕەپانی یەکەمیان

گۆڕەپانی یەکەم مەیدانی داران بوو. لەو مەیدانەدا رۆژانە دار و رەژووی گوندە چیاییەکانی دەوروبەری شاری هەولێر بە باری جۆرەها ئاژەڵی یەک سمی[1] لێ دەفرۆشرا، سەرەڕای قەرتارە و دەست قەرتارەی جۆرەها میوەجات، ئەو مەیدانە شوێنەکەی دەکەوتە نزیک مزگەوتی شێخەڵڵا و هەوارگەی سینەمای (حەمرا)ی ئێستا و باغی (خەلیل ئەفەندی)، کە ئێستا بە (باغی شار) نێودەبرێت.

## گۆڕەپانی دووەمیان

گۆڕەپانی دووەم مەیدانی جامبازان بوو، دەکەوتە پشت مزگەوتی (شێخەڵڵا) بەرامبەر بە قەسابخانە کۆنەکەی سەر لێواری بەستە سەرپۆش کراوەکەی ناوەڕاستی شار، کە ئێستا بازاڕی لەنگەفرۆشان و چەند عاردبانەی جۆرەها سەوزە و میوەفرۆشانە.

سەرەتا ئەو مەیدانە تایبەت بوو بە کڕین و فرۆشتنی مەڕ و ماڵات، جۆرەها ئاژەڵی دیکە بە تاک و بە کۆمەڵ، چەند ساماندارێکی ناوداری ئەم شارە دێرینەی هەولێریش بازرگانی دەرەوە و ناوەوەی وڵاتیان پێدەکردن.

## گۆڕەپانی سێیەمیان

مەبەستی هەرە سەرەکیم لەم نووسینەدا ئەم مەیدانەیە، کە بە - قاڕی بازاڕ - نێو دەبرا، ئەم بازاڕە مێژوویێکی دووردرێژی لەگەڵ شاری هەولێردا هەیە، زۆربەی ئەو کەلوپەلانەی (شتومەک)انەی لەم بازاڕەدا بۆ فرۆتن نمایش دەکران شتی بەنرخ و هەرزان و بە ڕەواج بوون.

## شوێنی ئەم بازاڕە

ئێستاکە چەند کۆگای فەنتازی و بازرگانێکی زێڕینگری دەست ڕەنگینی تێدایە، لەو سەردەمەی من باسی لێوە دەکەم، کاولگەیەکی کەم تەرخەمی لێ کرابوو، پشتی دەدایە قەیسەری خەفافان و دیوارەکەی ئەم قەیسەرییەش دەکرایە نمایشگای جلوبەرگی ئافرەت و پیاو و جۆرەها منداڵ و کەلوپەلی بەهاداری ئەنتیکەی دیکە.

ڕوودکەشی بەرەڵلا بوو، سەردکەشی ئاسمانێکی سروشتی واڵابوو، بۆیە لە ڕۆژە ئاڵۆزدکانی وەرزی زستان فرۆشتنی تێدا دەوەستا - نەدەکرا - بە پێچەوانەی ڕۆژە خۆشەکانی دیکەی هەرچوار وەرزی ساڵ.

پیرەژنە دەڵاڵەکانی ئەم بازاڕە



لەگەڵ گەردی بەیان بارگە و بوخچەی شتە کۆنە و زێدە و پێ نەویستەکانی دیکەی چەند ماڵێکیان بۆ فرۆشتن رادەخست، کڕیار و فرۆشیاری ژن و پیاو تێکدەقژان، هەر چەرچی و دەڵاڵ بوو خەریکی بانگەوازی فرۆشتنی کەلوپەل و وردەواڵەی خۆی بوو، دەبووە هاوار هاوار... نوێیە و هێشتا قۆڵی تێهەڵنەکێشراوە، لای باشترین بەرگدرووی شاری هەولێر



هەڵبڕاوە و دووراوە.

تەماشاکەن کەوای تاقە و کورتەکی سەلیم بەگی پیاوان و سوخمەی بریقەدار و کەوای گوڵباتمان و حەفت ڕەنگ و کەمەرچینی گوڵدار و چاکەتی قەستۆر و کراسی مۆزلین و شارلستۆن و کەتان چینی ژنان و چەند کەلوپەلێکی دیکەی هەرزەکارانمان لایە دڵنیاشتان دەکەینەوە، کە کەلوپەلی مردوویان[٢] لە ناودا نییە.

لەو کەینوبەینەدا کەس ئاگای لە کەس نەدەما، لەگەڵ ئەوەشدا لەناو ئەم جەنگی مەغلوبەدا هیچ جۆرە دزییەک و فڕوفێڵێک نەدەکرا، هەتا بەناوی پێشکەوتنی شارستانییەت لە ساڵی (١٩٤٧)م سینەما بنیات نرا، بۆ دیدەنی فلیمەکانی هەندێ لە لاوە با دەرامەتەکان ناچار دەبوون ڕوو لە فڕوفێڵ و گەندە دزی[٣] بکەن لە سایەی دڵسۆزە هەستیاردکان بەماوەیەکی کەم ئەم دیاردە ناشیرینەی شاز بنبڕ کرا، هێمن و

دڵنیابوونەوە باڵی بەسەر بازاڕ داگرتەوە. خاوەن دوکان و کۆگاکانی دەوروبەری قاڕی بازاڕ بەیانیان و ئێواران کە بەنێو ئەم بازاڕەدا ڕەت دەبوون دووچاری سەرسوڕمان دەبوون، بەیانیان لە جۆرەها کەلوپەل و وردەواڵە[٤] زرمەی دەهات، ئێوارانیش چۆڵ و هۆڵ دەبوو، وەک ئاشێکی ئاو لێ بڕاوی لێدەهات!!.

چەرچی و دەلالەکانی ئەم بازاڕە بەدەگمەن تا دوای نیوەڕۆ دەمانەوە زۆربەی زۆریان ئافرەت بوون، ئەرکی ماڵ و میوان و پەروەردەی منداڵیشیان لە مل بوو، بۆیە لەکاتی پشوودان بە کووچە و کۆڵاناندا دەگەڕان، بە تێلەگەی پشت هەوڵی کۆکردنەوەی جۆرەها کەلوپەل و وردەواڵەی بەهاداریان بۆ فرۆشتن لە قاڕی بازاڕ دەدا.

ژمارەی ئەم ئافرەتە دەلالانە زۆربوون، بەلام بەناوبانگترین و متمانە پێ کراوەکانیان ئەم بەڕێزانەی خوارەوە بوون، کەسیشیان سنووری گەڕەکی ئەوی دیکەیانی نەدەبەزاند، لەکاتی مامەڵەکردنیشدا جۆری کەلوپەلەکانی هاوسەنگەکەی خۆشی نەدەشکاند.

١- خوالێخۆشبوو: فاتمە ڕەواندزی و عایشە بلبل و خەدیجە ڕەش و حەبیبە شکاک لە گەڕەکی خانەقا و بڕوا پێکراوی چەند خانەوادەیەکی قەڵات بوون.

٢- ئەسمەر و کلێوەش لە گەڕەکی تەعجیل بوون، کلێوەیان بەزۆری مامەڵەی زێڕ و زیوی دەکرد.

٣- (ام هانی) و مەولوود قەلنەی هاوسەری ژیانی و ئامینە



گرگر لە گەڕەکی عارەبان. بوون هەندێ لەم ئافرەتە بەڕێزانە ئەوەندە متمانە پێکراو بوون بێ ترس کەلوپەلی بەهادار و زێڕ و زیوی کەلوکرۆمیان بۆ فرۆشتن پێدەدان، لە تاس و هەیاسە و جۆرەها ئەنگوستیلە و گوارە و پاشەسەرە و خەناوکە و خەزێم و گەردانە و تەبەلغ و لاسەرە و قۆیتاس و کەمەرە و بازن و خڵخاڵ و کرمۆکە و گەردەنلغ و کڵاوی بەدراوان و جۆرەها مۆری و مەرجانی بەنرخ، سەرەڕای جۆرەهای شەو لیفکە و کلدان و ئاوێنە و مشکێ و لێچەک و چەفیە و چەکمە و عەبا و چارشەو پێچەی ژنان. لەم باسەدا ئەوەمان بۆ ساغ دەبێتەوە، کە ئافرەتی کورد لەدێر زەمانەوە شانبەشانی پیاوان بۆ بژێوی خێزان و بووژاندنەوەی کاروباری کۆمەڵ ڕاستگۆیانە لەکاردا بووە.

تێبینی: بۆ بزرنەکردنی ئاسەواری ئەم بازاڕە میللییە، شارەوانی هەولێر لەسەر شێوازێکی شارستانی لە نێوان شەقامی "شێخەڵلا" و بازاڕی لەنگە سووتاوەکەی ڕیمان جێگەی بۆ هەمان ئافرەتە چەرچییەکان دروست کردۆتەوە.

**پەراوێزەکان:**

١- ئاژەڵی یەک سم- ئەسپ و هێستر و کەرە.

٢- ئەگەر ئەو کەلوپەلەی دەفرۆشان هی مردوویێک بایە، بایەخ بەکڕینی نەدەدرا، خۆ ئەگەر مرۆڤێکی کەم دەرامەتیش نیازی کڕینی بایە نرخێکی کەمی پێیدەدان.

٣- ئەوەی ئارەزووت بایە لە جلوبەرگ و وردەواڵە و کەلوپەلی پێویستی نێو ماڵت دەرحاڵ بە نرخێکی کەم وەبەرچاوان دەکەوتن.

٤- ئەو ئافرەتانەی ئەوکاتە هاتوچۆی ئەم بازاڕەیان دەکرد خۆیان بەشێوەیەکی ئەوتۆ لە چارشەو و پێچە دەپێچا بەدەگمەن سووچێکی چاوێکیانت دەدیت، نەریتێکی دانیشتوانی شار بوو.



# بازاڕی لەنگە

ئاشتی مەحموود

لەنگە دیاردەیەکی بەرچاوی زۆربەی شارەکانی جیهانە لە هەموو شارێکی گەورە، بازاڕێکی لەنگە فرۆشتن، کە زیاتر جلوبەرگی کۆنە یان جلوبەرگی مێژوویی کۆنی تێدا دەفرۆشێتەوە، کە ئەمڕۆ لە بازاڕی ئاساییدا نابینرێن و ئەم جلە کۆنانە لە زۆر وڵاتی جیا جیا دەهێنرێن و کڕیارێکی زۆری هەیە.

جلوبەرگی لەنگە تەنها دیاردەیەکی وڵاتانی هەژار نییە، بەڵکو لە وڵاتانی رۆژئاواش بازاڕی لەنگە هەیە، کە زیاتر لایەنێکی گەشتوگوزاری شارەکەی پێوە دیارە، بێجگە لە هەرزانی و دەسکەوتنی مۆدەی ئەو جلوبەرگانەی کە بەسەرچوون، زیاتر لاوان حەز بە کڕینی ئەو جلوبەرگانە دەکەن، کە ئی ساڵانی حەفتایەکانن وەک کاوبۆ و شارلستۆن و کراسی یەخە گەورەی یەک رەنگی، لە وڵاتانی دنیای سێیەمیش خەڵک بۆ هەرزانی و بۆ کڕینی جلوبەرگی رۆژئاوایی روو دەکەنە ئەو بازاڕانە، زۆر کەس لە کوردستان وا هەست دەکەن کە لەنگە فرۆشتن دوای راپەڕین پەیدا بووە، بەڵام وا نییە لەنگە فرۆشەکان لە ساڵانی حەفتایەکان لەناو بازاڕی گەورەی هەولێر بوون، بەڵام لەوانەیە ئەوەندە زۆر نەبووبن.

بە بیرمە ئێمە چەند گەنجێکی سەرشێت بووین، دەچووین بۆ دوکانی کۆنە فرۆشەکان، کابرای دوکاندارمان سەرقاڵی قسە دەکرد و هەندێکمان مارکەی کراس و پانتۆڵە کاوبۆیەکانمان لێدەکردەوە بەبێ پرسی کابرای دوکاندار... دوایش هەربەکەمان مارکە و نیشانەکانمان لە یەخەی کراس و قەمسەلە کاوبۆی و پانتۆڵەکانمان دەدا... چوار پێنج کەس بووین بەناو شاری هەولێردا دەگەڕاین دەتگوت رێکلامی کارگە جۆراوجۆرەکانی جلوبەرگی رۆژئاواین، بەڵام دیارە دوایی لەنگە فرۆشەکان زۆر بوون و لە بازاڕی پیرەژنان و سەیداوا و زۆر شوێنی دیکە ئەم کاسبییەیان کردووە...

بازاڕی لەنگەی نوێ لە هەولێر

دەکەوێتەوە گڵکەندی سێتاقان، کە حکومەتی هەرێم بە رێگەی شارەوانی هەولێر بۆ خاوێن کردنەوەی شاری هەولێر و یارمەتیدانی ئەو کاسبکارانە، بڕیاری دا بە بەخشینی زەوی بۆ دروستکردنی ئەو دوکانانە، کە ئیمڕۆ نزیکەی (١٤٠٠) دوکانی پاکی لێدەرچووە و (٧٢٠) دوکان تایبەتن بە لەنگە فرۆشان، هەمووشیان لە یەک شوێندا کۆ بوونەتەوە، بێجگە لە دوکانی سەرتاش و ساردەمەنی فرۆش و چادر دروو و پلاستیک و شووشە فرۆش و ئامێری کارەبایی و زۆر شتی دیکە، وای لەو بازارە کردووە، کە ببێتە سەنتەرێکی گەورە بۆ خەڵکی شاری هەولێر. لەو باوەڕەدام ئەگەر چەند دوکانێکی وەک چێشتخانە و ساردەمەنی فرۆش و گەس فرۆش و چاپخانەی تێدا بکرێتەوە دەبێتە بازارێکی گەورەی خۆش، کە هاوولاتیان، نەک هەر تەنها بۆ کڕینی جلوبەرگ و شتومەک، بەڵکو لایەنی گەشتوگوزاری پێوە دیار دەبێت و دەبێتە شوێنێک بۆ سەردان.

دوکاندارێکمان بە ناوی ئیسماعیل جەلال هێنایە دوان، کە جلوبەرگی ئافرەتان دەفرۆشێ:

*** لە کوێ جلوبەرگ دەکڕن؟ ئایا خەڵک بۆ هەرزانی یان جوانی روو لەم بازارە دەکەن؟**

- ئێمە جلوبەرگ بە کۆمەڵ دەکڕین و هەر یەکێکمانیش جۆرە جلێک دەکڕێ و دەفرۆشێ، خەڵکیش وا بزانم بۆ هەرزانی روو لێرە دەکەن، من خۆشحاڵم، کە ئێستا ئێمە هەموومان لێرە پێکەوەین.



*** رات چییە لەم بازارە؟**

- بە شێوەیەکی گشتی بازارێکی سەرکەوتووە و شارستانیترە لەو شێوەی، کە ئێمە پێشتر ئیشمان تێدا دەکرد. گیروگرفت هەیە، بەڵام چارەسەر دەکرێ، وەک ئاو و گرانی کارەبا و کاشی نەکردنی کۆڵانەکان، ئەم بازارە سەرکەوتووتر دەبێت ئەگەر بێت و خزمەتگوزاری زیاتری هەبێت.

مامۆستا رەفعەت کەمال مامۆستای ئینگلیزییە و بە هاوینیش جلوبەرگ فرۆشە، دوکانێکی رێک وپێکی خاوێنی هەیە، مامۆستایەکی لەسەرخۆ و رووخۆش و زیرەک دیار بوو، تەنها کراسی سپی کچان دەفرۆشێت.

*** بۆ تەنها کراسی سپی؟**

- راستییەکەی ئێستا کاتی قوتابخانەیە، کراسی سپیش باش دەفرۆشرێ، دەتوانی بە پارەیەکی کەم کراسێکی سپی و پوخت بکڕی، بێجگە لەوەی ئەو کراسانە نموونەیان نییە، چونکە هەر کراسێک تەنها یەک نموونەی هەیە، نەک وەک بازاڕ کە هەزاران کراسی سپی بە یەک شێوە و دروومان هەیە، جا ئەمەش دڵخۆشکەرە بۆ قوتابییەکی کچ، کە لە قوتابخانەکەدا تەنها یەک نموونەی کراسی تێدابێ.

لەگەڵ دوو گەنج دواین:

*** بۆ جوانی یان هەرزانی روو لێرە دەکەن؟**

- هەرزانی و گرانی گرنگ نییە، ئەوەی لای ئێمە گرنگە جوانی و جۆری جلی رۆژئاواییە، هەندێ جلوبەرگ لێرە هەیە و لە بازاڕ دەست ناکەوێت، بێگومان ئێمە زیاتر بە دوای پانتۆڵی کاوبۆدا دەگەڕێین، بازاڕەکەش خۆشتر بووە، چونکە هەموو کۆنە فرۆشەکان لێرە کۆبوونەتەوە.

خێزانێکمان دواند، کاک عەبدولرەحمان عەزیز خۆی و خێزانەکەی و دوو کوڕی لەم رۆژی هەینییە دا بۆ ئەم بازارە هاتوون.

*** راتان چییە بەم بازارە؟**

- بە شێوەیەکی گشتی باشە، هەندێکی ماوە لە بارەی خاوێنی و ئیشکردنەوە، هەتاکو ئێستا زۆربەی کۆڵانەکان چۆڵن، هەروەها نابێ دوکاندارەکان جلوبەرگیان لەسەر رێگای هاوولاتیان دابنێن. بێگومان هەرزانیشە، هەموو خەڵکیش توانای ئەوەی نییە جلوبەرگ لە بازاڕ بکڕێ بە تایبەتی لە زستاندا.

*** ئەم بابەتە لە گۆڤاری مێرگ، ژمارە (٦)، ٢٠٠٥ وەرگیراوە.**



# بازاڕی بەقاڵان

**بۆتان جەلال**

دیرۆکی شاری هەولێر زۆر لەوە زیاتر هەڵدەگرێت گەر هەر جارەو لەسەر لایەنێکی ژیانی گوزەران و کۆمەڵایەتی خەڵکی ئەو شارە لە کۆن و نوێوە بنووسرێت، چونکە شارێکە بەقەد مێژووە کۆنەکەی لە بنیادنان و کارتێکردنی شارستانی و ژیانی کۆمەڵایەتی دەوڵەمەندە و شایانی لێکۆڵینەوەو تیشک خستنە سەرە. هەر کە باسی شاری هەولێریش کرا، ناکرێ تۆ (قەڵا ، منارە، قەیسەری) ئەو شارە نەهێنیتە بەرچاو و نەیانکەیتە دەسکەلاو سەرچاوەی هەر باسێک کە گوزارشت لە ژیانی دانیشتوانی ئەو شارە ڕەسەنە دەکەن. قەیسەری خۆی لەخۆیدا شوێنەوارێکی دێرین و گرنگی ئەو شارە بووە، سەنتەری بازرگانی و ئاڵوگۆڕی کەلوپەل و پێداویستییە سەرەکییەکانی خۆراکی ئەو خەڵکە بووە، کاتێکیش بەر لە ١٥٦ ساڵ بەر لە ئەمڕۆ کە دروستکراوە، بیریان لەوە کردۆتەوە کە لەنێو ئەو قەیسەرییە شوێنێکی تایبەت بە فرۆشیارانی خۆراک بکەنەوە کە ئێمە بەو کەسانەی سەرپەرشتی کڕین و فرۆشتنی خواردن دەکەین، دەڵێین (بەقاڵ). واتە لە قەیسەری هەولێر بازاڕێکی گەورە کە لەدوو ریز دوکانی گەورە پێکهاتبوو دروستکراوەو هەر لە کۆنەوەش بەو شوێنەیان وتووە بازاڕی (بەقالان).. خەڵکێکی زۆریش بە تایبەتی ئەوانەی خانەدان و پارەو پوڵیان هەبوو، کاری بەقاڵییان کردووەو پێیان گوتراوە (بەقاڵ)و لەنێو خەڵکیشدا شوێنێکی بەرچاویان هەبووەو ڕێزیان لێگیراوە.

ئەمڕۆ گەر بەراوردێک لەگەڵ دوێنێی ئەو بازاڕە بکەین، تەماشا دەکەین چ لە رووی ڕواڵەت و سروشتی خەڵکی نێو ئەو بازاڕەو چ لەلایەنی بیناسازی و سیما ڕەسەنەکەیەوە جیاوازی هەیە. جاران لەسەرەتای دروستکردنی ئەو بازاڕە لە دوو ریز دووکانی گەورە پێکهاتووە، هەر دووکانێک لە حوجرەیەک و کۆگایەکی هەڵگرتنی خۆراک دروستکراوەو دەرگاو

پەنجــــەرەی لەدار دروســــتکراوی هەبووە، دوکـانەکـان لە کـەرپووچ و سەر دوکانەکانیش لە قوڕ و کاریتە و حەسیر داپۆشراوە، جادەیەک خۆڵی دوورو درێژی هەبووە لە زستانان ئەو جادەیە بۆ ئەوەی نەبێتە قوڕ و لیتە، بەردرێژ دەکـراو ڕێگایان بۆ هاتوچۆ کردن خۆش دەکرد. دەرگای سەرەکی هەبووەو پاسـەوان تا بەیانیـان لەو بازاڕە پاسەوانیان گرتووە. کاتی ئیش کردنیش بەیانی لەگەڵ خۆرهەڵات و ئێـوارانیش دوای مـەلا بانگدانی ئێواران بووە..

هەرچی ئەمـڕۆیە وێنەکـان تا سنـوورێکـی لێـڵ گـــۆڕانی بەسەرداهاتووە، خەڵکەکە خەڵکی جاران نین و دوکانەکانیش ئەو دوکانە ساکارانە نین کە جاران بەساکارییەوە بنیاد نرابوون، ئێستا دوکانی گەورەو چیمەنتۆڕێژ و بەردەم دوکانەکان یان چیمەنتۆڕێژو کارەبای چراخان، هەر دوکـانێک دەرابەیەکی ئاسنینی تایبەت بەخۆی هەیەو ڕووبەرەکەشی زۆر فـراوانتـر بووە، وەک لەوەی کـە جاران هەیبووە..



لەگەشتێکماندا بۆ نێو بازاڕی بەقـاڵان لە قـەیسـەری هەولێـر، سەردانی یەکێک لە کۆنە بەقاڵەکانی ئەو بازاڕە، کـە زیاتر لە نیوسەدەیە لەنێو دوکانێکدا بەقاڵی دەکات، مام (عـەبدولغـەنی شـاکـر سلێمـان) یادگارییەکی زۆری لەو بازاڕە تۆمار کردووەو ئەرشیفێکی دەوڵەمەندی داب و نەریت و ژیانی بەقاڵەکانی لە زاکیرەی خۆی کۆکردۆتەوەو هەر جارە لەگەڵ پرسـیارێکمـاندا بەوێنە و نموونە، وەڵامی تێـروتەسـەلی دەدایەوەو وردە وردە لاپەڕەکـانی بۆ هەڵدەدایەوەو سـەرەتاش بە یادگارییەکانی ژیانی خۆی لەو بازاڕەدا دەستی پێکردو گوتی: منداڵ بووم، باوکم لێرە بەقاڵ بووەو منیش شاگرد بووم. دێتەوە یادم زۆرجاران باوکم بۆی دەگێڕامەوە کە ڕۆژانە لەو بازاڕەدا چی دەکـرێ و چی ڕووی دەدا، لەکـاتی گـێڕانەوەی ڕۆژانەی بازاڕەکـە ناوی ژمـارەیەک بەقـاڵی دەهێنا ئەوانەی کـە لەمێـشکمـدا ناویان مـاوە (جـەبار ئاغـای عەبدولڕەحمان ئاغا، مستەفا ئاغای عوسمـان ئاغـای بەقـاڵ، نورەدین ئەڵلاویردی، ئەمین بەقاڵ) بوون، کە ئەوانە هاوڕێی باوکم بوون لە بەقاڵە کۆنەکان بوون.

پاشان کە گەورەبووم و ژنم هێنا، هاتمە سـەر دوکـانێ و کـاروباری دوکـانەکـە کـەوتە ئەسـتۆی من، ئەوانەی ئەوکـات لەو بازاڕە و لە خـەیاڵمـدا مـابن: (حـاجی عـەلی عەبدۆک، حاجی سابیر سەعید، ئیسمـاعیل مەجید ئاغا، حاجی عەباس فەتاح، واحد شێخ محەمەد،



حاجی حەیدەر عەبدولجەبار، سەید بیلال سەید محەمەد عەلی) بوون، هەندێکیان ماون و هەندێکیشیان چوونەتە بەر دڵۆڤانی خوای گەورە.

لەبازاڕی بەقاڵان کڕین و فرۆشتن وەرزی هەبوو، واتە هەر وەرزێکی ساڵ جۆرەک لە خواردن و میوە دەفرۆشرا، لەبەهاران ماست و پەنیر و ژاژی و لۆریان دەفرۆشت، لەهاوینان میوە و تەرە، لەپایز و زستانیش جۆرەهای خواردنی وشککراوە، بەڵام خۆراکی سەرەکی وەکو: (برنج و ئارد و ساوار و گەنمەکوتا و قەندی شەکر و چا و رۆنی ناوپێستە و تایت و سابوون و دۆشاو قەسپ و خورما و نیسک و نۆک و لۆبیا و.... هتد) لەهەر دوکانێکدا هەبوو.

ئەوانەی بەیانیان لە گەڕەکەکانی هەولێرەوە دەهاتنە ناو بازار بۆ کڕینی پێداویستیەکانیان، زۆربەی هەرە زۆری (پیاو) بوون، ئافرەت و کچ زۆر دەگمەن دەهاتنە بازار، جگە لەمانەش گوندنشین و کۆچەرەکانیش لە گوندەکانیانەوە بارگەی میوەیان هەڵدەگرت دەهاتنە ئێرە. بە خواردنی وەک رۆن و قەندی شەکر و چاو سابوونیان دەگۆڕییەوە، هەبوو بە قەرد یان بەسەلەم شتەکانی دەکڕی، کە ساڵ دەسووڕایەوە و دەغڵ و دانی دروێنە دەکرد دەهات پارەی خۆی دەداو خواردنی یەک ساڵی دابین دەکرد، زۆربەی خەڵکی هەژاربوون، بۆیە ساوەر و گەنمەکوتا و نیسک و نۆک و ماش سەرف دەبوون، برنج مەگەر ماڵە دەوڵەمەندەکان یان خەڵکی دیکە جەژنە و جەژن دەیتوانی برنج بکات.

ئێمە هەر بەقاڵێک کۆمەڵە موشتەرییەکی هەمیشەییمان هەبوو، لەوانە ماڵی مامۆستا (بەشیر مستەفا، سەید غەریب سەید سەلیم، شەهاب چەلەبی، ئەحمەد چەلەبی و ژمارەیەکی زۆر لە ئاغاکانی گەردیان)..

نرخی کەلوپەلی خۆراک ئەو کات زۆر هەرزان بوو، لەوانەش کیلۆی برنجی سووری بەغدا بە (١) درهەم بوو، یەک قەند شەکر بە (٣) درهەم بوو، یەک ئۆقەی چای باش بە (١٢) درهەم بوو، لەبازاڕی بەقاڵان بازرگانی گەورە هەبوون. یەکێک، لەوانە (نەسیم بەغدایی) بوو، کە بە نەژاد جوولەکە بوو. ئەوانە دەچوونە بەغدا و موسڵ، لەوێ خواردنیان دەهێنا و بەسەر دوکاندارەکانیان دابەش دەکرد و دەیانفرۆشتنەوە.

پاش ئەوەی مام عەبدولغەنی یادگارییەکانی نێو ئەو بازاڕە کۆنەی هەولێری بۆ گێڕاینەوە، حەزمان کرد هەندێ باس و خواسی ژیانی کۆمەڵایەتی و پەیوەندی نێوان بەقاڵەکانمان بۆ بکات، مام عەبدولغەنی دەڵێ: ژیان سادەو ساکار بوو، خەڵک لەگەڵ یەکتری تەباو دڵساف بوون، پەیوەندی لەگەڵ یەکتری بەتایبەتی خاوەن پیشەکان زۆر بەهێز بوو، هاریکاری یەکتریان دەکرد و کێ پارە و قەردی بویستایە بۆیان جێبەجێ دەکرد، من زۆرجار بەچاوی خۆم بینوومە بەیانیان کە یەکێکی تەنیشت خۆم ئیستفتاحی بکردایە موشتەرییەکی دیکەی بهاتبایە لای، دەیگوت برۆ دوکانەکەی تەنیشتم ئەو هێشتا ئیستفتاحی نەکردووە، لەکاتەکانی خۆشی و ناخۆشی هەموو لەگەڵ یەکتری وەک برا بوون. وەختی ئیشکردن لەو بازاڕە سبەینان لەگەڵ ڕۆژهەڵات دەرگای بازاڕ دەکرایەوە و ئێوارانیش دوای مەلابانگدان دادەخرا، پاسەوانی تایبەتی هەبوو، شەوان پاسەوانی دەگرت.

ئێواران کە دەگەڕاینەوە ماڵ دوای نان خواردن دیسان دەهاتینەوە سەر شەقامەکانی نزیک بازاڕی گەورەو هەموومان لە چایخانەکەی حاجی جەمیل یان مستیل یان قاوەخانەکەی عەبۆکۆ دەبووینەوە و چا و قاوەمان دەخواردەوە، باس و خواسی بازاڕمان لەگەڵ یەکتری دەکرد و دوای سەعات (١٠)ی شەو هەرکەس دەگەڕایەوە ماڵی خۆی..

بەڵام ئەمڕۆ وەک هەر گۆڕانکارییەکی دیکەی بوارەکانی ژیان و ژیانی کۆمەڵایەتیمان ئەو بازاڕەش گۆڕاوە، و لە راستیدا تاموچێژی جارانی نەماوە، جاران بەقاڵ تەنها بەقاڵی خۆی دەکرد و ئەو شتانەی دەفرۆشت، کە پەیوەندی بە پیشەکەی هەیە، ئەمڕۆ ناچارین لەپاڵ خواردن شتی هەمەجۆری دیکەی وەک کەمالیاتیش بفرۆشین، چونکی جاران ئەو بازاڕە تاکە بازاڕی شار بوو، ئەمڕۆ لەهەر کۆڵانێکی هەولێر چەند بازاڕێک کراوەتەوە و خەڵکی پێویستییان بە ئێمە نەماوە.

هەرچۆنێک بێت، بازاڕی بەقاڵانی ناو قەیسەری مێژوویێکی خۆی هەیەو تام و چێژ و مۆرکێکی تایبەتی بەسەردا براوە، هەرچەندە ئەمڕۆ زۆر لە سیما کۆنەکانی سڕاوەتەوە، بەڵام توانیویەتی پارێزگاری لە بوون و مۆرکی خۆی بکات.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری بارش ژمارە (٩) بڵاوبۆتەوە.



# کۆچەری و مەڕداری لە دەشتی هەولێر

عەباس سلێمان

گەلی کورد وەک گەلانی عەرەب و فارس بەشێکی جێوارو بەشەکەی دیکەشی رەوەندو کۆچەر بووە، وەرزی پایز مانگێکی بەسەر دەچوو، مەڕداران لە زۆزان دەگەڕانەوە دەشتەکان. بەهاریش مانگێکی بەسەر دەچوو بارگەیان دەپێچایەوە و مەڕەکانیان بەرەو کوێستان رادەدا.

لە هەموو ناوچەیەکی کوردستانیش رەوەند و کۆچەر هەبووە، بەڵام چوونە کوێستان و گەڕانەوەیان جیابوو، تاکو ئەمڕۆش کۆچەرایەتی هەر ماوە وەک هۆزانی مەمەسانی، بوێر ئەحمەد و بەختیاری و هەندێک لە هۆزانی فەیلی و جاف، مامەش، مەنگوڕ، دیبۆکری، زەرزا، هەرکی، مام سار، خەیلانی، میلان، شکاک، گەلاڵی، بێرتیاو کوردانی خۆراسان و گم گم و ناوچەی دیکەی وەک رەوان، ئاخ موغان، شنگارو چەولک.

دوای ئەوەی لە سالانی (١٥٠٠ز.) بە هۆی دروستبوونی ناکۆکی نێوان عوسمانی و سەفەوی، رەوەندەکان زیاتر لە هەواری گەرمیانییان نیشتەجێ بوون. دەشتی هەولێریش یەک لەو هەوارەی گەرمیانی رەوەندان بووە، کە ژمارەیەکی زۆری هۆزانی کوردی مەڕداری تیا نیشتەجێ بووە، هەروەک کوڕی حوقەل لە پەرتووکەکە (سوڕەتی ئەرز) باس لەم دەشتە دەکات و دەڵێت: مەڕدارانی دەشتی هەولێر لە رەشماڵان دەژین.

دوای ئەوەی لە ساڵی (١٥٠٨ز.) سەفەوی توانییان شاری موسڵ داگیر بکەن و لە سالانی نێوان (١٥١٤ - ١٥١٦)یش عوسمانی بە پاڵپشتی هۆزانی کورد توانییان زاڵ بن بە سەر سەفەوی، بەتایبەتی لە جەنگی چاڵدێران، ئیتر تا سالانی (١٥٣٦ - ١٥٣٧) و دابەشکردنی کوردستان، کۆچەرانی کورد لەوپەڕی ناخۆشیدا دەژیان و هاتوچۆی گەرمیان و کوێستانیان لێ تاڵ کرا. ئینجا کۆچەری کورد زیاتر لە هەواری گەرمیان جێوار دەبن و زیاتر بە کاری مەڕداری و چاندنی دەغڵودانەوە خەریک دەبن، واتە لە کۆچەری تەواو دەبن بە کۆچەری ناتەواو یا نیوە کۆچەر. سەرەڕای مەڕدارییان بە هەندێ پیشەی دەستیشەوە خەریک بوون وەک:

چنینی جۆرەها بەڕەو مافوورو رەشماڵ، پیشەسازی سووکی وەک نالبەندی و چاککردنەوەی چەک و داگرتنەوەی فیشەک و دروستکردنی چەقۆو جەنجەڕو سۆبەو گەچ دروستکردن وەستای زۆر شارەزای ئەم پیشەسازییانەش هەبووە، لەوانە لە دەشتی هەولێر، فەقێ عەولای سمایلاوا و وەستا ئەمین گوندی سۆربەش، کە وەرشە و کووورەشیان هەبووە.

ئەو کۆچەرانەی کە لە چیاکانیش نیشتەجێ دەبوون، زیاتر بە ڕەزو تووتن چاندنەوە خەریک دەبوون، سەرەڕای دروستکردنی جۆرەها گوشراوی میوە لە گەڵ دروستکردنی جۆرەها کەرستەی ناومال وەک: گۆیاڵ، سەبەتە، سەوەشیر، قەرتاڵە، دارجگەرە و قەفەزو شتی دیکە و بەردەوامیش (میوە و تووتن و بەفرو ڕەژوو)یان بۆ گوندەکانی دەشتی هەولێر بردووە و گەنم و جۆیان گۆڕیوەتەوە.

خۆشناو لە مالی خانەخوێی گوندی دەمایەوە و دەچووە سەربانی و دەیوت: دە وارنە ترێیان....وارنە بەدەم بانگکردنی میوەجاتان زۆر شیعریشیان دەوت لەوانە:

**هەی هەنار و هەی هەنار**
**چیت وتییە بارەک هەنار**
**گەنم دەدەم یەک و دوو بە جۆش**
**دەدەم یەک و چار**
**لە بۆ یارێ سەربەسەر هەنار سۆری قرمزی**
**بارناکەم لە کەردزی تا هەنار هەمووی نەرزی.**

### هەواری گەرمیانی دەشتی هەولێر

سەرەتای نیشتەجێ بوونی مەرداران لە هەواری گەرمیان هەموویان خاوەنی مالات بوون، بەلام بە هۆی گەورە بوونی گوند و پێشکەوتنیان هەندێک لەوان بە چاندنی دەغلودان خەریک دەبوون، هەندێکیش بە پیشەی دەستی و هەندێک بە ڕاو و هەندێک بە بازرگانی و ئی واش هەبوو رووی لە کاری دیکەی وەک خوێندنی ئایینی و قاوەچی کوێخوا و نۆبەتداری و سەرکاری دەکرد.

هەر لە کۆنەوەش هەر بنەماڵەیەک، کە دەبووە خاوەن لەوەڕگەیەک سەرەتا بیرێکی لێ دەدا، دوای ئەوەی گوندیش گەورە دەبوو ئەوانەی مەڕیان هەبوو مەڕەکانیان نەدەهێنا ناو گوندی، بەڵکو شوانکارەیان لێ دەگرت و لە لەوەڕگە دەمایەوە، بۆیە خاوەن مەڕ بیرێکیشی لە لەوەڕگەکە بۆ ئاژەڵەکانی لێ دەداو غەری بۆ مەڕەکانی دروست دەکرد و کەپریش بۆ مالی شوانکارە.

لە دوای سالانی (١٧٥٠-١٨٠٠) لە دەشتی ملکیە، گوندی زۆر گەورە دروست بوو بەتایبەتی لە سەر ڕێگای نێوان پردێ و گوێڕ، کە جاران ڕێگای سەرەکی نێوان کەرکووک و موسل و ئەستەنبوول بوو، ڕێگایەکی گرنگی بازرگانی و خاکێکی بە پیتی کشتوکالی هەبوو.

جا مەرداری ئەم گوندانە بەتایبەتی ئاغاو کوێخواکان بە زستانان مەڕەکانیان لە نێو غەران لە چیای قەرەچووغ دەمایەوە، بەلام دوای ئەوەی دەغلودان دەدوورایەوە مەڕەکانیان لە ناو پەرێزەکان دەلەوەڕاند تا پەرێز لەوەڕی نەدەما ئینجا بەرەو چیای قەرەچووغ مەڕەکانیان ڕادەدا. ئەگەر سالیش نەهات بوایە، هەر لە سەرەتای وەرزی بەهار مەرداران مەڕەکانیان بۆ بیتوێن یا دەو بەستۆرە و خۆشناوەتی ڕادەدا و مانگێک لە وەرزی پاییز تێدەپەڕی ئینجا مەڕەکانیان دەهێنایەوە، دەوروبەری (٢٠٠ - ٢٥٠) سالێکیش دەبێت هەوارەکانی کەندێناوە بەرەو گوند گۆڕاون، هەواری دیبەگەش لە هەموو هەوارەکانی دیکە گەورەتر بوو دواتر بوو بە شارۆچکە. قەراج - یش دەوروبەری (١٥٠) سەدو پەنجا سالێکە، هەوارە گەرمیانەکان بەرەو ئاوایی گۆڕاون، هەواری مەخموریش لە هەموویان کۆنترە، کە ئەمڕۆ بنکەی قەزای مەخموورە.

بەلام زۆر لە هەوارەکانی دەشتی هەولێر ئاسەواری کۆنە گوندو کۆنە شاریان تیا دۆزراوەتەوە، کە دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی جیاجیای هووریەکان، ئاشوورییەکان، ئەشکانی، ساسانی و ئیتر ئەم دەشتە دوای ئەوەی کۆمەڵێک تیرەو هۆزی جیاجیای تیا نیشتەجێ بوو و سەرەڕای ئاژەڵ بە خێوکردنیان خەریکی کشتوکاڵ کردنیش بوون.

بەلام دەشتی قەراج زۆرجار بە هۆی نەهاتی دانیشتووانی زۆر گوند، گوندیان بە جێ دەهێشت، واتە قەراج وەک پاوانێکی بەهاری وابووە بێجگە لە هۆزانی ناوچەکە هۆزانی دیکەی ناو شاخەکانیش بەهاران هاتوونەتە ئەوێ و هەریەک بنەگەی خۆی لەم دەشتە هەبووە، وەک هۆزی سورچی، خەیلانی، هەرکی، خۆشناو، بلباس.

### جل و بەرگی مەرداران

جاران دانیشتووانی ئەم دەشتە کورتەک و شەرواڵیان لەبەر نەکردووە، بەڵکو دەرپێیەکی سپی گەڵ کورتەکێکی بە لۆکەیان لەبەر دەکرد، کە پێیان دەوت کورتەکی بەشاقەڵ، کورتەکەکەشیان بەسەر دەرپێیەکەدا شۆڕ دەکردەوە.

کڵاوێکی لبادیشیان لە سەری دەکرد، ئەوی کەزیشی هەبوایە دوو کونی لە کڵاوەکە دەکرد و کەزییەکانی لێ دەهێنا دەرەوە و بەسەر شانیدا شۆڕی دەکردنەوە، مام سەعدونی کوێخوای گوندی سۆربەش لە شەڕێکدا لەگەڵ خزمەتکارانی ئاغای گوندی قورشاغلو شیرێکی بە کەزییەکانی کەوت و کەزییەکانی قوت بوون.

لە دوای بیستەکان کڵاوی بە نەخش لە کۆیە دروست دەکران و دەگەیشتە دەشتی هەولێر و لە جیاتی جەمەدانیش هەوری لە سەر دەکرا، هەژارەکانیش چیتیان لە سەری دەنا، دەوڵەمەندو ئاغا و کوێخواکانیش کەوێ و سەڵتەیان لەبەر دەکرد.

هەروەها تا بەرپابوونی جەنگی یەکەمی جیهانی خەڵک لە جیاتی پشتێن تەگبەندیان لە پشتی دەکرد، دەوڵەمەندەکانیش لە سەر تەگبەند پشتێنیان لە پشت دەکرد.

تەگبەند بریتی بوو لە پارچە قوماشێکی ئەستوورو نەخشێنراو بە ئارمووشی رەنگاورەنگ، بە بەنێکی رەش و سپی یا رەنگاو رەنگ لە پشتیان دەبەست، جلی ئافرەتانیش زۆر سادە بوو بریتی بوو لە کراسێکی کوردی ئافرەتان و کورتەکێکی بە شاقەلی بە سیم نەخشێنراو و چارۆگ و بەرامپیلێک.... پێڵاویشیان جاران کڵاش و بەم دواییەش هەبووەکان یەمەنیشیان لە پێ دەکرد.

**مەڕداری**

ئاغا و کوێخواکان مەڕیان لە خەڵکانی دیکە زیاتر بوو، هەریەکە چەند مێگەلێکی هەبوو، هەر مێگەلێکیش (٣٠٠-٥٠٠) مەڕ دەبوو و درابووە دەستی شوانکارەیەک یا چەند شوانێک، ئاغاکانیش بەخورتی دەستیان بە سەر زۆربەی پاوانەکان و لەوەڕگا نەرماییەکانی زوورگەزراودا گرتبوو، هەر دوای تێپەڕبوونی مانگێک بەسەر وەرزی بەهار، قەدەغە دەکرا خەڵکان مەڕی تیا بلەوەڕێن، ئینجا گیای ئەم پاوانە گەورە دەبوو و دەڕسکاو دەبوو بە پووش و بۆ ساڵی داهاتوو هەر لە سەرەتای پاییز بەهۆی سەرپۆش، کە پووشەکە بوو، هەوایەکەی ژێرەوەی گەرم دەبوو و گیا لە ژێریەوە زوو دەڕواو گەورە دەبوو ئینجا مەڕیان تێدەکرد.

پاوان-یش زیاتر لە گەلییەکانی چیای قەرەچووغ بوو، بۆ نموونە گەلییەکانی ئاقاری گوندی خدرجیجە پاوانی ئاغا بوو، هەژاران بۆیان نەبوو لە ئاقاری ئەم گوندە مەڕیان بەرەو چیا ببەن، دەبوایە مەڕەکانیان بەرەو زوورگەزراو رابدەن.

زۆر لەم ئاغا و کوێخوایانە سەرەتای پاییز مەڕە پیرەکانیان بە هەرزان دەفرۆشن، نەوەک لە سەرمای زستان دەرنەچن، دانیشتووی گوندەکان لێیان دەکڕین و بۆ ماوەی (١-٢) مانگ دایان دەبەستان و قەڵەو دەبوون ئینجا سەریان دەبڕین و گۆشتەکەیان دەکردە قاورمە.

بە گشتی شیری مەڕەکان دەکرایە رۆن و پەنیر، پردەیی دەیانکڕی و بۆ موسڵ و کەرکووک و بەغدایان دەبرد، هەروەها خوری و کاوڕیشیان دەکڕی، زۆر جاریش دانیشتووانی گوندەکان خۆیان خوری و کاوڕیان دەبردە شاری موسڵ و لەوێ دەیانفرۆشت، جاری واش هەبوو جوولەکە بۆی دەفرۆشتن.

هەندێک لەو گوندانەی کە تا ساڵانی شەستەکان زۆربەی دانیشتووانی مەڕدار بوون:

١- **گوندی پەرکانە:** گوندی پەرکانە بە هۆی ئاوی زۆر و پاوانی زۆرەوە زۆربەی دانیشتووانی ئەم گوندە بە بەخێوکردنی مەڕو ماڵاتەوە خەریک بوون، دانیشتوانەکەشی بریتی بوون لە هۆزانی کارەش، هورمزیار، بامەند، بیرو کانییەکانیشی ئەمانە بوون:

بیری رەش، کانی عەبدی، ئاوی شاخە کوورە، کە هاوینانیش ئاوەکەی دەڕۆیشت.

لە ساڵی (١٩٦٣) هۆزانی عەرەب بە پاڵپشتی حکومەت (٣٠٠٠) سێ هەزار مەڕی ئەم گوندەیان بە تاڵان برد

٢- **هەوارغەر:** هەوار غەر گوندێکە لە قەراج، جاران هەموو دانیشتووانی ئەم گوندە بە مەڕدارییەوە خەریک بوون، لە ساڵی (١٩٦٣) هۆزانی عەرەب (٢٨٥) دوو سەدو هەشتاو پێنج مەڕی ئەم گوندەیان بە تاڵان برد.

بە هۆی ئەوەی ئەو غەرەی کە لەم ئاقارە کراوە و هەوارێکی لە سەر هەڵدراوە بۆیە بەم ناوە ناسراوە.

٣- **گوندی بنێرز:** گوندی بنێرز گوندێکە لە شەمامکێ، دەڵێن جاران بنەماڵەیەکی ناوچەی زێباری بنار چیای پێرس ئەم گوندەیان ئاوەدان کردۆتەوە، سەرەتا هەواری گەرمیانیان بووە پاشان بووە بە هەواری

هەمیشەییان و هەموو دانیشتووانی گوند مەڕدار بووینە، ناوی گوندەکەش بن بێرز لە پیرس هاتووە.

٤- **ئاوەدلۆک:** ئاو دەلۆک ناوی گوندێکە کاتی خۆی مەڕدارێک ناوی قادر وەسمان لە هۆزی لەک ئاوەدانی کردۆتەوە، بە قسەی مەلا سابیری نەوەی قادر وەسمان ئەو گوندە بەرلەوەی باپیرە گەورەی ئاوەدانی بکاتەوە کاولە گوندێک بووە. ئەمەش سەرجەلەی مەلا سابیرە: مەلا سابیر، رەسول، سلێمان، قادر، وەسمان، فەقێ، محەمەد برایمەلەک، ناوی گوندەکەش لە ئاو هەڵێنجان بە دەولک هاتووە برایمی باپیریشی بەرلەوە گوندێکی ئاوەدان کردۆتەوە، کە بە برایمەلەک ناسراوە واتە ئیبراهیم لەک.

٥- **گوندی لهێبان:** کاتی خۆی لهێبان زەوی و زارێکی سەید ئەحمەدی خانەقا بووە دوای ئەوەی بنەماڵەیەکی لهێب بۆ ماوەیەک رەشماڵ لەم ئاقارە هەڵدەدەن.

ماڵاتەکانیان لەم لەوەڕگایە دەلەوەڕێنن، جا دوای ئەوەی ئەوێ بە جێ دێڵن، هەر بە ئاقاری لهێب دەناسرێت و لە ساڵی ١٩٢١ گوندێکی لێ ئاوەدان دەکرێتەوە و بە گوندی لهێبان دەناسرێت.

٦- **گوندی پیرداودوسوان:** زۆربەی دانیشتووانی ئەم گوندە مەڕدارن، پاوانێکی زۆریشیان لە چیای قەرەچووغ هەیە، کاتی خۆی یەکێک بە ناوی پیرداود وسو ئەم گوندەی ئاوەدان کردۆتەوە، بۆیە بەم ناوە ناسراوە، دانیشتووانەکەی بەر لە تێکدانی بریتی بوو لەم هۆزانە: رۆژبەیانی، موغ بایزی، چوغەرەشی، بلباس، ناوە جوگرافییەکانی گردی قوچی، کەلی مەنجەران، گەلی چک چکە.

گوندی گرون-یش نزیک ئەم گوندەیەو هەموویان مەڕدار بوون- لە ئاقاری ئەم گوندە لە چیای قەرەچووغ ئەشکەوتێک هەیە، ژمارەیەک دەلاقەی لێ هەڵکەندراوە، وا پێ دەچێت کاتی خۆی مرۆڤی تیا نیشتەجێ بووبێت.

٧- **تۆبزاوە:** گوندی تۆبزاوە لە باشووری هەولێر نزیک بە گوندی (تیمار)ە کاتی خۆی کاولە گوندێک بووە زەوییەکانیش مولکی کارمەندێکی عوسمانی بووە و لە کەرکوک نیشتەجێ بووە، دوای دروستبوونی وڵاتی نوێی عێراق، یەکێک بە ناوی تاهیر مەجید حاجی جوامێر کە دانیشتووی هەولێر بووە گوندەکە واتە زەوی و زارەکە دەکرێت و لەو کاولە گوندە جێوار دەبن و بەهاران مەڕەکانیان بەرەو قەراج رادەدا و لە وشکە ساڵیش بۆ دەو بەستۆڕە.

ناوی ئەم گوندە لە تۆزاوە هاتووە لە بەر ئەوەی شوێنی گوندەکە نەورایەو هەمیشە تۆزوبا دەیگرێتەوە، بەداخەوە دکتۆر جەمال رەشید هەموو ناوێکی تۆبزاوە بە ناوێکی هووری دەزانێ.

٨- **گوندی کونە سیخوڕ:** گوندی کونە سیخوڕ کاتی خۆی کاولە گوندێک بووە یەکێک بە ناوی حەمشینی سەلیم وەستا مەلا ئاوەدانی کردۆتەوە کە لە هۆزی کوردە بووە و لە لای سلێمانی هاتووە و مەڕێکی زۆری هەبووە و حەوت کوڕیشی هەبووە، دەستێکی باڵاشی لە بەیتاری هەبووە، زۆر جاریش بێجگە لە کاوڕی خۆی کاوڕی لە ناوچەکەش دەکڕی و لە شاری موسڵ دەیفرۆشت مەڕەکانی خۆشی هەمیشە لە چیای قەرەچووغ بووە و شوانکارەی لێ گرتووە لە هەر پاوانێکی هۆزی بۆ حەوانەوەی زستانی مەڕەکانی و غەریبیشی بۆ کاتی هەوای خۆش دروست کردووە و پاوانەکانی حەمشینی بریتی بوو لەم گەلییانە: گەلی سۆر لە ئاقاری گوندی قەڵاتە سۆری مەرزان و گەلی دەروێش.

بە هۆی ئەوەی زەوی و زاری ئەم گوندە رووەکی کاردی زۆری لێ دەروێت و سیخوڕیش کۆلکەی کاردی دەخوات و ئاقاری گوندەکە بووەتە کونە سیخوڕ، کە ناوی گوندەکەی پێناسراوە.

**پەراوێزەکان:**

مێژوو نووسان کوردیان بۆ چوار چین دابەش کردووە: رەوەند، کۆچەر، جووتیار، دانیشتووی شار (جێوار)، رەوەند و کۆچەر لە رەشماڵان دەژین و بیرکردنەوەشیان جیایە لەگەڵ جووتیارو دانیشتووی شار بەڵام ئێزدی، کاکەیی، ئەهلی حەق و دیان و جوو هەوڵیان داوە لە شوێنی سەخت نیشتەجێ بن و کۆچەریشیان کەمتر بووە لە کوردی موسڵمان.

* جێوار: جێوار بریتییە لە دانیشتووانی شارو گوند، دانیشتووانی گوندیش کە زیاتر بە چاندن خەریک بووینە و مەڕداریشیان کردووە و هەر لە قۆناغی رەوەندی و

کۆچەرییەوە بوونەتە جووتیار.

* رەوەند: رەوەند جێگا و هەواری تایبەتی نەبووە، لە کوێ لەوەڕ هەبوایە و کەشوهەوا لە بار بوایە دەگیرسایەوە بۆیە رەوەندێکی زۆری کورد پەرگەندەی ولاتانی دەوروبەری کوردستان بووە، لەوانە: بنەماڵەیەک بە ناوی (کاوە) پەرگەندەی ولاتی چین بوون و بنەماڵەیەک لە هۆزی بلباس کە ئەمڕۆ لە (١٠٠) ماڵ زیاترن پەرگەندەی ئوستانی رمادی بووینە و بنەماڵەیەکی بەرەسەن خەڵکی ئامێدی بە ناوی چیچان پەرگەندەی تکریت و سامەڕا بووینە.

بەلام کۆچەری قۆناغێک لە پێش رەوەندەکانن و هەواری تایبەتی خۆیان هەیە لە گەرمیان و کوێستان. هەڵبەت کورد لە زۆر کۆنەوە گەرمیان و کوێستانی کردووە، تەنانەت چوونە سەربانی دانیشتووانی شارەکان بۆ خەوتن لە هاوین و دانیشتووی هەندێک لە گوندەکانیش چوونیان بۆ ناو باغ و بن کەپران لە هاوین، جۆرە کۆچەرییێکە.

* فەقێ عەولا و وەستا ئەمین هەردووکیان وەرشەیان هەبوو، وەستا ئەمین کوورەی ئاسنگەریشی هەبوو جۆرەها کەلوپەلیان لە ئاسن دروست دەکرد، وەک سۆبە، باڵتەی جەنجەڕ، داس، شەنە.

* مەڕدارانی دەشتی هەولێر لە کۆنەوە کێشەیان لە سەر پاوان و لەوەرگەکان لەگەڵ یەکتری هەبووە، هەر بابایەو ویستوویەتی دەست بەسەر باشترین پاوان دابگرێت، بۆ نموونە بە هۆی کێشەی نێوان هەندێک هۆزی ناوچەکە و هۆزی فەقێ مەرکی، زەوییەکانی فەقێ مەرکیان کەوتە ژێر دەستی هۆزانی ناوچەکە و بەناچاری بەرەو لای گوێڕو کوشاف چوونە خوار، بەلام بە هۆی ئەوەی ئاغاکانی دزەیی زمانی تورکییان دەزانی توانییان دەست بە سەر گوندێکی زۆری ئەم دەشتە دابگرن سەرەڕای ئەوەی کە حکومەتی عوسمانی زەوی و زارێکی زۆری دەوروبەری هەولێری دا بە مەلا و ئاغا و کارمەندەکانی. کۆچەری بووەتە هۆی پاراستنی کلتوور بەتایبەتی کلتووری گۆرانی، سیستەمی گۆرانیش وەک پەروەردە وابووە چونکە خوێندن بە کوردی نەبوو لە رێگەی گۆرانی رووداو و چیرۆک دەگێڕدرایەوە سەرەڕای هونەرەکەی، لەبەرئەوەی (مەلا) لە نێو کۆچەران، کەس نەبووە هونەری گۆرانییان لێ قەدەغە بکات و بە ئازادی گۆرانییان چڕیوە، دوای ئەوەی گوند دروست دەبێت یان هەواری گەرمییان یان کوێستانیان دەبێت، بە گوندو ئاغای گوندی لە دیوەخانەکەی زۆر گرنگی بە گۆرانی داوە، بەلام دوای ئەوەی حوجرەی مەلا بۆ مزگەوت دەگوێزێ و رژێمی دەرەبەگایەتی بەرەو نەمان دەچێت لە گوندەکان، خەڵک زیاتر روو لە مزگەوتەکان دەکەن، هەڵبەت مزگەوتیش جێگای خودا پەرستنە و هونەری گۆرانیش لە مزگەوت قەدەغەیە جا مەڕدارانی دەشتی هەولێر باشترین رۆڵیان دیت لە پاراستنی حەیران و پێشخستنی لە دیوەخانەکان، حەیران نە هی موکریانە و نە هی دەشتی هەولێر، بەڵکو هونەرێکی گۆرانی کوردی نێوان بۆکان و قەراجە، بەلام لە دەشتی هەولێر بە هۆی دیوەخانەکانی ئاغا و کوێخواکان بەرەو پێش چووە.

* جاران مەڕدارەکان ئاگریان لە سەر ئەو زەوییانە دەکردەوە کە بەردەگێچی هەبوو، ئەم ئاگرە دەوروبەری ئەستوورایی (١٠)سم لە بەردە گێچەکەی دەسووتاند و ئینجا وردیان دەکرد و کوڵی مەڕەکانیان پێ دروست دەکرد، پاشان خەڵکەکە بەردە گێچەکانیان هەڵدەکەندو کوێیان دەکردەوە و بە هۆی نەوتی رەش دەیانسووتاندو ئینجا دەکوترا تا وای لێ هات گێچ دروستکردن بووە پیشەی خەڵکانێک و لە شاری هەولێر دەیانفرۆشت. تەنیا لە گوندی سۆربەش (٥٠) ماڵ ئەم کارەیان دەکرد.

* بێرتیا: بێرتیا هۆزێکی گەورەی کۆچەری کوردی کوردستانی تورکیایە ساڵانە بە دەیان مێگەلە کاوڕ لە شارەکان دەفرۆشن، ئەم هۆزە هاوینان دەچنە سەرحەدێ و زستانیش لە نێوان دیاربەکرو ماردین و ئورفە نیشتەجێ دەبن.

* جاران دیوی ژوورەوەی غەری مەڕان بە تانۆک دادەپۆشرا هەتا مەڕەکان سەرمایان نەبێت بە گشتی ئەگەر مەڕ تێر کاو و جۆ بێت، سەرمای نابێت، ساڵی هاتیش مەڕ دوو جار بە بەران دەهات.

پاوانیش بە زۆری موڵکی ئاغا بوو، مەڕی هەر کەسێک بچووبایە ناو پاوانی ئاغا، دەبوایە گیسکێک یا کاوڕێک بداتە ئاغا.

*** ئەم بابەتە لە گۆڤاری هەولێر، ژمارە (١٦)ی پایزی (٢٠٠٢) وەرگیراوە.**



# سیپان و ڕەشان لە دەشتی هەولێر

عەزیزی مەلای ڕەش

یەکەم: هەرچی لە مەڕ دەبێت، نێر و مێ، گەورە و گچکە سیپانی پێدەگوترێت، مەڕیش ئەو سیپانە مێیەیە، کە پێی نابێتە دوو ساڵ و نیو، بەرخێکی بەڕێ کردبێت.

**سیپان لە دەشتی هەولێر سێ جۆرە:**

١- **سیپانی کوردی:** باڵابەرز و درێژ و بە تەنگە و شۆڕدیە و خوری زۆر و تیسکنە، لە ڕۆیشتندا شل و خاوە، زۆر بە شیرە.

٢- **سیپانی عارەبی:** خڕ و گورج و توند و تۆڵە و کەلەش گچکەیە و کەم خوربیە، بەڵام لە خوری سیپانی کوردی سپیترە، شیری کەم و زۆر چەورە.

٣- **سیپانی تورکی:** لە ڕدسەنە مەڕی کوردی و عارەبی پەیدا دەبێت، خوری سپی و پەل ئەستوور و بە باڵا هەندی مەڕی کوردی دەبێت، بەڵام بە تەنگە و شۆڕە نییە. لە ڕۆیشتندا توند و تۆڵە و زۆر بە شیرە.

بابزانین کێهان جۆرە سیپان لەم سێ جۆرە ڕاگرتنی لە دەشتی هەولێر پەسندە. لە ئاخر و ئۆخری وەرزی بەهاردا، لە دەشتی هەولێر، هەر کە شینکە نەما، ڕوودکێک شین دەبێت پێیدەڵێن (سوڕناتک). بە تایبەتی لەنێو کێڵگەی (وەرد) و (شۆ)دا. هەوەڵجار زۆر ناسک و سووریشە و مەڕ و ماڵات باشی دەخۆن، ئەو سیپانەی کە پێستەی زۆر سپییە، هەر کە ئەو ڕوودکە بخوات هەموو لەشی دەبێتە برین و شەقار شەقار، نەخەسەلە سەروچاو و گوانی، سیپانە سوڕناتک بردووەکە ددم لەخۆی دەنێت، واتە بە ددان برینەکانی

دەخورێنێت و گەورەتریان دەکات. خاوەنەکەی بە خوێ و کەرە و تەنی برینەکان تیمار دەکات، بەلام بێ سوودە، ئەگەر مەڕەکە زابێت، ئەو ساڵە شیری وشک دەکات، زۆر جاریش گوانی سەقەت دەبێت، بۆیە شوانی باش و مەعلان تا سوڕناتک پیرنەبوایە و کاتی بەسەر نەچوبووایە مێگەلی خۆی بەناو کێلگەی وەرد و شۆدا نەدەگێڕا. سێپانی عەرەبی و تورکی پێستەیان زۆر سپییە و بەرگەی سوڕناتک خواردن ناگرن راگرتنیان لە دەشتی هەولێر پەسند نییە.

سێپانی کوردی زۆربەی هەرە زۆریان بێ (قۆچ)ن. تاکولۆکیان نەبێت. ئەویش پێدەگوترێت (کەرین). بە بۆچوونی من لە وشەی (قرن)ی عەرەبی وەرگیراوە هەر چۆنێک بێت موڵکی کوردە.

**ناوی سێپانی کوردی بە گوێرەی رەنگ ئەمانەن:**

١- بازی: سێپانێکە رەنگی پەڵەکانی سپی بێت، یان دوو رەنگە.
٢- بەڵەک: سێپانی رەنگ رەش و سپی، یان سوور و سپی، یان زەرد و سپی.
٣- (تە) = (چەرمو): ئەمە چوار جۆری هەیە:
أ- تە رووممەت رەش: ئەو سێپانەیە خورییەکەی هەموو سپییە تەنیا دەموچاوی رەشە.
ب- تە رووممەت زەرد: سێپانێکە لەش سپی و دەموچاو زەرد.
ج- تە رووممەت شین: سێپانی لەش سپی و روو شین = (کەوی).
د- تە رووممەت سپی: سێپانی لەش و رووممەت سپی، ئەم دوو جۆرەی دوایی بە دەگمەن هەیە.
٤- تبەش = سێپانی دەموچاو رەش و نیوچەوان سپی.
٥- رسەر: ئەمە دوو جۆرە:
أ- رسەر شین: سێپانێکە خورییەکەی هەموو سپییە، تەنیا لە کاتی ساواییدا دەموچاو و ملی شینە، کە گەورە بوو بە ئاستەم بۆرایی ملی دەمێنێت و دەموچاویشی مەیلە و رەش دادەگەڕێت: (کەوی).
ب- رسەر زەرد: خوری سپی و دەموچاو و مل زەرد.
٦- رەش: سێپانی خوری سەرتاپا رەش.
٧- زەرد: سێپانی خوری زەرد.
٨- سوور: سێپانی خوری سوور.
٩- سەر بە پۆرد: سێپانێکە خوری تەپڵی سەری وەک کڵاو بەرز بووەتەوە.
١٠- قولە: سێپانی خوری سپی و دەموچاو سوور ئەمە سێ جۆرە:
أ- قولە تارە: سوورەکەی تۆخ بێت.
ب- قولە سیسە: سوورەکەی (ئاچوغ = سپی واژی) بێت. یان قولە زەردی ناوە.
ج- قولە مس: جگە لە سووری دەموچاوی خەتی رەش یا زەردی هەبێت.
ئەمەش دوو تەرحە:
أ- قولە مس تارە.
ب- قولە مس سیسە.
١١- کەویسار: سێپانی رەنگ شین و سپی تێکەڵاو.

* * *

سێپانی کوردی لە دەشتی هەولێر لەو رەنگانەی سەرەوە بەدەرنین، کەچی هەندێ ناوی دی هەن بەهۆی چەشنی گوێوە خۆیان وەگەڵ ئەو ناوانەی سەرەوە دەدەن:
١- ئەگەر گوێی پان و گەورە بوو (حەمدانی)، پێدەگوترێت بۆ وێنە:
أ- تە رووممەت زەردی حەمدانی.
ب- رسەر رووممەت شینی حەمدانی.
ج- قولە تارەی حەمدانی.
٢- ئەگەر گوێی ئاسایی بوو: (رەشۆکی) ناوە، بۆ وێنە:
أ- کەویساری رەشۆکی.
ب- سەر... رەشی رەشۆکی.
ج- قولە سیسەی رەشۆکی.
٣- ئەگەر گوێی بە ئەندازەی پەنجەیەک بوو: (کوریس)ی ناوە، بۆ وێنە:
أ- سەر بە پۆردی کوریس.
ب- قولە مسی کوریس.
ج- تە رووممەت رەشی کوریس.
٤- ئەگەر گوێی بە ئەندازەی سەر پەنجەیەک بوو ناوی (کەڕە)یە، بۆ وێنە:

أ- تە رووممەت سپی کەڕە.
ب. رســەر.. رووممــەت شــینی کەڕە.
ج- کەویسار کەوەسێر کەڕە.

***

ئەو ســیــپانانەی باس کــران هەمووویان لای خاودن مەڕی دەشتی هەولێر بۆ راگرتن و هێشتنەوە پەسند نین، هەندێکیـــــان لەبەر ئەوەی خورییەکانیان تەواو سپی نییە و قیمەت باش ناکات. وەک غوونە:

١- سەر... رەش.
٢- بەڵەک.
٣- کەویسار. کەوەسێر
٤- زەرد

هەندێکیشیان بەرگەی سورناتک خواردن ناگرن. وەک:

١- تەبەش.
٢- تە رووممەت سپی.
٣- بازی.
٤- قوله سیسه.

کــەرینیش، واتە ســیــپـانی (قۆچدار) لەبەر قۆچەکە، کە دوو زەرەری هەیە، راگرتنی پەسند نییە:

١- بەرخی کــەرین بەهۆی شــوێنی قۆچەکەیەوە، کەوا نەختێک بەرزە، لە کـــاتی (زانا) = لە (دایک بوون) ئازار بە (زێ)ی دایکەکە دەگەیەنێت.
٢- لە کاتی ئالیک خواردندا، یان لە شەڕە قۆچانێدا ئازاری هاوڕێکانی خۆی دەدات.

***

**پەسندترین سیپان بۆ راگرتن لە دەشتی هەولێر ئەمانەن:**

١- تە رووممەت رەش.
٢- تە رووممەت شین.
٣- رسەر شین.
٤- قوله تارە.

باشترین رەسەنە سیپانی کوردی لە دەشتی هەولێر، سیپانی (حاجی سادق)ی گوندی (خەزنە)یە.

***

**بەرخە نێر بۆ بەران رابگیرێت، پێویستە ئەم مەرجانەی لێ بێتە جێ:**

١- پاشەڵ بەرین بێت.
٢- کاپێلک ئەستوور و راست.
٣- دونگ- دوگ شۆڕ و رێک.
٤- کلێنجەی راست بێت نەک خوار.
٥- سینگ بەرز.
٦- بە ناو زگ بێت، واتە ورگی گەورە بێت.
٧- کەلەش درێژ.
٨- لمۆز مەڕانی نەبێت، واتە کەوانی بێت، نەک راست.
٩- خوری زۆر و تیسک درێژ.
١٠- رەســــەنی دایک و باوکی بزانرێت.
١١- (ددو)= (ددم) ســە نەبێت، واتە لچی رێک بێت.
١٢- یەکــێک بێت لەو جــۆرە سیپانەی، کە بۆ راگرتن پەسندە.

دووەم: هەرچی لە "بزن" دەبێت نێر و مێ، گەورە و گچکە رەشانی ناوە، بزنیش ئەو رەشانە مێیەیە، کە پێی نابێتە دوو ساڵ و نیو کارێکی بەرێ کردبێت، رەشان بەگشتی سێ جۆرە:

١- رەشانی موو.
٢- رەشانی مەرەز.
٣- رەشانی دورە: (ئەمەیان نە مووی تەواوە و نە مەرەزیشە). دەشتی هەولێر گەرمیانە و رەشانی



مــەرەز و دورەی لێ هەڵناکــەوێت. خۆشم لەم دوو جۆرەی دوایی تەواو ئاگادار نیم. بۆیە هەر باسی رەشانی موو دەکەم. رەشانی موو لە دەشتی هەولێر دوو تەرزە:

١- شامی (حەمدانی). ئەم جۆرە رەشانە کەلەش گەورە و درێژ و باڵا بەرز و کاپێلک ئەستوور و لمۆزی وەک بەران کەوانییە. هەندێکیان گوێیان ئەوەندە گەورەیە، لەکاتی لەوەڕاندا دوو سێ پەنجە لە زەوی دەخشێت، گوان گەورە و زۆر بە شیرە.

٢- ئەوەی لە شامی بەدەرە پێیدەگوترێت رەشۆکی.



***

**ناوی رەشان بە گوێرەی رەنگەکان:**

١- بازی: رەشانێکە پەڵەکانی سپی بێت، یان دوو رەنگ.

٢- بەڵەک: رەشانی موو رەش و سپی تێکەڵاو یان سپی لەگەڵ سوور و زەرد.

٣- پۆش: رەشانی موو رەش و سپی تێکەڵاو (ماش و برنج)، یان هەر تەنیا گوێیەکانی وابێت.

٤- رەش: رەشانی سەرتاپا رەش.

٥- سپی: رەشانی موو سپی.

٦- سوور: رەشانی موو سوور.

٧- سەر - رەش کوور: رەشانێکە هەموو لەشی سپییە سەروچاو و ملی رەشە.

٨- شین: رەشانی موو شین.

٩- غەڕ: رەشانێکە نیوچەوانی هەندی ناو لەپێک سپی بێت. لەش رەش.

١٠- قەش: بەو رەشانە دەگوترێت نیوچەوانی هەموو سپی بێت و ئەوی دی رەش.

١١- کار: رەشانێکە دەموچاو سوور، یان زەرد بێت، یاخود تەنیا گوێیەکانی وابێت، لەش رەش.

١٢- کەژ: رەشانی سپی و شینی تێکەڵاو.

١٣- مجاخ: رەشانی بناگوێ سوور، یان زەرد.

١٤- مس = هەمس: ئەو رەشانەیە دەموچاوی خەتی سوور یا زەرد لەش رەش.

هەریەک لەو ناوانەی سەردوە، ئەو ناوانەشی رەگەڵ دەکەوێت.

١- ئەگەر گوێ گەورە و یان پان بێت (گۆردی) بۆ وێنە:

أ- گۆردی رەش.

ب- گۆردی مجاخ.

ج- گۆردی پۆش.

٢- ئەگەر گوێ لوول بێت (بەل)ی پێدەڵێن، بۆ وێنە:

أ- بەلە مس.

ب- بەلە کەژ.

ج- بەلە کار.

٣- گوێ (کولە) = (کورت) بێت (قوتە)، بۆ وێنە:

أ- قوتە غەڕ.

ب- قوتە بەڵەک.

ج- قوتە سەر.. رەش کوور.

گوتمان ناوی سیپان بە گوێرەی رەنگ (١٩) نۆزدەن و ئەمانەن: (بازی، بەڵەک، روومەت شین، تە روومەت شین، تە روومەت زەرد، تە روومەت سپی، تە بەش، رسەر زەرد، رەش، سوور، زەرد، سەر بە پۆرت، سەر... رەش، قولە تارە، قولە سیسە، قولە مس تارە، قولە مس سیسە، کەویسار). هەریەکەیان بە گوێرەی چەشنی گوێ دەبێتە ئەم پێنج

جۆرە:

١- حەمدانی.
٢- رەشۆکی.
٣- بەل.
٤- کوڕیس.
٥- کەڕە.

واتە (١٩ × ٥ = ٩٥). ئەگەر هەموویان بێ (قۆچ) بن، ئەگەر کەرین بن، هێندەی دی زیاد دەکات. واتە (٩٥ + ٩٥ = ١٩٠) سەت و نۆهەت ناوی سپیان.

* * *

گوتمان: رەشان بە گوێرەی رەنگ (١٤) چواردەن. ئەمانەن: (بازی، بەڵەک، پۆش، رەش، سپی، سوور، سەر رەش کوور، شین، غەر، کار، کەژ، مجاخ، مس). هەریەک لەم چواردە ناوە بە گوێرەی گوێ دەبێتە:

١- گۆردی.
٢- بەل.
٣- قوتە.

واتە (١٤ × ٣ = ٤٢) رەشانی شاخدار + (٤٢)ی رەشانی کوڕیس = (٨٤) ژمارەی رەشان، ژمارەی سپیان (١٩٠ + ٨٤ رەشان = ٢٧٤) ژمارەی ناوی رەشان و سپیانی دەشتی هەولێر. زۆر ناوی دیکەی سپیان و رەشانی هەیە من پەیم پێ نەبردووە.

**بڕوانە خشتەی ناوی رەشان و سپیان بە گوێرەی تەمەنەوە، لە دەشتی هەولێر**

**تێبینی (١):**

١- بەران لە چوار ساڵ و نیو دوو قەیرەی ناوە و لە سێ قەیرەیدا پیر دەبێت و بە (سەرە بەران) ناو دەبرێت.
٢- تەگە لە چوار ساڵ و نیو دوو قەیرەیە و لە سێ قەیرەییدا بە (سەرە) ناو دەبرێت.
٣- مەڕ: هەر بە بەرخ ناو دەبرێت چوار بەرخی و پێنج بەرخی.
٤- بزنیش: بە کار ناو دەبرێت چوار کاری و پێنج کاری.
٥- وادەبێت (تەگە) دەخەسێنرێت، ئەوسا دەبێتە نێری و لە بەرایی مێگەل دەڕوات، بۆ جوانی زەنگوڵی بە مل وەدەکرێت.
٦- لەناو سپیاندا رەنگ پێش گوێ دەکەوێت، بۆ وێنە: (مەڕە قولە حەمدانی، کەویسار بەل، تە کوڕیس).
٧- لە ناو رەشاندا بە پێچەوانە بۆ وێنە: (بزنە قوتە مس، گۆردی پۆش، بەلە کار).

**تێبینی (٢):**

ئەم بەرهەمەم لە گۆڤاری رۆشنبیری ژمارە (١٠٩) ساڵی ١٩٨٦ بلاوکردۆتەوە، بەلام زۆر ناتەواو و بێ سەروبەر، بۆ ئەمجارە هەندێکی دیکەم لێ زێدە کردووە و بە پێویستم زانی گەنجانی ئەمڕۆ بیخوێننەوە.

*** ئەم بابەتە لە گۆڤاری (ناسۆی فۆلکلۆر) ژمارە (٢٠)ی ساڵی ٢٠٠٦ وەرگیراوە.**

**خشتەی ناوی رەشان و سپیان بە گوێرەی تەمەنەوە، لە دەشتی هەولێر**

| جۆری رەشان و سپیان | لە رۆژی لە دایک بوونی تاکو تەمەنی ٦ مانگی | لە تەمەنی ٦ مانگی تاکو تەمەنی ساڵ و نیو | لە تەمەنی ساڵ و نیو تاکو تەمەنی دوو ساڵ و نیو | لە تەمەنی دوو ساڵ و نیو تاکو تەمەنی سێ ساڵ و نیو | لە تەمەنی سێ ساڵ و نیو تا چوار ساڵ و نیو |
|---|---|---|---|---|---|
| سپیان – نێر | بەرخ | کاوڕ | شەک | بەرانی خرت | بەرانی یەک قەیرە |
| سپیان – مێ | بەرخ | کاوڕ | بەردیل | مەڕە بەربوارد | مەڕی سێ بەرخی |
| رەشان – نێر | کار | گیسک | کوور | تەگەی خرت | تەگەی یەک قەیرە |
| رەشان – مێ | کار | گیسک | چوشتیر - چتیر | بزنە بەربوارد | بزنی سێ کاری |

# قاورمەی هەولێرییان

هوشیار عەبدوڵڵا

جاران لەناو شاری ئەو"پیرە هەولێر"ەی، زۆربەی هەرەزۆری دانیشتووانەکەی وەکو خوو و عادەتێک لەئاخرو ئۆخری هاوینان و سەرەتای پایزان هەر ماڵێک حەیوانێک یا دووانی دەکڕی، لەماڵەوە دایاندەبەستان و دەیانکردنە دابەستی، پەلکە شفتی و گندۆرەیان دەدانێ، ناوە ناوە پاک و جوان لە"ئاوی میری - جۆگەی میری"دەیانشووشتن، پاشان کە پرۆژەی ئاوی بەلووعە لەشار دامەزرا، هەرکەسەو لەماڵی خۆی دەیشووشتن، قیسکی خورییەکەی وەکو بەفری لێدەهات، ئێ خۆ حەیوانیش بە شووشتنێ قەڵەو دەبی؟! لێدەگەڕان تا باش قەڵەو دەبوون و دوونگیان دەکرد، کە پایز کۆتایی دەهات و دنیا کەمەک سارد دەبوو، زستان دادەهات، بارانێک یا دوو باران دەباری، ئەوە هەڵدەستان دابەستییەکەیان سەردەبڕی و دەیانکوشتەوە. لێرەدا چەند"پەندێک"لەناو شاری هەولێر و دەڤەری دزەییاتی دەشتی هەولێرێکەدا سەری هەڵداوەو هەیە. دەربارەی"دابەستی"دەڵێن:

١- دەڵێی دابەستییە!
٢- بوویتە دابەستی!
٣- دەمنی دابەستییە!
٤- خۆ دابەستی نی؟!

لەپاش کوشتنەوەی دابەستییەکە ئێسکەکەیان لەگۆشتەکەی جیا دەکردەوە، ئینجا گۆشتەکەیان لەناو دۆنی خۆی جوان سوور دەکردەوە، پاشان پاک و تەمیز لەناو گۆسکەیان دەکرد، ئینجا دەرکی گۆسکەکەیان بە پارچە قوماشێکی سپی دەبەستاو پاشان قوڕیان لەدەوری پەڕۆکەکەی هەڵدەسووی، بۆئەوەی هەوای وەرنەگری و گۆشتەکە تێک نەچێ.

وەختێ دنیا کەمێک سارد دەبوو، زستان دادەهات، ئەوە ناوە ناوە"مراک - کەوچک"ێک یان دوو مراکیان لێدەردەهێنا لەگەڵ هێلکەیان دەشەتاند یا بەچێشتی دیکەیان لێدەنا کە ئارەزوویان لەسەر بووایە، بەمەیان دەگوت:"قاورمە" ئەوەی دەماوە لەگۆشتی پەراسوو و تەراف و هیدیکە ئەوە هەربەخاوی خوێیان پێدادەکرد، لەسەر یەکیان دادەنا، لەسەر شێوەی گۆشتی گەسی ئێستاکە، بەڵام پێش سوورکردنەوەی، ئینجا لەناو گۆسکەی دیکەیان دەکردو دەیان پەستا، ئەمەیان بۆ چێشتی کفتەو ترش و ساوار بەگۆشتی بەکاردەهێنا، بەمەیان دەگوت:"باسمە". بۆیە کە کاتی قاورمەو باسمەکردن دادەهات و تا زستان دەچوو، ئەوە بازاڕی قەسابان نەدەما، کەس پێویستی بەوان نەدەبوو، کاردکەیان بەتەواوی کز دەبوو، چونکە هەرکەسەو لەماڵەوە گۆشتی خۆی هەبوو، جا لێرەدا دەیانگوت:"چەقۆی قەسابان شکا"دەربارەی گۆشتی قاورمەش دەیانگوت:

١- دەڵێی قاورمەی خواردییە!
٢- دەمنی گۆشتی قاورمەیە!
٣-خۆ قاورمەت نەخواردییە؟!
٤- بوویتە قاورمە!



# خانووی کۆیسنجەق ئولا

تاهیر ئەحمەد حەوێزی

لە زەمانی (برایم بەگ) قایمقامی عوسمانی لە ئەستەنبۆلەوە، قرۆکی خانوودکە هات، لەسەر ئەم قرۆکەیە دوو (بینا) بۆ قوتابخانە دروست کران، یەک لە بەغدا، لە زەمانی (عێراق) ناویان لێنا (مأمونیە)ی کوڕان، یەکێکیش لە کۆیە دروست کرا، لە زەمانی (عێراق) ناویان لێنا (کۆیسنجق ئولا) دوو وەستای کەرکووکی، لەگەڵ وەستا (شاکر) ئیشیان تێدا کرد.

شوێنەکەی لە گەڕەکی بەفریقەندییان بوو، بە کەونە خان دەناسرا، لە پێشان بە (خانی گەورە) یا (خانی عیسا ئاغا) دەناسرا، کە خانی (مەحموود ئاغا) دروست کرا، ئەمەیان پەکی کەوت، دوایی کاوڵ بوو، هەندێ ژووری بە گونبەتی مابوو، هۆدەکەی نوێلکە بوو، غەریبە و فەقیر دەچوونە ناوی.

لە زەمانی سوڵتان (ڕەشاد)ی لە وەختی دروونان لە ساڵی (١٩١٣)، کەونە خانیان رووخاند و دەستیان بە بناغە لێدانی کرد، لە پایزێ تەواوکرا دەبوایە پارە لە ئەستەنبولەوە بێ، بۆ ئەوەی ئیشەکە رانەوەستێ قائیمقام لیژنەیەکی پێکهێنا، مەلای گەورە کە موفتی بوو، کردییە رەئیسی لیژنەکە، پارەیان بە (تبرع) لە ئەهالی کۆکردەوە، پارەکەی خۆی بەشی نەکرد.

(حاجی کەریم)ی (حاجی عەلی) منداڵ بووە شەو فانووسی لەپێش باوکی هەڵدەگرت و دەچوونە دیوەخانی مەلای گەورە و هەموو جارێ دەستی ماچ کردووە، بە باوکی حاجی کەریمی گوتووە: " لەلایەن تەبەروعات، دوو مەجیدیم لەبۆ داناوی" رووی لە مەجلسەکەی کردووە و لە بابەت تەبەروعاتەکە، فەرموویەتی: "بیدەن، بیدەن." لە بابەت فائیدەی قوتابخانەکەش فەرموویەتی: "لەپاش (٣٠) ساڵی دی، هەمووتان دوعام بۆ دەکەن" کووردی گێچیان لە حەوشەکەی دانا.

(عەزیز ئاغای عەولا ئاغا) لەسەر بینایەکە کرابووە (مبصر)، بەرد و گێچی دەنووسی، بینایەکە دوو نهۆم بوو، نهۆمی بنەوە گونبەت و نهۆمی سەرەوە دارەڕێ و قامیشبەند و سەرەکەی سواغ کرابوو، بە سواندە و بێ ستارە بوو حەوشێکی گەورەی لەپێشەوە بوو، قولەتێنێکی تێدا بوو، لە پشتەوەش باغچەیەکی هەبوو، حەوشە و ئاودەستخانەی بەلاوە بوو، سێ کووپەی دیانانی گەورەشی هەبوو، دیواری زۆر ئەستوور بوو، ژوورێکی درێژی لە نهۆمی بنەوە (محراب)ی تێدابوو، نوێژی بە جەماعەت لێ دەکرا.

لە ساڵی ١٩٥٧ بەشی پێشەوەی بەبەر جادەی کەوت، بەداخەوە هەموو خانوودکەیان تێکدا، لە جێگاکەیدا بەناوی (کتێبخانەی سەلاحەدینی گشتی) خانووی دیکەیان لێ دروست کرد.

*** ئەم بابەتە لە کتێبی (مێژووی کۆیە)ی تاهیر ئەحمەد حەوێزی، بەرگی دووەم، چاپی یەکەم، ١٩٨٤ وەرگیراوە.**

# مزگەوتەکانی کۆیە (۱)

تاهیر ئەحمەد حەوێزی

**١. مزگەوتی بایزاغا:**

ئەم مزگەوتە لە گەڕەکی بایزاغایە، ئەم پیاوە دروستی کردووە، لەبەر ناوداری گەڕەکی کۆیە، بەناوی ئەم پیاوە ناونراوە، باپیرە گەورەی عەبدولرەزاق ئاغا، لە ساڵی ١٠١٥ک دروستی کردووە، بە قوڕ دروستی کردووە و دوو سێ خانووشی بۆ کڕیوە، یەکێک بۆ ماڵی ئیمام و مودەریس، خانووەکەی تریشی لەبەر بێ واریداتی بە کرێی داوە، تا بیکەنە مەسرەفی موم و دار و شتی تر بۆ مزگەوتەکە.

لە ساڵانی ١٢٠٠ک مەلا محەممەدی مەلا ئیسماعیلی قازی شەرعیەی لەسەر دانیشتووە، مودەریس و ئیمامی بووە، لەدوای وەفاتی ئەم، ئەوجا مەلا عەباس خەڵکی پشدەر لە جێگای دانیشتووە، مودەتی ٤٠ ساڵ لەسەر ئەم مزگەوتە بووە، لەدوای وەفاتی مەلا عەباس، مەلا سەعیدی هیرانی بۆ مودەتێکی کەم، لەداوی وەفاتی مەلا سەعید، مەلا شێخ تەیب حەفیدی مەلا محەممەدی مەلا ئیسماعیل - کە ئیجازەی لە مەلا قادری بیارە وەرگرتبوو، دانیشت، کتێبێکی لەسەر حەدیسی سەحیح داناوە و ٤٠ ساڵ دەوامی کردووە، پاش وەفاتی ئەویش مەلا عەبدوڵڵای نازەنینی بۆ مودەی ١٠ ساڵ لەسەر مزگەوتەکە دانیشتووە، لەدوای وەفاتی ناوبراو مەلا بەهائەدین کوڕی شێخ مەلا تەیب دانیشتووە. ئیجازەی لە باوکی وەرگرتووە، بە ئیرادەی شێخ ئەلئیسلام بووەتە مودەریسی رەسمی، مودەی ٤٥ ساڵ تەدریس و ئیمامەتی کردووە، لەدوای وەفاتی مەلا محەممەدی کوڕی لە جێگای دانیشتووە، و مەلا تەیب لەدوای تەقاعدی باوکی دانیشتووە.

لە ساڵی ١٩٨٥ک حاجی حوسێنی مام قادر، تەعمیری کردەوە و کردووە گێچ، عیبارەتە لە حەرەمی مزگەوت، حوجرەی ئیمام و مودەریس و حەوش و حەوزی ئاوی خۆش، کە بە حەوزەکەی دەڵێن (قەسر). لە دەرگای حەرەمی مزگەوت بە فارسی لەسەر مەرمەڕ نووسراوە:

**طرازندەی جامع بی مثال**
**به قادر علم بود فرخنده فال**
**زو ایجاد ان پیشی ان نامدار**
**برضوانی جنت نمود ارتحال**
**شد ا بانی ثانی حاجی حسین**
**چو همت بلندمست و نیکو خسال**
**دنانیر و درهم بسی صرف کرد**
**به تعمیر تره حشر نمود اشتغال**
**خرد گفت تاریخش ین بی نظیر**
**(مکان معلا چه جنت مثال) ١٢٨٥هـ**

نالی لە مزگەوتی بایزاغا بووە، پێشان مەلای مزگەوتەکە تەقیەی کردووە، دەرسی پێبلێ، چونکە گوتبووی: «لە شیعردا هاوتای نییە، ئەگەر عیلمیشی وابێ ناتوانم دەرسی پێبلێم»، ئەما کە دەرسی پێدەڵێ، مەلایە کۆییەکە لەو باڵاتر دەبێ.

**٢. مزگەوتی منارە:**

ئەم مزگەوتە لە ساڵی ١٠٥٤ک بیناکراوە، بەڵام نازاندرێ کێ دروستی کردووە، دەڵێن (شار هەر تا ئەوێ بووە، بە مزگەوتی (بنار)انیش ناوی هاتووە، کە کەوتبووە بناری شاری).

لە ساڵی ١١٨٣ک لە تەرەف زەبیحوڵڵا ناوێک تەعمیر کراوە، کەوتۆتە گەڕەکی قەڵات، وەختی خۆی نەوەی دایە خەجێیی لێرە مەلا بوون، بۆیەش پێی دەڵێن (مزگەوتی منارە، چونکە ئێستا لە مزگەوتەکانی کۆیە هەر ئەو منارەی هەیە، پێکهاتووە لە حەرەمی مزگەوت و هەیوانێکی خۆش و حەوز و حەوش، حوجرەی مودەریس هەیوان و حەدیقەی هەیە.

ئەم مەلایانە تەدریس و ئیمامەتیان لەم مزگەوتە كردووە: مەلا ئەبوبەكر، مەلا حەسەن[2] مەلا سالح كە نەوەی باپیر فەقێ ئەحمەدی دایە خەجێن، و پاشی ئەوانە مەلا عەلی (باداوەیی) - كە گوندێكە لە رۆژهەلاتی كۆیە، لە دیوی خەلەكان - بە ئیمتحان لەم مزگەوتە دانیشتووە، ئیجازەی لە مەلا محەمەد ئەفەندی جەلیزادە وەرگرتووە، مودەتێك وەكیلی قازی شەرعیە بووە لە گوندی كانی وەتمان، مودەتێك ئیمام و مودەریس بووە لە مزگەوتی (خادم السجادة) لە كۆیە و پاش وەفاتی مەلا عەلی لە سالی ١٩٤٣ مەلا محەمەدی كوری لەجێی دانیشت، كە علومەكانی لە خزمەت مەلا شێخ تەهای بالیسانی و شێخ مەلا تەهای (شەقلاوەیی) و لە خزمەت گەورەترین عولەمای كوردستان مەلا محەمەد ئەفەندی جەلیزادە تەواو كردووە و ئیجازەی وەرگرتووە، لە زەمانی باوكی دەورەیەك لە بەغدا كراوە، بووە موعەلیم لە لیوای سلێمانی لە مەكتەبی فەیسەلیە و خالیدیە، پاشان نەقلی قەلادزە بوو، كە باوكی وەفاتی كرد، ئیستقالەی كرد لە موعەلیمایەتی و دەستی بە تەدریس و ئیمامەتی كرد، ئێستاكە ئەندامی (عضو)ی مەجلیسی ئیمتحانی مەلایانە لە كۆیە، مەعاشی ١٥ دینار و نیوە لە دائیرەی ئەوقافی كۆیە.

لەسەر دەرگەی حەرەمی مزگەوتەكە لەسەر بەردی بە خەتی كوفی ئەم نووسراوە هەلقەندراوە، (بسم الله الرحمن الرحيم)، كە لەسەر شكلی تەیرێكە، وەستا مستەفای قایەچی گێچی بۆ منارەكە تەبەروع كردووە.

نبیع الله ز فرط صدق همت
چ طبعش تامی خیرات گردید
افكند تلغ تعمیرش سری نو
چ نادانیش برین وصف و تحیتها پسندید
اساس مسجدیرا كۆك جدش
بنایش ئەسپەیی طاعات بگوزید
خیرد تاریخ اورا یكی گفت
شدین دیرینه مسجد باز تجدید

ئیمامی ئێستاكەی ١٩٨٣ (مەلا شەفیع ئەحمەد كامل)ە.

**٣. مزگەوتی مەلا جامی:**

دەكەوێتە گەرەكی بایزاغا، لە سالی ١١٧٢ك دروست كراوە، نەوەی باپیر فەقێ ئەحمەد لەسەر ئەم مزگەوتەش ئیمام و مودەریس بوون، وەختێك فەقێ حوسێن كوری مەلا مستەفا ئیمام بووە، لە سالی ١٣٣٠هـ حاجی ئیسماعیل حاجی باپیر تازەی كردۆتەوە.

لەدوای فەقێ حوسێن، مەلا مەحموودی كوری لێی دانیشتووە، لەدوای ئەم مەلا جامی لێی دانیشتووە، كە مزگەوتەكە بەناوی ئەم هەلدەدرێ، لەدوای ئەم مەلا ئەحمەد ئەوجا مەلا سادقی كوری مەلا ئەحمەد دانیشتووە، ئیجازەی لە خزمەت مەلا محەمەد ئەفەندی جەلیزادە وەرگرتووە، لەپێش سەفربەرلگ مودەریسی رەسمی بووە لە (رانیە)، ئیمتیحانی لە موسل داوە، لەجێی باوكی دانیشتووە بە سیفەتی تەدریس و ئیمامەت و عضوی مەجلیس عیلمی مەلایان و فەقێیان بووە لە كۆیە و لە هەولێر، لەدوای وەفاتی مەلا زاهیری كوری لەجێی دانیشت. ئەم شەخسە گەلێ رسالەی هەیە، هەندێكی چاپ نەكراون، و شیعری بە كوردی و بە فارسیش هەیە، عضوی مەجلیسی ئیمتیحانی فەقێیانە لە كۆیە.

ئەم مزگەوتە عیبارەتە لە حەرەمی مزگەوت و هەیوانێك، حەوش و حەوزێكی زۆر خۆشی هەیە لەگەل حوجرەیەكی مودەریس و حوجرەیەكی فەقێیان، لەسەر دەرگای حەرەمی مزگەوت نووسراوە (ادخلوها بسلام امنين)، لەدوای تەقاعودی حاجی مەلا زاهیر مەلا محەمەد ئەمین چوم هەیدەری ئیمامە.

**٤. مزگەوتی موفتی:**

لە گەرەكی بایزاغا هەلكەوتووە، لە سالی ١١٧٦ لە تەرەف مەلا یوسف زاهدەوە دروست كراوە، مودەتی ٤٠ سال لەسەر مزگەوتەكە بووە، پاش وەفاتی مەلا یوسف، مەلا محەمەدی كوری كە بە (ابن الزاهد) ناسراوە، ٦٠ سال لەسەر ئەم مزگەوتە دانیشتووە، پاش وەفاتی مەلا محەمەد لە سالی ١٢٨٠ك مەلا سالحی كوری لەجێی دانیشتووە، وە پێیان گوتووە (مەلا سالحی موفتی) چونكە موفتی كۆیە بووە، لە سالی ١٢٨٢ ئۆمەری بەكری، كە گۆرەكەی لەبەر هەیوانی مزگەوتەكەیە، تازەی كردۆتەوە، بەلام هەر بە مزگەوتی موفتی ناسرا، مەلا سالح لە سالی ١٩١٨ وەفاتی كرد، حاجی مەلا عەبدولحەمیدی كوری لەسەر خوێندن دەوامی كرد و ئیجازەی لە مەلا محەمەد

ئەفەندی جەلی وەرگرت، بووە مودەریسی مزگەوتەکە. حاجی مەلا ئیبراهیم کە خەڵکی گوندی زینویێی شێخی بوو، ئیمامی مزگەوتەکە بوو، حاجی مەلا برایم لە سەفەری دووەمی حیجاز نەهاتەوە مەلا عەبدولحەمید وەکالەت ئەویشی وەرگرت، کە وەختی خۆی تەدریس و ئیمامەتی مزگەوتەکە ئی باب و باپیرانی بوو.

ئەم مزگەوتە عیبارەتە لە حەرەمی مزگەوت، کە سەری گونبەتە، هەیوانێک و ٣ حوجرە و حەوش و حەوزێکی خۆش، لەسەر دەرگای حەرەم بە فارسی ئەم شیعرانە نوسراوە:

**تاک شد از همت و احسان بنا ان مسجد فیضی ز عمر**
**گشت جای صالح و تدریس تقدیس هنر**
**روز شب أز بهری طاعات خداوند احد**
**صف به صف دەوری ملک با جن و اشراف بشر**
**سال تاریخش چو می پرسد فدا میگویدت**
**از هزار و دو صد هشتاد و دو پس شهر**

کە شاعیرەکە ناوی فیدا بووە، لە ساڵی ١٩٨١ مەلا کەمال محەممەد قادر ئیمامە و ئێستا مەلا خدر محەممەد حوسێن ئیمامە.

**٥. مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەد:**

ئەم مزگەوتە لە گەڕەکی بایزاغایە، وەخی خۆی بنەماڵەی مەلا عەبدوڵڵای گەلی گولانی لەسەر بووە، عەبدولرەحمان پاشای بابان لە ساڵی ١٢١١ بۆ مەلا عەبدولرەحمانی کاکی جەلی تەعمیر کردۆتەوە. لە زەمانی حاجی مەلا ئەسعەد، مزگەوتەکە هەر لە دەرەوەی شوورەی شاری بووە، لە دەرەوەی شوورە تا نزیک خانووی شێخ کەریم کۆیی بەرزنجی هەتا نزیک رووبار، ئەو عاردانە خانوو بوون، ٨٠ ماڵ هەر راتبەی فەقێیانیان داوە و لە (طارش)ەوە هاتوون لە مزگەوتی جەلیانیان خوێندووە.

لەبەر ئەوەی جەلیزادە ئەم مزگەوتە و مزگەوتی (گەورە)شیان لەبەر دەست بووە، بە مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەدیان گوتووە (مزگەوتی خواریێ) و بە مزگەوتی گەورەشیان گوتووە (مزگەوتی سەریێ).

جێگایەکی خۆشی هەیە، بە دیار چیای چنارۆک، بەسەر روبار و رەزەکانی کۆیەدا دەنۆڕێ، ژورێکی تێدا هەیە کە مەلا عەبدولرەحمانی جەلی لێی دانیشتووە و دەرسی تێدا گوتۆتەوە و کتێبخانەشی بووە، جێی نوێژی مزگەوتەکە هەیکەلی زەمانی عەبدولرەحمان پاشایە و ماوەتەوە، پێنج هۆدەی تێدا هەیە بۆ فەقێیان.

لەدوای مەلا عەبدولرەحمان حاجی مەلا عەبدوڵڵای کوڕی، لەدوای ئەو، حاجی مەلا ئەسعەد کوڕی لەجێی دانیشت، مەلایەکی زۆر گەورە بوو، حاجی بەکر ئاغای حەویزی بە فەقێیەتی فاتمەی خوشکی دەداتێ[٣] و دەینێرێتە بەغدا، لەوێ ئیجازەیەک و لە شامیش ئیجازەیەکی تر دێنێتەوە، لە هەردوو مزگەوتان دەبێتە مودەریس، لەدوای مەلا مەحموودی موفتی دەبێتە خەتیبی مزگەوتی گەورە بوو و لەدوای وەفاتی حاجی عەبدوڵڵا لە ساڵی (١٩٠٩) مەلا محەممەد ئەفەندی لە (مکە)ی پیرۆز، حاجی مەلا عەبدوڵڵای کوڕی لەجێی دانیشت، کە مەلای گەورە بوو، لەدوای وەفاتی حاجی عەبدوڵڵا لە ساڵی (١٩٠٩) مەلا محەممەد ئەفەندی کوڕی، لە هەردوو مزگەوتان دانیشت، بە مەلای گەورە، ناوی بە هەموو کوردستاندا بڵاوبۆوە، لەدوای وەفاتی مەلای گەورە لە ساڵی ١٩٤٣، شێخ نورەدین ئەفەندی برای بووە ئیمام و مودەریسی مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەد و مودەریس و خەتیبی مزگەوتی گەورە و رەئیسی مەجلیسی عیلمی، کە لە ساڵی ١٩٥٢ وەفاتی کرد، ئێستا حاجی مەلا ئەنوەر کوڕی مەلا شێخ محەممەد ئەمین شیواشانی ئیمامیەتی.

**٦. مزگەوتی کۆنە جومعە:**

لە گەڕەکی (هەواو)دا، مزگەوتێکی زۆر کۆنە لە مزگەوتەکانی کۆیە، هیچیان هەندەی ئەم مزگەوتە کۆن نییە، دەڵێن: (ئەمەش وەکو مزگەوتی گەرمووک (دیرە) بووە و کراوە بە مزگەوت)، بە مزگەوتی (ابن العمر)یش ناسراوە، ساردارێک هەبووە هەتا کۆنە قەڵات چووە، بەردی زۆر گەورەی تێدابووە، دەڵێن (عەبدوڵڵای کوڕی ئیمامی عومەر کردیتییە مزگەوت، بە مزگەوتی (عبداللە عمران)یش ناسراوە، لەپێش دروستکردنی مزگەوتی گەورە، نوێژی جومعەی لێکراوە، کە مزگەوتی گەورە جومعە لە ساڵی ١٢٦٠ دروستکرا، جومعە لەم مزگەوتە تەرک کرا و ناوی بووە کۆنە جومعە، جێگای نوێژی کە (٥ - ٦) گونبەت بوون تەپک بوو، بووە کاول، جێگای ٥٠٠

نوێژکەر بووە، کارێزێکی سەربەخۆی هەبووە، مزگەوتێکی گەورە بووە، دوو دەرگەی هەبوو، زۆر جوان بیناکراوە، وەختی حاکمەکانی شار بە دەرگای ناو بازاڕ بەوێدا چوونە ناو مزگەوت بۆ نوێژی جومعە کردن، لەسەر دەرگای مزگەوتەکە جووتە شیعرێکی فارسی مابوو:

**خورشید ضیاء بخش جهان روی محمد**
**أی طالب فردوس برو سوی محمد**

لە ساڵی ١٢٧٠ک سلێمان ئاغا کوڕی محەمەد ئاغا، کە ئاغا و دەوڵەمەندی گەڕەکی هەواو دەبێ لە حەوشی مزگەوتەکە حەرەمی مزگەوت دروست دەکا، کە گونبەتێک بوو، هەتا ساڵی ١٩٧٧ مابوو، لەوساوە بە مزگەوتی سلێمان ئاغاش ناسرا، کە حاجی قادر سەراف لە ساڵی ١٩٧٨ دروستی کردەوە، گونبەتەکەیان تێکدا، جێگای نوێژی زۆر گەورەیە، شوێنی تەعزیە و دوو حوجرەشی هەیە، ئاو و دەراوی زۆر خۆشە، مزگەوتەکە هەر بە کۆنە جومعە ناسراوە.

وەختێکی مەلا پیرۆت کانی وەتمانی ئەوجا مەلا خدر هەورامی، لەدوای ئەم مەلا عوسمان کوڕی سلێمانی حەمەیتە ئیمامی بوون، لەدوای ئەم مەلا شەلە کە ناوی مەلا ئەحمەد و خەڵکی باڵەکان بوو، لەسەر لینگەکی ئیمامەتی دەکرد، وەختی خۆی لەسەر دار گوێزی بەربووبۆوە لاقەکی شکابوو، مەلا ساڵحی کوڕیشی لە مزگەوتی مەلا ئۆمەری مەولوود چاورەشی ئیمام بوو، ئەمجا مەلا عەبدولرەحیم ژێ بووە ئیمام، ئەمجا مەلا تەهای مەلا عەبدولرەحیم بووە ئیمام لەپاش وەفاتی مەلا تەهای لە ساڵی ١٩٤٥، مەلا عەلی برای مەلا تەهای بووە ئیمام، ئیجازەی لە شێخ نورەدین ئەفەندی وەرگرتووە، لە ساڵی ١٩٥٠ معاشەکەی ٥.١٥ دینار بوو، لەدوای وەفاتی مەلا عەلی مەلا رەئوف ئاغای سەلیم ئاغا بووە ئیمام، ئێستا کە ساڵی (١٩٨٢)ە مەلا عوسمان حەمەد ساڵح خدر چۆمەزەردەلەیی ئیمامە مەلا عەبدوڵڵا مەلا عەلی موئەزینیەتی.

**٧. مزگەوتی گەرمووک:**

دەکەوێتە گەڕەکی (بەفریقەندی)، نازاندرێ کێ دروستی کردووە، دەڵێن: (ئەمەش دێر بووە و کراوە بە مزگەوت) ماوەیەک رووخاوە و بە وێرانی تا کاتێکی زۆر دەمێنێتەوە، سەرلەنوێ بۆ مەلا شێخ ئەحمەد ناوێک، کە پیاوێکی بە دین و مەلایەکی چاک بووە، چاککراوەتەوە و دوای ئەو کوڕەکەی، کە ناوی مەلا عەبدوڵڵا بووە هاتۆتە سەری، لەپاش ئەو دیسان تێکدەچێتەوە، چەند ساڵ بە کاولی دەمێنێتەوە، لە پاشان سەرلەنوێ دروستی دەکەنەوە، مەلا عەبدولرەحیم ژێ دەبێتە مەلای، هەر لە کاتی ئەو کە جەنگی گەورەی یەکەم دەست پێدەکا هەم دیسان دەروخێتەوە، کە حکومەتی عێراق دادەندرێ لەو کاتەی جەمیل ئاغای حەوێزی قائیمقام دەبێ، لەگەڵ دائیرەی ئەوقاف مزگەوتەکەی تەعمیر دەکەنەوە مەلا محەمەد ئەمین کوڕی مەلا مستەفا عاسی لەسەری دادەنیشێ، مەلا مستەفا بە خۆڕایی ئیمامەتی دەکا و مەلا محەمەد ئەمینی کوڕی ئیجازەی لە خزمەت مەلای گەورە وەردەگرێ و لە گوندێکی دەرەوەی شار ئیمامەتی دەکا، بەڵام لە ساڵی ١٩٤٨ معاشی بۆ دەردەچێ و دەبێتە ئیمامی مزگەوتی گەرمووک، لەدوای وەفاتی ئەو مەلا مستەفای باوکی کە بە عاسی ناودار و شاعیرێکی بەرز بوو لەسەر مزگەوتەکە دانیشت، تەقاعودی بۆ منداڵی مەلا محەمەد ئەمین بڕایەوە، لەدوای وەفاتی مەلا مستەفا ئێستا مەلا موسڵح ساڵح محەمەد ئیمامی مزگەوتەکەیە.

مزگەوتەکە عیبارەتە لە حەرەمی مزگەوت و دوو هەیوان و دوو حوجرەی فەقێیان، خەلایەکانی ئەم مزگەوتەش، وەک ئاودەستەکانی مزگەوتی (کۆنە جومعە) لە دەرەوەی مزگەوتەکە بوو، بەڵام ئێستا ئی هەردووکیان لەناو مزگەوتەکەن.

بۆیەش پێی دەڵێن (مزگەوتی گەرمووک) وەختی خۆی لە حەوشی مزگەوتەکە ئاوێک هەبوو، کارێز بوو دەڕۆیشت، قولەتێنێکیان بۆ کردبوو، بە قادرمان بۆی دەچوونە خوار تانەبەردی لە دەوردبوو، سەری گیرابوو، خەڵک لەناوی تێ دەکەوت، زستانان هەوا لە دەرێ چەند ساردبا، ئەو ئاوە هێندە گەرم بوو، بەڵام لە ساڵی ١٩٧٩ دائیرەی ئەوقاف پڕی کردەوە، مەشروعی ئاوی هەیە، حاجی سمایل گەڕەکی بایزاغا لەپێش سەفەربەرلگی لە مەیدانی داران دوو بیری بۆ لێدابوو، سەری حەوزەکەی گرت و هۆدەکی لەسەرکرد، لە سەفەربەرلگی تێکچوو.

**٨. مزگەوتی قامیش:**

دەکەوێتە گەڕەکی قەڵات، لە ساڵی ١٢٢٦هـ حاجی مەلا شێخ ئەحمەد کوڕی مەلا شێخ ئەبوبەکر نەقشبەندی تەعمیری کردۆتەوە، مەلا شێخ ئەبوبەکر مەرقەدی لە مزگەوتی حەیدەرخانە لە بەغدا مەدفونە لە پێشان ناوی مزگەوتی شێخ مەلا ئەبوبەکر بووە، لە پاشان لەبەر ئەوەی قەمیشەلانێکی لێبووە، ناوی بوویتە مزگەوتی بە قامیشان یا مزگەوتی قامیشی، لە ساڵی ١٣٠٤ک حاجی مەحموود حاجی محەمەد ئەمین حاڵخۆشی گەڕەکەکە تەعمیری کردیتەوە و پارەیەکی زۆری لێ خەرج کردووە، لەدوای حاجی مەلا ئەحمەد، حاجی مەلا ساڵح ئەفەندی کە بە (خطیب) ناسراوە لەسەر مزگەوتەکە دادەنیشێ، ئیمام و مودەریس بووە، ئیجازەی لە جەنابی حاجی مەلا عەبدوڵلای جەلی وەرگرتووە، مودەتێکیش خەتیبی مزگەوتی گەورە بووە، بۆیە بە (خطیب)یش ناسراوە.

ماڵی باوکی حاجی مەلا ساڵح لە گەڕەکی بەفریقەندییان، کە ماڵیان دەبەنە خانووەکەی مزگەوتی قەمیش، خەڵک دەڵێن (چۆن لەوێ دەحەوێنەوە) چونکە جێگایەکە چۆڵ بووە.

ئەو بەردە مەرمەڕەی، کە تاریخی تەعمیری مزگەوتەکەی لەلایەن حاجی مەحموودەوە ساڵی ١٣٠٤ لەسەرە، حاجی مەلا ساڵح هەڵیقەندووە و شیعری خۆشیەتی:

**ایوان عتیق بیت موجود نوسازی بنای حاجی محمود**
**تاریخ ویش پرسید از لفظ خوش بیت موجود[٤]**

لەدوای وەفاتی حاجی مەلا ساڵح مەلا عەبدوڵلای کوڕی دانیشتووە، لەپاش وەفاتی ئەو مەلا سەدرەدینی برای لەسەری دانیشتووە و ئیمام و مودەریسە و معاشی لە دائیرەی ئەوقاف ١٨ دینار و نیوە.

مزگەوتەکە منارەیەکی هەبووە، هەتا سەفەربەرلگیش مابوو، بە گێچ و بەرد دروست کرابوو، کە حاجی محەمەد ئەمین ئەحمەد قەسر و تاتەکانی دروستکرد، منارەکەشی تێکداوە، لە ساڵی ١٩٨١ مەلا خالید رەسوولی خەڵکی (نۆغەران) ئیمامی بوو.

مزگەوت عیبارەتە لە حەرەمی مزگەوت و دوو هەیوان و حوجرەیەکی فەقێیان و حوجرەیەکی ئیمام و مودەریس، حەوش و باغچە و حەوز و مەغسەلێکی خۆشی هەیە.

**٩. مزگەوتی (خادم السجادە):**

لە گەڕەکی بەفریقەندی هەڵکەوتووە، عەبدولرەحمان پاشای بابان لە ساڵی ١٢٢٠هـ بۆ مەلا سەعدی ئەفەندی (خادم السجادة)ی دروستکرد، چونکە بەرماڵەکەی پێغەمبەریان لەلابوو، لەبەر ئەمە دەیەکی واریداتی دەشتی کۆیە و گوندی (مەلا زیاد)یان دەدرایە، ساڵی یەک دوو جار بەرماڵەکەیان دەردەینا و لە مزگەوتەکە نیشانیاندەدا، خەڵک دەهاتن پیرۆزیان دەکرد و دیاریان دەینا، لەپاش وەفاتی مەلا سەعدی مەلا محەمەد ئەفەندی کوڕی هاتە جێگای، مودەتێکی زۆر ماوە، کە وەفاتی کرد مەلا ئەمین ئەفەندی کوڕی هاتە جێگای، مەلا ئەمین ئەفەندی چووە ئەستانبوڵ، چونکە سوڵتان عەبدولحەمید دەعوای بەرماڵەکەی کردبوو، بەو ناوەی خۆی بە خەلیفەی ئیسلامان دانابوو، دەیویست هەموو شتی پێغەمبەر بباتە لای خۆی، بەرماڵەکەشی بردبووە لای خۆی، لەپاش تکایەکی زۆر سوڵتان بەرماڵەکەی دانەوە، بە مەرجێک بیبەنە کەرکوک، لەوێ مزگەوتی بۆ دروستکردن و بەرماڵەکەیان گواستەوە ئەوێ، بەو ناوەی کەرکووک لە کۆیە رێگای هاتووچۆی خۆشترە، لەدوای مەلا ئەمین ئەفەندی، مەلا عەبدوڵلای نازەنینی لە مزگەوتەکە دانیشت، لەدوای ئەم لەپێش سەفەربەرلگی مەلا سەدیق ئەفەندی کوڕی کە ئیجازەی لە مەلا محەمەد ئەفەندی جەلی وەرگرت دانیشت، لەدوای ئەم مەلا عەلی باداوەیی دانیشت، لەدوای ئەویش مەلا فەتحوڵلا کوڕی مەلا عەبدولکەریم خەڵکی گوندی مام رەش لە عەشیرەتی شوان دانیشت و مەعاشی لە ئەوقاف بۆ براوە، لەدوای تەقاعودبوونی مەلا فەتحوڵلا ئێستا کە ساڵی ١٩٨٢ حاجی مەلا مستەفا عەلی مستەفا ئیمامی مزگەوتەکەیە.

مزگەوتێکی خۆش و جوان و رێکە، هۆدەیەکی بۆ فەقێیان و جێگای ئیمامی هەیە حەوزی ئاوی خۆشە، لەپێشان کارێز بوو، ئێستا مەشروعی ئاوی هەیە.

**١٠. مزگەوتی گەورە:**

دەکەوێتە ناوەندی شار و لە گەڕەکی بەفریقەندی، لە ساڵی ١٢٦٠هـ حاجی مەلا بەکر ئاغای حەویزی دروسیکردووە، وەستای لە موسڵ و حەلەب بۆ هێناوە، ساڵێک تەنها مەرمەڕەکانیان بە ئەندازە بڕیوە، ساڵی تر

دروستیان کردووە، تەرزی دروستکردنی وەکوو مزگەوتی (کابە)یە، زۆر تەرزێکی شیرین و جوان و دڵگیرە، گەلێک لەو پیاوە گەورانەی کە هاتوونە کۆیە و دیویانە، دەڵێن: (ئەم جۆرە مزگەوتە لەسەر ئەم تەرزە لەو وڵاتانەی کە دیومانە، نەمان دیوە، بەس ئی (کابە)ی نەبێ).

ژووری مزگەوت گونبەتێکی زۆر زل و گەورەی هەیە، لە هەر دوو تەنیشتەکانی گونبەتە گەورەکە (١٢) گونبەتی بچوک هەیە، ژوری مزگەوت شەش سەد مەتر مورەبەعە، دە هۆدەی هەیە، یەک بۆ مودەریس و یەکیان بۆ ئیمام و هەشتیشیان بۆ فەقێیان، میحراب و مینبەرێکی زۆر فاخرە موزەخرەف لە دیوی حەرەرمی هەیە، لە هەیوانەکەش دوو میحراب هەیە، لەبەر قەڵەباڵغی دوو کەس ئیمامەتیان کردووە، سەروەختێکیش لەزەمانی عوسمانییەکان مەئموورەکان، کە بە زۆری حەنەفی بوون، بەجیا، خەڵکی شارەکەش (شافعی)ن بەجیا لە هەیوانەکە جەماعەتیان کردووە.

مەلا مەحمودی ئۆمەرگونبەتی - کە بە موفتی دەناسرا، یەکەم خەتیب و مودەریسی مزگەوتەکە بووە و سەرۆکی مەلایەکان و هاوچەرخی موفتی زەهاوی و خەزووی حاجی بەکر ئاغا بووە، ئەوسا حاجی مەلا ئەسعەد فەقێ بووە عوسامەدین ئیستعارەی خوێندووە، مەلا مەحموود لە عیلمی هەیئەت و فەلەکیات و ریازیات زۆر شارەزا بووە، هەتاوەکو دەڵێن: (لەسەر شووران تەماشای چیای سمایل بەگیان کردووە، زانیویەتی بڵندایەتی چەندە)، کە بەم دواییە پیوایان قسەکەی لەگەڵ قسەی مەساحەکان چ فەرقێکی وای نەبووە.

لەدوای وەفاتی مەلا مەحموود، حاجی مەلا ئەسعەد جەلیزادە بووە مودەریس و خەتیبی مزگەوتەکە، ئەو بنەماڵەیە پێویست بە ناساندن نین، چونکە ناوبانگی زانایان بە هەموو لایەکدا بڵاوبوویتەوە، لەدوای وەفاتی، حاجی مەلا عەبدوڵڵای کوڕی لەجێی دادەنیشێ، لەدوای وەفاتی ئەو، ئەوجا مەلا محەمەد ئەفەندی، کە ئەویش بە مەلای گەورە ناسرا، دانیشت، کە ئەویش لە ساڵی ١٩٤٣ دنیای بەجێهێشت، شێخ نورەدین ئەفەندی برای لە جێی دانیشت، لەپاش ئەویش بۆ چەند رۆژێک مەسعود ئەفەندی کوڕی مەلای گەورە دانیشت، باوەرنامەی زۆریان بە مەلایان داوە، لە ساڵی ١٩٥٢ مەلا مەعسوم ئەفەندی کوڕی مەلا خدری هەورامی بووە خەتیب و مودەریسی مزگەوتی گەورە، ئیمامی مزگەوتی حاجی مەلا عومەریش بوو، ئەندامی مەجلیسی عیلمی مەلایان بوو بۆ (تجنید) و ئەندامی مەجلیسی ئیمتیحانی فەقێیانیش بوو، لە ساڵی ١٩٥٧ معاشی لە ئەوقاف ٢٦ دینار و نیو بوو لەدوای وەفاتی ئەو شێخ محەمەد بالیسانی بووە خەتیب و مودەریس، کرا بە مودیری مەعهەدی ئیسلامی لە مزگەوتەکە، ئێستا کە ساڵی (١٩٨٢)و حاجی مەلا ساڵح عەسکەر خەتیب و ئیمامی مزگەوتەکەیە.

لە زەمانی ئەمین ئاغا، حاجی مەلا قادر بێتووشی بووە ئیمام، ئەوجا حاجی مەلا رەسوولی کوڕی مەلا قادر بووە ئیمام لەدوای وەفاتی حاجی مەلا نەجیبی کوڕی بووە ئیمام، لەدوای وەفاتی مەلا عەلی حاجی تۆفیق بووە ئیمام.

بانگدەر و خادمی مزگەوتەکە لەپێش سەفەربەرلگ مەلا رەسوول بوو، لەپاش گرانی مەلا حەبیب سوورقاوشانی بووە موئەزین و خادم، لەپاش ودفاتی مەلا سابیری کوڕی ماوەیەک بووە خادم ئەوجا مەلا عەبدولرەحمان ئەسعەد ماوەیەکی زۆر موئەزین و خادم بوو لەپاش وەفاتی وەستا عەبدولکەریمی حەمدی عەولاتیم بووە خادمی یەکەم و مەلا عەبدوڵڵا خەڵکی پێنجووین خادمی دووەم، محەمەد کوڕی مەلا شوکر کرا موئەزین....

هەموویان زۆر خزمەتی مزگەوتەکەیان کردووە.

لە ساڵی ١٩٧٩ دائیرەی ئەوقاف مەسرەفێکی زۆری لێکرد، بەشی ژووروو، رۆژهەڵات و رۆژئاوای دەوری حەوشەکەی لەبنەوە تێکدا و بە کۆنکریتی دروست کردەوە و دیمەنێکی تازە و جوانی وەرگرت و جێی زۆر نوێژکەران بۆوە، حەوشەکەی کردە شتایگەر ئاودەستەکانی کردە تازە و سیفۆن، حەرەم (٣) دەرگا و مزگەوتەکە دوو دەرگای گەورەی هەیە.

حاجی سەدیق حەمدی عەبدوڵڵا قولەی لە ساڵی ١٣٨٤ک - ١٩٦٤ز لەسەر حەوزی ئاوەکە سەرێکی بە کۆنکریتی بۆ کرد، لە ساڵی ١٩٦٦ حاجی قادر ئاغا ئەفەندی ئاغا تەها سەکۆی حەوشەکەی کردە کاشی، کە لەپاش ئەم تەعمیراتە سەکۆیەکە هەڵگیرا.

مەلا رەسوول ناوێک لەدوای یەک دوو ساڵ دروستکردنی مزگەوتەکە، بە خەتێکی خۆش لە

پێچکەکانی دیوی گونبەتی الله، محمد، أبو بکر، عمری نوسیبوو، حاجی بەکر ئاغا خەلاتێکی چاکی کردبوو، لەسەر دەرگای ناوەندی بە خەتێکی خۆش نوسرابوو (هذه جنات عدن فادخلوها امنین).

ئەوەی خەتیب و مودەریسی ئەم مزگەوتە بووبێ، زۆر ڕێزی ڕاگیراو بووە و بووە بە سەرۆکی مەلایەکان، لەبەر شوێنەکەی ناچار بووە ئەهمیەت زۆر بە زیادکردنی زانیاری خۆی بدا.

لە زۆر شوێنی مزگەوتەکە لەسەر مەرمەڕ نەقش و نووسراو هەیە، لەسەر بەردێکی گەورە ئەمە نووسراوە:

**تا گنبد این جامع اعلا شده بریا**
**صد ناز کند گوی برین قبهٕ خضرا**
**عالم ز وجودش بنشاطیست که گویی**
**هستند بزیر شجر سدره و طوبا**
**از منبر و محراب و درش نیز یقین است**
**ایند ملائک بزمین بهر تماشا**
**هرکس که درو جمعه گذارد بشرائط**
**باکش نبود از غم و اندیشەی فردا**
**داند بیقین هرکه بود اهل سعادت**
**قد اشتری ملا بکر الجنه حقا**
**فرمود بمن از سر تعلیم سروشی**
**در وقت سحر از طرف عالم بالا**
**طالع بشمر مهمل این بیت و یکی فرد**
**تاریخ وی این است برین گنبد مینا**
**از همت ملا بکر این مسجد ممتاز**
**درسال هزار و دو صد و شصت شد انشا**

(حسب الفرموده جناب بانی تحریر شد (١٢٦٠) رقمه المذنب سلمان ابن - رستم اغا -).

### ١١. مزگەوتی مەحموود ئاغا:

لە پێشان بە مزگەوتی خالد ئاغا دەناسرا، کەوتۆتە گەڕەکی قەلات، لەپێشان مزگەوتێکی گچکە بوو، بەڵام لە ساڵی ١٢٧٢ مەحموود ئاغای غەفووری تازەی کردەوە، لەسەر دەرگای مزگەوتەکە ناوی مەحموود ئاغای لەسەر هەڵقەندراوە، مەحموود ئاغا خدری مام یەحیای کە خوارزای بوو، دەنێرێتە (خەتێ) و دارتاشان لەگەڵ خۆی دەبا، بەپێی ئەندازەی ساپیتەکەی دیوی حەرەمی داران دەبڕنەوە، بە ولاغان دارەکان دەهێننەوە کۆیە، لەبەر دەرکی ماڵی کەریم ئاغای برای مەحموود ئاغا ئاغای لەسەر یەکی دادەنێن، شەوێک وەستایەکی چەقوکەر هەموو سەردارەکان بۆ کالانی خەنجەری دەبڕنەوە، کاتێ کە دارەڕێی دەکەن، هەمووی کورت دەردێن و ناگەنەوە سەر دیوارێ، مەحموود ئاغا بە (مام خدر)ی دەڵێ: (خوارزا ئەمن ئەتووم نارد، دارەکان ئەوها سەقەت بکەی؟!) پاش چەند ساڵێک ئەوجا ئاشکرا بوو، کە کێ ئەمەی کردووە، کە دەچنە ماڵەکەی دەبینن خرارێک سەرەداری داناوە.

کۆڵەگەیەکی ئەستووری لە ناوەڕاست بوو، تووی (چەمبەرە)ی بووە، بۆیان هێناوە، لەپێشان مەلا حوسێنی لەسەر دانیشتووە، لەدوای ئەم مەلا ساڵح جەلی مەشهوور بۆ ماوەی ٥٠ ساڵ لەسەری دانیشتووە، لەدوای وەفاتی (مەلا ئەنوەر)ی کوڕی لەسەری دانیشت، ئیجازەی لە خزمەت مەلا سادق وەرگرت و مەعاشی لە ئەوقاف لە ساڵی ١٩٥٧ (١٧) دینار و نیوە، مودەریس و ئیمامی مزگەوتەکەیە، لەدوای وەفاتی یەک دوو مەلای تر هاتن، ئێستا کە ساڵی (١٩٨٢) حاجی مەلا عەبدولڕەحمان مەلا عەبدوڵلا، کە ناوی (امام)یەتی، لە ساڵی (١٩٨١) دائیرەی ئەوقاف سەری مزگەوتەکەی هەڵگرت، پەنجەرە کۆنەکانی دەرێنا و سەرەکەی کۆنکریت کرد، مزگەوتەکە عیبارەتە لە حەرەمی مزگەوت و هەیوانێک و حوجرەی مودەریس و دوو حوجرەی فەقێیان و حەوشێکی زۆر گەورە و حەوزێکی خۆش.

### ١٢. مزگەوتی پەلک:

لە گەڕەکی بەفریقەندی هەڵکەوتووە، مزگەوتێکی زۆر کۆنە، وەختی خۆی درەختی پەلکی لێبووە، فەقێ جەردیس لە ساڵی ١٢٧٤هـ تەعمیری کردووتەوە، ژووری حەرەمی گونبەتە، ئەمەش لە گونبەتی مزگەوتی کۆنە جومعە و مزگەوتی موفتی دەچێ، مامۆستا مەلا ئەحمەدی ئیمام لەسەری دانیشتووە، لەدوای وەفاتی مەلا محەمەدی کوڕی دانیشتووە، ئیجازەی لە باوکی وەرگرتووە، لەدوای وەفاتی مەلا تۆفیقی کوڕی دانیشتووە، لە خزمەت حاجی مەلا عەبدوڵلای جەلی و مەلا عەبدوڵلا نازەنینی خوێندوویەتی، ئیجازەی لە حاجی مەلا عەبدوڵلای جەلی وەرگرتووە، وە لەدوای وەفاتی ئەو، مەلا تاهیر کوڕی مەلا

حوسێن خەڵکی گوندی (میرکە)، کە لەبەینی سنووری کۆیە و دزەییاتییە، دانیشتووە، لەلای مەلا تۆفیق مەلا فەتحوڵڵای هەرتەلی و مەلاساڵحی کۆزەپانکە و مەلا محەمەد ئەفەندی جەلیزادە دەرسی خوێندووە و ئیجازەی لە مەلای گەورە وەرگرتووە، ئێستا حاجی مەلا محەمەدئەمین کەریم ساڵح ئیمامی مزگەوتەکەیە.

ئەم مزگەوتە عیبارەتە لە حەرەمی مزگەوت و هەیوانێکی زۆر خۆش و حەوزی ئاو، فەقێ حەبیب کوڕی فەقێ جەرجیس و حاڵخۆشی گەڕەکەکە، زۆر خزمەتی مزگەوتەکەیان کردووە، (۳) حوجرەی بۆ فەقێیان و حوجرەی مودەریسی تێدایە، ئەم شیعرانە بە فارسی لەسەر دەرگای حەرەمی مزگەوتەکە نووسراوە:

**دو شکرم سؤال از هاتف**
**کیست ایا نهاده ان تأسیس**
**جای ذکرو بنای بی همتا**
**منشأ زهد و مبدأ تدریس**
**تاج افلاک در ربود سرود**
**بیت تاریخ او به صد تقدیس**
**بر فلک سوی قبەی مسجد**
**پی اعلای دین فەقێ جەرجیس**

**(١٢٧٤)**

بۆ ئەمەی حەوشەکەی تەخت بێ، پێشەوەی دیوارێکی بە کەڵەکە بەردی بۆ کرابوو، چونکە مزگەوتەکە لەقەد کەندێ دابڕابوو، بێ لە دەرگەی رەئیسی، لەوێوەش بە قادرمەی بەرد بۆی سەردەکەوتی، بە تەنشتییەوە لەژێر حوجرەکان قولەتێنی ژنانی لێبوو.

**١٣. مزگەوتی مەلا عومەر ئەفەندی:**

لە گەڕەکی بەفریقەندی هەڵکەوتووە، حاجی مەلا عومەر کوڕی جەردیسی دارۆغەی لە ساڵی ١٢٨٠ک لە نزیک ماڵی خۆیان دروستیکردووە، جێگای حەساری داران بوو، کارێزی بۆ لێداوە، لە کارێزی مزگەوتی (بیرۆکە)ش ئاوی بۆ دەهات، کە کارێزەکەی ئاوی لێ پەیدابوو، حەیوانێکی زۆری بۆ کردە خێر، ئاوەکەیان بە کۆڵ و بۆرییە لەسەر گواوی بۆ مزگەوتەکە پەڕاندبۆوە، حەوز و قولەتێنێکی خۆشی هەبوو، جێیەکەی نەختێ لە چاڵدا بوو، سەری هەمووبان گیرابوو، جێی تارەت و دەستنوێژ و مەلەکردنی جیابوو، لەو ساڵانە تێکیان دا پڕیان کردەوە و کردیانە سەکۆ، حەرەم و هەیوانێکی خۆشی هەیە، بەر بەرۆچکەیە، چەند ئاودەستێکی سەرئاوەڵە و سەرگیراوی هەیە، لەسەر گواوی گەورەی شار دروستکراون نوێنەکەی قووڵە، ئێستا حەوزێکی بڵندی بە چەمەنتۆی بۆ کراوە.

ماوەیەک حاجی ئەسعەد ئەفەندی کوڕی حاجی مەلا عومەر لەسەری دانیشتووە، ناوی ئەویشی وەرگرتووە، ئەم کە لە گەڕەکی بەفریقەندی باردەکا و دەچێتە گەڕەکی قەڵات و لەسەر تەکیەی شێخ نەبی دادەنیشێ، حاجی مەلا رەسوول بێتووش دادەنیشێ، کە ئەم لە ساڵی (١٩١٩) ئەمری خوای کرد، ماوەیەک (مەلا ساڵح ئەفەندی) برای دادەنیشێ، کە ئەمە بووە کاتبی صلح، مەلا حەوێز ئەفەندی قوچ ئاغا دادەنیشێ، کە ئەمەش بووە موعەلیم، مەلا کەریم حەسەنی مەلا رەسوولی دانیشت، کە ئەمە وەفاتی کرد مەلا مەعسوم ئەفەندی دانیشت، لەلای مەلا سادق ئەفەندی و مەلا بەهائەدین ئەفەندی دەرسی خوێندووە، پاشان چووبتە خزمەت مەلای گەورە و لە ساڵی ١٣٥٦ ئیجازەی لێ وەرگرتووە و زۆری خۆش ویستووە، چونکە بەراستی زۆر زیرەک بووە و چەند ئیجازەیەکەیشی داوە، ئەندامی مەجلیسی عیلمی مەلایان و مەجلیسی ئیمتحانی فەقێیان بوو، لە دائیرەی ئەوقاف معاشی هەبوو، لەسەر حەرەکەی کوردی لە ساڵی ١٩٦١ لەگەڵ مەلایەکانی تر بۆ ماوەیەک گیرا، لە ساڵی ١٩٦٣ بەشداری حەرەکەکەی کرد، هەندەی پێنەچوو بە نەخۆشی سەرەتانی ڕیخۆڵە ئەمری خوای کرد و لە (عارەبیان) لە تەنیشت (مەلا خدر)ی باوکی نێژرا.

دیواری مزگەوتەکە هەرچەند بە خشت و قوڕ دروستکراوە، بەڵام بە گێچ مالنج کراوە، زۆر وەفیات و رووداوی لەسەر نوسرا بوو، بە دەستخەتی حاجی عەبدوڵڵای کوڕی حاجی مەلا عومەر، کە باوکی سابیر ئەفەندی مودیر شورتە بوو، بە خەتێکی خۆش و گەورە و رەش لەسەر دیواری هەیوانەکە نووسرابوو:

**عز من قنع        ذل من طمع**

لەناو چاوی (ع)یی قنع و (ع)ی طمع چەند شیعرێک بە وردی نوسرابوون، (کەیفی جوانرۆ)ییش بە خەتێکی

درشت (یا محمد)ی نوسیبوو، کاتێ دیوارەکە مالنج کردەوە، هەموو نووسینەکان بەبن گێچی کەوتن.

لەدوای حاجی مەلا مەعسوم ئەفەندی مەلا محەمەد بالیسانی، حاجی مەلا قادر کانی دەربەندی دانیشت، لەدوای ئەو دوو سێ مەلای تر هاتن، ئێستا ١٩٨٢ مەلا تەهای کوڕی مەلا عەبدوڵڵای مەلا ئیسماعیل ماویلی ئیمامیەتی لەپێش ئەویش مەلا لەتیف ئیسماعیل کەریم ئیمام و لەپێش ئەویش مەلا سەلیم سەعید ئاکرەیی ئیمام بوو.

**١٤. مزگەوتی حەتک:**

کەوتۆتە گەڕەکی بەفریقەندی، زۆر کۆنە، فکر وا دەڕوا، کە لەلایەن پیاوێک دروست کرابێ، کە ناوی حاتەم بووبێ، ناوەکەی گۆڕدرابێ بە حەتک، چونکە لە خۆشناوەتی ناوی (حاتەم) دەکەن بە (حەتەکە) یا (حەتک)، رەزێکیش لەکن کەونەپردی بەناوی رەزی ئەحمەدی حەتکی هەیە، لەگەڵ هەندێ دوکانی ناو بازار کراوە بە وەقفی مزگەوتەکە، لە ساڵی ١٣١٧ک حاجی عەبدوڵڵای حاجی مستەفای مسکێن رەبەن تەعمیراتی تازەی کردەوە، رەشید ئاغای حاجی بەکر ئاغا شیعرێکی فارسی بۆ داناوە، بە خەتێکی خۆش لەسەر مەرمەڕ هەڵقەندراوە و لەسەر دەرکەی حەرەمی مزگەوتەکەدراوە:

**کرد تعمیر حاجی عبدالله　　مسجد کهنه از ریا عاری**
**نقد بسیار از مر حلال　　صرف کردو ندید دشواری**
**شرف او چو بیت عتیق　　جای تدریس و علم و بیداری**
**یکی گفت مجوهر این تاریخ　　(باد مقبول حضرت باری)**

(باد مقبول حضرت باری) بە حسابی ئەبجەدی دەردەچێ ساڵی ١٣١٧، هەر حەرفێکی نوقتەی هەبێ، پێی دەگوترێ (مجوهر)، ئەوەی نوقتەی نەبێ، پێی دەگوترێ (مهمل)، کە لە شیعری ئەخیری مزگەوتی گەورە نووسراوە.

(حەتک) لە زوبانی عەرەبی بەو کەسە دەڵێن، خێرا بڕوا (رەهوان) بێ، بەڵام شەقاوی کورت باوێ، لە کوردیدا هەیە گەر کەسێک بۆ ئیشێک بچێ و لێی سەرنەکەوێ دەڵێن: (فلان کەس حەتکە کاروانی کرد).

مزگەوتێکی قشت و جوانە بەڵام گچکەیە، دوو هۆدەی تێدایە بۆ فەقێ و ئیمامی مزگەوت، وەختێکی (مەلا خڕناڵ) لە مزگەوتەکە دەرسی بە منداڵان گوتووە، لەدوای ئەم مەلا سلێمان خەڵکی بێتواتە بوویتە مەلا و ئیمام، لە پاشان بووە قازی بێتواتە، سەروەختێک ماڵی خاڵە (سمایل)ی (مەلا خالد)ی سەرپەرشتی مزگەوتەکەیان کردییە، لەدوای مەلا سلێمان مەلا ئیبراهیم کوڕی قادر عەودالانی، کە گوندێکە عایدی ناحیەی (سورداش) بووە ئیمام و مودەریسی مزگەوتەکە، لەپاش وەفاتی ئەو مەلا محەمەدی کوڕی، کە لەقەبی شیعری (دلاوەر) بووە، لە ساڵی ١٩٣٩ بووە ئیمام و مودەریسی مزگەوتەکە، لەدوای وەفاتی ئەو، لە ١٩٧١/٨/٨ حاجی مەلا حەسەن کوڕی حەمەد کوڕی مرۆ خەڵکی (بەرۆژ)ی (هەرتەل) کرا بە ئیمامی مزگەوتەکە، ئێستا کە ساڵی (١٩٨٢)ە هێشتا (ئیمام)ە.

**١٥. مزگەوتی رەشە:**

لە گەڕەکی قەڵات هەڵکەوتووە، لە دەرەوەی شوورەی دروست کراوە، دەڵێن: «پیاوێک ناو (رەشید = رەشە) دروستی کردووە»، مێژووی دروستکردنی نازاندرێ، مزگەوتێکی زۆر گەورە بووە، ئاودەستەکانی لە بەشی باکووری بوو، ئاوەڕۆیەکەی بۆ باغچەی (خدری مام یەحیا)ی دەچوو، کە جادە برا، بە حەوشی مزگەوتەکەدا رۆیشت و کردییە دوو بەش، لەپاش چەند ساڵێک دیوارێکیان بۆ کێشا و بەشەکەی تربان، کە کەوتە بەری تری جادەکە، وازیان لێهێنا و ئاودەستەکەیان بەجێهێشت، لە پشت حەوزی ئاوەکەش، ریزە ئاودەستێکی تربان بۆ دروست کردەوە.

لە ساڵی ١٣٠٧هـ حاجی ئەحمەدی وەتمانی تەعمیری کردەوە و قەسرەکەی بۆ کرد، کە لەسەر حەوزی مزگەوتەکە دروست کرابوو، بەلای رۆژهەڵاتی دوو سێ هۆدەی دروست کرد، لەسەر مەرمەڕێکدا، کە لە نێوچەوانی قەسرەکە درابوو، رەشید ئاغای حاجی بەکر ئاغا، کە لەقەبی موجریمی بۆ خۆی دانابوو بۆی نوبیوو:

**حاجی احمد ابن وتمان ست　　بانی قصری بیت یزدانست**
**مجرم ان مزدەرا بتاریخش گفت: لطفی خدا بار حساسنت**

حەوشێکی گەورە و مێرگێکی خۆشی لێبوو، عەسرانی هاوینان پیاوی ماقوولی گەڕەکی بەرگەکۆن لێی کۆدەبوونەوە.

سێ چار دارتووی زۆر گەورەی تێدا بوو، پێکهاتبوو لە حەرەمی مزگەوت و دوو حوجرەی فەقێیان و یەک حوجرەی مودەریس.

وەختێکی مەلا ئەحمەد، کە بە داستی کوز دەناسرا، مەلا بووە، لەپاش وەفاتی ئەو مەلا ئەحمەدی رەش دانیشتووە، لەپاش وەفاتی مەلا خدر هەورامی لەسەری دانیشتووە، لە سەفەربەرلگی وەفاتی کردووە و لە گۆڕستانی (عارەبیان) نێژراوە، ئەوجا مەلا عەبدولرەحمان دانیشتووە، ئەوجا مەلا حەسەنی مەعرووف شەشە دانیشتووە، ماوەیەکی زۆر ماوە لەپاش وەفاتی ئەو، مەلا ئەحمەدی خەڵکی گوندی بانەقەڵات بۆ ماوەی (٥) ساڵ دانیشتووە، ئەوجا مەلا عەبدوڵڵا کوڕی مەلا ئیسماعیل ساڵح کۆیی دانیشتووە، ماڵیان لە دەشتی هەولێر بوو، لە هەولێر ئیمتحانی داو ناجح بوو، ئیجازەی لە خزمەت شێخ مەلا مستەفا شێخ ئەبوبەکر هەولێری لە ساڵی ١٩٥١ وەرگرتووە، تا ئێستا کە ساڵی (١٩٨٢)ە ئیمامی مزگەوتی رەشەیە.

**١٦. مزگەوتی (سەرباغ):**

کە گردی جوولەکان لە ساڵی ١٩٥٧ کرا بە گەڕەک، نزیکی ٣٠٠ ماڵی لێ دروستکرا، حاجی محەمەد حاجی عەبدوڵڵا دوو پارچە عەردی لە گەڕەکەکە کڕی، بە پارەی خۆی مزگەوتێکی خۆشی لە ساڵی ١٩٥٨ لێ دروستکرد، حەرەمێکی گەورە و بەشێکی فەقێ و ئیمام و حەوزێکی گەورەی ئاوی لێ دروستکرد، ماوەیەک حاجی مەلا سەید محێدین بە پیتاکی ئەهالییەکە ئیمامەتی لێکردووە مەلا مستەفا عەبدوڵڵا ئیسماعیل ئیمامە.

**١٧. مزگەوتی (حاجی بەکر دلێر حاجی عومەر مام یەحیا):**

لە گەڕەکی (بایزاغا)یە (حاجی بەکر دلێر)ی موهەندیس و مقاول دروستی کردووە، حەوشێکی گەورە و جێگای تەعزیە و حەرەمی مزگەوتی تێدایە، لە ساڵی ١٩٧٩ تەواوبوو، منارەیەکی بڵندی بۆ کردووە، ئێستا ئیمامەکەی مەلا محەمەدئەمین سەردۆڵییە.

**١٨. مزگەوتی (حاجی سەدیق):**

لە گەڕەکی قەڵات هەڵکەوتووە، حاجی سەدیق حەمەد عەبدوڵڵا عاردەکەی و بینایەکەی لە ساڵی ١٩٨٠ بە پارەی خۆی دروستکرد، حەرەمی مزگەوتەکە بێ کۆڵەکەیە و سەرەکەی کۆنکریتە، هەیوانێک و یەک دوو ژووری هەیە، خێرومەندەکان پڕ فەرشیان کردییە و منارەیەکیان بۆ کردووە، هێشتا ئیمامی رەسمی نییە.

**١٩. مزگەوتی ئەوقاف:**

وا حکومەت لە رێی حەمامۆک لە ساڵی ١٩٨٢ دەستی بە دروستکردنی مزگەوتێکی گەورە کردووە.

**٢٠. مزگەوتی ئازادی:**

لە ساڵی ١٩٨٠ بە یارمەتی دانیشتوانی گەڕەکەکە، مزگەوتێکی خۆشیان دروست کردووە، دیوی حەرەمی گەورەیە، هەیوانێکیشی لەپێشە، (مەلا عوسمان شەفیع ساڵح) یەکەم ئیمامیەتی.

پەراوێزەکان:

باسی مزگەوتەکان لە (١٠/شوبات/١٩٥٧) لەلایەن (مەلا فاتح مەلا محەمەد)ەوە (مایسی ١٩٥٨) (مەلا فوئاد مەلا مەعسوم)ەوە نووسراوە، خۆشم شتی زیادم وەرگرتووە.

١. لەدوای مەلا حەسەن سەید وەلی جەباری ئیمام بووە، وە لە ٢/ ١٠/ ١٩٧٠ مەلا عەبدوڵڵا مەلا عەبدولرەحمان کە ناوی ئیمام بوو.

٢. لەم ئافرەتە ٣ کوڕی دەبێ: حاجی مەلا عەبدوڵڵا، حاجی مەلا ئەحمەد، مەلا حەبیب، کە هەموو جەلیزادەکانی کۆیە، لەم ٣ برایەن.

٣. حاجی مەحمود (٣) هەزار قڕانی هەبووە، هەزار قڕانی لە مزگەوتەکە خەرج کردووە.

* ئەم بابەتە لە کتێبی (مێژووی کۆیە)ی تاهیر ئەحمەد حەویزی، بەرگی دووەم، چاپی یەکەم، ١٩٨٤ وەرگیراوە.



# کەنیسەی هەرمۆتە (ارموطە)[1]

تاهیر ئەحمەد حەوێزی

(ئەمیر ئەفەندی حەنا سلێمان) مودەریسی سانەوی لە کۆیە - خەڵقی هەرمۆتە - بۆی نووسیومەوە و لە رۆژی یەک شەمموو (١٩٧٨/٢/١٩) پێیدام: ئەرمەنی (یوسف سرفیان) خەڵقی شاری (طوقات) بەیارمەتی قەشە (قس شەمعون) لە تورکیا لە ساڵی (١٨٦٨) دروستی کردووەتەوە، کە ئەمیش (٥٠٠) قرانی داوە و خواردنی (١٤) کرێکاری داوە، تا کەنیسەکە تەواو بووە، لە زەمانی مەتران (یوحەنا تەمەرز - ڕەبەنی دێر)دا، کە لە کەرکووک دادەنیشت، " بطریەک" (یوسف ئودو) کە لە بەغدا دادەنیشت، و پاپا (بیوس)ی نۆیەم.

قەشە شەمعون و یوسفی برای لە بنەماڵەی (شێخ حەجی غرۆ)یە و قەشە (ئوراها قریاقۆس) دوو ساڵ لەپێش دروستکردنی کەنیسەکە مردووە.

کەنیسەکە لەجێی کەنیسەیەکی کۆن دروست کراوەتەوە، کە پێشان کەنیسەکە بە قوڕی بووە، بەردی گێچی سووتای بە وڵاغی دێننە هەرمۆتەی لەوێ بە مەداری دەیکوتن.

لە هاوینی (١٩٧٧) کەنیسەکە فراوان کرا، لەلایەن قەشە (متی کوسا) لە (شەقلاوە)، هەر ماڵە هەرمۆتەییەک، (٢٥) دیناریان داوە، هەروەها (یوسف سرفیان) نەوەی (یوسف سرفیانی) گەورەش (٩٥) دیناریداوە، حکومەتیش هەزار دیناری داوە، بە کەنیسەی (مریەمە) دەناسرێ.

وەختی خۆی لە (شێخ محەمەد)ی دێرێوە (مەربێن قەدیشە)ی (تویزاوا)یەوە هەتا قەلاتی (شیلە)ی (٨) مەعبەد

هەبووە.

ئەوانەی لە نزیکی گوندی هەرمۆتەن و کەمێ شوێنەواریان ماوە:

١. مار یوسف.
٢. مار میخائیل: ئەم دووە لە ئاقاری هەرمۆتەن و نەماون.
٣. مار شەمعون: لە ئاقاری هەرمۆتەیە و نەماوە و کراوە بە گۆڕستانی (دێرە گچکەلە).
٤. کەونە دێرەیەک لەناو رەزان.

دیانەکان بە (کلدانی) بە (أرض) دەڵێن: (ئەرە) و بە گوندەکەی دەڵێن: (ئەرموطە) کە دوو مەعنای هەیە:

١. ئەرە مۆتە: عاردی مردی، گۆڕستان، یا جێی مردوان.
٢. عەرمۆتا: بە مەعنای هەنارە، وەختی خۆی لە هەوراز کاریزەکەی پشت مالان بەرەوخوار تا کاولە ئاشەکەی، رەز و باغ بووە، میوەی وەک: هەنار، سێو، قەیسی، زۆرتێدابووە.

(٣ - ٤) دار زەیتونەکەی لەبەر جادەی ئۆتۆمبێلن، لەسەر رۆخی پارچە عاردێکە، پێی دەڵێن: (چارباغ)، گردەکەش پاشماوەی قەسرێک بووە ـەشهور بە قەسری (عیسا ئاغا).

دیانی هەرمۆتەی لە هی کۆیە کۆنترن، وەک دەڵێن: گوندی (کلێسە) و (بۆگد)یش دیان بوون، (کلێسە) بەناوی (کنیسە)ی دیانان مایتەوە.

دیانەکانی ئێستاکەی هەرمۆتەی لە چواربەشان پێکهاتوون، سێیان: (عەودال، تومی قصاب، حەنای بطروس)ی لە هەموان کۆنترن، مالی (ئسول = ئسو = وسو = یوسف)ی لەلای (هیران)ێەوە هاتبوون.

دیانی هەرمۆتە لە زۆر لایان بلاوبووینەوە، وەک: کۆیە، سلێمانی، سنە، کەرکووک، عەنکاوە، بەغداد، کەرمەلێس.

لەو کەلاوانەی بە گوندی تۆپزاوایە، کە بە قەلابە بەشی زۆری بەردەکانیان بردن و کەلەکەکانیان نەهێشتن، هەمووی کاولە خانوو بوون، لەکاتی جووتکردندا، زۆرجار کولەئاسنی ئاسنگەران و جێ گوفەک بەدەرکەوتووە، بێ لە شتی دیکە، کە نەیانوێرایە ئاشکرای بکەن.

### سەرچاوە و پەراوێزەکان

١- لە ژووررووی (ایران) قەلاتێک هەبووە، شایەکانی رقیان لە یەکێک ببا وە بە حەپسی دەیننارده ئەوێ، رزگاربوونی نەبوو، پێیان دەگوت: (قلعة الموت) یەعنی (هێلانەی هەلۆ)، ئەل = ئەلو = هەلۆ.

٢- لە رۆژی ١٩٧٧/١١/٣ زۆری ئەو قسانەم، لە قەشە "مەتی" وەرگرت، کە خۆی لە دێری رەهبان لەلای "مەقلوب" دەرچووەو خۆشی "رەبەن= رەهبان"ە، بە ئەسڵ خەڵکی شەقلاوەیەو لە تەمەنی ١٠سالی ئەوێی بەجێهێشتووە، خزم و کەس و باوکی هێشتا لەشەقلاوە ماوە، کوردی بادینی، کلدانی و عەرەبی، باش دەزانێ، قەشەی کۆیەو هەرمۆتەیە، پار تا کەنیسەکەی بۆ نوێکردنەوە بە زۆری لەکۆیەی رادەبوارد، حیکایەتی "یەزدان دۆخت"ی هەولێری چاک لەبیرو لەبەرە.

حکومەت ١٠٠٠دیناری داوە بە دیانەکانی هەرمۆتەو ٨٠ دینارێکیش بۆ دیانەکانی کەرکووکێ کە نەوەی ئەو دیانەیە، کە وەختی خۆی ١١٥سال پێش ئیمڕۆ کەنیسەی هەرمۆتەی دروست کردووەتەوە، باقی پارەکەش کە لەبەری دەبڕێ، ئەهالی هەرمۆتەی دەیدەن، لا دیوارێکیان تێکداوەو گونبەتەکەیان رووخاندییە، سەرەکەی دەکەنە کۆنکرێت، درێژی ١٥مەترو پانی ١٠ مەترە.

* ئەم بابەتە لە کتێبی (مێژووی کۆیە)ی تاهیر ئەحمەد حەوێزی، بەرگی یەکەم، چاپی دووەم، ٢٠٠٧ وەرگیراوە.